ناوی کتێب: ئیلیادە
نووسینی: هۆمیرۆس
وەرگێڕانی: حەمە کەریم عارف
بابەت: داستان
مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولڕەحمان فەرەج
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٦٥٠٠دینار
ژمارەی سپاردن: ١١٤٨ ی ٢٠٠٩
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٩
کوردستان -سلێمانی
www.sardam.net
www.sardam.info
www.sardam.org

# زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
# کتێبی سەردەم ژمارە (٤٨٩)

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە

**ئازاد بەرزنجی**

# پێشەکی

(١)

دیارە ئیلیادەو ئۆدیسە وەکو دوو شاکاری هونەری بە درێژایی مێژوو، کاریگەریان بەسەر کارێن ئەدەبی و هونەری نەوە یەك لە دوای یەکەکان هەبووە. ئەم دوو داستانە، لە کۆنەوە تاکو رۆژگاری ئەمرۆ بە رەمزو هێمای هونەری نەمر دانراون و هەر ئەم نەمرییە پاراستوونی و کردویەتە کارێك کە بگەنە دەستی ئێمەی خەڵکی سەدەی بیست و یەکەم و لەزەتە ئەستاتیکییەکەی خۆیان بپارێزن. جا ئیلیادە و ئۆدێسە چەند مایەی سەرسامی بوون و چەند کاریگەریان هەبووە، ئەوەندەش مایەی جیاوازی بیرو بۆچوونی ئەهلی قەڵەم بوون لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا.. هەندێ کەس پێیان وایە هومێرۆس ئەم دوو قەسیدەیەی نەهۆنیوەتەوە، بەڵکو کۆمەڵە کورتە قەسیدەیەکی لەسەر جەنگی تەروادە خرکردۆتەوە، رێکی خستوون و داونیەتە دەم یەکەوەو پاشان کردویەتی بە دوو بەشەوە، یەکێکیان دەربارەی تۆران و تورەبوونی ئەخیلەو دووەمیان لەسەر گەرانەوەی(ئودوسیوس)ە ئیدی لەگەڵ تێپەڕ بوونی رۆژگاردا بەشی یەکەم ناوی ئیلیادەی وەرگرتگە و هی دووەم ئۆدیسە. هەندێکی دی لایان وایە هومیرۆس تەنیا ئیلیادەی هۆنیوەتەوە، هۆنەرێکی خۆوێژی دیکە ئۆدسەی هۆنیوەتەوەو پاشان بە هەڵەو نارەوا ئەویش دراوەتە پاڵ هۆمیروس.. هەندێکی دی پێیان وایە هۆمیرۆس، شایەرێکی خۆوێژی گۆرانی بێژی هۆنراوانی فۆلکلۆری بووەو پاشان ئەوهۆنراوە فۆلکلۆریانە لەلایەن خەڵکانی دیکەوە کۆ کراونەتەوەو بە هەڵە دروانەتە پاڵ هۆمیرۆس.. هەندێکی دی هەر بەوەندەوە ناوەستن، بەڵکو لە ناوی (هۆمیرۆس)ش بە گومانن.. وشەی هۆمیرۆس مانای کۆرە دەگەیەنێ، گوایە (کۆرە) ناز ناوی ئاشق و شاعیرێکی نابینا بووەو مێژوو ناوە راستەقینەکەی بۆ تۆمار نەکردوین و ئیدی ئەو نازناوە جێگەی ناوە راستەقینەکەی ئەو ئاشقو شایەرەی گرتوەتەوە، هەندێکی تر بە گومانن کەسێك بە ناو یان نازناوی هۆمیرۆس هەبووبێ، واتە هۆمیرۆس کەسایەتییەکی خەیاڵییەو پاشان وەکو کەسایەتییەکی راستەقینە خۆی بەسەر زانایان و مێژوونووسانی ئەدەبیاتدا سەپاندووەو بووە بەم ناوە زندووەی کە ئێستا لە سەرانسەری گێتی دا فرە ناسراوە،

بەهەرحاڵ وێرای جیاوازی ئەو بیروبۆچوونانەی لەمەڕ هۆنەری ئیلیادەو ئۆدیسە هەیە، وێرای جیاوازی ئەو پرسیارانەی کە: لە کوێندەر لە دایك بووە، ژیانی چۆن بووە، لە چ سەردەمێکا ژیاوە، رادەی پەیوەندی هۆنەر بە بویەرو رووداوەکانی ناو داستانەکان... و زۆر شتی دیکەش، بە هەرحاڵ بیروباوەڕو بۆچوونەکان چەند زۆربنو جیاوازبن، بە تۆزقاڵیش لەو حەقیقەتە ناگۆڕن، کە دوو دانە گەوهەری دانسقە بەناوی ئیلیادە و ئۆدیسە گەییونەتە دەستی خەڵکی ئەم سەردەمە و پەساپۆرتی ئەم گەشتە دوورو درێژەشیان تەنیا هونەرییەتی خۆیان بووە، جا خوای دەکرد لە بنی خاوەنیان نەدەبوو. چونکە ئەوەی بۆ خوێنەر گرینگە دەقی داستانەکانە وەکو چۆن هەن، نەك هۆنەرەکەیان.

(٢)

وەکو دەزانین، هەر یەکێك لە ئیلیادەو ئۆدیسە بە سەر بیست و چوار پاژدا دابەش بوون، کە رەخنەوانانی کۆن ناوی سردوویان لێناون، واتە هەر یەکێکیان بریتییە لە بیست و چوار سروود، دیارە ئەم تەقسیمبەندییە لە سەرەتای پەیدا بوونی ئەو جووتە داستانەدا نەبووە، دواتر لەلایەن ئەهلی ئەدەب و قەڵەمەوە ئەم تەقسیمبەندییەی بۆ کراوە.. هەر یەکێك لەم بیست و چوار سروودە لە ژێر پیتێکی ئەلفبایی بیست و چوار پیتەی گریکیدا دانراوە، سروودەکانی ئیلیادە بە پیتی گەورە (کەپیتال) و ئەوەکانی ئۆدیسە بە پیتی بچووك (سمۆڵ) دیاری کراون، بۆ نموونە سروودی یەکەمی ئیلیادە بە پیتی ((A))ی دەست نیشانکراوەو هی ئۆدیسە بە پیتی ((a)). دیارە دەبێ ئەم تەقسیمبەندییە دوای گۆڕان و پەرەسەندن و جێگیر بوونی ئەلفبای گریکی و گێرسانەوەی لەسەر بیست و چوار پیت، ئەنجام درا بێ، زانایان لەو باوەڕەدان کە ئەم کارە لەسەردەمانی پێش زایندا لەلایەن (زینودو توس)ەوە ئەنجام دراوە، کە لە دەوروبەریساڵی ٣٢٥ پ.ز لە دایك بووە، لە ساڵی ٢٨٤ پێش ز بە یەکەم بەڕێوەبەری کتێبخانەکەی ئەسکەندەر دامەزراوە. یەکەم کەس بووە هەوڵی رێکخستن و ساغکردنەوەو بێوکردنەوەی هۆنراوەکانی هۆمیرۆسی داوە..

ئیلیادە لە (١٥٦٩٣) بەیت پێك هاتووە و ئۆدیسە بریتییە لە (١٢٢١٠) بەیت، ژمارەی بەیتەکانی هەر سروودێکی ئیلیادە لە نێوان (٤٦١- ٩٠٩) بەیت دایە. سروودی یەکەم (٤٦١) بەیتە، سروودی سێیەم (٩٠٩) بەیتە. ژمارەی بەیتەکانی هەر سروودێکی ئۆدیسەش لە نێوان (٣٣١- سروودی شەشەم، و ٨٤٧- سروودی چوارەم) بەیت دایە... سەرەتاو

پەیدا بوونی ئەم دوو داستانە کەی بووەو چۆن بووە، ئەمە مشتو مڕی زۆری لەسەرە، بەڵام پێدەچێت لەسەردەمێکا پەیدا بووبن کە نووسین و تۆمار کردن هەبووبێ، جا ئەگەر هۆمیرۆس بەخۆی یەکەم کەس نەبووبێ کە نووسینی بۆ تۆمار کردنی هۆنراوەکانی بەکار هێنابێ ئەوا لە سەردەمێکا هۆنیونیەتەوە کە نووسین و تۆمار کردن لە باوو برەودا نەبووە، چونکە شەقڵی زارەکی بە دارشتنی هەردووك داستانەکەوە دیارە، بە هەر حاڵ ئەم بۆچوونانە ئەوە ناسەلمێنن کە هۆنراوەکانی هۆمیرۆس لەگەڵ پەیدا بوونیانا، ئیدی لە ئاستێکی بەرین و بەربڵاودا تۆمارو بڵاوکراونەتەوە. بەڵکو کەوتۆتە سەر زاری ئاشقان و شایەران و نەوە دوای نەوە گێردراوەتەوەو دەماو دەمی کردووە، ئەمەش کردویەتێ کارێك کە هۆنراوەکانی هۆمیرۆس لە ئاستێکی بەربڵاودا بڵاوببێتەوە و لە کۆنەوە بووە بە مایەی سەرنج و مشتو مڕی زانایان و دانایان و هزر ڤانان و فەیلەسوفان و هەر کەسەو لە گۆشە نیگای خۆیەوە راڤەو شرۆڤەی کردوون و کە ئێستا بوون بە سەرچاوەی باش بۆ لێکدانەوەی ئەو جووتە داستانە... بە هەر حاڵ کۆنترین چاپی هۆنراوەکانی هۆمیرۆس لە ساڵی ١٤٨٨ی زدا لەلایەن (دیمتریوس خالکوندیلوس)ەوە بڵاوکراوەتەوە. لە ساڵی ١٥٠٤دا جارێکی دی لەلایەن (ئالدین)ەوە چاپکرانەوە.. ئیدی زۆر چاپی دیکەی بە دودا هاتووە. بەڵام لە رۆژهەڵاتی عەرەبیدا، هیچ زانایەك بیری لە بڵاوکردنەوەی هۆنراوەکانی هۆمیرۆس نەکردۆتەوە هەر چەندە، چەند بەشێکی زۆری بە نووسراوی لەسەر لەبان، لە لمەڵانەکانی میسردا لە ژێر ئەرزا دۆزراونەتەوە... تا ئێستا ئەم جووتە شاکارە لەلایەن چەند نووسەرو ئەدیبێکی وەکو سلێمان البستانی، درینی خشبە، (امین سلامە)ەوە کراون بە زمانی عەرەبی، کە کۆنترینیان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دەیەی بیستەکانی سەدەی بیستەم، بەڵام هیچیان پابەندی ئەمانەتی وەرگێران نەبوون... هەروەها لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا چەند باسکارێکی عەرەب هەندێ لێکۆڵینەوەیان لەمەڕ جووتە داستانی گۆڕین نووسیوە، لەوانە کتێبی: ((هۆمیرۆس- شاعیری نەمری)) دانانی دکتۆر محمد صفر خفاجە، کە لە ساڵی ١٩٥٦دا لەلایەن وەشانخانەی (نهضة مصر) لە قاهیرە چاپ و بڵاوبووەتەوە، کە باسی ژیانی هۆمیرۆس و کاریگەریی هۆمیرۆس بەسەر نووسەرانو ئەدیبانی کۆن و نوێدا دەکات، و هەندێ پەرەگراف پەراگەندەشی لە هەر یەکێك لە داستانەکان وەرگێڕاوە، کتێبی دووەم لە ژێر سەر ناڤی "هۆمیرۆس- مێژووی ژیانی سەردەمێك"ـە، لەساڵی ١٩٦٨دا لە ئەسکەندەرییە چاپ و بڵاوبووەتەوە، بە کورتی باسی

ژیانی هۆمیرۆس‌و دیاردەی هۆمەری دەکات و ئیدی بابەت و ناوەڕۆکی جووتە داستانەکە و ڕادەی پەیوەندییان بە مێژووەوە خراوەتە بەر وردەبینی ڕاڤەو لێکۆڵینەوەوە.

(٣)

لێکۆڵینەوە بەراوردکارییەکانی بواری داستانناسی ئەوەیان ساغکردۆتەوە کە شاعیر بابەتەکەی لە ڕووداوێکی مێژووییەوە وەرگرتووە، بەڵام لە مالیجەی ئەو ڕووداوەدا، دەرهەق بە قارەمانانی داستانەکەو کات و ڕووداوەکان ئەوپەڕی ئازادی بە خۆی داوەو دەستکاری هونەرییانەی کردووە.

دیارە زانایان سەبارەت بە ڕووداوەکانی ناو داستانی ئیلیادە بۆچوونی جیاوازیان هەیە، هەیە پێی وایە کە ڕووداوەکانی ئیلیادە، زادەو ئافەریدەی خەون و خەیاڵی شاعیرێکی بلیمەتی خەیاڵپەروەرەو فریان بە ڕاستییەوە نییە، بگرە شەڕی تەروادەش ئەفسانەیەو هیچ پاشخانێکی مێژوویی ئەوتۆ لە ئارادا نییە کە متمانەی پێ بکرێت... لێ هەندێ زانای دی جەختی تەواو لەسەر ئەوە دەکەن کە جەنگی تەروادە، بویەرێکی مێژووییەو دەکرێ لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە ئارکولوژی و ئەدەبییە هەرە کۆنەکانەوە بسەلمێنرێ. ئەمانە پێیان وایە بابەت و نێوەڕۆکی ئیلیادە، وێنەی کێشەی نێوان ئاخاییەکان و (گریکەکان)- کە ئەوسا دورگەی ڕۆدۆس مەڵبەندی سەرەکیان بووە- پەیمان و بەرەی ئەسوا، کە شاری تەروادەش لەو بەرەیەدا بووە، وێنە دەگرێت، ئەو شەڕو کێشەیەش لەو سەرو بەندەدا قەوماوە کە ئەستێرەی دەسەڵاتی دەوڵەتی حیتی لە لێژی دا بووە... بەڵام ئەوەی ڕاستی بێ ئەم بابەتە زۆر ڕوون نییە، و ئەو زانیارییانەی لەمەڕ هەزارەی دووەمی پێش ز لە ئارادان هێشتا زۆر کەمن.. دیارە زانایانی مەیدانی ئارکۆلۆجی هەوڵێکی زۆریان داوە هەندێ تیشك بخەنە سەر مێژووی تەروادەو شوێنی شاری تەروادە دیاری بکەن. گوایە (شلیمان) شوێنی شارەکەی دیاری کردووەو هەندێ شوێنەواری خانووبەرەی دۆزیوەتەوە، پاشان (دوربفیلد) هاتووە لەئیشەکانی (شلیمان)ی کۆڵیوەتەوە، دوای ئەوان (بلجن) هاتووەو هەندێ سەرچاوەی دیکەی بە دەست هێناوەو بە وردی لە کارەکانی ئەوانی کۆڵیوەتەوە.. هەوڵ و تەقەللای ئەم سێ زانایە، ڕۆشناییەکی زۆریان خستوەتە سەر ڕادەی پەیوەندی نێوان بابەتی داستانی ئیلیادەو حەقیقەتی مێژوویی شاری تەروادە... دۆزینەوە ئارکولوجیەکان ئەوەیان سەلماندووە کە شاری تەروادە لە جارێك پتر بینانراوەو لە جارێکیش پتر وێران‌و تەخت کراوە..دەگێردرێتەوە کە شاری تەروادەی ناو ئیلیادە

PDF 4 KURD

لە ساڵی ١١٨٤پ.زدا رووخاوەو وێران بووە.. (بلجن) لە لێکۆڵینەوە بە پێزەکەی خۆیدا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە شاری تەروادەی حەوتەم لە دەوروبەری ساڵی ١٢٠٠ (پێش زاین) رووخاوەو شاری تەروادەی شەشەم لە ساڵی ١٣٠٠ پ.ز وێران کراوە. بە گوێرەی ئەمە دەبێ تەروادەی ناو ئیلیادە، شاری تەروادەی حەوتەم بێ... بەڵام دەستە زانایەکی دی بەلای ئەوەدا دایدەکێشن کە تەروادەی ناو ئیلیادە تەروادەی شەشەم بێ، بەڵگە مێژوویی‌و ئارکۆلوجیەکانیش وای نیشان دەدەن کە تەروادەی شەشەم بە هۆی بومەلەرزەوە وێران بووە، جڵەوداری بومەلەرزەش بە گوێرەی ئەفسانەو باوەڕێن گریکی، خواوەند (پۆسیدون)ـە.

بە گوێرەی ئیلیادە، تەروادە لە رێگەی ئەسپەدارینەوە  وێران کراوە، هەر چەندە ئەسپەدارینەکە، بەگوێرەی ئیلیادە، ئەتینای یەزدانخانم ناردی، بەڵام بە پێی ئەفسانەو باوەڕێن گریکی، رەمزی خواوەند پۆسیدون بووە، بە هەر حاڵ تەروادەکەی ناو ئیلیادە، تەروادەی شەشەم یان حەوتەم بێ، لە رووی ئارکۆلۆجی و مێژووییەوە، ئەوە ساغ بووەتەوە کە شارێك بووە، هەبووە، لە ئاسیادا و لە دووری چوار میلی دەوازەی دەردەنیل بووە، کە ئەو ناوچەیە ئەمڕۆ (حەسارلیك)ی پێ دەڵێن، هەروەها بەڵگە مێژوویی‌و ئارکولوجیەکان ئەوەشیان ساغکردوەتەوە کە شەڕی خوێناوی وکوشندە لە نێوان شاری تەروادەو دراوسێ ئاسیایی‌و ئەورووپاییەکانیان بەرپا بووە، بە گوێرەی ئیلیادە هێزی فرە رەگەز بەشداری ئەو شەڕەیان کردووە... شاری بولوس مەڵبەندێکی گرنگی شارستانیەتی موکینیایی بووە. سەیر دەکەین لە ئیلیادە شوێنەواری میتولۆژیای موکینیایی بەدی دەکرێت، وەکو شەڕی ئەرکادیاییەکان لە سروودی حەوتەمی ئلیادەداو هەروەها شەڕی ئاییان لە سروودی یازدەیەمدا.هەروەها نە ستور، کە یەکێکە لەو شیرەتکارو فەرماندانەی بەشداری گەمارۆی تەروادەی کردووە، خەڵکی ئەو دەڤەرەیە. لە باری سەرنجی مێژووییەوەش ئەوە دیارە کە موکینیاییەکان، کۆلۆنیان لە دورگەی رودوسدا دامەزراندووەو پەیوەندییان لەگەڵ لوکییەکاندا هەبووە، ئەم حەقیقەتە مێژووییانە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئیلیادەدا تەواو تێك دەکەنەوە، بۆ نموونە گەلێك لە قارەمانانی لۆکیایی وەك گلاوکوس و پنداروس و سارپیدون بەشداری شەڕی تەروادەیان کردووە، ئەمە جگە لەوەی هەندێ لە زانایانی کۆن پێیان وایە پەیوەندی لە نێوان پاریس و ناوچەی تسالیا، و لە نێوان هیکتۆرو ناوچەی ناوەڕاستی نیمچە دورگەی گریکدا هەبووە... کەواتە داستان و چیرۆکی گەمارۆی

تەروادە، وەکو چۆن لە ئیلیادەدا هاتووە، وێنەی جەنگێکی خوێناوی و کوشندە دەگرێت کە سوپاو لەشکری زۆربەی ناوچەکانی دنیای کۆن لە هەردوك کیشوەری ئەوروپاو ئاسیا بەشداریان تێدا کردووە، ئەو لەشکرانەش وەکو نوێنەری گەلانی ئەو دەڤەرانە بوو بوون بە دوو ئۆردوگای گەورەی هەڤدژ و ماوەیەکی زۆر شەڕی نێوان ئەم دوو ئۆردوە بەردەوام بووە.

هەڵبەتە هۆکارەکانی هەڵگیرسانی ئەو شەڕە کوشندەیە بە تەواوەتی روون نییە. بەڵام ئاشکرایە ئەو مەملەکەتانەی کەوتبوونە ئاسیای بچووکەوە زۆر دەوڵەمەندبوون و خودانی زێڕێکی زۆر بوون و ئەمەش کردبوویە کارێك گەلانی دەرو دراوسێ چاوی تەماحی تێ ببڕن، بۆیە پێدەچێت هۆی هەڵگیرسانی ئەو شەڕە ئابووری بوو بێ... بەڵام ئیلیادە هۆی شەڕەکە دەگێڕێتەوە بۆ رفاندنی (هیلین)ی ژنی (مینیلاوس) کە یەکێك بوو لە پاشاکانی گریك، لەلایەن پاریسی جوان خاسی کوڕی پریامۆسی پاشای تەروادە... بە هەر حاڵ شەڕو کێشەی نێوان هەردوو ئۆردووی تەروادەیی و گریکی زۆر کۆن و بە رەگ و ریشەیە، هۆیەکەشی یا ئابوورییە یان شەخسیە یان هەردووکیانە، بەڵام کە هومیرۆس هاتووە چیرۆکی هەڵگرتن و ڕەڤاندنی (هیلین)ی کردووە بە هۆکاری هەڵگیرساندنی شەڕەکە، رەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەو پایەیەی ئەم چیرۆکە لە میتولۆجیای گریکی دا هەی بووە، راستەوخۆ پەیوەست بووە بەکۆمەڵگەی خوداوەندانیەوە، وەکو چۆن خەیاڵی گەلانی موکینیایی و گەلانی دیکەی گریکی بەرجەستەیان کردووە.

سەیر لەوەدایە خوداوەندان لە ئیلیادەدا دەورێکی یەجگار گەورە دەبینن، جا بەڵگە مێژوویی و ئارکۆلۆجیەکان ئەوەیان سەلماندووە کە لێکچونێکی زۆر لە نێوان سیستەمی جیهانی خوداوەندانی زادەی خەیاڵی موکینیاییەکانو سیستەمی جیهانی خوداوەندانی ناو ئیلیادەو ئۆدیسەدا هەیە. کاریگەریی دیانەتی موکینیایی لەنۆڕینی هۆنەری ئیلیادە و ئۆدیسەدا بۆ خواوەندان زۆر بەزەقی دیارە... هەندێ لە زانایان پێیان وایە هەندێ کاریگەری رۆژهەڵاتیانەشی پێوە دیارە، بە تایبەتی کاریگەریی دیانەتی حیتی کە بە خۆیشی لە ژێر کاریگەریی دیانەتی بابیلیدا بووە... جگە لە چیرۆکی جەنگی تەروادە، گەلێك ئەفسانەی دیکەی وەکو ئەفسانانی موکینیایی و ئەفسانانی تیبە، ئەفسانەی نیوبی کە ئەخیل لە سروودی بیست و چوارەمدا ئاماژەی بۆ کردووە، هەروەها ئەفسانەی ملیاگرکە فوینیکس لە سروودی نۆیەم دا ئاماژەی بۆ کردووە، لە دەقی ئیلیادەدا کەم و زۆر رەنگیان داوەتەوە.

(٤)

بەهرەوەری و توانای هۆنەری ئیلیادەو ئۆدیسە هەر لەوەدا نییە کە کەرەستەی داستانەکانی لە چەندین سەرچاوەی کۆنەوە هەڵێنجاوە، بەڵکو زیاتر لە وەدایە کە چۆن بەو کەرەستانە ئیلیادە و ئۆدیسەی بنیادناوە.

هۆنەری ئیلیادە نەهاتووە هەموو چیرۆکەکەی جەنگی تەروادە وەربگرێ و مامەڵەی لە تەکدا بکات، بەڵکو یەك رووداوی ئەو جەنگەی هەڵبژاردووە، ئەویش بریتییە لە تۆران و تورە بوونی ئەخیل و کاریگەریی ئەم تۆرە بوونە بەسەر لەشکرو هێزی گریکەکانەوە کە دژی تەروادە دەجەنگی.... تورە بوونی ئەخیلی کردووە بە تەوەری سەرەکی و هەموو بویەرو رووداوە سەرەکیەکانی دیکە بە دەوری ئەودا دەسورێنەوە. رووداو لە ئیلیادەدا پەنجا رۆژ دەخایەنێ، بەڵام ئەگەر ئەو ماوانەی کە شەڕی تیا وەستاوە، وەکو ئەو نۆ رۆژەی پەتای تیا بێوبووەوە، ئەو دوانزە رۆژەی خواوەندان لە وڵاتی ئەتیوبیاندا بەسەریان دەبرد، و ئەو دوانزە رۆژەی گریکەکان بە شێواندن و سوکایەتی کردن بە جەنازەکەی هیکتۆرەوە بەسەریان برد، ئەو دوانزە رۆژەی پریام و تەروادەییان بە رێورەسمی پرسەو ناشتنی هیکتۆرەوە بەسەریان برد، ئەگەر ئەو ماوانە لە پەنجا رۆژەکە دەربکرێ، چەند رۆژێکی زۆر کەم دەمێنێتەوە کە دانەری ئیلیادە رووداوەکانی شەڕی تەروادەی تیادا دەگێڕێتەوە.. وێڕای کورتی ماوەی شەڕەکە، شاعیر توانیویەتی وێنەیەکی زۆر جوان و پوختەی چیرۆکی شەڕی تەروادە بە دەستەو بداتو بەرجەستە بکات. شاعیر بۆ ئەو مەبەستەی دوو رێگەی گرتۆتە بەر، یەکەمیان، هاتووە کێشەو ململانێی نێوان فەرماندە گریکییەکانی بەکۆمەڵێك دیمەنی پڕ لە وردەکاری ئاوێتە کردووەو بە جۆرێ ناو کێشی گێڕانەوەی ئیلیادەی کردووە کە هێندەی دی وێنەی شەڕی تەروادە بەرجەستە دەکات... بە تایبەتی ئەو دیمەنانەی کە هەست و سۆزی سەربازەکان لە کاتی شەڕدا بەرجەستە دەکەن، بەمجۆرە هۆنەری ئیلیادە ئەوەمان پیشان دەدا کە چۆن شەڕی تەروادە نۆ ساڵی تەواو درێژەی کێشاوە. چۆن گریکەکان لە شەڕ بێزار بوون و خوا خوایان بووە شەڕ تەواو بێ و ئاشتی بەرپا بێ. وچۆن فەرماندە گریکەکان ناچاربوون پەنا وەبەر شێوازی تازە بەرن تا ورەی سەربازەکانیان بەرز بکەنەوەو بە جۆرێ جۆشیان بدەن کە هەمدیس بەرەو پیری شەڕ بچن.... رێگەی دووەمی ئەوەیە شاعیر هاتووە لە زۆر شوێنی داستانەکەدا ئاماژە بۆ هەندێ رووداوی گرنگ، بەر لە روودانیان دەکات. ئەمەش لە رێگەی

کەسایەتیانی ناو داستانەکەوە دەکات، نەك لە ڕێگەی گێڕانەوەی ڕاستەوخۆوە. وەکو ئەمەی لەگەڵ ئەخیل دا کردووە، هەروەها لەگەڵ خەڵکی تەروادەدا، کە هەردوولایان تەرەفن لە کارەساتەکەدا، بۆ نموونە لە سروودی چوارەمدا ئاگا مەمنون، لە ئەنجامی خیانەتی پنداروسدا، دەگاتە ئەو ئەنجامگیرییەی کە تەروادە تیا دەچێت و گومان لەمەدا نییە... هەمان ئەنجامگیری لە سروودی شەشەمدا لەسەر زاری هیکتۆر دووبارە دەبێتەوە، هەروەها (دیومیدوس)ش لە سروودی حەوتەمدا ئەگەری وێران بوونی تەروادە دووپات دەکاتەوە... نیوەی دووەمی داستانەکە پڕە لە ئاماژە و هێمایان کە چارەنووسی هیکتۆر بەندە بە چارەنووسی تەروادەوە و گومانیش لە فەوتانی هیکتۆر نییە... خۆ ئەوەش هەر لە سروودی یەکەمەوە لای خوێنەر خۆیایە کە ئەخیل لە بەردەم هەڕەشەی تارمایی مەرگدایە، و ئەمە لە سروودەکانی هەژدەیەم، نۆزدەیەم، و بیست و یەکەم و بیست و دووەم دا زیاتر ڕوون دەبێتەوە.

بەو جۆرە دانەری ئیلیادە، بایەخی تەواو بە هەندێ لە کاراکتەرەکان دەدات و زۆر بە باشی دەتوانێ سەرنجی وەرگرو خوێنەر ڕابکێشێت و وای لێ بکات بە تاسەوە پەیگیری ڕووداوەکان بکات... جا ئەم جۆرە کاراکتەرسازییە دواتر بوو بەنموونەیەکی پەسندی ئەوتۆ کە گریکەکان لە هەموو جۆرە شیعرەکانیاندا لاساییان دەکردەوە، و لە زۆر کارێن ئەدەبی هاوچەرخیش دا لاسایی کراوەتەوە.

(٥)

دنیای ئەم جووتە داستانە دنیایەکی غەریب و سەیرە، نە بە تەواوەتی دنیای قارەمانێتی باوی سەردەمی موکینیاییەکانە، نە دنیای پاشایەتی باوی سەردەمی هومیرۆس، نە دنیایەکی ڕووتی خەیاڵیە، بەڵکو ئاوێتەیەکە لە کۆمەڵە دنیایەکی جیاواز و هونەرمەندانە لەگەڵ یەکتردا گونجێنراون، بەر لە هەر شتێك دنیایەکی ئینسانیە، هۆمیرۆس هاتووە پشت بە تواناو بەهرەی ڕەنگینی خۆی دنیایەکی زۆر تایبەتی دروست کردووەو شەقڵی تایبەتی خۆی پێ بەخشیوە، تانوپۆی دنیایەکەی، کاراکتەرسازییە هەرە جوان و پەسندەکەیەتی. زۆربەی کاراکتەرەکانی خەڵکانی خانەدان و ڕەسەنن، زۆر جار بۆ زیاتر بەرجەستە کردنی خانەدانیورەسەنایەتیان بە خواوەند یان خواوەندئاسا، نیمچە خواوەند وەسفیان دەکات، بەڵام لە پاڵ ئەوەشدا لێرەو لەوێ، هەندێ کاراکتەری بۆرەکی-ش قوت دەکاتەوە، کە

لە هەر شوێنێ ناویان دێ بە بێ قەدری ناو دەبرێن و مامەڵەیان لە تەکدا دەکرێ... بە هەرحاڵ دنیای ئەم جووتە داستانە زیاتر پاشایەتییە تا دنیای خانەدان و ئەرستوکراتان. کۆڵەکەو تەوەری کۆمەڵگە پاشایە، هەر چەندە لە ئیلیادە ئاگامەمنون سەردارو شای شایەکانە، بەڵام ئەمە بە هۆی بارودۆخی شەڕەوەیەو بارودۆخەکە وای خواستووە جڵەوی رابەرایەتی بە یەك کەس بسپێردرێت و کەس فەرمانی لە زەوی نەدات، دەنا هەموو پاشاکان لە یەك ئاستدان، کەس لە کەس نەزیاترە و نە کەمتر.

قارەمانانی ئیلیادە و ئۆدیسە بە پیاوەتی و نێراتی بەناوبانگن، هەموو شەڕڤان و جەنگاوەرن، وا دیارە شەڕ یەکێکە لە پێوەرو پێوانەکانی رادەی توانای پیاوەتی و تەبیعەت و ئەخلاق و بەردەباری قارەمان... بۆیە سەیر دەکەی قارەمانانی ئیلیادە لە شەڕدا زۆر بە توانان، لە رادەبەدەر بە توانان... چونکە شەڕ پێوەری مێرایەتیە، جا کاراکتەرە سەرەکیەکانی ئیلیادە و ئۆدیسە میناکی ئەخیل، هیکتۆر، ئەجاکس و پاتروکلۆس، لە شەڕدا زۆر سەکێش و کەڵەمێرد، رێسکبازن.. هەر قارەمانەو بە جۆرێ خۆی دەنوێنێ، ئیدی بە هێزی بازوو بێ، بەلەزگینی و گورج و گۆڵی و خۆشبەزی بێ، یان بە بەردەباری و خێرایی قەراردان بێ، یا بە دانانی نەخشەو پلان بێ، یان بە رادەی سەبرو حەوسەڵەی بێ سنوور بێ، یان بە هێرش و پەلاماری بێ روحمانە بێ. جا ئەوانەی لە شەڕدا قارەمانن، لە کۆمەڵگەشدا هەر پایەیان بەرزە و لە رووی رواڵەتی بەدەنیشەوە قۆز و جوانن، لە باری ئەقڵی و هۆشیاریشەوە، دەم راست و ئەهلی راوتەگبیر و بەردەبارن... ئەمەش دەکاتە کارێك هێندەی دیکە خانەدان بنوێنن و لەلای خەڵکی بە هەیبەت بن... بە زۆری کۆشك و بارەگاکانیان پڕە لە زێڕو سەروەت و سامانی زۆرو خوڵام و کەنیزەکی زۆریان لە خزمەتدایە.. تەویلەو ئاغەڵەکانیان پڕن لە میگەلە پەزو رەوە بەرازو، لە بۆنەو دەعوەتاندا، خوانیان رازاوەو بە هەموو خواردن و خواردنەوەیەکی بەلەزەت ئاوەدانە. لە شەڕدا شانازی بە چەك و ئەسلەحەکانیان دەکەن، کە لە برونز دروست کراوەو بە زێڕو زیوو عاجان نەخشێنراوە. لە کۆڕو مەجلیساندا نەك هەر حەکیم و بردەبارن بەڵکو بە دەم و زمان و قسەزانیشن... میوان پەروەرن، داڵدەی داڵدەخوازان دەدەن، سەخاوەتمەندانە لە کاتی سرووتی ئاینیدا، لە کاتی نوێژو نزاو پاڕانەوەدا، قوربانی و نەزر پێشکەش بە خواوەندان دەکەن... ئیدی دەبینی هۆمیرۆس لەو جووتە شاکارەدا دنیایەکی دەوڵەمەندتر لەو دنیایەی خۆی تیایدا ژیاوە، وێنەدەگرێت... هاتووە ئەم چیرۆکە ئینسانیەی لە چوارچێوەیەکی قارەمانێتی

دا دارشتووەتەوە. دیارە دەیتوانی رابردوو بکاتە دەستاوێزێك بۆ هەڵاتن لە واقیع، یان چوون بەرەو رۆمانسیەت... بەڵام ئەمەی نەکردووە، بەڵکو رابردووی کردووە بە هۆیەك تا لە رێگەیەوە وێنەیەکی باڵای ئەو جیهانە بە شەریە نیشان بدات کە خۆی ویستویەتی وێنەی بگرێت.

سیفەتی قارەمانەکانی هۆمیرۆس زیاتر لە رێگەی گوتارو کردارەکانیانەوە بە دیار دەکەوێ نەك لە رێگەی هزرین و هەستەکانیانەوە، دیارە کرداریش زادەو رەنگدانەوەی تەبع و تەبیعەتیانە.. هەموو دەزانین ئیلیادە بە تۆران و تۆرە بوونی ئەخیل دەست پێدەکات، ئەم تورە بوونە دەبێتە مایەی شکستی گریکەکان، شکستەکەش کوژرانی پاتروکلۆسی لێ دەکەوێتەوە، هەموو ئەمانە پەیوەندییان بە بوونی ئەخیلەوە هەیە، بەو گیانە بەرزە فرە لە خۆ باییەوە هەیە کە دەکاتە کارێك ئەخیل وەکو پیاوێکی درو دڵرەق و ئازاو مێرخاز بێ هاوتاو بێ هەڤرك بنوێنێ، یان ئۆدیسیوس، ئەوەندەی بە زیرەکی و فەندو فێڵن و بەردەباری بەناوبانگە ئەوەندە بە مێراتی و ئازایەتی بەناوبانگ نییە، بە هۆی بوێرییەکەیەوە تووشی زۆر ئاستەنگان دەبێت و تەنیا زیرەکییەکەی فریای دەکەوێ و رزگاری دەکات... کە دەبینین هیکتۆر شەرڤانێکی بە دیمەن و مێردێکی خۆشەویست و بابێکی میرەبانە، لەبەر ئەوەیە شتێکی هەیە کە لە پێناویدا دەخەبتێ، شەر دەکات، ئەویش خێزانەکەی و شارەکەیەتی. یان کە دەبینرێ ئاگامەمنون بوێرێکی دوو دڵ و بە سام و هەیبەت و لووتبەرز و خۆپەسندە، لەبەر ئەوەیە کە لە فەرماندەکانی دیکەی گریك پتر بەرپرسیارەو هەست بە باری قورسی مەسئوولیەتەکانی سەرشانی دەکات.. بە هەر حاڵ ئەو قارەمانانەی هۆمیرۆس وێنەی کێشاون زیاتر لە رێگەی کردارەکانیانەوە خۆ دەناسێنن و بوونی خۆیان دەسەلمێنن.

هەڵبەتە قارەمانانی هۆمیرۆس، ئافرەتیشیان تێدایە، و بوونی ئەو ئافرەتانەش زادەی پێداویستییەکانی خودی داستانەکانەو لە خۆڕاو بە بێهودە قوت نەکراونەتەوە. بۆ نموونە هیلین، هیلینی جوانە ژنی دڵرفێن، کە هۆکاری هەڵگیرسانی شەری تەروادەیە، زەرورەتی پەرەسەندنی داستانەکە سەپاندوویەتی نەك حەزو ئارەزووی هۆمیرۆس. دیارە هیلین تایبەتمەندی خۆی هەیە، هۆمیرۆس دەیتوانی بە جۆرێ وێنەی بگرێ کە نەك هەر سەرچاوەی شەر بێ بەڵکو خودی شەر بێ.... بەڵام هۆمیرۆس هاتووە بە جۆرێ وێنەی گرتووە، کە جەماوەری گوێگر یان خوێنەر هەست بە هیلین بکەن و هاوبەشی هەستەکانی

بکەن.... ئەوەتا کاتێ کە هیکتۆر دەکوژرێ بە جۆرێ بۆی دەگری و شینی بۆ دەکات هیچی لە گریان و شینی ژنەکەی و دایکی کەمتر نییە، بەڵکو بەوپەڕی خەمبارییەوە، بەدڵی پڕ کەسەرەوە ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن بە بەردەوامی هاوسۆزی لەگەڵدا کردووەو دڵی ڕاگرتووە.. ڕاستە کاراکتەرەکانی هۆمیرۆس بە پێی هەڵوێست و بارودۆخ و ژینگەی خۆیان نەشونما دەکەن، بەڵام زۆر جار لەو هەڵوێست و بارودۆخەی کە تیایدان، زندووتر و گەورەتر دەنوێنن، هۆمیرۆس لە کاراکتەرسازی ژناندا، چوارچێوە مرۆڤانیەکانی لەبەر چاو گرتووە، سەلبیات و ئیجابیاتی وەکو هەر بە شەرێك وێنەگرتوون، بۆیە کاراکتەری ژن لەئیلیادەدا، بودەڵەو سووك و خوێڕیلە نییە، مرۆڤەو لە دنیا بەشەریەکەی ناو داستانەکەدا نمودو دیمەنی خۆی هەیە... جا با بێینە سەر کەسایەتی پریسیس، هەر چەندە بوونی ئەم کاراکتەرە بۆ داستانی ئیلیادە پێویستە، چونکە ئەخیل لەسەر ئەو تورە دەبێت، کاتێ کە ئاگامەمنون تەماحی تێدەکات و بە تۆبزی لێی دەستێنێ، ئیدی ئەخیل تورە دەبێ و دەتۆرێ، پریسیس لەو سەروبەندەدا دیار نییە، نە دەنگی هەیەو نە ڕەنگ، نە هیچ شتێك دەڵێت و نە هیچ شتێك دەکات کە کار لە ڕووداوەکە بکات..... تاقە وشەیەك ناڵێت، پێدەچێت هۆمیرۆس بۆیە ئەمەی کردبێ تابەوە تاوانبار نەکرێ کە لە ڕێگەی قسەکانی ئەو کیژەوە ڕای خۆی لەمەڕ کێشەی نێوان ئەو دوو قارەمانە دەربڕیوە.. بەڵام دواتر کە جەنازەکەی پاتروکلۆس دەهێنرێتەوە بۆ بەر خێوەتەکان، دەست بە گریان دەکات و باسی ئەوە دەکات کە بەر لە کوشتنەکەی چەند لەگەڵیا باش بووە.. هیکتۆریش هاوسەرو دایکی هەیە، هەر یەکێکیان تایبەتمەندی و واقیعی خۆیان هەیە، هەر یەکەیان کول و کۆڤانی تراجیدیانەی خۆیان هەیە. ئەندروماك، هاوسەری هیکتۆر، ژنێکی منالْکارە، لە هەموو شتێکدا پشتی بە مێردەکەی بەستووە، زۆری خۆش دەوێ، بە ڕادەیەك دەترسێت لە دەستی بچێت، یانی لە خۆشەویستیدا پێشبینی مردنی دەکات. کە بە مردنەکەی دەزانێ و جەنازەکەی بە دوای گالیسکەکەی ئەخیلەوە دەبینێ، ئیدی لە کۆتایی و نەمانی خۆی و منداڵەکەی دڵنیا دەبێت، ئیدی ورە بەر دەدات و دەبێت بە نموونەی بێوەژنێکی نائومێدی خەمبار. بەڵام هیکۆبای دایکی هیکتۆر، پیرەژنێکی کارەساتدیدەی جەرگ سووتاوە، ژمارەیەك لە کوڕەکانی کوژراوەو بە بەردەوامی لەترس و نیگەرانی و دوو دڵیدایە... لە هیکتۆر دەپاڕێتەوە کە شەڕی ئەخیل نەکات، لە پریامۆسی مێردی دەپاڕێتەوە ریسك بە ژیانی خۆی نەکات و نەچێ بۆ لای ئەخیل تا داوای جەنازەکەی هیکتۆری لێ بکاتەوە.. ئیدی لە ئاکامدا دەوری

دایکێکی پیر، دایکی پاڵەوانێکی گەورەو ناودار دەگێڕێت، بەڵام کەسایەتی و هەست و سۆزو تەبع و تەبیعەتی تایبەتی خۆی هەیە.

(٦)

هەر چەندە، هۆمیرۆس زیاتر بایەخی بە کەسایەتی پاشایان و خانەدانان داوە، بەڵام پەی بەوەش بردووە کە وێنەی هونەری شیعرەکانی، بەبێ هەندێ دیمەنی میللی وخەڵکانی عەوام نوقستان دەبێت.. جا کە هاتووەتە سەر ئەو دیمەن و تابلۆیانە، بە تۆبزی لە دەقەکەی بار نەکردوون و هەرگیز وەکو پینەی زەق نانوێنن، بەڵکو بوون بە تەواوکەرێکی زۆر ئاسایی رەوتە گشتییەکەی رووداوی سەرەکی داستانەکە.. لە وانە بۆ وێنە چۆن دژمنان پەلاماری شوانکارانی بێ دەسەڵات دەدەن و مەڕو ماڵاتیان بەتاڵان دەبەن.. دیمەنی شەڕ، دیمەنی ئاشتی، ئاهەنگی زەماوەندو بەزم و گۆرانی، دیمەنی زەوی کێڵ‌ن‌و جووتکاری، دروێنە و حاسێت خڕ کردنەوە، میوەچنی و بە ڕەزو باخا راگەییشتن، ... هتد، دیارە هۆمیرۆس ئەم تابلۆ و دیمەنانەی بۆیە هێناوەتە ئاراوە، تا دنیا بەشەرییەکە بەو جۆرە وێنە بگرێ و بەرجەستە بکات کە لە خەیاڵی خۆیدا هەیە... دیارە هۆمیرۆس بۆ وێنەگرتنی ئەو دیمەن و تابلۆیانە رێگەیەکی دیکەشی گرتۆتەبەر، ئەویش رێگەی بەکارهێنانی وێنەی هونەری و سنعەتە رەوانبێژیەکانە، لەو بوارەدا کۆمەڵێك وێنەو هونەرو سنعەتی رەوانبێژی زۆر جوانی بەکار هێناوە کە دواتر بووە بە یەکێك لە شەقڵ و خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی شێوازە دەگمەن و بێ وێنەکەی.. رەنگە هۆمیرۆس ویستبێتی بەمە، ئەو باوەڕەی خۆی بسەلمێنێ کە جیهانی قارەمانێتی بە تەنیا هەموو شتێك نییە، بەڵکو زۆر شتی دیکەی ئاسایی و باو هەیە دەبنە تەواوکەری لایەنەکانی جیهانی قارەمانێتی و جۆرە زندوویەتیەکی زیاتری پێ دەبەخشن.. دەست رەنگینی هۆمیرۆس لەوەدایە کە هاوسەنگیەکی زۆر جوانی لە نێوان کارەکتەرەکانیدا دروست کردووە، و سیمای هەر یەکێکیان، سیمای ئەویتر بەرجەستە دەکات و تیشکی دەخاتە سەر. بۆ نموونە لە ئیلیادەدا دوو دنیا، یان دوو لایەن هەن، کە هەر یەکێکیان تیشك دەخاتە سەر ئەویتریان، دنیای یەکەم، دنیای نێرینە، کە بیریتیە لە هێزو لەشکری گریکەکان، دنیای دووەم، بریتییە لە کۆمەڵێك جەنگاوەر، ژنان، پیران، ژن و مناڵ و پەککەوتوان، کە هەموو شاری تەروادەیە... دیارە، ئەم بەرانبەرێن کردنەی ئەم دوو دنیایە، بەڵگەی ئەوەیە کە شەڕ بە تەنێ هەموو لایەنەکانی ژیان نییە، بەڵکو لایەنی دیکەش هەیەو ئەگەر جۆرە هاوسەنگیەك لە نێوان ئەو لایەنانەدا نەبێ ژیان سەنگەلا دەبێت... بۆیە ئەگەر

هۆمیرۆس ئەمەی نەکردبا رووداوی سەرەکی ئیلیادە دەبوو بە زنجیرە شەڕێکی هۆڤیانەی دوور لە هەستە مرۆڤانیەکان.

خۆ ئەگەر لەم روانگەو بۆچوون و چەمکەوە سەیری کەسایەتی ئەخیل بکەین، دەبینین نموونەی ئەو قارەمانەیە کە بۆ خۆی کار دەکات و شکۆو سەرفرازی خۆی مەبەستە، راستە کۆمەڵە هەست و سۆزێکی مرۆڤانی هەیە، بە تایبەتی دەرهەق بە پاترۆکلۆسی هاوڕێی، کە لە جیاتی ئەم چووە شەڕەوەو کوژراو، مردنەکەی بووە مایەی ئەوە کە ئەخیل رق لە هیکتۆر هەڵگرێ.. راستە ئەخیل هەست بە دۆستایەتیەکی بتەو دەکات لەگەڵ فەرماندە گریکییەکانی دیکەی میناکی ئۆدیسیوس و دیۆمیدوس و نەستورو ... هتد، بەڵام وێڕای ئەوەش گۆشەگیری و دوورە پەرێزی بەسەر ئەخیلدا زاڵە، هێشتا بابی لە ژیاندایە، بەڵام هەرگیز نایبینێ، چونکە دەریاو ئۆقیانووسی بەرین دە ساڵە لێکدی دایبریون.هەندێ جار دایکی دڵخۆشی دەداتەوەو ئامۆژگاری دەکات، بەڵام چونکە لە پێری خواوەندانە، و بەشەر نییە، هەرگیز پابەندی ئەو پەیوەندییە بەشەریانە نابێ، کە هەقە لە نێوان دایك و فەرزەندا هەبێ، هۆمیرۆس هاتووە هەردوو لایەنی خراپەو چاکەی ئەخیلی وێنەگرتووە، بەمەش شەقڵێکی مرۆڤانی ئەوتۆی پێ بەخشیوە، مەگەر تەنیا لە چەند قارەمانێکی راستەقینەی کەمدا هەبێ، بەڵام ئەخیل، لە هەموو حاڵێکا دەستبەرداری بەها بەرزو ئایدیالیەکانی خۆی لە مەڕ مێرایەتی و سەرفرازی نابێت و ئامادەیە لە پێناوی ئەو بەها بەرزانەدا خۆی بەکوشت بدات.. واتە ئەخیل نموونەیەکی ئایدیالی قارەمانێتی زاتیە، بەڵام لە بەرانبەریا قارەمانێکی جیاوازتر هەیە، کە ئەویش هیکتۆرە، کە بەڕاستی زێدەباری سەرکێشی و کەڵەمێردی و بوێرییەکەی، لایەنێکی مرۆڤانی گەلەك کاریگەریشی هەیە، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە دڵخۆشی ژنەکەی دەداتەوە و کوڕە ساواکەی دەلاوێنێ.. زۆر چاك دەزانێ کە دایکی چەندی هەق بەسەرەوە هەیە، زۆر بە نەزاکەت و ئەدەبەوە مامەڵە دەگەڵ هیلین دا دەکات.. هەر ئەو پشت و پەناو کۆڵەکەی مقاوەمەت و بەرگری تەروادەیە، ئەو رابەری لەشکر دەکات و هێرش بۆ سەر کەشتی گریکەکان دەکات، ئەو پاریس سەرزەنیشت و سەرکۆنە دەکات... چاك دەزانێ دەبێ بەرەنگاری ئەخیل ببێتەوەو لەسەر دەستی ئەویش دەکوژرێ.. کەچی کرو کپ و مەنگ ، بێ دوو دڵی بەرەو پیری مەرگ دەچێت، و وا دیارە تەروادەش لە دوای ئەو تیا دەچێت، جا بەم پێودانگە دەشێت ئەخیل بە نموونەی پاڵەوانێتی زاتی دابنرێ، بەڵام هیکتۆر نموونەیەکی پێشکەوتووترو

فرە دیمەنتری قارەمانیەتیە، قارەمانێکە، بەرپرسە بەرانبەر بە خێزان و نیشتمانەکەی.. واتە وەفاداری بەرانبەر بە خێزان و نیشتمان مەرجێکی ئەو قارەمانیەتیەیە... ئەگەر ئەخیل نموونەیەکی کۆن و کلاسیکی قارەمان و قارەمانێتی بێ، ئەوا هیکتۆر نموونەیەکی تازەتری قارەمان و قارەمانێتییە، ئەو نموونەیەیە کە خودی هۆمیرۆس گەرەکیەتی.

هۆمیرۆس، لەم جووتە داستانەدا، بایەخێکی زۆر بە ئینسانیەتی بەشەر دەدات، وەکو خۆی چۆنە ئاوها مامەڵەی لە تەکدا دەکات، کاری نائاسایی و موجیزەیی نەداوەتە پاڵ هیچ بەشەرێك.. خۆ ئەگەر لە شوێنێکدا وا پێویست بوو بێ بە شەرێك کارێکی نا ئاسایی و موجیزەیی بکات، خێرا هاتووە بە شێوەیەکی هونەری داویەتە پاڵ خواوەندان. وەکو چۆن پاریس بە موعجیزە لە شەڕی مینیلاوس رزگار دەبێت، هەڵبەتە بە فەزڵی ئەفرۆدێت رزگار دەبێت... یان کاتێ ئەسپەکانی ئەخیل دێنە قسە و پێشبینی مردنی ئەخیل دەکەن، دیارە هیرا بە حەولوقوەتی خوایانەی خۆی زمانیان دەپژێنێ و ئەو قسانەیان دەخاتە سەر زار.بەو جۆرە دەبینین هۆمیرۆس شەقڵێکی ئینسانی بە هەموو کاراکتەرەکانی بەخشیوە، تەنانەت لە وێنەگرتنی ئافەریدەێن خوراق و گیانلەبەرانیش دا ئەم لایەنەی فەرامۆش نەکردووە، ئەمەش کردویەتە کارێك کە چیرۆکەکەی وەکو یەکەیەکی یەکگرتووی هونەری شەقڵێکی ئینسانیانە وەربگرێت.

(٧)

جگە لە بەشەر، بەشێکی تەواوی قارەمانانی هۆمیرۆس خواوەندانن، لێ مامەڵەی هۆمیرۆس لەگەڵ ئەم تاقمە قارەمانەدا جیاوازەو بە رواڵەت ناکۆکییەك لەم بوارەدا بەدی دەکرێت. رەنگە ئەمە بگەڕێتەوە بۆ سروشتی هەڵوێستی گریکەکان لەمەڕ خواوەندەکانیان. هەر هەموو خوداوەندە گریکیەکان شێوەو جەوهەری ناسوتییان هەیە، رەفتارو هەڵس و کەوتیان وەکو رەفتاری بەشەرانە، جیاوازیەکەیان ئەوەیە کە خواوەندان نە پیر دەبن و نە دەمرن، هێزو دەسەڵاتیان لە بەشەران زۆر زیاترە و (هۆمیرۆس)ش جەختی تەواوی لەسەر ئەمە کردوەتەوە.. خواوەندان هێزو دەسەڵاتێکی نا ئاساییان هەیە، دوورن لە هەڕەشەی پیری و مردن، خۆش رادەبوێرن، مشت و مڕیان دەکەوێتە ناو، هەموویان یەك ماڵبات پێك دێنن و بارەگای سەرەکیان ئۆلیمبۆسە. هەمیشە کێشەو گەنگەشەیان لە نێوان دایە، تەنانەت زۆر جار زیوسی گەورەو سەروەریان بەزەحمەت دەتوانێ کۆنترۆڵیان بکات و جڵەویان بگرێ. بۆ نموونە کاتێ زیوس ئەمری پێکردن خۆ لە شەڕی بەینی گریك

و تەروادەییان هەڵ نەقورتێنن، هیرا دەسەڵاتی مێوینەیی خۆی دەخاتەگەڕ، لەگەڵیا دەخەوێ و شەرابی دەداتێ، مەست دەبێ، هەر لە بیری نامێنێ لەسەر زەوی شەڕ هەیە... خواوەندەکان هەندێ جار لە هەموو شتەکان ئاگادار نین، هەندێکیان ئاگاداری وردەکاری شەڕی تەروادەو لەشکری گریك نین، بۆ نموونە کاتێ پەڵە هەورێکی زێڕین لە خواوند ئەریس دەئاڵێ، نازانێ (سکالافوس)ی کوڕی لە شەڕگەدا کوژراوە، ئەمە بۆ خۆی لایەنێکە لە لایەنەکانی لێکچوونی خواوەندان و بەشەران. کاتێ خواوەندان بەشەریانە ڕەفتار دەکەن و لایەنە بەشەرییەکەی تەبیعەتیان دەردەکەوێ هەموو سەنگ و ویقارێکی خواوەندانە لە دەست دەدەن و زۆر کۆمیدیانە دێنە بەرچاو... بۆ نموونە ئەو ڕێگەیەی هیرا بۆ خەڵەتاندنی زیوس بەکاری هێناو شەڕی تەروادەی لە بیر بردەوە بە ڕاستی کۆمیدیانەیەو مایەی پێکەنینە... یان بەشداری خواوەندان لە شەڕدا... وێرای نیعمەتی پیر نەبوون و نەمریان، هەندێ جار ڕەفتارو هەڵوێستیان زۆر لە هی بەشەر بچووکترە. کاتێ دیومیدوس ئەریسی خواوەندی جەنگ لە شەڕا بریندار دەکات، خواوەندی شەڕ لە تاو ئازار هاوار دەکات، یان کاتێ ئەفرۆدێت هەندێك جار هەست بە نائومێدی دەکات لە هۆڕژنی گریان دەداو پەنا بو (دیونی) دایکی دەبات، یان لە یەکێك دەگەڕێ دڵخۆشی بداتەوە، جا ڕەنگە ئەم لایەنە کۆمیدیەی ڕەفتاری خواوەندان بگەڕێتەوە بۆ ئەو ئەمن و ئەمانە ڕەهایەی هەیانە، بۆ دووریان لە پیری و مردن... بۆ نموونە بەشداری خواوەندان لە شەڕدا ناکاتە سەرکێشی و ڕیسك، چونکە پێشوەختە دەزانن نامرن، با شەڕەکە زۆر ئەستەمیش بێ، بۆیە لە هیچ شتێکدا پەلەیان نییە، چونکە بێ خەمن... هەر چەندە هۆمیرۆس بە ڕواڵەت گاڵتە بە خواوەندانی گریکی دەکات، بەڵام خواوەندان پایەو دەسەڵاتی خۆیان هەیەو ئاکام و ئەنجامی هەموو شتێك بەندە بە ویست و ئارەزووی ئەوانەوە... هەندێ لە شارەزایان ئەم دیاردەیە وەها لێك دەدەنەوە کە ئیلیادە و ئۆدیسە بەو حاڵەیانەوە لە سەردەمێکا پەیدا بوون کە گریکەکان وردە وردە تۆڕێنیان بۆ خواوەندان گۆڕاوە و ویستویانە بایەخ بە کاروبارو ڕەفتارو چارەنووسی بەشەران بدەن. لە ئیلیادەدا خواوەندان ڕاستەوخۆ دەست دەخەنە کاروباری بەشەران... بۆ نموونە لە جەنگی تەروادەدا ئەتیناو هیرا دژی تەروادەییەکان دەوەستن، کەچی ئەفرۆدێت تەرفداریان لێدەکات، هەموو ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پاریس خەڵاتی جوانیی، دا بە ئەفرۆدێت و جووتە خواوەندەکەی تری لێ بێبەش کرد. سەیر دەکەی ئەم سێ خواوەندە، ئەتینا، هیراو

ئەفرۆدیت وەکو هەرمێوینەیەکی بەشەری رەفتار دەکەن،ئەمەش بە گوێرەی تێگەیشتنی گریکەکان لە قارەمانێتی، دەچێتە خانەی قارەمانێتی زاتییەوە... هەر لەو پێودانگەوە خواوەند ئەرتەمیس، نیوبی دەکوژێت هەر لەبەر ئەوەی بەمناڵەکانیەوە دەنازێ... خواوەند پۆسیدون، ئۆدیسیوس دەچەوسێنێتەوە چونکە ئۆدیسیوس کورەکەی ئەوی کوشتوە... هەروەها دەبینین خواوەندەکان رێزو حورمەتی ئەو بەشەرانە زیاتر دەگرن کە بە سرووتی تایبەتی قوربانیان پێشکەش دەکەن و نەزریان بۆ دەکەن... لەم حاڵەتەدا خواوەندان خۆیان بە قەرزاریاری ئەو کەسانە دەزانن و لە تەنگانەدا فریایان دەکەون... بۆ نموونەن کاتێ (خروسیس)ی کاهین دەیەوێ، کیژەکەی، کە ئاگامەمنون بەدیلی بردویەتی، وەربگرێتەوە، پەناوەبەر ئەپۆلۆ دەبات و لێی دەپارێتەوەو بیری دەخاتەوە کە چۆن نەزرو قوربانی بۆ کردووە، ئەپۆلۆش غەزەب لە گریکەکان دەگرێ و پەتا لە نێو لەشکرەکەیان بێدەکاتەوە. لە ئیلیادەدا تووشی دیمەنی دیکەی لەو بابەتە دەبینەوە... بە هەر حاڵ هۆمیرۆس هەمیشە بیری لە بەشەر کردۆتەوە، لە گەرمەی مامەڵەی خۆیدا لەگەڵ گروپی خواوەندان، بەشەری هەر لەبیر بووە.

هۆمیرۆس لە نزیکی کۆتایی ئیلیادەدا ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە هەڵگیرسانی جەنگی تەروادە لە سۆنگەی ئارەزووە سێکسییەکانی پاریسەوە بوو، ئەوەبوو لە کاتی داوەری لە نێوان هەر سێ یەزدانخانمی نێو براوادا، تەماحی جوانی و دڵرفێنی هیلین، کە ئەفرۆدێت خستیە بەری، گرتی و، داوەرییەکەی بەلای ئەفرۆدێتدا داشکاند.. ئەوە بوو تەروادە لە ئاکامی ئەو هەڵوێستەوە، تووشی شکست و وێرانی بوو.

هەرچەندە خواوەندەکانی هۆمیرۆس یەجگار بە دەسەلاتن، هەر چییەکیان بوێ دەیکەن، دەست لە هەموو کاروبارێکی بەشەر وەردەدەن، بەلام وێرای ئەوەش، هەندێ جار بەشەر، لە رێگەی توانا بەشەرییەکانی خۆیەوە، چارەنووسی خۆی دیاری دەکات، بەشەر لەلای هۆمیرۆس کار بۆ شکۆ و سەربەرزی خۆی دەکات و خواوندانیش هەندێ جار رێی لێناگرن، بەلام چ خواوەندان و چ بەشەران بەگوێرەی بەرەی خۆ پێ رادەکێشن. قارەمانی راستەقینە کەسێکە نەچێتە ئاقاری خواوو بەگژا خواوەنداندا نەچێتەوەو هەوڵنەدات لە سنووری تەبیعەتی بەشەریانەی خۆی دەربچێت و تەبیعەتی خواوەندانە وەربگرێت.. ئەرکی قارەمانەکانی هۆمیرۆس لە ژیاندا ئەوەیە کە ئەوپەری سوود لە بەهرەو توانا بەشەرییەکانی خۆیان وەربگرن... جا وەکو چۆن خواوەندان رێگەی تایبەتی خۆ دەگرن

و مومارەسەی خوایەتی خۆیان دەکەن، بەشەریش لەسەریانە رێچکەو رێبازێك بۆ خۆ بدۆزنەوە کە لەگەڵ بنەماو توانا بەشەرییەکانی خۆیاندا بگونجێ جا چونکە تەمەنی بەشەر زۆر کورتە، دەبێ لە خەمی ئەوەدا بێ کاری گەورەی تیائەنجام بدات. ناوێکی زندوو یان نیمچە زیندوو پەیدا بکات و بەجێ بێڵێ، هەر بۆیە دەبینین هیکتۆر و سارپیدۆن داوا لە هێزەکانیان دەکەن ئەوپەڕی توانای خۆ لە شەڕدا بەکار بێنن و گوێ بە مردن نەدەن، و ئازایەتی و بوێری و ورە بەرزی خۆیان بسەلمێنن... قارەمانی هۆمیرۆسی هەمیشە لە مردنەوە نزیکە، بەڵام ئەمە ژیانیان لەبەر چاو ناخات، و بە جۆرێ دەچنە شەڕەوەو بەشداری شەڕ دەکەن لە تۆ وایە هەتا هەتایە دەژین... بەڵکو بە پێچەوانەوە بیرۆکەی مردن، هێندە قارەمان سەر سەخت و درو دڕندە دەکات تا بەزووترین کات بگاتە ئاواتەکانی، ئەمە لە روانگەی هۆمیرۆسەوە جیاوازی جەوهەری نێوان خواوەندان و بەشەرانە، هەڵبەتە بە گوێرەی ئیلیادە و ئۆدیسە. خواوەندان سەرسەخت و سەختگیر و دڵرەقن بەڵام بیر لە مردن ناکەنەوە، بەشەران هەمان خەسڵەت وسیفەتیان هەیە بەڵام هەمیشە بیر لە مردن دەکەنەوە.. بەڵام وێرای ئەمەش بەشەر لەکن هۆمیرۆس باوەڕیان بەدنیای پاش مردن نیە، لە دوای مردن بەشەر تارماییەکی کز ولاوازی بێ ژیان و گیانە. واتە مردن لە خودی خۆیدا تەواو دەبێ، پردی پەڕینەوە بۆ جیهانێکی جیاتر و باشتر نیە.. چونکە ژیانی بەشەر کورتە، قۆناغێك نیە کە بیگەیەنێتە ژیانێکی چاکتر، جا سیحری ژیانی بەشەر لە مەدایە، بۆ یە لە سەرێتی، هیچ دەمێکی ژیانی خۆی بەفیڕۆ نەدات و لە رێگەی کارو کردەوەکانیەوە ناوبانگ و شۆرەت و سەرفرازی و شکۆو نەمری بە دەست بێنێ و هەرگیز بە زەبوونی وملکەچی و سەرشۆڕی قاییل نەبێ، و مردنی سەربەرزانەی پێ باشتر بێ لە ژیانی سەر شۆڕی. قارەمانی راستە قینە ئەوەیە رووبەرووی مەترسیان بێتەوە و لە ڕای سەربەرزی خۆیدا، ژیانی لا هەرزان بێ و لە مردن نەترسێت.. جا بە شەڕی ناوئیلیادە و ئۆدێسە لە سەرێتی قارەمانانە بژی، قارەمانانە بمرێ، ئەگەر وا نەکات بە قارەمانی راستەقینە نا ژمێردرێت، جا بەم پێودانگە خواوەندان، نەك هەر قارەمان نین، بەڵکو هەرگیزیش نابن بە قارەمان، وەکو چۆن قارەمانانیش هەرگیز ناتوانن رۆژێ لە رۆژان ببنە خواوەندان، ئا ئەمەیە پەیوەندی و جیایی نێوان قارەمانان و خواوەندان لە ئیلیادە و ئۆدیسەدا.

(٨)

هۆمیرۆس، لە هەردوو داستانەکەیدا، لایەنی چاکەو خراپەی جەنگی بەرجەستە کردووە، ئەو لەزەتە روحی و ئۆخژنە دەروونیەی سەرکەوتن لە شەڕا بە بەشەری دەبەخشێت، هونەرمەندانە لە پاڵ هەموومەینەتی وخەم وکارەساتەکانی شەڕدا وێنەگیراوەو بەرجەستە کراوە، ئەمە زۆر بە زەقی لە وێنەگرتنی هاوسەرەکەی هیکتۆر و ئەندامانی ماڵباتەکەیدا دەردەکەوێت، ئەگەرچی ئەمانە ناتوانن ببن بە شەریکی شکۆو سەرکەوتنەکانی، بەڵام سەلامەتی و مانی خۆیان بە سەلامەتی و مانی ئەوەوە بە ستووە، ئەندرۆماکی ژنی سوور دەزانێ هیکتۆر دەکوژرێ، هیکتۆر باسی ئەمەی لەگەڵدا ناکات چونکە هەردوکیان بە دڵنیاییەوە ئەمە بەسەرچاوەی کڵۆڵی و نەگبەتی مناڵە ساواکەیان دەزانن... هەر چەندە هۆمیرۆس بەر لە رووخان و وێران بوونی تەروادە کۆتایی بە ئیلیادە دێنێ، بەڵام بیرۆکەی روخانی تەروادە و ئاکامە خراپەکانی ئەو رووخانە، وەکو تاپۆیەك، لە سەرانسەری پاژەکانی ئیلیادەدا، بەسەر سەری تەروادەییەکانەوە لە باڵەفرەدایە... لە ئیلیادەدا تەروادە تاقە شار نییە کە بەسەر پاشاکەیدا وێران دەکرێت، بەڵکو پێشتریش، تیبەی زاگەی (ئەندروماك)ش بە دەستی ئەخیل وێران دەکرێ و بابی ئەندروماك و هەر حەوت براکەی دەکوژرێن. هەروەها (پریسیس)ش بە چاوی خۆی کوژرانی مێردەکەی وسیان لە براکانی بە یەك رۆژ، دەبینێ..جا هۆمیرۆس لەم بارەیەوە هونەرمەندانە ئەوەی نیشان داوە کە گەورەترین شکۆو سەربەرزی، لەسەر حیسابی نەگبەتی و ماڵوێرانی خەڵك و خەڵکانی دی دەبێت. ئەوەتا هۆمیرۆس لە ئاخرو ئۆخری ئیلیادەدا، جەخت لەسەر ئەو بیرۆکەیە دەکات و بەزمانی (ئەخیل)ەوە دەڵێت دوو گۆزە لە مەڵبەندی (ئولیمبۆس) دا هەیە، یەکێکیان خێری تیایە و ئەویتریان شەڕ، زیوس بەخۆی قرێر دەدات چۆن دابەشی دەکات، کێ خێری بەردەکەوێت و کێ شەڕ! جا باشترین بەش ئەو بەشەیە کە تێکەڵەیەك بێ لە هەردوو گۆزەکە، کە ئەمە زۆر بەکەمی روو دەدات. و ژیانی بەشەر بەزۆری هەر شەڕو شومییە، ئەگەر چی دەوری خۆیشی تێدایە.

راستە هۆمیرۆس لە ئیلیادە و ئۆدیسەدا بایەخی زۆری بە شەڕو دژمنایەتی و کوشتار داوە، لێ ئاشتی و دۆستایەتی و خۆشەویستیشی فەرامۆش نەکردووە... چونکە دنیای هۆمیرۆس، بەر لە هەر شتێك جیهانێکی بەشەرییە، بەشەریش تێکەڵەیەکە لە بوغزو کینەو ڤیان و خۆشەویستی و شەڕ و ئاشتی... رەنگە گەشترین نموونەی دۆستایەتی،

دۆستایەتی نێوان ئەخیل و پاترۆکلۆس بێ، کاتێ پاترۆکلۆس دەکوژرێ، ئەخیل یەجگار خەمین و خەمبار دەبێت، بەڵام هەر بە خەمبارییەوە ناوەستێ، بەڵکو زۆر شێتانە تۆڵەی هاوڕێکەی دەکاتەوە، هەر بەوەش داناسەکنێ کە بکوژی هاوڕێکەی بکوژێتەوە، بەڵکو هەر کاتێ خەم دایدەگرێ‌و هاوڕێکەی بیر دەکەوێتەوە، جەنازەی بکوژەکەی دەخاتە دوای عەرەبانەکەی و بە عاردی دا رایدەکێشێت و بە دەوری قەبرەکەی (پاترۆکلۆس)دا دەیگێڕێ. بە هەر حاڵ ئەوەش چاری خەمی دڵی ناکات، و تەنیا مەرگ فریای دەکەوێت و لە خەمی رەها دەکات و دەحەوێتەوە.

هەروەها هۆمیرۆس، بە شێوەیەکی نا راستەوخۆ ئاماژە بۆ بنەماکانی دۆستایەتی نێوان دوو کەس دەکات. سەبارەت بە ئەخیل و پاترۆکلۆس دەبینین هەموو هیواو ئاوات و خۆزیاکانیان چوون یەکە، داخوازییەکانیان لە ژیاندا وەکو یەکە. لە یەکدی حاڵی دەبن، متمانەی تەواویان بە یەکترە. ئامادەن لە پێناوی یەکدیدا خۆ بەخت بکەن. ئەوەتا پاترۆکلۆس خۆی لە پێناوی ناوبانگی ئەخیلدا بەخت دەکات. چونکە دوورە پەرێزی ئەخیل لە شەڕ دەبێتە مایەی شکستی سوپای گریك، بەڵام ئەو دوورە پەرێزییە، جۆرە نارەزاییەك بوو دژی ئەو سوکایەتییەی ئاگامەمنون بە ئەخیلی کردبوو. بۆیە بەشداری پاترۆکلۆس لە شەڕدا، بە چەکی ئەخیل و بە جەنگاوەرانی ئەخیل، سوپای گریکەکانی کڕییەوەو هەستاندەوە لەلایەکەوەو گیانی نارەزایەتی (ئەخیل)یشی رازی کرد... دیارە پەیوەندی نێوان کلاوکوس و سار پیدون)ش لە بەرەی تەروادەییەکاندا نموونەیەکی دیکەی دۆستایەتییە... ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەسێك ئەرکی دۆستایەتی ئەنجام نەدات ناشێت بە قارەمانی راستەقینە بزانرێ.. دیارە هۆمیرۆس لە مەسەلەی دۆستایەتی‌و ڤیاندا، خۆشەویستی نێوان پیاو و ژنیشی فەرامۆش نەکردوە، ئەو خۆشەتویستییە لە روانگەی هۆمیرۆسەوە دوو جۆرە، خۆشەویستیەکی نا بەجێ و سەرڤەسەرڤەی رەوتەنی. کە لە هەلومەرجێکی نارەواو نا شەریفدا چێدەبێت، خۆشەویستییەکی خاڵیسە و پەسند و حەڵاڵ و زوڵاڵی زادەی ڤیان و دڵسۆزی نێوان ژن و مێرد... خۆشەویستی بازاڕی و رەوتەنی، کاریگەرییەکی خراپی لەسەر ماشوق و لەسەر کۆمەڵگە دەبێت، نموونەی ئەمەش، خۆشەویستی پاریس و هیلینە... هەر چەندە هۆمیرۆس نەهاتووە هیلین وەکو ژنێکی خەتاکارو سووك و بازاڕی نیشان بدات، بەڵام وای لێکردووە بۆ بەختی رەشی خۆی دەگری و پەشیمانە لەو ژیانەی کەتێی کەوتووە. هەروەها(پاریس)ش لە ئیلیادەدا ئەو

خۆشەویستە نیە، بەڵکو زۆر جار لە لایەن هیکتۆری برایەوە سەرکۆنە دەکرێت و بەوە تاوانباری دەکات کە دەورێکی پیاوانە لە شەڕەکەدا نابینێ. نموونەی خۆشەویستی پاك و بێگەرد، خۆشەویستی نێوان هیکتۆرو ئەندروماکە.. هەردووکیان تا رادەی پەرستن یەکتریان خۆشدەوێ و ڕێزو حورمەتی یەکدی دەگرن..هۆمیرۆس هاتووە لە سروودی شەشەمدا، چەند وشەیەکی کەمی خستۆتە سەرزاری ئەندروماك و رادەی خۆشەویستی و دڵسۆزی ئەندروماکی بۆ هیکتۆر نیشانداوە کە دەڵێت: ئەی هیکتۆر تۆ بۆ من هەموو شتێکی، بابی میهرەبان، دایکی جوان، برای دڵسۆز، و مێردی ئازاو سەنگینی... هیکتۆریش هەر چەندە لە پێناوی تەروادەو خەڵکی تەروادەدا دەخەبتێ، بەڵام هەندێ جار ئەوەش دەردەبڕێ کە ئەندروماك بە تەنێ هاوتای هەموو تەروادە و خەڵکی تەروادەیە بۆ ئەو...

بەو جۆرە دەبینین لە دنیای ئیلیادەو ئۆدیسەدا شان بەشانی شەڕو دوژمنایەتی و کوشتار، دۆستایەتی و خۆشەویستی و ڤیانیش هەیە. خۆشەویستی رەگەزو توخمێکی هەرە سەرەکییە لە ژیانی مرۆڤدا... رەفتاری نەرم و نیان دەکات، باری مەینەتیەکانی لەسەر شان سووك دەکات. لە توندو تیژی دوور دەخاتەوەو پتر بەلای بونیادنانی ژیاندا دەڕوات تا وێرانکردنی. چونکە تەنیا خۆشەویستی ژیان لە دڵی بەشەردا شیرین دەکات.

(٩)

خوێنەر لەم داستانە نەمرەدا تووشی شێوازێك دەبێت رەنگە جیاواز بێ لە هەموو ئەو شێوازە ئەدەبیانەی لە کارێن ئەدەبی دیکەدا تووشی بووە، لە شێوازی ئیلیادەدا دووبارە کردنەوەیەکی زۆر، دەربڕین و دەستەواژەی ناساز، هزرینی سادەو سەرەتایی، هەڵبەتە پڕ بە پێستی ئەقڵیەتی باوی سەردەمی هۆمیرۆس بەدی دەکرێت، هزرین و ئەقڵیەتێك کە حەقیقەت و خورافات، واقیع و خەیاڵ ئاوێتە دەکات، خواوەند لە شێوەی بەشەردا وێنە دەگرێت ، خواوەندان زەماوەند لەگەڵ بەشەران دەکەن، بەشەران یەزدانخانمان دەخوازن، قارەمانانی داستانەکە هەندێکیان منداڵی بەشەری و هەندێکیان منداڵی ئاسمانی و خواییان لێدەکەوێتەوە!...

هەندێ نموونەی ئەم دەستەواژە سەیرو ناسازانە کە لە زۆربەی لاپەڕەکانی ئیلیادەدا دووبارە دەبێتەوە، دەستەواژەی (ئەخیلی لەزگین، یان گورج و خۆشڕۆ، ئەپۆلۆی دوور ئەنگێوە، گریکانی سەراپا چەکدار، هیرای باسك سپی، ئاخیانی چەك برونزین.. زیوسی هەورەوان، پۆسیدونی زەوی هەژێن... هتد)

ئیلیادە، بۆ ماوەی نزیکەی پێنج سەدە، داستانێکی زارەکی بووەو شایەران بەگیتارو گۆرانییەوە گوتویانەتەوەو دەماو دەم هاتووەو لەوەیشومەی رۆژگار پارێزراوە، تا لە سەدەی پێنجەمی پ.ز (پێش زایین) بیزیستراتوس لیژنەیەکی تایبەتی بۆ تۆمار کردنی پێك هێناو لیژنەی ناوبراو دوای گەڕان و پشکنێکی ورد، بە ئەمانەتێکی زۆرەوە تۆماری کردو لە ئاهەنگێکی نیشتمانی گەورەدا، بە دەنگ و ئاوازەوە خوێنرایەوەو ئیدی بوو بەم ئیلیادەیەی کە ئەمڕۆکە بە هەموو زمانە زندووەکانی جیهان هەیەو تا رۆژگاری ئەمڕۆ دەخوێنرێتەوەو ئیلهامبەخشی دەیان و سەدان شاکاری ئەدەبی جیهانیە.

گوتمان قارەمانان و کاراکتەرانی ئیلیادە، تێکەڵەیەکە لە بەشەرو خواوەندان. لە بەشەرەکان: پاریس و هیکتۆر، کوڕانی شای تەڕوادە... مینیلاوسی دوژمنیان، شای سپارتە، ئاگامەمنونی برای مینیلاوس، کە سەرداری سوپاکەی بوو... لە خوداوەندەکانیش: زیوس، سەردارو گەورەی خواوەندان، ئەتینا، کیژی زیوس.. ئەوجا ئەخیل، دیارترین قارەمانی سوپای ئاگامەمنون، و هیلین، هاوسەری شای سپارتە، کە شەڕی تەڕوادە لەسەر ئەو هەڵگیرسا... جا ئێستا و بەر لەوەی بکەوینە خوێندەوەی دەقەکەی هۆمیرۆس با بەسەر چڵی گەشتێکی بلەز بە جیهانی ئەفسانەیی ئەو قارەمانانەدا بکەین و بەسەر کێشییەکانی ئەوان چ لە واری ڤیان و خۆشەویستی و چ لە واری شەڕو کاولکاریدا، ئاشنا ببین.

پوسیدون، خواوەندی دەریا، پەرییەکی دەبێت بە ناوی (تیتیس)، (زیوس)ی سەردارو گەورەی خواوەندان دەیبینێ و دڵبەندی دەبێت.. لێ لە قەدەرو غەیبەوە ئەوە دەزانێ کە ئەم پەرییە کوڕێکی دەبێت زۆر لە بابی خۆی گەورەتر دەبێت.. ئیدی زیوس لەترسی پایەو شوێنەکەی خۆی ناوێرێ توخنی تیتیس بکەوێ!... ئیدی بڕیار دەدات دەستبەرداری بێ و نایخاتە ریزی ماشوقەکانی خۆیەوە... بەڵکو دەیدات بە پاشای شارێکی دراوسێ.. بەڵام شایی و زەماوەندێکی یەجگار گەورە و بەرەونەقی بۆ ساز دەدا، زیوس بە خۆیشی بەشداری ئاهەنگی زەماوەندەکە دەکات، هیرای ژنیشی دەگەڵ خۆدا دەبات، هیرا خواوەندی کاری خێرێیە (ژن و ژنخوازی)... خواوەندانی دیکەی (ئۆڵەمپ)ش بەشداری دەکەن... خواوەندی دەریا، بابی بوکێ، بە ئانقەست یەزدانخانمی فیتنە و دووبەرەکی بۆ زەماوەندی کیژەکەی دەعوەت ناکات، بەڵام ئەو نێرەنگبازە خۆی دەگەیەنێتە زەماوەندەکە، لێ لە هەرەمەی ئاهەنگەکەدا، سێوێکی زێڕ هەڵدەداتە ناوەندی ئاهەنگ

دێڕان، که له سه‌ری نووسراوه: ئه‌مه دیارییه بۆ جوانترین مێوینه‌ی ناو ئه‌م زه‌ماوه‌نده‌!.. سێ که‌س له‌سه‌ر سێوه‌که لێیان ده‌بێ به کێشه: هیرا، خواوه‌ندی کاری خێزێ، ئه‌تینای کیژی، خواوه‌ندی هۆشمه‌ندی و ژیری، ئه‌وجا ئه‌فرۆدێت،خواوه‌ندی ڤیان و خۆشه‌ویستی. هه‌ر یه‌کێك له‌وانه خۆی به شایسته‌تر ده‌زانێ و پێی وایه ده‌بێ سێوه‌که بۆ ئه‌و بێ!... هه‌ر یه‌کێك له یه‌زدانخانمه‌کان ده‌که‌ونه به‌ره‌یه‌ك و موریدانی خۆیان لێ خڕ ده‌بێته‌وه، زۆری نامێنێ شایی ببێ به‌شین و مه‌یدانی شه‌ڕێ! ئه‌وه بوو ئاماده بووان پێشنیازیان کرد ئه‌م شه‌رعه ببڕێته ده‌ف شوانکاره‌یه‌کی قۆزو جوان، ناوی پاریسه، له‌و نزیکانه و له‌بناری چیای ئیدادا خه‌ریکی له‌وه‌ڕاندنی په‌زه‌کانیه‌تی.

راسته پاریس به شوانکاره‌یی ده‌ژیا وشوان بوو، به‌ڵام کوڕی گه‌وره‌ترین شاو شابانۆی ئه‌و ده‌ورو زه‌مانه بوو، کوڕی پریام و هیکۆبای شاو شابانۆی ته‌رواده بوو!.. کاتی خۆی که مندال ده‌بێ، فالچییه‌ك پێشبینی ئه‌وه ده‌کات که ده‌بێته مایه‌ی وێرانی ولاته‌که‌ی، ئیدی داك و بابی، لێده‌برێن له پێناوی ته‌رواده‌دا پێ له جگه‌رگۆشه‌که‌یان بنه‌ن، له قه‌د پالی چیای لیموتدا فرێی ده‌ده‌ن... به‌ڵام ته‌گبیر له‌گه‌ل ته‌قدیرا تێك ناکاته‌وه‌و شوانکاره‌یه‌کی هه‌ژاری بێنه‌وا ده‌یدۆزێته‌وه‌و هه‌لیده‌گرێته‌وه‌و ده‌یکات به کوڕی خۆی و به‌خێوی ده‌کات!... پاریس گه‌وره ده‌بێ، هێنده قۆزو جوان ده‌بێ، هه‌ر هه‌موو په‌ریانی ده‌ریاو ئافره‌تانی شوان، دلبه‌ندی ده‌بن.. به‌ڵام پاریس حه‌ز له په‌رییه‌ك ده‌کات به نێوی (ئوینون)، هه‌ردووکیان زۆر به خۆشی له بناری چیای ئیدادا راده‌بوێرن...

رۆژێك هه‌ر سێ یه‌زدانخانم، که له‌سه‌ر سێوه‌که کێشه‌یان بوو، دێنه لای، سێوه‌که‌ی ده‌خه‌نه به‌رده‌ست و داوای لێده‌که‌ن به عه‌داله‌ت شه‌رعیان بکات و سێوه‌که بدات به‌و که‌سه‌ی شایسته‌یه‌تی... ئه‌وجا یه‌زدانخانمه‌کان بێ هیچ شه‌رم و شکۆیه‌ك که‌وتنه هه‌ولی ئه‌وه‌ی ته‌ماحی بخه‌نه به‌رو هه‌ر که‌سه‌و به‌لای خۆیدا رایکێشێت تا سێوه‌که بدات به‌و، ئه‌وه بوو هیرا به‌لێنی دایه که ده‌سه‌لات و ده‌وله‌مه‌ندی ده‌داتێ.. ئه‌تینا به‌لێنی شۆره‌ت و ناوبانگی جه‌نگی دایه... لێ ئه‌فرۆدێت به‌لێنی دایه که جوانترین ژنی سه‌ر رووی زه‌وی بکات به هاوسه‌ری... ئه‌وه بوو ته‌ماحی ژن گرتی و سێوه زێڕینه‌که‌ی (سێوی جوانی)دا به خواوه‌ندی ڤیان و ئاشقێنی.

له‌و سه‌رو به‌ندو رۆژگاره‌دا شای سپارته ژنێکی ده‌بێ به‌ناوی (لیدا)، زیوس، سه‌ردارو گه‌وره‌ی خواوندان ته‌ماحی تێده‌کات، ئیلاقه‌ی ده‌کات،کیژو کوڕێکی ئاسمانی لێده‌خاته‌وه،

پێچ و دوڕێکی بەشەریشی لە مێردەکەی خۆی دەبێت... وختێ ئەم چوارە گەورە بوون کیژە بەشەریەکە شوو بە ئاگامەمنون ، پاشای (مسینا) دەکات و دەبێتە مایەی کارەساتێن گەورە بۆ مێردەکەی.. بەڵام کیژە ئاسمانیەکە (خواییەکە) کە(هیلین)ی ناو دەبێت، مینیلاوس، برای ئاگامەمنون دەیخوازێت، و لە هەمان کاتدا دەبێ بە میراتگری عەرشی سپارتە، واتە لە یەك کاتدا هەم دەبێ بە خودانی دەسەلاٚت و هەم ژنی جوان!

ئیدی پاشای سپارتە کە پیاوێکی پیری دنیادیدە دەبێت، هەست دەکات کە مێردی هیلین، کە جوانترین ژنی سەر رووی زەمین دەبێت، بەهۆی ئەو هەموو جوانیەی ژنەکەیەوە، حەسوودی پێدەبرێت و تووشی گێچەڵ و کێشە دەبێت... بۆیە بەر لەوەی هیلین بدات بەشوو، هەر هەموو ئاشقانی هیلین کۆ دەکاتەوەو پێشنیاز دەکات، کە هەر هەموویان سوێندی گەورە بخۆن و لە قسەی ئەم دەرنەچن، سوێند بخۆن کە ئەگەر هیلین بە نسیبی هەر کەسێکیان بوو، ئەوانی دی بە هیچ جۆرێ شەڕی پێ نەفرۆشن، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ئەگەر ئاشقێکی حەسودیش رفاندی و هەڵیگرت ئەوا هەمووان بەگوێرەی ئەم سوێندە بچنە هیمدادی و ژنەکەی بۆ وەربگرنەوە!.. وەکو دیارە هەر ئەمەش مایەی هەڵگیرسانی شەڕی تەروادە بوو!.

ئەوە بوو هیلین شووی بە مینیلاوس کرد، کە بوو بە پاشای سپارتە، ئەم ژن ومێردە ساڵانێکیان بە خۆشی رابوارد... رۆژێك میرێکی گەنج لە میرانی تەروادە دەبێ بە میوانیان... تومەز ئەم میرە (پارس)ە کەی لەمەڕ خۆمان دەبێ، ئەوەی کە سێوەکەی (سێوی جوانی) دابوو بە ئەفرۆدێت، کە بەڵێنی جوانترین ژنی سەر رووی زەمینی دابویە.. ئافرۆدێت، بۆ وەی قسەی خۆی بەرێتە سەر، پێی دەڵێ کە بگەڕێتەوە بۆ کۆشکەکەی بابی لە تەروادە و خۆی پێ بناسێنێ و چەند کەشتییەکی لێوەرگرێ تاسەفەری دەریایی بەرەو یۆنان بکات، کە هیلینی جوانترین ژنی سەر رووی زەوی لەوێندەر نیشتەجێیە.. بۆ نەگبەتی، ئەو ژنە جوانەی کە ئافرۆدیت بەڵێنی دابوو، بە مێرد بوو!.. بەڵام خۆ یەزدانخانمێك ناچێت بۆ تەگەرەیەکی ئەوها بچووك خۆی بە درۆ بخاتەوە!.. ئیدی بەو جۆرە میری تۆلاز، پاریس، بە هاندانی خواوەندی ڤیان و ئاشقێنی، لە دەرفەتێکدا کە مینیلاوس لە کۆشك و سەراکەی نابێ، حیزفرسەتانە ژنەکەی هیلین بۆ تەروادە دەرفێنێ و رەدووی دەخات!.

هەڵبەتە ئەمە خیانەتێکی نا مەردانە بوو، چونکە خانەخوێیەکەی زۆر بە گەرمی

میوانداریی‌یه‌کی شایسته‌و به‌شکۆی کردبوو، زۆری حورمه‌ت و ڕێزگرتبوو!.. کاتێ له‌ سه‌فه‌ره‌که‌ی ده‌گه‌ڕێته‌وه‌، به‌ هه‌واڵی هه‌ڵاتنی ژنه‌که‌ی ده‌زانێ، خێرا ته‌ته‌ران به‌ڕێده‌کات بۆ لای هه‌موو کۆنه‌ ئاشقان و خوازبێنیکه‌رانی هیلین و سوێنده‌کانیان بیرده‌خاته‌وه‌ که‌ چۆن ده‌بێ له‌م حاڵه‌ته‌دا به‌هانایه‌وه‌ بێن و به‌رگری لێبکه‌ن!.. هه‌موو به‌له‌ز لێی خڕبوونه‌وه‌... ده‌م سپی و ردێن سپی و شیره‌تکارانی خێڵ‌و عێ‌ن کۆکرانه‌وه‌، تا راو ته‌گبیری خۆیان له‌مه‌ڕ ئاکام و ئاقیبه‌تی ئه‌م شه‌ره‌ ده‌ربڕن که‌ له‌و کێشه‌یه‌ ده‌که‌وێته‌وه‌... ئیدی هه‌موو به‌یه‌ك ده‌نگ بڕیار ده‌ده‌ن که‌ ئاگامه‌منون، مێردی خوشکی هیلین، و برای مێردی هیلین، واته‌ مینیلاوس بکرێ به‌ سه‌رداریان، له‌و شه‌ڕه‌دا که‌ له‌ ڕێیانه‌... به‌ڵام یه‌کێك له‌ ئاماده‌بووان، که‌ (ئودیسیوس)ی به‌رده‌بارو ئاقڵ، پاشای هه‌رێمێکی دراوسێیان ده‌بێ، پێشنیاز ده‌کات، که‌ (ئه‌خیل)ی قاره‌مان و نه‌به‌زیش له‌ بیر نه‌کرێ‌و بهێنرێته‌ ریزه‌وه‌، ئه‌خیل کوڕی ئه‌و په‌رییه‌ بوو که‌ پێشتر باسی زه‌ماوه‌نده‌که‌یمان کرد.. ئه‌خیل ئه‌و که‌سه‌ بوو، که‌ به‌پێی قه‌ده‌ر و چاره‌نووس له‌بابی گه‌وره‌تر ده‌بوو!.. جا ئه‌خیل له‌ زۆر ئه‌فسانان‌دا ناوی هاتووه‌و ره‌نگه‌ گه‌وره‌ترین کاراکته‌ری چیرۆکانی خه‌یاڵی بێ. به‌پێی ئه‌فسانان، کاتێ قه‌ده‌ر له‌ زه‌ماوه‌ندی داك و بابیدا ئاماده‌ ده‌بێت، پێشبینی ئه‌وه‌یان بۆ ده‌کات که‌ کوڕێکیان ده‌بێت شه‌ڕی ته‌رواده‌ ده‌کات، کورانی ته‌رواده‌یی به‌ زه‌بری رم و شیری ئه‌و ده‌کوژرێن، وه‌کو گه‌ڵای دار له‌به‌ر هێرش و په‌لاماری ئه‌ودا هه‌ڵده‌وه‌رن!.. حه‌سارو قه‌ڵای شاری ته‌رواده‌ له‌به‌ر هێرشی ئه‌ودا خۆ ناگرن و شار ده‌گیرێت، به‌ڵام له‌ ئه‌نجامدا له‌ بن حه‌سارو دیواره‌کانی ته‌رواده‌دا ده‌کوژرێت و گیانی له‌ ده‌ست ده‌دات.

ئه‌م پێشبینییه‌ له‌ هزرو بیری په‌ری خانم، تازه‌ بووکدا، (تیتیس) هه‌ر مایه‌وه‌. که‌ ئه‌خیلی بوو، له‌ خه‌می ئه‌وه‌دا بوو چۆن جگه‌ر گۆشه‌که‌ی له‌ قه‌ده‌ران بپارێزێ و نه‌مری بۆ مسۆگه‌ر بکات.. که‌ هه‌فته‌ی چوو، بردی بۆ ڕوباری پیرۆزی (ستیکس)، تا له‌ ئاوی ڕووباری هه‌ڵکێشێ، چونکه‌ هه‌ر به‌ده‌نێك له‌و ئاوه‌ی به‌ربکه‌وێ ئیدی نه‌مر ده‌بێت و بۆ هه‌تا هه‌تایه‌ له‌ مه‌رگ ده‌خه‌له‌سێت!.. له‌وێ، له‌ پشته‌وه‌ هه‌ردوو پێی مناڵه‌که‌ی گرت و له‌ ئاوه‌که‌ی هه‌ڵکێشا... ئیدی به‌ده‌نی مه‌ناعه‌ی دژی هه‌ر جۆره‌ فه‌وتانێك په‌یدا کرد... ته‌نیا پاژنه‌ی پێی نه‌بێ که‌ به‌ ده‌ستی دایکییه‌وه‌ بوو، و ئاوی ڕووباره‌که‌ ته‌ڕی نه‌کرد، واته‌ ئه‌گه‌ر مه‌رگ زه‌فه‌ری لێ بێنێ، ته‌نیا له‌ پاژنه‌ی پێیه‌وه‌ لێی دێنێ.

کاتێ مناڵه‌، پارچه‌ڵه‌ بوو، له‌سه‌ر ده‌ستی یه‌کێك له‌ زه‌به‌لاحه‌کان مه‌شقی شه‌ڕو کوشتار

دەخاتو مۆخی بە قوەترین شیری دڕندەی دەرخوارد دەدرێت!.. بەڵام دایکی هەمیشە لە دڵەڕاوکێدا دەبێت و هەر چاوەڕوانی هەڵگیرسانی شەڕی تەروادە دەکات، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەقەومێ و سەری کوڕەکەی، ئەخیل دەخوات!.. لە ئەنجامی ئەم ترس و دڵەڕاوکێیە، جلی ژنانەی لەبەر دەکات و بەگەڵ کارەکەران و کەنیزەکانی دەرباری پاشایەتی دەخات!.. بەڵام ئەم فێڵە بەسەر شا (ئۆدیسیوس)ی بەردەبارو زەین تیژدا تێ ناپەڕێ.. ئەویش خۆی دەکات بە چەرچی و شتەکانی، لە بازنگ و مووچەوانە و گوارە، کە خەنجەرو شمشێرێکیانیش بە فێڵ بەگەڵ دەخات، دەخاتە بەر دەستی کارەکەرو کەنیزەکان... بەڵام ئەخیلی لاو، کە خۆی گۆڕیوەو جلی ژنانی لەبەرە، هەر کە چاوی بەخەنجەرو شمشێرەکە دەکەوێ، ڕەفتارێکی وەها دەکات، ئەوە دەردەخات کە شارەزای هونەرێن جەنگیە! بەو جۆرە کەشف دەبێ، ئۆدیسیوس لەگەڵ خۆیدا دەیبات تا بەشداری شەڕی تەروادە بکات، تا هیلین، شابانۆی ئەسپارتە وەربگرنەوەو تۆڵە لەوانە بکەنەوە کە ڕفاندوویانە!.

بەو جۆرە سوپای گریك بەرابەرایەتی ئاگامەمنون سازو تەیار بوو، بە دەریادا بەرەو کەنارێن ئاسیای بچووك – کە شاری تەروادە کەوتووەتە ئەوێندەرەوە- وەڕێ بکەوێ و شەوکەتی شاری تەروادە بشکێنێ... بەڵام لەو دەمەدا کە ئەمان دەیانەوێ بکەونە ڕێ، دەیکات بە گێژەلۆکەو باهۆزێکی ئەوتۆ نەتوانن لەجێی خۆ بجوڵێن.. گێژەلۆکەو باهۆز هەر نەبڕایەوە، ئیدی ناچار بوون بچنە دەف غەیبزان و پێشگۆیان تا تەگبیرێکیان بۆ بکات و ڕێنوێنیان بکات کە چ بکەن تا خواوەندان ڕازی بکەن و ئەم غەزەبەیان لەسەر لابچێ!.. کابرای لێزان پێیان ڕادەگەیەنێ کەهیچ چارێکیان نییە، تەنیا ئەوە نەبێ کیژە گەورەکەی ئاگامەمنون لەسەر سەکۆی قوربانی، لە پێناوی نیشتماندا بکەنە قوربانی! ئەمە حوکمی قەدەرەو لە ئەرزی نادرێ، بۆیە بابی کڵۆڵ ناچار دەنێرێ بە شوێن ژنەکەیدا کە لەگەڵ کیژەکەیدا بێت بۆ ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری، بەبێ ئەوەی پێی بڵێ بۆچی بێت!..

کچ و دایك هاتن... کیژێ دەزگیرانی قارەمانی گەنج، ئەخیل بوو، کاتێ بە فتوای لێزانەکەی زانی بوو، بێهودە هەوڵی دابوو دەزگیرانەکەی لەو چارەنووسە دڵتەزێنە ڕزگار بکات.. بەڵام خەڵکەکە لێی هاتنە دەم و نزیکترین دۆستانی خۆی بە خیانەتی نیشتمانی تاوانباریان کرد!.. خەریك بوو شەڕێکی دژواریان لە نێواندا بقەومێ.. لێ کیژە فریاکەوت و کێشەکەی یەکلاکردەوەو هاواری لە دایکی کرد: ((دایکە، من بیرم لە کارەکە کردوەتەوە، بڕیاری

خۆم داوە، بە دڵ و بەگیان، بە خوایشتی خۆم بەرەو پیری مەرگ دەچم، هەموو ترسێکم لەدڵی خۆدا سڕیوەتەوە! ترسم لە دڵی خۆدا نەهێشتووەتەوە... خواوەندان ژیانی منیان گەرەکە.. داوای خواوەندان ڕەت دەکرێتەوە ؟!... کەواتە ژیانی من با فیدای نیشتمانەکەم بێ... هەرنەپێش بەرەو گرتنی تەروادە... بەو جۆرە کیژی ئاگامەمنون بەرەو پیری مەرگ دەچێت... ئیدی ڕەوت و ئاراستەی گێژەلۆکە و باهۆزەکە دەگۆڕێت، هەزار کەشتی، بەسەر نشینانی گریکییەوە، بەناو ئاوی ڕەشباوی بادە ئاساوە، بەرەو شەڕی تەروادە دەکەونە ڕێ‌و جەنگە بەناوبانگەکەی تەروادە دەست پێدەکات!.

(١٠)

یەکێك لە لایەنە هەرە جوان‌و هونەرییەکانی ئیلیادە، بێلایەنی مامەڵەی شاعیرە دەگەڵ بابەتەکەیدا.. بەسەرهەڵدانی ئیلیادە، ڕەگەزی بێلایەنی نۆڕینی شاعیر بۆ مرۆڤ و ژیانی بەشەر، بە تەواوەتی و بۆ هەمیشە وەکو بنەمایەکی هونەری چەسپی... هەر شیعرێك ئەو ڕەگەزەی (بێلایەنی شاعیر) تیا نەبێت، لەشیعرییەت دەکەوێت‌و دەبێ بە ئامرازێکی سواو بۆ گەیشتن بە ئامانج و مەبەستێکی میناکی: بانگەشە، سەرگەرمی، یان فێرکاری... بەڵام ئەگەر ئەو ڕەگەزەی تیابێ. توانایەکی وەها پەیدا دەکات کە سنووری ڕۆژگاران ببڕێ و بگاتە هەموو شوێن و کاتێك و بە زمانی هونەر سەر لەبەری تیرەی بەشەر بدوێنێ و ئۆخژن بە ناخ و ڕوحی ببەخشێت وەکو چۆن ئەمە لە ئیلیادەو ئۆدیسەدا خۆیایە.

بە هەر حاڵ ئیلیادە، لە زمانی ئەسڵی خۆیدا، بە شیعر هۆنراوەتەوە، شیعریش بوونەوەرو ئافەریدەیەکی هونەری گەلەك تایبەتەو ڕەنگە خەڵکانێکی پسپۆڕو شارەزای واری شیعر هەبن پێیان وابێ کە وەرگێڕانی شیعر، بە شیعر مەحاڵ بێ، یان ئەگەر مەحاڵیش نەبێ، یەجگار سەخت و ئەستەمە و کوڕم گەرەکە کە زات بکات و خۆی لە قەرەی بدات، جا لە وەرگێڕانی شیعردا، وەرگێڕ چەند زەبەردەست و تەنانەت شاعیریش بێ، وەرگێڕانەکەی چوون دەقە ئەسڵییەکە دەرناچێت، وەکو چۆن جمکانەیەك چەندیش لێکدی بچن، هەر فەرقێکیان هەیە، ئەسڵی دەقیش لەگەڵ وەرگێڕانەکەیدا ئاوایە.

هەڵبەتە ئیلیادە بۆ سەر زۆربەی زمانە زندووەکانی دنیا وەرگێڕدراوەو تا ئێستاش بەردەوامە، ئەدیب و نووسەرانێکی زۆری گێتی خۆیان تیا تاقیکردۆتەوە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری وەرگێڕانەکان بە پەخشانە، نەك شیعر. ڕەنگە هۆیەکەی بگەڕێتەوە بۆ ئەو

باری سەرنجەی لەسەرێ را ئاماژەمان بۆ کرد... بە هەرحاڵ وەرگێرانی باشی ئەم جووتە داستانە زۆرن، بەڵام هیچ وەرگێرانێك کامڵ و لە کەم و کوڕی بەدەر نییە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شکۆو جادووی ئیلیادە هەر دیارە.

هەڵبەتە پێتڤیە ئەوەش بگوترێ هۆمێرۆس ئەم شیعرانەی بۆیە هۆنیوەتەوە، بە دەنگو ئاواز و مۆسیقاوە بگێڕدرێتەوە، بۆیە هەندێ دەستەواژەو رستەو پەرەگرافان، بەزەقی و لە زۆر شوێنی جووتە داستانی ئیلیادەو ئۆدیسەدا بەدی دەکرێن، هەروەها هەندێ بۆشایی و درێبێژیش لێرەو لەوێ بەدی دەکرێن، کە هەر هەمووی زادەو بەرەنجامی ئەو واقیعی زارەکیەتەی داستانەکانە، رەنگە خوێنەری تازە ئەوانە بە عەیب و خەوشێك بزانێ کە لە پایەی ئیلیادەو ئۆدیسە کەم بکەنەوە. بەڵام دەبێ ئەوەمان لەبەر چاو بێ کە بەپێوەری ئەمڕۆکە، دەقی شاکارێکی ئەدەبی، بەر لە نزیکەی سی سەدە، نایەتە هەڵسەنگاندن..

بەهەرحاڵ ئیلیادە و ئۆدیسە تا رۆژگاری ئەمڕۆش ئەفسونی خۆیان لەدەست نەداوەو خوێنەرێکی یەجگار فرەیان هەس، ئیلهامبەخشی زۆربەی شاکارە تازەکان و ئەدیبە گەورەکانی جیهانە و سیحری ئەم جووتە داستانە لەوەدایە راستەوخۆ مامەڵە لە تەك تیرەی بەشەرو تەبع و تەبیعەتی بەشەردا دەکەن، بەشەریش لە هەر سەردەم و شوێنێکدا هەر بە شەرە.

جا خوێنەری هێژا، ئەم پێشەکییە هەر چییەك و هەر چۆنێك بێ، ئەلتەرناتیڤی دەقەکە نیە، ناتوانێ هەمان سوودو لەزەتی خوێندنەوەی راستەوخۆی دەقەکەت بداتێ، بۆیە لەوەی پتر لەسەری نارۆم، و لە لەزەتی خوێندنەوەی دەقی ئەم داستانە ئەدەبییە نەمرە مەحرومت ناکەم، کە لە ساڵی نۆیەمی گەمارۆی تەروادە لەلایەن ئارگۆسیەکانەوە (گریکەکان) دەست پێدەکات، فەرموو ئێوەو دەقەکە.....

حەمە کەریم عارف

سلێمانی

٢٠٠٨/٩/٢٤

# تێبینی:

بۆ نووسین و ئامادەکردنی ئەم پێشەکییە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١- هومر، چسپرگریفین، ترجمه: عبدالله کوثري، چاپ اول: ١٣٧٦، مامۆستای ئەدیب جەلال زەنگابادی ئەم سەرچاوەیەی دامێ سوپاسی دەکەم.
٢- هۆمیرۆس، شاعر الالیادة والاودیسا، بقلم الدکتور عبدالمعطي شعراوي، الهیئة المصریة العامة للتالیف والنشر، ١٩٧١.
٣- ئەلیادە و ئۆدیسە، و: شاکیر فەتاح، بەغدا، ١٩٨٣.
٤- فرهنگ اساطیر یونان و رم، ژوئل اسمیت ترجمه: شهلا برادەران خسروشاهی، ١٣٨٣.
٥- اساطیر یونان، ف. ژیران، ترجمه: دکتر ابو القاسم اسماعیل پور، ١٣٨٢.
٦- قهرمانان یونان باستان، ڤیرا سمیرنوڤا، مترجم: روحی ارباب تهران، ١٣٨٢.
٧- الالیادە: هومیروس، ترجمها عن الاصل الیونانی المقارن: امین سلامه.
٨- ایلیاد، شاهکار، هومر، ترجمه: سعید نفیسی، چاپ سوم: ١٣٨٥.
٩- هومیرۆس، الالیادە، ترجمه حنا عبود، دار الحقائق، گ١، ٢٠٠٧.
١٠- ایلیاد، هومر، ترجمەی میر جلال الدین کزازی، چاپ پینجم ١٣٨٥.
١١- ئەفسانەێن گریکی و رومانی، گریس . ە. کوپف. و: حەمە کەریم عارف کتێبفرۆشی سۆران، چاپی یەکەم: ٢٠٠٤.
١٢- زارۆکستان، پێنج کتێب لە یەك بەرگدا، چاپی یەکەم، ٢٠٠٨، خانەی وەرگێڕان، سلێمانی، و: حەمە کەریم عارف.

# ناوی کاراکتەرە سەرەکییەکانی داستانی ئیلیادە

١- گروپی گریکەکان:

ئەمانە لە داستانەکەدا بە (ئاخیایی، ئارگۆسی، دانیایی)ش ناوبراون.

ئوترایدس (کوڕی ئوتریوس) :ناوی ماڵباتی (ئاگامەمنوون ومینیلاوس)ە.

ئاگامەمنوون:فەرماندەی سوپای گریکە.

ئەخیل:کوڕی بیلیوسە.دایکی (تیتیس)ی ناوە، لە خواوەندان و پەرییانی دەریاییە. ئەخیل ئازاترین جەنگاوەری ئاخیاییەکانە.

ئودیسیوس (عولیس،ئولیس) : پاشای ئیتاکیایە لە یونان.

ئیدومینیوس: یەکێکە لە فەرماندەکانی ئاگامەمنوون.

مینیلاوس: (کوڕی ئوتریوس) :پاشای ئەسپارتەیە. مێردی هیلینە، برای ئاگامەمنوونە.

هیلین: کیژی زیوسە، ژنی مینیلاوس بوو، خوشکی (کلوتمنسترا)ی ژنی ئاگامەمنوونە.

٢- گروپی تەروادەییەکان:

ئەندرۆماك (ئەندرۆماخی) :ژنی هیکتۆری کوڕی پاشای تەروادەیە.

پاریس (ئەلکساندەر) :کوڕێکی دیکەی پاشای تەروادەیە.

پریام: پاشای تەروادەیە.

هیکتۆر: کوڕی پاشای تەروادەو سەرداری سوپای تەروادەیە.

٣- گروپی خواوەندان :

ئەپۆلۆ :(کوڕی زیوس)ەو لە (لیتو)یە. هەندێ جار (فوییبوس ئەپۆلۆ)شی پێدەگوترێ. خواوەندی پێشبینی وشیعرو مۆسیقایە. بە تیرەندازی و دوورئەنگێوەیی بە ناوبانگە.

ئەتینا: کیژی زیوسە. خواوەندی حیکمەت و هونەرانە.

ئەریس: خواوەندی جەنگە.

ئەفرۆدێت: خواوەندی ڤیان و جوانییە.

بوسایدون (پۆسیدون) : خواوەندی دەریایە، کوڕی کرونوسە، برا بچووکی زیوسە.

بینتیس: کیژی پوسیدونه، دایکی ئەخیلە.

زیوس: سەردارو گەورەی خواوەندانە، کوڕی کرونوسە، دایکی نێوی (ریا) یە

کرونوس: بابی زیوس، پوسیدون، هادیس،وهیرایە.جاران پاشاو گەورەی ئاسمان بوو،زیوسی کوڕی دەریکردو خۆی چووە شوێنی!.

لیتو: کیژی کرونوسە، ماشوقەی زیوسە،و دایکی ئەپۆلۆیە.

هادیس: کوری کرونوسە،خواوەندی مردووانە، پاشاو مەزنی جیهانی ژێرینە (دۆزەخ). وەختێ لەگەڵ هەردوو براکەی تریدا (زیوسی خوای ئاسمان و پوسیدونی خوای دەریادا) گەردوونیان دابەش کرد ،جیهانی ژێرین بەر ئەو کەوت.

هیرا: خواوەندی دایکایەتی وکاری خێرێیە، کیژی کرونوسە، خوشك و ماشوقەی فەرمی زیوسە، وشابانۆی ئۆلیمبۆسە.

# سروودی یەکەم

## شەڕی نێوان ئاگامەمنونو ئەخیل

**حیکایەتەکە:**

**گریکەکان، لە کاتی گەمارۆی شاری تەراوەدەدا، پەلاماری شارانی تەراودیەکانیان دەدا، و تالأنیان دەکردو ژنیان بە دیلی دەبردن لەنێو خۆیاندا دابەشیان دەکرد. بریسیسی شۆخ Briseis بەر ئەخیلی فەرماندەی مەرمیدونەکان (گریك) دەکەوێت، و کریسیس chryseisش بەر ئاگا مەمنونی سەرکردەی گشتی لەشکران دەکەوێ. لێ کریسیس، کیژی خریس chrysesە کە فالبین و غەیبگۆی ئەپولۆی خواوەندە لە شاری خریسی chryse؛ کە بە دەست و سەربەهایەکی گەورەوە هاتووە بۆ لەشکرگەکانی گریك تا کیژەکەی وەربگرێتەوە. ئاگامەمونون بە دەستی بەتاڵ وەدەری دەنێ، و ئەویش لە ئەپولۆی خواوەند دەپارێتەوە، ئەپولۆ دوعاکەی گیرا کرد و تاعونی لەنێو لەشکرانی گریك دا بلأوکردەوە ،خەڵکێکی فرەیان لێ مرد. گریکەکان هۆی ئەم تاعونەیان نەزانی، چوون بەدووی (کاڵخاس)ی لێزان دا، ئەویش داوای لە ئەخیل کرد کە بیپارێزێو کەس ئەزیەتی نەدات، ئەخیل بەڵێنی دایێ کە ئەوەی ئەزیەتی دەدا هێشتا لە دایك نەبووە، ئیدی لێزانەکە (عەڕاف) گوتی هۆی تاعونەکە ئەوەیە کە ئاگامەمنون کریسیسی بۆ باوکەکەی نەگێڕاوەتەوە. جا بۆ ئەوەی تاعونەکە نەمێنێ پێویستە کیژەکە بگێڕدرێتەوەو سەد گاو بزنان بکرێ بە قوربانی. ئاگامەمنون تورە بوو و هاواری کرد "ئەی لێزانی شوم، پێشبینیەك ناکەی زیانیی منی تیا نەبێ" ناچار ملی بۆ داواکە دا، بەڵام داوای بریکاری بریسیسنی کرد، ئیدی ئەخیل شێتو هار بوو، لێ لە ئەنجامدا ملیدا تا خەڵی لەم تاعونە کوشندەیە بخەلەسێنێ. زۆری سوو خوارد و کەناری گرت و کەوتە هاوار بۆ دایکی، واتە بۆ تیەتیس (thetis) ئەو خواوەندەی نیشتەجێی ئاوە قوڵەکانی ئۆقیانووسە، ئەو دایکەی دەزانێ تەمەنی کوڕەکەی کورتە، بەرەو پیری هاتو لە حاڵی پرسی، ئەویش سکاڵای کارەکەی ئاگامەمنونی لەلا کرد، داوای لێکرد ئەم سکالأیە بگەیەنێتە زیوس، و**

داوای لێبکات کە پشتیوانی لە تەروادەییەکان بکات تا بەسەر ئاخییەکاندا سەربکەون و توندترین کوشتاریان لێبکەن و لە نێوان لمەلآنی کەنارەکان و کەشتییە بلآوەکانیان لە بەندەرەکانی پشتیانەوە گەمارۆیان بدەن. پێی گوت زیوس و خواوەندان لە ئاهەنگێکی دوورن لە ئەسیوبیا، و تا دوانزە ڕۆژان ناگەڕێنەوە.
لەوکەین و بەینەدا ئاگامەمنون دوو تەتەری نارد و کیژەکەی لەمەڕ( ئاخیل )یان لە خێوەتەکەیەوە هێنا. گاڤێ زیوس گەڕایەوە، تیەتس لە جەرگەی ئۆقیانووسەوە وەدەرکەوت و چوو بۆ ئۆڵەمپ و قسەی دەگەڵ زیوس دا کرد. زیوس بەڵێنی دایێ. ئەویش گەڕایەوە. کاتێ خواوەندان کۆبوونەوە، هیرای ژنی زیۆس کەوتە دواندنی و تاوانبار کردنی بەوەی کە دژی ئاخییەکان دەوەستێ، ئەو ئاخییانەی ئەم بە بارتەقای ڕقی لە تەروادەییەکانی خۆشی دەوێن، کەوتە هەڕو گیف لێی، هیفستوتسی کوڕیان کە ئاسنگەرێکی مەعلان بوو کەوتە بەینەوە و بە دایکی گوت کە ئەگەر زیوسی خواوەند غەزەبی لێ بگرێ. هیچ کەسێك لە ئاسمانا زات ناکات فریای بکەوێ، بەخۆی لە بیریەتی ئەو ڕۆژەی کە هیفستوس تەدەخولی کرد چۆن لەلاقی نەوی و لە ئاسمانێرا بەرەو دوڕگەی لیمنوس-ی توڕداو لەنگی کرد. و داوای لە دایکی کرد کەمدارای بکات و دڵخۆشی بکات، و پەرداخێك شەرابی نکتاری دایێ، ئۆڵەمپ نقومی بادەنۆشی و خواردنەوە بوو، ئەپولۆ کەوتە ژەنینی گیتارەکەی، خواوەندانی هونەر بە نۆرە کەوتنە سترین تا ئێوارە داهات، و هەر خواوەندێك چوو بۆ ئاسایشگەی خۆی، ئەو ئاسایشگانەی کە هونەرمەند هیفیستوس، ئاسنگەری خواوەند، لێهاتوانەو وەستایانە دروستی کردبوون.
کات: سروودی یەکەم ٢٢ ڕۆژ دەخایەنێ: کارەساتی تاعون نۆ ڕۆژی خایاند، کۆبوونەوەی سەرکردەکان یەك ڕۆژی خایاند، لەو ڕۆژەدا هەردوو سەرکردە ئەخیل و ئاگامەمنون بەشەڕ هاتن. مانەوەی خواوەندان لە ئەسیوبیا دوانزە ڕۆژی خایاند. و مەبەست لە کات، ماوەی گێڕانەوەکەیە.
شوێن:
ڕووداوەکانی ئەم سرووده لە لەشکرگەی گریك دا ڕوودەدەن، پاشان لە شاری خریسی کە (خرییس) ی غەیبگۆ (فاڵچی) سرووتی قوربانی بۆ ئەپولۆ سازکرد. و لە دواییدا دێتە ئۆڵەمپ، کە دایکی ئەخیل لە دەریاوە بۆ ئەوێ سەردەکەوێت، پاشان ئاهەنگی بادەنۆشی کە خواوەندان دوای ئاشتبوونەوەی زیوس و هیرا سازیان کرد، دەست پێدەکات.

(١) بسترینه، بێژه خواوەندی شیعری جوان، لەمەڕ توڕەبوونی ئەخیلی کوڕی بیلیوس بێژە، ئەو توڕەبوونەی پەتای زۆری خستە نێو لەشکری ئاخییەکان. روحی چەندین و چەندین جەنگاوەرانی عەگیدی ڕەوانەی هادیس، خانەی مردووان کرد، و جەستەی چەند قارەمان بوو بە خۆراکی کسۆك

(٥) و دالآن، بەمجۆرە، ویستی زیوس، سەرداری خواوەندانی ئۆڵەمپ، هاتەدی، لەو ڕۆژەوە کە شەڕ لە نێوان ئاگامەمنونی کوڕی ئەتریوس، سەرداری لەشکران، و فەرماندەی مەزن ئەخیل، هەڵگیرسا. کام خواوەند ئەو شەڕەی لە نێویاندا نایەوە؟ ئەپۆلۆی کوڕی زیوس و لیتو بوو، چونکە لە سەرداری لەشکران توڕە بوو.

(١٠) تاعونی ناردە ناو لەشکرو پەتا لە نێو خەڵکیدا بێوبووەوە، چونکە کوڕەکەی ئەتریوس، خریسیسی فالچی و غەیبگۆی ئەپولۆی تەوهین کردبوو و نهو خریسیس هاتبووە لای کەشتی ئاخییەکان تا کیژەکەی بە زێڕ و زیوان ئازاد بکات، سەربەهایەکی مۆڵ و گەورەی لەگەڵ خۆدا هێنا بوو: سەوڵەجان ودارعاساکەی ئەپۆلۆی بەدەستەوە گرتبوو، کە چەپکە ریشوی پێدا هاتبووە خوارێ،

(١٥) دەکەوێتە پارانەوە لە ئاخییەکان، بەتایبەتی جووتە کوڕەکەی ئەتریوس: مینیلاوس و ئاگامەمنون، کە سەردارانی لەشکرەکان بوون. هاواری کرد: "ئەی کوڕانی ئەتریوس، و هەموو ئاخییان، چەند حەز دەکەم خواوەندانی ئولەمپ بە هاناتانەوە بێن و بەسەر تەروادە، شاری پریام پاشادا سەربکەون، و بەساغ و سەلامەتی بۆ نیشتمانی خۆ بگەڕێنەوە،

(٢٠) بەڵام کیژەکەم ئازاد بکەن، و ئەم سەربەهایەم لێ قەبوڵ بکەن، لەبەر خاتری ئەپولۆی کوڕی زیوس" لەم کاتەدا هەموو ئاخییەکان بەیەك دەنگ هاواریان کرد کە ڕێزی غەیبگۆکە بگیرێت و سەربەهاکەی لێ وەربگیرێت، لێ ئاگامەمنون قابیل نەبوو،

(٢٥) بە توڕەیی وەدەری ناو هاواری بەسەرا کرد "ئەی پیرەمێرد نامەوێ لە نێو کەشتیەکانماندا بت بینم، و جارێکی دی نەگەڕێیتەوە بۆ ئێرە. نە سەوڵەجان و دار عەساکەی ئەپولۆی خواوەندت و نە تاجە بە ریشوە چەپکە گوڵ ئاساکەی دادت نادەن. کیژەکەت ئازاد ناکەم،

(٣٠) لە ماڵەکەی مندا، لە شاری ئارگوس دا، دوور لە وڵاتی خۆی پیر دەبێت، سەرقاڵی تەشی ڕێسی خۆی دەبێت، و دێتە ناو جێگای منەوە، بەڕێی خۆتا بڕۆ و تورەم مەکە

ئەگینا خراپت پێ نیشاندەدەم"٠ کابرا لێی ترسا و بەگوێی کرد٠ بێ هیچ قسەیەك، ڕووی کردە کەناری دەریایی بەگێژەنگ وگێژاو و خرۆشاو،

(٣٥) لەلایەکەوە کەوتە نوێژ بۆ ئەپولۆی خواوەند، ئەو ئەپۆلۆیەی لە لیتو، دایکە جوانەکەی بوو بوو٠ هاواری کرد "گوێ لە من بگرە ئەی خواوەندی زیوین کەوان، تۆ ئەی پارێزەری خریس و سیلای پیرۆز، ئەی فەرمانڕەوای تینیدۆس، گوێم لێبگرە ئەی خواوەندی سمیشی، بیکە بەخاتری ئەو تاجە سەرووەی پەرستگەکەتم پێ ڕازاندەوەتەوە، بیکە بەخاتری ئەو ئێسکە گاو بزنە قەڵەوانەی کە بۆم سوتاندویت، ئەم نوێژەم لێ قەبوڵ بکەو پاڕانەوەم بژنەوە، با تیرەکانت تۆڵەی فرمێسکەکانم لە داناییەکان بسەننەوە٠ بەو ئاوایە نوێژی کرد و ئەپۆلۆ نوێژەکەی لێ قەبوڵ کرد و بەتوڕەیی لە لوتکەی ئۆلەمپەوە دابەزی،

(٤٥) بەخۆو کەمانەکەی و تیردانەکەی سەرشانی، و زرینگەی تیرە جوانەکانی سەر پشتییەوە کە نیشانەی توڕەیی بوو، لە دووری کەشتییەکان دانیشت، ڕوویی تاریك وەکو شەو، کەمانە زیوینەکەی لەگەڵ هەر تیرێکدا تاعون و مەرگی دەهاویشتنێ٠

(٥٠) هەوەڵین تیرانی گرتە هێسترو گاکانیان، ئەوسا ڕووی تیرەکانی کردە خەڵکەکە، ئاگردانان داخرا تا هەموو ڕۆژێ سرووتی جەنازەوپرسەی کوژراوانی دەستی ئەپۆلۆ ئەنجام بدرێت٠ نۆ ڕۆژی خشت خەڵکی بەر تیران دا، بەڵام لە ڕۆژی دەیەمدا ئەخیل کۆبوونەوەی پێکردن٠

(٥٥) هیرای خواوەند، ژنی زیوس بۆ ئەمەی هاندا بوو، کە بینی بووی ئاخییەکان چ قوربانییەکیان داوە، بەزەیی پێیاندا هاتبووەوە٠ کاتێ هەموویان خڕبوونەوە ئەخیل هەستاو گوتی: "کوڕی ئەتریوس، بە پێویستی دەزانم هەر ئێستا٠

(٦٠) بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێینەوە مادامێکی لە وێرانی ڕزگار بووین، چونکە ئێمە کەوتینە نێوان جەنگو پەتاوە٠ با راوێژ بە غەیبگۆیەك یان لێزانێك، یان لێکدەرەوەیەکی خەونان بکەین (خۆ خەونانیش هەر لەلایەن زیوسی گەورەی خواوەندانەوەیە)و پێمان بێ بۆچی ئەپۆلۆی خوای هەتاو لێمان توڕە بووە، و پێمان بێ

(٦٥) ئاخۆ قەراری نەزرێك هەیەو فەرامۆشمان کردبێ، یان قەولی قوربانیەکی سەد گایی دراوەو نەمانکردبێ، و یان قایل دەبێ پەزەکانمان بەسەلامەتی دەرباز بکەین، و ئەم پەتایەمان لەسەر هەڵگرێ٠" ئەم قسانەی کرد و لە جێی خوێ دانیشتەوە، کالخاس-ی

کوڕی نیستور، باشترین غەیبگۆو فالبین، کە ئەوەی چوو بوو، ئەوەی لە ئێستادا هەبوو، و ئەوەی لە ئایندەدا دەبوو هەمووی دەزانی، هەستاو کەوتە قسان. کالخاس ئاخییەکانی بە کەشتییەکانیانەوە بەرەو ئیلیون (تەروادە) ڕێنوێنی کردبوو، هەڵبەتە بەزەبری ئەو پێشبینیانەوە کە ئەپۆلۆی خواوەندی هەتاو ئیلهامبەخشی بوو، بە هەمووویقار و سامێکەوە پێی گوتن: "ئەی ئەخیل، ئەی ئەو کەسەی ئاسمان خۆشی دەوێی، داوات لێکردم هۆی تورەبوونی ئەپۆلۆ، ئیزەد پاشات بۆ ڕوونبکەمەوە، ئەمەت بۆ دەکەم، بەڵام بەر لەوەی قسە بکەم سوێندم بۆ بخۆ کە بە قسەو بە کردار دڵسۆزانە پشتیوانیم لێبکەی، چونکە دەزانم من کەسێك دەهاروژێنم کە بەهێز حوکمی گریکان دەکات، و ئاخییەکان گوێڕایەڵ و ملکەچی ئەون پیاوێکی ڕوتە خۆی لەبەر غەزەبی پاشادا پێ ناگیرێ، پاشایەك ئەگەر ئێستاش پەشم و غەزەبی خۆی قووتبداتەوە، هەر تۆڵەی لێدەکاتەوە. بۆیە لە ئێستاوە پێم بێ جەناب، دەمپارێزیت یان نا" ئەخیل وەڵامی دایەوە: ترست نەبێ، قسەی خۆت بکە وەکو چۆن لە ئاسمانەوە بۆت هاتۆتە خوارێ، کالخاس، بە و ئەپۆلۆیەی، کە نوێژی بۆ دەکەی، بەو خوایەی سەرۆ و سروشی ئەوەمان بۆ دەرکەوتووە، سوێندت بۆ دەخۆم، کە هیچ کەسێك لە داناییەکانی نێو کەشتییەکانمان، تا من لەم دنیایە بمێنم دەستی ئازارت بۆ نەبات- تەنانەت ئاگامەمنونی سەرداری هەموو ئاخییەکانیش". ئیدی غەیبگۆیەکە زاتی پەیداکرد، و گوتی: "خواوەند لە نەکردنی نەزر و نیاز و قوربانیان تورە نییە، بەڵکو لەبەر ئەو کاهینەی، کە ئاگامەمنون سوکایەتی پێکردووە، تورەیە، چونکە نە کیژەکەی ئازاد کرد و نە سەربەهاکەی لێوەگرت، بۆیە بەڵاو مسیبەتانی بۆ ناردین، و بەڵای دیکەش دەنێرێت. ئەم تاعون و پەتایە لەسەر داناییەکان هەڵناگرێت تا ئاگامەمنون بێ هیچ ساتو سەودا و سەر بەهایەك کیژێ بۆ بابی نەگێرێتەوە، و تا سەد سەرگا بۆ خریسی، لە نزیکی تەروادەدا نەکرێتە قوربانی. ڕەنگە بەم ڕێگەیە دڵی نەرم بکەین" ئەو قسەیەی کردو دانیشت، ئاگامەمنون بە تورەیی هەستا. دڵی ڕەش بوو، پڕ بوو لە تورەیی، چاوانی ئاگریان لێدەبووەوە.

گرژومۆن دەیڕوانییە کالخاس، و گوتی: "ئەی فاڵچی شووم، ئەی ئەو کەسەی تەنیا پێشبینی شتێك دەکەی کە بە زیانی من بێ، هەرگیز پێشبینی شتێکی جوانت بۆ من نەکردووە، هەمیشە پێشبینی شتی شومو شرندەم بۆ دەکەیت، تۆ نەك دڵی منت خۆش نەکردووە، ئەوەتا هاتوی لەنێو داناییەکاندا پێشبینی دەکەیتو دەڵێیت

ئەپولۆ بۆیە تاعونی بۆ نازڵ کردوین چونکە من سەربەهای ئەم کچەی خریسیس-م وەرنەگرتووە. من لێبرام لە ماڵی خۆمدا گلی بدەمەوە، چونکە لە کیلیتمنسترای خێزانم، زیاترم خۆش دەوێ کە هاوتای ئەوە،

لە شێوەو سوخەتان، لە فامیدەیی و کاردا. بەڵام بەنیازم ئەگەر لەم پەتاو بەڵایە ڕزگار بم، ئازادی بکەم، چونکە سوورم لەسەر ئەوەی ئەم خەڵکە بژی و بمێنێ، بەڵام دەبێ لەبری ئەو دیاری و دەسکەوتێکی دیکەم بۆ پەیدا بکەن، دەنا لە نێو هەموو ئارگوسییەکاندا تەنیا من بێ دیاریی و خەڵات و دەسکەوت دەبم و ئەمەش ڕەوا نییە؛

چونکە هەمووتاان دەزانن، کە دەسکەوتەکەی من لێم دوور دەکەوێتەوەو بۆ شوێنێکی دیکە دەچێت". ئەخیل وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی ئوتریوسی خانەدان، تەماعی تۆ لەسەرووی تەماعی بەشەرانەوەیە، ئاخییەکان چۆن دکارن خەڵات و دیارییەکی دیکەت بۆ پەیدا بکەن؟ ئێمە عەمارمان نییە تا لەوێندەرەوە خەڵات و دیاریت بۆ بێنین.

ئەوانەمان لەشارە گەمارۆدراوەکانەوە بەناوی پاداشت وەرگرتوون، ناتوانین ئەو پاداشتانە ڕەفز بکەین کە پێشکەشمان کراوە. کەواتە، ئەم کیژە بەخوا ببەخشە، ئەگەر زیوس دەستی داین و شاری تەراوادەمان گرت، سێ قاتو چوار قات تۆڵەت بۆ دەکەینەوە.

ئاگامەمنون لەم کاتەدا هەڵیدایێ: "ئەخیل، چەند ئازا بی، لە هۆش و بیرا نامگەیەتێ، بە بیانوان قەناعەتم پێ ناکەی. گەرەکتە تۆ دەسکەوت و خەڵاتی خۆت هەبێ و من بەدەستی بەتاڵ دانیشم و لەسەر داوای تۆ دەستبەرداری کیژەکە ببم؟

بە ئاخییەکان بێ لە جیاتی خەڵاتە خۆشەویستەکەم، خەڵاتێکی دیکەم بۆ پەیدا بکەن، دەنا خەڵاتەکەی تۆ بۆ خۆم دەبەم، یان خەڵاتەکەی ئاجاکس یان ئەوەی ئودیسیوس، یان هی هەر کەسێکی دی، و ژێوان نابمەوە.

با دوایی بیر لەمە بکەینەوە، باجارێ کەشتییەك بە دەریاوانەکانیەوە بۆ دەریا ڕەوان بکەین، و ئاگردانێکی بەشی سەد سەرگای لەسەر دابنەین، و کریسیس-ش ڕەوانە

بخەین، هەنگێ لە نێو خۆمانا فەرماندەیەکی بۆ هەڵبژێرین،

(١٤٥) ئیدی ئاجاکس بێ یا ئیدومینیوس یان تۆ بەخۆت بی کوڕی بیلیوس، هەرتۆ قارەمانی بەسامی، قوربانییەکە پێشکەش دەکەین و غەزەبی خواوەند دادەمرکێنینەوە)). ئەخیل لێی هاتە دەم و وەڵامی دایەوە: "زۆری لەسەر ڕۆییشتی و هەر چاوت لە دەسکەوتە.

(١٥٠) بە چ غیرەتێکەوە ئەمر بە ئاخییەکان دەکەی، ئیدی ئەمری غەزو کردن بێ یان ئەمری جەنگی کراوە؟ من لێرەدا کە دەجەنگم لەبەرئەوە نییە تەروادەییەکان بەرپرسن لەو خەتاو هەڵەیەی پێمەوە لکاوە. من دژمنایەتیم لەگەڵ کەسیاندا نییە. نە پەزیان دزیوم و نە گەلە ئەسپیان داگیرکردوم،

(١٥٥) بەروبومی دەشتی بەپیتی بیتیا-یان نەبردوم، مەودایەکی زۆر لەنێوان من و ئەواندا هەیە، دەریایەك لە چیاو لمەڵان. ئێمە دوای تۆ کەوتووین، ئەی سەروەری تەوهین و سوکایەتی! لە پێناوی شادی تۆدا هاتووین نەك شای خۆمان- ئێمە بۆ پشتیوانی تۆ و تۆڵە لە تەروادەییەکان هاتین بەهۆی خودی عەیبدارتەوەو بەهۆی مینیلاوس-ەوە کە هیلینی ژنی ڕفێنراوە.

(١٦٠) ئەمەت لە بیرکرد، و هەرەشەی ئەوەت کرد کە ئەو دیارییەم لێ بدزیت کە شایانی منە، ئەوەی کوڕانی ئاخیایی دایانمێ. ئاخییەکان هیچ دیارییەکیان لەو شارانەی کە گەمارۆمان دان لە چاو دیارییەکانی تۆدابەمن نەداوە،

(١٦٥) هەرچەنددۆستانی من لە ریزی پێشەوەی شەڕدا بوون. کەچی کاتێ دەستکەوتان دابەش کران بەشی هەرە گەورە هی تۆ بوو، کەواتە من دەبێ بۆلای کەشتییەکانم بگەڕێمەوە، ئەوەی بەخۆم بەدەستم هێناوە ببیەم، کە کاری خۆم ئەنجام دەدەم لە سوپاس زیاتریان لێ نابینم. بۆیە دەبێ هەر ئێستا بۆ بیتیا بگەڕێمەوە، بۆ من باشترە.

(١٧٠) لەگەڵ کەشتییەکانما بگەڕێمەوە، من لێرە بەبێ ڕێزی دانانیشم کە زێڕو کاڵا بۆ تۆ کۆبکەمەوە. ئاگامەمنون وەڵامی دایەوە: "ئەگەر حەز دەکەی خێراکە، خۆ قوربانیت بۆ ناکەم تا لێرە بمێنییەوە. خەڵکانی ترم لێرە هەن.

(١٧٥) ڕێزم دەگرن، و لەسەرویانەوە زیوسی خودانی ئەنجومەنی خواوەندان. هیچ پاشایەك لێرەدا بەقەدەد تۆ نام بوغزێنێ، تۆ کەسێکی ناساز و شەڕانی و مگێزنەخۆشیت. ئێ چییە کە ئازایت؟ ئاسمان ئازای نەکردویت؟ بڕۆ بۆ وڵاتی خۆت، بە کەشتی و هاوڕێکانتەوە بڕۆ.

(١٨٠) لەوێ حوکمڕانی میرمیدۆنەکان بکە. من گوێ بە تۆ و تورەبوونی تۆ نادەم،

بزیاریدەو داومە: مادامێکی ئەپولۆی خواوەندی هەتاو کریسیس لە من دەسەنێتەوە، بە کەشتییەکەی خۆم و پیاوەکانما دەینێرمەوە، بەڵام بەخۆم دێم بۆ سەرا پەردەکەی تۆ.
(١٨٥) و خەڵاتە جوانەکەت ،پریسیس، لێ دەبەم، تا بزانی چەند لە تۆ بەسامترم، و ئەوانی تریش بترسن و خۆیان بەهاوتاو هاوسەنگی من نەزانن". کوڕی بیلیوس هەستی بەتوڕەیی کرد، هەستی کرد کەدڵی لە سینەیەوە دەرپەڕی.
(١٩٠) تیاما بوو ئایا هەڵکێشێتە شمشێر یان نا، کوڕەکەی ئەتریوس بکوژێ یان جڵەوی توڕەییەکەی بگرێ، لەم کاتەدا ئەتینا
(١٩٥) لە ئاسمانەوە دابەزی (هێرای ژنی زیوس ناردبووی چونکە هەردوو پاڵەوانەکەی: ئەخیل و ئاگامەمنون-ی بەیەك ئەندازە خۆشدەویست) ئەتینا لە پشتەوە قژە زەردەکەی کوڕی بیلیوس-ی ڕاکێشا، جگە لەو کەسی تر نەی بینی، پیاوەکانی دیکە نەیانبینی. ئەخیل سەرسام بوو، بەگڕی چاوەکانیا زانی ئەمە خواوەند
(٢٠٠) ئەتینایە گوتی: "بۆچی لێرەی ئەی کیژی زیوس، ئەی هەڵگری قەڵغانی زیوس؟ تاگو ساخیو غروری ئاگامەمنونی کوڕی ئەتریوس بدینی؟ دەبا منیش پێت بڵێم- کە بە ئەکیدی
(٢٠٥) گیانی خۆی لە پێناوی ئەم خۆپەسندییەدا دادەنێت".
ئەتینا گوتی: "لە ئاسمانێرا هاتووم، گوێ لە من بگرەو ڕقەکەت بخۆوە، هێرا ناردومی، هێرا بەیەك ئەندازە بایەخ بە تۆو بە ئاگامەمنون دەدات.
(٢١٠) کەواتە دەستبەرداری ئەم شەڕە ببە، شمشێر هەڵمەکێشە، بەڵکو حەز دەکەی بیبێزرێنە، بێزرانەکەت بێ سوود نابێ، چونکە من پێت دەڵێم- ئەوەی پێتی دەڵێم بێگومان دێتەدی- تۆ پاشان بەهۆی ئەم بێزکاڵیەوە کە ئاراستەی کردی سێ هێندەی ئەو دیاری و خەڵاتت پێ دەبڕێت، کەواتە دەستبەردار و گوێڕایەڵ بە."
(٢١٥) ئەخیل وەڵامی دایەوە: " خوداوەندا، پیاو چەندیش توڕەبێ، دەبێ گوێڕایەڵی داوای تۆ بێ. ئەمە باشترە، چونکە خواوەند هەمیشە نوێژی ئەوانە قەبوڵ دەکەن کە تاعەتیان دەکەن". دەستی لەسەر دەسکی زیوینی شمشێرەکەی ڕاگرت.
(٢٢٠) ئەوسا وەکو چۆن ئەتینا ئەمری پێکرد خستییەوە ناو کێلانەکەی و هەنگێ گەڕایەوە بۆ ئۆڵەمپ و بۆ لای خواوەندەکانی تر و بە قەڵغانەکەی بابیەوە خۆی بەماڵی زیوس-ی بابیا کرد. بەڵام کوڕەکەی بیلیوس جارێکی دی کەوتەوە قسەی سارد و سووك

بەخوری ئەتریوس، چونکە هێشتا ڕق و تورەیی بەری نەدابوو.
(٢٢٥) هاواری کرد: "تۆ ئەی عەرەقخۆر، ئەی ئەوەی چارەت لە چارەی سەگ و دڵت لە دڵی ئاسك دەچێت، تۆ نەزانی ئەوەت هەیە لەگەڵ لەشکرا بچیتە جەنگ، نە لەگەڵ جەنگاوەرە دلێرەکانماندا کەمین بۆ دوژمن بنەیتەوە. تۆ خۆت لەمە دەدزییەوە وەکو چۆن خۆت لە مردن دەدزییەوە. تۆ تەنیا لەوە دەگەڕێی
(٢٣٠) کە خەڵاتی هەر جەنگاوەرێك کە لە گەڵتا ناسازە بدزی. تۆ گەلی خۆت دەخۆیت، چونکە پاشای گەلێکی لاوازی، دەنا، ئەی کوڕی ئەتریوس، سوکایەتیت بەپیاو نەدەکرد. بۆیە دەڵێم، گەورەترین سوێند دەخۆم- نەخێر، بەم دارعەسایەم کە نە گەڵایەك و نە شکۆفەیەك،
(٢٣٥) و نە چرۆیەکی تازەی دەرکردووە لەو ڕۆژەوە کە لە دارێکی سەرچیا کراوەتەوە، چونکە تەورەکە لە گەڵاو توێکێنی ڕوتەڵ کردەوە، و نهۆ ڕۆڵەی ئاخییەکان وەکو فەرمانڕەوا و پاسەوانانی یاسایێ ئاسمان هەڵیدەگرن- لە ناخی دڵەوە سوێند دەخۆم
(٢٤٠) کە بە تاسەوە لە ئەخیل دەگەڕێن و نایدۆزنەوە. لە ڕۆژی خەمباریتا، ڕۆژێ کە جەنگاوەران بەدەستی هیکتۆری مەردم کوژی، کوڕی پریام دەکوژرێن، و تۆش وێڵ و سەرگەردان دەسوڕێیتەوە و نازانی چۆن یارمەتیان بدەی، ئازارێکی تورەی دەرونی دڵت دەگرێت، چونکە سوکایەتیت بە باشترین کەسی ئاخییەکان کردووە".
(٢٤٥) کوڕی بیلیوس بەو جۆرە قسەکەی تەواو کرد و دارعەسا زێڕینەکەی نایە سەر زەوی و لە جێی خۆی دانیشتەوە. کەچی کوڕەکەی ئوتریوس لەو بەرەوە لە جێی خۆی کەوتە هەستان. هەنگێ نەستوری شیرین زمان، وتەبێژ بە ناوی بیلیانییەکانەوە هەستا، واژەو پەیڤان شیرینتر لە هەنگوین لە زارییەوە دەرژان.
(٢٥٠) دوو نەوە لە جەنگاوەران لە بیلوس لەدایك بوون و پەروەردە بوون و حوکمی ئەویان دیتوە، ئەمێستا حوکمی نەوەی سێیەم دەکات. بۆیە بە دڵێکی پاك و بێگەردەوە پێی گوتن: "ئەوی ڕاستی بێ کۆستێکی گران بەسەر خاکی ئاخییەکاندا هاتووە.
(٢٥٥) بێگومان پریامو کوڕەکانی خۆشحاڵ دەبن، تەروادەییەکان ئەگەر ئەم شەڕەی نێوان جووتە قارەمان بژنەون زۆر خۆشحاڵ دەبن، ئەم جووتەی کە لە دلاوەری و ڕاوێژکاریدا لە نێو جەنگاوەرەکانمانا بێ وێنەن. من لە هەردوکتان گەورەترم، بۆیە لە سەرتانە بەگوێم بکەن.

(٢٦٠) وێڕای ئەوەی کە من دۆستی پیاوانی لە ئێوە بەهێزتر بووم و لە قسەم دەرنەچوون. من ئێستا شەرم دەکەم سەیری پیاوانی وەکو بیرتیوس و دەریاس-ی پاشای جەنگاوەران بکەم، یان پیاوانی وەکو ئیکسادیوس و پولیفیموس-ی نیمچە خواوەند،

(٢٦٥) وتیسیوسی کوڕی ئیگوس کە وەکو خواوەندان نەمر بوون. ئەوانە بەهێزترین پیاوان بوون کە لەسەر ڕووی زەوی لە دایك بوو بوون: زۆر بەهێز بوون، کاتێ شەڕی تیرە هۆڤییە چیاییەکانیان کرد بەسەریاندا زاڵ بوون. لە بیلوسەوە لە دووری دوورەوە هاتم، و دامە پاڵیان،

(٢٧٠) چونکە داوایان لێکردم بدەمە پاڵیان، وەکو پێویست جەنگیم. لە نێو زیندووانی ئەمڕۆدا کەسێك نیە هاوتایان بکاتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گوێیان لە قسەکانم دەگرت، قەناعەتیان بە تەگبیرەکانم دەکرد. ئێوەش واهی بن لەگەڵ خۆتاندا چونکە ئەم ڕێگەیە ڕێگەیەکی شایستەو دروستە،

(٢٧٥) بۆیە، ئەی ئاگامەمنون، پایەت هەرچییەکە، ئەو کیژە مەبە، چونکە ئاخییەکان بە ئەخیلیان بەخشیوە، تۆش ئەی ئەخیل، لە بیری ئەوەدا نەبی بەگژ پاشادا بچی، چونکە هیچ کەسێك لەوانەی زیوس دارعەسای فەرمانڕەوایی پێ بەخشیون لە ئاگامەمنون سەرفرازتر نین.

(٢٨٠) تۆ ئەگەر لەو بەهێزتری، دایکت ئیزەد خانمە، بەڵام ئاگامەمنون لە تۆ بەسامترە، چونکە حوکمی ڕەعیەتێکی فرەتر لە ڕەعیەتەکەی تۆ دەکات. جا تۆ ئەی کوڕی ئوتریوس، پشم و غەزەبی خۆت جڵەو بکە، تکات لێدەکەم، سنورێك بۆ ئەم شەڕە لەگەڵ ئەخیل دا، دابنە، چونکە ئەخیل لە شەڕدا قەڵایەکی بەهێزە بۆ ئاخییەکان".

(٢٨٥) ئاگامەمنون وەڵامی دایەوە: "جەنابی پیر، هەموو ئەوەی گوتت دروستە، بەڵام ئەم پیاوە دەخوازێت ببێ بە فەرماندە و سەردارمان: سورە لەسەر ئەوەی کە فەرماندەی هەمووان بێ، پاشای هەمووان و سەروەری هەمووان بێ،و زەحمەتە ئەمە بێتە دی.

(٢٩٠) من دان بەوەدا دەنەم کە خواوەندن کردویانە بە جەنگاوەرێکی گەورە، بەڵام ئاخۆ ئەو هەقەیان داوەتێ کە جنێوان بدات؟" ئەخیل لەلای خۆیەوە هاواری کرد: خوێڕی و ترسنۆکم ئەگەر هەموو شتەکانت بۆ بسەلمێنم

(٢٩٥) ئەم فرمانانە بە خەڵکانی دی بدە، نەك بە من، لە ئێستا بەدواوە بە فەرمانی تۆ ناکەم. بەڵام قسەیەکی ترم هەیە —ئەم قسەیەم بخە قوڵایی دڵتەوە- نە جەنگی تۆ و نە

جونکی هیچ کەسێکی دی لە سەر ئەم کیژە ناکەم، چونکە تۆ بەخۆت پێشکەشت کردم، وئەوەتا هەر بە خۆت لێمی دەسەنییەوە. بەڵام هەرگیز ناتوانی بە تۆبزی هیچ شتێك لەو شتانەی سەر کەشتی یەکەم داگیر بکەی. ئەگەر ئازای هەولبدە ئەمە لەبەرچاوی خەڵکی بکە. بزانە شمشێرەکەم لە خوێنتا هەڵدەکێشم یا نا". هەردوو قارەمان پاش ئەوەی شەرە قسەیان گەییە ئەم رادەیە هەستان، کۆبوونەوەکەیان کە لای گەلە کەشتی ئاخییەکان بەسترابوو، هەڵوەشاندەوە کورەکەی بیلیوس لەگەڵ کوری مینویتیوس و یاوەرەکانیا بۆ لای ئۆردوگاو کەشتییەکانی گەرایەوە، کەچی ئاگامەمنون فرمانیدا کەشتییەکەی بخەنە دەریاوەو بیست سەوڵ لێدەری بۆ هەڵبژارد. کریسیسی سەرخستە سەر کەشتییەکەو سەدگای بۆ خودا کردە قوربانی. ئودیسیوس بوو بە فەرماندە، ئەمانە بەرێگەی دەریایی خۆیاندا کەوتنە رێ. کوری ئوتریوس فەرمانی بە جەنگاوەرەکان دا خۆیان پاك بکەنەوە، خۆیان پاك کردەوە و پیسییەکانیان توردایە دەریاوە. ئەوجا سەد سەرگاو بزنیان کردە قوربانی و پیسییەکانیان توردایە دەریاوە، دووکەڵی قوربانییەکەیان بە پێچو دەورە بەرەو ئاسمان بەرزبووەوە. بەو ئاوایە لە ناوەندی لەشکردا خۆیان مژول کرد. لێ ئاگامەمنون هەرەشەکەی ئەخیلی لە بیر نەکردبوو، هەردوك تالتیبیوس و یوریباتیس-ی تەتەر و هاورێی دڵسۆزی خۆی بانگ کردن. پێی گوتن: "بچن بۆ خێوەتەکەی ئەخیلی کوری بیلیوس و بریسیس هەڵگرن و بۆ ئێرەی بێنن، ئەگەر ئەخیل ملی نەداو تەسلیمی نەکرد ئەوا بەخۆم لەگەڵ خەڵکانی دیکەدا دێم و لێ دەستێنم- ئەم کارە پتر ئازاری دەدات". یەکسەر ناردنی، و دەست بەجێ کەوتە تاسەیان، هەردووکیان بەخەمینی و بەدەم برینی رێگەی کەناری دەریاوە لە ئۆردوگا و گەلە کەشتی میرمیدونەکان نزیك بوونەوە. سەیریان کرد ئەخیل لە نزیکی خێوەت و کەشتییەکەی خۆی دانیشتووە، بەدیتنیان خۆشحاڵ نەبوو. بەترس و رێزەوە لە بەردەمیا وەستان و هیچ قسەیەکیان نەکرد، بەڵام ئەخیل پەی بە حاڵیان برد و گوتی: "سڵو ئەی نێردراوان، ئەی پەیامبەرانی خواوەندان و بەشەران، وەرنە پێشەوە، شەری من لەگەڵ ئێوەدا نییە، بەڵکو لەگەڵ ئاگامەمنون دایە کە

ئێوەی ناردووە تا بریسیس لەگەڵ خۆتانا بەرن. کەواتە جەنابی پاترۆکلوس، ئەی هاوڕێ و دۆستی ئازیز کیژەکە بێنە و بیدە دەستیان، بەڵام ئێوە لە حوزوری خواوەندانی موبارەك و بەشەردا شایەتیم بۆ بدەن،

لە بەردەم توڕەیی ئاگامەمنون دا شایەتیم بۆ بدەن، کە من ناچار نابم خەڵکی لە تەنگانە و ماڵوێرانی ڕزگار بکەم، و ڕۆژێ دێ هانام بۆ دێنن و نامبینن. ئاگامەمنون شێت و شبر بووە، حیسابی ئەوەی نەکردووە کە ئاخییەکان ناچاری جەنگ دەبن تا بەرگری لە سەلامەتی کەشتییەکانیان بکەن".

باترۆکلۆس فەرمانی فەرماندە ئازیزەکەی بەجێ هێنا. بریسیسی لە خێوەتەکەوە هێنا و دایە دەست دوو تەتەرەکە، ئەوانیش لەگەڵ خۆدا بۆلای کەشتی ئاخییەکانیان برد- و کیژە ناچار کرا کە سەربکەوێ. هەنگێ ئەخیل بەتاقی تەنیا چوو بۆ کەناری دەریای کەفچەڕیوو، چاوی بڕییە شەپۆلانی بێ کۆتایی دەریا، هەردوو دەستی بە پاڕانەوە بۆ دایکە نەمرەکەی هەڵبڕی، هاواری کرد: "دایکە تۆ کە منت هێناوەتە دنیا، لێم گەڕێ با بژیم، ئەگەر ژیانێکی کورتیش بێ، بێگومان زیوسی سەرداری خواوەندان، کە لە ئۆڵەمپەوە هەورە تریشقان دەنێرێ، ئەویش ڕێزی لێناوم، بەڵام ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس سوکایەتی پێکردوم، بەزۆر خەڵاتەکەی لێ سەندوم." بەم شێوەیەو بەدەنگی بەرز گریا. دایکی لە بنەبانی دەریاوە کە خەریکی بابە پیرەکەی خۆی بوو، گوێی لە دەنگی بوو. لە جەرگەی شەپۆلانەوە، وەکو پەڵە هەورێکی چڵکن وەدەرکەوت،

و لە بەردەمیا دانیشت، ئەویش بەپێوە وەستابوو و دەگریا، ئەوسا لە هەمێزی گرت، و گوتی: "بۆچی دەگریت کوڕی خۆم؟ چ شتێ خەمباری کردووی؟ ڕێك و ڕەوان قسە بکە. هیچ شتێکی دڵت مەشارەوە، تا بە هەردووکمان چارەسەرێکی بۆ بدۆزینەوە" ئەخیل هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و گوتی:

تۆ بە خۆت خەمەکە دەزانی، ئیدی بۆچی شتێکت پێ بڵێم کە خۆت پێشوەختە دەیزانی؟ چووین بۆ شاری تیبەی ئیتیونی سەختو قایم، وێرانمان کرد و بەتاڵانی و دەسکەوتانەوە هاتینەوە. کوڕانی ئاخایی ئەم دەسکەوتانەیان لە بەینی خۆیاندا دابەش کرد، کریسیس-یان بە ئاگامەمنون پێشکەش کرد؛ لێ خریسیس-ی کاهینی ئەپولۆ، خۆی گەیاندە گەلە کەشتی ئاخییان تا کیژەکەی

ئازاد بکات، سەربەهایەکی گەورەو زۆری لەگەڵ خۆدا هێنابوو: ئەمە جگە لەوەی دارعەسا زێڕین و تاجەکەی ئەپولۆشی بەدەستەوە بوو، و کەوتە پاڕانەوە لە ئاخییەکان،

بەتایبەتی لە مینیلاوس و ئاگامەمنون، کوڕانی ئەتریوس، کە سەرداری ئاخییەکانن. کە ئاخییەکان گوێیان لە داواکەی بوو و بەیەك دەنگ داوایان کرد ڕێز و حورمەتی کاهینەکە بگرن، و ئەو سەربەهایەی لێ وەربگرن کە هێناویەتی؛ لێ ئاگامەمنون لێی توڕە بوو، وەدەری نا.

پیرەی زویر ڕێو ڕێ گەڕایەوە، ئەپولۆی خواوەند کە زۆری خۆش دەویست، دوعاو پاڕانەوەکەی قەبوڵ کرد. هەنگێ ئەپولۆ تیرە کوشندەکان بۆ ئارگوسییەکان نارد، خەڵکەکە بڕ بڕ مردن، چونکە تیرەکان لە هەموو شوێنێکەوە بەسەر لەشکری ئاخییەکاندا دادەبارین. ئەنجام فاڵچی و لێزانێك هات

بەو حوکمەی خواستی خواوەندان دەزانێ، مەبەست و خواستی ئەپولۆی بۆ ڕوونکردینەوە، و من یەکەم کەس بووم ووتم دەبێ ئەپولۆ ڕازی بکەین. لێ کوڕی ئوتریوس توڕە بوو، و هەستاو کەوتە هەڕوگیف و هەڕەشەکەی خۆی بردە سەر. ئەوەتا ئاخییەکان کیژێ لە کەشتییەکدا دەبەن

بۆ خریسی، و دیاری و قوربانی بۆ خواوەند دەنێرن، لێ دوو تەتەرەکە هەر ئێستا بریسیس-یان لێ سەندم، جا ئەگەر دەتوانی فریای کوڕەکەت بکەوە، بچۆ بۆ ئۆڵەمپ، ئەگەر بەقسە بووە یان بە کردەوە دڵی زیوس بەدەست بێنە، لەبەری بپاڕێوە و داوای یارمەتی لێبکە. زۆرجار لە ماڵی بابمدا گوێم لێت بووە شانازیت بەوە کردووە کە تەنیا تۆ لەنێو نەمراندا کوڕی کرونوس-ت لە مردن ڕزگار کردووە، پاش ئەوەی ئەوانی دی

لەگەڵ هیرا و بوسیدون و ئەتینا پالاسدا ویستویانە کۆت و بەندی بکەن. تۆ ئەی یەزدانخانم ڕزگارت کرد، چونکە لەبەر ئۆڵەمپی زەبەلاحی پەنجا سەر و سەد بازوو کە خواوەندان (بریاروس) ی پێ دەڵێن، واتە "بەهێز"و بەشەران (ئیجیون)ی پێ دەڵێن، چونکە لە بابی بەهێزترە، پاڕایتەوە؛

و کاتێ لایەنی زیوسی کوڕی کرونوسی گرت، خواوەندەکانی دی ترسان کۆتو زنجیری بکەن. کەواتە بچۆ بۆلای، و هەموو ئەمەی بیر بخەرەوە و دەسەوداوێنی بە، داوای لێبکە کۆمەکی تەروادەیەکان بکات، تا ئاخییەکان بخزێننە پاشەڵی کەشتیەکانیانەوە، و لە کەناری دەریادا بمرن،

(٤١٠) تا ئەوە بدورنەوە کە پاشاکەیانی شادو دڵخۆش دەکرد، و تا ئاگامەمنون لەو سوکایەتییە ژیوان ببێتەوە کە ئاراستەی دلێرترین ئاخیانی کرد".( تیتیس)ی دایکی بە گریانەوە وەڵامی دایەوە: "زۆر بەداخەوەم کوڕی خۆم لەوەی کە هێنامیتە دنیاوە و بەخێوم کردی.

(٤١٥) دەبوایە تۆ دوور لە خەم و پەژارە لە پاڵ کەشتیەکانتا بمایتایەوە، چونکە تەمەنی تۆ کورتە، بەداخەوەم لەوەی کە تەمەنێکی کورت و خەمێکی دوور و درێژ لە ژیانتا بەسەر دەبەی: من خەمباری ئەو ساتەم کە تۆم تیا فرێدایە ئەم جیهانە؛

(٤٢٠) لەگەڵ ئەمەشا دەچم بۆ ئۆڵەمپ، ئۆڵەمپی سەر بە بەفر، و ئەم چیرۆکە بۆ زیوس دەگێڕمەوە، بزانم داخوا دوعام قەبوڵ دەکات: جا لەم کاتەدا تۆ لە شوێنی خۆت، لای کەشتییەکانت بمێنە، رق و کینەت دەرهەق بە ئاخییەکان جڵەو بکە، خۆت لە شەڕ دوور بگرە، چونکە زیوس دوێنێ چووە بۆ ئۆقیانوس تا لەگەڵ ئەسیوبییەکاندا جەژن بکات، هەموو خواوەندەکان لەگەڵیا ڕۆییشتوون.

(٤٢٥) تا دوانزە ڕۆژی دی ناگەڕێتەوە، هەنگێ دەچم بۆ کۆشکە برونز ڕێژکەی و لێی دەپاڕێمەوە، ئەگەر بەقسەم نەکات، باوەڕ ناکەم بتوانم قەناعەتی پێ بکەم." بەم قسەیە کورەکەی بەجێ هێشت، کە بە کەسەرو داخی لە دەستدانی کیژە جوانەکەوە دەتلایەوە

(٤٣٠) ئەو کیژەی بەزۆر لێی سەندرا. لەم کاتەدا ئودیسیوس بەسەر کەڵەگای قوربانیەوە گەییە خریسی، کە گەییشتنە ناو بەندەرەکە بادەوانەکانیان لە ستونی کەشتیەکەوە ئاڵاند، و ستونەکانیان هێنایە خوارێ

(٤٣٥) کەشتییەکەیان بە سەوڵ لێدان بۆ لەنگەرگە برد، لەوێ کندرەکانیان لە تاوێران بەست و لەنگەریان گرت. ئەوجا دابەزین و سەد قوربانییەکەیان پێشکەشی ئەپولۆ کرد؛ هەروەها کریسیس لە کەشتیەکە دابەزی،

(٤٤٠) و ئودیسیوس بەرەو قوربانگەکەی برد تا بیداتە دەستی بابی، و گوتی: "ئەی خریسیس، ئاگامەمنون شا ناردمی تا کیژەکەت بۆ بگێڕمەوە، و بەناوی داناییەکانەوە قوربانی بۆ ئەپولۆ بکەم، بەڵکو خواوەند رازی ببێ،

(٤٤٥) ئەو خوایەی کە ئارگوسییەکانی دوچاری ئاسیو وپەرێشانی کرد." ئەمەی گوت و کیژەی بۆ لای بابی پاڵدا، ئەویش بەخۆشحاڵییەوە وەریگرتەوە، ئەوجا لە دەوری

قوربانییەکەی خواوەند کۆبوونەوە تا ڕێوڕەسمی سەد قوربانییەکە بۆ خواوەند ئەنجام بدەن. دەستیان شۆرد و بادەیان هەڵبڕی تا بیکەن بەسەر قوربانییەکاندا،

(٤٥٠) خریسیس-ش هەردوو دەستی هەڵبڕی و بەدەنگی بەرز لە بەردەمیانا کەوتە دوعا و پاڕانەوە: "گوێم لێ بگرە ئەی ئەپولۆ، ئەی خودانی کەوانی زیوین، ئەی ئەو کەسەی کە خریسی و سیلای پیرۆزت پاراست و حوکمڕانی دورگەی( تینیدوس)ت بەهێزی خۆت کرد. وەکو چۆن جارەکەی پێشوو دوعات گیرا کردم و ئاخییەکانت دوچاری کۆستو بەڵاو ئاسیو کرد،

(٤٥٥) ئەمجارەش دوعام گیرا بکە، و ئەم تاعونە لەسەر دانایییەکان هەڵگرە". بەو جۆرە دوعای کرد، و ئەپولۆ دوعاو نزاکەی گیرا کرد. دوای نوێژ و دوعا بادەیان ڕشت و سەری قوربانییەکانیان ڕاکێشا و کەوڵیان کردن.

(٤٦٠) ئێسکی ڕانیان بڕی و لە هەردوو دیوەوە لە پیویان گرت، چەند پارچە گۆشتێکی خاویان نایە سەر، ئەوجا خریسیس نایە سەر ئاگرەکە و مەی بەسەردا کرد، لەم کاتەدا پیاوانی لاو لە پاڵ ئەودا وەستابوون و شیش کەبابی پێنج لقەیان بەدەستەوە بوو، کە ئیسقانی ڕان سوتا، و هەستیان بە ژەمێن روحی کرد،

(٤٦٥) باقی گۆشتەکەیان ورد کرد، و پلەکانیان بە شیشەوە کرد، و برژاندیان تا پێگەیی، ئەوجا کشانەوە: کاتێ کارەکەیان تەواو کردو خوانەکە ئامادەبوو، هەموو لێیان خوارد، هەر کەسە و بەشی خۆی برد، تا تێر بوون. کە لە خواردن و خواردنەوە، تێر بوون

(٤٧٠) خزمەتکاران جامیان لە مەی و ئاو تەژی کرد وگێڕایان بەسەریاندا، هەر کەسە و بەشی خۆیان دایێ، بەو جۆرە لاوانی ئاخایی باقی ڕۆژەکەیان بە بەزم و گۆرانی و تالیلەی شادی بەخشەوە بۆ ئەپولۆ بەسەر برد، خواوەندش کە گوێی لە ستایشی ئەوان دەبوو، بە دڵ شاد دەبوو،

(٤٧٥) بەڵام کە خۆرئاوا بوو، دنیا تاریك بوو، لەلای گوریسی پێشەوەی کەشتییەکە نووستن، و کاتێ سپێدە بە قامکە سورەکانییەوە دەرکەوت، بادەوانەکانیان بەرەو لەشکری ئاخییان هەڵکرد. ئەپولۆ بایەکی لەباری بۆ کۆمەکیان نارد،

(٤٨٠) بورجەکەیان دامەزراند و بادەوانە سپییەکانیان بە بەرزییەوە هەڵکرد. بادەوانەکان پڕ بوون لە هەواو کەشتیەکە بەناو ئاوە قوڵە گەرمەکە کەوت، و شەپۆلی کەفچەڕینی دەریا خۆی لە نوکی کەشتیەکە هەڵدەسوو، و کاتێ گەییشتنە ئۆردوی پان و پۆڕی ئاخییان،

(٤٨٥) کەشتییەکەیان ڕاکێشایە کەنارەوە و لە بەرزاییدا، پایەکانیان بەدرێژی لە ژێریا دانا، و بەرەو خێوەت و کەشتیەکانیان کەوتنە ڕێ. لێ ئەخیل لەلای کەشتییەکەی مایەوە و هەر پیشی دەخواردەوە و تورە و تورەتر دەبوو.
(٤٩٠) نە بۆ کۆبوونەوە بە شکۆکە چوو، و نە بەشداری شەری کرد، بەڵکو هەر خۆی دەخواردەوە و قینی دڵی دەشاردەوە، و گوێی بەجەنگ و هاوار و قریوەی جەنگ نەدەدا، ئێستاش دوای دوانزە رۆژی خشت هەر هەموو خواوەندەکان بۆ ئۆڵەمپ گەڕانەوە،
(٤٩٥) زیوس لە پێشیانەوە بوو،( تیتس)ی دایکی ئەخیل راسپادەی کوڕەکەی لە بیر نەکرد، بەدڵ کاری بۆ وەدیهاتنی کرد، لە ژێر دەریاوە ڕابوو، بەنێو تەم و مژا و لەگەڵ سپێدەی زوودا، بە ئاسمانی بەشکۆدا بەرەو ئۆڵەمپ ڕۆیی، لەوێ زیوسی بەتوانای کوڕی کرونوسی لەسەر بەرزترین لوتکەی ئۆڵەمپدا بە تەنێ بینی.
(٥٠٠) لە بەردەمیا دانیشت، دەستی چەپی خستە سەر ئەژنۆکانی، و دەستی راستی نایە ژێر چەناگەی، و بەدەم پارانەوەوە گوتی: "ئەی زیوس، ئەی باوك، ئەگەر هەر خۆم لەنێو نەمراندا بە قسە یان بە کردەوە خزمەتێکم کردبێ، ئەوا ئەم تکایەم لێ قەبوڵ بکە،
(٥٠٥) کوڕەکەم سەرفراز بکە، ئەو کوڕەی کە بە گەنجی دەمرێ. ئاگامەمنوونی پاشای جەنگاوەران سوکایەتی پێکردووە و کەنیزەکەی لێ سەندووەتەوە و بۆ خۆی داگیری کردووە. سەرفرازی بکە ئەی گەورەی ئەنجومەنی ئۆڵەمپ، تەراوەدەییەکان زاڵ و باڵادەست بکە تا
(٥١٠) تا ئاخییەکان قەرەبووی کوڕەکەم دەکەنەوە و هەقەکەی دەدەنەوە." زیوس بۆ دەمێك بە بێدەنگی دانیشت، تاقە وشەیەکی لە زار نەهاتەدەر، لێ تیتس هەر باوەشی بە ئەژنۆکانیا کردبوو، بۆ جاری دووەم تکای لێکرد نیاز و نزاکەی بێنێتە دی. گوتی: "بە جوڵەیەکی سەرت رەزامەندی بنوێنە و پەیمانی راستیم بدەیە،
(٥١٥) یان داواکەم رەت بکەوە —خۆ تۆ باکت بە هیچ نییە- هەنگێ بێزاری تۆم لە خۆم بۆ دەردەکەوێ". "هەڵبەتە نارەحەت دەبم ئەگەر لەگەڵ هیرای ژنما بەشەڕم بدەی و تووشم بکەی، هیرا لایەنگری گریکەکانە، بە قسە سارد و سڕ و تەوسامێزەکانی دەمرەنجێنێ و زویرم دەکات؛
(٥٢٠) تاکو ئێستا لەبەردەم خواوەندەکانی دیکەدا گەرم پێدەکات و بەوە تاوانبارم دەکات کە یارمەتی تەروادەییەکان دەدەم. جا ئێستا بگەڕێوە، تا پێکەوەی نەدیووین. بە

خۆم تەگبیری مەسەلەکە دەکەم، و بەدڵی تۆی دەکەم.

(٥٢٥) تەمەشا، من سەر دادەنەوێنم تا تۆ باوەڕ بکەی. هەر ئەم کارەم لە دەست دێ دەرهەق بە هەر خواوەندێك، من کە سەر دادەنەوێنم نیشانەی ئەوەیە نە لە قسەی خۆم پاشگەز دەبمەوە، نە پشتگوێی دەخەم و نە ناکام دەبم لە جێبەجێ کردنی وەعدەکەم." کوڕی کرونوس (زیوس) ئەوەی گوت و برۆ چڕ و پڕەکانی وێك هێنانەوە، و پرچە بۆندارەکانی

(٥٣٠) بەسەر سەر نەمرەکەیەوە لەرییەوە و، ئۆڵەمپی مەزن لەگەڵیا لەرییەوە. کە لە دانانی پلانەکەیان بوونەوە، لێکدی جیابوونەوە، زیوس چوو بۆ کۆشکەکەی، بەڵام تیتس لە ئۆڵەمپی بەشکۆوە، بۆ بنکی دەریا داگەڕا. هەموو خواوەندەکان بەر لەوەی بگاتە جێ لە شوێنی خۆیانەوە لەبەری هەستان. کەس نەبوو زاتی ئەوە بکات کە

(٥٣٥) لەبەری هەڵنەستێ، زیوس لەسەر کورسییەکەی خۆی دانیشت. بەڵام هیرا هەر کە بینی، زانی لەگەڵ( تیتس)ی زیوین پێ، کیژی کۆنترین و پیرترین خواوەندی دەریادا، پلانێکی خراپی داناوە، یەکسەر لێی ڕابوو و کەوتە سەرزەنشتکردنی.

(٥٤٠) هاواریکرد: "ئەی خاپینوك، لەگەڵ کام یەزداخانم دا راوێژو تەگبیرت دەکرد؟ تۆ هەمیشە پلانەکانت بەدزیەوە دادەنەی، لە پشتی منەوە، لە هیچم ئاگادار ناکەی، ئەگەر بەخۆت بتوانی چارەسەری بکەی، تەنانەت بە وشەیەك لە نیاز و مەبەستەکانت ئاگادارم ناکەی".

(٥٤٥) گەورەی خواوەندان و بنیادەمان وەڵامی دایەوە: "هیرا، تۆ بەتەما مەبە لە تەگبیر و راوێژەکانم ئاگادارت بکەمەوە. تۆ ژنی منی، بەڵام بە خۆت دەبینی زۆر زەحمەتە لێم تێبگەی. هەر کاتێ شایستەیی ئەوەت هەبێ لێم حاڵی ببی، گوێم لێ بگری، ئەوا دڵنیابە بەر لە تۆ چ کەسێك، نە خوا و نە بنیادەم ئاگادار ناکەمەوە، بەڵام کە دەمەوێ مەسەلەیەك بۆ خۆم و لای خۆم بپارێزم،

(٥٥٠) نابێ خۆتی تێهەڵقورتێنی و پرسیاران بکەی." هیرا وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی کرونوسی سامناك، ئەوە تۆ باسی چ دەکەی؟ خۆم هەڵقورتێنم و پرسیاران بکەم؟ نا، هەرگیز. دەبێ لێت گەڕێم ئازادانە بڕیار لەسەر هەموو شتەکان بدەی.

(٥٥٥) تا ئێستاش هەر وام کردووە، بەڵام گومانێکی بەهێز لە گۆڕێیە، چونکە تیتس، کیژی پیرترین و کۆنترین خواوەندی دەریا، قسەی لەگەڵ کردوویت، ئەم بەیانیە هەردوو

نەریوی له باوەش گرتبوویت. بۆیه پێموایه بەڵێنت دایێ که شکۆ و ئیحتوبار بۆ ئەخیل بگێڕیتەوه، و خەڵکێکی زۆر لای کەشتیی ئاخییەکان بکوژیت."

(٥٦٠) زیوس گوتی: "ژنەکه، من هیچ شتێ ناکەم، بەڵام تۆ گومانم لێدەکەی و کارەکانم کەشف دەکەی. هیچ شتێکێت لەمه دەستناکەوێ، تەنیا ئەوه نەبێ زیاتر خۆت لەبەرچاوی من بخەی. ئەمەشت زۆر لەسەر دەکەوێ، باوەڕ بکه، من ئەوه دەکەم که تۆ بیری لێدەکەیەوه،

(٥٦٥) کەواته به گوێم بکەو بەبێدەنگی دانیشه، دەنا ئەگەر بەم دوو دەستەم تێت بەربم، هەموو خواوەندانی ئاسمانیش بەهاناتەوه بێن بێسوده." ئیدی هیرا ترسا، ئارەزووه چەموشەکانی خۆی جڵەو کرد، و به بێدەنگی دانیشت.

(٥٧٠) له ماڵی زیوس دا، نیگەرانی باڵی بەسەر خواوەنده ئاسمانییەکاندا کێشا، تا سنعەتکاری مەعلان و کارامه هیفیستوس، ی ئاسنگەری خواوەندان، کەوته دڵدانەوەی هیرای دایکی: "زۆرم پێ ناخۆشه ئێوه ئاوا بەشەڕ بێن

(٥٧٥) و له ناو خواوەندانی ئاسمانا، لەسەر بەشەرانی فانی و مردەنی هەرا و هەنگامه بنەنەوه. ئەگەر ئەم قەرقەشه و گەنگەشه شوم و خەمناکانه بەردەوام بێ، ئیدی هیچ لەزەت و خۆشییەك له ئاهەنگ و بەزمەکەمان نابینین. ئەوەی لەسەر منه ئەوەیه دایکم ئامۆژگاری بکەم –که دەبێ خۆی ئەمه له من باشتر بزانێت- که لەگەڵ بابی ئازیزم زیوس دا نەرم و نیان بێ، تا بابم نەی بوغزێنێ و ئاهەنگەکەمان لێ نەشێوێنێ.

(٥٨٠) چونکه گەر خوای بروسکانی ئۆلۆمپایی بیەوێ له شوێنی خۆماندا بەر بروسکانمان بدات، له دەستی دێت، چونکه له هەمووماں بەهێزتره.کەواته قسەی خۆشی لەگەڵ بکه، با لەگەڵمانا میرەبان و باش بێ." پاش ئەوەی قسەکەی تەواو کرد، دوو جامی پڕ له نکتاری، ئەو شەرابەی نەمری بۆ خواوەندان دێنێ، هەڵگرت،

(٥٨٥) له دەستی دایکی نزیکی خستنەوه. گوتی: "هەڵگره، هەرچیت له توانادایه بۆی بکه. من زۆرم خۆشدەوێی، پێم ناخۆش دەبێ ئەگەر لەبەرچاوی من رەفتاری درێوو ناشیرینت لەگەڵ بکەن، زۆر خەمبار دەبم، لێ ناتوانم یارمەتیت بدەم، کەس ناتوانێ لەڕووی زیوس بوەستێ.

(٥٩٠) ئەوه بیر خۆت بێنەوه که جارێکیان هاتم یارمەتیت بدەم، هەر له قاچم نەوی و له ئاستانەی ئاسمانەوه توڕی دام، بەدرێژایی ڕۆژەکه، له بەیانییەوه تا ئێوارێ، هەر هاتمه

خوارەوە تا لای ئێوارێ لە دورگەی لیمتوسدا گەییمە سەر زەوی، و لەوێندەر گیرسامەوە وبەحاڵ هەناسەم تیا مابوو، تا سنتیانیون-ەکان هاتنو فریام کەوتن".

(٥٩٥) هیرا بۆ قسەکەی گرژییەوە، و بەدەم بزە و گرژینەوە یەکێك لە جامەکانی لە دەستی کوڕەکەی وەرگرت، هەنگێ هیفیستوس لە جامێکی تردا نکتاری لە چەپەوە بۆ ڕاست بەسەر خواوەکاندا گێڕا، خواوەندە پیرۆز و موبارەکەکان بەدەنگی بەرز پێکەنین و ستایشی ڕەفتارەکەیان کرد

(٦٠٠) کە تێ بەو چالاکییە لە کۆشکە ئاسمانیەکەدا دیتیان. ئیدی بەدرێژایی ڕۆژەکە و تا خۆرئاوا بەزم و ئاهەنگیان گێڕا، هەر هەمووان بەوپەڕی خۆشی و شادی بەشدارییان کرد، هەمووان ئاسودە و کەیفساز بوون. ئەپولۆ کەوتە ساز ژەنین، خواوەندانی هونەریش بەدەنگە خۆشەکانیان، یەك لەدوای یەك هەڵیان کردە گۆرانی چڕین.

(٦٠٥) بەڵام کە تیشکی درەخشانی هەتاوی بەشکۆ کەوتە تاریکی، هەر کەسە و چووەوە بۆ ماڵی خۆی و پەنای بردە ناو جێگە و نوێنی تایبەتی خۆی، ئەو جێگە و بانەی کە هیفیستوسە لەنگ بەوپەڕی کارامەیی و لێهاتووییەوە بۆی دامەزراند بوون. بەمجۆرە زیوس پەلەی لێکرد کە دەیەوێ بچێتە جێگەوە

(٦١٠) ئەو جێگەیەی هەمیشە تیای دەخەوێ، وکاتێ ئەو ڕۆیی، زیوس هەستا و دەیویست بنوێ و هیرای زێڕین عەرش لە پاڵیا بێ.

# سروودی دووەم

## تاقیکردنەوەکەی ئاگامەمنون و ئامادەکردنی لەشکر

**حیکایەتەکە:**

**زیوس سەرداری خواوەندان ئەو شەوە لە ئۆڵەمپدا هەر بیری لەوە دەکردەوە چۆن ئەو وەعد و بەڵێنە بەرێتە سەر کە بەتیتسی خواوەندی دەریا، و دایکی ئەخیلی دابوو. فێڵێکی دۆزییەوە کە گریکەکانی پێ بخاپێنێ، "خەونە شەوانەیەکی" ناردە خەوی ئاگامەمنون، وای تێبگەیەنێ کە سەردەکەوێ ئەمما سەرکەوتن. ئاگامەمنونیش بیری لەمە دەکردەوە، دەیەوێ بەسەر تەروادەییەکاندا سەربکەوێ، تا ئەخیلی تورە و تۆراو و دەستبەرداری جەنگ، بەهۆی ئەو کیژەوە کە ئاگامەمنون لێی زەوت کرد، پێی خۆش نەبێ. چونکە دۆڕاندنی هەر شەڕێك ناچاری دەکات. بچێ بۆ لای ئەخیل و تکای لێبکات بێتە مەیدانی جەنگەکە و بەشداری شەڕ بکات. جا لەبەر ئەوەی گریکەکان تاڵاوێکی زۆریان بەهۆی تیرەکانی ئەپولۆوە کە تاعونی لەناویاندا بڵاوکردەوە چەشت، ئاگامەمنون لێبرا بە فەندێك تاقیان بکاتەوە، ئەویش ئەوەیە پێیان بڵێ پێویستە بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێنەوە، کۆبوونەوەیەك بە فەرماندەکان بکات و لە تەگبیرەکەی ئاگاداریان بکات، و رایان بسپێرێ لەنێو سەربازەکان بڵاوبنەوە و بۆ شەڕەیان هانبدەن و بیریان بخەنەوە کە گەڕانەوە بۆ هەموو گریك زەلیلی و سەرشۆڕییە، ئیدی دەخرۆشێن و بەورەیەکی یەجگار بەرزەوە ئامادەی شەڕ دەبن. کاتێ هەڵدەستێ و دوای ئەم نۆ ساڵە بێوەرە مەسەلەی گەڕانەوە رادەگەیەنێ، سەربازەکان زۆریان کەیف دێت و بەرەو کەشتییەکان دلەزینن.**

**ئالێرەدا فەرماندەکان لەناویاندا بڵاو دەبنەوە، ئۆدیسیوس لە ئاگامەمنونی فەرماندەی گشتی نزیك دەبێتەوە و دارعەسای فەرمانڕەواییەکەی لێوەردەگرێت و بەسەرزەنشتەوە بەسەر سەربازەکاندا دەگەڕێ، نستورس هەوڵدەدا قەناعەتیان**

پیشانی که زیوسی خواوەند هێمایەکی ناردووە کە ئاماژەیە بۆ ماوەی خۆ ڕاگرتنی تەڕوادە، ئەویش بریتییە لە ئەژدیهایەك کە پەرەسێلکەیەك و هەر هەشت بێچووەکەی دەخوات و دەبێ بەکەڤر، ئەمە بەو مانایەیە کە تەڕوادە لە ساڵی دەیەمدا دەکەوێ. زۆربەی هەرە زۆری ساڵەکان بوریون، و ماوەیەکی زۆر کەم ماوە، و شانازی ڕوخان و وێرانکردنی تەڕوادە لەسەر دەستی ئەوان دێتە دی، جا چ شانازییەك لەمە گەورەترە. و ئۆدیسیوس وتەیەکی بەجۆش دەدات، لێ تیرسیتیسی سەربازی لاق خواری، لەنگی سەرتیژی، کەچەڵ، لێی هەڵدەستێ و بەناڕەزاییەوە هاوار دەکات هەموو کارێکی ئاگامەمنون لە جەنگدا ئەوەیە لە خێوەتەکانیا. برونز و ئافرەتێن یەخسیر کۆبکاتەوە، ئێمەش هیچمان پێنابڕێ، ئاگامەمنون هەر بەوەوە نەوەستاوە و کەوتۆتە زەوتکردنی دیاری و دەسکەوتی خەڵکی دیکەش، خۆ ئەگەر ئەخیل-یش بەکردەوەی ئەوەی کردبا لەناوی دەبرد و ئێستا نە دەمانبینی و نە بەگوێی ئەوەمان دەکرد، ئۆدیسیوس هیچ چاری نەما ئەوە نەبێ بە سەوڵەجانەکەی سەری بشکێنێ. ئیدی فەرماندەکان بەکۆمەکی ئەتینای خواوەند توانیان قەناعەت بەسەربازەکان بکەن و بۆ ناو کۆبوونەوەکە بگەڕێنەوە و ئامادەی جەنگ ببن، دوای پێشکەشکردنی کۆمەڵێك قوربانی بەم بۆنەیەوە. هۆمەر لەدوای ئەوەی باسی بەشدارانی جەنگەکە و فەرماندەکانیان و ئەو وڵاتانەی لێوەی هاتوون و باسی هەسپ و قاترەکان و ژمارەی کەشتییەکانیان دەکات...هتد لە دیمەنی دووەمدا زیوس دێتە سەر تەڕوادەیەکان، و ئایریس-ی خواوەند و پەیامبەری ئاسمانیان بۆ دەنێرێ، ئایریس لە شێوەی کوڕەکەی پریامدا دەردەکەوێ، دەکەوێتە هۆشیارکردنەوەیان لە هێرش و پەلامارێکی نزیك و چۆن گریکەکان دەشتەکەی بەردەم کۆشەکەی بریام-یان داپۆشیوە. بە بریامی گوت هێشتا بەجۆرێ قسان دەکات وەك ئەوەی ئاشتی بەرقەرار بێ، کەچی گریکەکان خۆ بۆ هێرشێکی ترسناك و گەورە ساز دەدەن. و ئامۆژگاری هیکتۆری کوڕی پریامی کرد، کە هاوپەیمانەکان بەگوێرەی ئەو زمانەی قسەی پێدەکەن ڕێك بخات تا سەربازەکان لە فرمانەکانی فەرماندەکەیان تێبگەن، هیکتۆری کوڕی بریام فەرماندە و گەورە قارەمانی ناو ڕیزی تەڕوادەییەکان بوو. هۆمەر لێرەدا باسێکی ژمارەی سەربازان و ئەسڵ و فەسڵ و وڵات و فەرماندە و هەسپەکانیان دەکات، بەڵام نەك بەو وردی

و دیمەنەی کە لە باسی هێزی گەورەی گریکەکاندا دەیبینین.

کات:

سەربورەکانی سروودی دووەم تەنیا لە بەشێکی ڕۆژی بیست و نۆیەمدا ڕوودەدەن: دوا بەتڵی شەو، کە ئاگامەمنون ئەو خەونە دەبینێ کە زیوس نادرویەتی، ئەوجا بەشێکی ڕۆژەکە.

شوێن:

ڕووداوەکان لە دوو شوێندا ڕوو دەدەن: لە کەناری دەریا کە گریکەکان لەوێندەر لەبەردەم کەشتییە لەنگەر گرتووەکانیان دان، ئەوجا لە تەروادەدا کە دوای هاتنە خوارەوەی ئایریسی یەزدانخانم خۆ بۆ بەرەنگاری تەیار دەکەن.

هه‌موو خواوه‌نده‌كانی دیكه و جه‌نگاوه‌ره چه‌كداره‌كانی ده‌شته‌كه له نێو هه‌نگامه و هه‌راو زه‌نادا لێی خه‌وتن، به‌ڵام زیوس هه‌ر به‌خه‌به‌ر بوو، بیری له‌وه ده‌كرده‌وه چۆن ئه‌خیل سه‌ربخات و خه‌ڵكێكی فره له ئاخییه‌كان به‌لای كه‌شتییه‌كانیانه‌وه له‌نێو ببات. له‌سه‌ر ئه‌و بیره گیرسایه‌وه كه باشتر وایه شه‌وانه خه‌ونێك بۆ شا ئاگامه‌منون بنێرێت؛ یه‌كێك له‌و خه‌ونانه‌ی گازكرده نك خۆی و پێی گوت "ئه‌ی شه‌وانه خه‌ون، هه‌ره بۆ ده‌ف كه‌شتی ئاخییه‌كان، خۆت به‌سه‌راپه‌رده‌كه‌ی ئاگامه‌منوندا بكه‌و چ ئه‌مرێكت پێده‌كه‌م وشه به‌وشه بۆی بگێره‌وه. پێی بێ یه‌كسه‌ر هه‌موو ئاخییه‌كان بخاته ژێر چه‌كه‌وه و ته‌یاریان بكات، چونكه كاتی ئه‌وه هاتووه به‌سه‌ر ته‌رواده‌ییه‌كاندا سه‌ربكه‌وێ. و ئێستا خواوه‌نده‌كان ناكۆك نین؛ هیرا دڵی هه‌موویانی بۆ خۆی ڕاكێشاوه و سورن له‌سه‌ر وێران كردنی ته‌رواده‌ییه‌كان. "خه‌ونه‌كه" هه‌ر كه گوێی له په‌یامه‌كه‌ی بوو، ڕۆیی، و یه‌كسه‌ر گه‌ییشته ده‌ف كه‌شتی ئاخییه‌كان. له ئاگامه‌منونی كوڕی ئوتریوس گه‌ڕا، له خێوه‌ته‌كه‌ی خۆیدا بینییه‌وه كه خۆی له لیفه‌كه‌یه‌وه ئاڵاند بوو و خه‌وێكی قوڵی لێكه‌وتبوو. له شێوه‌ی نستوری كوڕی نیلیوسدا، كه ئاگامه‌منون له گشت شیره‌تكاره‌كانی پتر ڕێزی ده‌گرت، به‌سه‌ر سه‌ریا زڕی و سوڕایه‌وه:" ئه‌وه تۆ نووستووی ئوتریوسزاده؛ خه‌و بۆ كه‌سێك نه‌هاتووه كه خێری سوپاكه‌ی و سوپاكانی دیكه‌ی گه‌ره‌ك بێ. گوێم لێبگره، چونكه من له‌لایه‌ن زیوسه‌وه بۆ لای تۆ نێردراوم، خواوه‌ند زیوس، ئه‌گه‌رچی لێته‌وه نزیك نییه، به‌ڵام ده‌خه‌متدایه و دڵی له‌لاته. ئه‌مرت پێده‌كات كه یه‌كسه‌ر ئاخییه‌كان ته‌یار بكه‌ی تا له ژێر چه‌كدا بن، چونكه ته‌رواده ده‌گریت. هیچ ناكۆكییه‌ك له‌نێو كۆڕی خواوه‌ندانا نه‌ماوه، هیرا هه‌موویانی بۆ لای خۆی ڕاكێشاوه، له‌سه‌ر ده‌شتی زیوس كاره‌سات و ماڵوێرانی به‌سه‌ر ته‌رواده‌ییه‌كانا دێت. ئه‌مه‌ت له‌بیر بێ، و كه له خه‌و راده‌بی هیچ شتێك فه‌رامۆش نه‌كه‌یت." خه‌ونه‌كه ئه‌وه‌ی گوت و به‌جێی هێشت. بیری له ڕابردوو كرده‌وه، بیری له‌و شتانه كرده‌وه كه هێشتا نه‌یكردوون. قه‌ناعه‌تی وابوو هه‌ر ئه‌و ڕۆژه به‌سه‌ر ته‌رواده‌دا سه‌رده‌كه‌وێ، به‌ڵام نه‌یده‌زانی چی له مێشكی زیوسدایه، چه‌ند شه‌ڕی دژواری بۆ داناییه‌كان و ته‌رواده‌ییه‌كان شاردۆته‌وه. ئاگامه‌منون له خه‌و

رابوو، هێشتا ئەم پەیامە پیرۆزە لە گوێیدا دەزرنگایەوە، دانیشت، کراسە نەرمە جوان وتازەکەی لەبەرکرد، پاڵتۆ قورسەکەی بەسەریا کرد. قەیتانی پێڵوەکانی بەسەر پێیە جوانەکانیا بەست،

شمشێرە دەسکزیونیەکەی لە شان کرد، ئەوجا دارعەساکەی بابە نەمرەکەی هەڵگرت، ئەوجا بەرەو کەشتی ئاخییەکان بەدەریادا وەرێکەوت. ئیدی خواوەندی سپێدە بەرەو لوتکەی ئۆڵەمپ هەڵگەڕا تا مژدەی هەڵاتنی ڕۆژ بەزیوس‌و باقی نەمرەکان بدات،

ئاگامەمنون جاڕچی ناردن کە خەڵکەکە بۆ کۆبوونەوە بانگ بکەن، جاڕی خۆیان داو خەڵکەکەیان لەوێندەر کۆکردەوە. بەڵام لێبڕا یەکەمجار کۆبونەوەکە لە کەشتییەکەی (نستور)ی گەورە و پاشای بیلوس دا بکرێ،

کاتێ کە هەموو کۆبوونەوە، لەبەردەمیانا وەستا و پەردەی لەسەر نیازی خۆی لادا و گوتی: "ئەی دۆستان! لە شەوی تاریکدا خەونێکم بینی کە لە ئاسمانەوە بۆم هاتبوو، پەیامبەرەکە تەواو دەشوبهایە سەر نستور. بەسەر سەرما سوڕایەوە و گوتی:

ئەوە تۆ خەوتووی ئەی ئوتریوس زادە، خەو بۆ پیاوێکی وەکو تۆ کە مەسئولیەتی سوپای خۆت و سوپای دیکەت دەستۆیە، نەهاتووە. باش گوێم لێبگرە، چونکە من پەیامبەرم و لەلای زیوسەوە هاتووم، ئەو زیوسەی هەرچەند لێتەوە نزیك نییە. بەڵام دەخەمتدایە و دڵی پێت دەسوتێ

زیوس ئەمرت پێدەکات یەکسەر ئاخییەکان بانگ بکەی بۆ ژێر چەك، چونکە تۆ بەسەر تەروادەدا سەردەکەوی و دەیگریت. خواوەندەکان چیتر ناکۆك نین، هیرا هەموویانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە، و تەروادەییەکان کارەساتیان

لەسەر دەستی زیوسدا بەسەر دێت. "ئەمەت لەبیر بێ" ئەوسا خەونەکە لێیدا و ڕۆیی. لەخەو ڕاپەڕیم، جا با ئێستا ئاخیەکان تەیار و چەکدار بکەین. بەڵام باشتر وایە جاڕێ هەر بۆ تاقیکردنەوە بانگیان بکەم و پێیان ڕابگەیەنم کە بە کەشتیەکانیان هەڵێن.

بەڵام ئێوە بەوانی دی بڵێن کە بەناو لەشکرەکەدا بسوڕێنەوە و قسەیان بۆ بکەن کە ئامادەی شەڕ بن" ئاگامەمنون دوای ئەم قسەیە دانیشت. نستوری پاشای بیلوس بە هەموو ویقار و سام و حیکمەتێکەوە هەستاو ڕووی دەمی تێکردن و گوتی: ئەی دۆستانم، ئەی مێران و شیرەتکارانی ئارگوسییان،

ئەگەر پیاوێکی دیکەی ئاخییان ئەم خەونەی بۆ بگێڕابایەنەوە، دەمانگوت خەونە

درۆیینەیەکی بێ بناوانە، و هیچ کارێکمان نەدەکرد. بەڵام ئەوەی ئەم خەونەی دیتوە پێشەنگی هەموومانە، کەواتە دەبێ داوا لە خەڵکی بکەین کە چەك هەڵگرن". قسەکەی تەواو کرد و لە کۆبوونەوەکە کشایەوە،

پاشا گۆچاندارەکانی دیکەش لەگەلیدا هەستان و بە فرمانی ئاگامەمنونیان کرد، بەڵام جەماوەرەکە یەکسەر هاتنەبەرەوە تا گوێیان لە قسەکان ببێ. وەکو پورەی هەنگ بن و پەیتا پەیتا لە کلۆرە کەڤرانەوە بێنە دەرێ، و لە گوڵین بەهار بورِوکێن، برِێکیان لێرەو برِێکیان لەوێندەرێ،

ئا بەو شێوەیە ئاپورای هارِوژاو لە کەشتی و خێوەتەکانەوە رووی کردە شوێنی کۆبوونەوەکە، و لە کەنارە پان و بەرینەکەدا ریز بوون، لەولاشەوە جارِچییەکە، پەیاماوەری زیوس، کەوتە سورِانەوە بەناویاندا و هانی دەدان بچنە پێشەوە.

ئیدی بەجۆرێکی پرِ هەرا و زەنا و ترس کۆبوونەوە، کاتێ جەنگاوەرەکان لەجێی خۆ دانیشتن زەوی لەژێر پێیاندا هاتە ناڵین، نۆ جارِچی کەوتنە هاوار تا بێدەنگ ببن و بەگوێی خۆیان قسەی پاشاکان بژنەون، لە ئەنجامدا شوێنی خۆیان گرت و ئارام بوونەوە.

هەنگێ ئاگامەمنون رابوو، گۆچانەکەی بەرزکردەوە. ئەم گۆچانە (سەوڵەجان= دارعەسای فەرمانرِەوایی) دەستکردی هیفیستوس بوو، کە پێشکەشی زیوسی کورِی کرونوسی کردبوو زیوس دابووی بەهرمسی پەیامبەری خواوەندان، کە ئارگۆسی هۆڤی پێ کوشبتوو، هرمس دابووی بە بیلوبسی ئەسپەوان،

بیلوبس دابووی بە ئوتریوسی شوانی گەلەکەی. وکە ئوتریوس مردبوو بۆ (تیستیس)ی خودان مێگەل و پەزانی فرەی بەجێهێشتبوو، وتیستیس-ش لەلایەن خۆیەوە دابووی بە ئاگامەمنون، بەو حەساوەی دەبێت بەسەردار و فەرمانرِەوای شاری ئارگۆس و دورگەێن فرە. جا ئاگامەمنون خۆی دا بەسەر گۆچانەکەیدا، بەمجۆرە روویکردە ئارگۆسییەکان:

دۆستانی من، قارەمانان، ئەی هاورِێیانی ئەریسی خواوەندی جەنگ، زیوسی کورِی کرونوس جەزرەبەیەکی توندی لە منداء ئەم خواوەندە زاڵمە بەڵێنی دامێ کە بەر لەوەی بۆ ولاتی خۆ بگەرِێمەوە، تەروادە، شارەکەی بریام وێران دەکەم، لێ درۆی دەگەڵ کردم، و ئێستاش فرمانم پێدەکات.

کە دوای لە دەستدانی گەلێك لە جەنگاوەرەکانم بۆ ئارگۆس بگەرِێمەوە. ئەمە ویستی زیوسە، ئەو زیوسەی زۆر شاری بەفەوتان داو لەگەڵ زەویدا یەکسانی کردن، و

زۆر سواری دیکەش وا لێدەکات، چونکە توانای ئەو لەسەرووی هەمووانەوەیە. ئیدی ئەم چیرۆکە خەمناکە دەکەوێتە سەرزاران

کە چۆن سوپای ئاخییان، بەهەموو گەورەیی و هێزێکیەوە، بێهودە دژی دژمنێکی بەژمارە کەم دەجەنگێ، و شەڕەکەش یەك لایی ناکاتەوە. بەڵام ئەوە بیر خۆتان بێننەوە کە ئاخییەکان و تەروادەییەکان بمانەوێ سەرژمێرییەکی دروستی خۆمان بکەین و درۆ لەگەڵ یەکتردا نەکەین

ئەگەر تەروادەییەکان بەپێی ئاماری دانیشتوان بێنە بەرەوەو، هەر تەروادەییەك بکەین بە ساقی و مەیگێڕی دەستەیەکی سوپاکەی خۆمان، ئەوا گەلێك لە دەستەکانمان بەبێ مەگێڕ دەمێننەوە، ئێمە بەژمارە گەلەك لەوان پترین.

بەڵام لەناو تەروادەدا هاوپەیمانانێکیان هەن کە لە شوێنانی ترەوە هاتوون، ئەمە کۆسپە و نایەڵێ شاری دەوڵەمەندی تەروادە وێران بکەم. ئێستا نۆ ساڵ بەسەر بەڵێنەکەی زیوسدا تێپەڕیوە

ئەوەتا تەختەی کەشتییەکانمان ڕزی، خواوەندان دەنگیان لێوە نایەت، ژن و منداڵەکانمان لەماڵەوە چاوەڕوان و نیگەرانی گەڕانەوەمانن، بەڵام تا ئێستا ئەو کار و ئەرکەمان ئەنجام نەداوە کە بۆی هاتووین. بۆیە دەبێ ئەوە بکەین کە پێتانی دەڵێم:

با سواری کەشتیەکانم ببین و بەرەو وڵاتی خۆمان هەڵێین، چونکە ناتوانین تەروادە بگرین." بەم قسانە ئاپوراکەی هاروژاند، تەنانەت ژمارەیەکی زۆریش لەوانەی بە کۆبوونەوە فەند ئامێزەکەی ئاگامەمنونیان نەزانی بوو. دەهاتن و دەچوون وەکو شەپۆلی

دەریای ئیکاری، کاتێ بای ڕۆژهەڵات و باشوری هەڵقوڵاوی هەورێن ئاسمان ڕای دەدا، یان وەکو تەبارە گەنمێك لە گوڵ و بۆقدا بەدەم بای ڕۆژاواوە کەڕوێشکە بکات، جا ئاپوراکە بەدەم هاتوهاواری بەرزەوە هریان دەکرد

بەرەو کەشتیەکان، تەپوتۆزی ژێر پێیان گەییە ئاسمان. بەدەم پاڵنانی کەشتییەوە بۆ ناو دەریا سێویان لە یەکدی دەکرد،ڕێگەی بەردەم کەشتیەکانیان پاك کردەوە، لە خۆشی گەڕانەوەدا، هات و هاواریان ئاسمانی پڕ دەکرد.

ئارگۆشییەکان دڵنیابوون کە دەگەڕێنەوە، بەڵام چۆنیەتی گەڕانەوەکەیان دیاری نەکرا بوو. بەڵام هیرا بە ئەتینای گوت: "ئەی هەڵگری سوپەری زیوس، ئەی ئەو کەسەی کە نە بێزار دەبێ و نەماندوو، ئایا ئارگۆسییەکان بەدەریای پان و بەریندا بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێنەوە،

و دەستبەرداری بریام و تەروادەییەکان دەبن کە شانازی بە زەوتکردنی هیلینەوە بکەن، ئەو هیلینەی کە گەلێك لە ئارگۆسییەکان لەڕای ئەودا لە تەروادەدا، و دوور لە وولاّتی خۆ مردن؟ هەر ئێستا برۆ و بەناو لەشکرەکە بکەوە و جەنگاوەر بە جەنگاوەر بیانگرە و بەقسەی خۆش بیاندوێنە

داوایان لێبکە کەشتییەکانیان نەجوڵێنن". ئەتینا هەر زوو بەزوو فرمانەکەی هیرای بەجێهێنا. لە لوتکە بەرزەکانی ئۆڵەمپەوە داگەڕ، و لە چاو تروکانێکا گەیشتە لای کەشتی ئاخییەکان. بینی ئودیسیوس، کە لە ژێریو تەگبیرکاریدا هاوتای زیوس بوو، لەوێدا،

بەتاقی تەنیا وەستاوە. هێشتا دەستی بۆ کەشتییەکەی نەبرد بوو، چونکە داخ و کەسەر دایگرتبوو، لێی نزیك بووەوە و گوتی: "ئودیسیوس، ئەی کوڕە نەجیبەکەی ئیرتیس،

تۆش بەتەمای بچی بۆ لای کەشتییەکانت و بەم شێوەیە بۆ وولاّتی خۆ بگەڕێیتەوە؟ دەستبەرداری بریام و تەروادەییەکان دەبێت بەو ئاسانیە هیلین بۆ خۆ گل بدەنەوە، ئەو هیلینەی گەلێك لە ئاخییەکان لەبەردەم شورەکانی تەروادەدا و، دوور لە ماڵی خۆیان، لە پێناویدا مردن؟ بڕۆو بەسەر لەشکرەکەدا بگەڕێ

یەك بەیەك قسەیان بۆ بکە و بێ با کەشتیەکانیان نەخەنەوە ناو دەریا". ئودیسیوس یەکسەر دەنگی یەزدانخانم ئەتینای ناسییەوە: عەباکەی توردا و بەپەلە بۆی دەرچوو. بەلاّم یوریباتسی ئیتاکەیی، خەڵکی شارەکەی ئودیسیوس، کە یار و هاوڕێی بوو، عەباکەی هەڵگرتەوە،

ئودیسیوس بەپەلە و یەکسەر چوو بۆ لای ئاگامەمنون، گۆچانەکەی ئاباد و ئەژدادانی نەمری لێوەرگرت، ئەوسا بەپەلە بەناو کەشتی ئاخییەکان کەوت. هەر پاشایەك یا فەرماندەیەکی دەبینی لە بەردەمیا دەوێستا و بەزمانی خۆش دەیدوان:

جەناب، ئەزبەنی، ئەم هەڵاتنەتان تەنیا ترسنۆکی و زەلیلییە. لە شوێنی خۆت بوەستە و داوا لە خەڵکەکەیش بکە لە جێی خۆ نەجوڵێن. تۆ هێشتا نیاز و مەبەستی ئاگامەمنونت بەتەواوی نەزانیوە؛ ئاگاداری دەکردینەوە، بەم زووانە سەری ئاخییەکان دەدات تا بزانن چەند تورەیە، خۆ هەمووومان لە کۆبوونەوەکە نەبووین تا گوێمان لە قسەکانی بووبێ؛

وریابە تورە نەبێ و خراپەیەکمان لەگەڵدا بکات، چونکە ڕۆژگاری شاهان مەزنە،

و دەستی (زیوس)یان لەگەڵە. هەر کە جەنگاوەرێك بە بۆڵە بۆڵ بەنزیکیدا ڕەتبوایە، گۆچانێکی پێدا دەماڵی و سەرزەنشتی دەکرد و دەیگوت:

(٢٠٠) خوتە و بۆڵەی چیتە؟ خۆ بگرە و گوێ لە کەسانی لە خۆت باشتر و شایستە تر بگرە . تۆ نە لە شەڕا دیاری و نە لە کۆڕی تەگبیر و ڕاوێژان؛ خۆ ناشبێ هەموومان هەر سەردار و سەروەر بین، فرە سەرداری باش نییە. دەبێ هەریەك کەس سەردار بێ.

(٢٠٥) کوڕەکەی کرونوس گۆچانەکەی و یاسا پیرۆزەکانی داوە بەیەك سەردار تا حوکمڕانی هەمووتان بکات." بەم ژیرییەوە بەناو لەشکر کەوت، خەڵکەکە بەپەلە لە خێوەت و کەشتییەکانیانەوە بەرەو کۆبوونەوەکە دەهاتنەوە و دەنگە دەنگیان دەتگوت هاژەی شەپۆلە و خۆ بەکەناردا دەکێشێت.

(٢١٠) دەریا هەر هاژە هاژی بوو. هەموو جێی خۆیان گرت و بێدەنگ بوون، تەنیا تیرسیتیس نەبێ کە زمانی لێ بەرەڵێ کرد بوو- جنێوی بەهەموو پاشا و سەرداران دەدا، ئەوانەی کە گوێیان نەدەدایێ،

(٢١٥) تەنانەت هەموو ئاخییەکانی هێنایە پێکەنین. لە هەموو ئەوانەی کە بۆ تەڕوادە هاتبوون ناشیرین تر بوو.. هەردوو لاقی خوار بوون، یەکێکیان دەلەنگی، شانەکانی کەوانەیی بوون و بەسەر سینگیدا چەمی بوونەوە. تەنیا چەند داوە موویەك بەتەپڵی سەرە تیژەکەیەوە بوو.

(٢٢٠) ئەخیل و ئۆدیسیوس (ئۆلیس) لە هەموو کەسێك پتر دەیانبوغزان، چونکە هەمیشە جنێوی دەدانێ و گەڕی پێدەکردن، بەڵام ئێستا بەدەنگێکی زیقن ئاگامەمنونی جنێوباران دەکرد. ئاخییەکان لێی توڕە بوون و بوغزاندیان، بەڵام ئەو هەر سوور بوو لەسەر جنێودانی خۆی بە کوڕەکەی ئۆتریوس.

(٢٢٥) هاواریکرد: "ئاگامەمنون ئێستا تۆ لە چی توڕەی، لەوەی پتر چیت گەرەکە، خێوەتەکانت پڕن لە برونز و ژنانی جوان، هەر کە شارێك دەگرین ژنی دنیات دەدینێ. ئەو هەموو زێڕەی کە تەڕوادەییەك

(٢٣٠) لە پێناوی ئازادی کوڕە دیلەکەیدا دەداتێ بەس نییە، ئەو کوڕەی کە من یان کەسێکی دیکە بەدیلی هێناویەتی؟ یان گەرەکتە کیژێکی دیلی جوانت بۆ بێنن لەگەڵیا ڕابوێری؟ تۆ کە فەرمانڕەوای ئاخییەکانی، بۆت نییە ئەم هەموو کلۆڵیو بەدبەختییەیان بەسەرا بێنی.

ئەی ترسنۆکانی بودەڵە، ئێوە لە ژن کەمترن، وەرن باسواری کەشتیەکانم ببین وبۆ وڵاتی خۆ بگەڕێینەوە و ئەم پیاوە لێرە، لەلای تەروادەییەکان بەجێ بێڵین و مژوڵی دیاری و دەسکەوتەکانی خۆی بێ، بۆی دەربکەوێ کە ئێمە خزمەتمان دەکرد یان نا. سەیری ئەخیل بکەن، کە لەو شایستە ترە، چتۆ مامەڵەیەکی لە تەکدا کرد. دیارییەکەی، کیژە جوانەکەی لێ سەندەوە و بۆ خۆی داگیری کرد. ئەخیل بەنەرمی مامەڵەی لەتەکدا کرد، و پەنای نەبردە بەر شەڕ، ئەگەر بەگژتا چووبایە، جارێکی دی سوکایەتیت پێنەدەکرد ئەی کوڕی ئەتریوس". تیرسیتیس بەو جۆرە لەسەری ڕۆیی، بەڵام ئودیسیوس لێی ڕابوو بەتوندی سەرزەنشتی کرد. گوتی: "زمانە هەڵەوەرەکەت بگرە، و فزە نەکەی. بە تەنیا بەگژ پاشایاندا مەچۆ. من دڵنیام لەناو ئەوانەدا کە لەگەڵ جووتە کوڕەکەی ئوتریوسدا بۆ تەروادە هاتوون، لەتۆ تورە هات تریان تیا نییە، وازلەم چەنەبازییە بێنە و چیتر جنێو بەپاشایان مەدە وباسی گەڕانەوە بۆ نیشتمان مەکە. ئێمە جارێ نازانین چ ڕوودەدات، نازانین ئایا ئاخییەکان بەسەرکەوتنی سەربەرزانە دەگەڕێنەوە یان بە ناکامی و بەدبەختی. چۆن زات دەکەی جنێو بە ئاگاممنون بدەی هەر لەبەرئەوەی داناییەکان بەم دەسکەوتانە پاداشتیان داوەتەوە؟ قەیدی نییە ئێستا من تێت دەگەیەنم و قسەی خۆیشم دەبەمە سەر- ئەگەر جارێکی دیکە بەم چەنەبازییەوە بت بینم، یا سەری خۆم دەبڕم و خۆم بەبابی تلیماخوس دانانەم، یان سوك و چروکت دەکەم و لە کۆبونەوەکە وەدەرت دەنێم و تێر و پڕت تێهەڵدەدەم، و بەگریان بۆ لای کەشتیەکانت دەنێرمەوە". بەگۆچانەکەی بەربووە پشت و شانی تا کەوتە سەر زەوی و دەستی بەگریان کرد. شوێنی گۆچانەکە بەسەر پشتییەوە خوێنی لێدەچۆڕا، بەدەم ئازارەوە دانیشت، گەوجانە کەوتە سڕینی فرمێسکەکانی. خەڵکەکە بۆی نارەحەت بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا لە دڵی خۆدا پێی پێدەکەنین، یەکێکیان ئاوڕی لە هاوسێکەی دایەوە و گوتی: "ئودیسیوس تا ئێستا زۆر کاری چاکی لە بواری شەڕ و تەگبیران دا کردووە، بەڵام باشترین کاری لەنێو ئارگوسییەکاندا ئەمە بوو کە دەمی ئەم پیاوەی داخست و نەیهێشت لەوەی پتر هەڵەوەڕی بکات. جارێکی دی سوکایەتی بە پاشایان ناکات." خەڵکەکە ئەو قسەیەیان دەکرد. ئەوسا ئودیسیوس

دوچان بەدەست هەستا، و ئەتیناش

(٢٨٠) لە شێوەی جارچیدا ئەمری بە جەنگاوەران دەکرد کە بێدەنگ بن، تا ئەوانەی لە دوور و نزیك وەستاون، گوێیان لە ئۆدیسیوس بێ و ئامۆژگارییەکەی بگرنە گوێ. هەنگێ ئۆدیسیوس بەدڵێکی پاك ڕووی تێکردن و گوتی: "جەنابی ئاگامەمنون، ئاخییەکان

(٢٨٥) شۆرەت و ناوبانگی جیهانیان پێ بەخشیت. کە لە شاری ئارگۆسەوە دەرچوون، بەڵێنی ئەوەیان دایتێ تا شاری تەروادە نەگیرێت، نەگەڕێنەوە، کەچی ئێستا لە وەعدەکەی خۆیان ژێوان بوونەتەوە، ئەوەتا وەکو منداڵ و بێوەژنان

(٢٩٠) بەگوێی یەکدا دەچپێنن و باسی گەڕانەوە بۆ نیشتمان دەکەن. ئەوی ڕاستی بێ زۆر ماندووبوون. پیاو کە بۆ تەنیا مانگێك بەسەر کەشتییەوە لە دەریادا گیرۆدەی زریان و شەپۆلان دەبێ، و لە ژنەکەی دادەبڕێ تورە دەبێ، چ جای ساڵان

(٢٩٥) ئەوە نۆ دانە ساڵە ئێمە لێرەین، بۆیە لۆمەی ئاخییەکان ناکەم گەر لە دڵی خۆدا بێزار و تورە بن؛ بەڵام ئەگەر دوای ئەم هەموو ساڵە بەدەستی بەتاڵ بۆ وڵات بگەڕێینەوە، دەبین بەگەپجاڕ وگازەندەمان دێتە سەر، جا دۆستان سەبرۆکەیەك بکەن، تا بزانین

(٣٠٠) ئاخۆ پێشبینییەکەی کالخاس ڕاستە یان درۆ. ئەوانەی تا ئێستا ماون، وا دەزانن دوێنێ و پێرێ بوو کە کەشتی ئاخییەکان لە مینای ئولیسەوە بەڕێ کەوتن بۆ شەڕی بریام و تەروادەییەکان

(٣٠٥) هەموو لە دەوری کانییەك خڕ بوووبووینەوە تا قوربانی سەدینە لەسەر قوربانگە پیرۆزەکان پێشکەش بە خواوەندان بکەین، بەو ناونیشانەی دار سنۆبەرێك لەوێ بوو کە ئاوێکی زوڵاڵی لەژێردا هەڵدەقوڵا. هەنگی هێمایەکی خواییمان بینی، چونکە زیوس ئەژدیهایەکی ترسناکی لەژێر ئەرزەوە نارد، پشتی سوری سوور بوو،

(٣١٠) لەژێر قوربانگەکەوە بەرەو دارسنۆبەرەکە هات. پەرەسێلکەیەك لەسەر لقێکی بەرز هێلانەی کردبوو، چەند بێچوویەکی بچووکی هەبوو، لەژێر گەڵاکانەوە سەرەتاتکێیان دەکرد، نۆ بێچو بوون، بەدایکیانەوە دەیانکردە نۆ دانە. ئەژدیهاکە بێچووە بچووکە بەستەزمانەکانی خوارد،

(٣١٥) دایکەکەیان هەندێ کشایەوە و بۆ بێچوە بچووکەکانی دەگریا، بەڵام ئەژدیهاکە کلکی تێوە ئاڵاند و باڵەکانی گرت و کەوتە هاوار. کاتێ ئەژدیهاکە هەموویانی بەبێچوو دایکەوە خوارد، ئەو خوایەی کە ناردبووی تا بیکات بە هێما و ڕەمز، لەبەرچاو ونی کرد،

چونکە زیوسی کوڕی کرونوس، کە خوایەکی فرە تەگبیر بوو، کردی بە کەڤر،

هەموو بە واقی وڕەوە تەمەشای ئەو ڕووداوەمان کرد، بەچاوی خۆ دیتمان چۆن ئەم نیشانە ترسناکە بەسەر سەد قوربانیەکەوە تێکشکا، کالخاس پێی ڕاگەیاندین کە ئەمە وەحی و سروشی ئاسمانە. گوتی: "ئەی ئاخییان بۆچی واقتان وڕماوە، ئەمە ڕەمز و نیشانەیەکە کە زیوس بۆی ناردووین،

زۆر بەر لە وەدیهاتنی بۆی ناردوین، بەڵام شۆرەتی هەرگیز لەبیر ناچێت. جا چۆن مارەکە هەر هەشت بێچوەکەی خوارد و بەدایکیانەوە کردیانی بەنۆ، ئێمەش بەو جۆرە نۆ ساڵان لە تەروادەدا دەجەنگین، لێ لە ساڵی دەیەمدا شارەکە دەگرین.،

ئەمە پێشبینیەکە بوو، جا ئێستا لەسەرتانە ڕووبەڕووی حەقیقەتەکە ببنەوە، بۆیە سەبر بکەن و بمێننەوە تا شارە گەورەکەی بریام دەگرین." ئارگوسییەکان بە یەك دەنگ هاواریان کرد، هاوارێکی وەهاکە کەشتیەکان لە دەنگی هاوارەکەیان لەرزین.

هەنگێ نەستوری سوارچاکی جیرینی هەڵیدایێ و هاواری کرد: "شەرمە بۆ ئێوە کە وەکو منداڵان قسە دەکەن، لە کاتێکا دەبێ وەکو پیاوان بجەنگن. ئەدی کوا پەیمان و بەڵێنەکانمان، ئەو سۆزەی دامان کێوە چوو؟

باشە وەعد و بەڵێنەکانمان، کۆڕ و کۆبوونەوەکانمان، لەگەڵ ئەو بادانەی خواردمانەوە و ئەو دەستە ڕاستانەی کە سوێندی هاوڕێیەتی و دڵسۆزیمان پێ خوارد تور بدەینە ئاگرەوە؟ ئێمە کاتی خۆمان بەقسەوە بەفیرۆ دەدەین، و بەم قسانە هیچ بەهیچ ناکەین. بۆیە ئەی کوڕی ئوتریوس، تۆ سوربە لەسەر ئامانجی بتەوی خۆت،

پێش ئارگۆسییەکان بکەوە بۆ شەڕ، و ئەم چەند جەنگاوەرە بودەڵانەی کە چەنەچەنی ئەوەیان، بەر لەوەی بزانین کە ئاخۆ زیوس ڕاست دەکات یان درۆ، بۆ ئارگۆس بگەڕێنەوە، بەجێبهێڵە.

چونکە کوڕە هەرە بەهێز و تواناکەی کرونوس، کاتێ ئێمەی ئارگۆسی بەسواری کەشتی، مەرگ و وێرانیمان، بۆ تەروادەییەکان دەهێنا، بەڵێنی دایێ کە سەردەکەوین. ئاماژەی خێری دایێ، کردیە کارێك بروسەکەکەی بەسەر دەستی ڕاستماندا بێچە بدات،

بۆیە هەرنە پێش، نابێ کەس پەلە لە ڕۆشتنەوە بکات،

تا هەریەکەمان ژنی پیاوێکی تەروادەیی نەگێ، و تۆڵەی ئەو هەموو عەزاب و ژانە نەکەینەوە کە لە پێناوی هیلین دا چەشتمان.

بەهەرحاڵ هەر کەسێك دەیەوێ زوو بۆ وڵات بگەڕێتەوە، لێیگەڕێن با بەس دەستی بگەیەنێتە کەشتییەکەی، بزانە چۆن بەبەرچاوی هەمووانەوە مەرگی خۆی دەبینێ. بەڵام ئەی پاشا، بیربکەوە و گوێ لە ئامۆژگاری من بگرە، چونکە ئەو قسەیەی دەیکەم بە ئاسانی لە بیر ناچێت. ئاگامەمنون جەنگاوەرەکانت بەپێی تیرە و تایفە جۆرا و جۆرەکانیان دابەش بکە. چونکە تیرە و تایفە پشتیوانی لێکدی دەکەن. ئەگەر ئەمەت کرد و، ئاخییەکان بە گوێیان کردی

هەنگێ فەرماندە و جەنگاوەرانت بۆ دەردەکەوێ، ئازایان لە ترسنۆکان جیادەکەیەوە، چونکە هەڤرکی یەکتر دەکەن. بەو جۆرە دەشزانی کە ئاخۆ ئەمە ویستی ئاسمانییە یان ترسنۆکی جەنگاوەرانە کە ناتوانی شارەکە بگری." ئاگامەمنون وەڵامی دایەوە:

"نەستور، ئەی جەنابی پیر، بە تەگبیرەکانت بۆری هەموو ئاخییەکانت دا. بەزاتی بابە زیوس، و ئەتینا و ئەپولۆ، ئەگەر من لەناو ئاخییاندا دە شیرەتکار و تەگبیرکەری وەکو تۆم هەبا، ئێستا دەمێ بوو شارەکەی بریام شا کەوتبووە دەستمان، و ویرانیشمان کردبوو.

بەڵام کوڕەکەی کرونوس ڕووبەڕووی قەرقەشە و شەڕم دەکاتەوە، من و ئەخیل لەسەر ئەم کیژە بەشەڕ هاتین، و لەم مەسەلەیەدا بەوە تاوانبار کرام کە من دەست پێشکەر بووم؛ ئەگەر جارێکی دیکە ئاشت بووینایەتەوە و هەڵوێستمان یەك بخستایە

ئەوا تەروادەییەکان بەرگەی تاقە ڕۆژێکیان نە دەگرتین. جا ئێستا نانی بەیانی بخۆن، ئەوسا سوپاکەمان بۆ شەڕ کۆ دەبێتەوە، نێزەکانتان تیژبکەنەوە، قەڵغانەکەنتان ڕێکبخەنەوە، و ئەسپەکانتان باش ئالیك بدەن، بە وردی عەرەبانەکان سەح بکەنەوە،

لەوەیە بچینە شەڕێکەوە تا ئێوارێ بخایەنێ، بۆ ساتێکیش پشووی تیا نابێت، تا شەو دادێ و لێکمان جیا دەکاتەوە، قایشی قەڵغانەکانتان بەسەر شانتانەوە ئارەقە دەکەنەوە، دەستان لە گرتنی نێزەکانتان ماندوو دەبێ،

وبەچاوی خۆتان دەبینن چۆن ئەسپی ژێرعەرەبانەکانتان لە ئارەقەدا هەڵدەکشێن، جا هەر کەسێك لە شەڕ هەڵبێ، یان بگەڕێتەوە بۆ لای کەشتییەکان، نابێ ئومێدی ئەوەی هەبێ کە نەبێ بە نەچیروخۆراکی کسۆك و سەر گەران". ئاگامەمنون بەو جۆرە قسەی کرد. ئاخییەکان قسەکانیان پێ پەسەند بوو، و هورایەکی وەهایان کێشا، لە تۆ وایە

سەپۆلنەو بەدەم بای باشورەوە بەرز دەبێتەوە و خۆی بەکەناراندا دەدات و باهۆز بەهەموو لایەکیدا دەبات. ئاخییەکانیش بەو ئاوایە هەستان و لە هەموو قوڵێکەوە بەپەلە بەرەو کەشتییەکانیان رۆییشتن. و لەوێ و لە خێوەتەکانا ئاگریان کردەوە و نانەکەیان خوارد،

(٤٠٠) و هەر جەنگاوەرێك قوربانییەکی بۆ یەکێك لە خواوەندەکان کرد، نوێژیان بۆ کردن و لە بەریان پاڕانەوە کە بە سەلامەتی لە شەڕ بگەڕێنەوە؟ ئاگامەمنونی سەرداری جەنگاوەرەکانیش گایەکی پێنج ساڵانی بۆ کوڕەکەی کرونوس کردە قوربانی، فەرماندە و ردێن سپیانی لەشکرەکەی بانگ کرد

(٤٠٥) هەوەڵجار ڕاوێژی بە نەستور و ئیدومینویوس شا، ئەوجا برایان ئیاکس، و کوڕەکەی تیدیوس، و شەشەمین میوان ئودیبوس بوو، کە هاوتای زیوس بوو لە ڕاوێژ و تەگبیردا، لێ مینیلاوس دوایی بەخۆی هات، چونکە دەیزانی کە برایەکەی چەند مژول و سەرقاڵە.

(٤١٠) هەموو بە جامی بادەوە لە دەوری گایەك وەستان، ئاگامەمنون بەدەم نوێژ و نزاوە گوتی: "ئەی زیوس، ئەی هەرە بەتوانا، ئەی ئاکنجی ئاسمان، ئەی خوای هەورانی گەواڵ گەواڵ، خواوەندا وەعدمان بدەیێ کە هەتاو ئاوا نەبێ و شەو دانەیەت تا کۆشکەکەی بریام هەرەس نەهێنێ،

(٤١٥) و تا دەرگاکانی نەبنە خۆراکی ئاگر، وەعدم بدەیە کە شمشێرەکەم قەڵغانەکەی هیکتۆر لە ئاستی دڵییەوە دیواودەربکات، و هاورێکانی بەچواردەوریا لە گڵ بگەوزن و بەدەم ئازاری مەرگەوە قەپ بەزەویدا بکەن." بەو جۆرە پاڕایەوە و نزای کرد، بەڵام کوڕەکەی کرونوس حەزی نەدەکرد جارێ دوعاکەی گیرا بکات.

(٤٢٠) قوربانیەکەی لێ قەبوڵ کرد، بەڵام گرفت و سەریەشەکانی زیاتر بوون. دوای ئەوەی پاڕانەوە و قوربانییەکەیان بە بادە ئاورشێن کرد، سەری گایەکەیان هەڵبڕیو، سەریان بڕی، و کەوڵیان کرد، ئێسکی ڕانەکانیان بڕی، دوو چین چەورییان تێوە پێچا، و چەند پارچە گۆشتێکی خاویان خستە سەر قوربانیەکە.

(٤٢٥) بەدار ئاگریان کردەوە، گۆشتی خوانەکەیان لە شیشدا و خستیانە سەر ئاگرەکە تا ببرژێ، و کاتێ ئێسکی ڕانەکان سوتا، و شیشەکان برژان، باقی گۆشتەکەیان بڕی و لە شیشیاندا، و برژاندیان تا پێگەیی، و ئەوجا دایانماڵی؛

(٤٣٠) ئەوجا کە لەکار بوونەوە و دەعوەتەکە ئامادە بوو، خواردیان و هەر کەسە و

بەشی تەواوی خۆی درایێ، تا هەمووان تێر بوون. کە لە خواردن و خواردنەوە بوونەوە، نەستوری، سوارچاکی جیرینی، کەوتە قسان و گوتی: "ئەی ئاگامەمنون، ئەی پاشای جەنگاوەران،
(٤٣٥) با بە قسانەوە مژول نەبین، و تازووە ئەو کارەی کە ئاسمان پێی سپاردوین ئەنجام بدەین، فرمان بدە کە جارچیان، سوپای ئاخییان ئاگادار بکەنەوە کە لەلای کەشتیەکانیان کۆببنەوە، ئێمەش برۆین و بچینە ناو سوپاوە و،
(٤٤٠) و یەکسەر دەست بەشەڕ بکەین". بەو جۆرە قسەی کرد و ئاگامەمنون قسەکانی بەهەند وەرگرت، دەستبەجێ جارچی ناردن کە داوا لە خەڵکەکە بکەن کۆببنەوە. جەنگاوەرەکان زوو بەزوو خڕبوونەوە.
(٤٤٥) فەرماندەکانی کوڕی ئوتریوس، جەنگاوەرانی خۆیان هەڵبژارد و فەرماندەیی مەیدانییان پێ سپاردن، ئەتینا بەخۆی و مەتاڵەکەیەوە لەناویانا دەسوڕایەوە، ئەو مەتاڵەی کە نەکۆن دەبوو و نە دەمرد. و سەدان ریشوی زێڕی خاڵیسەی پێدا شۆڕ بووبووەوە، ئەو ریشوانەی باش رێسرابوون، و هەر ریشویەکی سەد سەرگای دێنا
(٤٥٠) ئەتینا بەم مەتاڵەوەوە و بەجۆش خرۆشەوە، بەناو لەشکری ئاخییاندا دەسوڕایەوە و هانی دەدان کە پێشرەوی بکەن، زات و جورئەتی دەخستە دڵی یەکە بەیەکەیانەوە، بەو رادەیەی یەکسەر و بێ وەستان بچێتە شەڕەوە. بەو جۆرە تا وایان لێهات شەڕیان پێ خۆشتر بێ، لە سواری کەشتی و گەڕانەوە بۆ وڵات.
(٤٥٥) وەکو چۆن ئاگرێکی گەورە لەسەر ترۆپکی چیایەك هەڵگیرسێ و بڵێسە بسەنێ و لە دوورەوە شۆق بداتەوە، بەو ئاوایە بەدەم پێشڕەوییەوە بروسك و هوڕی قەڵغانەکانیان گەییە حەوت تەبەقەی ئاسمان. وەکو چۆن پۆلی بێ شوماری
(٤٦٠) قازان یا قەتاری قورینگان بەسەر مێرگ و دەشتی چواردەوری ڕوباری کیستەردا، لێرەو لەوێ بەپەلە و خێراخێرا دەڕۆن، و بەهێزی باڵەکانیانەوە دەنازن، بەدەم قاوقیژەوە دەنیشنەوە، و دەنگیان لە زۆنگاواندا دەنگ دەداتەوە، بەو ئاوایە تیرەو تایفەکان لە کەشتی و خێوەتەکانەوە بەرەو
(٤٦٥) دەشتی سکاماندروس هوروژمیان هێنا، زەوی لەژێرپێی جەنگاوەران و ئەسپاندا، لەرزی. وەکو مەزرایەکی چڕ کە لە بەهاری گوڵ و گەڵادا بێ، وەستان. وەکو چۆن پورەی مێش
(٤٧٠) بەدەوری ماڵی شواندا لە وەرزی بەهارا کە ئامانان تەژی شیر دەبن، دەسوڕێنەوە و

دەدرمێن، بەو ئاوایە ئاخییەکان بەسەر دەشتەکەدا دابارین تا ڕووبەڕووی تەرەوادەییەکان ببنەوە و تەفرو تونایان بکەن. سەرکردەکان، جەنگاوەرەکانیان جیا کردەوە تا بۆ شەڕ سازیان بدەن، هێندە بە ئاسانی جیایان کردنەوە

(٤٧٥) وەکو چۆن شوانکارەیەك پەزە تێکەڵاوەکانی لەکاتی لەوەڕدا دەناسێتەوە و جیای دەکاتەوە. ئاگامەمنونی سەرداریش بەسەروچاوی چوون سەروچاوی زیوسی خودان بروسکە، بەکەمەری چوون کەمەری ئەریسی خوای جەنگ، و بەسینەی چوون سینگی خوای دەریا (بوسیدون)ەوە کەوتە ناویان

(٤٨٠) وەکو گایەکی مەزن و پێشەنگ و دیار لەناو گاران دا، زیوس بەو جۆرە کوڕەکەی ئوتریوسی لەنێو ئاپورای قارەماناندا قوت کردەوە، جا ئێستا ئێوە ئەی خواوەندانی هونەران، ئەی ئەوانەی لە ئۆڵەمپ نیشتەجێن، پێم بڵێن

(٤٨٥) چونکە ئەنگۆ خواوەندن و لە هەموو شوێنێ هەن، بەچاوی خۆ هەموو شتان دەبینن و دەزانن، بەڵام ئێمە تەنیا بانگەشان دەبیستین و هیچ نازانین —پێم بێژن کێ رابەر و سەروەرانی داناییەکانن؟ بەڵام سەبارەت بە عەوامی جەنگاوەران، ئەوەندە زۆرن ئەگەر دە زمانم هەبوایە،

(٤٩٠) هەرگیز دەنگم نەکەوتبووایە و دڵێکی ئاسنم هەبوایە، ناوی تاقە یەکێکیانم نەدەزانی، ئەگەر ئێوە ناویانتان پێ نەگوتبام، ئەی خواوەندانی ئۆڵەمپ، کیژانی زیوسی قەڵغاندار، بەهەرحاڵ ناوی کەشتیوانەکان و هەموو کەشتیەکانتان پێکەوە پێدەڵێم. بینیلیوس و لیتوس

(٤٩٥) و ئەرکیسیلاوس و بروتونور و کلونیوس فەرماندەی بوتیەکانن. ئەمانە ئاکنجی وڵاتی ئولیسی کەڤرۆکن، کەسکونیوس و سکولوس و شاخەکانی ئیتونوس دەگرێتەوە، لەگەڵ تیسالیا وگرایا و شارە جوانەکەی میکالیسوس. هەروەها هارما و ئیسلیسیوم و ئەریتریاش دەگرێتەوە

(٥٠٠) ئەمانە خاوەنی ئیلون و هیلی و بیتیو و ئوکالا و دارستانە گەورەکەی میدیون و کوبیا و یوتریسیس و تسبی پڕ لە کۆترە باریکەن، و کورونیا، و پاوەنەکانی هالیارتوس و بلاتیا و گلیساس،

(٥٠٥) و دارستانی تیبە و ئونشیستوس و ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی بوسیدون، و هەروەها ئەرنی بە ناوبانگ بەرەزوترێ؛ و میدیا و نیسای موبارەك و پیرۆز، و ئەنیتدونی سەر

دەریا. لەوێندەرەوە پەنجا کەشتی هاتوون، و هەر کەشتییەک سەد و بیست لاوی بوتیی تیابووە. ئاسکالافوس و ئیالیمینوس، کوڕانی ئەریس، رابەری ئەو گەلەیان کرد کە لە ئەسبلیدون و ئورخومینوس ئاکنجی بوون. ئەم دوانە لە پاکیزەیەکی خانەدان لە ماڵی ئوکتوری کوڕی زیوس لە دایك بووبوون، چونکە ئەو پاکیزەیە لەگەڵ ئەریسی خواوەندی جەنگدا بەدزییەوە چوو بووە ژوورێکی سەرەوە لەوێ لەگەڵیا خەوتبوو. سی دانە کەشتی لەگەڵ ئەوانەدا هات. سکیدیوس و ئیبستروفوس، کوڕانی( ئیفتوس) ی بەتوانای کوڕی توبولوس ڕێبەرایەتی فوشییەکانیان کرد، ئەو دووەی کە سیباریوس، و بیتوی کەڤرۆکیان گرتبوو، هەروەها کریسای پیرۆز و دولیس و بانوبیوس، هەروەها ئەوانەی لە ئەنیموریا و هامبولیس و لە دەوروبەری ئاوی ڕوباری کیفیسوس، و لیلای نزیکی سەرچاوەکانی کیفیسوس ئاکنجی بوون، لەگەڵ فەرماندەکانیاندا بەچل کەشتی هاتبوون، هێزی فوشییەکانیان لەگەڵ خۆدا هێنابوو، کە لە نزیکی بوتییەکاندا، بەدەستە چەپیاندا هەواریان هەڵدابوو. ئەجاکسی کوڕی ئویلیوس ڕێبەرانی لوکرییەکانی کردبوو. ئەمە وەکو ئەجاکسی کوڕی تیلامون گەورە نەبوو، پیاوێکی بچووك بوو. قەڵغانەکەی کەتان بوو، بەڵام لە بەکارهێنانی نێزەدا لەهەر هەموو هیلینی و ئاخییەکان باشتر بوو. ئەمانە لە سینوس و ئوبوس و کالیاروس و بیسا و سکارفی و ئوجیای جوان و تارفی و ترونیومی نزیکی ڕوباری بوگریوسدا دەژیان. لەگەڵیا چل کەشتی لە لوکرییەکانی بەرانبەر یوبویا هاتبوو، و ئەبانیتسە سامدارەکان کە یوبویا و هەموو شارەکانی یوبویا و خالکیس و ئیریتریا و هیستیای پڕ ڕەز و ترێ، و( سیرنتوس)ی سەر دەریا و شارە کەڤرۆکەکەی (دیون)یان گرتبوو، و جەنگاوەرانی کارستوس و (سیترا)ش لەگەڵیان هاتبوون ئیلفینو ڕابەرایەتی ئەمانەی دەکرد، ئیلفینو لە خانەدانی ئەریسی خواوەندی جەنگ بوو، کوڕی خالکودون، و سەرداری هەموو ئەبانتیفەکان بوو. لەگەڵیا هاتن و یەك ئوستوڵ خواردنیان لەگەڵ خۆدا هێنا بوو، قژە درێژەکانیان بەپشتیانا بەر بوو بووەوە، ئەمانە جەنگاوەری ئازان، و دەیانەوێ بەنێزەکانیان، کە لە دار بەڕوو دروستکراوە کەمەری دژمنەکانیان بشکێنن.

(٥٤٥) چل دانه کەشتی لەگەڵ ئەم فەرماندەیەدا بوو. بەڵام لەوانەی کە لە شارە بەهێزەکەی ئەتینادان، ئەوانە گەلی (ئێریختوس)ن، کە لە هەمان گڵ و خاك لە دایك بووە، کە کیژەکەی زیوس ئەتینا پەروەردەی کردو، لە ئەتینا، لە پەرستگە ئاوەدان و دەوڵەمەندەکەیدا ئاکنجی کرد. جا لەوێ لەگەڵ تێپەڕبوونی زەمان و ساڵ لەدوای ساڵ ئەتینییەکان کەوتنە پەرستنی

(٥٥٠) و قوربانی کردن بۆی لە گا و بەرانان. مینیسیتوس-ی کوڕی فیتیوس کە فەرماندەیان بوو. لە ڕابەرایەتی گالیسکان و سەربازانی پیادەدا بێ هاوتا بوو، هیچ جەنگاوەرێکی زیندوو نەبوو شان لە شانی بدات.

(٥٥٥) تەنیا نەستور، کە لەو بەتەمەنتر بوو، هاوتای دەکردەوە. ئەم فەرماندەیەش پەنجا کەشتی بەدواوە بوو. ئەجاکس دوازدە کەشتی لە سالامیسەوە هێنا و لە پاڵ کەشتی ئەتینییەکانا رایگرتن. بەڵام جەنگاوەرانی ئارگوس، ئەوانەی کەشورە و قەڵاکانی (تیرینیس)یان گرتبوو

(٥٦٠) لەگەڵ هیرمیونی و ئەسینی سەرکەنداودا، و لەگەڵ تروزین و ئیونی و وڵاتی ڕەز و مێوان لە ئەبیدوروس، و لاوانی ئاخییانی کە لە ئیجینا و ماسیسەوە هاتبوون، ئەوانە کە سەرکردەکانیان دیومیدسی شێری نەڕە لە جەنگاو، ستینیلوسی کوڕی کابانیوسی بەناوبانگ بوون

(٥٦٥) ئەمانە یوریالوسی فەرماندەشیان لەگەڵ بوو، کە کوڕی شامیکیستیوسی کوڕی تاولاس بوو، بەڵام دیومیدس سەرکردەی هەر هەموویان بوو. ئەمانە هەشتا کەشتیان بەدواوە بوو. ئەوانەی کە شارە بەهێزەکەی مسینا و کورنتەی دەوڵەمەند و کلیونیا و ئورنیا و ئەریتیریا و لیسون) یان کە تا ماوەیەکی زۆر لەژێر حوکمی ئەدراستوس دا بوو، و هیبیرسیا و گونوسای ژوورو و بیلینی و ئیجبیوم

(٥٧٥) و هەموو وڵاتە کەنارییەکانی دەوری هیلیکی-یان لەژێر دەستدا بوو، ئەوان سەد کەشتیان لەژێر فەرماندەیی شا ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوسدا نارد بوو. باشترین و زۆرترین لەشکرییان لەگەڵ ئەمدا بوون، پاشا بەخۆی و مەتاڵە برونزییە بریقەدارەکەیەوە لە ناوەڕاستا و لەناو هەموو قارەمانەکاندا دیار بوو،

(٥٨٠) چونکە مەزنترین پاشا بوو، و زۆربەی جەنگاوەران لەژێر ئەمری ئەودا بوون. ئەوانەی کە لە لاسیدیمون دادەنیشتن، ئەوانەی نێوان هەردوو بانی فاریس و ئەسپارتە،

لەگەڵ میسی مەڵبەندی کۆتران، و بریسیا و ئوجیا و ئەمیلیکا، و هیلوسی سەر دەریا

(٥٨٥) و هەروەها لا س و ئویلیلوس، (مینیلاوس) ی دەنگ دلێری شەڕ و برای ئاگامەمنون فەرماندەیی دەکردن، ئەمانە شەست کەشتیان پێ بوو، دوور لە کەشتییەکانی دی ڕێگەی خۆیان بڕی،( مینیلاوس)ی دلێر و دلاوەر بەخۆی بەناویانا دەگەڕا و جەنگاوەرەکانی بۆ نەبەرد هان دەدا، چونکە لەهەر کەسێك پتر تاسەمەندی

(٥٩٠) ئەوەبوو کە تۆڵەی ئەو هەموو خەم و نارەحەتیە بکاتەوە کە بەبۆنەی رفاندنی هیلینی ژنییەوە دووچاری بوو بوو، ئەوانەی لە بلیوس و ئەرینیو (پریوم)ی سەر بواری ڕوباری فیوس، و ئیبی بەهێز دەژیان، و ئەوانەی ماڵیان لە سیباریسیس، و ئەمفیجینا، و تیلیوم و هیلوس و دوریوم بوو، و خواوەندانی هۆزان

(٥٩٥) لەوێندەر تووشی تامیریس بوون، و بۆ هەتا هەتایە کۆتاییان بەشیعر و ئاوازخوانی ئەو هێنا، تامیرسی لە ئوخالیاوە، لە ماڵی (یوریتوس)ی حوکمرانی ئەوێوە دەهاتەوە و بەوەوە دەفشی کە خواوەندانی هۆزان، کیژانی زیوسی قەڵغاندار دەبەزێنێ ئەگەر لە گۆرانی و ئاوازخوانیدا هەڤرکی بکەن، لەبەرئەمە لێی تورە بوون و عەیبداریان کرد

(٦٠٠) بەهرە پیرۆزەکەی ئاوازخوانیان لێ ستاندەوە، گیتارژەنیان لەبیر بردەوە. ئەمانە لەژێر فەرمانی نەستوری، سوارچاکی جیریینیدا بوون، و نەوت کەشتی لەگەڵدا هاتبوو. ئەوانەی خەڵکی ئارکادیای بناری چیایە بەرزەکەی سیلینی، نزیکی مەزارەکەی ئیبیتوس بوون و جەنگاوەرانی لێهاتووی جەنگی دەستەو یەخەیان تیابوو،

(٦٠٥) و ئەوانەش کە لە فینیوس و ئورخیمینوسی بەپەزان بەناوبانگ، و ریبی و ستراتی و ئینیسبی باگر دەژیان، و ئەوانەی لە تیجیا و مانتینای جوان، و لە ستیمفیلوس و باراسیادا بوون، و هەموویان لەژێر فەرمانی شا ئاگابینوری کوڕی ئەنکایوسی فەرماندەی بالاّدا بوون

(٦١٠) شەست دانە کەشتیان پێ بوو. گەلێك لە ئارکادییەکان، جەنگاوەرانی مەزن، ئامادەبوون، بەلاّم ئاگامەمنون بەخۆی کەشتی بۆ ئامادەکردن و پێی لە دەریا پەڕینەوە، چونکە ئارکادییەکان سەروساختیان لەگەڵ ئاو ودەریادا نەبوو

(٦١٥) هەروەها جەنگاوەرانێکی فرە لە بوراسیون و ئیلیسەوە هاتبوون، ژمارەیان هێندە زۆر بوو نێوان هیرمینی و میرسینوسی کەناری دەریا و ئولینی کەڤرۆك و ئەلیسیومیان گرتبوو، ئەمانە چوار فەرماندەیان هەبوو، و هەر فەرماندەیەك دە کەشتی هەبوو، و هەر

کەشتییەك ژمارەیەکی زۆری لە ئییانییەکان هەڵگرتبوو.
(٦٢٠) هەندێکیان لەژێر فەرمانی ئەمفیماخوس و تالیبیوسدا بوون —یەکەمیان کوڕی کتیتوس و دووەمیان کوڕی یوریتوس بوو- و هەردوکیان لە ڕەچەڵەکی ئەکتور بوون. و هەندێکی تریان لەژێر فەرمانی هەردوو فەرماندە دیوریس-ی کوڕی ئەمارینکیس، و بولیکسینوس-ی کوڕی شا ئوگاسیتنوسی کوڕی ئوجیاس دا بوون.
(٦٢٥) و ئەوانەی لە دولیخیومەوە لەگەڵ خەڵکی دورگە پیرۆزەکانی ئینحنییەوە هاتبوون. ئەوانەی ئاکنجی ئەودیوی دەریای ئیلیس بوون، ئەوانە لەژێر فەرمانی میغیس-ی هاوتای خواوەندی جەنگ ئەریس، و کوڕی شێرە پیاو فیلیوسی، ئازیزی دڵی زیوسدا بوون، ئەو میغسەی کە لەگەڵ بابیا بەشەڕ هات و ڕۆیی تا لە دولیخیوم نیشتەجێ ببێ.
(٦٣٠) و چل دانە کەشتی لەگەڵدا هات. ئودیسیوس، ڕێبەرایەتی سفالینیە ئازاکانی دەکرد، ئەوانەی لە ئیتاکا و نیریتومی پڕ دار و دارستاندا ئاکنجی بوون، لەگەڵ ئەوانەی کە لە کروسیلیا و ئیجیلیبس ی هەزار بەهەزار و ساموس و زاکینتوس،
(٦٣٥) و ناوچە سەرەکییەکانی بەرانبەر دورگەکان ئاکنجی بوون. ئەمانە( ئودیسیوس)ی هاوتای زیوس لە تەگبیر و ڕاوێژان، ڕێبەری دەکردن و دوانزە کەشتی لەگەڵدا هات. تاوس، ڕێبەرایەتی ئیتولیانییەکانی دانیشتووی بلیرون و ئولینوس و بیلینی،
(٦٤٠) و خالکیسی نزیکی دەریا و کالیدونی کەڤرۆکی دەکرد، چونکە شای مەزن و ئینیوس ئێستا منالی زیندووی نەبوو، بەخۆشیی مردبوو، هەروەها میلیغری قژزەردیش کە چووبۆلای ئیتولییەکان تا ببێ بە پاشایان مرد بوو. جا چل دانە کەشتی دەگەڵ تاوس دا هات.
(٦٤٥) فەرماندەی کریتانییەکان ئیدومینیوس، نێزە هاوێژی بەناوبانگ بوو، هەروەها فەرماندەی خەڵکی کنوسوس و شاری غورتیسی شورەدار بوو، هەروەها فەرماندەی لیکتوس و میلیتوس و لیکاستوسی کەڤرۆکی سپی ئاخ بوو، هەروەها هەردوو شاری پڕ دانیشتووانی فیستوس و ریتیوم، زێدەباری دانیشتوانی کریت بەهەر سەد شارەکەیەوە.
(٦٥٠) هەر هەموو ئەمانە ئیدومینیوس، (میریونیس ی هاوتای ئەریسی خواوەندی جەنگ ڕێبەرایەتی دەکردن و هەشتا کەشتیان لەگەڵدا هات. تلیبولیموسی کوڕی هیراکلیس، قارەمانی کەڵەگەتی ڕەشید و جوامێر، نۆ کەشتی پڕ لە جەنگاوەرانی دڕی (رودس)ی لەگەڵ خۆدا هێنا
(٦٥٥) ئەو رودسەی دابەش دەبێ بەسەر سێ شاردا: لیندوس و ئیالیسوس و کامیروس،

کە دەکەوێتە سەر تاوێرانی سپیواژەوە. هەموو ئەمانە لەژێر فەرمانی تلیبولیموسی کوڕی هیراکلیسی بەتوانا بوون، کە لە ئەسیتوخیا بوو بوو، کە لە ئیفرای سەر ڕوباری سیلیس بەدیلی هێنابووی

(٦٦٠) دوای وێران کردنی زۆر شاری جەنگاوەرانی بەهێز. کاتێ تلیبولیموس گەورە بوو، لیکیمنیوسی مامی بابی، کە لە کاتی خۆیدا جەنگاوەرێکی ناودار بوو، کوشت، ئەو کاتە پیر بوو. ئیدی خێرا بڕە کەشتییەکی بۆ خۆی دروست کرد و دوایی لایەنگرانێکی زۆری لەخۆی خڕکردەوە.

(٦٦٥) بە دەریادا هەڵات، چونکە کوڕ و کوڕەزاکانی هیراکلیس، هەڕەشەیان لێدەکرد، دوای گەشتێکی دەریایی پڕ لە ناڕەحەتیو دژواری گەییە رودس، خەڵکەکە بەسەر سێ تیرەدا دابەش بوون، و زیوسی خودانی خواوەندان و بەشەران مەحەبەتی چووە سەریان؛

(٦٧٠) و کوڕەکەی کرونوس، سەروەت و سامانێکی زۆری بەسەردا ڕشتن. نیریوس ڕابەری سێ کەشتی لە سومییەوە کرد -و نیریوس لەدوای کوڕەکەی بیلیوس لەهەر هەموو ئەو داناییانەی بۆ تەروادە هاتبوون قۆزتر بوو-

(٦٧٥) چونکە دەوڵەمەند نەبوو، چەند لایەنگرێکی کەمی لەگەڵ بوو. بەڵام دانیشتوانی نیسیروس و کارباتوس و کاسوس، لەگەڵ کوسی شاری یوریبیلوس، و دورگەکانی کالودینا، ئەمانە لەژێر فەرمانی فیدیبوس و ئەنتیفوس ی کوڕانی ساتیسالوسی کوڕی هیراکلیس دا بوون.

(٦٨٠) سی کەشتیان لەگەڵ بوو. هەروەها خەڵکانی ئارگوسی بیلاسجیا و ئەلوس و ئەلوبی و تراخیس و خەڵکانی بتیاوهیلاس، وڵاتی ژنانی جوان، ئەوانەی پێیان دەگوترا مەرمیدون و هیلینی و ئاخیەکان،

(٦٨٥) بەهەر پەنجا کەشتییەکەیانەوە ئەخیل ڕابەرایەتی دەکردن. ئەمانە ئێستا بەشداری شەڕیان نەدەکرد، چونکە کەس نەبوو ئەمریان پێبکات، چونکە ئەخیل کونجی کەشتیەکەی گرتبوو، و تورە بوو لەوەی کە( بریسیس)ی لێ زەوت کرابوو، ئەوکیژەی کە بە خەتەربازییەکی زۆرەوە لە لیرنیسوسەوە بەدیلی هێنابووی

(٦٩٠) کاتێ کە پەلاماری لیرنیسوس و تیبی، دابوو، و مینیس و ئیبیستروفوسی، کوڕانی شا ئیونوری کوڕی سیلبیوسی ریسوا کردن. لە سوێی ئەو کیژەدا خەمین و لێو بەباربوو،

بەدەم پشان بەگەڵ جەنگاوەرەکان کەوت.

(٦٩٥) دانیشتوانی فیلاکی و میرگوزارەکانی بیراسوس، و پەرستگەکەی دیمیتر، و ئیتونی فرە پەزومالات، و ئەنترومی سەر دەریا، و بتیلیومی باوەشی سەوزە گیایان، هەموو ئەمانە فەرماندەی عەگید بروتیسیلاو-یان تا لە ژیانا بوو، بەسەرەوە بوو، بەڵام ئێستا لەژێر خاکدا بوو.

(٧٠٠) ژنێکی لە فیلاکیدا لە پاش خۆی جێهێشت تا لە حەژمەت و داخانا روومەتی خۆی برنێ، و ماڵەکەی بەنیوەچڵی بەجێهێشت، چونکە لە کاتێکا پێشی ئاخییەکان کەوتبوو بۆ سەر خاکی تەروادە، لەسەردەستی جەنگاوەرێکی داردانی کوژرا بوو. هەرچەندە، بۆ فەرماندەکەیان خەمبار بوون، بەڵام بەبێ فەرماندە نەمانەوە، چونکە بودارکسی نەتیرەی ئەریسی خوای جەنگ، بوو بەسەر گەورەیان،

(٧٠٥) چل دانە کەشتی لەگەڵ بوو. دانیشتوانی فیرای نزیکی دەریاچەی بوییبە، وبوییبی و گلافیریا،و شارە قەرەباڵغەکەی ئیولکوس، هەموویان بەیازدە کەشتییەکەیانەوە لەژێر فەرمانی یومیلوسی کوڕی ئەدمیتوس دا بوون،

(٧١٠) یومیلوس لە ئەلسیست بوو، کە جوانترین کیژی ناو بیلیاس بوو. دانیشتوانی میتونی و توماکیا، و دانیشتوانی میلیبونا و ئولیزونی کەڤرۆك، ئەوان لەژێر فرمانی تیر هاوێژی مەعلان فیلوکتیتس دا بوون، ئەمانە حەوت کەشتیان پێ بوو، هەر کەشتییەك پەنجا سەوڵەوانی تیابوو،

(٧١٥) و هەموویان تیرەوان بوون، بەڵام فیلوکتیتس بەدەم ژان و ئازارەوە لە دورگەی لیمنوس مایەوە، کوڕانی ئاخییایی لەوێندەر بەجێیان هێشت، چونکە مارێکی ئاویی ژەهراوی پێوەی دابوو. لەوێندەر بەدەم ئازارەوە مایەوە.

(٧٢٠) یەکسەر ئارگوسییەکان هەستیان بە بایەخی کرد، بەڵام هێزەکەی هەرچەند هەستیان بەخەسارەتی ئەو کرد، بەڵام بەبێ فەرماندە نەمانەوە، چونکە میدون، کە کوڕی بیژوی ئولیوس و لەرینی بوو، خێرا کەوتە سەرپەرشتی و رێکخستنیان. خەڵکانی تریکا و هەرێمی بەردەلانی ئیتومی،

(٧٢٥) و دانیشتوانی ئوخالیا، شارەکەی لەمەڕ وریتوسی ئوخالی، ئەمانە لە مەعیەتی دووان لە کوڕانی ئەسکلیبیوس دا بوون، ناویان بودالیریوس و ماخاون بوو، لە هونەری خۆراکپەزیدا مەعلان وکارامە بوون. ئەمانە سی دانە کەشتیان لەگەڵ بوو. بەڵام دانیشتوانی

ئورمینیوس، و دەوروبەری کانی هیبیریا،
(٧٣٠) و دانیشتوانی ئەستیریوس، و لوتکە چەرموەکانی تیتانوس، هەموویان لەژێر فەرمانی یوریبیلوسی کوڕی یومون دا بوون، و چل کەشتیان پێ بوو، ئەوانەی لە ئەرگیسا و جیرتونی و ئیلونی و شارە سپییەکەی ئولوسن دا دەژیان،
(٧٣٥) بولیبویتیس رابەریان بوو، ئەمە کوڕی بیریتوس بوو، کە کوڕی خودی زیوس بوو، چونکە هیبودامیا بەئەم سکی لە بیرتیوس پڕ بووبوو، لەو رۆژەدا کە تۆڵەی لە کەنتورانی چیا کردبووەوە و لە لوتکەی بیلیونەوە دەری کرد بوون بۆ ئیتیکیس.
(٧٤٠) بەڵام بولیبویتیس بەتەنیا ڕابەرایەتی نەدەکرد، لیونتیوسی نەتیرەی ئەریسی خواوەندی جەنگی لەگەڵ بوو، ئەمە کوڕی کورونوسی کوڕی کاینیوس بوو. ئەمانش چل دانە کەشتیان لەگەڵ بوو. گونیوس-ش لە سیفوسەوە بیست و دوو کەشتی هێنا بوو، و ئینیسون و بیرابیونە عەگید و جەزرەبەکانیش دوای کەوتن،
(٧٤٥) ئەمانە لە دودونای سارد وکۆجاڕدا دادەنیشتن و لە دەوروبەری ڕوبارە جوانەکەی تیتاریسیوس دادادەنیشن، کە جۆگەلە مەنگەکانی دەڕژێنە بینیوسەوە. ئەم جۆگانە تێکەڵاوی شەپۆلە زیوینەکانی بینیوس نەبوون، وەکو زەیتی زەیتون بەسەرییەوە دەمایەوە،
(٧٥٠) چونکە تیتاریسیسو لقێك بوو لە ئورکوسی ترسناك و لەڕوباری ستیکسی جیهانی ژێرین. بروتوسی کوڕی تینتریدون ڕێبەرایەتی ماگنیتیەکانی دەکرد، کە لە دەوروبەری ڕوباری بینیوس و لوتکەی بیلون دادەنیشتن و فەرماندەکەیان بروتوسن بوو، کە چەندین پاپۆڕە خۆراکی ئامادە کرد بوو، چل دانە کەشتی لەگەڵ بوو
(٧٥٥) ئا ئەوانە فەرماندە و سەردارانی داناییەکان بوون. بەڵام ئەی خواوەندی هۆزان پێم بێ کێ لەوانەی شوێنی کوڕانی ئوتریوس کەوتن لە هەموو ئەمانە دلێرتر بوو؟ لە هەسپاندا هینەکانی فیریس چاکترین بوون. یومیلوس ڕابەری دەکردن، کە وەکو پۆلی مەلان خێرا بوون
(٧٦٠) لە یەك تەمەن و ڕەنگ دابوون، هەموو باڵا بەرز بوون، بەو ئەسپانە ئەپولۆی، زیوین کەوان، تیرەکانی خستە بیریاوە- پەشێوی کەوتە ئۆردوەکەوە، وەکو چۆن خواوەندی جەنگ ئەریس، وا دەکات لە شەڕدا. لە نێو جەنگاوەراندا ئاجاکسی کوڕی تیلامون-یان لەگەڵدا بوو، کە دوای دامرکانەوەی پشمو غەزەبی ئەخیل دەرکەوت، چونکە ئەخیل زۆری ستایش کرد

(٧٦٥) هەروەها ئەسپی باشی هەبوون، بەڵام ئەخیل ئێستا لە ئاگامەمنون تورە بوو، و کونجی کەشتییەکانی گرتبوو، جەنگاوەرەکانی لە کەناری دەریادا کاتی خۆیان بەهەڵدانی دیسك و نێزە و تیرهاویشتن و نیشانە نانەوە رادەبوارد

(٧٧٠) ئەسپەکانیان، هەریەکەیان لەبەر عەرەبانەکەی خۆیدا وەستابوو، و لۆتس و گیایان دەخوارد. عەرەبانەکان داپۆشرا بوون، بەڵام خاوەنەکانیان، بێکار لێرە و لەوێ بە دەوری لەشکرەکەدا دەسورانەوە و نەدەچوون بۆ شەڕ چونکە فرمانی فەرماندەکەیان پێ نەبوو.

(٧٧٥) بەم جۆرە سوپا وەکو چۆن خودانی بروسکانی ئاسمانی، تورە دەبێ و زەوی دەوروبەری تیفویوسی نزیکی ئەریمی بەر قامچی دەدات، کە دەڵێن تیفویوس لەوێدا نێژراوە، بەو ئاوایە زەوی لەژێر پێی جەنگاوەرەکاندا ،

(٧٨٠) کە بە دەشتەکەدا پێشڕەویان دەکرد پتر دەینالاند، ئیدی ئایریسی خواوەندی پەلکە رەنگینە، نوێنەر و پەیامبەری ئاسمان، وەکو با بۆ لای تەراودەییەکان دایکێشا، چونکە زیوس ناردبووی، تا هەواڵی ناخۆش بە تەرواددەییەکان بگەیەنێ.

تەرواددەییەکان لەبەر دەروازەکانی کۆشکەکەی بریامدا، بە گەنج و پیرەوە مژوڵی کۆبوونەوە بوون.

(٧٨٥) ئایریس لە بریام نزیك بووەوە، بە دەنگی (بولیتیس) ی کوڕی بریام قسەی بۆ کرد، بولیتیس کە کەسێکی تیژڕەو بوو، وەکو دیدەوان لەسەر گۆڕەکەی( ئیسیتیس) ەوە چاودێری تەرواددەییەکانی دەکرد، تا لە هەر جموجۆڵێکی ئاخییەکان ئاگادار بێ.

(٧٩٠) دوای ئەوەی چووە پێست و شێوەی (بولیتیس) ەوە، بەبریامی گوت: "ئەی بریامە پیر، تۆ ئێستاش وەکو جاران، وەکو زەمانی ئاشتی سوێرە قسەیت، کەچی شەڕ بەردەرکەی پێ گرتووی من زۆر شەڕم دیوە و کردووە، بەڵام من هەرگیز سوپای وەك ئەم سوپایەی کە بەرەو ئێوە پێشڕەوی دەکات، گەورەم نەدیوە. ئەوەتا وا دەشتەکە دەبڕن تا پەلاماری شار بدەن

(٧٩٥) ئەوەندەی گەڵای دار و لمی دەریا زۆرن. جا هیکتۆر من بەر لە هەمووان رووی دەمم لە تۆیە، تا بەگوێم بکەی، هاوپەیمانانێکی فرە لە هەر چوار نکالی شارەکەی پریام دا بێوبوونەتەوە، خەڵکی دەڤەرێن دوور و جیاوازن، بەزمانانی جیاواز دەپەیڤن

(٨٠٠) با هەر فەرماندەیەك فەرمانەکانی بەزمانی گەلەکەی خۆی دەربکات، یەك بەیەك

ریزیان بخە و بەرەو شەڕ ڕابەرایەتیان بکە." بەو ئاوایە قسەی کرد بەڵام هیکتۆر ناسییەوە کە خواوەندە، و دەم و دەست کۆبوونەوەکەی هەڵوەشاندەوە. جەنگاوەرەکان پڕیان دایە چەکەکانیان، و هەموو دەروازەکان خرانە سەر پشت، و ئاپوراکە،

بەسوارە و پیادەوە هاتە بەرەوە، بەقەوغایەکی گەورە وەڕێکەوت. گردێکی بەرز لەبەر شاردا هەبوو، کە دەڕوانییە سەر دەشتەکە. خەڵکی پێیان دەگوت بانی باتیا (درِك)، بەڵام یەزدان خانم دەیزانی ئەمە گۆڕی میرینی سەماکاری بەژنزراڤە.

تەروادەییەکان و هاوپەیمانەکانیان لێرەیا هێزەکانیان دابەشکرد. هیکتۆری مەزن، کوڕی بریام، خودانی کێو خودی بریقەدار، سەرکردایەتی تەروادەییەکانی دەکرد، و زۆرترین و دلێرترین جەنگاوەرانی لەگەڵدا بوو. دەردانییەکانیش لەژێر فەرمانی

ئینیاس-ی قارەمانی عەگیدا بوون، کە ئەم قارەمانە زادەی، هاو باخەڵی ئەفرۆدێتی خوای جوانی بوو لەگەڵ ئەنخیسدا، هەرچەند خواوەند بوو، لە بنارەکانی چیای ئیدادا. ئەم قارەمانە هەر خۆی نەبوو، بەڵکو ئەرکیلوخوس و ئەکامس)ی کوڕانی (ئەنتینور)یشی لەگەڵ بوون، کە هەردوکیان شارەزای هەمووهونەرەکانی جەنگ بوون. بەڵام ئەوانەی لە تیلیای بنارە نزمەکانی چیای ئیدادا دادەنیشتن،

ئەو دەوڵەمەندانەی، ئاوی زوڵاڵی ڕوباری ئیسیوس دەخۆنەوە، کە لە نەژادی تەروادی بوون —ئەوانە لە ژێر فەرمانی بانداروسی کوڕی لیکاوندا بوون، کە ئەپولۆ بەخۆی فێری بەکارهێنانی کەوانی کرد. ئەوانەی لە ئەدراستیا و دەڤەری بیتیا و چیا بەرزەکەی لیتریادا ئاکنجی بوون.

ئەوانە ئەدراستوس و ئەمفیوس، کە سوپەری کەتانیان لەبەربوو، ڕێبەرایەتیان دەکردن. ئەم دووە کوڕانی میروبس ئەلبیرکوتی بوون، کە لە هەموو جۆرە فالبینی و پێشبینییەکدا بالادەست بوو. ئاگاداری کردنەوە کە بەشداری شەڕ نەکەن، بەلام بەگوێیان نەکرد، چونکە چارەنووس بەرەو مەرگی ڕادەدان

ئەوانەی لە دەوروبەری بیرکوتی و براکتیوس، و سیستوس و ئەبیدوس و ئەریسبی دەژیان، ئەسوسی کوڕی هیرتاکوس، کە فەرماندەیەکی عەگید بوو —ڕێبەرایەتی دەکردن. ئەسپە کوێتە بەهێزەکانی کە لە نەژادی ڕوباری سیلیس بوو، لە ئەریسبییەوە هێنابوویان.

هیبوتوس ڕێبەرایەتی تیرە نێزەچییەکانی بیلاسیجییانی دەکرد، کە خەڵکی لاریسای بەپیت و بەرەکەت بوون- و هیبوتوس و بیلایوس لە نەوەی ئەریس بوون،

کوڕانی لیتوسی بیلاسجینی کوڕی تیتاموس بوون، ئەکامس و بیروس، جەنگاوەرانی بەهێزرێبەریی تەراقییەکان

(٨٤٠) و هەموو ئەوانەی لە پشت سەرچاوە گەورەکەی (هیلیسبونت) ەوە هاتبوون، دەکرد. و یوفیموسبن ی کوڕی تروزینوس، کوڕی لیوس، فەرماندەی نێزەچییە سیکونییەکان بوو. بیریخمیس-ش ڕێبەرایەتی نێزەچیانی بونیاییانی خەڵکی ئەمودونی، نزیکی ئاوی بەرینی ڕوباری ئەکیوسی دەکرد،

(٨٤٥) جوانترین ڕوباری سەررووی زەوی. بافلاگونییەکانیش لەلایەن بیلیامینیسی خەڵکی ئینیتیای مەڵبەندی گەلە ئەسپی کێویەوە، ڕابەری دەکران. ئەوانە ئاکنجی سیتوروس و دەڤەرەکانی دەوروبەری بیساموس، و شارەکانی سەر ڕوباری بارتینیوس،

(٨٥٠) و کرومنا و ئجیالوس و ئێریتینو-ی بەرز بوون. و ئودویوس و ئیبستروفۆس ڕابەرایەتی هالیزونیانی خەڵکی ئەلیبی، مەڵبەندی کانە زیویان دەکرد. کرومیس و ئیوموسی لێزانیش ڕابەرایەتی میسیانییەکانیان دەکرد، بەڵام لێزانیەکەی لە مردن ڕزگاری نەکرد

(٨٥٥) چونکە بەدەستی نەوەکەی ئیکوس کەوتە ڕوبارەوە، کە زۆری لە تەرِوادەییەکانش کوشت. فورکیس و( ئیسکانیوس)ش ڕابەری ئەو فریجیبیانەیان دەکرد کە لە دەڤەری دوری ئەسکانیاوە هاتبوون، و هەردوکیان ئاشقە جەنگ بوون. میسنتلیس و ئەنتیفوس فەرماندەی میونیانەکان بوون،

(٨٦٠) ئەمانە کوڕانی تالامینیس بوون، و لە دەریاچەی غیاغانیە بووبوون. ئەو جووتە ڕابەری ئەو میونیانەش بوون کە لە بناری چیای تمولوس دەسەکنین. ناستیس ڕابەری کاریانینەکانی، کە زمانێکی نامۆیان هەبوو، دەکرد. ئەوانەی کە نیشتەجێی میلیتوس و چیای بتیریسی چڕە دارستان، و قەراخ ڕوباری میاندیر و لوتکە بڵندەکانی میکاڵی بوون

(٨٦٥) ئەوانە ناستیس و ئەمفیماخوس، کوڕانی ڕەشیدی نومیون ڕابەرییان دەکردن. ناستیس وەکو کچێکی ڕازاوە بەخشڵ و زێڕان هاتبوو بۆ جەنگ، بەڕاستی کەودەن بوو، زێڕەکەی هیچ دادێکی نەدا، و ڕزگاری نەکرد، چونکە بەدەستی نەوە چاپوکەکەی ئیاکوس کەوتە ڕوبارەکەوە،

(٨٧٠)ئەخیل دەستی بەسەرزێڕەکەیداگرت.ساربیدون وگلوکوس ڕابەرایەتی ئەولیشییانەیان دەکرد کە لە دەڤەرێك دوورەوە، لە نزیکی ئاوە بەگێژەنگەکانی زانتوسەوە هاتبوون.

# سرودی سێیەم

## ئارگربەست و دوئێل

**حیکایەتەکە:**

**پاش ئەوەی سەرانی گریك لەشکرەکانیان جۆشدا، بڕیاری جەنگ درا و لەشکر بەرەو دەشتەکەی بەر کۆشکەکەی بریام کەوتە پێشرەوی. کە لە تەروادەییەکان نزیك بوونەوە ئەلکساندر (پاریس) هاتە دەرێ و داوای دوئێلی لەگەڵ بەهێزترین قارەمانی یۆناندا کرد، تا جەنگ نەقەومێ، مینیلاوس بۆی هاتە مەیدان، پاریس ترسا و پاشەکشەی کرد، بەلاّم هکتۆری برای، قارەمانی گەورە ،سەرزەنشتی کرد کە ترسنۆکە و بەکەڵکی هیچ نایەت جگە لە خۆ ڕازانەوە و ڕاوە ژنان لە وڵاتانی دوورا تا شەرمەزاری بەسەر خۆی و کەسوکاری و وڵاتەکەیدا بێنێ، ئیدی زاتی هاتەوە بەر و گەڕایەوە و داوای لە براکەی کرد کە پێیان ڕابگەیەنێ کە کێ سەرکەوت هیلین و سەروەت‌و سامانەکەی بۆ ئەو دەبێ، هەنگینێ گریکان بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێنەوەو تەروادەییەکان بەئاشتی بۆ خۆ دەژین. هیکتۆر ئەمە بەتەروادەییەکان و بە گریکەکان ڕادەگەیەنێ و هەموو قایل دەبن، ئیدی بۆ جەزرەبەی یەکەم تیرو پشك دەکەن، و بۆ پاریس دەردەچێ. دەنێرن بەدووی بریامدا تا ئامادەی سوێند خواردن و پەیمانەکە بێ. لەو بەینەدا ئیریس-ی یەزدان خانم، دەچێتە شێوەی قەرەواشەکەی هیلینەوە و لە وەزع و حاڵی پاریس ئاگاداری دەکاتەوە، ئیدی لە ژوورەکەی وەدەردەکەوێ و بەرەو تاوەری تەروادە دەچێت، کە بریام و هەندێ لە یاوەرەکانی لەوێ دەبن، ئامادەبووان واقیان لە جوانیەکەی وردەمێنێ. بریام پرسیاری قارەمانانی یۆنانی لێدەکات، یەك یەك وەسفیان دەکات، و قاسیدان ئامادە دەبن و داوا لە بریام دەکەن ئامادە بێت و ئەویش دەگەڵ ئەنتینوری هاوڕێیدا دەڕوات و پەیمانەکە دەبینێ. و بەر لە دەستپێکی دوئێلەکە لەگەڵ هاوڕێکەیدا دەزڤڕێتەوە چونکە تەحەمولی ئەوە ناکات کوشتنی کوڕەکەی**

بدیێ. دوئێله بەردەوام دەبێ و تێزە و شمشێران دەشکێن، مینیلاوس هێرش دەبات وکڵاوخودەکەی پاریس دەگرێت و پاریس رادەکێشێت، لێ خواوەندی جوانی و ڤیان ئەوە دەبینێ و خێرا فریا دەکەوێ و قایشە چەرمەکەی کڵاوخودەکە دەبچڕێنێ و پاریس لە هەورێکی چڵکنەوە دەپێچێ و بۆ ژوورەکەی خۆی دەباتەوە و ئەوجا بیچمی خۆی دەگۆڕێ، دەچێت بۆ سەر بورجەکە و کراسە بۆندارەکەی هیلین رادەکێشێت، و ئاگاداری دەکاتەوە کە مێردەکەی لە ژووری نووستندا چاوەڕوانی دەکات، دەڕوات و زۆر بەتوندی سەرزەنشتی پاریس دەکات، دوای ئەوەی تەواو دەبێت، پاریس داوای لێدەکات بێتە ناو نوێنی ژن و مێردایەتییەوە، چونکە لە هەر هەموو کاتێك پتر ئارەزووی دەکات و تاسەمەندیەتی، ئیدی تورەبوونەکەی ژبیر دەکات و وە ژوور دەکەوێ. لێ لە مەیدانی دوئێلدا گریکەکان رایانگەیاند کە ئەوان سەرکەوتوون، تەروادەییەکان لەسەریانە هیلین و هەموو سەروەت و سامانەکەی هیلینیان تەسلیم بکەن. ئاگامەمنون ئەمە رادەگەیەنێ و هورای لەشکر بەرز دەبێتەوە.

زەمەن:

قەوماوەکانی ئەم سروودە هەمووی لە ڕۆژی بیست و سێیەمدا روو دەدەن.

شوێن:

زۆربەی رووداوەکان لە دەشتەکەی بەردەم کۆشکەکەی بریارم دا ڕوودەدەن، کە هەردوو لەشکرەکە وەستاون و مەیدانێکیان بۆ دوئیلی نێوان مینیلاوس و پاریس هێشتۆتەوە، بەڵام هەندێ دیمەن لەناوجەرگەی تەروادەدا ڕوودەدەن، هەر لە ژووری نووستنەکەی هیلینەوە تا دەروازەکان. پاش ئەوەی ئەفرۆدێت فریا دەکەوێ و پاریس لە مەیدانی دوئێلەکەوە دەفڕێنێ تا لە مردن ڕزگاری بکات، دیمەنەکە جارێکی دی بۆ کۆشکەکەی ناو تەروادە دەگەڕێتەوە.

(١) کە لەشکر ڕیزی بەست، هەر دەستەیەك لەژێر فرمانی فەرماندەی تایبەتی خۆیدا، تەروادەییان وەکو پۆلە مەلی کێوی بە هەرا و هەنگامەوە کەوتنە پێشرەوی، لە تۆ وایە قەتاری قورینگانن و بەدەم قریوە و هاوارەوە لە زستان و باران هەڵدێن، و بەرەو ئۆقیانوس کۆچ دەکەن و مەرگ بۆ بێگمییەکان (کورتە باڵاکان) لەگەڵ خۆدا دەبەن. بەڵام ئاخییان، مات و بێدەنگ، بە ورەی بەرزەوە، ڕیزەکانیان بەتەنیشت یەکترەوە ڕێکخست.

(١٥) هەردووك لەشکر لێکدی نزیك بوونەوە، پاریسی برای هیکتۆر، وەکو قارەمانی تەروادەییەکان ڕابوو و چووە پێشێ. کەوڵە پڵنگێکی بەلەکی دابوو بەشانیا، لەگەڵ کەوان و شمشێرەکەیدا، دوو نێزەی برونزی نیشاندەدا و داوای دەکرد ئازاترین ئاخیایی بێتە مەیدانی. کە مینیلاوس بینی بەو جۆرە دێتە پێشەوە، زۆری پێ خۆش بوو، وەکو شێرێك برسی بێ و کەوتبێ بەسەر کەلاکی بزن یا کەڵە کێوییەکدا و بێ سڵەمینەوە لەو تانجی و ڕاوچیانەی بەدیارییەوەن سەری تێ بژەنێ، مینیلاوس کە چاوی بە ئەلکساندر (پاریس) کەوت، بەو ئاوایە شادمان بوو، چونکە پێی وابوو ئێستا تۆڵەی خۆی دەستێنێ.

(٢٧) بۆیە، بەتەواوی جلی جەنگەوە، لە عەرەبانەکەیەوە خۆی هەڵدایە خوارێ

(٣٠) وەختێ پاریس، مینیلاوسی بینی دێتە پێشێ، لەترسی ئەوەی لە بەرچاوی جەنگاوەرەکانیا بکوژرێ چۆیەوە قاوغەکەی خۆی و کشایەوە، وەکو چۆن یەکێك لەپڕ لە قلیشی چیاکەدا پێ دەنێ بەمارێکا، لە ترسا دەلەرزێ و ڕەنگ دەبوێرێ، (پاریس)ش کە بەبەردەم جەنگاوەرە تەروادەییەکاندا دەڕۆیی، وەختێ کوڕەکەی ئەتریوسی بینی، بەو ئاوایە لە ترسا ڕاجفری.

(٣٩) هەنگێ هیکتۆری برای کەوتە سەرزەنشتی. گوتی: "پاریس، ئەی بەدفەڕ، ئەی جوان خاس، ئەی مێبازی، بەدرزمان، خۆزیا لە دایك نەدەبووی، یان ژنت دەهێنا و دەمردیت. ئەمەت باشترە لەوەی بەسەرشۆڕی بژی و خەڵکی بەقێزەوە مۆڕەت لێبکەن. باشە ئاخییەکان گاڵتەمان پێناکەن، ناڵێن ئێمە کەسێکمان ناردووە کە ببێ بە قارەمانمان، بەڕواڵەت قۆزە بەڵام زەرەیەك دلاوەری و غیرەتی نییە؟ باشە ئێستا، کە تۆ لەم هەڵوێستەدایت باشتر نییە کۆمەڵێك لە هاوڕێکانت خڕ بکەیەوە و بەرەو ئەودیوی دەریایان سەر هەڵگرن؟ باشە تۆ لە وڵاتێکی دووری دوورەوە، جوانترین ئافرەتی شودارت نەفراندووە، لە گەلێکت نەفراندووە کە هەموویان جەنگاوەرن، _ژنێ کە ببێ بەمایەی خەم وماڵوێرانی بۆ بابت،

و بۆ شارەکەت، و بۆ هەموو گەلەکەت، ببێ بە مایەی شادی دژمنەکانت، و ببێ بەمایەی شەرمەزاری خۆت؟ ئێستاش ئایا ڕووبەڕووی مینیلاوس دەبییەوە، و تابەلای کەمەوە بزانی پیاوی ژن هەڵگیراو چۆنە؟ کاتێ لە بەردەمیا لە عاردی گەوزای هیچ شتێك دادت نادات، نە گیتارەکەت،ونە دیارییەکانی ئەفردێت ، و نە فێڵ و فەندی ئاشقێنی، و نە پرچ و قژەکەت؟ تەروادەییەکان هیچ نین، خۆشباوەڕن، دەنا دەبوایە بەهۆی ئەو هەڵانەوە بەسەرت هێناون، کراسی بەردیان لەبەرکردبای، بەرد بارانیان کردبای".

(٥٨) ئەلکساندر (پاریس) وەڵامی دایەوە: "برام هیکتۆر، سەرزەنشتەکەت لە شوێنی خۆیەتی. تۆ سەختی، وەکو تەوری دەستی کەشتی ساز، کە بەئارەزووی خۆی تەختەی پێ شەق دەکات. وەکو چۆن تەورەکەی دەستی ئەو تیژ و بڕندەیە، ئەقڵی تۆش بڕندە و تیژە. ئاگاداربە، باسی ئەو دیاریانە مەکە کە خواوەندی زێرینی جوانی، ئەفرۆدێت پێی بەخشیوم، دیاری خواوەند ڕەت ناکرێتەوە، با کەس گاڵتەی پێنەکات، چونکە خواوەندان هەر کاتێ بیانەوێ دەیبەخشن، و کەسیش هۆی ئەمەی لێنەپرسیون. ئەگەر دەتەوێ بچمە دوئێلی مینیلاوس، ئەمر بە تەروادەیی و ئاخییەکان بکە با لە شوێنی خۆ دانیشن، و منیش لە ناوەڕاستا لە ڕای هیلین و هەموو سەروەت و سامانەکەیدا، دوئێلی لەگەڵ بکەم.

(٧١) ئەوسا کێ سەردەکەوێ و شایستەیی خۆی دەسەلمێنێ با ژنە و هەموو سەروەت و سامانەکەی بۆ ئەو بێ و بۆ ماڵی خۆیی بەرێتەوە، بەڵام با ئەوانی دی سوێند لەسەر پەیمانێکی ڕاستەقینەی ئاشتی بخۆن، کە بەگوێرەی ئەو پەیمانە تەروادەییەکان لێرە بمێننەوەو، هەموو ئەوانی دی بۆ ئارگۆس و وڵاتی ئاخییان بژڤرنەوە."

(٧٦) هیکتۆر کە ئەمەی گوێ لێبوو زۆری کەیف هاتێ، نێزەکەی لە ناوەندەوە گرت و بەبەردەم تەروادەیەکاندا سوڕایەوە تا بیانداتە دواوە، بەگوێیان کرد و هەموویان دانیشتن: لێ ئاخییەکان هەر بەردیان تێدەگرت، تا ئاگامەمنون هاواری لێکردن و گوتی: بوەستن ئەی ئارگوسییەکان، بەردە فڕکێ مەکەن کوڕانی ئاخیایی، هیکتۆر دەخوازێ قسە بکات."

(٨٥) دەستیان لە بەردەفڕکێ هەڵگرت، هیکتۆر کەوتە قسان وگوتی: "ئەی تەروادەییەکان و ئەی ئاخییان گوێ لە داوای ئەلکساندەر بگرن، ئەو داوایەی ئەم شەڕەی لەسەر دەکرێ. داوا لە تەروادەیی و ئاخییەکان دەکات کە قەڵغان و کەرەستەی جەنگەکانیان لە عاردی

دابنەن، ئەو و مینیلاوس لە ناوەڕاستاندا لە پێناوی هیلین و سەروت و سامانەکەیدا دەجەنگن. جا هەر کەسێ سەربکەوێ و شایستەیی خۆی بسەلمێنێ ژنە و سەروەت و سامانەکەی دەباتەوە و بۆ ماڵی خۆیی دەبات، بەڵام با ئەوانی دی پەیمانێکی ڕاستەقینەی ئاشتی ببەستن و سوێندی لەسەر بخۆن."

(٩٥) بەو جۆرە قسەی کرد، و هەموو پابەندی ئاشتی بوون، تا مینیلاوسی مەعلان لە جاڕی جەنگدا، هەستاو گوتی: "ئێستا گوێ لە منیش بگرن، چونکە خەم و کول و کۆڤانی من لە هی هەمووتان گەورەترە، پێم وایە یەکلابوونەوەی شەڕی ئاخییان و تەروادەییان نزیکە، دوای ئەو هەمووکول و کۆڤانەی چەشتم، دوای ئەو غەڵەتەی ئەلکساندەر دەرهەق بەمن کردی، ئیدی دەبێ یەکێکمان بمرین، جا ئێوە لەسەرەتانە شەڕی یەکتری نەکەن، هەڕن دوو کاوڕ بێنن، یەکێکیان بەرانێکی سپی و ئەوی تریان مەڕێکی رەش بێ، بۆ خواوەندانی زەوی و خۆر بیانکەن بە قوربانی، هەنگێ ئێمەش کاوڕی سێیەمیش دێنین بۆ زیوسی دەکەین بەقوربانی. جا لەسەرتانە داوا لە بریامی بەتوانا بکەن و بۆ ئێرەی بێنن تا بەخۆی سوێندەکە بخوات، چونکە کوڕەکانی ڕێزی ڕەئی خەڵکی دی ناگرن، و جێگەی متمانە نین، چونکە نامانەوێ پەیمان و سوێندێکی پیرۆز بە زیوس، بەخیانەت و درۆ هەڵوەشێتەوە. چونکە گەنجان هەندێ بادی هەوان و ئەقڵیان وەکو هەوا سووکە، بەڵام کە پیاوێکی پیر ئەمە بکات، سەیری ڕابردوو و ئاییندە دەکات و قەرارێك دەدات کە نە شیش بسوتێ و نەکەباب."

(١١١) تەروادەیی و ئاخییەکان بەم قسەیە خۆشحاڵ بوون، پێیان وابوو، بەمە شەڕ و کوشتاری لە کۆڵ کردنەوە، عەرەبانەکانیان لە ڕیزا دانا، دابەزین، مەتاڵ و کەرەستەی جەنگیان لەخۆ کردەوە و لە عاردیان دانا. هەردوو لەشکرەکە زۆر لە یەکترەوە نزیك بوون. هیکتۆر دوو قاسیدی بۆ شار نارد تا جووتە کاوڕەکە بێنن و داوا لە بریام بکەن بێت. ئاگامەمنونیش ئەمری بە تالتیبیوس کرد بچێ لە کەشتییە قوڵەکاندا کاوڕێك بێنێ، ئەویش بەفرمانی ئاگامەمنونی کرد.

(١٢١) لەو کات و دەمەدا خواوەندی زەرینە و سیمینە ئیرس، قاسیدی زیوس، چوو بۆلای هیلین، خۆی خستبووە شێوە و هەیئەتی دشەکەی هیلینەوە، واتە شێوەی ژنەکەی کوڕی ئەنتینۆرەوە، چونکە هیلیکاونی کوڕی ئەنتینور، لاودیکی جوانترین کیژی بریامی خواست بوو. ئیریس هیلینی لە ژوورە تایبەتییەکەی خۆیدا بینی پارچەیەکی گەورەی

ئەرخەوانی دەچنی، وێنەی جەنگەکانی نێوان تەروادەییان و ئاخییانی لەسەر دەچنی، وئەوەی نیشان دەدا کە چۆن ئێریسی خواوەندی جەنگ، لەسەر ئەو (هیلین) کردبوونی بەگژ یەکا، هەنگێ ئیریس لێی چووە پێشێو گوتی: "وەرە ئێرە ئەی ژنی جەوان،تا ڕووداوە سەیر و عەنتیکەکانی نێوان تەروادەیی و ئاخییان بدینی، تا ئێستا شێتانە شەڕی دەشتیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، کەچی ئێستا وازیان لەشەڕ هێناوە و شانیان بەسەر مەتاڵەکانیانا داداوە، و دانیشتوون نێزەکانیان لە تەنیشتی خۆ داناوە. و ئەلکساندەر و مینیلاوس حازر و ئامادەی شەڕی دوو قۆڵین لەسەر تۆ، و کیهەیان سەربکەوێ، دەبی بەژنی ئەو".

(١٣٩) یەزدانخانم بەو شێوەیە قسەی خۆی کرد، دڵی هیلین بۆ مێردەکەی جارانی، و شارەکەی و داك و بابی کەوتە لێدان، سەرپۆشێکی سپی بەسەردا داو، بەلەز بەدەم گریان و هەنگاوی هەراوەوە لە ژوورەکەی وەدەرکەوت، هەر بەتەنێ نەبوو، دووان لە کارەکەرەکانی لەگەڵدا بوو، ئیترای کیژی بیتیوس، و کلیمینی، و بەپەلە گەییشتنە دەروازەکانی سکای.

(١٤٦) هەردوو پیری دانا، یوکالیگون و ئەنتینور لە نزیکی دەروازەکانی سکایدا، لەگەڵ بریام و بانتوس و تیموتیس و لامبوس و کلیتیوس و هیتکتاونی ئێریس زادەدا دانیشتبوون. ئەمانەش خەڵکانێکی بەتەمەن بوون، نەدەچوونە شەڕەوە، بەڵام قسەزان و بەدەم و زمان بوون، لەسەر بورجەکە و بەدەم قسەوە دانیشتن، لە تۆ وایە زیکزەکەن و لەنێو لق و پۆپی درەختێکی بەرزی ناو دارستانێکەوە ناسکە زەمزەمە دەکەن. کاتێ هیلینیان بینی بەرەو بورجەکە دێت.

(١٥٦) بەم شێوەیە کەوتنە چپە دوو: "تەروادەیی و ئاخییەکان ناهەقیان نییە، کە ئەم هەموو شەڕە دوور و درێژ و سەخت و تاقەتبەرە، لەسەر ئەم ژنە، کە لە ئەفسون و جوانیا لە یەزدان خانمانی نەمر دەچێت، تەحەمول بکەن. لەگەڵ هەموو ئەم جوانیەشدا وا چاکە ڕێیان بدەین لەگەڵ خۆدا بیبەن و بڕۆن، دەنا دەبێ بەمایەی داخ وکەسەر بۆ خۆمان و بۆ منداڵەکانمان لەدوای خۆمان."

(١٦١) بەڵام بریام-ی پاشای تەروادە گازی کردە نك خۆی. گوتی: "کیژی خۆم وەرە ئێرە، لەبەردەم منا دانیشە تا کۆنە مێردەکەت، کەسوکار و دۆستەکانت بدینی. من خەتای تۆ ناگرم، خەتای خواوەندانە، ئەوان ئەم جەنگە سامناکەیان لەگەڵ ئاخییەکاندا

درم هەڵگیرساندووە. کیژەکەم، پێم ناڵێی ئەم قارەمانە زەلامە بەشان و شەوکەت و قۆزە کێیە؟ جەنگاوەرانم دیوە لەو باڵابەرزتر، بەڵام کەسم نەدیوە بەم قۆزی و شان و شەوکەتەوە، هەر لە پادشا دەچێت."

(١٧١) هیلین وەڵامی دایەوە: "ئەزبەنی، بابی مێردەکەم، تۆ لە چاوی منا ئازیز و رێزداری، چەندم حەز دەکرد مردنم هەڵبژاردایە و لەگەڵ کورەکەی تۆدا بۆ ئێرە نەهاتبام، و ژووری بووکێنییەکەم و کەسوکار و کیژە ئازیزەکەم، و هەموو دەستە خوشکەکانی منداڵیم لەو دوورە بەجێنەهێشتبا. بەڵام مەخابن ئەوەم نەکرد، بۆیە ئێستا بەشم هەر فرمێسك و ژانە. جا سەبارەت بە وەڵامی پرسیارەکەت، ئەو قارەمانەی لێی دەپرسیت ئەوە ئاگامەمنونی کوری ئوتریوسە، پاشایەکی خانەدان و جەنگاوەرێکی بەجەرگە. کوری خەزورم بوو، پیاوێکی سەربەرزە، لە دڵەی کڵۆڵ و بێزراوی منەوە نزیکە."

(١٨١) بریامی پیر پێی سەرسام بوو، گوتی: "ئەی کوری ئەتریوس، ئەی منالی بەختەوەری جوان، دەبینم ئاخییان بەخۆ و لەشکری فرەیانەوە لەژێر فرمانی تۆدان.. کاتی خۆی کە لە فریجیا بووم جەنگاوەرانم بینی، لایەنگرانی ئوتریوس و میگدون، کە لە کەناری روباری سنگاریوس دا هەڵیاندابوو، من هاوپەیمانیان بووم، کە ئەمازونەکان، هاوتایانی پیاو، بەگژیاندا چوون، من لەگەڵیاندا بووم، بەڵام بەم زۆرییەی ئێستای ئاخییەکان نەبوون."

(١٩١) ئەوسا پیرەمێر روانییە (ئودیسوس)، گوتی: "پێم بێ ئەمە کێیە، ئەمەی کە بستێك لە ئاگامەمنون کورت ترە، بەڵام سینگ و شانی پانترە؟ مەتاڵەکەی لە عاردی دانراوە، بەبەر ریزەکاندا دەروات، و دەڵێی بەرانێکی گەورەیە و دووی مەران کەوتووە."

(١٩٩) هیلین وەڵامی دایەوە: "ئەوە ئودیسیوس-ە، کوری لابرتیس-ە، لە دەڤەری ئیتاکای کەڤرۆك لە دایك بووە، لە هەموو شێوازێکی ستراتیژی و فەند و فێڵێکدا باڵادەسە، زیرەك و کازرانێکی گەورەیە.

(٢٠٣) لێرەدا ئەنیتنور هەڵیدایێ: "راستت کرد خانم، چونکە جارێکیان ئودیسیوس، وەکو نوێنەر بەکارەکەی تۆوە بۆ ئێرە هاتبوو، مینیلاوس-شی لەگەڵ بوو. من لە ماڵەکەی خۆما پێشوازیم کردن، بۆیە من هەردوکیان بەدیتن و بەقسان دەناسم. کاتێ کە لە ناو تەروادەییەکاندا وەستان، شانەکانی مینیلاوس پانتر هاتنە بەرچاو، بەڵام کە دانیشتن ئودیسیوس لەو بەهەیبەت تر و بەسامتر بوو، دوای کەمێك پەیامەکەیان پێشکەش کرد، کە مینیلاوس کەوتە قسە، زمانی زۆر پاراو نەبوو. زۆری لەسەر نەرۆیی، پیاوێکی کەمدوو

بوو، بەڵام بەڕوونی لە ئەسڵی مەبەست دووا، هەرچەندە لە هاوڕێکەی بچووکتر بوو، بەڵام کاتێ ئۆدیسیوس هەستا قسە بکات، هەرچەند لە هەوەڵەوە بێدەنگ بوو، هەردووك چاوی بڕینە عاردی، گۆچانەکەی نەجوڵان، بەڵکو ڕەپ و ڕاست بەدەستەوەی گرت، وەکو پیاوێك بێ ئەزموونی قسەکردنی نەبێ –بەڵام کە زمانی کرایەوە و دەنگی بەرزبووەوە وشە و پەیڤان لە ناخی دڵییەوە وەکو بەفری زستانی بەر لە هەڵکردنی با هەڵقوڵی، پێم وانییە کەسێك لە دنیادا هەبێ شان لە شانی بدات."

(٢٢٥) ئەوسا بریام چاوی بە ئەجاکس کەوت و پرسی: "ئەدی ئەو جەنگاوەرە قۆز و گەورەیە کە بەژن و باڵای لە ئارگوسییەکانی دی کورت ترە کێیە؟"

(٢٢٨) هیلین وەڵامی دایەوە: "ئەوە ئەجاکسی مەزنە، سەنگەر و مەتەرێسی ئاخییانە. ئەوەی بەرانبەریشی، کە لەناو کرینییەکان وەستاوە ئیدومینیوسە وەك خوا وەستاوە و فەرماندە کریتییەکان دەوریان داوە، هەر جارێ لە کریتەوە دەهات بۆ سەردانمان مینیلاوس لە ماڵی خۆماندا میوانداری و پەزێرایی دەکرد. ئێستا زۆری دی لە ئاخیەکان دەبینم و دەتوانم ناوی هەموویانت پێ بڵێم، بەڵام دووانی دیکە هەن کە لە هیچ شوێنێکەوە دیار نین، ئەوانیش کاستری ڕامکەری ئەسپانی تۆسن و بولوکسی بۆکسبازی مەزنن، ئەو دووانە برای دایك و بابی منن، یا هەر لە لاسیدیمونەوە لەگەڵ سوپاکەدا نەهاتوون، یان لە ڕێگەی دەریاوە بەکەشتییەکانیان هاتوون، و زات ناکەن بەشداری شەڕ بکەن، لە ترس و شەرمی ئەو قسە درێو و جنێوە ناشیرینانەی خەڵکی بەمنی دەدەن.

(٢٤٣) نەیدەزانی ئەو جووتە قارەمانە لە لاسیدیمونی وڵاتی خۆیانا وان لەژێر خاکدا.

(٢٤٥) لەو بەینەدا قاسیدەکان قوربانییە پیرۆزەکانیان بەناو شاردا دەهێنا، دوو کاوڕ و بادەیەك، لە بەخششی خاك،( ئیدوایوس)ش تاسێکی بریقەدار و چەند پەرداخێکی زێڕی هێنا. چوو بۆلای بریام و گوتی: "ئەی کوڕی لاومیدون، فەرماندانی تەروادەیی و ئاخییان داوات لێدەکەن بچییە خوارێ بۆ دەشتەکە و سوێندی پەیمانی ڕاستەقینە بخۆیت. چونکە ئەلکساندەر و مینیلاوس لەسەر هیلین دوئێل دەکەن، بەخۆی و سەروەت و سامانەکەیەوە دەبێ بە هی ئەو کەسەی سەردەکەوێ. لەسەرمانە سوێندی پەیمانی ئاشتی ڕاستەقینە بخۆین، و بەپێی ئەو سوێندە ئێمە لێرەدا، لە تەروادەدا دەمێنینەوە، و ئاخییەکان بۆ ئارگۆس و وڵاتی ئاخییان دەگەڕێنەوە."

(٢٥٩) بریام کە گوێی لەو قسەیە بوو ڕاجفری، لێ فەرمانی بە پیاوەکانی دا کە عەرەبانەکەی

لە ئەسپیان ببەستن، بەپەلە فرمانەکەیان بەجێهێنا، سواری عەرەبانەکەی بوو، بەدەستی خۆی جڵەوی ئەسپەکانی گرت، ئەنتینور-ش لە تەنیشتییەوە سواربوو، لە دەروازەکانی سکاییەوە بەرەو دەشتەکە دەرچوون. کاتێ گەییشتنە ناو تەروادەیی و ئاخییەکان لە عەرەبانەکە دابەزین، و بەرەو مەیدانە چۆڵەکەی نێوان هەردوو لەشکرەکە چوون.

(٢٦٧) ئاگامەمنون و ئودیسیوس بەپەلە بەپیریانەوە چوون. خزمەتکاران قۆچی قوربانی سوێندەکەیان هێنا، شەرابەکەیان لە بادیەدا تێکەڵ کرد، ئاویان بەدەستی فەرماندەکاندا کرد، و کوڕەکەی ئوتریوس، خەنجەرەکەی هەڵکێشاو خوری سەری کاوڕەکانی بڕی، و خزمەتکاران بەسەر فەرماندە تەروادەیی و ئاخییەکاندا دابەشیان کرد. ئەوسا ئاگامەمنون هەردوو دەستی بەرزکرد و بەدەنگی بەرز کەوتە نزا: "ئەی بابە زیوس، ئەی ئەو کەسەی لە لوتکەی ئیداوە حوکم دەکەی، ئەی هەرە سەرفرازو هەرە مەزن، هەروەها تۆش ئەی خواوەندی خۆر، ئەی ئەوەی هەموو شتێ دەبینی و دەبیستی، ئێوەش ئەی خواوەندی زەوی و خواوەندانی ڕوباران، ئێوەش ئەی حوکمڕانانی دەڤەرانی ژێر زەوی، ئەی ئەوانەی کە سزای ئەو کەسە دەدەن بەدرۆ سوێندی خواردبێ، گەواهی ئەم سرووتە بن و بیپارێزن، و نەیەڵن بەفیڕۆ بچێ. ئەگەر ئەلکساندەر مینیلاوسی کوشت، با هیلین و هەموو سەروەتەکەی بۆ خۆی هەڵگرێ، و ئێمەش سواری کەشتییەکانمان دەبین و بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێینەوە، بەڵام ئەگەر مینیلاوس ئەلکساندەری کوشت، کارێکی وا بکەن تەروادەییەکان هیلین و هەموو سەروەتەکەی بگێڕنەوە، و باج و قەرەبوویەکی ئەوتۆ بەئاخییەکان بدەن، کە نەوەکانی دوای ئێمە هەمیشە باسی بکەن.

(٢٨٧) بەڵام ئەگەر بریام و کوڕانی بریام، لەدوای کوشتنی ئەلکساندەر، ئەم باج و قەرەبووە ڕەفز بکەن، ئەوا بەخۆم لێرەدا دەمێنمەوە و شەڕ دەکەم تا جەنگەکە تەواو دەبێت."

(٢٩٢) کە لە قسەکەی بووەوە هەڵیکێشایە کێردەکەی و لە ملی قوربانییەکانی نا، و لەسەر ئەرزەکە کەوتنە لەقە فرتێ و دوا هەناسە، چونکە کێردەکە هێزی لەبەر بڕین. هەنگێ خەڵکەکە پەرداخەکانیان لە بادیە شەرابەکە تەژی کرد و لێیان پرژاندە سەر زەوی و کەوتنە نوێژ و نزا بۆ خواوەندە نەمرەکان، تەروادەیی و ئاخییەکان پێکەوە و بەیەك دەنگ هاواریان کرد: "ئەی زیوس، ئەی هەرە شکۆدار، ئەی مەزنی مەزنان، ئەی خواوەندە نەمرەکانی دیکە، ئێوە ڕازی بن کە ئەوانەی ئەم پەیمان و سوێندە دەشکێنن،

مێشکی خۆیان و منداڵیان، وەکو ئەم شەرابە ئاڵە بپرژێتە سەر زەوی، و ژنەکانیان ببنە دیل و یەخسیری بێگانان."

(٣٠٢) بەو جۆرە نوێژ و نزایان کرد، بەڵام هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبوو کە زیوس نوێژ و نزاکەیان قەبوڵ بکات، هەنگێ بریام، نەوەی داردانوس رابوو، هاتە ناو خەڵکەکە و گوتی: "ئەی تەروادەیی و ئاخییان گوێتان لە من بێ، من بۆ شارەکەم دەگەڕێمەوە، بۆ ئیلیون (تەروادە)ی بە گێژەڵوکە و باهۆزان: من چاوم بەرایی نادات شەڕی نێوان کورەکەم و مینیلاوس بدینم، چونکە هەر زیوس و خواوەندەکانی دیکە بەخۆیان دەزانن کە مەرگ لە چارەی کیهانیان نووسراوە."

(٣١٠) ئەوجا هەردووك کاوڕەکەیان هەڵدایە عەرەبانەکەیەوە و بەخۆی سەرکەوت، و جڵەوی ئەسپەکانی بەدەستەوە گرت، هەنگێ ئەنتینور لە تەنیشتیەوە دانیشت و بەدوو قۆڵی بۆ ئیلیون (تەروادە) گەڕانەوە، هیکتۆر و ئۆدیسیوس مەودای مەیدانەکەیان پێوا و ئەوجا قورعەکانیان لەکێوخوێکدا دانا، و کەوتنە بادانی تا بزانن کێ لە پێشا نیزەکەی بهاوێژێ. هەنگێ هەردوو لەشکر دەستەونزا هاواریان کرد: "ئەی بابە زیوس، ئەی ئەوەی لە لوتکەی ئیداوە حوکم دەکەی، ئەی ئەوەی ئاگات لە ئێمەیە، ئەی شکۆدارترین بەشکۆ، ئەی مەزنی مەزنان، هەر کەسێك لەم دووە مایەی ئەم جەنگەی نێوانمانە بیکوژە، با بمرێ، با بچێتە هادیسەوە و ئێمە بەئاشتی بژین و پابەندی سۆز و پەیمانەکەمان بین."

(٣٢٤) هیکتۆری مەزن ڕووی وەرگێڕا و کەوتە بادانی کێو خودەکەی، هەر زوو پشکەکەی پاریس دەپەڕییە دەرێ و بەخت بوو بەیاری. ئەوانی دی شوێنی خۆیان گرت، هەر کەسەو لە نزیکی ئەسپ و عەرەبانەی خۆی، لەو شوێنەی چەکەکانی دانابوو، ڕۆنیشت، ئەلکساندەری مێردی هیلینە جوانیش، باشترین بەتەدارەکی جەنگی لە خۆدا.

(٣٣٠) هەوەڵجار لاقبەندە قایمەکانی لەپێ کرد و بەگیرەی زیو قایمی کردن، ئەوجا زرێیەکەی (لیکاون )ی برای هێناو لەبەری کرد و جوان لە بەدەنی خۆی چەسپاند، شمشێرە برونزنیشانەکەی کردە شانی، ئەوجا مەتاڵە قایمەکەی. ئەوسا کێوخودێکی قایمی لەسەر نا کە چەپکە یاڵێکی ئەسپی بەسەرەوە دەجوڵا، ئەوجا نێزەیەکی سەختی پڕ بەدەستی هەڵگرت. (مینیلاوس)ش بە هەمان شێوە تەدارەکی جەنگی لە خۆیدا.

(٣٤٠) دوای ئەوەی ئەو جووتە، هەر کەسە و لەناو گەلی خۆدا، تەدارەکی جەنگیان لەخۆدا، بەدیمەنێکی سامناکەوە چوون بۆ مەیدانە چۆڵەکەی نێوان هەردوو لەشکرەکە،

تەروادەیی و ئاخییەکان کە بەو شێوەیەیان بینین ترسیان لێ نیشت. هەردوکیان لە شوێنی دیاریکراو ڕاوەستان، هەر کەسە بە هەڕەشەوە نێزەکەی بادەداو، لەوی دی دەترسا. ئەلکساندەر هەوەڵجار نێزەی خۆی هاویشت، بەر مەتاڵە بازنەییەکەی مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس کەوت، بەڵام نەیبڕی، و نوکی ڕمەکە لەسەر مەتاڵەکە چەمی. هەنگێ نۆرەی مینیلاوس هات، ڕووی نێزەکەی تێکرد و بەدەم وێرد و نزاوە لە بابە زیوس دەپاڕایەوە: "خواوەندا، شاها، ئەی زیوس دەستم بدە با تۆڵەی خۆم لە ئەلکساندەر بکەمەوە، ئەو ئەلکساندەرەی نمەك حەرامی لەگەڵ کردم، بخە بەر دەستم، با ببێ بە پەند بۆ نەوەکانی داهاتوو، و کەس نەوێرێ خراپە دەرهەق بە خانەخوێی دڵپاکی خۆی بکات."

(٣٥٥) بەدەم قسەوە نێزەکەی گرتە مەتاڵەکەی ئەلکساندەر. مەتاڵەکە و زرێکەی بەری بڕی، و لە نزیکی کەمەرییەوە کراسەکەی دڕی، بەڵام ئەلکساندەر بەپەلە خۆی لادا و لە مردن دەرباز بوو. هەنگی مینیلاوس هەڵیکێشایە شمشێر و کێشای بە قەراخی کێوخودەکەیدا، کەچی شمشێرەکە بوو بە سێ چوار پارچەوە و لە دەستی کەوتە خوارەوە، ڕووی کردە ئاسمان و هاواریکرد: "ئەی بابۆ، ئەی زیوس، هیچ خوایەك لە تۆ ڕق ئەستورتر نییە، وامزانی تۆڵەی خۆم لە ئەلکساندەر کردەوە، کەچی شمشێرەکە بەدەستمەوە شکا، و نێزەکەم بە خۆڕایی لە دەست چوو، و نەمکوشت."

(٣٦٩) ئەوەی گوت و بەرەو ئەلکساندەر (پاریس)، چوو گرتی بە چەپکە یاڵەکەی سەر کێو خودەکەیدا، و بەرەو ئاخییەکان ڕایکێشا، قایشی کێوخودەکە لەژێر چەنەی چەقی و خنکەخنکی پێخست، چی وای نەمابوو مینیلاوس بە ئاواتی خۆی بگا، ئەگەر ئەفرۆدێتی کیژی زیوس، خواوەندی جوانی، ئەم دیمەنەی نەدیبا و قایشەکەی نەبڕیایە، ئەو قایشەی لە چەرمی گا دروست کرابوو، مینیلاوس کێوخودێکی بۆش و بەتاڵی بەدەستی خۆیەوە بینی. ئیدی بۆ هاوڕێکانی هەڵدا و لەناو ئاخییەکاندا کەوتەوە، و بۆ جاری دووەم پەلاماری ئەلکساندەری دایەوە تا بەنێزە جەستەی دیواودەربکات، بەڵام ئەفرۆدێت لە چاوتروکانێکدا (هەر خواوەندان ئەمەیان پێدەکرێ) ڕفاندی و لە پەڵە هەورێکی تاریکییەوە پێچا و گەیاندییەوە ژووری نووستنەکەی.

(٣٨٣) ئەوسا چوو هیلین بانگ بکات، لەسەر بورجە بەرزەکەدا بینی لە کۆمەڵە ژنێکی تەروادەیی بەدەورەوە بوو. خۆی خستە بیچمی ئەو پیرەژنەوە کە ئەوسای هیلین هێشتا لە لاسیدیمون بوو، جلی ناسکی خوری بۆ دەچنی، هیلین زۆری خۆشدەویست. بەو

سیوەیە خۆی لێگۆڕی و چمکی کراسە بۆندارەکەی گرت و ڕایکێشا و گوتی: "وەرە بۆ ئێرە، ئەلکساندەر دەڵا با بێتەوە بۆ ماڵا، لە ژوورەکەی خۆیدایە و پاڵ کەوتووە، خۆی ڕازاندووەتەوەو پرشنگی جوانی دەدا. کەس ناڵا ئێستا لە شەڕ گەڕاوەتەوە، دەڵێی بۆ ئاهەنگی سەما دەچێت، یان ئێستا لە سەما بووەتەوە."

(٣٩٥) بەم قسانە ڕقی هیلینی هەستاند. بەڵام کە گەردنی بەرز و بەرۆکی جوان و چاوانی گەشی خواوەندی بینی، دڵی داخورپا و گوتی: "ئەی یەزدانخانم، بۆچی تەفرەم دەدەی؟ دەتەوێ جارێکی دیکە وێڵی دووی پیاوێکم بکەی، کە لە فریجیا یان لە میونیای جواندا پێی سەرسام بووی؟ ئا ئێستا مینیلاوس، ئەلکساندەری لەناو برد، منی قێزەون هەڵدەگرێ و لەگەڵ خۆیم دەباتەوە. هاتووی بۆ ئێرە تا فریوم بدەیت. هەرە بۆ خۆت بەدیار ئەلکساندەرەوە دانیشە، و دەستبەرداری خوایەتی ببە و بالاقەکانت جارێکی دی بۆ ئۆڵەمپت نەبەنەوە، ئەوەندە لە خەمی پاریس دا بەو ئەوەندە پەرۆشی بە تا دەتکات بەژنی خۆی، یان دەتکا بەکەنیزەکی خۆی. بەڵام من؟ من ناچم، من جارێکی دی جێگەی ئەو ڕێك ناخەم و گەرم ناکەم، ئیدی دەبم بەگەپجاڕی هەموو ژنانی تەروادە. دەردی دڵم کەم نییە."

(٤١٤) ئەفرۆدێت لە قسەکانی توڕە بوو گوتی: "توڕەم مەکە ئەی داوێن تەڕی بێ شەرم و حەیا، ئەگەر توڕەم بکەی دەستبەردارت دەبم و چەندم خۆشویستوی بەهەمان ئەندازە دەتبوغزێنم. وکەرب وکینێکی پیس دەخەمە بەینی تەروادەیی و ئاخییانەوە، هەنگێ بە چارەنووسێکی خراپ لەناو دەچیت."

(٤١٨) هیلین کە گوێی لەم قسانە بوو ترسی لێنیشت، خۆی لە عەباکەیەوە پێچاو بە بێدەنگی و بێ ئەوەی ژنە تەروادەییەکان هەستی پێبکەن دووی خواوەندەکە کەوت.

(٤٢١) کە گەییشتنەوە ماڵی ئەلکساندەر، کارەکەرەکان یەکسەر. چوونە سەر کاری خۆ، بەڵام هیلین چوو بۆ ژوورە تایبەتیەکەی خۆی، ئەفرۆدێتی خەندە شیرین، کورسییەکی هەڵگرت و لە هەنبەر ئەلکساندەر دایناو. هیلین، کیژی زیوسی قەڵغان بەشان، لەسەر ئەم کورسییە ڕۆنیشت، و بەمۆڕەوە کەوتە سەرزەنشتی مێرەدەکەی.

(٤٢٨) گوتی: "کەواتە لە شەڕهاتیەوە، خۆزی بەدەستی ئەو کەڵەمێرە، کۆنە مێردەکەم دەکوژرای. خۆ تۆ جاران فشەت دەکرد کە هەم بەهێزی بازوو، و هەم بەنێزەکەت لە مینیلاوس بەهێزتری، ئەمجارەش بچۆوە و تەحەدای بکەوە —بەڵام من ئامۆژگاریت

دەخەم کە نەچیت، شێتانە ڕووبەڕووی نەبێتەوە، چونکە دەترسم زوو بەزوو بەنێزەی ئەو بکوژرێی!"

(٤٣٦) باریس وەڵامی دایەوە: "ئافرەت، بە سەرزەنشتەکانت تووڕەم مەکە. مینیلاوس ئەمجارە بەکۆمەکی خواوەند ئەتینا بەسەرما سەرکەوت، بەڵام جارێکی دی من ئەو دەبەزێنم، چونکە منیش خواوەندانێکم هەن کە پشتیوانیم لێدەکەن. وەرە با تێك ئاڵێین و دۆستایەتییەکەمان تازە بکەینەوە، لە ژیانما وەکو ئەم ساتە ئارەزووم نەکردوویت- تەنانەت ئەو کاتانەش کە یەکەمجار لە لاسیدیمونەوە ڕەدووم خستی و بە دەریادا رفاندمیت- تەنانەت ئەو کاتانەش کە لە دورگەی کرانیادا بووین بەشەریکی نوێنی ڤیان، ئەم ئارەزوو تامەزرۆییەی ئێستام لە خۆدا نەدەبینی." دوای ئەم قسانە چوو بۆ سەر جێگەکەی، و ژنەکەشی دوای کەوت.

(٤٤٧) بەو جۆرە ئەوان بەدوو قۆڵی چوونە ناو جێگاو تێکهاڵان. کوڕەکەی ئەتریوس- ش بەناو ئاپورای خەڵکەکەدا کون بەکون لە ئەلکساندەر دەگەڕا، بەڵام نەیدۆزییەوە، نە لەناو تەروادەییەکاندا دیار بوو، نە لەناو هاوپەیمانەکاندا. خۆ ئەگەر بیاندیبا لێیان نەدەشاردەوە، چونکە هەمووان چەند لە مردن بێزار بوون، ئەوەندەش ڕقیان لەوە بوو. ئەوسا ئاگامەمنونی، شای جەنگاوەران، ڕووی دەمی کردە ئاپوراکە و گوتی:

(٤٥٦) "گوێ بگرن ئەی تەروادەیی و داردانییەکان، گوێ بگرن ئەی هاوپەیمانان. ئێستا ئاشکرایە کە مینیلاوس سەرکەوتووە، بۆیە هیلین و سەروەتەکەیمان پێ بسپێرن، و قەرەبوویەکی ئەوتۆشمان بدەنێ، کە ببێ بەعیبرەت بۆ نەوەکانی ئاییندە."

(٤٦١) کوڕی ئوتریوس بەو جۆرە قسەی کرد، و هەموو ئاخییەکان بەیەك دەنگ قسەکەیان پەسند کرد.

# سروودی چوارەم

## پێشێل کردنی ئاگربەستەکە و یەکەمین شەڕ

**حیکایەتەکە:**

**خواوەندان کۆبوونەوە تادەربارەی جەنگی نێوان تەروادەیی و ئاخییەکان گفتوگۆ بکەن. زیوس ویستی هیرا و ئەتینا کە لایەنگری گریك بوون، تورە بکات، پێشنیازی ئەوەی کرد کە ئاشتی لەنێوان هەردوولادا بەرپا بکرێت. هەردوو خواوەندەکە تورەیی خۆیان شاردەوە، لێ هیرا نەیتوانی خۆی کۆنترۆڵ بکات، و کەوتە گازاندە لە زیوس چونکە گوێ بەحەز و ئارەزووی ئەو نادات، و هەرچییەکی لە تواناداا بوو کردی بۆ ئەوەی ئاخییەکان دژی تەروادەییەکان تەیار بکات. زیوس و هیرا مامەڵە و سەودایەك دەکەن، هیرا پێی دەڵێت کە زۆر شاری هەیە، خۆشەویست ترینیان لە دڵی ئەودا ئارگوس و ئەسپارتە و میسینایە، کامیانی دەوێ با وێرانی بکات، لە هەنبەر ئەوەی کە ڕێی بدات تەروادە وێران بکات، چونکە ڕەدووخستنی هیلین لەلایەن تەروادەییەکانەوە کارێکی حەیا بەرەیە. زیوس لەگەڵیا ڕێکەوت و ڕێگەی بەئەتینادا کە دابەزێ بۆ سەر زەوی و کار بۆ تێکدانی ئاگربەستەکە و هەڵگیرسانەوەی جەنگ بکات. ئەتینا دابەزییە ناو تەروادەییەکان و باندارۆسی هەڵبژارد و لە شێوەی برادەرێکیدا خۆی لێ ئاشکرا کرد و کەوتە دندەدانی تا ئاگربەستەکە پێشێل بکات، وای حاڵیکرد کە ئەگەر تیرێك باوێتە مینیلاوس ناو وشۆرەت دەردەکات، و تەروادە هیلین و سەروەت و سامانەکەی بۆ خۆ هەڵدەگرێت و گریك بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێنەوە. ئیدی میر ئەلکساندەر (پاریس) ڕێزت لێ دەنێت و لە ماڵ دیارییانت دەگرێت، ئەگەر مینیلاوس بەسەر ئاگری جەنازەوە بدینێ. باوەڕی کرد و تیرێکی هاویشتێ، لێ زامەکەی مینیلاوس سووك بوو. ئاگامەمنوونی برای وایزانی برینەکەی کوشندەیە و سووی لە بێ بەختی ئەو هات، لێ لوقمان نووکی تیرەکەی لێ دەرهێناو بەگیا سپی برینەکەی چارە کرد. پاش ئەوەی ئاگامەمنون**

دڵنیابوو لەوەی برینەکە سووکە، کەوتە گەڕان و جەولە بەناو لەشکرەکانی گریکدا و فەرماندەکانی جۆشدەدا و ئاگاداری دەکردنەوە چۆن تەروادەییەکان ئاگربەسەکەیان پێشێل کردووە، و هیچ چاریان نییە تەنیا پەلاماردانی شورە و قەڵاکانی تەروادە و سەندنەوەی هیلین و سەروەت و سامانەکەی نەبێ. سوپاکان دەخرۆشێن، ڕیزەکانیان ڕێکدەخەن، سواران (ئەوانەی بەعەرەبانە شەڕ دەکەن) دەخەنە پێشەوە، و ترسنۆکان دەخەنە ناوەڕاستەوە، و دلێر و ئازایان دەخەنە دواوە.
دوای خۆسازدانی تەواو جەنگ دەست پێدەکات و خەڵکێکی زۆر دەکوژرێن و زەوی لە خوێنا سور دەبێ.

زەمەن:

ئەم ڕووداوانە لە بەشێکی ڕۆژی بیست و سێیەمدا ڕوودەدەن.

شوێن:

هەمان شوێنی سروودی پێشوو، دەشتەکەی بەینی تەروادە و ئەو کەنارەیە کە کەشتییەکانی گریکەکانی لێ وەستاوە.

(١) هەموو خواوەندەکان لەگەڵ زیوس دا دانیشتوون، و لەسەر زەوی زێڕینی بارەگاکەیاندا کۆبوونەتەوە و ڕاوێژان دەکەن. هیبی مەیگێڕی خواوەندان بە بادەی نکتارەوە بەسەریاندا دەسوڕێتەوە، هەر کە یەکێکیان بەسەلامەتی ئەویتریان پێکە زێڕینەکەی هەڵدەدا، دەڕواننە خوارێ، سەیری تەڕوادە دەکەن. ئەوسا کوڕی کرونوس هەر بۆ وەی هیرا توڕە بکات، کەوتە قسان، قسەیەك لێرە و قسەیەك لەوێ. پێی گوت: "مینیلاوس لەنێو یەزدان خانماندا دوو دۆستی هەیە، هیرای ئەرگۆسی و ئەتینای ئەلکومینی، ئەم جووتە بەبێدەنگی دانیشتوون و تەنیا دڵیان بە تەمەشاکردنی دیمەنەکە خۆشە. کەچی خواوەندی ڤیان و جوانی، ئەفرۆدیت هەمیشە لە ئەلکساندەرەوە نزیکە تا بەدڵ بەرگری لێ بکات، ئەوی ڕاستی بێ هەر ئێستاکێ، دوای ئەوەی دڵنیابوو دەمرێت، فریای کەوت و ڕزگاری کرد –چونکە گومان لەسەرکەوتنی مینیلاوس نەبوو- جا ئێمە دەبێ بیر لەوە بکەینەوە چ بکەین، ئایا وازیان لێ بێنین شەڕێکی دی بکەنەوە یان لە بەینی خۆیاندا ئاشت ببنەوە؟ ئەگەر ڕاتان لەسەر چارەسەری دووەمە، ئەوا مینیلاوس دەتوانێ هیلین بەرێتەوە و شاری تەڕوادە بەئاوەدانی دەمێنێتەوە."

(٢) ئەتینا و هیرا کە بەلای یەکەوە دانیشتبوون، و زۆر داخ لە دڵ بوون دەرهەق بەتەڕوادەییەکان، بەگوێی یەکتریاندا چپاند، ئەتینا لە هەنبەر بابیدا چارەی بەیەکدا دا، چونکە زۆر لێی پەست و توڕە بوو، بەڵام هیچی نەوت، لێ هیرا خۆی پێنەگیرا. گوتی: "ئەی کوڕی کرونوسی سامناك، تکایە پێم بێ ئەمە چییە؟ ڕەنج و ماندووبوونەکەم بەفیڕۆ بچێ

(٢٧) ئەو هەموو ئارەقەی کە ڕشتم لە ڕای کۆکردنەوەی خەڵکی دژی بریام و کوڕەکانی بەخۆڕایی بڕوات؟ تۆ هەرچی دەکەی بیکە، بەڵام ئێمەی خواوەندان بەم تەگبیرەی تۆ ناکەین."

(٣٠) زیوس توڕە بوو و وەڵامی دایەوە: "ئازیز، بریام و کوڕانی بریام چ زەرەرێکیان لێ داوی، تا ئەوەندە بەجۆش بی بۆ وێرانکردنی شاری ئیلیون؟ هیچ شتێك تامەزرۆییت ناشکێنێ ئەوە نەبێ قولە و قەڵاتەکانی بریام بڕوخێنی و لەگەڵ کوڕەکانیا بیخەیتە ژێر پێیان؟ چی دەکەی بیکە، من نامەوێ ئەم مەسەلەیە ببێتە مایەی پەشێوی نێوانمان. دەمەوێ ئەوەشت پێ بڵێم، ئەم قسەیەم بکە بەگوارە و لە گوێی بکە، ئەگەر ویستم شارێکی دۆستانی تۆ وێران بکەم، نابێ دەست بێنیتە ڕێگەم، دەبێ ڕێم بدەی ئەو کارە

بدەم، چونکە من ئەمجارە بەکەسەرێکی زۆرەوە و بەناچاری تەنازولم بۆ تۆ کرد لە هەموو شارانی ژێر هەتاو و ئەستێرانی ئاسماندا، ڕێز و حورمەتی هیچ شارێکم هێندەی ڕێز و حورمەتی ئیلیون و بریام و گەلەکەی لەلا نییە. هەرگیز قوربانگەی منیان بێ خواردن و داوەت نەکردووە، هەرگیز قوربانگەکەی منیان بێ ئاورودوو نەکردوە، بەڕێزەوە سروتەکانیان لەڕای مندا ئەنجام داوە."

(٥٠) هیرا هەڵیدایێ: "شارانی دڵگیری من بریتین لە ئەرگوس، و ئەسبارتە و میسینا. هەر کاتێ یاخی بوون وێرانیان بکە، نە بەرگرییان لێدەکەم و نەگوێیان دەدەمێ. خۆ ئەگەر بشمەوێ ڕێگەت لێبگرم. بەهیچ ناچێت چونکە تۆ لەمن بەهێز و تواناتری، بەڵام حەز ناکەم کارەکەم لێ تێکبدەیی، من لەم سەر زەمینەدا هەر لەبەرئەوە ڕێز ناگیریم کە خواوەندم، بەڵکو لەبەرئەوەشە کە ژنی تۆم، تۆش سەروەری خواوەندانی. ئەمر بە ئەتینا بکە هەر ئێستا بڕوات بۆ مەیدانی جەنگەکە، و بەهەر فێڵێك بووە کارێکی وەها بکات تەروادەییەکان دەست پێشکەری بکەن و ئاگربەسەکە بشکێنن و بەسوێندەکەی خۆیان نەکەن و پەلاماری ئاخییەکان بدەن."

(٦٨) سەروەری خواوەندان و بەشەران قسەکانی بەهەند وەرگرت و بەئەتینای گوت: "هەر ئێستا خۆت بگەیەنە لەشکرانی تەروادەیی و ئاخییەکان، و بەهەر فێڵێك بووە کارێکی وەها بکە تەروادەییەکان ئاگربەسەکە بشکێنن و سوێندەکەیان بەدرۆ بخەنەوە و بەریانبدە ئاخییەکان."

(٧٣) ئەتینا تامەزرۆی ئەم کارە بوو، یەکسەر لەبەرزترین لوتکەی ئۆڵەمپەوە داگەڕا. لەگەڵ خۆیدا هەندێ بەردەستێری (نیازك) پرشنگداری هاویشت، بەو بەردەستێرانەی کە کوڕی کرونوس وەکو نیشانەی شوم یان مژدەی خۆشی بۆ دەریاوانان و هەندێ گەورە لەشکرانی ڕادە خۆشاندن و گریان لێدەبووەوە. تەروادەیی و ئاخییەکان کە ئەم بەردەستێرانەیان بینی ترسان، ئاوریان لێکدی دایەوە و گوتیان: "یان لێمان دەبێتەوە بەشەڕ، یان زیوسی داوەر و سەرداری جەنگان، ئاشتیمان لەنێواندا بەرپا دەکات."

(٨٥) تەروادەیی و ئاخییەکان ئاوایان دەگوت. هەنگێ ئەتینا چووە بیچمی لاودوکۆسی کوڕی ئەنتینور و بەناو تەروادەییەکاندا گەڕا تا باندارۆسی کوڕە بەهەیبەت و ساماکەی لیکارونی دۆزییەوە. سەیری کرد لەنێو ئەو جەنگاوەرە عەگیدانەدا وەستاوە کە لە کەنارەکانی ڕووباری ئیسیبوسەوە دووی کەوتبوون. لێی نزیك بووەوە و گوتی: "ئەی

کوڕە ئازاکەی لیکاون، قسەیەکت پێ بڵێم بەقسەم دەکەی؟ ئەگەر تیرێك بگریە مینیلاوس دەبی بەمایەی ڕێز و ستایشی هەموو تەروادەییەکان، بەتایبەتی میر ئەلکساندەر- ئەگەر ببینێ مینیلاوس خراوەتە سەر لێژنە داری جەنازە، و بەتیری تۆ کوژراوە، خەڵاتێکی گەورەت دەکات. دەی خۆت یەك دڵ بکە، و لەبەر ئەپولۆی تیر ئەندازی بەناوبانگ بپارێوە و سوێندی بۆ بخۆ کە بۆماڵی خۆت لە شاری زیلیا. گەڕایتەوە سەد سەر بەرخە کۆرپەی وەکو ڕێز بۆ بکەیتە قوربانی."

(١٠٤) زووبەزوو باوەڕی کرد، کەوانەکەی داگرت، ئەم کەوانە لە شاخی کەڵە کێوییەك دروست کرابوو کە بەخۆی کوشتبووی، لە کاتێکا لەو تاوێرەوە بۆ ئەو تاوێر بازی دەدا، تیرێکی لە دڵیدا بوو و کوشتبووی. شاخەکانی شەش بستان درێژ بوون، کەوانسازێکی مەعلان کەوانێك لە هەردوو شاخەکەی دروست دەکات، کەوانێکی یەجگار خۆشدەست. و هەردوو سەری لە زێر دەگرێت. کاتێ باندارۆس کەوانەکەی ئامادەکرد زۆر بەوریایی لە عاردی دانا، یاوەرە ئازاکانی قەڵغانەکانیان لە پێشیا ڕاگرت لە ترسی ئەوەی نەبادا ئاخییەکان، بەرلەوەی تیرەکەی ئەم مینیلاوس بپێکێ، تیربارانی بکەن. ئەوجا سەری تیردانەکەی لاداو تیرێکی باڵداری دەرێنا کە هەرگیز بەکاری نەهێنا بوو، تا ئاه و ناڵەی مەرگ لەگەڵ خۆیدا هەڵگرێ.

(١١٨) تیرەکەی لە کەوان ناو لەبەر ئەپولۆی تیر ئەندازی ناودار پاڕایەوە و سوێندی خوارد هەر کە بۆ ماڵەکەی خۆی لە شارە بەهێزەکەی زیلیا، گەڕایەوە سەد بەرخە کۆرپەی بۆ بکات بەنەزر و قوربانی. شەقی تیرەکەی نایە سەر ژێی کەوانەکەی کە لە چەرمی گا دروست کرابوو، شەقی تیرەکە و ژێی کەوانەکەی بەرەو سینگی خۆی ڕاکێشا، تا سەری تیرەکە تەواو لە کەوانەکە نزیك بووەوە، کە کەوانەکە شێوەیەکی نیوەبازنەیی وەرگرت و تیرەکە بەسەر سەری ئاپوراکەدا هاژەی کرد.

(١٢٩) بەڵام خواوەندە موبارەکەکان لە بیریان نەکردیت مینیلاوس. ئەتینای کیژی زیوس، و سەرپەرشتیاری وێرانی و وێرانکاری، یەکەم کەس بوو خۆی دایە بەردەمت و لەو تیرە بڕندەیەی پاراستی. لە جۆرێ تیرەکەی لێ لادا، وەکو چۆن دایکێك مێشێك لە مناڵەکەی کە لە شیرینی خەودا بێ بتارێنێ، کارێکی وەهای کرد تیرەکە ڕووبکاتە ئەو شوێنەی کە لۆی پشتێنەکەی دەکەونە سەر یەك و بەمەش زرێی سەر کەمەری بوو بە دوو لۆی لەسەریەك، بەڵام تیرەکە ڕێك بەر پشتێنەکەی قەدی کەوت. پشتێنە کەو زرێ مەحکەمەکەی ژێریشی

بڕی، هەروەها ئەو پشتێنەی ژێریشی بڕی، کە پشتێنەکە ڕاستەوخۆ لەسەر گۆشتەوە دەبەستریێ، و دژی نێزە و تیرانە، ئەمە خزمەتێکی زۆری مینیلاوسی کرد، و بەر باشترین شوێنی مینیلاوس کەوت، و کە تیرەکە سمی، زامێکی سەرڤەسەرڤەی سووکی کردە جەستەی، و دەم و دەست خوێنێکی ڕەش لە زامەکەی هات

(١٤١) وەکو چۆن هەندێ ژنانی میونیایی یان کاریایی بەرەنگی سوور پارچە عاجێك دەرەنگێنن بۆ چاوبەندی ئەسپان، و لە عەماردا دادەنرێ –زۆر سوارچاکیش چاویان لە دویەتی، ئەوەی بەدەستی دێنێ شازادەیەکە، وەکو توحفەیەك کە هەم ئەسپەکە برازێنێتەوە و هەم خاوەنەکەی شانازی پێوە بکات- بەو ئاوایە ئەی مینیلاوس هەردوو ڕان و لاقەکانت تا بنی هەردوو پاژنە جوانەکەت خڵتانی خوێن بوون.

(١٤٨) ئاگامەمنون کە بینی خوێن لە زامەکەوە فیچقە دەکات، ترسا، هەروەها (مینیلاوس) ش شڵەژا، بەڵام کە بینی سەری نێزەکە گۆشتی پێوە نییە، هەنگێ هێدی بووەوە، لێ ئاگامەمنون هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، دەستی مینیلاوسی گرت، و گوێی لێبوو و هاوڕێکانیشی دەیان نالاند، هاواریکرد:

(١٥٤) پێدەچێ من ئەو قوربانیەم بۆ مەرگی تۆ کردبێ، و بەتاقی تەنیا وەپێشم خستی تاوەکو قارەمانی مە بەگژ تەروادەییەکانا بچی. تەروادەییەکان سوێند و پەیمانەکەیان پایەماڵ کرد و برینداریان کردیت، وێڕای ئەوەش سوێند و پەیمانەکە و خوێنی بەرخەکان و شەرابە پرژاوەکە و دەستی ڕاستمان کە بۆ ئاشتی و دۆستایەتی درێژمان کرد بەفیڕۆ ناچێ.

سەردار و فەرمانڕەوای ئۆڵەمپ ئەگەر لێرە و لە ئێستادا ئەم سوێند و پەیمانە نەیەنێتە دی، بێگومان دوایی هەر دەبهێنێتە دی، و بەهای ئەم پەیمانشکێنییە لەسەرخۆیان و ژن و منداڵیان زۆر دەکەوێ، بێگومان هەر ئەو ڕۆژە دێ کە ئیلیونی هێزدار، لەگەڵ بریام و گەلەکەی بریام دا دەکەوێ، کاتێ کوڕی کرونوس لە عەرشە بەرزەکەی خۆیەوە، سزای سامناکی ئەم خیانەتەی ئێستیان بۆ نازڵ دەکات. بێگومان ئەمە دێتەدی، بەڵام ئێستا ئەی مینیلاوس، ئەگەر ئەمڕۆکە. ئەجەلت هاتبا، خەمی گەورە بۆ من دەمایەوە، ناچار دەبووم بۆ ئارگوس بگەڕێمەوە، چونکە ئاخییەکان بۆ ماڵی خۆ دەگەڕانەوە. هەنگێ بریام و تەروادەییەکانمان بەجێدەهێشت و خۆیان بەزەوتکردنی هیلینەوە بادەدا، و تۆمان بەجێدەهێشت و ئێسکەکانت لە خاکی تەروادەدا دەڕزین بێ ئەوەی بەئاواتی خۆت بگەی.

ئەوسا تەروادەییەکی لەخۆ ڕازی گۆڕەکەتی بەر پێلەقان دەدا و دەیگوت: "ئاگامەمنون ئاوها تۆڵە دەکاتەوە، لەشکرەکەی بەبێهودە بۆ ئێرە هێنا، بەکەشتی بەتاڵ بۆ وڵاتی خۆ گەڕایەوە و مینیلاوسی لە پاش خۆی بەجێهێشت" خەڵکانێك قسەی وا دەکەن، ئەوسا هێڤیدەکەم زەوی بقڵەشێ و قووتم بدات."

(١٤٨) بەڵام مینیلاوس دڵنیای کردەوە: "خەمت نەبێ، ئاخییەکان مەترسێنە، تیرەکە شوێنی کاری نەگرتووم، چونکە ئاسنی پشتێنەکەم بەری گرتووە، لەژێر ئەمەشەوە زرێ و پشتێنێکی گوللە نەبڕم لەبەرە کە برونزگەران بۆیان دروستکردوم."

(١٨٨) ئاگامەمنون وەڵامی دایەوە: "من دڵنیام لەمە مینیلاوسی ئازیزم، بەڵام دەبێ لوقمان سەیری برینەکەت بکات و گیاسپی لێ بنێ تا ئازارەکەت سووك ببێ."

(١٩٣) ئەوسا ڕوویکردە تالتیبیوس و گوتی: "تالتیبیوس، هەرە ماخاون-ی کوڕی دکتۆری گەورە ئەسکلیبیوس ئاگادار بکە کە بەپەلە بێت مینیلاوس معایەنە بکات. بێ کەواندارێکی تەروادەیی یان لیشی تیرێکی لێداوە، کە ناوی بۆ خۆی دەرکردووە و خەم و پەژارەی بۆ ئێمە هێناوە."

(١٩٨) تالتیبیوس بەگوێی کرد، و ڕۆیی و کەوتە گەڕان لە ماخاون، سەیری کرد لەنێو جەنگاورەکانیا، ئەو جەنگاوەرانەی لە تریکاوە لەگەڵی هاتبوون، وەستاوە. لێی نزیك بووەوە و گوتی: "ئەی کوڕی ئەسکلیبیوس، ئاگامەمنون شا دەڵێ با بەپەلە بێ و مینیلاوس معایەنە بکات، کەواندارێکی تەروادەیی یان لیشییە تیرێکی لێداوە، تا هەم ئێمە بترسێنێ و هەم بۆ خۆی ناوبانگێکی گەورە دەربکات."

(٢٠٨) هەر کە ئەو قسەیەی کرد ماخاون کەوتە ڕێ. بەدوو قۆڵی بەناوجەرگەی سوپای پان و بەرینی ئاخییاندا ڕێیان کرد تا گەیشتنە ئەو شوێنەی مینیلاوسی لێی بریندار بووبوو، ڕاکشابوو و گەلێك لە فەرماندەکان ئەڵقا و ئەڵق بەدەورییەوە بوون. ماخاون خۆی گەیاندە ناوەندیان و یەکسەر نێزەکەی لە پشتێنەکە دەرهێناو، بەهەمان قوەتەوە کە دەریهێنا، دڕکەکانی بۆ پشتەوە چەمانەوە. ئەوجا پشتێنە لوسەکە و زرێکەی ژێری و پشتێنە گوللە نەبڕەکەی کە برونزگەران بۆیان دروست کردبوو، هەمووی کردنەوە، ئەوجا دوای ئەوەی برینەکەی بینی، خوێنەکەی سڕی و هەندێ لەو داو و دەرمانە هاراوەیەی کە قەنتور کاتی خۆی بەنیازی پاك دابووی بە ئەسکلیبیوسی بابی، لە برینەکە نا.

(٢٢٠) لەو دەکەدا کە سەرقاڵی مینیلاوس بوون، تەروادەییەکان هێرشیان هێنا،

ئاخییەکانیش جلی حەربیان لەبەرکرد و خۆیان بۆ شەڕ تەیار کرد.

(٢٢٣) لەم دەمەدا ئاگامەمنونت نەدەبینی خەواڵو بێ یان بترسێ، یان ئارەزوی کوشتار و شەڕی نەبێ، بەڵکو زۆر تاسەمەندی شەڕ بوو. ئەسپەکانی و عەرەبانەکەی کە بەبرۆنز ڕازابووەوە بۆ پاسەوانەکەی، واتە یوریمیدونی کوڕی بتولیمایوسی کوڕی فیرایوس بەجێهێشت و ئەمری پێکرد کە ئامادەبێ بۆ ئەو کاتەی کە ئەم لە گەڕان و دەرکردنی فرمانان ماندوو دەبێ، چونکە بەپێیان بەسەر ڕیزەکانی لەشکرەکەدا دەگەڕا. کە بینی جەنگاوەرەکان بەپەلە بۆ پێشەوە تاو دەدەن، لە نزیکیانەوە هاواری کرد: "ئەی ئارگۆسیان، بەئەندازەی داوە مویەك لە هێرش و پەلامار سارد نەبنەوە، بابە زیوس پشتیوانی ڕیاکاران و دەغەڵبازان ناکات؛

(٢٣٦) تەروادەییەکان دەست پێشکەریان کرد و سوێندەکەیان پێشێل کرد و پەلاماریان داین، بۆیە دەبن بەخۆراکی قەل و داڵان، دەست بەسەر شارەکەیاندا دەگرین و ژن و منداڵەکانیان لە کەشتی دەنەین و لەگەڵ خۆدا دەیانبەین."

(٢٤٠) بەڵام زۆر بەتوندی سەرزەنشتی ئەوانەی کرد کە خۆیان دەدزییەوە و وازی شەڕیان نەبوو، هاواریکرد: "ئەی ئارگوسییان، ئەی مەخلوقاتە ترسنۆك و کلۆڵەکان، شەرم لە خۆ ناکەن کە وەکو ئاسکانی ترساوی پەلوپۆ شکاوی دەشتان، لە دەوری یەك خڕبوونەتەوە و ناجەنگن؟ ئێوە دەڵێی ئاسکانی حەپەساوی بێ باشارن. چاوەنۆڕی ئەوەن تا تەروادەییەکان بگەنە سەر کەشتییەکانمان، و ئێوەش لە کەنارەکەدا پاڵ بدەنەوە و چاوەڕوان بن کە ئاخۆ کورەکەی کرونوس لەسەرتان دێتە جواب؟"

(٢٥٠) ئاو بەو جۆرە دەسوڕایەوە و ئەمری بۆ جەنگاوەران دەردەکرد، بەنێو ڕیزەکاندا ڕەت دەبێ و دەگاتە کریتییەکان، باسکی لە قەدی ئیدومینوبوس وەردێنێ، ئیدومینوبوس بەچەشنی ورچێکی کێوی لە پێشیانەوە وەستابوو، میریونیس-ش سەرپەرشتی و سەرکردایەتی هێزەکانی دواوەی دەکرد. ئاگامەمنون بەدیتنی خۆشحاڵ بوو، بەخۆشەویستی و سۆزەوە قسەی لەگەڵدا کرد، گوتی: "ئیدومینیوس، تۆ لە دڵی مندا لەهەر ئاخییەکی دیکە جیاوازتری، بەڕێزتری، ئیدی لەجەنگدا بێ یان لە شتی دا، یان لەسەر خوانی نانخواردن بێ. کاتێ فەرماندەکان بادە نایابەکانم لە بادیەدا تێکەڵ دەکەن، هەریەکەیان بەشی تایبەتی خۆی دەبات، لێ پەرداخەکەی تۆ هەمیشە وەکو پەرداخەکەی من تەژی دەبێت، بۆت هەیە هەموو کاتێ بخۆیتەوە. کەواتە هەستە و بڕۆ بۆ

سەرڕ بیسەلمێنە کە ئەو پیاوەیت کە هەمیشە شانازیت پێوە کردووە."

(٢٦٥) ئیدومینیوس وەڵامی دایەوە: "من هاوڕێی وەفاداری تۆ دەبم، وەکو چۆن لە هەوڵەوە سۆزم دایتێ. هەرە و ئاخییەکانی دی جۆشبدە، تا هەموو پێکەوە بچینە شەڕ، چونکە تەڕوادەییەکان پەیمان و بەڵێنەکانی خۆیان شکاند. لە ئێستا بەدواوە بەشیان هەر مەرگ و وێرانی دەبێت، چونکە ئەوان سوێند و پەیمانەکەیان شکاندوە و پەلاماریان داوین."

(٢٧٢) کوڕی ئوتریوس بەدڵی خۆشەوە لەسەر جەولەکەی بەردەوام بوو، تا گەییە نزیکی دوو کەس لە ئەیانتینەکان کە لە ناوەندی کۆمەڵێك سەربازی پیادەدا تەدارەکی جەنگیان لەخۆ دەدا. جا وەکو پەزەوانێك لە شوێنێکی بەرزەوە هەور و هەڵایەکی توند بدینێ، بەدەم بای سەباوە زۆر بەخێرایی

(٢٧٧) وەکو قیرێکی ڕەش بەسەر دەریاوە بەرەو ئەو بێ و هەرەشەی تۆفانی پێ بێ، ئەوجا بترسێت و پەزەکەی بۆ شکەفت و ئاغەڵێك بەرێ —ئاواو بەو جۆرە ئاپورەی لاوانی خورت و ئازا ڕەش دەچوونەوە و لەژێر فرمانی ئەم جووتە ئەیانتینەدا، کە مەتاڵ و نێزە و جەنگەوزارەکانیان سامیان دەخستە دڵەوە، بەرەو جەنگ دەچوونە پێش. ئاگامەمنون بەدیتنیان شادبوو. هاواری کرد: "من فەرمان بۆ فەرماندە ئارگوسییەکان دەرناکەم، چونکە ئێوە خۆبەخۆ ئەمرتان بە جەنگاوەرەکانی خۆ کردووە کە ئامادەی شەڕ بن.ئەی بابە زیوس، ئەتینای یەزدانخانم، ئەی ئەپولۆ، خۆزیا هەموو کەسێك وەکو ئەم جووتە بوایە، ئەوسا شارەکەی بریام زووبەزوو دەکەوتە دەستمان و هەموویمان وێران دەکرد."

(٢٩٢) ئەو قسانەی کرد و ڕۆیی بۆلای نەستوری وتاربێژی بەتوانای بیلییەکان، کە جەنگاوەرەکانی بۆ هێرش و پێشڕەوی هاندەدا و لە دەوری بیلاجون و ئەلاستور و کرومیوس و هیمون و بیاسی فەرماندەی سوپا خڕی دەکردنەوە، سوارەکانی بەعەرەبانە و ئەسپەکانیانەوە، لە ڕیزی پێشەوە دانا، بەڵام هێزی پیادە و جەنگاوەرە ئازاکانی لەدوای دواوە دانا. ترسنۆکەکانی لە ناوەڕاستەوە دانا، بۆ ئەوەی ناچاری شەڕ بن، یەکەمجار فرمانی بۆ هێزی سوارە دەرکرد، ئەمری پێکردن کە ئەسپەکانیان کۆنترۆڵ بکەن، تا لەهەر شڵەژان و پەشۆکانێ بەدوور بن. گوتی: "ڕێگە مەدەن هیچ جەنگاوەرێك بەپشتیوانی هێزی خۆی یان عەرەبانچییەکەی بەتەنیا بچێتە شەڕی تەڕوادەییەکان، و ڕێگەشی مەدەن بگەڕێتە دواوە دەنا هێرشەکەتان سست دەکەن، هەر سوارەیەك

ڕووبەڕووی عەرەبانەی دژمن دەبێتەوە دەبێ لەناو عەرەبانەکەیەوە نێزەکەی بهاوێ، ئەمە زۆر باشترە، بەم شێوەیە پێشینان شار و قولله و قەڵاتیان دەگرت و بەم ئەقڵیەتەوە بیریان دەکردەوە."

(٣١٠) ئا بەو جۆرە ئەم پیاوە پیرە، ئەم قاڵبووەی بۆتەی شەڕان، و شارەزای هونەرەکانی شەڕ جەنگاوەرەکانی هاندەدا، کە ئاگامەمنون بینی دڵی خۆش بوو، و پێی گوت: "خۆزیا لاقەکانت وەکو بیرکردنەوەت گورج و چالاك بوایەن، هێز و شنگت وەکو ئەقڵت مسۆگەر بوایە، بەڵام تەمەن، دژمنە هاوبەشەکەی تیرەی بەشەران، چۆکی پێداداویت، خۆزگە لە جیاتی تۆ چۆکی بەکەسێکی تر دابدایە، و تۆی بەلاوی بۆ دەهێشتینەوە."

(٣١٧) نەستوری شۆڕەسواری جیرینی وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی ئوتریوس، منیش تەمەنام دەکرد پیاوەکەی ئەوسا بام کە ئیریوتالیونی مەزنم سەربڕی، بەڵام خواوەندان لە یەك کاتدا هەموو شتێکمان نادەنێ. ئەو ڕۆژگارە گەنج بووم و ئەمڕۆ من پیرم،

(٣٢٢) بەڵام ئێستاش لەگەڵ سوارەکانمدا دەڕۆم و بەتەگبیر و قسان هانیاندەدەم. ئەمە ئەرکی پیرانە، نێزە و ڕمان گەنجان هەڵیدەگرن، ئەوانەی شنگ و توانای زیاتریان هەیە."

(٣٢٦) ئاگامەمنون بەدڵی خۆشەوە کەوتەوە ڕێ، مینیستیوسی کوڕی بیتیوسی، بینی کە بە تەمەڵی لە شوێنی خۆی وەستاوە و ئەتینییەکان، سەروەرانی جاڕی شەڕ، لە دەوری خڕ بوونەتەوە. وئودیسیوس لە نزیکی ئەوەوە ولەناوسیفاڵییە ئازاکاندا تەمەڵ ودەسەوەستان وەستاوە، هێشتا جاڕی شەڕەکەیان نەبیستبوو، چونکە لەشکرانی تەروادەیی و ئاخییەکان لە ئان و ساتا بوو کە بجمێن، لەبەرئەوە لە شوێنی خۆ ڕەق ڕاوەستابوون و چاوەڕوانی لەشکرەکانی دیکەی ئاخییەکانیان دەکرد تا پەلاماری تەروادەییەکان بدات و دەست بەشەڕ بکەن. کە ئاگامەمنون ئەمەی بینی، سەرزەنشتی کردن و گوتی: "ئەی کوڕی بیتیوس، ئەدی تۆی دلێر و بەئاوەز، بۆچی وا دوورە پەرێز وەستاون و چاوەڕوانی ئەوانی دیکە دەکەن؟ دەبووایە ئێستا لەڕیزی پێشی پێشەوە لە جەرگەی ئەم شەڕە سەختەدا بووایەن، چونکە کە ئێمەی ڕاوێژکارانی ئاخییان وەختێ دەعوەتێك بەرپا دەکەین، ئێوە لە پێشی هەموو کەسێکەوە دەعوەت دەکرێن. هەنگێ بە ئارەزووی خۆتان گۆشت دەخۆن و بادە هەڵدەدەن و کەیف دەکەن، کەچی ئێستا بەبەرچاوی خۆتانەوە دەیان لەشکری ئاخییایی پەلاماری دژمن دەدەن و ئێوەش گوێتان لێ نییە".

(٣٤١) ئۆدیسیس مۆرەیەکی لێکرد و وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی ئۆتوریوس، ئەوە تۆ چ دەڵێی، باسی چ دەکەی؟ چۆن دەڵێی ئێمە کەمتەرخەمین؟ با ئاخییەکان بەتەواوەتی لەگەڵ تەروادەییەکاندا تێك بگیرێن، هەنگێ ئەگەر خۆت مەبەستت بێ، دەبینی بابی تلیماخۆس چۆن دەچێتە شەڕەوە و خۆی بەبەرایی تەروادەییەکاندا دەدات، قسەکانت لە قسەی کەسێك دەچن کە بیەوێ کات بەسەر بەرێ و ڕاوبوێرێ."

(٣٥٦) کە ئاگامەمنون ئۆدیسیوسی بەو تووڕەییە بینی، بزەیەکی بەڕوویدا داو، لە قسەکەی خۆی ژێوان بووەوە و گوتی: "ئۆدیسیوس، ئەی کوڕە خانەدانەکەی لایرتیس، ئەی پیاوی تەگبیر و ڕاوێژان، من فەرمانت پێنادەم، چونکە من ڕاستگۆیی دڵت دەناسم، تۆ و من خودانی یەك ئەقڵیەتی پایەدارین، لە قسەکەم ببورە، ئەگەر ئێستا قسەیەکی خراپم بەزاردا هات،لە خواوەندانم داوایە کە بەسوعبەتێکی ئاسایی و بێ غەرەزی حەساو بکەن."

(٣٦٤) ئەوانی بەجێهێشت و ڕۆیی. سەیری کرد کوڕەکەی تیدویوس، دیومیدسی خانەدان بەدیار عەرەبانە و ئەسپەکانییەوە وەستاوە، و ستینیلوسی کوڕی کابانیوس-شی بەلاوە وەستاوە. کەوتە سەرزەنشتی و گوتی: "ئەی تیدیوس زادە، بۆچی بەم ترسنۆکییە لە دووری شەڕەکە وەستاوی؟ تیدیوس، ئاوا خۆی دوور نەگرتووە، بەڵکو پێشەنگی جەنگاوەرەکانی بووە لە شەڕدا —ئەمە قسەی ئەوانەیە کە لە شەڕدا دیتویانە، چونکە من قەت نەمبینیوە. دەڵێن لەنێو پیاواندا بێ وێنە و هاوتا بووە. جارێك وەك میوان نەك دژمن بۆ مسینا هات، لەگەڵ بولینیسکس دا دێ تا هێزەکانی خڕ بکاتەوە، چونکە خۆیان بۆ شەڕی دژ بەشاری تیبەی بەهێز ئامادە دەکرد، هانایان بۆ گەلی ئێمە هێنا تا کۆمەکیان بکەن و هەندێ جەنگاوەریان بەگەڵ بخەن، پیاوانی میسینا ویستیان هەندێ جەنگاوەریان بدەنێ، بەڵام زیوس ژێوانی کردنەوە و هەندێ ئاکامی نەحس و شومی پیشاندان. بۆیە تیدیوس و بولینیکس بەدەستی بەتاڵ زڤرینەوە. کاتێ دوورکەوتنەوە و گەیشتنە ڕوبار و بێشەکانی ئیسیبوس، ئاخییەکان تیدیوس-یان وەکو وەفد بەدوایاندا نارد، سەیری کرد کوڕانی کادیموس لەماڵی ئیتیوکلیس دا سەرگەرمی دەعوەت و ئاهەنگن. هەرچەندە غەریب بوو، بەڵام کە خۆی لەنێو تەحەدای ئەم هەموو خەڵکەدا بینییەوە، نەترسا، بەڵکو تەحەدای یەکە بەیەکەیانی کرد و چووە مەیدانی هەر یەکێکیان و هەموویانی بەزاند، ئەتینا لەمەدا پشتیوانی بوو. کادیمۆسەکان لەبەر سەرکەوتنەکانی ڕێزیان گرت،

پەنجا گەنجیان لەگەڵ هەردوو فەرماندە-مایونی کوڕی هایمون، قارەمانی خوا ئاسا، وبولیفونتیس ی کوڕی ئۆلوفوسدا نارد تا لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بیخەنە بۆسەوە، لێ تیدیوس هەر پەنجایانی سەربڕی بێجگە لە مایۆن، کە دوای ئەوەی هەندێ نیشانانی ئاسمانی بینی بەسەلامەتی بەرەڵێی کرد. ئەمەکاری ئەو پیدیوسە بوو کە لە ئیتولیاوە هاتبوو. بەڵام کوڕەکەی لە شەڕ و جەنگدا ناگا بەتۆزی پێی بابیدا."

(٤٠١) دیومیدس، وەڵامی نەدایەوە، چونکە شەرمی لە سەرزەنشتەکانی ئاگامەمنون کرد، بەڵام کوڕەکەی کابانیوس وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس درۆیان مەگێڕەوە، مادامێکی دەتوانی ڕاست بڕۆیت، ئەگەر حەز بکەی.

(٤٠٤) ئێمە بەخۆمان دەفشین و بگرە لە بابمان باشترین، ئێمە شاری تیبەی حەوت دەرگامان گرت، هەرچەند شورە و قەڵای دژمن قایمتر و ژمارەی لەشکرمان کەمتر بوو،.. ئەمە لەبەرئەوە بوو کە باوەڕمان بە نوقێنەی خواوەندان و کۆمەکی زیوس هەبوو. بەڵام باوانمان بەهۆی گەوجێتی خۆیانەوە مردن، لەبەرئەوە باوانمان بەئێمە مەشوبهێنە و لەیەك ئاستا دامان مەنێ."

(٤١١) دیومیدس مۆڕەیەکی لێکرد و گوتی: "ئەی دۆست زمانی خۆت بگرە و ئەمری من جێبەجێ بکە. ئاگامەمنون هەقی خۆیەتی ئاخییان بۆ پێشرەوی هانبدات، ئەگەر شارەکە بگرین شانازییە بۆ ئەو، خۆ ئەگەر بکوژرێین خەم و خەمینی بۆ ئەوە. لەبەرئەوە ئێمە، تۆ و من دەبێ بیرمان تەنیا لای شەڕ بێ."

(٤١٩) ئەوەی گوت و خۆی لە عەرەبانەکەی هەڵدایە خوارێ، و قەڵغان و تاقمەکەی کەوتە تەق و هوڕێکی وەها پیاوی ئازا گوێی لێبوایە هەترەشی دەچوو.

(٤٢٢) وەکو چۆن شەپۆلێکی گەورەو تورەی دەریا پەیتا پەیتا بەدەم ڕەشەباوە سەری خۆی بەکەنارا دەکێشێت- لە پێشا بۆ دواوە دەگەڕێتەوە و ئەوجا بەرز دەبێتەوە و خۆی بەتاوێرێکی بەرزا دەدات و ئەوجا لەسەر کەنارەکەدا پەرت دەبێ و کەف و خوێاو بەهەموو لایەکدا دەنێرێ —بەو ئاوایە لەشکرانی دانایی ڕیز لەدوای ڕیز، دلێر و ئازا بەرە و جەنگ دەجمان.فەرماندەکان هەریەکە و فرمانی بۆ جەنگاوەرانی خۆی دەرکرد، بێ ئەوەی جەنگاوەرکان ورتەیەکیان لێوەبێت، خامۆش و گوێڕایەڵ لە تۆ وایە لاڵ و بێ زمانن، بەدەم ڕێکردنەوە چەك و تاقمەکانی قەدیان لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەبریسکایەوە. بەڵام تەروادەییەکان، دەتگوت هەزاران سەر پەزن و چاوەڕوانی ئەوەن لە حەوشەی

یەردارێکی دەوڵەمەندا بێنە دۆشین، و هەر کە گوێیان لە بارەی بەرخەکانیان دەبوو، یەکسەر وەڵامیان دەدایەوە، چونکە نوتق و زمانیان نەبوو. زمانی تەروادەییەکان جیاواز بوو، چونکە لە دەڤەرانی جیاوازەوە هاتبوون. ئەریسی خواوەندی جەنگ ئیلهامبەخشی تەروادەییەکان بوو، بەڵام ئاخییەکان ئیلهامیان لە ئەتیناوە وەردەگرت—و لەگەڵ ئەو جووتەدا ترس و ئاژاوە و ئێریس ،خوای دووبەرەکی هاتن، ئەو خوایەی کە شەڕ هەڵدەگیرسێنێ و کۆتایی پێ نایەنێ، ئەمە خوشکی خواوەندی جەنگی قرکەر ئەریسە، ئەم یەزادنخانمە لە سەرەتادا کورتە باڵا بوو، کەوتە نەشونما و گەورە بوو گەورە بوو تاسەری گەییە ئاسمان، دووبەرەکی خستە ناو خواوەندەکانەوە، بەڵام لاقەکانی هێشتا لەسەر عاردین. ئەو گەڕا وسوڕایەوە و دووبەرەکی لە بەینی ئاخییان و تەروادەییاندا نایەوە، دەیەوێ لەو دەمەیدا کە لە جەنگا دەکوژرێن گوێی لە ناڵە و هاواریان بێ.

(٤٤٦) کە هەردوو سوپا گەییشتنە یەك، هەر قەڵغان و نێزان بوون لە گەرمەی شەڕدا بەریەکدی دەکەوتن. ئیدی هەراو زەنایەك بوو مەپرسە، ناڵەی مەرگ و هاواری سەرکەوتنی بکوژ و کوژرا و تێکەڵ بوو، لافاوی خوێن زەوی گرت، وەکو چۆن سێیۆی زستان لە چیاکانەوە، لەسەرچاوە گەورەکانەوە دێتە خوارێ تا لە خاڵی یەکانگیری دوو دۆڵدا کۆببێتەوە و ئەوجا گوڕ ببەستێتەوە تا بڕژێتە دۆڵێکی قوڵەوە و، شوان لەسەر چیایانەوە و لە دوورەوە گوێی لە هارە و هاژەی ببێ، هەرا و زەنا و هاوار و هارەی هەردوو سوپاکە کە دایان بەیەکدا بەو شێوەیە بوو،

(٤٥٧) هەر لە سەرەتاوە ئەنتیوکوس، جەنگاوەرێکی چەکداری لە تەروادەییەکان کە ئەخیولوسی کوڕی تالیسیوس بوو، کوشت. ئەم جەنگاوەرە لە ڕیزەکانی پێشەوە دەجەنگی. نێزەیەکی لە کێوخودەکەی دا و نێزەکە چوو بەنێوچەوانیا، سەرە تیژەکەی نێزەکە ئێسکەکەی بڕی، چاوانی تاریك بوون، وەکو قەڵایەك لە جەرگەی شەڕەکەدا هەرەسی هێنا و کەوتە سەر زەوی، هەنگێ ئیلفینوری کوڕی خالکودون و سەرداری ئوبانتیە دلێرەکان ڕایکێشا و لە مەودای ئەو تیر و نێزانەی لە دەوروبەری دەکەوتنەوە دووری خستەوە و دەیویست بەزووترین کات قەڵغان و تاقمەکەی لێ داماڵێ. بەڵام ئەم هەوڵەی زۆری نەبرد، ئەجینور بینی کە جەنازەکە دوور دەخاتەوە، و بەدەم دانەوینەوە قەبرغەی لەژێر قەڵغانەکەوە دەردەکەوێ، بەنووکی نێزە برونزییەکەی قەبرغەی پێکا و کوشتی. ئیدی شەڕی نێوان تەروادەیی و ئاخییەکان لەسەر جەنازەکەی گەرم بوو، وەکو

دورت پەلاماری یەکیان دەدا، یەکتریان دەکوشت و بەسەر یەکدا دەکەوتن.

(٤٧٣) ئیدی ئەجاکس، کوڕە جوان و قۆزەکەی تیلامون، سیمویسیوسی کوڕی ئەنتیمونی کوشت، سیمویسیوس، کاتێ دایکی لە چیای ئیداوە، کە لەگەڵ داك و باییدا پەزی دەلەوەڕاند، داگەڕا ئەوی لە کەناری سیمیوس بوو بوو. لەبەرئەوە ناونرا بوو سیمویسیوس، بەڵام ئەم کوڕە نەژیا تا جێگەی داك و بابی بگرێتەوە، چونکە بەنێزەی ئەجاکسی پاڵەوان کوژرا. کاتێ پێشڕەوی دەرکرد و دەهاتە ڕیزی پێشەوە، نێزەیەکی خێواندە سینگی و نزیکی مەمکی ڕاستی پێکا.

(٤٨١) نێزەکە لە شانییەوە دەرچوو، وەکو سپیدارێکی درێژی ڕاستی سەر بەچڕە لق و پۆپانی ناو مێرگێکی نزیکی دەریاچەیەك بێ، و ئەوجا عەرەبانە سازێك بێ و بەتەوران بەر بێتە ڕەگو ڕیشەی بەو تەمایەی عەرەبانەیەکی جوانی لێدروست بکات، بکەوێتە خوارێ و لە کەناری ئاوەکەدا تەخت بێ، بەو ئاوایە ئەجاکس، سیمویسیوسی کوڕی ئەنتیمونی تەختی عاردەکە کرد.

دوای ئەوە و لە گەرمەی شەڕدا ئەنتیفۆسی درەخشان زرێ، کوڕی بریام، نێزەکەی خێواندە ئەجاکس کە لە ناوەندی ئاپوراکەدا بوو، نێزەکە سەری کرد و بەرلیوکس، هاوڕێ ئازاکەی ئودیسیوس کەوت، بەدەم ڕاکێشانی جەنازەکەی (سیمویسیوس) ەوە بەرەو ئەوبەر، هاواری لێ هەستاو زیراندی، بەو جۆرە جەنازەکەی کەوت بەسەر جەنازەکەدا. ئودیسیوس کە بینی لیوکوس کوژرا، زۆر تورە بوو، بەتەواوی چەك و تاقمەکەیەوە، بەناو ڕیزەکانی پێشەوەدا تێپەڕی تا تەواو نزیك بووەوە، ئەوجا هەڵیڕوانییە دەوروبەری خۆی تا هەدەفەکەی خۆی بینی، کە تەروادەییەکان ئەمەیان لێ بینی پاشەکشەیان کرد. ئەمجارەیان نێزەکەی سەری نەکرد، بەڵکو دیموکون، کوڕە حەرامزادەکەی بریامی پێکا کە لە ئەبیدوسەوە هاتبوو، لەو شوێنەوە کە ماینانی خۆشبەزی تیا بەخێو دەکرد.

ئودیسیوس لە داخی هاوڕێکەی نێزەیەکی بەلاجانگیا کرد، و سەری دیواودەرکرد. چاوەکانی تاریك بوون، زرێکەی وەکو ئەوەی لە بەرزییەوە بکەوێتە سەر زەوی بە تەق و هوڕ غل بووەوە. بەدیتنی ئەم ڕووداوە ئەو جەنگاوەرانەی هاتبوونە پێشەوە لەگەڵ هکتۆردا پاشەکشەیان کرد. ئارگۆسییەکان بەدەم هاوار و بانگی بەرزەوە لاشەی مردووەکانیان ڕاکێشایە لاوە و لە جاران پتر بەرەو تەروادەییەکان هروژمیان هێنا. بەڵام ئەپولۆ کە لە شاری برگاموسەوە دەیڕوانێ، پەست بوو و هاواری لە تەروادەییەکان کرد،

و دوویی: "ئەی تەروادەییان پەلاماری دژمنەکەتان بدەن لەبەر ئەرگوسییان نەرەڤن. خۆ گۆشتی وان لە بەرد و ئاسن نییە کە بەرگەی نێزان بگرێ.. با ئەوەشتان پێ بڵێم کە ئەخیلی قۆز، کوڕەکەی تیتس لەم شەڕەدا بەشدار نییە، بەڵکو لەلای کەشتییەکانە و بەدەم توڕەیی خۆیەوە دەسوتێ."

(٥١٤) ئا بەو جۆرە خواوەندی توانا لە شارەوە تێی خوڕین و هاواری لێکردن لەولاشەوە ئەتینای سامناك، کیژەکەی زیوس، بەسەر سوپای ئاخییەکاندا دەگەڕاو، هەر کە دیبای ڕەخاوەتی دەکەن، هانیدەدان کە هەرنەپێشێ و پەلامار بدەن.

(٥١٧) لەم کەین و بەینەدا (چارەنووس) دیوریسی کوڕی ئەمارینکیوسی خستە داوەوە، چونکە بەردێکی تیژ و زبر بەر پاژنەی پێی ڕاستی کەوت. بیروسی کوڕی ئیمبراسوس، فەرماندەی تەراقییەکان کە لە (ئینوس)ەوە هاتبوو بەردەکەی تێ سرەواند بوو، ئەم بەردە دوابڕاوە گۆشت و ئێسقانی بەسەریەکدا جنی. بەپشتا کەوتە سەر زەوی، لەتاو ئازاری مەرگ هەردوو دەستی بۆ هاورێکانی درێژ کرد. بەڵام بیروس کە زاماری کردبوو پەلاماریداو ڕمەکەی کرد بەسکیا، ورگ و ڕیخۆڵەی ڕژایە سەر ئەرزەکە، و چاوانی تاریك بوون. وەختێ لەسەر جەنازەکە هەستایەوە، تاوسی ئیتولی پڕی دایێ و خێرا نێزەیەکی لە ئاستی مەمکیا کرد بە سینگیدا، نووکی نێزەکە لە سییەکانی چەقی. تاوس لێی چووە بەرەوە، ڕمەکەی لە سینگی دەرهێنا، ئەوجا شمشێرەکەی هەڵکێشا و کردی بەسکیا تا زوو بمرێ، بەڵام زرێکەی لێ نەکردەوە، چونکە هاورێ تراقیەکانی، ئەوانەی قژە درێژەکانیان لەسەر تەپڵی سەریان دەبەست، دەست بەڕم و نێزە دەوریاندا، وێرای زەبلاحی و بەهێزی، بۆ دواوە دەڵەکیان داو لە خۆیان دووریان خستەوە، بەلایا هات و کەوت. ئا بەو جۆرە هەردوکیان بە پاڵ یەکەوە لە خاك و خوێن گەوزان، یەکێکیان فەرماندەی تراقیەکان بوو و ئەوی تر فەرماندەی ئیبییەکان، و زۆر کوژراوی دیکەش بەدەوریاندا کەوتبوو.

(٥٣٩) دوای ئەوە هیچ جەنگاوەرێکی تر نەیتوانی بچێتە شەڕەوە و گاڵتەی بەشەڕ بێت، هەر کەسێك کە بەتیر بریندار نەبوو بوو، و بەر سەرە نێزان نەکەوتبوو، بەرەو ناوەڕاست دەگەڕایەوە و (ئەتینا)ی یەزدانخانم دەستی دەگرت و لە تیرانی دەپاراست. بەو جۆرە ئەو ڕۆژە گەلێك لە تەروادەیی و ئاخییەکان بەتەنیشت یەکەوە کەوتن و سەروچاویان لە خاك و گڵ چەقی.

# سروودی پێنجەم

## دیومیدس، شەڕی خواوەندان دەکات

**حیکایەتەکە:**

**ئەتینای لایەنگری ئاخییەکان دەتوانێ ئەریسی خواوەندی جەنگ لە مەیدانی کوشتار بەرێتە دەرێ، ئیدی دیومیدس بەئارەزوی خۆی هێرش دەکات، دێ و دەچێ، دەکوژێ و دەبڕێ و ئەتیناش زۆری کەیف بەو کارانەی دێ، کە ئینیاسی قارەمانی ناودار دەبینێ زامداری دەکات. هاوارێکی قایم دەکات و دایکی، ئەفرۆدێتی قوبرسی، یەزدانخانمی جوانی و ڤیان گوێی لێدەبێت، خێرا خۆیی دەگەیەنێتێ و هەڵیدەگرێت و لە هەمێزی دەگرێت تا تیمار و چاکی بکاتەوە، کە دیومیدس (ئەتینا بەهرەی جیاکردنەوەی خواوەندان و بەشەرانی دابوویێ) ئەفرۆدێتی بینی ناسییەوە و تیرێکی هاویشتێ و پێکای، خواوەند خانم کەوتە زیقەزیق و هاوار، دەستی لە ئاستی مەچەکیا بریندار بوو، ئیدی ئینیاسی کوڕی کە لە ئەنخیس بووبووی بەجێدێڵا و دەکەوێ و بەلەز بۆ ئاسمان هەڵدەکشێ تا زامەکەی خۆی تیمار بکات. ئیدی ئەپولۆ فریای ئینیاس دەکەوێ و لە پەڵە هەورێکی ڕەشی دەگرێ و لە چاوان ونی دەکات. ئاخییەکان پێشڕەوی دەکەن و دیومیدس گەلێك لە تەروادەییەکان دەکوژێت، بەڵام بە تیرێکی کوڕی لیکاون بریندار دەبێت، داوا لە کوڕی کابانیوس دەکات تیماری بکات و تیرەکە لە شانی دەربێنێ. ئەتینا دەتوانێ دیومیدس تیمار بکات و هانی بدات، ئەویش چاك دەبێتەوە و گەلێك لە تەروادەیی و هاوپەیمانەکانیان دەکوژێت. لەم کاتەدا هیکتۆر دەردەکەوێ و پەلاماری جەنگاوەرێکی ڕیزەکانی پێشەوە دەدات، دوای ئەوەی هەندێ لە براکانی لە شەڕدا کوژرا بوون. عەرەبانە جەنگی و ئەسپەکان بەردەوام لە شەڕ و پێکدادانابوون. ئەوجا ئەریسی خواوەندی جەنگ، دوای ئەوەی ئەتینا خەڵەتاندبووی و لە مەیدانی شەڕ دووری خستبووەوە، گەڕایەوە مەیدان. ئالێرەدا ئاگری شەڕ هەڵایسا و هەردوو لەشکرەکە**

کەوتنە شەڕێکی سامناکەوە و کوشتار و برینداریێکی فرەی لێکەوتەوە، دیومیدس داوا لە هاوڕێکانی دەکات پاشەکشێ بکەن، بەڵام چاویان لە دژمن بێ دوای ئەوەی دڵنیا دەبێ کە ئەریس کەوتوەتە سەروکاری شەڕەکە. لە ئاسماندا هیرای ژنی زیوس لەگەڵ ئەتینای کچیا قسان دەکەن، ئەوجا باسی ئەو کارە دزێوانە بۆ زیوس دەکەن کە ئەریسی خواوەندی شەڕ دەیانکات، و ئیزنی لێدەخوازن کە بچن بۆ ئەرز و ئەم کارە دزێوانەی ئەریس ڕاگرن، پێدەکەنێ و ڕێگەیان دەدات، عەرەبانە جەنگییە ئاسمانیەکە ئامادە دەکەن و بۆ سەر زەوی دادەبەزن و دیومیدس کە لە ئەریس دەترسا، دنە دەدەن. دوای ئەم دنەدانە هەڵدەکوتێتە سەر ئەریس و نێزەیەك لە حانای ناوکییەوە دەکا بەسکیا، خواوەند هاوارێکی وەها دەکات لە تۆ وایە هەزاران جەنگاوەر تیری دەهاوەنێ، بەگلەییەوە بەرە و ئاسمان هەڵدەگەڕێ، بابی گازەندەی لێدەکات و بەوە سەرزەنشتی دەکات کە ئەم تەبیعەتە شەڕانیەی لە هیرای دایکییەوە وەرگرتووە، ئەگەر کوڕی خواوەندێکی دیکە بووایە ئێستالەگەڵ تیتانە زەبەلاحەکاندا لە زیندانا دەبوو. وێڕای ئەوەش پێی دەڵا هیچ چاری نییە ئەوە نەبێ کە شەفای بدات چونکە کوڕیەتی، دەنێرێ بەشوێنی بایوندا و زامەکەی تیمار دەکات، و بەلای بابیەوە ڕۆدەنیشێت. دوای ئەوەی هەردووك یەزدانخانم هیرا و ئەتینا ئەریسی خواوەندی جەنگیان لە مەیدانی شەڕەکە وەدەرنا، بە عەرەبانەکەیان بۆ ئۆڵەمپی بەرگوشاد گەڕانەوە.

زەمەن:

ڕووداوەکانی ئەم شەڕانە لە بەشێکی ڕۆژی بێست و سێیەمدا ڕوودەدەن، ئەمە تەواوکەری سروودی پێشووە.

شوێن:

شوێن هەمان شوێنی سرودی پێشووە، مەیدانی شەڕەکانی ئەم سرووده مەودای نێوان کەنار و تەروادەییەکانە. هەڵبەتە ئۆڵەمپیشی دێتە سەر، ئۆڵەمپی بارەگای خواوەند و شوێنی کۆبوونەوە و ڕاوێژ و پلان و خواردنەوە و بەزم و سەرگەرمیان.

(١) ئەوسا ئەتینا بالآس، زات و جورئەتێکی وەهای خستە دڵی دیومیدسی کوڕی تیدیوسەوە، کە بتوانێ لە هەموو ئارگوسییەکانی دیکە پتر دەربکەوێ و ناوبانگ دەربکات. زرێ و کڵو خودەکەی بەتیشك و گڕێکی هەمیشەیی ئەوتۆ درەخشانەوە لەتۆ وایە ئەستێرەیەکی پرشنگدارە و لە هاویندا، لە ئاوی ئۆقیانوسدا دەدرەوشێتەوە —بەڵکو ئەو تیشك و گڕەی لەسەر و هەردوو شانی هەڵایساند و ئەوجا بۆ ناوەندی ئاپورای جەنگاوەرەکانی مەیدانی شەڕ ناردی.

(٩) داریس ناوێك لەنێو تەروادەییەکاندا هەبوو، ئەمە دەوڵەمەندێکی بەڕێز بوو، کاری فاڵبینی بۆ هیفایستوسی خواوەندی ئاسنگەر دەکرد. دوو کوڕی هەبوو بەناوی: فیجیوس و ئیدایوس، هەردووکیان لە هەموو هونەر و سنعەتێکی جەنگدا مەعلان بوون. ئەم جووتە لاوە لە قۆشەنی سەرەکی تەروادەییەکان نزیك بوونەوە و هێرشیان بۆ دیومیدس کرد، دیومیدس بەپای پیادە دەجەنگی، بەڵام ئەوان لە عەرەبانەکانیانەوە دەجەنگین. کاتێ لێی نزیك بوونەوە، فیجوس دەست پێشکەری کرد و نێزەیەکی تێ سرەواند، بەڵام نێزەکە بەسەر شانی چەپی دیومیدس دا تێپەڕی و نەیپێکا. هەنگێ دیومیدس نێزەی خۆی هاویشت، ڕێك بەر سنگی فیجیوس، لە بەینی هەردوو مەکیدا، کەوت، لە عەرەبانەکەی کەوتە خوارەوە. ئیدایوس نەیوێرا بەسەر لاشەی براکەیدا بڕوات، لە عەرەبانەکەوە بازیدایە خوارێ، هەڵیگرت تا لەگەڵ خۆیدا بیفڕێنێ، خۆ لە مردنیش ڕزگار نەدەبوو

(٢٣) ئەگەر لەو دەمەدا هیفیاستوس فریای نەکەوتبا و لە پەڵە هەورێکی تاریکییەوە نەیپێچایە، چونکە نەیدەویست بابە داماوەکەی بەخەمی کوڕەکەیەوە سەر بناتەوە. بەڵام کوڕەکەی تیدیوس ئەسپەکانی کردەوە و فەرمانی بەهاوڕێکانی دا کە بیانبەن بۆ کەشتییەکی بەتاڵ. تەروادەییەکان کە دیتیان جووتە کوڕەکەی داریس یەکێکیان لە ترسانا شڵەژاوە و ئەویتریان لە عەرەبانەکەدا مردووە ترسیان لێ نیشت. لەدوای ئەوە ئەتینا دەستی خواوەندی جەنگ (ئەریس)ی گرت و گوتی: "ئەریس، ئەریس، ئەی مایەی کڵۆڵی بەشەران، ئەی وێرانکەری شار و قەڵاتان، کاتی ئەوە نەهاتووە واز لە تەروادەیی و ئاخییەکان بێنین، شەڕی خۆیان بکەن، و چاوەڕوان بین تا بابە زیوس لایەکیان سەر دەخات؟ دەی با لاکەوین و خۆ لە غەزەبی زیوس دوور بگرین."

(٣٥) بەوقسانە (ئەریس)ی لە مەیدانی شەڕەکە دوورخستەوە، ولەسەرکەنارە هەڵدێرەکەی (سکاماندروس)دا دایینیشاند. ئەوسا داناییەکان پاشەکشەیان بەتەروادەییەکان کرد، هەر

فەرماندەیەك هاوتایەكی خۆی لە دژمن كوشت. هەوەڵجار ئاگامەمنون هەڵیكوتایە سەر (ئۆدیوس)ی بەهێز، فەرماندەی (هالیزونیس)ەكان، لە عەرەبانەكەی خستییە خوارەوە، ڕێك لەو كاتەدا كە دەیویست هەڵا نێزەكەی ئاگامەمنون تەختی پشتی، لە بەینی هەردوو شانیەوە پێكاو لە سنگییەوە دەرچوو، بەتەقوهوڕی جەنگەوزارەكانییەوە كەوتە خوارەوە.

(٤٣) ئەوجا ئایدومینیوس (فایسوس)ی كوڕی بوروسی میونونی كوشت كە لە دەڤەری (فارنی)یەوە هاتبوو. وەختێ كە سواری عەرەبانەكەی دەبوو. ئایدومینیوس ڕمێكی لە شانی ڕاستی دا، تاریكی مەرگ پێچایەوە و تەپ لەسەر عەرەبانەكەیەوە كەوتە خوارێ.

(٤٨) ئەوجا پیاوانی ئایدومینیوس بەپەلە كەوتنە داماڵینی چەك و تەدارەكەكەی، (مینیلاوس)ی كوڕی (ئوتریوس)ش سكاماندیوس)ی كوڕی (سترونیوس)ی، ڕاوچی كارامە و شەیدای ڕاوی كوشت. (ئەرتیمس)ی خواوەندی لێڕ و جەنگەڵان بەخۆی فێری كردبوو كە چۆن هەر جۆرە نێچیرێكی كێوی ناو جەنگەڵ و بێشە چیاییەكان چ لە دوورەوە و چ لە نزیكەوە وەكو ڕاوچییەكی كارامە ڕاو دەكات. بەڵام بۆ ئێستا نەخواوەند و نە تیر ئەندازییە بێ هاوتاكەی فریای نەكەوتن، چونكە لەو دەمەدا كە ڕایدەكرد، نێزەكەی مینیلاوس لە پشتەوە و لە بەینی هەردوو شانییەوە پێكای و لە سینگییەوە دەرچوو، بەدەما ڕما و تەدارەكەكەی بەتەق و هوڕ بەسەریا غل بووەوە.

(٥٩) ئەوجا (میریونیس)، فیریكلوسی كوڕی تیكتونی كوڕی هارمونی كوشت. فیریكلوس كابرایەكی مەعلان و شارەزای هەموو جۆرە شێوازێكی كەشتی سازی بوو، گشت جۆرە كەشتییەك، چونكە ئەتینا بالاس زۆری خۆش گەرەك بوو، و بەخۆی ئەم پیشەیەی فێركردبوو. هەر ئەو كەشتی بۆ ئەلكساندەر دروستكرد، ئەو كەشتییەی بووە سەرەتا و سەرچاوەی هەموو ئەوبەدبەختی و نەگبەتی و ئازار و ماڵوێرانیەی بەسەر تەروادەییەكان و بەسەر ئەلكساندەر و خودی خۆیدا هاتن، چونكە گوێی بەیاسا ئاسمانیەكان نەدا. میریونیس، دوای دەكەوێ و نێزەیەكی تێدەسرەوێنێ، بەر سمتی دەكەوێ و ئێسكەكەی دەبڕێ و دەگاتە میزڵدانی، ئەجەل دەگاتە سەری، بەدەم هاوارێكی بەرزەوە بەچوكا دێت.

(٦٩) هەروەها میجسی كوڕی فیلیوس (بیدایوسی كوڕی ئەنتینور)ی كوشت، هەرچەندە بیدایوس كوڕێكی بیژ بوو، بەڵام ئیزەد خانم تیانو لەبەر خۆشەویستی مێردەكەی وەكو

دوریڤی حەڵاڵزادەی خۆی پەروەردەی کردبوو. کوڕی فیلیوس لێی نزیك بووەوە، نێزەیەکی بەپشتی ملیا کرد؛ لە بنی زمانییەوە و لە بەینی هەردوو کاژێرەیەوە دەرهات، بەمردویەتی کەوتە سەر عاردی، و ددانەکانی لە برونزە ساردەکە گیر کردبوو.

(٧٦) هەروەها یوریبیلوسی کوڕی ئیویمون، (هیبسینور)ی کوڕی دولوبیونی خانەدان و بەجەرگی کوشت، ئەو پیاوەی کە وەکو کاهین و پێشگۆی ڕوباری سکاماندروس دانراو، خەڵکەکە وەکو خوایەك ڕێزیان دەگرت. کاتێ بە بەردەم یوریبیلوس دا هەڵات، دوای کەوت. شیرێکی لە باسکی دا، باسکە بەهێزەکەی شۆڕبووەوە، بەخوێن وخورەوە کەوتە سەر عاردی، سێبەری مەرگ و ئەجەلی نەگۆڕ نیشتە سەرچاوەکانی،(٨٥) ئا بەو جۆرە شەڕێکی ترسناك لەنێوان هەردوولادا گەرم بوو. بەڵام سەبارەت بەکوڕەکەی تیدیوس، نەتدەتوانی بڵێی کە ئاخۆ پتر لەنێو ئاخییەکاندا سوڕایەوە یان لە نێو تەروادەییەکان، سەر بەئوردوی ئاخییەکانە یان ئوردوی تەروادەیەکان. بەمەیدانی شەڕەکەدا وەکو لافاوی زستان ملی نا، لافاوێکی بەهێز کە نە بەربەستان بەرگەی دەگرن و نە شوورە و پەرژینی ڕەزانی شکۆفە کردووە، دەتوانێ ڕێگە لە هاتنی بگرێ ،کاتێ بەبارانی ئاسمان تەژی و ئاوس دەبێ، لەچاو تروکانێکا دێ و هەموو شتێك لەبەردەم خۆیدا ڕادەماڵێ، و گەلێك لە کێڵگە و مەزاریان وێران دەکات و بەژمارەیەکی زۆری خەڵك نەبێ چاك ناکرێتەوە، ئا بەو جۆرە هێزی زۆر و زەبەندی تەروادەییان بەشڵەژاوی و پەرێشانی لەبەر پەلاماری کوڕەکەی (ئیدیوس)دا هەڵات، و هەرچەندە ژمارەیان زۆر بوو، خۆیان لەبەری نەگرت.

(٩٥) بەڵام کە لیکاون بینی دەشتەکە دەبڕێ و تەروادەییەکانی تەرتەو وەرتە کردووە و ڕاویان دەنێ، تیرێکی خێواندێ و بەر ڕووی پێشەوەی زرێکەی سەر کەمەری لە نزیکی شانییەوە کەوت: تیرەکە زرێکەی سمی و لە گۆشتی لەشی چەقی، و تەنانەت زرێکەی لە خوێنا سور بوو. ئەوجا کوڕەکەی لیکاون بەدەنگێکی دلێرهاواری کرد: "ئەی جەنگاوەرانی تەروادە، هەڕنە پێش، دلاوەرترین ئاخیایی زامدار بووە، و پێم وایە ماوەیەکی زۆر بەم زامەوە ناژی، مەگەر ئەپولۆ، لە لیساوە بۆ ئێرەی نەهێنابم."

(١٠٦) بەو شێوەیە کەوتە خۆهەڵنان، لێ دیومیدس بەتیرەکەی ئەو نەهاتە کوشتن، عەرەبانە و ئەسپەکانی ڕاگرت و بەستینیلوسی کوڕی کابانیوسی گوت: برادەری ئازیز، کوڕی کابانیوس، لە عەرەبانەکەت وەرە خوارێ و ئەو تیرە لە شانم دەربێنە."

(١١١) ستینیلوس خۆی لە عارەبانەکەیەوە هەڵدایە خوارێ، و تیرەکەی لە زامەکە

دەرهێنا. خوێن لەو شەبەقەوە کە کەوتبووە زرێکەی فیچقەی کرد. ئەوجا دیومیدس کەوتە نزا و پاڕانەوە: "گوێم لێبگرە ئەی ئەتینای کیژی زیوس، ئەی هەمیشە بێدار، ئەگەر بابت خۆش ویستووم و لە گەرمەی شەڕدا کۆمەکت کردووە، ئێستاش ئەوە لەگەڵ مندا بکا، کارێکی وەها بکە ئەو پیاوە بێتە بەر تیررەسی من و بیکوژم، ئەو پیاوەی فرسەتی لێهێنام و زاماری کردم، و ئەوەتا خۆی هەڵدەنێ و لافی ئەوەم بەسەرا لێدەدا کە جارێکی دیکە هەرگیز تیشکی هەتاو نابینم."

(١٢١) بەو تەرحە پاڕایەوە و لالایەوە و ئەتینا بالاس گوێی لێ بوو، لاقەکانی ڕاستکردنەوە، هێز و شنگی وەبەر دەست و لاقانی خست. ئەوجا لێی هاتە بەرەوە و گوتی: "ئەی دیومیدس، لە ئێستا بەدواوە ترست نەبێ و شەڕی تەروادەییان بکە، چونکە من هەمان هێزی بابتم وە بەراکردویت، ئەو هێزەی کە لە شکان نایەت. هەروەها تەمەکەی سەرچاوم ڕەواندویتەوە، تا خواوەندان و بەشەران لێکدی جودابکەیەوە. جا هەر خواوەندێك هاتە مەیدان و ویستی تاقیت بکاتەوە، ئامان شەڕی ئەو خواوەندە نەکەی، بەڵکو هاوار بکە ئەی ئەفرۆدیت، ئەی کیژی زیوس وەرە، هەر کە دەرکەوت بەنێزە تیژەکەت زامداری بکە."

(١٣٣) ئەتینا ئەو قسەیەی کرد و ڕۆیی، کوڕی ئیدیوس دووبارە لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکاندا شوێنی خۆی گرت، هەستی کرد سێ هێندەی جاران بەهێزە، دەتگوت شێرێکە و بەدەم پەلاماری پەزانەوە، شوانێکی چیایی زامداری کردووە، بەلام نەیکوشتووە.

(١٣٩) کابرای شوان تەنیا شێرەکەی وروژاند، بەلام نەیتوانی بەرگری لە پەزەکەی بکات، خۆی لە ئاغەڵەکەدا دایە پەناو، بەلام مەڕە ترساوەکان، بەبێ خاوەن، بڕ بڕ سەریان دەکرد بەیەکاو، شێری تورەش خۆی هەڵدەدایە سەر دیوار و پەڕژینی ئاغەڵەکە. دیومیدسی تورە و هاروژاو بەو ئاوایە خۆیدا بەتەروادەییەکاندا

(١٤٤) ئەوجا ئاستینوس و هیپرونی شوانی جەنگاوەرانی کوشت، یەکەمیانی بەنێزە کوشت، نێزەیەکی سرەواندێ ڕێك سەروی مەمکی گرت، دووەمیانی بەشمشێر کوشت، شمشێرێکی دا بەلاملیا، شانی لە لاملییەوە تا پشتی شەق کرد. ئیدی ئەم دووەی بەجێهێشت و دوای ئەباس و بولیدوس)ی کوڕانی (یوریداماس)ی پیرە شرۆڤەکاری خەونان کەوت: کە جارێکی دی ناگەڕێنەوە تا خەونەکانیان بۆ شرۆڤە بکات، چونکە دیومیدس

دوبایی بەو خەونەیان هێنا، ئەوجا دووی زانتوس و تون، کوڕانی فینوبس کەوت، کە هەردووکیانی لە دڵا شیرین بوون، چونکە پیر بوو بوو، و منداڵی دی نەدەبوو تا موڵك و ماڵەکەی بەمیرات بەرن، بەڵام دیومیدیس هەردوکیانی کوشت و خەم و پەژارەیەکی تاڵی بۆ بابیان بەجێهێشت، چونکە جارێکی دیکە بەچاوی خۆی نایانبینێ، بەزیندوویەتی لە مەیدانی شەڕەوە بۆ ماڵ بگەڕێنەوە، و خزم و کەسوکارەکانی سەروەت و سامانەکەی دابەش دەکەن.

(١٥٩) ئەوجا هێرشی بردە سەر هەردوو کوڕەکەی بریام: ئیخمون و کرومیوس، هەردوکیان لەیەك عەرەبانەدا بوون، وەکو چۆن شێرێك پەلاماری گاگەلێکی ناو مێرگی دارستانێك دەدات و ملی مانگایەك یان گوێرەکەیەك دەشکێنێ، بەو ئاوایە کوڕەکەی تودیوس، دڕندانە هەڵیکوتایە سەر ئەم دووە و بەزۆر لە عەرەبانەکەوە خستیانییە خوارێ و تەدارەك و ئەسلەحەکەی لێ داماڵین. ئەوجا ئەسپەکانی دایە دەست هاوڕێکانی تا بیانبەن بۆ لای کەشتییەکان.

(١٦٦) وەختێ ئینیاس بینی بەوجۆرە بەربووەتە ناو لەشکرەکان، بەژێر بارانی تیر و نێزاندا ڕۆیی تا باندارس بدۆزێتەوە. وەختێ کوڕە ئازاکەی لیکاونی دۆزییەوە گوتی: "ئەی باندوراس کوا کەوانەکەت، کوا تیرە پەڕ پەڕ و باڵدارەکانت، کوا ناوو ناوبانگی تیرەندازیت، کە چ کەسێك نە لێرە و نە لەوێ (لە لیسیادا) نایگاتێ؟ دەی دەست لە زیوس پان بکەوە و تیرێك بگرە ئەم پیاوەی کە ماڵی تەروادەییەکان وێران دەکات،

(١٧٥) بەناو تەروادەییەکان کەوتووە و جەنگاوەرانێکی زۆری لێ کوشتوون- کێ دەزانێ لەوەیە خوایەك بێ و لە یەکێك لە ڕێوڕەسمانی قوربانیدا غەزەبی لە تەروادەییەکان گرتبێ، و پشم و غەزەبی خواوەندش ترسناکە."

(١٧٩) کوڕەکەی لیکاون وەڵامی دایەوە: "ئەی ئینیاس من بەکوڕەکەی تیدیوس نەبێ بەکەسی ناشوبهێنم، بە زرێکەی و بەکێوخودەکەی و بەئەسپەکانیا دەیناسمەوە. دەشێت خواوەندێك بێت، بەڵام ئەگەر ئینسانیش بێ بەبێ کۆمەکی ئاسمان ئەم هەموو وێرانکارییەی پێناکرێ، هەڵبەتە دەبێ خواوەندێکی لە پشت بێ، و خۆی لە تویێ پەڵە هەورێکی تاریکدا مەڵاس دابێ، وا تیرە تیژەکەی منی لێلادا، من بەڕاستی تیرەکەم سرەواندە ئەو، ڕێك بەرشانی ڕاستی کەوت، تیرەکەم چوو بەزرێکەیدا، من دڵنیابووم کە بۆ ئەو دنیام نارد، بۆ (هادیس)م نارد. بەڵام وادیارە نەمکوشتووە. هەبێ و نەبێ

خواوەندێکم لیٚ چووە بەقینا. ئەمە جگە لەوەی من لێرەدا نە ئەسپ شك دەبەم و نە عەرەبانە. لەویٚ، لە تەویلەکەی بابمدا یازدە عەرەبانەی زۆر چاك و تازە هەیە کە تازە لای وەستا هاتوونەتەوە، و پەردەیان پێدا دراوە، هەریەکەیان جووتیٚ ئەسپی قەڵەوی تێر جۆ و ئالیکی لەلاوە بەستراوەتەوە. بەرلەوەی بێم بۆ ئێرە بابە پیرەکەم، لیکاون، داوای لێکردم کە عەرەبانە و ئەسپەکان لەگەڵ خۆدا بەرم، تا لە ریزی پێشەوەی تەروادەییەکاندا، بکەومە جەنگ، لیٚ بەندە بەگوێم نەکرد، بریا بەقسەی ئەوم کردبا، بەڵام من بیرم لە ئەسپەکان دەکردەوە، کە فێرە ئالیکی تەواو بوون، دەترسام لەم شارە جەنجاڵ و ئابڵوقە دراوەدا ئالیکی باشیان بەرنەکەویٚ، بۆیە لەماڵەوە بەجێمهێشتن و بەپێیان بۆ ئیلیون هاتم، و پشتیوانم تەنیا تیرو کەوانەکەم بوو. بەڵام وا دیارە تیرەکانم بیٚ سوودن، چونکە من دوو فەرماندەم پێکا، کوڕانی ئوتریوس و تیدیوس، خوێنێکی زۆریان لەبەر ڕۆیی، بەڵام من هیچم نەکرد، زیاترم وروژاندن.

ئەو ڕۆژەی کەوانەکەم لە عەمار دەرێنا و بەرەو ئیلیون پێش جەنگاوەرە تەروادەییەکان کەوتم، تا بەهانای هیکتۆرەوە بچم کارێکی باشم نەکرد.

(٢١٣) بەڵام ئەگەر جارەکی دی بۆ ماڵەکەی خۆم گەڕامەوە و چاوانم بەدیداری وڵات و هاوسەر و کۆشك و تەلارە بەرزەکەم ڕوون بووەوە، سەرم بەبڕین بچیٚ ئەگەر ئەم کەوانە نەشکێنم و نەیخەمە ئاگرەوە. ئەم کەوانە جوانێکی بیٚ هونەرە، و لێرەدا، ئالەم ئاخەدا بەکاری هیچ نایەت."

(٢١٨) ئینیاس وەڵامی دایەوە: "نا، ئەم قسانە مەکە. ئا من و تۆ، هەردووکمان بەئەسپ و عەرەبانەوە نەچینە مەیدانی ئەم پیاوە و چەکەکانمانی لیٚ تاقی نەکەینەوە هیچ گۆڕانێك ڕوونادات. دەی وەرە، سەرکەوە سەر عەرەبانەکەی من تا بزانی ئەسپانی (ترۆس) چتۆ ئەسپێکن، چۆن دەتوانن لە دەشتا، بەوپەڕی خێرایی پەلاماری دژمن بدەن یان خۆ لە چنگی دژمن دەرباز بکەن. خۆ ئەگەر ویستی (زیوس)ش ئەوە بوو جارێکی دیکەش دیومیدسی کوڕی تودیوس سەربکەویٚ، ئەم ئەسپانە بەسەلامەتی دەمانگەیەننەوە شار، دەی وەرە و ئەم قامچی و هەوسارە درەخشانانە بگرە و ئەسپەکان لێخوڕە و من لەسەر عەرەبانەکەوە شەڕ دەکەم، یان تۆ شەڕ بکە و من ئەسپەکان لێدەخوڕم.

(٢٢٩) کوڕی لیکاون وەڵامی دایەوە: "ئەی ئینیاس بەخۆت هەوسارەکان بگرە و عەرەبانەکە لێخوڕە، چونکە ئەگەر لەبەر تیدیوس هەڵاتین، ئەوا ئەسپەکان بۆلای خاوەنی

حودەچن، خۆ ئەگەر دەنگت نەناسنەوە ڕەنگە جەنە ببەستن و بەپەلە لە مەیدانی شەڕ دەربازمان نەکەن. هەنگێ کوڕی تیدیوس هەردووکمان دەکوژێت و ئەسپەکان بۆ خۆی دەبات، کەواتە دەی بەخۆت عەرەبانە و ئەسپەکانت بازۆ، و من خۆ سازدەدەم کە بەنێزە تیژەکەمەوە پەلاماری بدەم."

(٢٣٩) سواری عەرەبانەکە بوون و بەلەز بەرەو کوڕی( تیدویوس)یان هاژوت. کاتێ (ستینیلوس)ی کوڕی کابانیوس بینیانی نزیك دەبنەوە بە (دیومیدس)ی گوت: "ئەی دیومیدس، کوڕی تیدیوس، ئەی ئازیزەکەی دڵی من، جووتێ جەنگاوەر دەبینم زۆر بەلەز بەرەو تۆ دێن، و هەردووکیان لە ڕادەبەدەر بەهێز و توانان، یەکێکیان کەوانکێشێکی مەعلانە و (باندارۆس)ی کوڕی لیکاونە، ئەویتریان ئینیاسی کوڕی ئەنخیسە، و دایکی ئەفرۆدێت)ی خواوەندی جوانییە. رابە عەرەبانەکەت بازۆ و با بگەڕێینەوە. تکات لێدەکەم ناچاری پێشڕەویمان مەکە، نەبادا بکوژرێی.

(٢٥١) دیومیدس، بەتوڕەیی تێڕوانی و گوتی: "باسی هەڵاتن مەکە، گوێت لێناگرم: من لە ڕەگەز و نەژادێکم هەڵاتن و ترس لە مەزەبیا نییە. لاقەکانم هێشتا ماندوو نەبوون. بەتەمانیم سواری عەرەبانە ببم، دەمەوێ هەر بەم شێوەیە ڕووبەڕوویان ببمەوە. ئەتینا ئەمری پێکردوم لە هیچ پیاوێك نەترسم، و خۆ ئەگەر یەکێکیش لەو جووتە ڕزگار بێ، ئەوا ئەسپەکان هەردووکیان نابەنەوە.

(٢٦٠) جا قسەیەکت بۆ دەکەم، بیکە گوارە و لە گوێی بکە –ئەگەر ئەتینا بەڕەوای زانی و شانازی کوشتنی هەردوکیانی پێ بەخشیم، هەردوو ئەسپەکەت لێرە ڕاگرە و بیانبەستە بەعەرەبانەکەوە،خێرا فریا بکەوە هەردوو ئەسپەکەی ئینیاس لەبەری تەروادەییەکانەوە بۆ بەری ئاخییەکان ببە. ئەمانە لە ڕەگەز و تیرەی ئەو ئەسپە ڕەسەنانەن کە زیوس، دانی بەترۆس لەبری ڕفاندنی گانیمیدی کوڕی کە بوو بەمەیگێڕی خواوەندەکان، بۆیە باشترین ئەسپن کە ڕوناکی سپێدە و تیشکی هەتاویان پێ کەوتووە. ئەنخیسی بابی ئینیاس ئەم ڕەگەزەی دزی، دوای ئەوەی بەدزی (لاومیدون)ەوە ماینەکانی خۆی لەگەڵدا جووتکردن و شەش جوانویان بوو. چواریان هێشتا لە تەویلەکانی خۆیدان، و دووانەکەی دیکەشی داون بەئینیاس کە ئەگەر بتوانین بیانگرین سەربەرزی و شانازییەکی گەورە بەدەست دەهێنن."

(٢٧٤) لە کاتێکا بەو جۆرە قسانیان بۆ یەکتر دەکرد، جووتەکەی دی زیاتر لێیان دەهاتنە پێشێ، هەوەڵجار کوڕی لیکاون هاتە قسان و گوتی: "ئەی ڕۆڵە مەزن و بەجەرگەکەی

(تیدیوس)ی خانەدان، ئەگەر تیرەکەم لە پەلوپۆی نەخستی، ئەوا ئێستا نێزەکەمت پێ تاقی دەکەمەوە."

(٢٨٠) بەدەم قسەوە ژەهری لە نێزەکەی داو هاویشتی. بەر سوپەرەکەی کوڕی تیدیوس کەوت و تاسەر سنگی بڕی. کوڕەکەی لیکاون هاواریکرد و گوتی: "سەری نێزەکەم سکتی دیوا و دەرکرد، و زۆرت لەم دنیایەدا نەماوە، و سەرفرازی و شانازی جەنگ بەمن دەبڕێت."

(٢٨٦) بەڵام دیومیدس ورەی بەرنەدا و گوتی: "خەیاڵت خاوە، نەت پێکاوم، پێم وایە ئێوە واز ناهێنن تا هەردووکتان یا یەکێکتان بەخوێنی خۆی زرێکەی خوای جەنگ نەڕەنگێنێ."

(٢٩٠) ئەوەی گوت و نێزەکەی هاویشت، ئەتینا ئاراستەی لوتی (باندراوس)ی کرد و ڕێك لە نزیکی چاوییەوە، نێزەکە بەبەینی ددانە سپییەکانیا ڕۆیی و نوکی برونزینی نێزەکە زمانی لە بن و بێخەوە بڕی و لەژێر چەناگەیەوە دەرچوو، تەدارەك وئە سەلەحەکەی کەوتە تەق و هوڕ و تەپ کەوتە خوارەوە. ئەسپەکان لە ترساندا خۆیان لادایە لاوەو، ژیانی لەبەر برا.

(٢٩٧) ئینیاس بە زرێ و چەك و ئەسلەحەکەیەوە خۆی لە عەرەبانەکە هەڵدایە خوارێ، ترسی ئەوەی لێنیشت کە ئاخییەکان جەنازەکەی لێ بفرێنن. وەکو شێری نەڕی متمانە بەخۆ لاشەکەی خستە بەینی هەردوو لاقی و زرێ و ڕمەکەی بۆ پێشەوە برد و هاواری کرد کە هەر کەسێك لە جەنازەکە بێتە پێشێ دەیکوژێت. لێ کوڕەکەی تیدیوس گرتی بە بەردێکی گەورەدا، کە بە دوو زەلامی بەهێزی ئەمڕۆ هەڵنەدەگیرا، و بەئاسانی و بێ کۆمەکی چ کەسێك بەرزی کردەوە و هاویشتییە ئینیاس و بەر جومگەی نێوان ڕان و سمتی کەوت. بەردەکە جومگەکەی ورد و خاش کرد و گۆشتەکەی دەوری جنی. جەنگاوەرەکە بەچۆکا هات، خۆی بەدەستەکانی گرتەوە و کەوتە سەر زەوی و بەرچاوەکانی تاریك بوون، ئیدی ئینیاسی قارەمان، شای جەنگاوەران کەوتە حاڵی مردن، و ئەگەر ئەفرۆدێتی دایکی فریای نەکەوتبا دەمرد، ئەفرۆدێت ئەم کوڕەی لە ئەنخیس ی شوان بوو بوو، کە کوڕەکەی بەو حاڵەوە بینی باسکە سپییەکانی لە جەستەی کوڕە ئازیزەکەی وەرینا و بەلایەکی کراسە جوانەکەی داپۆشی، تا یەکێك لە داناییەکان نێزەیەك بە سینگیدا نەکاو نەیکوژێ.

(٣١٨) بەو جۆرە کوڕە ئازیزەکەی هەڵگرت و لە مەیدانی شەڕەکە دووری خستەوە. بەڵام

کوڕەکەی (کابانیوس)ش فەرمایشتەکانی (دیومیدس)ی لەبیر نەکردبوو. بەپەلە جووتە ئەسپەکەی خۆی لە مەیدانی شەڕەکە دوورخستەوە و دەستە جڵەوەکانی بەعەرەبانەکەوە بەستن. ئەوجا خۆی هەڵدایە سەر پشتی ئەسپەکانی ئینیاس و عەرەباکەی لە بەری تەروادەییەکانەوە بۆ بەری ئاخییەکان برد. لەوێ دانییە دەستی هاوڕێی ئازیزی خۆی (دیبیلوس)ەوە کە لە هەموو هاوڕێکانی دیکەی پتر ڕێزی دەگرت و داوای لێکرد بیانبات بۆلای کەشتییەکان. ئەوجا گەڕایەوە و سواری عەرەبانەکەی بوو، جڵەوی ئەسپەکانی گرتە دەست و بەپەلە کەوتە گەڕان بەدووی کوڕەکەی (تیدیوس)دا

(٣٣٠) بەڵام کوڕی تیدیوس چنگ لەسەرشان و نێزە بەدەست دووی خواوەندی قوبرسی، دوای ئەفرۆدێت کەوتبوو، چونکە دەیزانی نەرم و لاوازە، و لەو خواوەندانە نییە کە زاڵ بێ بەسەر شەڕ و کوشتاری جەنگاوەراندا. نە ئەتینا بوو، و نە (ئینیو)ی خوای شەڕ و خوشکی (ئەریس)ی خواوەندی شەڕ) وێرانکەری شار و ئاوەدانیان، دوای تاقیب کردنێکی زۆر هەر کە گەییە ئاستی،

(٣٣٥) خێرا پەلاماریداو قەمەکەی کرد بەدەستە ناسکەکەیدا. قەمەکە جلە بۆندارەکەی بڕی، ئەو جلەی کە خواوەندانی هونەر بۆیان چنی بوو، پێستی نێوان مەچەك و ناولەپی بڕی، خوێنی نەمر (یان ئیکور- ئەو خوێنەیە کە تەنیا بەدەماری خواوەنداندا دێ و دەچێ) لە زامەکەوە فیچقەی کرد، چونکە خواوەندان هەمان ئەو نان و شەرابەی ئێمە ناخۆن و ناخۆنەوە، بۆیە خوێنیان وەکو خوێنی ئێمە نییە، نەمر و جاویدانن. ئیدی ئەفرۆدێت لەتاو ئازار هاوارێکی قایمی کرد، و کوڕەکەی لە دەست کەوت، بەڵام ئەپولۆ لە باسکەکانی نەوی و لە پەڵە هەورێکی تاریکییەوە پێچا، چونکە لەوە دەترسا یەکێك لە دانابیەکان بگاتە سەری و نێزەیەك بەسینەیدا بکات و بیکوژێت. هەنگێ دیومیدس وازی لێهێنا و هاواری لێکرد: "ئەی کیژی زیوس، خۆت لە هەرا و هەنگامەی جەنگ و شەڕان دوور بگرە، بۆچی خەریکی ئەفسونکرن و لە خشتە برنی ژنانی ساویلکەی خۆت نابی؟ ئەگەر خۆت لە کاروباری شەڕان هەڵقورتێنی، شتی وا دەبینی کە لە دووریشەوە ناوی شەڕ بژنەوی لەرزت لێ بێ."

(٣٥٢) خواوەند خانم بەبێزاری و بێتاقەتی دوورکەوتەوە، (ئایریس)ی قاسیدی ئاسمان وەکو با فریای کەوت و لە ئاپوراکەی دوورخستەوە، ئازاری زۆر بوو، پێستە نەرمەکەی شین هەڵگەڕا.

لەبیر خواوەندی جەنگ، ئەریسی سامناکی بینی کە لە دەستی چەپی مەیدانەکەدا وەستاوە و شانی داداوەتە سەر ڕمەکەی و عەرەبانە و ئەسپەکانی لە نزیکیا وەستاوە.هەنگێ لەبەردەم براکەیدا چۆکی دادا و تکای لێکرد ئەسپەکانی بەئەمانەت بداتێ. هاواریکرد: "ئەی برا ئازیزەکەم، فریام کەوە، ئەسپەکانتم بدەیێ تا پێیان بچمەوە بۆ ئۆڵەمپ، بارەگای خواوەندان. بەشەرێکی فانی بریندارى کردوم و ئازارم زۆر زۆرە، ئەو بەشەرە کوڕەکەی (تیدیوس)ە کە بەجۆرێ دەهری بووە دەتوانێ بەگژ بابە (زیوس)شدا بچێ."
(٣٦٣) ئاوا قسەی کرد، ئەریس ئەسپە یاڵ زێڕینەکانی دایێ، ئەفرۆدێت بەدەم نەخۆشی و ئازارێکی زۆرەوە سواری عەرەبانەکە بوو، (ئیریس)ش لە تەنیشتییەوە سوار بوو و جڵەوی ئەسپەکانی گرتە دەست. قامچییەکی بەئەسپەکانا کێشا، ئیدی وەکو با بۆی دەرچوون، و بەچاو تروکانێك گەییشتنە نیشتمانی خواوەندان، ئۆڵەمپی هەزار بەهەزار. ئیریس، ئەسپەکانی ڕاگرت، لە عەرەبانەکەی کردنەوە، ئالیکی خوایی دانێ، لێ ئەفرۆدێت خۆی هاویشتە ئامێزی (دیونی)ی دایکی، کە ئەویش لە باوەشی گرت و دەستی پێدا هێناو گوتی: "ئەوە کامە بوونەوەری ئاسمانی بەم شێوەیە ڕەفتاری لەگەڵ کردویت؟ وەکو ئەوەی بەئاشکرا و بەبەرچاوی هەموانەوە خەتاو هەڵەیەکت کردبێ؟."
(٣٧٥) ئەفرۆدێت کە پرشنگی جوانی دەدا، وەڵامی دایەوە: "ئەوەی زامداری کردوم (دیومیدس)ی لەخۆبایی کوڕی(تیدیوس)ە، چونکە ئینیاسی کوڕم، کوڕە ئازیزەکەم، ئەوەی لە هەموو بەنی بەشەرم خۆشتر دەوێ، هەڵگرتبوو، و دەمویست لە مەیدانی شەڕی دوور بخەمەوە. شەڕەکە لەوە دەرچووە تەنیا شەڕی بەینی تەروادەیی و ئاخییان بێ، چونکە داناییەکان ئێستا کەوتونەتە شەڕی خواوەندانش."
(٣٨١) دیونی وەڵامی دایەوە: "تەحەمول بکە کیژەکەم، ئارامت بێ. گەلێك لە ئێمەمانانی دانیشتووی ئۆڵەمپ، ئازاری دەستی بنیادەمانمان چەشتووە، کاتێ ئوتوس و ئیفیالتیسی، کوڕانی ئەلویوس، (ئەریس)یان کەلەپچە کرد وبۆ ماوەی سیازدە هەیڤان لە گۆزەیەکی برونزیدا حەپسیان کرد دەبوایە تەحەمول بکات. خۆ ئەگەر ئیریبویای جوان، واتە ژنی ئەلویوس فریا نەکەوتبا و (هرمس)ی ئاگادار نەکردباوە کە (ئەریس)ی ڕفاند ئەوا ئەریس لە زنداندا تیا دەچوو. هەروەها (هیرا)ش کاتێ کوڕە فیلەتەنەکەی ئەمفیترون بەتیرێکی سێ سوچ سەروی مەمکی ڕاستی پێکا و بریندار کرد ئازارێکی زۆری چەشت، ئازارێکی بێ دەرمان.
هەروەها شتێکی واهیش بەسەر هادیسی مەزن هات، کاتێ هیرکلی کوڕی زیوس لای

دەروازەکانی دۆزەخەوە تیرێکی لێداو گەیاندییە شەرای مەرگ. ئەوسا هادیس بەدڵی پڕ خەم و جەستەی بەئازارەوە چوو بۆ ماڵی زیوس لە ئۆڵەمپی بەرز،تیرەکە چووبوو بە شانی بەهێزو پانیدا و زۆری ئازار دەدا، تاپایون فریای کەوت و گیا و دەرمانی لە زامەکەی ناو چارەی کرد. چونکە هادیس لە ڕەگەز و تیرەی بەشەڕ نەبوو، بەڵکو خواوەندێکی سەرکێش بوو، لە هیچ کارێکی توند و تیژ نەدەپرینگایەوە، تەنانەت بەتیرەکانی ئەو خواوەندانەی ئۆلەمپیشی تورە کرد. ئێستاش ئەتینا ،(تیدیوس) لە تۆ هاندەدا، گەوج ئەو کەسەیە نەزانێ کە هەر پیاوێك شەڕی خواوەندان بکات زۆر ناژی و گوێی لە گڕوگاڵی منداڵەکانی نابێ لە باوەشیا، چونکە لەشەڕ ناگەڕێتەوە. جا با کوڕی تیدیوس چاك بزانێ نەچووە بەگژ کەسێکی لەتۆ بەهێزترا،

(٤١٢) زۆری پێ ناچێت کە ژنە ئازاکەی، (ئیگیالە)ی کیژی ئەدراستوس، بەشیوەن و گریان بۆ (دیومیدس)ی مێردی، بۆ ئازاترین پیاوی ناو ئاخییان، هەموو خەڵکی ماڵەکەی لەخەوهەڵدەستێنێ.

(٤١٦) ئەوەی گوت و ئیکورەکەی (خوێنی خوایی) بەهەردووك دەستان لە مەچەکی کیژەکەی سڕی و ئازارەکەی دامردەوە و دەستی چاك بووەوە. بەڵام ئەتینا و هیرا کە ئەوەیان بینی، کەوتنە تەوس و توانج لە زیوس، ئەتینا لە پێشا قسەی کرد. گوتی: "بابە زیوس، لێم تورە مەبە، بەڵام پێم وایە ئەفرۆدێتی کوبرسی هەق وابوو ژنێکی ئاخییایی بێنێتە ڕەداو ڕەدووی یەکێك لەو تەروادەییانەی بخستایە کە زۆریان پێ سەرسامە، و چاوەڕوانی بکردایە تا هەردووکیان غەرقی راموسان دەبوون، و دەبوایە دەستە جوانەکەی بەدەرزیلەی زێری ئەو ژنە ئاخیاییە بروشایە."

(٤٢٦) سەرداری خواوەندان و بەشەران بزەیەکی کرد، و ئەفرۆدێتی زێرینی بانگ کردە لای خۆیەوە. گوتی: "کیژەکەم تۆ بۆ جەنگ و جەنگاوەری نەخولقاوی. تۆ خەریکی کارە دڵگیرەکانی خۆت بەو پەیوەندی زەماوەندان خۆش بکە، شەڕ و شۆڕ کاری ئەریس و ئەتینایە، بەوانی بسپێرە.

(٤٣١) لە کاتێکا ئەوان بەو جۆرە قسەی خۆیان کرد، دیومیدس بەهەموو هێزێکییەوە پەلاماری (ئینیاس)ی دا، دەشیزانی کە لە ژێر باڵی ئەپولۆدایە، و زەرەیەك لەم خواوەندە بەدەسەڵاتە نەترسا، و دەیویست ئینیاس بکوژێت و چەك و ئەسلەحەکەی لێ داماڵێت. سێ جاران پەلاماریدا تا بیکوژێ، و هەر سێ جارەکە ئەپۆلۆ بە قەڵغانە پرشنگدارەکەی

بەرپەرچی دایەوە. کاتێ جاری چوارەم وەکو خواوەندێك هێرشی هێنا، ئەپولۆ بەدەنگێکی سامناك تێی خوڕی وگوتی: "ئاگاداربە کوڕی تیدیوس، بگەڕێوە، بیر لە شەڕی خواوەندان نەکەیەوە، چونکە بەشەری فانی، ئەوانەی سەر زەوی ناتوانن بەربەرەکانی خواوەندانی نەمر بکەن."

(٤٤٣) کوڕەکەی تیدیوس بۆ ئەوەی خۆی لە پشم و غەزەبی خواوەند بپارێزێ، تۆزێك کشایەوە و ڕێگەیەکی بچووکی کردەوە، ئەپولۆ (ئینیاس)ی لەنێو ئاپورای خەڵکەکە هەڵگرت و لە (برگاموس)ی پیرۆزا کە پەرستگەکەی لەوێندەر بوو، داینا. لەناو قوربانگە گەورەکەدا، جووتە خواوەند لیتو و ئەرتەمیس تیماریان کرد و ڕوناکی و جوانییەکەی جارانیان بۆ گێڕایەوە، کەچی ئەپولۆی زیوینکەوان تاپۆیەکی هاوشێوەی (ئینیاس)ی دروستکرد، و تەدارەك و ئەسلەحەیەکی وەکو هینەکەی ئەوی لەبەرکرد، ئیدی تەروادەیی و ئاخییانی مێرخاز بەدەوری ئەم تاپۆیەدا بەربوونە یەکتری و قایشی زرێ و قەڵغانی یەکترییان هەڵدەبڕی. ئەوجا ئەپولۆ بەخواوەندی جەنگی گوت: "ئێریس، ئەی ئێریس، ئەی بەڵای گیانی بەشەران، ئەی وێرانکەری شاران، ئەی ئاوێتە بەخوێن و مەرگان، بۆچی ناچی بۆلای ئەم پیاوە، ئەم کوڕەی (تیدیوس)ە، کە وەها گەرم بووە دەیەوێ بەگژ (زیوس)شدا بچێت، بۆچی ناچی و لە شەڕەکەی دوور ناخەیتەوە؟ تەعەدای لە کوبرسی (ئەفرۆدێتی خواوەندی جوانی) کرد و مەچەکی بریندار کرد، دوای ئەوە وەکو ئەوەی خوا بێ پەلاماری منیشیدا."

(٤٦٠) ئەوەی گوت و چوو لەسەر لوتکەی برگاموس لێی دانیشت، بەڵام (ئەریس)ی وێرانکەر بەناو لەشکری تەروادەییەکان کەوت، خۆی خستە شێوەی (ئاکاماس)ی ڕابەری تراقییەکانەوە و گوتی: "ئەی کوڕانی بریام، چۆن غیرەتتان قەبوڵ دەکات گەلەکەتان بەدەستی ئاخییان بێتە سەربڕین؟ چاوەڕوانی ئەوەن تا دەگەنە بەر دەروازەکانی تەروادە؟ ئەوەتا (ئینیاس)ی کوڕی ئەنخیس لەو گۆڕە کەوتووە، ئەو ئینیاسەی بەئەندازەی هیکتۆر لامان گەورە و بەڕێزە. کەواتە خێراکەن، یارمەتیم بدەن با هاوڕێ مێرخاز و جوامێرەکەمان لە تونی شەڕ دەربێنین."

(٤٧٠) بەو پەیڤانە هانیدان و هێنانیە جۆش. ئەوجا ساربیدون هات و زۆر بەتوندی سەرزەنشتی هیکتۆری کرد. گوتی: "ئەی هیکتۆر کوا ئازایەتیەکەت؟ خۆ تۆ فشەت دەکرد کە بەتەنێ، بەبێ گەل و بەبێ یاوەر و هاوپەیمانان، بەتەنێ لەگەڵ براکانتا،

لەگەڵ زڕ براکانتا تەروادە پا سدەکەن. کەچی من کەسیان لێرەدا نابینم، وەکو سەگی ترسنۆکی دەوری شێرن. ئێمە نەبێ کەسی دی شەڕ ناکات، ئێمەی هاوپەیمانت. من لە بنی دنیاوە، لە لیسیا و کەنارەکانی ڕوباری ئیکسانتوس)ەوە هاتووم، ژنەکەم و کوڕە چکۆلەکەم و سەروەت و سامانێکی زۆر و جێ تەماحی ئاتاج و دزان-م بەجێهێشتووە، و پێشی لایەنگرەکانم، جەنگاوەرانی لیسیایی کەوتووم و هەر کەسێك بێتە ڕێم شەڕی دەکەم بێ ئەوەی لێرەدا هیچ شتێکم هەبێ کە ئاخییەکان بتوانن لێمی بدزن، کەچی تۆ ڕەق وەستاوی بێ ئەوەی داوا لە سەربازەکانت بکەی خۆ ڕاگرن و بەرگری لە ژنەکانیان بکەن. ئاگاداربە نەوەك خۆت و خەڵکەکە بکەونە داوێکی تەنگەوە و گیرۆدەی دژمنان بن، دژمن دژمنە، یەکسەر شارە جوانەکەت وێران دەکەن، شەو و ڕۆژ بیر لەمە بکەرەوە، هانا بۆ فەرماندە ناودارەکانی هاوپەیمانەکانت ببە، تا بەبێ ترس بەرگری بکەن، تەنیا بەمە لە لۆمە و گازاندە دەخەلەسی."

(٤٩٣) ساربیدون بەو قسانە گیانی هیکتۆری تەزاند. یەکسەر بەجلی جەنگەوە خۆی لە عەرەبانەکەی هەڵدایە خوارێ، بەدەم بادانی هەردوو ڕمە تیژەکەیەوە بەناو سوپاکەی کەوت و بەدەنگی بەرز جەنگاوەرەکانی بۆ شەڕ هاندەدا و جاڕی شەڕێکی ترسناکی دەدا. ئیدی تەروادەییەکان گەڕانەوە و پەلاماری ئاخییەکانیاندا، بەڵام ئارگوسییەکان یەکریز لەجێی خۆی وەستان و لەبەریان هەڵنەهاتن. وەکو چۆن کاتێ شەنکەران خەرمانەکانیان شەنە با دەکەن و شەماڵ کایەکە دەبات، و (دیمتر)ی قژ زەرد هەڵدەکاتە باو دانەکە لە کا جیا دەکاتەوە و کایەکە زیاتر سپی دەبێ، ئا بەو جۆرە ئاخییەکان سەر و شان و ملیان لە تەپوتۆزی ژێر سمی ئەسپەکانیاندا سپی بوو، ئەو تەپوتۆزەی گەییە کەشکەڵانی ئاسمانی برونزین، وەختێ دەستیان بەشەڕ کردەوە و گالیسکەڕانەکان بەعەرەبانەکانیانەوە دەسوڕانەوە و گوشاریان دەخستە سەر دژمنەکانیان. جا (ئەریس) خواوەندی شەڕ کە لایەنگری تەروادەییەکان بوو، پەردەیەکی تاریکی بەسەر شەڕەکەدا دادا تا کۆمەکی تەروادەییەکان بکات، بەمەش فەرمانەکانی ئەپولۆنی ئەنجام دەدا، کە پێی گوتبوو هەر کاتێ بینی ئەتینا بالاس دەست بەرداری شەڕ بوو، بەناو تەروادەییەکان بکەوێ و زاتیان بخاتە بەر و ورەیان بەرز بکاتەوە —چونکە ئەتینا یارمەتی داناییەکانی دەدا. وێڕای ئەمەش ئەپولۆ بەخۆی (ئینیاس)ی لە پەرستگە پیرۆزەکەیەوە نارد و ورەیەکی زۆری خستەبەر، ئینیاس شوێنەکەی خۆی لەناو هاوڕێکانیا گرتەوە و کە دیتیان زیندووە و ساغ

و سەلامەتە و ورە و ئازایەتی لێ دەچۆڕێ زۆریان لاخۆش بوو، بەڵام هیچیان لێنەپرسی، چونکە بەدەردی ترەوە گیریان خواردبوو، ئەو گرفتاری و نیگەرانیانەی ئەریس و خوشکەکەی (ئێرس)ی خواوەندی تەفرەقە و دووبەرەکی، بۆیان دروست کردبوون، هەرا و هەنگامەیەکی گەورەی لەناویاندا نابووەوە.

(٥٢٠) جووتە ئەجاکسی؛ ئۆدیسیوس و دیومیدس ،دانایییەکانیان بۆ شەڕ جۆش دەدا، ئەوانیش وەکو ئەو هەورانەی کوڕی کرونوس لە دەمانی کپی و خامۆشی هەوادا لە لوتکەی کۆساراندا ڕای دەگرت، لەو دەمانەدا کە (بوریاس)ی خواوەندی ڕەشەبا لەگەڵ بایەکانی دیکەدا نووستبا، ئەو بایانەی بەگڤ و هوڕ هەوران بەهەموو لایەکدا پەرت دەکەن. دانایییەکان وەکو ئەو هەورانە لە جێی خۆ وەستان و لەبەر تەروادەیییەکان هەڵنەهاتن. ئاگامەمنون بەناویان کەوت و پەیتا پەیتا هانی دەدان و دەیگوت: دۆستان، پیاوەتی و مەردایەتی خۆتان بسەلمێنن، سەرشۆڕی لە خۆتان دوور بخەنەوە و بچنە ناو جەرگەی شەڕەوە.

(٥٣١) ئەوانەی سەرشۆڕی قەبوڵ ناکەن، ئەگەری ژیانیان زیاترە تا مردن، بەڵام ئەوانەی دەرەڤن نە ژیانیان ڕزگار دەکەن و نە ناویان."

(٥٣٣) ئەو قسانەی کرد و خێرا ڕمەکەی هاویشت و بەر یەکێك لە پێشەنگەکان کەوت، ئەویش (دیکون)ی کوڕی پرگاس، وهاوڕێی ئینیاس بوو، کە بەلای تەروادەیییەکانەوە هاوتاو هاوپایەی کوڕانی بریام بوو، کە هەمیشە لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکاندا دەجەنگی و نێزەکەی ئاگامەمنون مەتاڵەکەی بڕی و لێوەی چووە ژوورەوە، کەمەربەندەکەی لەخوار سکییەوە دیوا و دەرکرد، و تەپ کەوتە سەر زەوی و تەدارەك و ئەسلەحەکەی بەتەق و هوڕ بەسەر لاشەکەیدا کەوت.

(٥٤١) ئەوسا ئینیاس دوو قارەمانی لە دانایییەکان کوشت، کریتون و ئورسیلوخۆس. بابیان پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، خەڵکی شارە قایمەکەی فیری بوو، لە توخم وتۆوی ئەلفیوس، خواوەندی ڕوباری ئەلفیوس بوو، ئەوڕوبارەی کە ئاوەڕۆیە بەرینەکەی بەخاکی بیلیانیەکاندا دەڕۆیی. ڕوبار (ئورسیلوخوس)ی بوو کە حوکم و فەرمانڕەوایی زۆر گەلانی کرد، ئەمە بابی دیوکلیس بوو، کە ئەمیش دوانەیەکی لێکەوتەوە بەناوانی کریتون و ئورسیلخوس، کە شارەزای هەموو فەند و هونەرێکی شەڕ بوون. ئەم دووانە کە گەورەبوون، لەگەڵ گەلە کەشتی ئورگوسییەکاندا و لەبەرخاتری مینیلاوس و ئاگامەمنونی کوڕانی (ئوتریوس)دا

چوون بۆ ئیلیون (تەروادە) و لەوێندەر مەرگ بردنییەوە و کۆتاییان پێهات. ئەمانە وەکو جووتە شێرێك دایکیان لە لێڕ و بێشەلانێکی چیاییدا بەخێوی کردن، ئیدی پەلاماری مالآنیان دەدا، بەرخ و پەزانیان دەفراند تا لەسەر دەستی پیاوێکدا کوژران. ئەم جووتە لاوە واهی بوون، ئینیاس کۆتایی بەژیانیان هێنا، و وەکو دوو درەختی سنۆبەر کەوتنە سەر زەوی.

(٥٦١) مینیلاوس کە مەرگی ئەوانی بینی دڵی هاتە ژان، بەخۆ و زرێ بریقەدارەکەیەوە و بەدەم بادانی ڕمەکەیەوە بەرەو ڕیزی پێشەوە تاویدا، چونکە ئەریس دنەی دا کەواهی بکات تا بەدەستی ئینیاس بێتە کوشتن، بەڵام (ئەنتیلوخوس)ی کوڕی نەستور بینی، لە ترسی ئەوەی نەبا پاشا ئاسیوێکی بگاتێ و ڕیسەکەیان لێ ببێتەوە بەخوری، خۆی گەیاندە ڕیزەکانی پێشەوە، ڕێك لەو دەمەدا کە ئینیاس و مینیلاوس نێزەکانیان بەرانبەر بەیەکدی هەڵبڕی بوو و تامەزرۆی دەست پێکردنی شەڕ بوون، ئەنتیلوخوس دایە پاڵ مینیلاوس.

(٥٧٢) ئینیاس، وێڕای مێرخازی و ئازایەتی، کە بینی دوو پاڵەوان ڕووبەڕووی وەستاونەتەوە، پاشەکشەی کرد، ئیدی هەردوو جەنازەکەی کریتون و ئۆرسیلوخوس)یان بۆ ناو سوپاییانی ئاخییایی بردەوە و ئەو جووتە کلۆڵەیان دایە دەستی هاوڕێکانیان. ئەوسا بەخۆیان گەڕانەوە تا لە ڕیزەکانی پێشەوە بجەنگن؛

(٥٧٦) دوای ئەوە (بیلامینیس)ی هاوتای (ئەریس)ی خواوەند و ڕابەری پافلاگونیاکانیان کوشت. لەو کاتەدا کە بەسەر عارەبانەکەیەوە وەستابوو، مینیلاوس ڕێك چۆڵەمەی گەردنی پێکا، و ئەنتیلوخوس)ش بەردێکی سرەواندە (میدون)ی کوڕی (ئەنتیمنیوس)ی عەرەبانچی و گاردی بیلامینیس، لەو کاتەدا کە پێچی بەئەسپەکان دەکردەوە تا هەڵا. بەردەکە ڕێك بەر ئانیشکی کەوت، هەوسارە عاج نیشانەکە کەوت، دەستەکانی خاو بوونەوە و کەوتە سەر زەوی. ئەنتیلوخوس پەلاماریدا و شیرێکی بەلاجانگیا کرد، لەسەر عەرەبانەکەوە بەسەرا کەوتە خوارەوە. لە عاردەکە چەقی. چونکە عاردەکە لمەلآن بوو، ماوەیەکی زۆر بەو دەقەوە مایەوە، تا وەختێ ئەنتیلوخوس ئەسپەکانی بەر قامچی دان و بەرەولای ئاخییەکان ئاژۆتنی، بیلامینیس بوو بەژێر دەست و پێیانەوە و کەوتە سەر زەوی.

(٥٩٠) هیکتۆر لەنێو ڕیزی سوپاییەکاندا بەدی کردن، هاواری کرد وبەرەو ڕوویان تاویدا، و هێزی جەنگاوەرانی تەروادەیی بەدوویا جمان. ئەریس و خوشکە سامناکەکەی (ئینو)

پێیان کەوتبوون، ئەم خانمە بەهەرا و هەنگامەی شەڕ بارگاوی بوو، ئەریس بەنێزە سامناکەکەیەوە و بەدەوری هیکتۆردا دەسوڕایەوە، جارێ دەکەوتە پێشی و جارێ دەکەوتە پاشی.

(٥٩٦) کە دیومیدس بەو جۆرەی دیتن لەرزی لێ نیشت. وەکو چۆن پیاوێك بەبیابانێکی بەریندا بڕوات و لەپڕ خۆی لە کەناری ڕوبارێکی بەخوڕا ببینێتەوە کە بەرەو دەریایەك بکشێ، دەحەپەسێ و دەگەڕێتەوە، بەو جۆرە کوڕەکەی تیدیوس گەڕایەوە. ڕوویکردە لەشکرەکەی و گوتی: "دۆستان، چۆن پێمان سەیر بێ کە هیکتۆر ڕمبازێکی کارامەیە؟ مەگەر نابینن کە هەمیشە خواوەندێکی ها لەتەکا، و دەیپارێزێ؟ ئێستاش ئەوەتا ئەریس خۆی گۆڕیوە بەبەشەر و ها لە تەکیا. جا ڕووتان بکەنە تەروادەییەکان و، پاشە و پاش بۆ دواوە بگەڕێنەوە. چونکە ناوێرین شەڕی خواوەندان بکەین.

(٦٠٧) دیومیدس بەو جۆرە قسەی کرد. لێ تەروادەییەکان زیاتر و زیاتر تەنگیان بەئاخییەکان هەڵدەچنی. هیکتۆر دووانی لێکوشتن، کە هەردوکیان لەیەك عەرەبانەدا بوون، ئەو دووە مینیتیس و ئەنخیالوس بوون، جووتە جەنگاوەرێکی زۆر ناوداری مەیدانی جەنگ بوون. ئەجاکسی کوڕی تیلامون کە بینی کەوتن دڵی پێیان سووتا، نزیك بووەوە و بەرمەکەی نیشانەی لە (ئەمفیوس)ی کوڕی سیلاگۆس گرتەوە، ئەمفیوس دەوڵەمەندێکی حێڵی، خەڵکی بایسوس بوو، زەوی و زارێکی فرەی گەنم و دانەوێڵەی هەبوو، لێ بەخت بۆ ئێرەی هێنابوو و هاتبووە هیمدادی بریام و کوڕەکانی. ڕمەکەی ئەجاکس ڕێك بەر کەمەربەندەکەی کەوت و نێزەکە بەشی خوارەوەی سکی بڕی، ڕمبەی لێ هەستاو کەوتە سەر زەوی. هەنگێ ئەجاکس غاریدا تا تەدارەك و ئەسلەحەکەی لێداماڵێت، بەڵام تەروادەییەکان ڕمبارانیان کرد، بەڵام مەتاڵەکەی زۆری لەو ڕمانە گێڕایەوە. ئەوسا پاژنەی نایە سەر لاشەکەی و ڕمەکەی دەرهێنا، بەڵام بارانی تیر بەجۆرێ بەسەریا داباری نەیپەرژا زرێکە لە شانی داماڵێ. هەروەها سەرانی تەروادەیی بەجۆرێ دەست بەنێزەوە کەوتنە پەلامار، کە نەیوێرا لەوەی پتر وەمێنێ، هەرچەندە کابرایەکی مێرخاز و عەگید بوو، بەڵام ڕاویان ناو، و بەناچاری و بەزیوی گەڕایەوە..

(٦٢٦) ئا بەو جۆرە لەشەڕێکی گەرمەوە گلان. بەڵام چارەنووس و قەدەری بەهێز وای خواست کە (تلیبولیموس-ی کوڕی هرکلی) باڵابەرزی مێرخاز، شەڕی ساربیدون بکات، ئیدی ئەم جووتە، کوڕ و نەوەی زیوس ڕووبەڕووی یەکدی بوونەوە، لە یەکتری نزیك

بوونەوە، هەوەڵجار تلیبولیموس قسەی کرد و گوتی: ئەی ساربیدون، ئەی دەمڕاست و ڕاوێژکاری لیسیان تۆ پیاوی شەڕ نیت، چ شتێك تۆی ڕەوانەی ئێرە کردووە تا لێرەدا بمری؟ درۆ دەکەن ئەوانەی پێت دەڵێن تۆ کوڕی زیوسی قەڵغان بەشانی، چونکە تۆ لە هەموو ئەو جەنگاوەرانەی کە لە کۆنا لە زیوس کەوتونەتەوە بچووکتر و کەمتری. تۆ زۆر دووری لە خەڵکانی وەکو بابم، هەرکولی مێرخازی شێردڵ، ئەو هەرکولەی هات بۆ ئێرە تا ئەسپەکانی لاومیدون بەتاڵان بەرێ. هەرچەند تەنیا شەش کەشتی و چەند پیاوێکی کەمی لە مەعیەتدا بوو، بەڵام توانی شاری ئیلیون وێران بکات و ڕێگا و بانەکانی تێکبدات. تۆ ترسنۆك و زەبوونی، و پیاوەکانت لە ترساندا هەڵدەلەرزن و لێت بێزارن. نە هەموو هێزەکەت و نە هاتنت لە لیسیاوە بۆ ئێرە، دادی تەروادەییەکان نادات، چونکە بەدەستی من دەکوژرێیت و ڕوحت بەرەو ئەو دنیا، بەرەو دەروازەکانی هادیس دەفرێ."

(٦٤٧) ساربیدونی ڕابەری لیسیان وەڵامی دایەوە: "تلیبولیموس، بێگومان هەرکولی بابت بەهۆی حەماقەتی( لامیدون)ەوە ئیلیونی وێران کرد، چونکە لاومیدون پەیمانشکێنی لەگەڵ پیاوێکدا کرد کە دڵسۆزانە خزمەتی کردبوو. بابت لە ڕێگایەکی دوورەوە بۆ ئەو ئەسپانە هاتبوو، لاومیدون ئەسپەکانی نەدایێ. بەڵام سەبارەت بەتۆ، ئەوا تۆ بەنێزەی من دەکوژرێیت، تۆ دەبیتە مایەی سەربەرزی و ناوداری من، و ڕوحت بۆلای هادیسی خودان ئەسپانی ڕەسەن دەڕوات."

(٦٥٥) ساربیدون ئەو قسەیەی کرد و تلیبولیموس نێزەکەی بەرز کردەوە. نێزەی هەردوکیان لەیەك کاتدا دەرپەڕین، ساربیدون ناوەندی گەردەنی خەنیمەکەی پێکاو، سەرە نێزەکە گەردنی دیواودەر کرد و تاریکی مەرگ باڵی بەسەر چاوەکانیا کێشا. نێزەکەی تلیبولیموس بەر ڕانی چەپی ساربیدون کەوت، هەموو گۆشتەکەی بڕی و گەییە سەر ئێسقان، بەڵام زیوسی بابی ئەمجارەش لە مەرگ ڕزگاری کرد.

(٦٦٣) هاوڕێیانی ساربیدون هاتن، هەڵیانگرت و لە شەڕگەکەیان دوورخستەوە. سەری نێزەکە کە چەقی بووە زامەکەی زۆری ئازار دەدا. لەبەر پەلەپەلی خۆیان کەس بیری ئەوەی نەبوو نێزەکە لە ڕانی دەربێنێ تابتوانێ خۆی لەسەر لاقان ڕابگرێ، هەموو خەمێکیان ئەوە بوو فریای تیماری بخەن. لەولاشەوە ئاخییەکان لاشەکەی (تلیبولیموس)یان لە شەڕگەکە دوور خستەوە، بەڵام ئودیسیوس کە (تلیبولیموس)ی بەو حاڵەوە بینی دڵی هاتە جۆش و بیری لە شەڕ کردەوە. دوو دڵ بوو لەوەی کە دووی کوڕەکەی زیوس بکەوێ

یان قەسابخانەیەك بۆ لیسیان و ڕابەرانیان دابنێ. دیارە لە چارەی ئۆدیسیوس نەنووسرا بوو کە کوڕەکەی زیوس بکوژێ، بۆیە ئەتینا لە دڵی نا کە پەلاماری سوپای سەرەکی لیسییەکان بدات. ئەوەبوو کورانوس و ئالاستور و کرومیوس و ئالکاندروس و هالیوس و نومون و بریتانیس)ی لێکۆشتن. خۆ ئەگەر هیکتۆری مەزنی نەبینایە کە بەجلی جەنگ و مەتاڵ و سوپەر و زرێوە بەرەو ڕیزەکانی پێشەوەی شەڕ دەهات و ترسی دەخستە دڵی دانابییەکانەوە، دەیتوانی زۆری دیکە لە لیسییەکان بکوژێت.

بەڵام ساربیدون کە ئەوی بینی نزیك دەبێتەوە زۆر دڵی خۆش بوو، و لەبەری پاڕایەوە و گوتی: "ئەی کوڕی بریام، لێرە بەجێم مەهێڵە و با نەکەومە بەردەستی داناییەکان. فریام بکەوە، لێرە دوورم بخەوە، ئەگەر قەدەر وای هانی نەگەڕێمەوە بۆماڵی خۆم، بۆ وڵاتی خۆم و دڵی ژنە ئازیزەکەم و کوڕە ساواکەم خۆش بکەم، با لە شارەکەی تۆدا ڕوحم دەربچێ."

(٦٨٩) هیکتۆر هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، بەڵکو زیاتر تاویدا بۆ پێشەوە تا ڕاستەوخۆ خۆی بەئاخییەکاندا بدات و زۆرترین ژمارەیان لێ بکوژێت. هەنگێ هاوڕێکانی (ساربیدون)یان دوورخستەوە و لەژێر دار بەڕویەکدا، دارە بەرز و جوانەکەی زیوس دا دایاننا. (بیلاگون)ی دۆست و هاوڕێی نێزەکەی لە ڕانی دەرهێنا، لێ ساربیدون دوا هەناسەی دا، و تەمومژی مەرگ نیشتە سەر چاوی.بەڵام جارێکی دی ژیایەوە، چونکە کە سروەی شەماڵ لە لەشی دا، سەرلەنوێ ژیانی وەبەر خستەوەو وەهۆش هاتەوە. (٦٩٩) جا لەو دەمانەدا ئارگۆسییەکان لەژێر گوشاری ئەریس وهیکتۆردا نە بەرەو کەشتییەکانیان پاشەکشەیەیان دەکرد،و نە پەلاماری تەروادەییەکانیان دەدا، بەڵام کە زانیان (ئەریس)ی خواوەندی جەنگ لەگەڵ تەروادەییەکاندایە، ڕوو لە دژمن و پاشە و پاش کەوتنە کشانەوە. مابزانرێ کێ بوون یەکەمین و دوایەمین کوژراوانی دەستی ئەریس و هیکتۆر؟ بریتی بوون لە( تیوتراس)ی ئازا،( ئوررستیس)ی عارەبانچی بەناوبانگ،( تریخوس)ی جەنگاوەری ئیتولی، ئونومارس و هیلینسونی کوڕی ئونوبس و ئورسبیوسی خودان کەمەربەندی بریقەدار، کە خاوەنی سەروەت و سامانێکی فرە بوو، و لە نزیکی دەریاچەی سیفیزدا ئاکنجی بوو و دراوسێی بوتیانییەکانی نزیکی خۆی بوو، کە زەوی و زارێکی فرە و بەپیت و بەرەکەتیان هەبوو.

(٧١١) کاتێ هیرا بینی ئارگوسییەکان بەو شێوەیە دەکەون و دەگلێن بەئەتینای گوت:

هاوار بەماڵم، ئەی کیژی زیوسی سوپەر بەکۆڵ، زیوسی هەمیشە تازە نەفەس، ئێمە بەڵێنمان بەمینیلاوس دا کە تا شاری ئیلیون (تەروادە) وێران نەکات ناگەڕێتەوە. بەڵام ئەگەر کار وا بڕوات و ئێریس)ی خواوەندی جەنگ بەم شێوەیە کەرب و کینی خۆی بڕێژێ، ئەوا بەڵێنەکەمان نایەتەدی. با ئێمەش ڕاستەوخۆ بچینە ناو ئەم جەنگەوە."

(۷۱۹) ئەتینا سەرپێچی نەکرد. هەنگێ هیرای کیژی کرونوس کەوتە ئامادەکردنی ئەسپە مل بەزێڕەکانی. (هیبی)ش خێرا تەگەرە خڕە برونزیەکانی خستنە ژێرعەرەبانەکە. چێوەی تەگەرەکان زێڕی ئاوێتە بوو، کە چوارچێوەیەکی برونزی سەیری بەسەردا درابوو. تەوەری تەگەرەکان لەزیو بوو، لە هەموو لایەکەوە بەدەوری ئەکسلێکدا دەسوڕایەوە. عەرەبانەکە بەخۆی لە زێڕ و زیوی ئاوێتە دروست کرابوو، زرێیەکی بەرزی دوو لۆی بەدەورا درابوو. مژانێکی زێڕ لە عەرەبانەکە هاتبووە دەرێ و هیبی نیرێکی زێڕی بەسەرییەوە بەست، هەوسار و قایش و قروشی زێڕین و جوانی لێوە ڕەت کرد. ئەنجام هیرای تامەزرۆی پەلامار و نەعرەتەی جەنگ ئەسپە ڕەهوانەکانی خستنە ژێر نیر

(۷۲۳) (ئەتینا)ش لەو ماوەیەدا جبە بەنەخش و نیگارەکەی، کە بەدەستی خۆی نەخشاندبووی و دروویبووی، لە ژورەکەی بابی داکەند، و ئەوجا زرێکەی زیوسی بابی لەبەرکرد و بۆ شەڕ تەیار بوو. ئەوسا سوپەرە ڕیشوداره سامناکەکەی دا بەشانیا، سوپەرەکە یەکپارچە بەشتی سامناك نەخشێنرابوو، وەکو خواوەندانی هەڤڕکبازی، شەڕەنگێزی، ئازایەتی و ڕەدوونانی ئەوتۆ کە خوێنی لە دەماری پیاو دەماسان، ئەمە جگە لەسەرە سامناکەکەی میدوزای گورگون، کە هەر کەسێك سەیری بکات، ترس و لەرز دایدەگرێت، ئەمە ئەو سەرە بوو کە نابووی بەسپەرەکەی (زیوس)ی بابییەوە. ئەتینا کڵوخودێکی دوو شاخی لەسەرنا کە چوار ڕیشوی بەپشتا پێدا شۆڕ بوو بووەوە- کە وێنەی جەنگاوەرانی سەد شاری لەسەر نەخشێنرا بوو، ئەوجا سەرکەوتە سەر عارەبانەکە کە گڕی لێهەڵدەستا، ڕمە قورس و بتەوەکەی گرت بەدەستییەوە، لەهەر لەشکرێك ڕازی نەبوایە بەو ڕمە سەرکوتی دەکرد. هیرا بەپەلە ئەسپەکانی بەر قامچی دا. دەروازەکانی ئاسمان خۆبەخۆ کرانەوە، ئەو دەروازانەی کە خواوەندانی کات پاسەوانیان دەکردن. ئەو خواوەندانە لەلایەن ئاسمانی مەزن و ئۆڵەمپەوە دانرابوون کە ئەم دەرگایانە لە هەورێن گەواڵ گەواڵ بکەنەوە و دابخەن، بەو جۆرە خەڵکی بۆ ئۆڵەمپ و ئاسمانی پان و بەرین بنێرن، یان لەوێندەرەوە وەدەریان بنەن.جا جووتە خواوەند، هیرا و ئەتینا بەئەسپە

رمەکانیانەوە لەم دەروازەیەوە وە ژوور کەوتن، دیتیان کوڕی کرونوس، بە تاقی تەنێ لەسەر بەرزترین لوتکەی ئۆڵەمپ دانیشتووە.

هیرا لەوێدا ئەسپەکانی ڕاگرت و ڕووی کردە زیوسی کوڕی کرونوس، سەرداری عالەم و گوتی: "بابە زیوس تۆ لە ئەریس توڕە نیت، لەسەر ئەم هەموو کارە توند و تیژەی. حەیف و مەخابن بۆ سوپای ئاخییەکان، کە بەو شێوەیە و بێ هیچ پاساوێکی ماقوڵ قڕ بکرێن. زۆرم لە بەرگرانە، کەچی ئەفرۆدێتی کوبرسی و ئەتینا کەیفیان بەدیتنی کارەکانی ئەم خواوەندە شێتە، ئەریس دێت و بۆ ئەم کارە خراپانەی هاندەدەن. بابە زیوس توڕە نابێت ئەگەر من لە ئەریس بدەم و لە شەڕگەکەی دوور بخەمەوە.؟"

(٧٦٤) زیوس وەڵامی دایەوە: "ئەتینای بکە بەگژدا، چونکە زۆر جار لەسەرکاری دیکەش سزای داوە."

(٧٦٧) هیرا بەقسەی کرد. ئەوجا قامچییەکی لە ئەسپەکان دا، ئەسپەکان بێ ئەوەی چ شتێك خۆی لە ڕێگەیاندا بگرێ دەرپەڕین، و ڕێگەی بەینی زەوی و ئاسمانی پڕستێرانیان دەبڕی. مرۆڤ کە لە لوتکەیەکی بەرزەوە دەڕوانێتە دەریایەك چەندی پێ دەچێت، ئەسپە خواییەکانیش بەدەم حیلاندنەوە بەهەمان ماوە ڕێگەکەیان بڕی. و کاتێ گەیینە تەروادە، هیرا لەو شوێنەی کە هەردوو ڕوباری سیمویس و سکاماندروس یەکانگیر دەبن لایدا و ئەسپەکانی لە عەرەبانەکە کردەوە. لە هەورێکی توندییەوە هاڵاندن، ڕوباری (سیمویس)ش پاوەنێکی خوایی بۆ ئامادەکردن تا لێی بلەوەڕن. هەنگێ هەردوو خواوەندەکە وەکو جووتێ قومری بەتاسەوە لە شەقەی باڵیان دا. تا بچنە هیمدادی ئارگوسییەکان.

کە گەییشتنە ئەو شوێنەی گەلێك لە جەنگاوەرە دلێرەکان لە دەوری (دیومیدس)ی پاڵەوان خڕبووبوونەوە، جەنگاوەرەکان لە شێرانی درندە یان لەو بەرازە کێویانە دەچوون کە ماندوو بوون نازانن، هیرا لەوێندەر وەستا، لە شێوەی (ستینتور)ی جارچیدا، کە بانگ و هاواری هاوتای بانگ و هاواری پەنجا پیاو بوو، ڕووی کردە ئارگوسییەکان و هاواریکرد: "ئەی ئارگوسییەکان، ئەوە شەرم لە ترسنۆکی خۆتان ناکەن، تومەز هەر بەڕواڵەت ئازان، تا ئەو کاتانەی (ئەخیل)تان لەگەڵ بوو، نێزەکەی سامی دەخستە دڵانەوە، تەروادەییەکان نەیاندەوێرا پێ لە دەرگاکانی داردانی بێننە دەرێ، کەچی ئێستا لە دەرێ و لە دووری شارەکەیاندا هێرش دەکەن و لەلای کەشتیەکانتانا دەجەنگن."

(٧٩٢) بەو قسانە ورەی بەرزکردنەوە و وزاتی وەبەرخستن، ئەتیناش بەپەلەچوو بۆلای

کوڕەکەی تیدیوس، لە نزیکی عەرەبانە و ئەسپەکانیا بینی خەریکی تیماری ئەو زامە بوو کە باندراوس لێی کردبوو. ئارەقەی ژێر ئەو قایشە پانەی کە زرێکەی پێ بەستبوو نارەحەتی دەکرد. دەستی ماندوو بوو، قایشەکەی بەرز دەکردەوە و خوێنە ڕەشەکەی دەسڕی. ئەتینا دەستی خستە سەر نیری هەردووك ئەسپەکەی و گوتی: "کوڕی تیدیوس لە بابی ناچێت. ڕاستە تیدیوس پیاوێکی وردیلە بوو، بەڵام جەنگاوەرێکی دلێر بوو. بێباکانە بەرەو پیری شەڕ دەچوو. تەنانەت جارێکیان کە وەکو قاسید بەتەنێ بۆ شاری تیبە، بۆ ناو کادوموسیەکان هات، ئەمرم پێکرد کە وەکو میوانێکی ئارام و هێمن لەسەر خوانیان دانیشێت، بەڵام ئەوی هەمیشە بێباك و مەیدانخواز لاوانی کادوموسیانی هێنایە گیروگاز

(٨٠٢) و یەکسەر بۆڕیدان و بەسەریاندا سەرکەوت، چونکە من یارمەتیمدا. جا من تای تۆش دەگرم و کۆمەکت دەکەم. ئەمرت پێدەکەم یەکسەر بچۆرە شەڕی تەروادەییەکان؛ جا وادیارە یان شەکەتی، یان لە ترسا دڵت پێ نەماوە، جا ئەگەر وابێ ئەوا تۆ لە (تیدیوس)ی کوڕی ئونیوس نیت."

(٨١٤) دیومیدس وەڵامی دایەوە: "خواوەندا دەتناسمەوە، ئەی ئەو کەسەی زرێکەی بابی هەڵگرتووە، چی بێ لە تۆ نهێنێ. ئەوەی زاتی لەبەر بریوم نەترسە، و نە گومان و دوودڵی، من ئامۆژگارییەکانی تۆم لە بیرماوە. تۆ بەخۆت ئاگادارت کردمەوە کە شەڕی هیچ خواوەندێکی موبارەك نەکەم. بەڵام ڕێگەت پێدام کە ئەگەر کیژەکەی زیوس، ئەفرۆدێت هاتە مەیدانی شەڕ، بەنێزەکەم زامداری بکەم. بۆیە ئێستا دەستم لەشەڕ هەڵگرتووە و فەرمانم بەئارگۆسییەکان داوە هەموو لێرە خڕببنەوە، چونکە دەزانم ئێستاکە ئەریس پێشەنگ و ڕابەری شەڕەکەیە." ئەتینا وەڵامی دایەوە: "ئەی دیومیدس، ئەی کوڕی تیدیوس، نە لە ئەریس و نەلە هیچ خواوەندێکی دیکە مەترسە، چونکە من پشتت دەگرم. یەکسەر بەرەو ئەریس تاو بدە، بەگژیا بچۆ، لەم شرشێتە تورەیە، لەم کۆگەی کەرب و کینە مەترسە، جارێك لەم دیوەوە و جارێك لەو دیوەوە پەلاماری بدە. ئا ئێستا زیوس قسەی بۆ هیرا و بۆ من دەکرد و دەیگوت یارمەتی ئارگوسییەکان دەدات و پەلاماری تەروادەییەکان دەدات، دەنا پشتی تەروادەییەکان دەگرێت و ئارگوسییەکان لەبیر دەکات."

(٨٣٥) ئەو قسەیەی کرد و بەدەستی خۆی (ستینیلوس)ی گرت و لە چاو تروکانێکدا

دنیایە سەر زەوی، بەخۆشی سەرکەوتە سەر عەرەبانەکە و لە تەنیشی (دیومیدس)ەوە وەستا. ئەکسلی عەرەبانەکە کە لە دار بەڕوو چێکرا بوو لەژێر قورسایی خواوەندی سامناك و (دیومیدس)ی نەرە قارەماندا کەوتبووە جیرە جیرێکی بەرز، ئەتینا بالاس هەوسارەکانی گرت و کەوتە قامچی وەشاندن و ڕاستە و ڕاست بەرەو ئەریس چوو. ئەریس خەریك بوو زرێکەی لە (تیریفاس)ی کوڕی ئوخیسیوس، کە دلاوەرترین جەنگاوەری ناو ئیتولیان بوو، دادەمالی. بەڵا (ئەریس)ی خوێنرێژ چەك و ئەسلەحەکەی لێ دەداماڵی. ئەتینا بۆ ئەوەی ئەریس نەیبینێ. کێوخودەکەی هادیسی لەسەرناو لە چاوی ئەریس ون بوو. ئیدی ئەریس، دیومیدسی بینی، فیریفاس"ی بێگیان و ڕوحی لەو گوڕە بەجێهێشت و یەکراست ڕووی کردە دیومیدس. کە لە یەکدی نزیك بوونەوە ئەریس ڕمەکەی سرەواندە نیر و هەوساری ئەسپەکان

(٨٥٢) پێی وابوو بەو نێزەیە گیان لەبەر دیومیدس دەبڕێ، بەڵام ئەتینا بەدەست نێزەکەی گرت و کارێکی وای کرد بەسەلامەتی بەسەر عەرەبانەکەدا تێپەڕێ. ئەوجا دیومیدس نێزەی خۆی هاویشتێ، ئەتینا باڵاس ڕمەکەی ئاراستەی سکی ئەریس کرد، ڕێك بەر ئەو شوێنە کەوت کە کەمەربەندی لێ بەستبوو. دیومیدس زامداری کرد، و گۆشتە جوانەکەی جنی و ئەوجا نێزەکەی لێ دەرهێنایەوە. ئەریس زیراندی و هاواری لێ بەرزبووەوە،هاوارێکی ئەوتۆ لە تۆ وایە هاواری نۆ تا دە هەزار جەنگاوەری مەیدانی شەڕە. ئاخیایی و تەروادەییەکانی دڵیان داخورپا، هاوارەکە زۆر ترسناك بوو.

(٨٦٤) وەکو چۆن پەڵە هەورێکی تاریك دوای شەپۆلە گەرمایەك بایەکی توند ڕایدەماڵا و لە هەورەکانی دیکەی جیادەکاتەوە، بەو ئاوایە ئەریس بەبەرچاوی (دیومیدس)ەوە بەرەو ئاسمانی بەرین بەرزبووەوە. زۆر بەپەلە گەییە وڵاتی خواوەندان، گەییە ئۆڵەمپی هەڵەموت، بەئازارەوە لای (زیوس)ی کوڕی کرونوس ڕۆنیشت، زامەکەی نیشانی زیوس دا کە چۆن خوێنی نەمری لەبەر دەڕۆیی، کەوتە پارانەوە و گوتی: "بابە زیوس، تۆ لەم کارانە تووڕە نیت؟ ئێمەی خواوەندان هەمیشە زاڵمانە دژی یەکدی دەوەستین، کەچی بەقازانجی بەشەران کار دەکەین، ئێمە هەموومان لە تۆ زویرین چونکە تۆ ئەو کیژە سەرشێتە، زماندرێژە شرندەیەت خستوەتەوە کە هۆش و بیری هەر لە لای ئەم جۆرە بەدکاریانەیە. هەموو خواوەندەکان لە ئەمر و ڕای تۆدان، تەنیا ئەم نەبێ کە نە گازاندەی لێدەکرێ و نە سزا دەدرێت، تۆ دەست بەپشتیا دەدەیت، جلەوی بۆ شل دەکەیت

چونکە ئەم خەلقەندە سەر شێتە کچتە. بڕوانە چۆن (دیومیدس)ی لەخۆبایی هاندەدات، وبەگژ خواوەندانی نەمریدا دەکات. هەوەڵجار پەلاماری کوبرسی دا و مەچەکی زامدار کرد، ئێستاش ئەوەتا وەکو ئەوەی خوا بێ پەلاماری منی داوە. خۆ ئەگەر لە دەستی هەڵنەهاتبام دەبوا تائێستاش لەناو خەرمانی لاشەێن بۆگەندا، لە مەیدانی شەڕەکەدا بکەوتبام، یان لەژێر زەبری نێزەدا شنگ و توانام لێ ببڕایە."

(٨٨٨) زیوس بەتوڕەییەوە لێی ڕوانی وگوتی: "لاکەوە لای منەوە، نامەوێ گوێم لە گریان و زاریت بێ، جەنابی دوو ڕوو. زۆر لێت بێزارم، ئەوەندەی لەتۆ بێزارم لە هیچ خواوەندێکی ئۆڵەمپ ئەوەندە بێزار نیم، چونکە تۆ هەمیشە هەر سەرقاڵی شەڕ و شەڕەنگێزیت، تۆ گیانی لاساری و بزێویت، و دڵرەقیت لە (هیرا)ی دایکتەوە بۆ ماوەتەوە: کە هەرچیم کرد و کۆشا بۆم کۆنترۆڵ نەکرا. پێم وایە ئەم دەرد و ئازارەی تۆ ئێستا دەیچەژی زادەی قسە و ڕێنوێنییەکانی ئەوە.

(٨٩٥) بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانم ئەم دەرد و ئازارەت تەحەمول بکەم، چونکە تۆ توخمی منی، دایکت تۆی لەمن بووە، ئەگەر کوڕی هەر خواوەندێکی دیکە بای، و خودانی ئەم تەبیعەتە شەڕانییە بای، ئێستا لەژێرزەمینێکی قوڵتر لەژێرزەمینی تیتانە زەبەلاحەکاندا زندانی دەبوویت."

(٨٩٩) ئەوجا فەرمانی بەبایون دا کە تیماری بکات، بایون هەندێ داو و دەرمانی ئازارشکێنی لە برینەکە ناو چاك بووەوە، چونکە وەکو برینی بەشەران نەبوو. وەکو چۆن شیلەی درەختی هەنجیر چڕی شیر زیاد دەکات و بەجوڵاندنێك دەماسێ، بەهەمان شێوە و خێرایی بایون زامەکەی (ئەریس)ی سەرشێتی تیمار کرد. ئەوجا هیبی شۆردی و جلوبەرگی جوان و لایەقی لەبەرکرد، و لەلای زیوسی بابییەوە کە پرشنگی شکۆمەندی دەدا، داینیشاند.

(٩٠٧) ئەوجا هیرای ئارگوسی و ئەتینای ئالالکومینی، دوای ئەوەی سنورێکیان بۆ کاری خوێنرێژی ئەریس دانا، بەدوو قۆڵی بۆ بارەگاکەی زیوس گەڕانەوە.

# سروودی شەشەم

## هیکتۆر دوعاخوازی لە ئەندرۆماك دەكات

**حیكایەتەكە:**

**گریكەكان جۆش و خرۆشیان تێكەوت و چەند هێرشێكی توندیان كردە سەر تەروادەییەكان و دەیان كەسیان لێكوشتن. لەنێو ئاخییەكاندا قارەمانێك هەڵدەكەوێ و دەردەكەوێ بەناوی دیومیدس كە قارەمانان دەكوژێت و ترس و لەرز دەخاتە دڵانەوە. تەروادەییەكان ناچار دەبن لەژێر گوشاری گەورەی شەڕدا سووكە پاشەكشەیەك بكەن. هیلینوس، هێكتۆری برای و جەنگاوەر ئینیاس دەبینێ. داوا لە هیكتۆر دەكات بگەڕێتەوە بۆ تەروادە و تكا لە هیكوبای دایكی بكات كە ژنانی تەروادە كۆبكاتەوە و بەنرخترین جلكی خۆی لەبەر پێی خواوەند ئەتینا بالاس، لە پەرستگەكەیدا دابنێت، و لێی بپاڕێتەوە كە ئەگەر بەڵای ئاخییانیان لە كۆڵ بكاتەوە و تەروادە و ژنان و مناڵانی تەروادە بپارێزێ ئەوا سەد گوێرەكەی یەك ساڵی بۆ دەكات بەقوربانی. لە مەیدانی شەڕدا دیومیدس قارەمانێكی تەروادەیی (گلوكوس) دەبینێ. دەترسێ لەوەی لە ڕەچەڵەكی خواوەندن بێ، لێی دەپرسێت كە ئاخۆ بەشەرە یان خواوەندە، چونكە دەترسێت شەڕی خواوەندان بكات. كاتێ گلوكوس ڕەگ و ڕەچەڵەكی خۆی بۆ كەشف دەكات، دەردەكەوێ كە بنەماڵەكانیان دۆستی یەكتر بوون، ئیدی هەردوك قارەمان پەیمان دەدەن كە شەڕی یەكتر نەكەن، و جا بۆ ئەوەی یەكتر بناسنەوە، مەتاڵەكانیان گۆڕییەوە، گلوكوس ئەوەی بیردەچێت كە سوپەرەكەی ئەو زێڕ بوو و ئەوەكەی دیومیدس برونز بوو. هیكتۆر بۆ تەروادە دەگەڕێتەوە و تكا لە دایكی دەكات ئەوە بكات كە براكەی داوای كردبوو، سەرە ژنانی تەروادەیی كۆدەكاتەوە و دەچێت بۆ پەرستگەی ئەتینا، و جلێكی جوان كە باریسی كوڕی لەو سەفەرەیدا كە هیلینی لەگەڵ خۆدا هێنابوو، بۆی هێنابوو، لەگەڵ خۆیدا دەبات. ئەوجا دەچێت بۆ ماڵی باریسی برای، دەبینێ خەریكی كەوانەكەیەتی و هیلینیشی لەگەڵە، سەرزەنشتی دەكات و پێی ڕادەگەیەنێ كە نابێ لە شەڕەكە دوابكەوێ تا تەروادەیی و**

هاوپەیمانەکانیان لێی تورە نەبن. باریس وەزع و حاڵی خۆی بۆ باسدەکات و بەڵێنی دەداتێ کە بەرلەوەی ئەو بگاتە مەیدانی شەڕەکە ئەمیش بەدوویا دێت. ئەوجا دەچێت بۆ ماڵی خۆی و ئەندروماکی ژنی نابینێ، کارەکەرەکان پێی ڕادەگەیەنن کە لەگەڵ دایەنەکەی و کوڕە چکۆلەکەیا چووە بۆ بورجی شار. هیکتۆر دەچێ بۆلای، دەکەونە قسان، ئەندروماك داوای لێدەکات کە ئاگای لە خۆی بێ و دڵی خەبەری داوەتێ کە نایبینێتەوە بۆیە دەبێ فەرمان بەسوپا بدات بۆ لای دار هەنجیرەکە پاشەکشە بکات، چونکە ئەوێ خاڵی لاوازی شورەکەیە، و ئاخییەکان چەندین جار پەلاماریان داوە. وەڵامی دەداتەوە کە ئەمەیان لە بیرە و حسابیان بۆ کردوە، ئەم دەبێ ئاگای لە خۆی و کاروباری ماڵەکەی بێ. ئەوجا دەڕوانێتە مناڵەکەی کە بەباوەشی دایەنەکەوە دەبێ، دەست درێژ دەکات لە باوەشی بگرێ، مناڵەکە کە ڕیشوی کڵاوخودەکەی دەبینێ دەترسێت و دەگری. هیکتۆر پێدەکەنێ و ئەندروماك بەدەم فرمێسکەوە بزەیەك دەکات. ئەوسا کڵاوخودەکە دادەکەنێ و لە ئەرزەکەی دادەنێ و مناڵەکەی لە هەمێز دەگرێت و جۆلانەی پێدەکات، ئەوجا دەیداتەوە بەدایەنەکە، و خەمەکانی خۆی بۆ ژنەکەی دەردەبڕێ، و پێی ڕادەگەیەنێ کە دەزانێت خواوەندان چارەنووسی مرۆڤ لە یەکەم ڕۆژی لە دایکبوونیەوە دیاری دەکەن، بۆیە زۆر بیر لە مردنی باب و داك و برا و خوشکەکانی ناکاتەوە، و بیر لە وێرانبوونی تەروادەش ناکاتەوە، بەڵکو بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن ئەو (ئەندروماك) بەدیلی دەبرێ و فەرمانی خانمەکەی جێبەجێ دەکات، و چارەنووسی کوڕەکەی چۆن دەبێت. ئەوجا لە زیوس دەپاڕێتەوە کە کوڕەکەی بکات بەقارەمانێکی ئەوتۆ کە خەڵکی دیتیان بڵێن ئەم کوڕە لە بابی باشترە. ئەوجا باوەش بەژنەکەیدا دەکات و دوعاخوازی لێدەکات و بەرەو دەشتەکە، بۆ مەیدانی شەڕەکە دەڕوات، ئەریس خۆی دەگەیەنێتێ و بەجووتە دەچنە مەیدانی شەڕەکە.

کات:

بەشێکی ڕۆژی بیست و سێیەمینە، پاشماوەی سروودی پێشووە.

شوێن: ڕووداوەکان لەو دەشتەدان کە شەڕەکەی لە بەینی ڕووباری گەورەی سیمیوس و ئیکسانتوس دا تیادەکرێ، ئەوجا دیمەنەکە دەگوازرێتەوە بۆ کۆشکەکەی بریام لە تەروادەدا.

(١) شەڕ لەنێوان تەروادەیی و ئاخییاندا هەڵگیرساو تەواو گەرم بوو، لێرە و لەوێ، لە پێدەشتەکەدا و لەنێوان هەردوو ڕوباری سیمیوس و ئیکسانتوسدا پەرەی دەسەند و جەنگاوەران دەست بەنێزە و ڕمان هەڵیاندەکوتایە سەر یەکدی.

(٥) هەوەڵجار (ئاجاکس)ی کوڕی تیلامون، قەڵای هێزی ئاخیاییەکان، شەبەقێکی خستە ڕیزی جەنگاوەرانی تەروادەییەکان، و بەمە کێوڕۆژنەیەکی هومێدی لە هاوڕێکانی کردەوە، چونکە ئاکامسی کوڕی یوسوروسی کوشت کە گەورەی تراقیەکان بوو، پیاوێکی ئازای کەتەو بەقەد و باڵا بوو. یەکەمجار ئاجاکس جەزرەبەیەکی بەترۆپکی کێوخودەکەیدا کێشا: نووکە برونزییەکەی ڕمەکە کێوخودەکەی بڕی و نێوچەوانی شەق کرد و گەییە مێشکی، ئیدی تاریکی باڵی بەسەر چاوەکانیا کێشا.

(١١) ئەوجا دیومیدس، (ئەکسیلوس)ی کوڕی( تیوترانوس)ی کوشت، ئەمە پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، لە شاری ئەریسبەی مکومدا دەژیا، خۆشەویستی هەمووان بوو، ماڵەکەی لەسەرە ڕێگا بوو، و بۆ هەموو میوانێك کراوە بوو، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ یەکێك لەو میوانانە بەهانایەوە نەهات تا ژیانی بپارێزێ، ئیدی دیومیدس خۆی و( کالیسیوس)ی خوڵامی کوشت کە لەو کاتەدا ئەسپەکانی بۆ داژۆت، و هەردوکیان لەسەر عەرەبانەکەوە کەوتنە سەر عاردەکە.

(٢٠) هەروەها یوریالوس، هەردوك دبیسوس و ئوفیلیتوسی کوشت، ئەوجا کەوتە تاقیبی هەردوك ئیسیبوس و بیداسوس، کە زادەی جووتبوونی پەری دەریایی ئاباربارە و بوکلیون بوون.بوکولیون، کوڕی گەورەی لاومیدون بوو، بەڵام کوڕی ناشەرعی بوو. کاتێ بۆکولیون کەشتییەکەی ئامادە دەکات، لەگەڵ پەریدا قسان دەکات، و..ئیدی سکی پڕ دەبێت و ئەو جمکانەیەی لێ دەبێت، کە ئێستا کوڕی میکیستوس کوشتنی و سوپەر و ئەسلەحەکانی لێ داماڵین.

(٢٨) ئەوجا بولیبویتیس، ئەستیالوسی کوشت. ئودیسیوس، بیدوتیس خەڵکی بیرکوتیی کوشت. و تیوسیر ئەریتاونی کوشت. ئەبلیروس بەنێزەی ئەنتیلوخوسی کوڕی نەستور کوژرا. شا ئاگامەمنون، ئیلاتوسی کوشت کە خەڵکی تیداسوسی نزیکی ڕوباری ستانیوس بوو. لیتوس، فیلانکوسی لەو دەمەدا کوشت کە دەرەڤی. یوریپیلوس، میلانتوسی کوشت. ئەوجا مینیلاوس نەرەشێری مەیدان، ئەدراستوسی بەزندویەتی گرت، چونکە ئەسپەکانی بەدەم ڕاکردنەوە عەرەبانەکەیان کێشابوو بەدار گەزێکدا، ئیدی عەرەبانەکە شکابوو، و

هەردوو ئەسپەکە بەر بوون بوون و لەگەڵ هەسپانی هەڵاتوی دیدا بەرەو شار ڕۆییشتن، بەڵام ئەدراستوس وەرگەڕا و بەدەما گلا و لە نزیکی تەگەری عەرەبانەکەیدا کەوتەوە، مینیلاوس نێزە بەدەست بەرەو ڕووی هات، بەڵام ئەدراستوس باوەشی بەئەژنۆکانیا کرد و لێی پاڕایەوە کە نەیکوژێ. گوتی: "ئەی کوڕی ئەتریوس مەمکوژە، لەجیاتی من سەربەهایەکی مۆڵ بۆ خۆت وەربگرە: بابم دەوڵەمەندە، گەنجینەی پڕ لە زێڕ و بڕۆنزی هەن، ئاسنێکی زۆری دەستکردی وەستاو هونەرمەندان لەماڵەکەیدا کەوتووە. خۆ ئەگەر بزانێ من زندووم و لە کەشتی ئاخییەکاندام، سەربەهایەکی مۆڵت لەو گەنجینانە دەداتێ."

(٥١) بەو جۆرە لێی پاڕایەوە، مینیلاوس دڵی پێی سوتاو دایە دەستی خوڵامەکەی خۆی تا بیبات بۆلای کەشتی ئاخییەکان، بەڵام ئاگامەمنون بەپەلە هات بۆلای، کەوتە سەرزەنشت کردنی، و گوتی: "ئەی مینیلاوسی دلۆڤان، ئێستا وەختی بەخشین نییە. ئەگەر کەسێکی تۆ بکەوتایەتە دەستی تەروادەییەکان، ئایا هەمان کاریان لەگەڵ دەکرد کە تۆ لەگەڵ ئەمەی دەکەیت؟ کەسیان مەبوێرە- تەنانەت مناڵی ناو سکی دایکانیش مەبوێرە، هەر هەموویان مەحو بکەوە، با ئیلیون (تەروادە) وێران بێ و ناو و ناوبانگی کوێر ببێتەوە."

(٦١) ئاوای گوت ئاگامەمنون، براکەی پێی قایل بوو، چونکە قسەکانی دۆغری بوون، بۆیە (ئەدراستوس)ی لەخۆی دوورخستەوە، ئاگامەمنون نێزەیەکی کرد بەقەبرغەیدا و کەوت: "ئەوجا کوڕی ئەتریوس پێی خستە سەر سینەی تا نێزەکەی لە لاشەکە دەربێنێتەوە.

(٦٦) لەولاوە نەستور هاواری لە ئارگۆسییەکان کرد و گوتی: "برادەرانی من، ئەی جەنگاوەرانی دانایی، یارانی ئەریس، کەس دوانەکەوێ و دەستکەوت بچنێتەوە و بۆلای کەشتییەکانی بەرێ، باجارێ تا دەتوانین لێیان بکوژین، پاشان کە دەستمان بەتاڵ بوو بەشێنەیی بگەڕێنەوە سەر مەیتەکان و ئەسلەحەکانیان لێ داماڵن و بیبەن.

(٧٢) بەو قسانە ورەو زاتی خستنەوە بەر. پێدەچوو تەروادەییەکان بیانەوێ پاشەکشە بکەن و بۆ ئیلیون (تەروادە) بگەڕێنەوە، بەڵام هیلینوس چاترین ڕازگۆ و پەنهان بین و فالبین، هیلینوسی کوڕی بریام خۆی گەیاندە هیکتۆر و ئینیاس و گوتی: هیکتۆر، ئینیاس، چونکە ڕابەریکردنی تەروادەیی و لیسیان بەر لەهەر کەسێك لە ئەستۆی ئێوەیە، ئێوە چ لە شەڕ و چ لە تەگبیر و ڕاوێژاندا لە پێش هەموانەوەن، جا سوپاکە لێرە ڕاگرن،

لەبەر دەروازەکان، دەنا هەموو دەڕۆن و خۆ لە باوەشی ژنەکانیان دەنێن، و دژمنمان پێ خۆشدەکەن. کە لەشکرەکانتان هاندا و ورەتان خستنەبەر هەنگێ لێرەدا دەچەقین و بەوپەڕی خۆڕاگرییەوە شەڕی دانایییەکان، چەند دڕ و بەهێزش بن، دەکەین، لەمەی زیاتر هیچ چارێکی دیکەمان نییە. ئەوسا هیکتۆر تۆ بچۆ بۆ شار و لەگەڵ دایکماندا قسان بکە، پێی بێ کۆمەڵێك لەسەرە ژنان لە پەرستگەکەی ئەتینا لە ئەکروبولیس خڕ بکاتەوە، ئەوجا پێی بێ کلیلەکەی بەرێ و دەرگاکانی پەرستگە پیرۆزەکە بکاتەوە و لەوێ، جوانترین جلی خۆی- جلێك کە لە هەموو جلەکانی تری زیاتر هەڵیگرتووە و تاقەتی کردووە، لەبەر پێی ئەتینادا دابنێ، و پێی بێ نەزرێك قەرار بدات و قەولی بداتێ کە ئەگەر ڕوحم بەشارەکەدا بکات و ژنانی تەروادەیی و مناڵەکانیان بپارێزێت و شەڕی کوڕی تیدیوس لە ئیلیونی شکۆمەند دووربخاتەوە، ئەوا لە پەرستگەکەی خۆیدا دوانزە سەر گوێرەکەی ناسکی یەکساڵەی بۆ بکاتە قوربانی، کوڕی تیدیوس، ئەو قێزەوەرە دڕندە مەزەب و دڵڕەق و سامناکەی کە پێم وایە سەلماندویەتی کە لە هەموو ئاخییەکان بەترەفترە. ئێمە بەم ڕادەیە لە کەس نەترساوین، تەنانەت لە ئەخیلی سەرکردەش کە دەڵێن دایکی خواوەندە. ئەم (دیومیدس)ە بەڵایە، پشم و غەزەبی بێ سنورە، و کەس نییە لە شەڕ و کوشتار و ئازایەتیدا شان لە شانی بدات."

(١٠٢) هیکتۆر بەگوێی براکەی کرد. بەهەموو تەدارەکی شەڕەوە خۆی لە عەرەبانەکە هەڵدایە خوارێ، کەوتە گەڕان بەسەر لەشکرەکەدا، بەدەم نێزە بادانەوە کەوتە هاندانی جەنگاوەرەکان بۆ شەڕ، بەدەنگێکی سامناك دەنگیدان، خڕبوونەوە و ڕووبەڕووی ئاخییەکان وەستان.

(١٠٨) ئارگۆسییەکان دەستیان لە کوشتار هەڵگرت و گەڕانەوە، چونکە پێیان وابوو یەکێك لە خواوەندان لە ئاسمانێ ڕا دابەزیوە و هاتۆتە هیمداد و هانای تەروادەییەکانەوە، بۆیە تەروادەییەکان بەو شێوەیە ورەیان هاتەوە بەر. ئەوجا هیکتۆر بەدەنگی بەرز ڕووی کردە ئاپورای تەروادەییەکان و گوتی: "ئەی تەروادەییان، ئەی هاوپەیمانان، ئەی یاران، پیاوانە شەڕ بکەن تا من دەچم بۆ ئیلیون (تەروادە)و بەردێن سپییانی ئەنجومەنی ڕاوێژکاری و هەروەها بەژنەکانمان دەڵێم کە نوێژبۆ خواوەندان بکەن و لەبەریان بپاڕێنەوە و پەیمانی سەد قوربانیان بدەنێ."

(١١٦) ئەو قسانەی کرد و کەوتەڕێ، بەدەم ڕێوە قەراخی چەرمینی سوپەرەکەی بەر ملی

و هەردوو پاژنەی پێی دەکەوت.
(١١٩) ئەوسا (گلوکوس)ی کوڕی هیبولوخوس، و کوڕەکەی تیدیوس چوونە مەیدانە کراوەکەی نێوان هەردوو لەشکرەکە تا ڕووبەڕووی یەکتر کە تەواو لە یەکتر نزیك بوونەوە و ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە. کە تەواو لە یەکتر نزیکبوونەوە ڕوو بە ڕووی یەکتر وەستان، (دیومیدس)ی جەنگبازی دەنگ دلێر یەکەمجار هاتە قسە و گوتی: "تۆ کێی ئەی پیاوی باش، تۆ لە توخم و تۆوی بەشەری؟ تا ئێستا تۆم لە مەیدانی شەڕاندا نەدیوە، کەچی وا بۆڕی هەمووانت داوە و بێباکانە هاتووی ڕووبەڕووی نێزەی من بوەستی. وای بەحاڵی ئەو باوکانەی کە کوڕەکانیان دێنە مەیدانی من و جەبەروتی من، چونکە ئەوانە لەسەر کوشتەی مناڵەکانیان دەگرین. خۆ ئەگەر یەك لە خواوەندانی و لە ئاسمانەوە هاتووی ئەوا من شەڕی تۆ ناکەم، چونکە تەنانەت (لیکورگوس)ی کوڕی (ریاس)ش کە شەڕی خواوەندانی کرد زۆر نەژیا. لیکۆرگوس دایەنەکانی (دیونیسوس)ە شێتی لە چیای پیرۆزی "نیسا" وەدەرنان، و کە لیکورگوس بەقامچی تێیان کەوتبوو، دارەکانیان توڕدابووە سەر ئەرز، (دیونیسوس)ش لە ترسا پێی وەغارێوە نابوو خۆی بەدەریادا کردبوو، و لەوێ تیتس لە باوەشی دەکات و دڵخۆشی دابووەوە، چونکە زۆر لە هەڕەشەکانی ئەو پیاوە ترسابوو. ئیدی خواوەندان کە لە ئاسودەییدا دەژیان، لە لیکورگوس پڕبووبوون و کوڕەکەی کرونوس دووچاری کوێری کردبوو، و کاتێ کە هەستی کردبوو هەموو خواوەندە نەمرەکان دەیبوغزێنن، دوای ماوەیەکی کەم دەمرێت!... بۆیە من شەڕی خواوەندانی موبارەك ناکەم، بەڵام ئەگەر لە تیرەی بەشەری و لەوانەی کە بەروبومی کێڵگە و مەزاریان دەخۆن، وەرە پێشەوە تا بەزووترین کات بادەی مەرگی خۆت بنۆشیت!"
(١٤٤) کوڕەکەی هیبولوخوس وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی کوڕی تیدیوس، بۆچی لە ڕەگ و ڕەچەڵەکم دەپرسیت؟ نەوە و نەژادی گەڵای درەختان و نەژادی ئادەمیزادان یەکسانە. گەڵای دار لە خەزانا بەدەم باوە دەڕژێ و دەکەوێتە سەر زەوی، بەڵام کە وەرزی بەهار دێ درەختەکە گەڵای تازە دەردەکاتەوە.
(١٤٩) چارەنووسی بنیادەمانیش بەو جۆرەیە، نەوەی تازە لە دایك دەبێت و نەوەی کۆن دەبڕێتەوە و لەناو دەچێت. جاوێڕای ئەوەش ئەگەر حەز دەکەی ئەوا گوێ بگرە تا ڕەگ و ڕەچەڵەکی من باشتر بزانیت، هەرچەندە زۆر کەس دەیزانن: شارێك لەناوجەرگەی ئارگوسدا هەیە، یەکپارچە پاوەنی هەسپانە، پێی دەگوترێ ئیفیرا، سیزیف کە زیرەکترین

و پڕ نیرەنگترین بەشەر بوو لەوێندەر دەژیا.

سیزیف کە کوڕی ئیولوس بوو، کوڕێکی هەبوو (کلوکوس)ی پێدەگوترا، ئەم گلوکۆسە بابی بیلیرفون بوو، کە ئاسمان (زیوس) قۆزی و جوانییەکی وەهای دابوێی کە بەکەسی نەدابوو. بەڵام برویتوس،توشی بەدبەختی کرد، چونکە لەو بەتواناتر بوو، لە قەڵەمڕەوی ئارگۆسییەکان وەدەری نا، ئەو قەڵەمڕەوەی زیوس ئەوی کردبوو بە حوکمڕان و فەرمانڕەوای. جا (ئەنتیا)ی ژنی برویتوس کەڵکەڵەی ئەوەی کەوتە سەر کە بەدزییەوە لەگەڵیا بخەوێ، بەڵام چونکە ئەو پیاوێکی سەلار و سەنگین و پیاوانە بوو ڕەفزی کرد و لەگەڵی نەکرد، ئەنتیا چوو لەلای بروتیوس بوختانی بۆ هەڵبەست. گوتی: "یا دەبێ بیلیروفون بکوژی، یان من دەمرم، چونکە ویستویەتی بە تۆبزی لەگەڵ مندا بخەوێ."

پاشا تورە بوو، بەڵام لە ترسی خواوەندەکان نەیکوشت، هەندێ ئاماژە و نیگارەی شوم و مەرگ ئامێزی دایێ و بۆ (لیسیا)ی نارد، پاشا تابلۆیەکی دایێ کە ڕاسپاردەی کوشتنی هەڵگرەکەی تیابوو، و داوای لێکرد کە ئەو تابلۆیە بگەیەنێتە خەزوری، کە داوای لێکردبوو بیلیروفون لەناوبەرێ؛ بیلیروفون بەرەو لیسیا وەڕێکەوت، و تا گەییە ئەوێ خواوەندان ڕێنوێنیان کرد.

(١٧٢) کە گەییە ڕوباری ئیکسانتوس لە لیسیا، پاشا زۆر بەگەرمی پێشوازی کرد، و نۆ دانە ڕۆژ میوانی ئەو بوو، و لەبەرخاتری ئەو نۆ گوێرەکەی سەربڕی، بەڵام لەگەڵ هەڵاتنی سپێدەی ڕۆژی دەیەمدا پاشا کەوتە پرسیار کردن لێی ویستی ئەو نیشانە و نیگارانەی کە (بروتیوس)ی زاوای بۆی نووسیوە، بدینێ. کە نیشانە و نیگارە شوومەکانی وەرگرت، ئەمری بە بیلیروفون کرد کە شەڕی (خیمیرا)ی ترسناك بکات، ئەم دێوە لە تیرەی بەشەران نەبوو، بەڵکو لە نەژادی پیر و پیرۆزان بوو، سەر و ملی هی شێر، کلکی هی ئەژدیها و بەدەنی هی بزن بوو، هەناسە ترسناکەکەی تین و تاوی گڕ و ئاگری هەبوو، بەڵام بیلیروفون چونکە متمانەی بەنیشانەکانی خواوەندان هەبوو، کوشتی. جاری دووەم خۆی لە شەڕی تیرەی سولیمیدا کە بەدڕی و دڕەندەیی بەناوبانگ بوو، تاقی کردەوە، و بەخۆی دانی بەوەدانا کە ئەمە قورسترین شەڕی ژیانی بووە.

(١٨٦) جاری سێیەم شەڕی ژنانی ئامازونی کرد و کوشتنی، ئەمانە ژنانێك بوون، وەکو پیاوان ڕەفتاریان دەکرد. بەڵام لە گەڕانەوەدا پاشا پیلانێکی دیکەی بۆ دانا کە پێی وابوو لێی دەرباز نابێت، ئازاترین جەنگاوەرانی هەموو قەڵەمڕەوی لیسیای هەڵبژارد و داوای

لیکردن بیخەنە بۆسەوە، بەڵام شتاقیان نەگەڕانەوە، چونکە بیلیروفون پاکی کوشتن. ئەوساکە پاشا زانی میوانەکەی دەبێ نەوە و نەتیرەی خواوەندێکی زۆر دلێر بێ، لە لیسیا هێشتییەوە و کیژەکەی خۆی دایێ، و نیوەی قەڵەمڕەوەکەی خۆی پێ بەخشی، ئیدی لیسیاییەکان گەورەترین پارچە زەویان دایێ، زەوییەك پڕ بوو لە ڕەز و باخ ،کێڵگە و مەزرا، تا بۆ خۆی ڕەنێوی بێنێ.

(١٩٦) جا کیژەکەی پاشا سێ منالّی لە بیلیروفون بوو، بریتی بوون لە: ئیساندروس، و هیبولوخوس و لاودامیا. زیوس، سەروەری ئەنجومەنی خواوەندان، لەگەڵ لاودامیادا خەوت، و ساربیدونی شکۆمەندی لێ بوو، بەڵام کە خواوەندان روویان لە بیلیروفون وەرگێڕاو بوغزاندیان، هیچی بۆ نەمایەوە ئەوە نەبێ سەری خۆی هەڵگرێ و بەتاقی تەنیا و سەرگەردان، دڵ پڕ لە خەم و ژان، دوور لە بەشەران بەناو دەشتی ئەلینی بکەوێ. (ئەریس)ی خواوەندی جەنگ هەر بەهەوەس شەڕێکی نایەوە و (ئیساندروس)ی کوڕی لەو دەمەدا کە شەڕی تیرەی سولیمی دەکرد کوشت، هەروەها (ئەرتیمس)ی خواوەندی شکار و لێڕەواران، خودانی ئەسپانی زێڕین هەوسار. لە دەمێکی تورەییدا (لاودامیا)ی کیژی کوشت، (هیبولوخوس)ش ئەوە بابی منە، کە بۆ تەروادەیی ناردم، چەندین جار ئامۆژگاری کردم کە لە ڕیزی پێشەوە بجەنگم و هەڤرکی جەنگاوەرانی هاوتای خۆم بکەم و عەیبە بەسەر خوێنی باب و باپیرانمدا نەهێنم، ئەو باب و باپیرانەی سەلماندویانە کە ئازاترین پیاو و جەنگاوەرن چ لە ئیفیرا و چ لە هەموو قەڵەمڕەوی لیسیادا. ئا ئەمە ئەو ماڵبات و ڕەگ و ڕەچەڵەکەیە کە من دەچمەوە سەری."

(٢١٢) ئاوای گوت. دیومیدس لە دڵی خۆیدا خۆشحاڵ بوو. نێزەکەی لە عاردی چەقاند و بەڕوییەکی خۆشەوە دواندی و گوتی: "کەواتە تۆ دۆستی دێرینەی ماڵباتی بابمی. (ئونیوس)ی مەزن جارێکیان بۆ ماوەی بیست دانە ڕۆژ میوانداری بیلیروفون)ی کرد، هەردوکیان دیاری و سەوقاتیان بەیەکتردا. ئونیوس کەمەربەندێکی درەخشانی ئەرخەوانی دا بەبیلیروفون، بیلیروفون)ش جووتێ پەرداخی زێڕینی دابوویێ، کە هاتم بۆ ئێرە (تەروادە) لە ماڵەوە بەجێمهێشتن. بەڵام( تیدیوس)م لەبیر نایەت، چونکە من هێشتا منالّ بووم کە ئەو کۆچی کرد، ئەو سەردەمەی کە سوپای ئارخییەکان لەبەردەم تیبەدا تێکشکا.

(٢٢٤) کەواتە من لە ئارگوسدا میوانی تۆ دەبم، و تۆش لە لیسیادا ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان

بۆ ئەویدەر گەڕامەوە، میوانی من دەبیت، جا با ئێمە، تەنانەت لە گەرمەی شەڕیشدا، لە نێزەی یەکدی حەرام بین، چونکە ئەگەر من لە کوشتن بم تەروادەیی وهاوپەیمانانی ناوداری تەروادەیی زۆرن چ لەوانەی بەگیریان دێنم و چ لەوانەی خواوەندان دەینێرنە بەردەستم، تا بیانکوژم، هەروەها سەبارەت بەتۆش هەر ئاخییان زۆرن گەر بتوانی بیانکوژیت، کەواتە با تەدارەك و مەتاڵەکانمان بگۆڕینەوە و هەر یەکەمان ئەو دۆستایەتییە دێرینەمان لەبیر بێ کە تا ئێستا بەردەوامە."

(٢٣٢) دوای ئەو قسانە هەردوکیان لە عەرەبانەکانیان دابەزین، و دەستی یەکتریان گوشی و سوێندی وەفاداریان بۆ یەکدی خوارد، بەڵام لەم دەمەدا زیوسی کوڕی کرۆنۆس ئەقڵی گلوکۆسی بەجۆرێ شێوان کە مەتاڵە زێڕەکەی خۆی بەمەتاڵێکی برونزی گۆڕییەوە، لە کاتێکا سوپەرەکەی خۆی بایی سەد سەر گا دەبوو، و هینەکەی دیومیدس تەنیا بایی نۆ سەر گا بوو.

(٢٣٧) لەو کاتەدا هیکتۆر گەییە دەروازەکانی قەڵای شار و بەر دار بەڕووەکە، ژنان و کیژانی تەروادەیی بەپەلە هاتنە پێشوازی و لە حاڵی کوڕ و برا و خزم و مێردەکانیان پرسی. داوای لێکردن کە نوێژ بۆ خواوەندەکان بکەن و لەبەرقاپی هەر خواوەندێك بپاڕێنەوە، کە گوێیان لەو قسانە بوو، خەم زۆربەیانی داگرت.

(٢٤٢) هیکتۆر بەپەلە خۆی گەیاندە کۆشکەکەی شا بریام، ئەم کۆشکە لەسەر چەندین پایەی جەلایی کراو رۆنرا بوو. پەنجا ژووری نووستنی تیابوو- هەموو ژوورەکان لەبەردی جەلایی کراو بوو. ژوور لە تەنیشت ژوور دروست کرابوو، هەر ژوورێك کوڕێك و بووکێکی بریامی تیا دەنووست، بەرامبەر بەم ژوورانە و بەدەستی ئەوبەری داڵانەکەوە، دوانزە ژووری جەلایی کراوی دیکە هەبوو، بەتەنیشتی یەکەوە دروست کرابوون، لەهەر ژوورێکدا کچێك و زاوایەکی بریام دەنووستن. کە هیکتۆر گەییە ئەوێ هیکۆبای دایکی و کیژە هەرە جوانەکەی، واتە لاودیلی بەپیرییەوە هاتن. هیکۆبای دەستی هیکتۆری لەنێو دەستی خۆی ناو گوتی: "کوڕی خۆم، بۆچی شەڕەکەت بەجێهێشتووە و بۆ ئێرە هاتوویت؟ ئایا ئاخییەکان —خوایە دوایان بڕێ- لەژێر گوشارا بەرەو شار پاشەکشەتان پێدەکەن، کە وات بە چاك زانی بێیت و لێرە، لە قەڵاوە دەست بەرزبکەیتەوە و لە زیوس بپاڕێیتەوە؟ بوەستە با من بچم بادەیەکی لە هەنگوین خۆشترت بۆ بێنم، تا هەوەڵجار بەخۆشی زیوس و خواوەندەکانی دی بەسەر خاکیا بیڕژێنی، و ئەوجا بەخۆتیش لێی بخۆیتەوە و ماندوییەتیت دەربچێ. بادە و شەراب، گوڕ و تینی تازە

وەبەر مرۆڤی ماندوو دەخاتەوە، ماندووەوکو تۆ کە لە جیاتی کەسوکارت دەجەنگی."

(٢٦٣) هیکتۆر وەڵامی دایەوە: "ئەی دایکی شکۆمەندم، شەراب و بادە مەیەنە، دەنا پیاوەتیم تیا ناهێڵێ و هێزم لەبەر دەبڕێ. من زات ناکەم بەدەستی نەشۆراوەوە بادە بەخۆشی زیوس بڕژێنم وهەڵدەم. خەڵکی لەوتاو لە خوێن و خوردا نوێژ بۆ کوڕی کرونوس ناکات. تۆ سەرە ژنانی تەروادە خڕبکەوە، بڕۆن و قوربانی پێشکەش بە بەپەرستگەکەی ئەتینای ڕابەری تالآنی و وێرانی بکەن، جا لەوێ بەنرخترین و شایستەترین سەرپۆشی خۆت، سەرپۆشێك کە لە هەموو سەرپۆشەکانی تر زیاترت هەڵگرتووە و لە دڵتدا شیرینتر و شایستە تر بووە، بدە بەسەر ئەژنۆکانی ئەتینادا وەعد و بەڵێنی بدەیێ کە ئەگەر بەزەیی بەشارەکەدا بێتەوە، و ڕوحم بەژنانی تەروادەیی و مناڵە ساواکانیاندا بکات، و شەڕی کوڕی تیدیوس کە شێتانە شەڕ دەکات و ترس و خۆف دەخاتە دڵی پیاوانەوە، بەتەواوەتی لە شاری ئیلیون دووربخاتەوە، ئەوا لە پەرستگەکەی خۆیدا دوانزە گوێرەکەی یەکساڵەی، کە نەقیزەیان بەرنەکەوتبێ، بۆ دەکەی بەقوربانی. دەی ئێوە بڕۆن بۆ پەرستگەکەی ئەتینا، منیش دەچم باریس دەدۆزمەوە و ئەگەر بەقسەم بکات هەندێ ئامۆژگاری دەکەم. هێڤیخازم زەوی بقڵەشێ و قووتی بدات، زیوس بۆی پەروەردەی کردووە تا ببێ بەبەڵای تەروادەییەکان و بریام و کوڕانی بریام، خۆزی دەچووە دۆزەخ و هەنگێ دڵم ئیسراحەتی دەکرد."

(٢٨٦) دایکی چووە ماڵەوە و بانگی لە کارەکەرەکانی کرد کە بەناو شار بکەون و سەرە ژنان لە هەر چوار نکالی شارەوە خڕ بکەنەوە، بەخۆیشی دابەزییە خوارەوە بۆ ژوورە بۆندارەکەی خۆی، کە لە قاتی خوارەوەی قەسرەکەدا بوو، کە لەوێ سەرپۆشی گوڵدۆزی و گولاڤدونی دەستکردی ژنانی سیدونی هەڵگرتبوو، کە ئەلکساندەر لەو سەفەرە دەریاییەیدا کە هیلینی هەڵگرتبوو، بۆی هێنابوو. هیکۆبا یەکێك لە جوانترین ئەو سەرپۆشە بەنەخش و نیگارانەی هەڵبژارد تا بیکاتە دیاریی دەستی بۆ ئەتینا، سەرپۆشەکە وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە، و کەوتبووە ژێر سەرپۆشەکانی دیکەی ناو سەندوقەکەوە. بەو سەرپۆشەوە هیکۆبا کەوتە ڕێ و ژمارەیەکی زۆر لەسەرە ژنان بە پەلە کەوتنە شوێنی.

(٢٩٧) کە گەییشتە پەرستگەکەی ئەتینا، تیانۆی جوان، کیژی کیسیوس و ژنی ئەنتینور، دەرگاکانی بۆ کردنەوە، چونکە تەروادەییەکان بەراهیبەی پەرستگەکەیان

دانابوو. ئیدی ژنەکان هەموو پێکەوە و بەدەنگی بەرز دەستیان بۆ خواوەند بەرزکردەوە. (تیانو)ش سەرپۆشەکەی برد و دای بە ئەژنۆکانی ئەتینادا، و کڕنۆشی بۆ کیژەکەی زیوسی شکۆمەند برد و لەبەری پاڕایەوە.

(٣٠٥) هاواری کرد: ئەی ئەتینای موبارەك، ئەی پاسەوان و پارێزەری شارەکەمان، ئەی خواوەندە بەتواناکە، نێزەکەی دیومیدس بشکێنە، کارێکی وا بکە بەخۆی لەبەر دەروازەکانی سکایینی دا بکوژرێ. ئەگەر تۆ بەزەییت بەشارەکەدا بێتەوە و ڕوحم بەژنانی تەروادەیی و منالە ساواکانیاندا بکەی، دوانزە گوێرەکەی یەك ساڵەت، کە نەقیزەیان بەرنەکەوتبێ، لە پەرستگەکەی خۆتدا بۆ دەکەم بەنەزر و قوربانی." بەو جۆرە نوێژی کرد و پاڕایەوە. بەڵام ئەتینا نوێژەکەی قەبوڵ نەکرد.

(٣١٢) لەو دەمەدا ئەوان خەریکی نوێژ و پاڕانەوە بوون لە کیژی زیوس، هیکتۆر بەرەو کۆشکە بەردینە جوانەکەی ئەلکساندەر (باریس) وەڕێکەوت، ئەو کۆشکەی ئەلکساندەر بەخۆی بەکۆمەکی باشترین بەناکارانی تەروادەیی ئەو زەمانە دروستی کردبوو. جا ئەوانە هۆڵێك،ماڵێك، حەوشەیەکیان لە نزیکی کۆشکەکەی بریام و هیکتۆردا، کە کەوتبووە سەرووی شارەوە بۆ دروست کردبوو. هیکتۆر بەخۆ و نێزە یازدە گەزییەکەیەوە وەژوور کەوت، و نووکی نێزەکەی لە پێشیەوە دەبریقایەوە، ئەڵقەیەکی زێڕ بەدەسکەکەیەوە بوو. سەیری کرد ئەلکساندەر (باریس) لە ژوورەوەیە و خەریکی سوپەر و زرێکەیەتی، کەوانە چەماوەکەی چاك دەکات. (هیلین)ی ئارگوسیش لەوێ بوو ئەمری بەکارەکەر و قەرەواشەکانی دەکرد.

کە هیکتۆر، ئەلکساندەری بینی بەسەرزەنشتەوە پێی گوت: "ئەی نەگبەتی چارەڕەش، تۆ هیچ باش ناکەی کە ئەم ڕقە لە دڵی خۆدا پەروەردە دەکەیت. قەومەکەت لە دەوری شار و قەڵا بەرزەکانیا سەرگەرم و ماندووی شەڕ و هەنگامەن، بەهۆی تۆوە ئاگری شەڕ لە چواردەوری شار هەڵگیرساوە، هەقی ئەوەت نییە گەر بەرێکەوت کەسێك بدینی ڕەخاوەتی لەم شەڕە دزێوە بکات، لێی تورە بیت. تازووە فریاکەوە، دەنا شارەکە دەبێ بەخۆراکی ئاگر."

(٣٣٢) ئەلکساندەر (باریس) وەڵامی دایەوە: "ئەی هیکتۆر تۆ گلەییم لێدەکەی، ڕەنگە هەقی خۆت بێ، بەڵام گوێ بگرە و باوەڕم پێ بکە، دڵنیابە من لە ڕقی تەروادەییەکان خۆم نەخزاندوەتە ماڵەوە، من غەرقی خەمی خۆمم. تۆزێ لەمە پێش ژنەکەم بەقسەی

حوس مێوری دەکردمەوە و دەیگوت کە بچم بۆ شەڕ، پێم گوت باشتروایە بڕۆم بۆ شەڕ، بەمە ورەی دۆستان و یاران بەرز دەبێتەوە. جا چاوەڕوانم بکە با زرێکەم لەبەر بکەم، یان حەزەکەی تۆ بڕۆ و منیش بەدواتا دێم، دڵنیابە کە دێم."

(٣٤٢) هیکتۆر هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. هیلین ویستی دڵخۆشی بداتەوە. گوتی: ئەی برا، ئەی شووبرای لەدڵدا ئازیزم، لە دڵی منی هەڵەکاری بێزەوەر و بێزراو، کاشکێ ئەو ڕۆژەی کە دایکم منی بوو، باهۆز و گێژەڵوکەیەك هەڵیدەکرد و بۆ سەر چیایەکی دەبردم یان

(٣٤٨) دەیدامە دەم شەپۆلی خرۆشاوی دەریایەکەوە و شەپۆلان بۆ دووری دووریان بردبام و نەبوومایەتە مایەی ئەم هەموو ئازار و مەینەتیانە. یان وەکو خواوەندان ئەم هەموو ئازار و مەینەتی و هەڵە و پەڵەیەیان لە چارەنووسیم، بریا ژنی پیاوێکی باشتر دەبووم، پیاوێ کە لۆمە و گازاندە و تورەبوونی پیاوان کاری تێبکردایە. ئەم پیاوە متمانەی بەخۆی نییە، و هەرگیزیش متمانەی بەخۆی نابێ، بێگومان بەری ئەم خەمساردی و بێ موبالاتیەی خۆی دەدروێتەوە. ئەی شووبراکەم با لەم قسانە گەڕێین و وەرە تۆزێ لەسەر ئەم کورسییە ڕۆنیشە، و پشوویەك بدە، چونکە هەر تۆی کە باجی هەرزەکارییەکانی منی بێ ئابڕو و حەماقەتەکانی ئەلکساندەر دەدەیت و ئازار و خەم دەچێژیت-زیوس سەرەنجام و چارەنوسێکی خەمناك و گریە ئەنگێزی ئەوتۆی لە چارەنووسیون، کە ببین بەداستانی سەر زاری نەوەکانی ئایندە و بەگۆرانی بەسەرهاتمان بگێڕنەوە.

(٣٥٩) هیکتۆر وەڵامی دایەوە: "ئەی هیلین داوای دانیشتن لە من مەکە، هەرچەند من لە دڵسۆزی تۆ دڵنیام، بەڵام دەرفەتی دانیشتنم نییە، من دڵم لای تەروادەییەکانە، چونکە من لەوێ نەبم زۆر نیگەران و پەرێشان دەبن. بەڵام تۆ گوشار لە مێردەکەت بکە، تا پەلە بکات و بەرلەوەی لەشار دەربچم بمگاتێ. دەبێ سەرێکی ماڵی خۆم بدەم و ژنەکەم و کوڕە ساواکەم ببینم، چونکە نازانم کە ئاخۆ جارێکی دی دەگەڕێمەوە بۆلایان، یان خواوەندان دەمکەن بەنێچیری دەستی ئاخییان."

(٣٦٩) هیکتۆر ئەوی بەجێهێشت و بەرەو ماڵی خۆی بەڕێکەوت. (ئەندروماك)ی لە ماڵەوە نەبینی، چونکە لەگەڵ کوڕە چکۆلەکەی و یەکێك لە کارەکەرەکانیا چوو بوو بۆ سەر بورجی شار، و لەوێ بەکوڵ دەگریا. کە هیکتۆر بینی لە ماڵەوە نییە، لە ئەستانەی حەرامسەراکەدا وەستاو گوتی: "ئەرێ ژنان، ڕاستم پێ بڵێن کە ئەندروماك لە ماڵ وەدەرکەوت کێوە چوو؟ ئایا بۆ ماڵی خوشکەکانم یان بۆلای

براژنەکانم چووە؟ یان چووە بۆ پەرستگەکەی ئەتینا و لەگەڵ ژنانی دیکەدا لە خواوەندی ترسناك دەپاڕێنەوە تا سۆزی ببزوێ و دڵەی ڕەقی نەرم بکەن؟"

(٣٨١) کارەکەرباشی ماڵەکە کە ژنێکی چەڵەنگ و کارزان بوو وەڵامی دایەوە: "ئەی هیکتۆر، تۆ کە داوام لێدەکەی ڕاستیت پێ بڵێم، ئەوا بزانە کە نە بۆلای خوشکەکانت چووە و نە بۆلای براژنەکانت، و نە بۆ پەرستگەی ئەتینا، تا لەگەڵ سەرەژنانی تەروادەییدا لە خواوەندی ترسناك بپاڕێتەوە و دڵی نەرم بکات، چووە بۆ سەر بورجە بەرزەکەی ئیلیون (تەروادە)، کە بیستی تەروادەییەکان لە حاڵی شکست و پاشەکشەدان، و ئاخییەکان لە هەڕەتی و ڕەبەرزی و هێرشدان، ئیدی خۆی پێنەگیرا و بەپەلە چوو بۆ سەر بورجەکە و دایەنەکەش منداڵەکەی بۆ هەڵگرت و بەدووی کەوت.

(٣٩٠) دوای ئەوەی کارەکەرباشیەکە لە قسەکانی بووەوە، هیکتۆر بەپەلە لە ماڵ وەدەرکەوت، بەهەمان ڕێگەی خۆیدا گەڕایەوە، کە بەناو شارا ڕەت بوو و گەییە ئەو دەروازانەی کە بەسەر دەشتەکەدا دەکرانەوە، ئەندروماکی خێزانی بەڕاکردن بەرەو پیری هات، ئەندروماك کیژی (ئیتون)ی شکۆمەند بوو، ئەو ئیتونەی کە لە بناری چیای بلاکوس)ی چڕە دارستان و بێشەدا حوکمڕانی تیبەی دەکرد و پاشا و فەرمانڕەوای کیلیکیەکان بوو. کیژەکەی شووی بەهیکتۆر کرد، جا ئێستا ئەو کیژە دەگەڵ دایەنەکەیدا کە منداڵە ساواکەی بۆ هەڵگرتبوو، بەپەلە بەرەو پیری هیکتۆری مێردی دەهات. دایەنەکە منداڵەکەی بۆ هەڵگرتبوو، منداڵە خۆشەویستەکەی هیکتۆر کە وەکو ئەستێرە دەدرەوشایەوە. هیکتۆر پێی دەگوت سکاماندریوس، بەڵام خەڵکی پێیان دەگوت ئەستیاناکس، واتە پاسەوانی شار، چونکە هیکتۆر بەتەنیا پاسەوانی تەروادەی دەکرد. هیکتۆر بەدەم زەردەخەنەیەکی کپ و بێدەنگەوە ڕوانییە منداڵەکەی. ئەندروماك بەگریانەوە لێی نزیك بووەوە، دەستی گرت. گوتی: "ئەم جورئەت و ئازایەتییە بەرەو مەرگت دەبات، بیر لە منداڵە ساواکەت، لە منی بەدبەخت بکەوە کە بەو زووانە بێوەژن دەکەوم-چونکە ئاخییەکان کە زۆرت لێ ڕن، دەستبەردارت نابن و دەتکوژن.جا من بەر لە تۆ بمرم باشترە، چونکە لەدوای تۆ هیچم بۆ نامێنێتەوە خەم و پەژارە نەبێ. خۆ داك و بابم نەماون. بابم، لەلایەن ئەخیلەوە کاتێ کە پەلاماری تیبەی شارە جوانەکەی کلیلیەکانی داو وێرانی کرد، کوژرا. ڕاستە ئیتونی کوشت، بەڵام تەدارەك و تاقمەکەی لێ دانەماڵی، واتە تەوهینی نەکرد، بەتەدارەك و تاقمەکەیەوە سوتاندی و لە خۆڵەمێشەکەی

خویدا گۆڕی نا، و پەرییانی کۆسارانیش، کیژانی زیوسی قەڵغاندار، دارستانێکیان لە سپیدار لەسەر گۆڕەکەی چاند. حەوت برایەکەشم، لە هەمان ڕۆژدا هەواڵەی ئەو دنیا، کران، ئەخیل بەدیار مەڕ و ماڵاتەکانیانەوە کوشتنی. دایکیشم کە شاژنی هەموو خەڵکی قەڵەمرەوی بناری چیای بلاکوس بوو، ئەویشی لەگەڵ دەستکەوتەکانی دیدا بۆ ئێرە هێنا، و بەسەربەهایەکی مۆڵ و فرە ئازادی کرد. کەچی "ئارتیمیس"ی کەواندار، لەماڵەکەی بابیا کوشتی. جا هیکتۆر ئێستا تۆ بۆ من لە جێی باب، داك، و برایت، و مێردی بوێر و جەنگاوەری منی. کەواتە بەزەییت پێمدا بێتەوە،

(٤٢٩) لێرە و لەسەر بورجەکە وەمێنە، تا کوڕەکەت بێ باب و ژنەکەت بێ مێرد نەمێننەوە. سوپاکەت لە دەوروبەری بنە هەنجیرە کێوییەکە مۆڵ بدە، چونکە ئەوێ خاڵی لاوازی شارە و بورجەکە لەو قوڵەوە پەلامار دەدرێ، ئەوێ قایم بگرن. ئازاترین جەنگاوەرانی ئاخیایی سێ جاران لەو شوێنەوە هێرشیان هێنا، بەسەرپەرشتی هەردوو قارەمان "ئیاس" و ئیدومینوسی شکۆمەند و کوڕانی ئەتریوس، و کوڕە ئازاکەی تیدویوس هێرشیان هێنا، جا یا بەخۆیان هەستیان بەلاوازی ئەو قوڵە کردبوو، یان فاڵبین و ڕازگۆیان ڕێنوێنییان کردبوون."

(٤٤٠) هیکتۆر وەڵامی دایەوە: "هاوسەرە ئازیزەکەم، بیرم لەهەر هەموو ئەمانە کردووەتەوە، بەڵام ئەگەر وەکو ترسنۆکێکی خوێڕی خۆ لەشەڕ بدزمەوە بە چ ڕوویەکەوە تەماشای تەروادەییان، پیاوان و ژنانی تەروادەیی بکەم؟ غیرەتم ئەوە قەبوڵ ناکات، چونکە من فێری ئەوەم کە هەمیشە و بێ ترس لە سەنگەری پێشەوەی تەروادەییەکاندا شەڕ بکەم و تا ناو ناوبانگی باوانم و خۆیشم بپارێزم. من زۆر چاك لام عەیانە و دەزانم ڕۆژێ دێت تەروادە وێران دەکرێ و بەسەر بریام و گەلی بریامدا دەڕوخێنرێ، بەڵام من خەمی کەسم نییە، نە خەمی هیکوبامە و نە بریام شاو نە برا زۆر و ئازاکانم کە بەبەرچاوی دژمنەکانیانەوە دەکوژرێن- نا من خەمی هیچ یەکێك لەوانەم نییە، بەڵکو خەم و پەژارەی تۆمە، خەمی ئەو ڕۆژەمە کە یەکێك لە ئاخییەکان دیلت دەکات، بۆ هەتا هەتایە ئازادیت لێ دەستێنێ و بەدەم گریانەوە دەتبات، بۆ دووری دوورت دەبات. بۆ( ئارگوس)ت دەبات، لەوەیە لەوێندەر بەفەرمانی خانمەکەت بەسەر خەرەکانەوە دابنەویتەوە، یان ئاوت لە کانی و سەرچاوەکانی میسیس و فیبیریاوە پێ بێنن و لەلایەن ئاغاکەتەوە مامەڵەیەکی خراپت لەگەڵ بکرێ، هەنگێ ئەوانەی کە دەت بینن فرمێسك دەبارێنی دەڵێن: "ئەوە ژنەکەی

هیدووره، ئەو هیکتۆرەی لە شەڕی قەڵاکانی تەروادەدا لە هەر هەموو تەروادەییەکان ئازاتر بوو." کە گوێت لەو قسەیە دەبێ هەنگێ فرمێسکت تازە دەبێتەوە و خەفەت بۆ پیاوێکی وەکو من دەخۆیت کە لە ژیانا نیم تا فریات بکەوم لە دیلی و یەخسیریت ڕزگار بکەم. بۆیە هێڤیخازم بمرم و لە گۆڕ بنێرم، بەر لەوەی تۆ بەئەسیری ببەن و گوێم لە فریاد و هاوارت بێ."

(٤٦٦) هەنگێ باوەشی بۆ منداڵەکەی گرتەوە، بەڵام منداڵەکە گریا و خۆی بەباوەشی دایەنەکەیەوە قرساند، لە دیمەنی بابی و سپەرەکەی ترسا، لەو ڕیشوانە ترسا کە بەکێوخودەکەیەوە شۆڕبووبوونەوە. بابی پێکەنی و دایکی بەدەم ڕوندك ڕشتنەوە بزەیەکی کرد، هیکتۆر کێوخودە بریقەدارەکەی داکەند و لە عاردی دانا. ئەوسا منداڵە ئازیزەکەی لە باوەش گرت،

(٤٧٤) ماچی کرد و لە باوەشیا ڕایژەند و ڕووی کردە دەرگای زیوس و خواوەندەکانی دیکە و بەدەم پاڕانەوەوە گوتی: "ئەی زیوس، ئەی گەلی خواوەندان، کارێکی وەها بکەن کە ئەم کوڕەی من وەکو خۆم دەربچێت، لەنێو هەموو تەروادەییەکاندا بدرەوشێتەوە، ببێ بەسەردار و سەرئامەد هەمان هێز و توانای منی هەبێ، تاوەکو خواوەندان، بەشایستەی خۆی فەرمانڕەوایی ئیلیون (تەروادە) بکات، بەو ڕادەیەی کە هەر کەسێك بینی لەشەڕ دەگەڕێتەوە بێ "ئەم کوڕە گەلەك لە بابی هەژی ترە." کارێکی وەها بکەن کە لە شەڕ دەگەڕێتەوە تەدارەك و تاقمی خوێناوی ئەو کەسانەی کە لە شەڕدا کوشتوونی لەگەڵ خۆدا بێنێتەوە و دڵی دایکی تەژی شادی و خۆشی بکات."

(٤٨٢) ئەوەی گوت و منداڵەکەی خستە باوەشی دایکییەوە، کە لە هەمێزە گەرمەکەی گرت و بزەیەکی گریان ئامێزی بۆ کرد. کە مێردی بەو ئاوایەی بینی دڵی بۆی سوتاو بەدەستی نەوازشی کرد و گوتی: "ئەی هاوسەرەکەم، تکایە دڵی خۆت زۆر تەنگ مەکە، تا ئەجەلم نەیەت کوڕ نییە بتوانێ بمکوژێت، بەڵام مرۆڤ کە ئەجەلی هات، ئازا بێ یان ترسنۆك، هەر دەبێ بمرێ و لە ڕۆژی لە دایکبوونەوە ئەمەی لە چارە دەنووسرێت. بچۆوە بۆ ماڵێ، و خەریکی کاری ڕۆژانە و خەرەك وتەشی خۆت بەو کارەکەرەکانت ئاراستە بکە و هەڵیانسوڕێنە، شەڕ و جەنگ ئیشی پیاوانە، ئەرك و ئیشی منە بەر لەهەر تەروادەییەکی لە دایك بووی ئیلیون (تەروادە)."

(٤٩٤) کێوخودە ڕیشودارەکەی لە عاردی هەڵگرت، ژنەکەی بۆ ماڵ گەڕایەوە، بەدەم ڕێوە

ناوەناوە ئاوڕی پاشەوەی دەدایەوە و بەکوڵ دەگریا. کە گەییشتەوە ماڵا، کارەکەرەکان هەموو لەوێندەر بوون، داوای لێکردن لەگەڵی بگرین، بەزندویەتی شین و شەپۆڕیان بۆ هیکتۆر لە ماڵەکەی خۆیدا گەرم کرد. چونکە پێیان وابوو جارێکی دی نای بیننەوە و لە دەستی ئاخییە درندەکان دەرباز نابێ و بەسەلامەتی لەشەڕ ناگەڕێتەوە.

(٥٠٤) باریس زۆر لە ماڵەوە ماتەڵ نەبوو. زرێکەی لەبەرکرد و بەپەلە بەناو شارکەوت. وەکو ئەسپێکی بەستراوەی تێر ئاڵف، کە بەربێ و بەرەوتە بکەوێتە دەشت و خۆی بۆ روبارێکی سازگار بکوتێ کە مەلەی تیا بکات و خۆی فێنك بکاتەوە –گەردنی هەڵبڕێ و یاڵەکەی بەسەر شان و ملیا سەما بکات و بەهێز و شنگی خۆیەوە بنازێ و وەکو با بەرەو پاوەنی مایناں بفڕێت-

(٥١٢) باریسی کوڕی (بریام)ش بەو ئاوایە لە چیا بەرزەکەی برگاموسەوە داگەڕا، سپەر و تەدارەکەکەی لەژێر تیشکی خۆردا دەبریسکایەوە. بەپەلە ڕێی دەکرد و شادمانی و پێکەنینی لێدەباری. دوای تۆزێك گەییە هیکتۆری برای کە لەو شوێنە دوور دەکەوتەوە کە قسەی لەگەڵ ژنەکەیدا کرد. ئەلکساندەر (باریس) لە پێشا قسەی کرد، و گوتی: "دەترسم بەخاوە خاوی خۆم ماتەڵم کردبی، و زۆرت چاوەڕوان کردبم، تۆ پەلەتە و منیش لە مەوعیدەکەی تۆدا هاتم."

(٥٢٠) هیکتۆر وەڵامی دایەوە: "ئەی برا باشەکەم، کەس ناتوانێ نکۆڵی لەوە بکات کە مەردانە شەڕت کرد، بەڵام تۆ کەسێکی خەمسارد و کەمتەرخەمی. زۆرم پێ ناخۆشە کە گوێم لە تەروادەییەکانە زەمی تۆ دەکەن، ئەو تەروادەییانەی کە ئەم هەموو دەرد و مەینەتییە لە ڕای تۆدا دەکێشن. با جارێ بڕۆین، دوایی ئەم شتانە چاك دەکەین، ئەگەر زیوس بەقسمەتی کردین، و ئاخییەکانمان لە تەروادە وەدەرنا لە ماڵەکانی خۆمانا، و بەخۆشی خواوەندانی ئاسمان بادەی ڕزگاری هەڵدەین و ڕێزیان لێ بگرین و ستایشیان بکەین.

# سروودی حەوتەم

## دوئێلی نێوان ئەجاکس و هیکتۆر

**حیکایەتەکە:**

**هیکتۆر و باریسی برای لە شار وەدەردەکەون و باس و تەگبیری شەڕەکە دەکەن. چی وای نەمابوو شەڕەکە هەڵگیرسێت، کە ئەتینا هەستی بەمەترسی تەروادەییەکان لەسەر ئاخییەکان کرد، بۆیە لەگەڵ ئەپولۆی برایدا ڕێکدەکەون کە شەڕەکە و هەڵبەتە ڕوخانی تەروادەش بۆ کاتێکی دی دوابخرێ، چونکە وا نەبێ ئاخییەکان وێران دەبن. ئێدی ئیلهام دەدەنە (هیلینوس)ی فاڵبین کە گوایە خواوەندان حەز دەکەن هیکتۆر گەلەکەی لەم شەڕە دژوارە دوور بخاتەوە و داوای دوئێلی دوو قوڵی لەگەڵ بەهێزترین قارەمانی یۆناندا بکات. ئەوە بوو چووە پێشێ و داوای کرد قارەمانێك بێتە مەیدانی دوئێل لەگەڵیا، ئەگەر سەرکەوت ئەوا جەنازەکە دەداتەوە بەجماعەتی کوژراوەکە و دەبێ یۆنان دەستبەرداری تەروادە بێ، خۆ ئەگەر دۆڕاش ئەوا جەنازەکەی بدرێتەوە بەخەڵکی تەروادە و یۆنان هیلین و سەروەت و سامانە زۆرەکەی لەگەڵ خۆدا بنەوە و برۆن. کاتێ جاڕچی جاڕ دەدا و داوا دەکات ئاخییەکان جەنگاوەرێکی خۆیان بۆ ئەو مەبەستە دیاری بکەن، هەموو بێدەنگ دەبن و کەس ناچێتە پێشێ. مینیلاوس هەڵدەستێ و سەرزەنیشتیان دەکات و دەڵێت بەخۆی دەچێتە دوئێلی هیکتۆر. شا ئاگامەمنونی برای خێرا دەچێ بۆلای و داوای لێدەکات بگەڕێتەوە شوێنەکەی خۆی، چونکە کەس قەوەتی هیکتۆری نییە، تەنانەت (ئەخیل)یش. ئێدی نۆ پاڵەوانی یۆنانی رادەبن، و داوەر هەڵدەستێ و تیروپشکیان لەنێواندا دەکات و پشکەکە بەر ئەجاکس (ئەیاس) دەکەوێ، کە ئەمە تەمەنای هاوڕێکانیشی بوو. دوئێلێکی سەخت لەنێوان هەردووک قارەماندا ڕوودەدات و بەبێ ئەوەی بگەنە هیچ ئەنجامێك شەویان بەسەدا دێت و لێکیان جیادەکەنەوە، لێرەدا هیکتۆر دان بەپاڵەوانێتی ئەجاکس دا دەنێت و وەکو عادەتی سوارچاك و پاڵەوانان دیارییەکی پێشکەش دەکات، هەروەها (ئەجاکس)یش**

دیارییەك بەو پێشكەش دەكات. نەستور پێشنیاز دەكات كە شەڕ بوەستێ تا هەردوولا كوژراوەكانیان دەنێژن. ئەنیتۆر لەبەرەی تەروادەییەكان پێشنیاز دەكات كە هیلین بەخۆ و سەروەت و سامانەكەیەوە تەسلیم بكرێتەوە تا ئەم شەڕە ببڕێتەوە، پاریس بەتەسلیم كردنەوەی هیلین ڕازی نابێت، بەڵام بەتەسلیم كردنەوەی سەروەت و سامانەكەی قایل دەبێت و بگرە بەڵێن دەدا كە لە سەروەت و سامانی تایبەتی خۆیشی بخاتە سەر. قاسیدێك بەفەرمانی بریام دەڕوات و گریكەكان لە پێشنیازەكەی باریس ئاگادار دەكاتەوە و داواشیان لێدەكات كە ماوەیەك شەڕ ڕابگیرێ تا مردووەكان بنێژرێن و ڕێورەسمی پیرۆزیان بۆ ئەنجامبدرێ. چی وای نەمابوو ئەنجومەنی باڵای گریكەكان بەپێشنیازەكەی باریس ڕازی بێ، بەڵام مینیلاوس ڕەفزی كرد و سوور بوو لەسەر ئەوەی دەبێ (هیلین)ی ژنی لەگەڵ سەروەت و سامانەكەیدا بێ. بەڵام پێشنیازی هودنەكە، ئەنجومەن لەسەری ڕازی دەبێت، بەڵام سەبارەت بەرێكەوتنی ئاشتی دیومیدس ڕەفزی دەكات و دەڵێت تەروادە لە ڕوخاندایە، پێویست بەوە ناكات دوای ئەم هەموو ساڵە دوور و درێژە بێ دەستكەوت بگەڕێینەوە. پێشنیازێكی دیكەش كە هی گریكەكان بوو لە ئارادا بوو كە گردولكەیەك بۆ ناشتنی مردووەكان دروست بكرێ و شورەیەكی بەدەورا بكێشن تا لە هەموو پەلامارێكی تەروادەییەكان بەدوور بن و دەروازانی هەبێ بۆ دەرهێنانی عەرەبانەكان، و هەروەها خەنەكێك لە دیوی دەرەوەدا بەدەوری شورەكەدا لێ بدرێ. و شەو بەخواردن و خواردنەوەوە بەسەر بەرن، بەڵام لە كۆڕی خواوەنداندا بوسیدون، زیوس ئاگادار دەكاتەوە كە ئەوانە بەبێ ناوهێنانی خواوەندان بادە دەنۆشن، ئەویش سەركۆنەیان دەكات، خێرا قوربانی پێشكەش دەكەن و لێی دەخەون.

زەمەن:

دوئێلی نێوان هیكتۆر و ئەجاكس (ئەیاس) لە كۆتایی ڕۆژی بیست و سێیەمدا ڕوودەدات، و لە ڕۆژی بیست و چوارەمدا هودنە دەبەسترێ، و لە ڕۆژی بیست و پێنجەمدا مردووەكان دەنێژن و لە ڕۆژی بیست و شەشەمدا شورە و حەسار دروست دەكەن و خەنەك لێدەدەن.

شوێن:

دوای دەرچوونی هیكتۆر لە شار، واریقاتی ئەم سرووده لە دەشتەكەی نێوان كەشتیگەلی گریكەكان و شاری تەروادەدا ڕوودەدا.

(١) هیکتۆر بەدەم ئەو قسانەوە لە دەروازەی شار وەدەرکەوت، ئەلکساندەری براشی بەگەڵی کەوت، هەردوکیان تامەزرۆی شەڕ بوون. وەکو چۆن ئاسمان شنە بایەکی خۆش بۆ کۆمەڵێك دەریاوانی چاو لەڕێی ئەو بایە، نائومێد و ماندووی دەستی سەوڵ لێدان، دەنێرێ و دەبوژێنەوە، تەروادەییەکانیش بەو ئاوایە بەردەکەوتنی ئەو جووتە قارەمانە کە چاویان لە ڕێیان بوو، شادی و ئومێدیان تێکەوت.

(٨) ئەوە بوو ئەلکساندەر ،(مینیستیوس)ی کوڕی ئەرتیوسی کوشت، مینیستیوس لە ئەرنی دەژیا، ئەمە کوڕی ئەریتوسی هەڵگری گۆچانی فەرمانڕەوایی بوو لە فیلومیدوسا. هیکتۆریش نێزەکەی هاویشت و ڕێك بەر ملی ئیونیوس لەژێر قەراخی کڵوخودە برۆنزییەکەوە کەوت و کوشتی. هەروەها گلوکوسی کوڕی( هیبولوخوس)ی ڕابەری لیسیان-ش لە نزیکەوە لەگەڵ ئەفینوسی کوڕی دیکسیوس دا بەشەڕ هات و لەو دەمەدا کە دوای ئەسپە خۆشپەزەکانی کەوتبوو و خۆی هەڵدەدایە سەرعەرەبانەکەی، نێزەیەکی خێواندێ و شانی دیوا و دەرکرد، و لە عەرەبانەکە کەوتە خوارەوە و خاو بووەوە و گیانی دەرچوو.

(١٧) بەڵام کە ئەتینا سەیری کرد ئەو پیاوانە ئارگۆسییەکانیان شپرزە کردوە، لە لوتکە بەرزەکانی ئۆڵەمپەوە بەرەو ئیلیون داگەڕا، ئەپولۆ کە لە چیای برگاموسەوە چاودێری دەکرد و حەزی بەسەرکەوتنی تەروادەییەکان هەبوو، بەرەو پیری هات. لەنك دار بەڕووەکە یەکیان گرت، ئەپولۆی کوڕی زیوس لە پێشا قسەی کرد، گوتی: "ئەی کیژی زیوسی شکۆمەند، خێرە بەم پەلەپەلە لە ئۆڵەمپەوە هاتوی، ڕوحی لەخۆباییت بۆچی ناردوی؟ بۆ ئەوەی تای تەرازووی سەرکەوتن بەلای ئاخییەکاندا قورس بکەی، هیچ بەزەییەکت بەتەروادەییەکاندا نایەتەوە؟ ئەگەر بەقسەی من دەکەی وا باشترە ئەمڕۆ شەڕەکە ڕابگرین، و دوایی شەڕەکەیان لێ تازە بکەوە تا داناییەکان تەروادە وێران دەکەن، مادامێکی ئێوەی خواوەندانی نەمر پێتان خۆشە ئەم شارە وێران ببێ!"

(٣٣) ئەتینا وەڵامی دایەوە: "با قسەی تۆ بێ، ئەی نێزە ئەندازی دوورهاوێژ، منیش هەر بەو مەبەستە لە ئۆڵەمپەوە هاتمە خوارێ بۆ ناو تەروادەیی و ئاخییەکان، بەڵام پێم بێ بزانم چۆن ئێستا ئەم شەڕە گەرمە ڕادەگریت؟"

(٣٧) ئەپولۆی کوڕی زیوس وەڵامی دایەوە: "با هیکتۆری مەزن دندە بدەین و داوا بکات یەکێك لە داناییەکان بێتە مەیدان و دوئێلی دوو قۆڵی بکەن، ئەوسا ئاخییەکان لە ڕوو

دادەمیین و جەنگاوەرێکی ڕووبەڕوو دەکەنەوە."

(٤٣) ئەتینا سەرکەوتەوە بۆ ئۆڵەمپ. هیلینوسی کوڕی بریام نەخشە و پلانی خواوەندەکانی زانی، بۆیە چوو بۆلای هیکتۆر و گوتی: "ئەی هیکتۆری کوڕی بریام، ئەی ئەو کەسەی لە زانایی و هۆش و ئاقڵدا هاوتای زیوسی، من براتم با قسەت بۆ بکەم.داوا لە تەروادەیی و ئاخییەکان بکە هەموو لە جێی خۆ دانیشن، و بەخۆت داوا بکە کە ئازاترین پیاوی ئاخییایی بێتە مەیدانت و شەڕی تەن بەتەنی لەگەڵ بکە. برایەکەم من بەخۆم گوێم لە دەنگی خواوەندە نەمرەکان بوو، هێشتا ئەجەلت نەهاتووە."

(٥٤) هیکتۆر کە ئەم قسەیەی ژنەوت خۆشحاڵ بوو، چووە بەردەم تەروادەییەکان و نێزەکەی لە ناوەندەوە گرت و تەروادەییەکانی دایە دواوە، کشانەوە و لە جێی خۆ دانیشتن. هەروەها ئاگامەمنونیش ئەمری بەئاخییەکان کرد کە دانیشن. ئەتینا و ئەپولۆ)ش لە شێوەی دوو داڵدا لەسەر دار بەڕووە ئازیزەکەی زیوسی بابیان هەڵنیشتن، بەدیمەنی جەنگاوەرەکان خۆشحاڵ بوون، جەنگاوەرەکان زۆر بەنزیکی بەرانبەر بەیەك دانیشتبوون، و هەموو لە سپەر و کێوخود و نێزە و ڕماندا دەبریسکانەوە، وەکو چۆن شەپۆلە بای دەبور هەڵدەکاو لەڕووی دەریا دەدا و ئاوەکەی تاریك و مەنگ دەنوێنێ، سوپای تەروادەیی و ئاخییانیش بەو ئاوایە لە دەشتەکەدا دانیشتن. هیکتۆر ڕووی کردە هەردوو سوپاکە و گوتی:

(٦٧) گوێ بگرن ئەی تەروادەیی و ئاخییەکان، من قسەی کانگەی دڵی خۆمتان بۆ دەکەم. وادیارە زیوس لە عەرشی باڵای خۆیەوە نەزر و نیازەکانی قەبوڵ نەکردوین، و ئیدی نەگبەتی هەردوولای گرتووین، و گەییشتوینەتە حاڵێك یان دەبێ قەڵاکانی تەروادە وێران بکەین، یان دەبێ لەلای کەشتییەکانتانا شکست بێنن و ببەزن. جا ئێوە لەناو خۆتاندا جەنگاوەرانێکتان هەن کە لە هەر هەمووتان ئازاترن،

(٧٣) جا با یەکێك لەو ئازایانە، ئەوەی لە خۆی ڕادەبینێ، بێتە مەیدان و وەکو قارەمانی ئێوە ڕووبەڕووی هیکتۆری شکۆمەند ببێتەوە.. ئەمە پێشنیازی منە و با زیوس"مان لە بەینا بێ: ئەگەر قارەمانەکەی ئێوە منی کوشت، با تەدارەك و سپەرەکەم لێ داماڵا و بیبا بۆ کەشتییەکانتان، بەڵام با جەنازەکەم بداتەوە بەوڵاتەکەم تا تەروداەییەکان و ژنانی تەروادەیی بەئەرکی خۆ هەستن و لە مردنمدا ئاگرێکی وەهام بۆ بکەنەوە کە شایستەی من بێ.بەڵام ئەگەر ئەپولۆ دەستی دام و من قارەمانەکەی ئێوەم کوشت،

ئەو تەدارەکەی لێ دادەماڵم و بۆ شاری ئیلیونی دەبەمەوە، لەوێ لە پەرستگەکەی ئەپۆلۆدا هەڵیدەواسم، بەڵام جەنازەکەیتان دەدەمەوە تا ئاخییەکان بیبنەوە بۆ لای کەشتییەکانیان و لەوێ بینێژن و لە نزیکی ئاوی هیلیسبونتدا گۆڕێکی بۆ هەڵبەستن. تا ئەگەر یەکێك بەکەشتییەکەی بەوێدا، بەدەریای تاریکی هاوڕەنگی خڵتەی شەرابدا تێپەڕی بێ: "ئەمە گۆڕی پیاوێکە لە مێژە مردووە.. ڕۆژێ لە ڕۆژان، کە لە هەرەتی ئازایەتی و جەنگاوەریدا بوو، هیکتۆری شکۆمەند کوشتی." ڕۆژێ دێ یەکێك وا دەڵێت، و بەو جۆرە ناوبانگ و شکۆی من هەرگیز لە بەین ناچێت."

(٩٢) هیکتۆر بەو جۆرە قسەکانی کرد، بێدەنگی و خامۆشی باڵی بەسەر هەمووان‌دا کێشا، لە ملنەدان شەرمەزار بوون و لە قەبوڵکردنیش دەترسان. سەرەنجام مینیلاوس هەستایە سەر پێیان، و کەوتە سەرزەنشت کردنیان، بەتوڕەبوونەوە هاواریکرد: "مەخابن، ئەی فشەکەرانی بەلاف و گەزاف، ئێوە ژنن نەك پیاو، بەڕاستی ئەگەر یەکێك لە داناییەکان هەر ئێستا ڕانەبێ و ڕووبەڕووی هیکتۆر نەبێتەوە دووچاری شەرمەزاری و نەنگییەکی گەورە دەبین. ئەی کاشکێ هەمووتان لە جێی خۆتانا، لەو شوێنەدا کە بەشەرمەزاری دانیشتوون، روحتان لەبەر دەبڕاو دەبوون بەگڵ و بەئاو. فایدەی نییە بەخۆم دەردەچم و شەڕی تەن بەتەنی ئەم پیاوە دەکەم، و من دەزانم ئەنجام و ئاقیبەتی ئەم شەڕە بەدەستی خواوەندانی نەمرە."

(١٠٣) ئەو قسانەی کرد و جل و تەدارەکی جەنگی لەبەرکرد، بەڵام ئەی مینیلاوس، کاری تۆ بەدەستی هیکتۆر تەاو بوو بوو ئەگەر پاشای ئاخیان هەڵنەستابا و نەیگرتبای. شا ئاگامەمنون دەستی ڕاستی گرت و گوتی: "تۆ شێتی مینیلاوس! ئەم گەوجێتییە لەتۆ ناوەشێتەوە. تۆزێ سەبرت بێ و هەڵمەچۆ، بیر لە شەڕی پیاوێکی لەخۆت بەهێزتر مەکەوە، بیر لە شەڕی هیکتۆری کوڕی بریام مەکەوە، کە زۆربەی جەنگاوەران وەکو تۆ لەبەری دەلەرزن.

(١١٤) تەنانەت(ئەخیل)ش کە لە تۆ بەجەرگترە، دەترسێت بچێتە شەڕی ئەوەوە. بگەڕێوە و لەنێو جەنگاوەرەکانی خۆتدا ڕۆنیشە، ئاخییەکان پاڵەوانێکی دیکە بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و شەڕی هیکتۆر هەڵدەبژێرن، پێم وایە چەند نەترس و بێباك بێ، چەند تینووی شەڕ و کوشتار بێ، زیاتر بەوە خۆشحاڵ دەبێت کە بحەسێتەوە، ئەگەر لەم شەڕە پڕ کەرب و کین و کوشتارە سامناکە بەسەلامەتی دەربازبێ."

(١٥٣) بەو قسانە قەناعەتی بە براکەی کرد، دەست و پێوەندەکەی کە بەگەڕانەوەی خۆشحاڵ بوون، زرێکەیان لە شانی داکەند. ئەوجا نەستور لەنێو ئارگوسییەکانەوە هەستا و گوتی: "سەد حەیف و مەخابن وادیارە خەمێکی گەورە باڵی بەسەر وڵاتی ئاخییاندا کێشاوە. ئێستا ئەگەر ئەو سوارچاکە پیرە، (بیلیوس)ی شیرەتکار و غەیبگۆی (مەرمیدون)ەکان، لە کونێکەوە چاوی لێدەبوو، یان دەیبیست کە ئارگۆسییەکان چۆن لە هیکتۆر دەترسن؟ ئاخۆ چ شینێکی بۆ خۆی دەگێڕا. ئەو بیلیوسەی جارێکیان لەماڵەکەی خۆیدا پرسیاری ڕەگ و ڕەچەڵەکی ئارگوسییەکانی لێکردم، چەند خۆشحاڵ بوو بەزانینی ماڵبات و ڕەگ و ڕەچەڵەك و توخم و تۆوی هەر هەموویان.بەڵا ئێستا ئەگەر بژنەوێ کە نەوە و پاشینەکانی بەو ئاوایە لە بەرانبەر هیکتۆردا ورەیان بەرداوە، بێگومان دەست لە خواوەندان پاندەکاتەوە کە گیانی دەربچێ و بڕوات بۆ هادیس. ئاه! ئەی بابەزیوس! ئەی ئەتینا! ئەی ئەپولۆ! بریا وەکو ئەو کەونە ڕۆژگارانە گەنج دەبووم! ئەو ڕۆژگارانەی کە بیلیان و ئەرکادیان بەڕم و نێزان لە نزیکی ڕوبارە بەخوڕەکەی کیلادون، و لە بن دیوارەکانی فیا و، نزیکی کەنارەکانی ڕوباری ئیاردانوس دا شەڕی یەکتریان دەکرد.. (ئیریوتالیون)ی باڵابەرزی خواوەند ئاسا، پێش ئارکادیەکان کەوتبوو، و سپەرەکەی شا ئەرتیوس-ی دابوو بەشانیا- ئەو ئەریتوس)ەی پیاوان و ژنان حەزیان دەکرد پێی بڵێن "گورزەوان" چونکە نە بەکەوان و نە بەڕمان شەڕی نەدەکرد، بەڵکو بەگورزێکی ئاسنین دەکەوتە سەر لەشکری دژمن، ئەم پیاوە لیکورگوس بەتەڕن کوشتی نەك بەهێزی بازوو، بەفێڵ ڕایکێشایە ناو ڕاڕەوێکی تەنگەبەری ئەوتۆوە کە گورزە ئاسنینەکەی بەکەڵکی هیچی نەدەهات، ئیدی لوکورگوس لە ناغافڵدا پڕی دایێ و ڕمێکی کرد بەنێو قەدیا، و بەپشتا کەوتە سەر زەوی، ئەوسا لوکورگوس تەدارەکی جەنگ و سپەرەکەی کە ئەریسی خواوەندی جەنگ دابویێ- لێ داماڵی و لەوە بەدواوە لە هەموو شەڕێکی قورسدا لەبەری دەکرد، بەڵام کە پیر بوو و کونجی ماڵەوەی گرت، ئیدی دای بەخوڵامە دڵسۆزەکەی، دای بەئیریوتالیوس، کە بەو سپەرەوە لەرووی ئازاترین کەسماندا دەوەستاو تەحەدای دەکرد. کەسێك غیرەت و باشاری ئەوەی نەبوو لە ڕوویا بوەستێ. بەڵام من هەرچەندە لە هەمووان بچووکتر بووم کە دیتم کەس خۆی لە قەرەی نادات، غیرەتم جوڵاو چوومە مەیدانی.

(١٥٤) بەڵام کە چوومە مەیدانی، ئەتینا فریام کەوت و سەکەوتم. من ئەو زەلامە زل و زەبەلاح و بەهێزەم کوشت، کە گلاو کەوتە سەر زەوی لایەك لە عاردەکەی داگیرکرد.

ئەگەر وەکو ئەو زەمانە گەنج و بەهێز دەبووم، هەنگێ هیکتۆر دەیزانی حەریفی کێیە، کەچی ئێوە، کە خۆتان بەئازاو سەرداری سوپاییان دەزانن، کەستان غیرەتی ئەوەتان نییە بچنە مەیدان و شەڕی هیکتۆر."

(١٦١) ئا بەو جۆرە پیرە پیاو سەرزەنشتی کردن و بەرتانە و تەشەرانی دان، ئیدی یەکسەر نۆ دانە جەنگاوەر هەستانە سەر پێیان. یەکەم کەسیان شا ئاگامەمنون بوو، ئەوجا پاڵەوانی بوێر و جوامێر دیومیدسی کوڕی تیدیوس. لەدووانی ئەوان جووتە ئەجاکس هەستان کە دلێری و ئازایەتی کالآیەك بوو و بەبالآیان بڕابوو، ئەوجا ئیدومینیوس و میریونیسی هاوڕێی هەستان دوای ئەوانە یوریبیلوسی کوڕی ئیومون و تاوسی کوڕی ئەندریمون هەستان و (ئودیسیوس)ش هەستا. هەر هەموو ئەمانە ئامادەی دوئیلی هیکتۆر بوون، ئەوسا نەستوری سوارچاکی جیرینایی جارێکی دی هاتە قسان و گوتی: "لە بەینی خۆتاندا تیروپشك بکەن، بزانن تیروپشکەکە بەر کێ دەکەوێ، و کێ ئەم شەڕە بەناوی ئاخییان و لەجیاتی ئاخییان دەکات. خۆ ئەگەر بەسەلامەتی لەم شەڕە دەرباز بێ و بگەڕێتەوە، ئەوا خزمەتێکی باشی خۆی و ئاخییەکان دەکات."

(١٧٥) ئەو قسانەی کرد و ئیدی هەر کەسە و پشکێکی هەڵگرت و نیشانەیەکی خۆی لەسەر دانا و خستییە ناو کێوخودەکەی ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوسەوە، ئیدی هەموو سوپا دەستەو دوعا دەستیان بۆ خواوەندان هەڵبڕی و چاویان بڕییە ئاسمان و دەیانگوت: "ئەی بابە زیوس، زیۆسا، کارێکی وەها بکە کە پشکەکەی ئەجاکس، یان کوڕی تیدیوس، یان خودی ئاگامەمنون دەربچێ."

(١٨١) لەو دەمەدا کە ئەوان دەپاڕانەوە نەستوری سوارچاکی جرینیایی کێوخودەکەی باداو ئەو پشکەی لێ کەوتە خوارەوە کە خەڵکەکە تەمەنایان دەکرد —پشکەکە بەر ئەجاکس کەوت. پشکەکەی هەڵگرت و جاڕچی پشکەکەی هەڵگرت و لە چەپەوە بۆ ڕاست بەسەر سوپاکەیدا گێڕا و پیشانی هەمووسەرانی ئاخیایی دا، کەسیان نەیانناسییەوە و خۆیان نەکرد بەخاوەنی. تا جاڕچییەکە گەییە ئاست ئەوپیاوەی کە نیشانەی خۆی پێوە نابوو و خستبوویە کێوخودەکەوە، گەییە ئاستی ئەجاکس "ئەیاس"ی شکۆمەند، ئەجاکس دەستی درێژکرد و جاڕچییەکە نزیك بووەوە و پشکەکەی خستە دەستییەوە، ئەجاکس یەکسەر نیشانەکەی خۆی ناسییەوە و لەدڵی خۆیدا خۆشحاڵ بوو. ئەوجا پشکەکەی فڕێدایە بەر پێی خۆی و گوتی: "برادەران، گومان لەوەدا نییە کە ئەم پشکە، پشکەکەی منەو، و من خۆشحاڵم. چونکە

من دڵنیام کە هیکتۆری کەڵە پیاو دەکوژم. جا تا من زرێکەم لەبەردەکەم،
(١٩٤) ئێوە لەبەر خۆتانەوە و بەبێدەنگی نوێژ بۆ شا زیوس بکەن، تا تەروادەییەکان ئاگایان لێ نەبێ —یان قەیدی نییە بەدەنگی بەرز بپاڕێنەوە چونکە ئێمە بەهیچ شێوەیەك ترس و باکمان لە کەس نییە، وکەس نییە بتوانێ بەهێز یان بەکارامەیی و لێهاتوویی بۆڕم پێ بدا و لە مەیدان وەدەرم بنێ، هیچ هێز و کارامەییەك بارتەقای ئەوە ناکاتەوە کە من لە سالامیس لە دایك بووم و گەورە بووم، ئەوەندەش دەست و پێ سپی نیم."
(٢٠٠) ئەو قسانەی کرد، هەموو خەڵکەکە ڕوو لە دەرگای زیوس پاشای کوڕی کرونوس کەوتنە نزا و پاڕانەوە، هەریەکەیان ڕوو لە قوبیەی ئاسمان دەیگوت: "ئەی زیوس، ئەی بابی هەموومان، ئەی ئەوەی لە لوتکەی ئیداوە حوکمدەکەی و ئاگاداری خەڵکیت، ئەی شکۆمەند و ئەی گەورە و بەتواناو هێزمەند، سەرکەوتن بەنسیبی ئەجاکس بکە، کارێکی وەها بکە سەرکەوتنێکی مەزن بەدەست بێنێ: بەڵام ئەگەر هیکتۆریشت خۆشدەوێ و لە خەمی ئەویش دایت، ئەوا هێز و توانایەکی یەکسان بەهەردوکیان بدە." ئەوان بەو جۆرە لە زیوس دەپاڕانەوە و، ئەجاکس تەدارەکی جەنگی لەبەر دەکرد، کاتێ کە بەتەواوەتی خۆی ئامادەکرد، وەکو ئەریس،ی خواوەندی زەبەلاح و بێ ڕەزای جەنگ، کاتێ بەشداری شەڕێك دەکات کە زیوس لەنێوان دوو کەسدا هەڵیگیرساندبێ —بەو ئاوایە ئەجاکسی بێ ڕەزا، قەڵا و قەڵغانی ئاخییەکان بەدەم بزەیەکی تەڵخەوە و بەدەم نێزە بادانەوە بەرەو پێشەوەهەڵیکوتا. کە ئارگوسییەکان بینیان گەشانەوە، بەڵام تەروادەییەکان دڵیان داخورپا، هەروەها دڵی هیکتۆریش کەوتە پەلەپەل، بەڵام نەیدەتوانی پاشەکشێ بکات و بگەڕێتەوە ناو ڕیزەکانی پشتییەوە، چونکە ئەو داوای ئەو شەڕەی کردبوو.
ئەجاکس بەمەتاڵەکەیەوە کە لە بورج و قەڵای شارێك دەچوو هاتە بەرەوە، ئەم مەتاڵە وەستا (توخیوس) کە بەناوبانگترین مەتاڵسازی خەڵکی هیلی بوو، بۆی دروست کردبوو، حەوت چینە چەرمی گای قەڵەوی لەسەر یەك دانابوو، و چینی هەشتەمی کردبوو بەبرونز. بەڵا ئەجاکسی کوڕی فیلامون ئەم قەڵغانەی بەسینگییەوە گرتبوو و دەچووە پێشێ، لە نزیکی هیکتۆردا وەستاو کەوتە هەڕ و گیڤ: "ئەی هیکتۆر، تۆ ئێستا لە شەڕی تەن بەتەندا بەتەواوەتی بۆت دەردەکەوێ کە داناییەکان چتۆ قارەمانانێکیان تێدایە! تەنانەت دوای تۆرانی (ئەخیل)ش، ئەخیلی دژمن بەزێن، و دڵشێر، کە ئێستا لە ڕقی ئاگامەمنونی سەرداری جەنگاوەران لەنێو دەریادا کونجی کەشتییەکانی گرتووە و هەقی هیچی نییە،

بەڵام تەنانەت بەو حاڵەشەوە زۆر کەسمان هەن کە دەتوانن ڕووبەڕووی تۆ ببنەوە، کەواتە ئەوە عەرز و ئەوە گەز، شەڕ شەڕ."

(٢٣٣) هیکتۆر وەڵامی دایەوە: "ئەجاکس، ئەی زیوس زادە، ئەی کوڕی تیلامون، ڕابەر و سەرداری جەنگاوەران، هەوڵ مەدە وەك ئەوەی منداڵێکی بێدەسەڵات یان ژنێکی بێ ئاگا لە فەند و فێڵی شەڕ و جەنگان، بخەیتە ترسەوە.

(٢٣٦) من زۆر شەڕی خوێناوی و کوشتارم جەڕباندووە. من دەتوانم سپەرە چەرمییەکەم بەڕاست و بەچەپا وەربگێڕم، و پێم وایە ئەمە کاری سەرەکییە لەشەڕدا. دەتوانم پەلاماری جەرگەی ئەو عەرەبانانە بدەم کە ماینانی خۆشبەز و ڕەهوان ڕایاندەکێشن، دەتوانم لە شەڕی تەن بەتەندا دڵی ئەریسی خواوەندی جەنگ خۆش بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەتەمانیم لە ناغافێ جەزرەبە لە کەسێکی وەکو تۆ بدەم —ئەگەر بۆم بکرێ بەئاشکرا و بەبێ تەڕن شەڕی تۆ دەکەم.

(٢٤٤) بەدەم ئەو قسانەوە نێزەکەی لە دەستیا هەڵسەنگاند، نێزە دەرپەڕی سپەرە حەوت چینەکەی بڕی، لە چینە دەرەکییەکەوە —واتە لە چینی هەشتەمەوە کە لە برونز چێکرابوو- وە ژوور کەوت و شەش چینی دیکەی سمی بەڵام لە چینی حەوتەمدا وەستا. ئەوجا نۆرە هاتە سەر ئەجاکس (ئەیاس)، نێزەکەی بەر سپەرە بازنەییەکەی کوڕی بریام کەوت.نووکی نێزەکە سپەرە درەخشانەکەی بڕی و لە ناوەوە زرێکەی کە هونەرمەندانە و وەستایانە دروستکرابوو، بڕی، نێزەکە ڕێك لای قەبرغەیەوە زرێکەی دڕی، بەڵام هیکتۆر خۆی لاداو ژیانی خۆی ڕزگار کرد. دوای ئەوە هەردووکیان و لەیەك کاتدا. نێزەکانیان لە سپەرەکانیان دەرهێنا، ئەوسا وەکو جووتێ شێری درندە یان دوو بەرازی کێوی بەهێز پەلاماری یەکتریاندا: کوڕی بریام نێزەیەکی کێشا بەناوەندی سپەرەکەی ئەجاکسدا، لێ برونزەکەی نەشکا، و نووکی نێزەکە خوار بووەوە. ئەوجا ئەجاکس ڕاپەڕی و نێزەیەکی کێشا بە سپەرەکەی هیکتۆردا، سپەرەکەی دیوا و دەرکرد، هیکتۆر لارەلاری پێکەوت و ملی بریندار بوو، و خوێنێکی تۆخ لە برینەکەوە فوارەی کرد، بەڵام هیکتۆر بەو حاڵەشەوە دەست بەرداری شەڕ نەبوو، دانەوییەوە و بەدەستە بەهێزەکانی بەردێکی گەورە و زبری لە عاردەکە هەڵگرت و کێشای بەگۆی سپەرەکەی ئەجاکسدا، ڕێك بەر ناوەندی سپەرەکە کەوت، برونزەکە هەمدیس زرینگایەوە.( ئەجاکس)ش بەردێکی گەورەتری هەڵگرت کە بە ئەندازەی بەرداشێك دەبوو، بایداو بایدا و تا هێزی تیا بوو کێشای بەسپەرەکەی

هیکتوردا، بەپشتا کەوت و لەژێر سپەرەکەیدا گرمۆڵە بوو.

(٢٧٢) بەڵام ئەپولۆ یەکسەر هەڵیساندەوە، هەردووک جەنگاوەر خەریك بوو بەشمشێران بەردەبوونە وێزەی یەکتری، ئەگەر پەیاماوەرانی زیوس و بەشەران فریا نەکەوتبان، ئەوەبوو تالتیبیوس و ئیدایوس کە هەردوکیان پیاوی باش و دووربین و سەنگین ڕەفتار بوون، هاتن، یەکێکیان چووە لای تەروادەییەکان و یەکێکیان چوە لای ئاخییەکان و بەدارعەساکانیان هەردوو جەنگاوەرەکەیان لێکدی دوورخستنەوە، (ئیدایوس)ی دووربین پێی گوتن: "کوڕە ئازیزەکانم، ئیدی شەڕ بەسە، دەست هەڵگرن، چونکە هەردوکتان، جوامێرن و لای زیوس ئازیز و بەڕێزن، بەڕاستی نێزەوانن، ئێمە هەموومان ئەمە دەزانین، ئەوە ئیتر شەوە، شەویش حوکمی خۆی هەیە، باشتر وایە مل بۆ حوکمی شەو بدەن."

(٢٨٣) ئەجاکسی کوڕی تیلامون وەڵامی دایەوە: "ئیدایوس، داوا لە هیکتۆر بکە ئەو قسانەی تۆ بکات، چونکە ئەو جاری شەڕی تەن بەتەنی دلێرترین جەنگاوەری ئێمەی داوە. دەبێ ئەو قسە بکات و من ئامادەم بەگوێی بکەم."

(٢٨٧) ئەوسا هیکتۆر بەرشقی دایەوە و گوتی: "ئەی ئەجاکس، ئاسمان قەد و باڵای کەڵەگەت و هێز و ژیریت بپارێزێ، ئەی باشترین نێزەوانی ناو هەموو ئاخیان با شەڕودوئێلی ئەمرۆ بەس بێ، پاشان ئەم شەڕە دەست پێدەکەینەوە تا خواوەندێك داوەریمان لەنێواندا دەکات و سەرکەوتن بەنسیبی لایەکمان دەکات، ئەوە شەومان بەسەرا هات، شەویش حوکمی خۆی هەیە، وا چاکە مل بۆ حوکمی شەو بدەین، بەو جۆرە تۆ دەڕۆیت، تا هەموو ئەو ئاخییانەی لای کەشتییەکانیان مۆڵیان داوە، بەتایبەتی دۆستان و هاوشارییانی خۆت دڵخۆش و شادمان بکەی، منیش دەڕۆم بۆ شارە گەورەکەی بریام، تا هەموو پیاوان و ژنانی تەروادەیی کە کێ برکێیانە لەسەر نوێژ و نزا لە پێناوی مندا، دڵخۆش و شادمان بکەم. جا با دیاری پێشکەش بەیەکتر بکەین تا لەنێو ئاخییایی و تەروادەییەکاندا بگوترێ بەڕاستی شەریان شەڕ بوو نەك گاڵتە، بەڵام کە ئاشتیش بوونەوە، دۆستانە لێکدی جیابوونەوە."

(٣٠٣) هەر کە لە قسەکەی بووەوە. شمشێرە زیو نیشانەکەی خۆی بەکیف و حەمایلە چەرمەکەیەوە کە هونەرمەندانە و وەستایانە دروست کرابوو، پێشکەش کرد، (ئەجاکس)ش کەمەربەندە بریقەدارە ئەرخەوانییەکەی خۆیی پێشکەش کرد. بەو جۆرە لێکدی جیابوونەوە: یەکێکیان بەرەو لەشکری ئاخییان وەڕێکەوت و ئەویتریان بەرەو

دیورای تەروادەییان، کە زۆر شادمان بوون بەوەی قارەمانەکەیان زندووە و بەسەلامەتی لە دەستانی بەهێزی ئەجاکس دەرباز بووە. بەجۆرێ بەرەو شاریان برد وەکو ئەوەی باوەڕ بەخۆ نەکەن کە ڕزگاری بووە! لەولاشەوە ئاخییەکان کە مەستی سەرکەوتنی قارەمانەکەیان بوون، ئەجاکسیان بۆلای ئاگامەمنون برد.

(٣١٣) کاتێ گەیینە خەرگەکەی ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس، ئاگامەمنون جوانەگایەکی پێنج ساڵەی لەبەر دەرگای زیوسی کوڕی کرونوس دا بۆ کردن بەقوربانی. گایەکەیان کەولکرد، گۆشتەکەیان جنی، لە شیشیان دا، برژاندیان و لە شیشەکانیان داماڵی، کە هەموو ئەو کارانەیان ئەنجامدا و دەعوەتەکەیان ئامادە کرد، هەموو بەشی خۆیان بەزیادەوە خوارد و تێربوون، شا ئاگامەمنون ڕێزی لە ئەجاکس ناو چەند پارچە پشتە مەغزەیەکی دایێ، دوای ئەوەی تێریان خوارد و خواردەوە، پیرە نەستوری دنیا دیدەی دووربینی، خاوەنی باشترین ڕاوتەگبیران هەستایە سەرپێیان. بەوپەڕی ڕاستگۆیی و دڵپاکی کەوتە قسان و گوتی:

(٣٢٧) ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی فەرماندە و سەرانی لەشکرانی ئاخیا، سەد حەیف و مەخابن چونکە ژمارەیەکی زۆر لە ئاخییان مردون. ئەریسی خواوەندی جەنگ خوێنی گەشیانی لە ڕۆخێن سکاماندروس بەرشتن داوە و گیانی هەواڵەی هادیسی خانەی مردووان کردوون، بۆیە وای بەباش دەزانم لەگەڵ هەلاتنی سپێدەدا شەڕ ڕابگرن. دەبێ مردووەکانمان بەئەسپ و عەرەبانان بگوازینەوە و لە شوێنێکی هەندێ نزیك لە کەشتییەکانمان بیانسوتێنین، تا لە گەڕانەوەدا بۆ وڵات بتوانین ئێسك و پروسکی هاوڕێکانمان لەگەڵ خۆدا بەرینەوە و بیاندەینەوە بەماڵ و مناڵەکانیان. لە نزیکی شەوتنگەکەدا ئارامگەیەکی بەرز بۆ هەموویان چێدەکەین، و شورە و دیوارێکی بەرزی بەدەوردا دەکێشین تا خۆمان و کەشتییەکانمان بپارێزێ، و چەند دەروازەیەکی مکومیشی بۆ دەکەین بۆ هاتوچۆی عەرەبانەکانمان، لە دیوی دەرەوەو بەپاڵ دیوارەکەدا خەنەکێکی قوڵ لێدەدەین، کە لە هێرش و پەلاماری عەرەبانە سواران و پیادان بمانپارێزێ، نەوەك تەروادەییانی سەرکێش لە ناکاودا هێرشمان بکەنە سەر."

(٣٤٤) بەو جۆرە قسەی کرد و هەموو سەردارەکان ئامۆژگاری و قسەکانیان پەسند کرد. لەولاشەوە تەروادەییەکان لە بورجی تەروادەدا، لە نزیکی دەروازەکانی کۆشکی شا بریامدا کۆبوونەوەیەکی لە بابەتی کۆبوونەوەکەی ئەوانیان گرێدا، کە یەکپارچە ناکۆکی

و ناڕوە و دووبەرەکی بوو. ئەنتینۆری ردێن سپی و دانا هەستاو بەمجۆرە کەوتە قسان: "ئەی تەروادەیی و دەردانیان و هاوپەیمانان گوێتان لەمن بێ، من قسەی دڵی خۆماتان بۆ دەکەم، چیم لە دڵایە ئەوەتان پێ دەڵێم. وەرن با هیلینی ئەرگۆسی و هەموو سەروەت و سامانەکەی بدەینەوە بەکوڕانی ئەتریوس و بیبەن و بڕۆن. ئێمە پەیمان و سۆزی خۆمان نەشکاندووە و ئەم شەڕەمان شەڕێکی ناڕەوایە، ئەگەر بەگوێم نەکەن، باوەڕ ناکەم هیچ بەهیچ بکەین!"

(٣٥٤) ئەنتینور ئەو قسانەی کرد و دانیشتەوە. ئەوسا باریسی مێردی هیلینی خشکۆك هەستاو گوتی: "ئەنیتنۆر من ئەم قسانەتم بەدڵ نییە، تۆ دەتوانی قسانی لەمە باشتر بکەی. خۆ ئەگەر ئەو قسانەت بەراستی بووبێ وادیارە خواوەندان هۆش و ئەقڵیان لێ سەندویتەوە و تووشی ڕەشبینی و سەرگەردانییان کردویت. ئێستا نۆرەی منە قسان بکەم، جا تەروادەییەکان من بێ پەردە و بەڕوونی پێتانی ڕادەگەیەنم کە من ئەم ژنە نادەمەوە، بەڵام سەبارەت بەو سەروەت و سامانەی لە ئەرگۆسەوە لەگەڵ خۆی هێناویەتی، ئامادەم هەر هەمووی بگێڕمەوە و بگرە لە سەروەت و سامانی تایبەتی خۆمیشی بخەمە سەر."

(٣٦٥) باریس ئەو قسانەی کرد و لەجێی خۆی دانیشتەوە. ئەوسا بریامی داردانوس زادە، پیری دووربین و ئەقڵمەند چوون خواوەندان هەستایە سەر پێیان و بەدڵێکی ساف و بێگەردەوە، بەوپەڕی ڕاستگۆییەوە ڕووی تێکردن و گوتی: "ئەی تەروادەیی و داردانیان و هاوپەیمانان گوێتان لەمن بێ با قسەی دڵی خۆمتان بۆ بکەم. ئێستا وەکو جاران لەسەر خوانی ئێوارێ دانیشن و نانی خۆ بخۆن، بەڵام بیرتان نەچێ دیدەوان و پاسەوانان لە هەموو شوێنێکی شار دابنەن و بەخۆشتان هوشیار و بێدار بن. با لەگەڵ سپێدەی بەیانیدا ئیدایوس بچێ بۆلای گەلەکەشتییەکان و ئاگامەمنون و مینیلاوس، کوڕانی ئوتریوس لەم نیاز و مەبەستەی پاریس، ئاگادار بکاتەوە، ئەو باریسەی ئەم قەرقەشە و کوشت و کوشتارەی بۆ نایەوە، هەروەها ڕای بسپێرن کە داوایان لێبکات شەڕ ڕاگرن تا مردووەکانمان دەنێژین، دوای ئەوە ئیدی دەست بەشەڕ دەکەینەوە تا خواوەندێك دێتە بەینەوە و لایەك بەسەر ئەویتردا سەر دەخات."

(٣٧٩) ئەو قسانەی کرد، تەروادەییەکان بەگوێیان کرد، لەشکر و سوپا هەر دەستەیەك لە ڕیزی خۆ لەسەر خوان دانیشتن و شیویان خوارد. لەگەڵ سپێدەی بەیانیدا ئیدایوس بەرەو کەشتییەکان ملی ڕێگەی گرت. داناییەکانی بینی، ئەو هاوڕێ و خولامانەی ئەریسی

بینی کە لە بەردەم کەشتییەکەی ئاگامەمنوندا کۆبووبوونەوە و، خۆی بەناویانا کرد، ڕاوەستاو بەدەنگی بەرز گوتی: "ئەی کوڕانی ئەتریوس، ئەی فەرماندە و سەرانی سوپای ئاخیا، بریام و تەروادەییە نەجیبەکانی دیکە منیان نادرووە ئەگەر ئێوە پێتان باش بێ تا پێشنیازی ئەلکساندەرتان پێ ڕابگەیەنم، ئەو ئەلکساندەری کە ئاگری ئەم شەڕەی هەڵگیرساندووە، ئامادەیە هەموو ئەو سەروەت و سامانەی بۆ تەروادەی هێناوە —بریا دەمرد و بەوەڕانەدەگەیی- بگەڕێنێتەوە و هەموو سەروەت و سامانی تایبەتی خۆیشی بخاتە سەر، بەڵام ژنەکەی مینیلاوس ناگێڕێتەوە، ئەگەرچی تەروادەییەکان حەزیان دەکرد لەکەری شەیتان بێتە خوارێ و ئەویش تەسلیم بکاتەوە. هەروەها بریام ڕای سپاردم کە داواتان لێبکەم کە شەڕ ڕاگرن تا مردووەکانمان بنێژین؛

(٣٩٦) دوای ئەوە دەست بەشەڕ دەکەینەوە، تا ئەو ڕۆژەی یەکێك لە خواوەندەکان بێت و لایەکمان بەسەر لایەکەی تردا سەر بخات."

(٣٩٨) بەو ئاوایە قسەی بۆ کردن. هەموو مات و خامۆش لە جێی خۆ کڕبوون، لێ دیومیدسی دەنگ دلێری مەیدانی شەڕ هەڵیدایێ و گوتی: "نە گفتوگۆ و نەسەروەت و سامان و نەهیلین-مان ناوێ. چونکە منداڵێکی بچووکیش دەزانی کە تەروادەییەکان کۆتاییانە و

(٤٠٣) کوڕانی ئاخیایی بەیەك دەنگ هاواریان کرد و پشتیوانیان لە قسەکانی دیومیدس کرد، شا ئاگامەمنون بە(ئیدایوس)ی گوت: خۆ بەگوێی خۆت وەڵامی ئاخییەکانت ژنەوت. وەڵامی وان وەڵامی منیشە. بەڵام سەبارەت بەمردووەکان، من ڕێگە لە تەروادەییەکان ناگرم کە بیان سوتێنن، چونکە کەسێك مرد نابێ سرووتی شەوتاندنی لێ قەدەغە بکرێ. با زیوسی مێردی هیرا شایەتی ئەم پەیمانەمان بێ."

(٤١٢) هەرکە ئەو قسانەی کرد گۆچانەکەی لەبەردەم هەموو خواوەندەکاندا بەرزکردەوە، ئیدایوس بەرەو شارە پیرۆزەکەی ئیلیون ملی ڕێی گرت. تەروادەیی و داردانییەکان کۆبووبوونەوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەویان دەکرد، کە گەییە جێ لە ناوەڕاستیانا وەستاو پەیامەکەی پێ ڕاگەیاندن. کە گوێیان لە پەیامەکە بوو خێرا بەخۆ کەوتن، هەندێکیان کەوتنە کۆکردنەوەی جەنازەکان و هەندێکیان کەوتنە دارهێنان. لەولاشەوە ئارگۆسییەکان لە کەشتییەکانیان وەدەرکەوتن، هەندێکیان جەنازە و بڕێکیان دار و چێویان کۆدەکردەوە.

(٤٢١) که هەردوو سوپا یەکیان بینی گزنگی هەتاو تازە دەیدا لە کێڵگە و مەزراکان و لە شەپۆلە ئارامەکانی ئۆقیانوسی قوڵەوە بەرەو قوبیەی ئاسمان پرشنگی دەهاویشت، زۆر بەزەحمەت مردووەکانیان لێکدی جیادەکردەوە، خوێنی قەتماغە بەستووی سەر زامەکانیان بەئاو شتن، و فرمێسکیان بەدیارەوە ڕشتن و لە عەرەبانەکانیان بارکردن. بریام نەیهێشت تەروادەییەکان بەدەنگی بەرز بگرین، بۆیە بەماتی و خەمینی مردووەکانیان خستنە سەر لێژنە دارەکان، دوای ئەوەی سوتاندیانن بۆ شاری ئیلیون (تەروادە) گەڕانەوە. لەولاشەوە ئاخییەکان بەهەمان شێوە، مات و خەمین مردووەکانیان لەسەر لێژنەدارەکە کەڵەکە کرد، پاش ئەوەی سوتانیانن بەرەو لای کەشتییەکانیان گەڕانەوە.

(٤٣٣) هێشتا بەتەواوەتی بەیانی نەدابوو کە دەستەیەکی هەڵبژاردە لە ئاخییەکان لە دەوری شەوتنگەکە (محرقە) کۆبوونەوە و کەوتنە کارکردن. گڵیان لە دەشتەکەوە هێناو گردۆلکەیەکیان دروستکرد، کردیان بەئارامگەیەکی گشتی بۆ هەموو مردووەکانیان، ئەوجا شورەیەکی بڵندیان بەدەوریدا کێشا تا خۆیان و کەشتییەکانیان بپارێزێ، چەند دەروازەیەکی مکومیان بۆ هاتوچۆی عەرەبانەکانیان لێ دروست کرد، لە دیوی دەرەوە و خەنەکێکی قوڵ و پانیان بەدەوریا هەڵکەند سنگی دنیایان لە ناویا چەقاند.

(٤٤٤) ئاخییەکان بەو جۆرە کاریان دەکرد، بەڵام خواوەندەکان، ئەوانەی لە دەوری زیوسی خودان چەخماخە دانیشتبوون بەسەرسامی دەیانڕوانییە کارە مەزنەکەی وان. پۆسیدونی خودانی دەریا و بوومەلەرزە هەڵیدایێ و گوتی: "ئەی باوکە، ئەی زیوس، چ بەشەرێکی فانیی سەر ڕووی زەمین جارێکی دی دێت و ڕاز و بیر و نیازی خۆی دەخاتە بەر دەستی نەمران؟ بڕوانە ئاخییەکان چۆن شورەیەکیان بەدەوری کەشتییەکانیانا کێشاوە و خەندەکێکیان بەدەوریا هەڵکەندووە بێ ئەوەی قوربانی گەورە (سەد سەر گا) بۆ خواوەندان بکەن؟ شۆرەت و ناوبانگی ئەم شورەیە تا بنی دنیا، تا ئەو شوێنەی هەتاوی لێ هەڵدێ دەڕوات، ئیدی بنیادەمان ئەو شورەیە لەبیر دەکەن کە ئەپولۆ و من بەهێزی بازوو ئارەقی نێوچەوان بۆ (لاومیدون)ی جەنگاوەرمان دروست کرد."

(٤٥٥) زیوس زۆر بێتاقەت بوو و گوتی: "ئەی خودان بوومەلەرزە، ئەی خاوەن دەسەڵات، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ ئەگەر خواوەندێکی لەتۆ کەم دەسەڵات ترە لەم کارە بترسێت هەر نەیسە، بەڵام تۆ! ناو و شۆرەتی تۆ، دەگاتە هەر شوێنێ هەتاوی لێ هەڵبێ. بێگومان گاڤێ ئاخییەکان بەخۆ و کەشتییەکانیانەوە بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێنەوە، دەتوانی ئەم دیوارە

تێك و پێك بدەی و تورێ بدەیتە دەریاوە، دەتوانی جارێکی دی کەنارەکە بکەیتەوە بەلمەلان و هەنگێ ئەم شورە مەزنە بەتەواوەتی لەبەرچاو وون دەبێت."

(٤٦٤) بەو جۆرە قسانیان دەگەڵ یەکدیدا کرد. لەگەڵ خۆرئاوادا ئاخییەکان لەکاربوونەوە، گایان لە هەموو خێوەت و خەرگاکانیاندا سەربڕی، دانیشتنە سەر خوانی شیوێ. چەندین کەشتی پڕ لە شەراب لە (لیموس)ەوە هاتبوون. ئەم کەشتیانە ئیونیوسی کوڕی جاسون ناردبوونی ئیونیوسی کوڕی جاسون لە هیبسبیلی بوو. جا ئەم کوڕەی جاسون دە هەزار پەیمانە شەرابی تایبەتی بۆ کوڕانی ئوتریوس؛ ئاگامەمنون و مینیلاوس ناردبوو، ئاخییەکان لەو کەشتیانە شەرابیان بۆ خۆ کڕی بوو، هەندێکیان بەبرونز، و هەندێکیان بەئاسن، و هەندێکیان بەچەرم و پێستە و هەندێکیان بە گوێرەکە و هەندێکیان بەدیل و کۆیلە شەرابیان کڕی بوو و نرخەکەیان دابوو. بەو جۆرە هەموو شەوەکەیان بەئاهەنگ و بەزم و شادمانی ڕابوارد، هەروەها تەروادەییەکان و هاوپەیمانەکانیشیان لە شاردا هەمان بەزمیان بۆ خۆ گێڕا.

(٤٧٧) بەڵام زیوس لە بیری ئەوەدا بوو لێیان تێکبدات، هەوەرە بروسکەیەکی گەورە و سامناکی نارد، هەموو لە ترسا زەرد هەڵگەڕان، هەموو پێکەکانیان ڕژایە سەر عاردەکە، کەسیان نەیانوێرا تاقە چۆڕێك بخۆنەوە تا هەر کەسە و پێکێکی بەناوی زیوسی توانای کوڕی کرونوسەوە نەپرژاندە سەر زەوی. ئەوسا هەموو پاڵکەوتن و چوونە باوەشی خەوی شیرینەوە.

# سروودی هەشتەم

## شەڕی حەساران

**حیکایەتەکە:**

**زیوس لە ئۆڵەمپدا کۆبوونەوەیەکی بەست و لەو کۆبوونەوەیەدا خواوەندەکانی ئاگادارکردەوە کە نەخەڵەتابن بەتەنیا و خۆسەرانە بەشداری شەڕ بکەن، هەڕەشەی ئەوەی کرد کە هەر کەسێك ئەو کارە بکات ئەوا هەواڵەی چاڵە بێ بنەکەی دۆزەخ، واتە( تارتاروس )ی دەکات و دەگەڵ کرونوسی بابی و یاخییەکانی دیدا حەپسی دەکات. هیرا و ئەتینا بەمە سەخڵەت بوون. هیرا نەیوێرا قسان بکات، لێ ئەتینا داوای لە زیوس کرد ڕێگەی ئەم و هیرا بدات تەنیا بۆ ئامۆژگاری و نسحەتان تای گریکەکان بگرن، ئەویش ڕێگەی دان هەر واش بوو کەوتە ڕێنوێنی و ئامۆژگاری ئاخییەکان. شەڕ گەرم دەبێت، یەکێك لە ئەسپەکانی نەستور بەتیری باریس دەنگێورێ، عەرەبانەکەی پەکی دەکەوێ، ئەگەر دیومیدس فریای نەکەوتبا و ئەمری نەکردبا ئەسپەکە لە عەرەبانەکە بکەنەوە و نەستوری نەخستبایە عەرەبانەکەی خۆیەوە، لەوەبوو نەستور بمرێ. هاواری لە ئودیسیوس کرد کە بێتە کۆمەکی، بەڵام ئودیسیوس گوێی ناداتێ و ڕێگەی خۆی بەرنادا. نەستور ڕمەکەی سرەواندە هیکتۆر بەڵام بەر مەیتەرەکەی کەوت، ئیدی هیکتۆر سوێی بۆ خوارد و داوای لە براکەی کرد کە عەرەبانەکە باژوێ و لەسەر هێرشی خۆی بەردەوام بوو. ئەتینا و هیرا بێهودە هەوڵیان دەدا جڵەوی خۆ بگرن، کەوتنە هەوڵی ئەوەی بەسواری گالیسکەکانیانبۆ زەوی دابەزن و کۆمەکی ئارگوسییەکان بکەن، زیوس دیتنی و ئەریسی نارد کە گوێیان بابدا، ئیدی ترسان و لە گالیسکەکانیان دابەزین و ڕێ و ڕێ گەڕانەوە، ئەوە بوو زیوس لە چیای ئیداوە بۆ ئۆڵەمپ هات و کۆبوونەوەیەکی کرد و هەڕەشەی لەو جووتە ئیزەد خانمە کرد کە ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن بەر چەخماخەیان دەدا، ئیدی کڕ و کپ بوون.**

شەڕ لەسەر زەوی بەردەوام بوو، ئارگوسییەکان توانیان هەندێ دەست لە تەروادەییەکان بوەشێنن، بەڵام هیچ پێشڕەوییەکیان پێ نەکرا، بەڵکو پاشەکشەیان دەکرد، ئیدی شەڕی گەورە لە دەوری حەسارەکە هەڵگیرسا، ئەو حەسارەی گریکەکان دروستیان کردبوو و خەنەکیان بەدەوریا لێدابوو، تەروادەییەکان خەڵکێکی زۆریان لێکوشتن. کە شەو داهات، ئەو شەوەی تەروادەییەکان حەزیان نەدەکرد بێ، و گریکەکان سێ جاران نوێژیان کرد و پاڕانەوە کە شەو زوو بەسەرا بێت و شەڕ بوەستێ، تەروادەییەکان گەڕانەوە و پاشەکشەیان کرد، هیکتۆر قسەی بۆ کردن، ئەسپەکانیان لە گالیسکەکان کردەوە، قاسیدیان بۆ شار نارد تا ئاگری چاودێری لە بورجەکانی شاردا بکەنەوە و خواردن بۆ خۆ و ئالیك بۆ ئەسپەکان بێنن، لە دەشتەکەی نێوان کەشتییەکان و روباری( ئیکسانتوس)دا گریکەکانیش ئاگری چاودێریان هەڵایساند و بێدار و وریا کەوتنە نانخواردن و ئالیکدانی ئەسپەکانیان، دەشتەکە بەئاگری چاودێری و ئاگری ئۆردوەکان بووبوو بەچراخان و ئاسمانیش لە تریفەی مانگ و جریوەی ستێراندا دەبریقایەوە. هەموو بێ ئۆقرە چاوەڕوانی سپێدەیان دەکرد.

زەمەن: کات لە بەیانی ڕۆژی بیست و حەوتەوە تا ئێوارێ دەخایەنێ.

شوێن:

دوو شوێن هەیە. شوێنی شەڕەکە لە دەشتەکەی نێوان تەروادەیی و کەشتییەکانی گریکەکان، و شوێنی کۆبوونەوەی خواوەندان لە ئۆڵەمپ، جگە لە لوتکەی ئیدای بارەگا و عەرشی زیوس کە لەوێندەرەوە چاودێری هەموو شتێك دەکات، هەر لەوێشەوە بینی چۆن ئەتینا و هیرا دەیانویست دزەبکەن بۆ سەر زەوی، و گرتنی و گەڕاندنیەوە.

(١) سپێدە بەخۆ و سەرپۆشی زافەرانییەوە دای لە زەوی و ڕوناکی کردەوە، زیوس هەموو خواوەندەکانی بانگ کرد و لە بەرزترین لوتکەی ئۆڵەمپدا کۆبوونەوەی پێکردن، و پێی گوتن: "ئەی خواوەندان و یەزدانخانمان، گوێ بگرن با قسەی دڵی خۆمتان پێ بڵێم. هیچ خواوەندێك چ نێر و چ مێ بۆی نییە قسە لە قسەم بکات، بەڵکو دەبێ هەر هەمووتان بەگوێم بکەن تا من ئەم کارە دەگەیەنمە ئاکام و ئەنجامی خۆی. هەر کەسێکتان ببینم خۆسەرانە لە گەلی خواوەندان تاك بکەوێتەوە و کۆمەك بەتەروادەیی یان داناییەکان بکات، ئەوا بەرلەوەی جارێکی دی بۆ ئۆڵەمپ بگەڕێتەوە ترۆ دەکرێت و لە کەوشەنی سیستەمی گەردونی وەدەردەنرێت، یان توری دەدەمە ناو بیری بێ بنی تاریك و نوتەکی (تارتاروس)ەوە تا هەر یەکێکتان بزانێت و دڵنیابێ کە من لە هەر هەمووان، لە هەموو خواوەندانی نێر و مێ بەهێزترم. بەهەر هەمووتان هەرچی هێز و تواناتان هەیە بیخەنە کار ناتوانن زیوسی دانا، خودانی ڕاوێژ و تەگبیران لە ئاسمانێ ڕابێننە سەر زەوی، بەڵام من بەتاقی تەنیا دەتوانم ئێوە هەمووتان بەزەوی و دەریاوە بۆ ئاسمان هەڵکێشم و بەزنجیران بەلوتکەیەك لە لوتکەکانی ئۆڵەمپەوەتان ببەستمەوە و لە ناوەندی قوبەی ئاسماندا هەڵتانواسم. تا بزانن کە من لە هەموو خواوەندان و بەشەران باڵاتر و تواناترم.

(٢٨) هەر هەموو ترسان و کڕ و کپ بوون، چونکە دەنگی لە تێری و دلێرییەوە دەهات، لێ ئەتینا سەرەنجام هەڵیدایێ: "خواوەندا، ئەی زیوسی کوڕی کرونوس، ئەی شاهنشاها، هەموومان دەزانین تۆ لەوە بەتواناتری بەربەرەکانی بکرێی، بەڵام ئێمەش دڵمان بەجەنگاوەرانی دانایی دەسوتێ، کە کار وابڕوات هەموو دەکوژرێن و قڕیان تێدەکەوێ. جا ئێمە لەسەر فەرمانی تۆ خۆ لە قەرەی شەڕی پراکتیکی نادەین، بەڵام دەخوازین هەندێ پێشنیاز و تەگبیری باش بۆ ئارگۆسییەکان بکەین تا بەیەکجارەکی غەوری پشم و غەزەبی تۆ نەبن و دوایان نەبڕێتەوە."

(٣٨) زیوس بزەیەکی بۆ کرد و گوتی: "دڵنیابە کچۆڵەکەم، کە عەزمم جەزمە، بەڵام لەگەڵ تۆدا نەرم دەبم."

(٤١) ئەو قسەیەی کرد و ئەسپە خۆشبەزە سمبرونزین و یاڵ زێرینەکانی زین کردن و لە گالیسکەکەی بەستن. و نیتاقێکی زێڕی لە کەمەری بەست، قامچییە زێرەکەی بەدەستەوە گرت و لەسەر گالیسکەکەی دانیشت. قامچییەکی لە ئەسپەکان دا، ئەسپەکان وەکو تێسکەی تفەنگ بۆی دەرچوون و ڕێگەی بەینی ئەرز و ئاسمانی پڕ ئەستێرانیان

خرنەبەر. دوای چاو تروکانێك گەییە ئیدای فرەکانیاوان، و مەڵبەندی دڕندان، و لوتکەی گارگاروس کە پەرستگە و کوشتارگە بە بۆن و بەرامەکەی لەوێندەر بوو.بابی خواوەندان و بەشەران لەویٚ ئەسپەکانی ڕاگرت و لە گالیسکەکەی کردنەوە و لە چرە هەورێکیەوە پێچان، و ئەوجا بەوپەڕی شکۆوە لەسەر بەرزترین لوتکە دانیشت و لەوێوە چاوانی بڕییە شاری تەروادە و کەشتیانی ئاخییەکان.

(٥٣) ئاخییەکان بەپەلە و لەناو کەشتییەکانیاندا ناشتایان خوارد. و ئەوجا جل و تەدارەکی جەنگیان لەبەرکرد، لەولاشەوە تەروادەییەکان لە سەرانسەری شاردا چەکیان لەخۆدا، ژمارەیان کەمتر بوو، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبا زەرو زیانێك بەژن و منداڵەکانیان بگات، زۆر سور بوون لەسەر شەڕ. دەروازەکانی شار خرانە سەر گازی پشت، لەشکر بەسوارە و پیادەوە کەوتە خۆ و، هەراو زەنایەکی سەیر هەستا.

(٦٠) هەر کە هەردوو لا گەیینە یەکدی، ئیدی هەر قەڵغان بوو و بەر یەك دەکەوت، هەر نێزە بوو و بەنێزەی دەگوت بەولاوە. ئیدی جەنگاوەران تێك ڕژان، هەر کە قەڵغانێك بەر قەڵغانێك دەکەوت دەنگ و سەدای بەرز دەبووەوە، دەنگ و هاواری مەرگ و سەرکەوتن بەرز بووەوە، زەوی لە خوێنا سوور بوو،

(٦٦) هێشتا هەر چێشتان بوو، شەڕ گەرم بوو، و هەر خەڵك بوو ودەکوژرا، لیٚ کە هەتاو بەرەو ناوەندی ئاسمان هەڵکشا، خودای خواوەندان تەرازووە زێڕینەکەی هێنا و سەنگی مەرگی هەردوو لایەنەکەی لە دوو تاکی تەرازووەکە ناو: تاکێکیان بۆ تەروادەییەکان و تاکەکەی تری بۆ ئاخییەکان، تەرازووەکەی لە ناوەڕاستەوە گرت، کە بەرزی کردەوە تاکی ئاخییەکان داکەوت و نیشتە سەر زەوی، بەڵام تاکی تەروادەییەکان بەرز بووەوە بۆ ئاسمان. هەنگیٚ خواوەندی مەزن لە ئێداوە گرماندی و چەخماخەیەکی سرەواندە ناو ئاخییەکان، کاتی ئاخییەکان ئەمەیان بینی ترس و سامیان لیٚ نیشت.

(٧٨) ئیدی نە ئیدومینویوس، و نە ئاگامەمنون و نە جووتە ئاجاکسی کوڕانی ئەریسی خواوەندی جەنگ، نەوێران خۆ بگرن. تەنیا نەستوری جرینانی نەبیٚ کە بەتەنیا وەکو قەڵغان و قەڵای ئاخییەکان لە جێی خۆی وەستا بوو، ئەویش بەحەزی خۆی نەوەستا بوو، بەڵکو یەکێك لە ئەسپەکانی پێکرابوو. ئەلکساندەری مێردی هیلینە. شۆڕیٚ تیرێکی بەترۆپکی سەریا، ڕێك بەو شوێنەدا کە یاڵی لیٚ دەڕویٚ و بەتەوێڵیا دێتە خوارەوە دابوو، ئەو شوێنە شوێنێکی یەجگار پڕ مەترسییە. ئەسپەکە کە تیرەکەی پێکەوت هەستی

بەناڕازیکی زۆر کرد، و ئەسپەکانی دیکەشی شپرزە کرد. پیرەمێرد هەڵیکێشایە شیر و ویستی هەوسار و نیرەکە ببڕێ، لێ ئەسپە خۆشبەزەکانی هیکتۆر، بەسایەقە کارامەکەیانەوە هاتنە ناوجەرگەی هەراو هەنگامەی شەڕەکە. خۆ ئەگەر دیومیدس بەنیگا تیژەکانی نەیدیبا و بەدەنگە دلێرەکەی ئودیسیوسی ئاگادار نەکردباوە کە فریای نەستور بکەوێ، ئەوا هیکتۆر بەخۆی هەر لەوێدا دەیکوشت.

(٩٤) هاواری کرد: "ئودیسیوس، ئەی خانەدان، ئەی کوڕی لایرتس، بۆ کوێ وەکو ترسنۆکان هەڵدێی و پشت دەکەیتە شەڕ؟ وریابە جەنگاوەرێکت لێ پەیدا نەبێ و نێزەیەکت بەناوشاندا بکات. ڕاوەستە و یارمەتیم بدە با نەستور لە هێرشی هیکتۆری سامناک، هیکتۆری درندە مەزەب دەرباز بکەین."

(٩٧) ئودیسیوس گوێی لێنەگرت، و بەپرتاو بەرەو کەشتییەلی ئاخییەکان دەڕۆیی. تیدیوس خۆی لە مەیدانی شەڕدا بەتاقی تەنیا بیبیننەوە، لەبەردەم ئەسپەکانی کوڕی نیلیوسدا وەستا. گوتی: ئەزبەنی ئەو جەنگاوەرە گەنجانە تەنگیان پێ هەڵچنیویت و شنگ و هێزت نەماوە،

(١٠٤) پیریش باری سەرشانی قورس کردویت، خولامەکەت بێدەسەڵاتە و ئەسپەکانت خاو و تەمەڵن. دەیسا وەرە سواری گالیسکەکەی من بە، تا بزانی ئەسپانی تیروس چتۆ ئەسپێکن و چۆن دەردەپەڕن، چەند لێهاتوانە و بەلەز بەم دەشتە بەرینەدا چ لە هێرش و پەلارمادا و چ لە گەڕانەوەدا دێن و دەچن. من ئەم ئەسپانەم لە ئینیاسی قارەمان گرتوون. ئەسپەکانی خۆت بەخولامەکانمان بسپێرە، وەرە باخۆمان یەکسەر پەلاماری تەروادەییەکان بدەین، تا هیکتۆر بزانێت کە نێزەکەی منیش لە دەستما ناهێورێ."

(١١٢) نەستوری سوارچاك، نەستوری جیرینی گوێی لە قسەکانی گرت. ئیدی هەردوو خولامەکە (ستینیلوس)ی شێرە پیاو و (یوریمیدون)ی دڵپاك ئەسپەکانی نەستوریان وەرگرت. نەستور لەگەڵ دیومیدسدا سەرکەوت. نەستور جڵەوی ئەسپەکانی گرت و بەر قامچی دان، بەپەلە لە هیکتۆر نزیك کەوتەوە، ئەوسا کوڕی تیدیوس بەدەم هێرشەوە نێزەیەکی خێواندێ، بەڵام نێزەکە بەر هیکتۆر نەکەوت، بەر ئیوبیوسی کوڕی تیبایوسی سایەق و یاوەری هیکتۆر کەوت، لە کاتێکا ئیوبیوس جڵەوی ئەسپەکانی بەدەستەوە بوو نێزەکە بەر سینگی لە ئاستی مەمکیا کەوت، بەسەر عەرەبانەکەوە دوا هەناسەی داو کەوتە خوارەوە، ئەسپەکان لاتریسکەیان بەست. هیکتۆر بەمەرگی سایەقەکەی

زۆر حەمین بوو، بەڵام بەو حاڵەشەوە وازی لێهێنا کە بکەوێتە خوارەوە، کەوتە گەڕان بەدووی گالیسکە ڕانێکی دلێردا. چونکە ئەسپەکانی بەبێ سایەق جوان ڕێیان نەدەکرد، زۆری نەبرد کە ئەخیبتولیموسی کوڕی ئیفیتوسی پەیدا کرد، سەری خست و جڵەوی ئەسپەکانی دایە دەستی.

(١٣٠) هەموو شتێك ڕوو لە نەمان بوو، ئەگەر سەرداری خواوەندان و بەشەران ئەو حاڵەی نەدیبا، ئەوا وەکو پەز لە ئیلیوندا ئابڵوقە دەدران، ئەوەبوو سەرداری خواوەندان و بەشەران فریاکەوت و بەلەز چەخماخەیەکی نارد و ڕێك لەبەردەم ئەسپەکانی دیومیدسدا کەوتەوە، وەکو گۆگرد گڕی گرت و هەڵایسا. ئەسپەکان ڕەوینەوە و جڵەوەکە لە دەستی نەستور بەربوو.ترسا و بەدیومیدسی گوت: "ئەی کوڕی تیدیوس، ئەسپەکانت بگێڕەوە و هەڵێ، نابینی کە دەستی زیوس لەگەڵ تۆدا نییە؟ ئەمڕۆ لەگەڵ هیتکۆردایە و سەرکەوتنی ئەوی دەوێ، سبەینێ نۆرەی ئێمەیە ئەگەر حەز بکا. هیچ کەسێکی فانی چەندیش بوێر و ئازابێ، ناتوانێ لەبەردەم ویستی زیوس دا بوەستێ، چونکە زیوس لەهەر هەمووان بەهێز وتواناترە."

(١٤٥) دیومیدس وەڵامی دایەوە: "ڕاست دەکەی، هەموو قسەکانت تەواون، بەڵام من ئەو دەردەم لە دڵدایە کە ڕۆژێ دێ هیکتۆر قسە بۆ تەروادەییەکان دەکات و دەڵێت: "کوڕەکەی تیدیوس لەبەرم هەڵات و ڕایکرد بۆ لای کەشتییەکان." من دەزانم بەمەوە دەفشێ، جا ئەو ڕۆژە زەوی شەق بەرێ و قوتم بدات زۆر خۆشترە لەوەی بژیم."

(١٥١) نەستور وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی تیدیوس، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ خۆ ئەگەر هیکتۆر بەتۆ بێ زەبون و ترسنۆك نەتەروادەییەکان و نە داردانییەکان باوەڕی پێناکەن، تەنانەت ژنانی ئەو جەنگاوەرە ئازایانەش کە تۆ کوشتوتن باوەڕ ناکەن."

(١٥٧) ئەو قسانەی کرد و سەری ئەسپەکانی وەرگێڕا و تا بەناو هەراو هەنگامەی شەڕەکەدا هەڵا. بەڵام تەروادەییەکان و هیکتۆر بەدەم هەرا وهەڵایەکی سەیرەوە کەوتنە تیر باران کردنیان هیکتۆر هاواری لێکردن و گوتی: "ئەی کوڕی تیدیوس داناییەکان تاکو ئێستا ڕێزیان دەگرتی و لەسەرووی خوانانەوە دایان دەنایت، و گۆشتیان دەخستە بەردەمت و پێکیان بۆ تەژی دەکردیت. بەڵام لە ئێستا بەدواوە قێزت لێدەکەنەوە، چونکە سەلماندت کە لە ژن کەمتری. بڕۆ هەی بوکەڵەی ترسنۆك، تۆ هەرگیز بەو ئاواتە ناگەی کە بورجەکانمان بلەقێنی، یان ژنەکانمان بەکەشتییەکانت بەری، چونکە قەدەر و

جارەنووس بەم دەستانەی من کۆتایی بەژیانت دێنێ."

(١٦٧) هیکتۆر بەو ئاوایە پەیڤی. کوڕی تیدیوس دوودڵ بوو لەوەی کە ئایا هەڵا یان بگەڕێتەوە و ڕووبەڕوو شەڕی هیکتۆر بکات. سێ جار پڕ بەدڵ ویستی بگەڕێتەوە، هەر سێ جارەکە زیوس لە چیاکانی ئیداوە گرماندی و ئاماژە و هێمای سەرکەوتنی بەتەروادەییەکان دا. هیکتۆر ڕووی کردە تەروادەییەکان و بەدەنگی بەرز گوتی: "ئەی تەروادەییان، لیسیان و داردانیان. ئەی جەنگاوەرانی شەڕی دەستە و یەخە، ئەی دۆستان پیاو بن و پیاوانە بجەنگن، بیر لە قارەمانێتی و سەرکەوتن بکەنەوە. وای بۆ دەچم کە زیوس نیازی پاکە و مژدەی سەرکەوتن و سەربەرزییەکی گەورەم دەداتێ، و بەشی داناییەکانیش شکست وماڵوێرانی دەبێ. چ گەوجێتییەکیان کرد کە ئەم حەسارە سستەیان بەخۆڕایی دروستکرد، ئەمە خۆی لەبەر هێزەکانی ئێمەدا ناگرێ، ئەسپەکانمان بەسەر خەنەکەکەیاندا بەئاسانی بازدەدەن، جا کاتێ دەگەمە ناوەڕاستی کەشتییەکانیان ئاگرتان لەبیر نەچێت و تا ئاگر لە کەشتییەکانیان بەربدەم و ئەوجا بکەومە کوشتنی ئەو ئەرگۆسیانەی بەحەپەساوی دەکەونە ژێر تەپو دووکەڵی ئاگرەوە."

(١٨٤) ئەوجا ئەسپەکانی دەنگدان: "ئیکسانتوس، بودارگروس، ئێوەش ئەی ئیتون و لامبوس، ئێستا چاکە و قەرزەکەم بدەنەوە، (ئەندروماك) کیژی ئیتیونی شێردڵ، خۆشترین ئالیکی دەدانێ، بادە و ئاوی بۆ لەبادیە دەکردن تا هەر کاتێ دڵتان ویستی چەندی دەتوانن لێی بخۆنەوە، ئەمە قەرزی منە بەسەر ئێوەوە، چونکە بەر لە من کە شووی ئەوم، خزمەتی ئێوەی دەکرد. کەواتە بجمێن، لەزێکەن، بەڵکو دەست بەسەر سپەرەکەی نەستوردا بگرین، سپەرەکەی لەزێڕی خالیسەیە، دەسکەکانیشی زێڕن، ئەو سپەرەی ناوبانگی گەییوەتە ئاسمان. بجمێن، لە زێکەن بەڵکو قەڵغان و زرێکەی دیومیندس بگرین، ئەو زرێیەی کە هیفایستوسی خواوەند بەتایبەتی بۆی دروستکردووە. ئەگەر ئێمە ئەم شتانە بگرین، پێم وایە ئاخییەکان ناچار دەبن هەر ئەمشەو بەکەشتییە خێراکانیان هەڵێن و بڕۆن.

(١٩٨) ئا بەوجۆرە کەوتە خۆ هەڵنان، هێرای شکۆمەند تورە بوو، خۆی لەسەر عەرشەکەی بادا، ئۆڵەمپی بەرز کەوتە جوڵە. ئەو جا ڕووی کردە خواوەندی گەورە، پۆسیدونی خودانی دەریا و گوتی: "ها خواوەندی بوومەلەرزە؟ ئەی دەسەڵاتدار تا ئێستا سۆزت بۆ ئەو داناییانەی کە دەکوژرێن نەجوڵاوە؟ خۆ چ لە هیلیکی و چ لە ئیجە قوربانیانی

رووبان بۆ کردویت؟ کەواتە فریایان بکەوە..خۆ ئەگەر هەموومان، لایەنگرانی داناییەکان، بڕیار بدەین تەروادەییەکان ڕاوبنەین و گوێ بەهەڕەشەی زیوس نەدەین، ئەوا هەر خۆی و خۆی لە لوتکەی ئیدادا دەمێنێتەوە و جگە لەوەی لێمان بڕەنجێ و بێتاقەت بێ هیچ کارێکی دیکەی پێناکرێ."
(٢٠٨) شا بوسیدون زۆر شڵەژاو وەڵامی دایەوە: "هیرا، ئەی زماندرێژ، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ ئێمەی خواوەندان نابێ دژایەتی زیوس بکەین، چونکە لەهەر هەموومان بەتواناترە."
(٢١٢) بەو ئاوایە قسانیان دەگەڵ یەکدی کرد، بەڵام هەموو ئەو مەیدانەی کە کەوتبووە نێوان کەشتییەکان و حەسارەکە و خەنەکی بەدەورا لێدرابوو، پڕ ببوو لە ئەسپ و گالیسکە و جەنگاوەران، هەموو لە گەمارۆی هیکتۆری کوڕی بریامدا بوون، چونکە زیوسی لەگەڵدا بوو. خۆ ئەگەر هیرای مەزن فریا نەکەوتبا و ئاگامەمنونی دنە نەدابا کە بەپەلە ئاخییەکان خڕبکاتەوە و تەیار بکات، ئەوا لەوە بوو هیکتۆر هەموو کەشتییە جوانەکانیان بسووتێنێ. ئەوەبوو ئاگامەمنون بەخۆ و عەبا ئەرخەوانییەکەیەوە کەوتە ناو کەشتی و ئۆردوی ئاخییەکان، لە نزیکی کەشتییە ڕەشە گەورەکەی ئودیسیوسدا کە لە ناوەڕاستی هەموو کەشتییەکاندا بوو، وەستا، لەوێوە بەدەنگێکی بەرز و ڕەسا کە هەم بگاتە خەرگەکەی ئەجاکسی کوڕی تیلامون، و هەم بگاتە خێوەتەکانی ئەخیل هاواری کرد
(٢٢٥) چونکە ئەم دوو سەردارە، کە لە توانا و دلاوەرییان دڵنیابوو، کەشتییەکانیان بردبووە پاشی ڕیزەکەوە. جا لەم شوێنەوە و بەدەنگێك کە بگاتە دوورترین شوێن، هاواری لە داناییەکان کرد و گوتی: "ئەی ئارگۆسییان، ئەی حەیاچوو خۆتان، ئەی بوونەوەرانی بودەڵە و ترسنۆك، ئێوە هەر بەڕواڵەت ئازان، ئەو فشانەمان کێوە چوو کە پڕ بەزار دەمانگوت ئێمە ئازاترین خەڵکانین؟ ئەو فشانەی لە لیمنوس و بەدەم خواردی گۆشتی برژاوی قەڵەوی قوربانیان و خواردنەوەی بادەی لێوانلێوەوە لە قەراخی کەشتییەکەدا دەمانکرد؟ خۆتان هەڵدەناو سوێندتان دەخوارد کە هەر یەکێکتان هاوتای سەد جەنگاوەری تەروادەیین، کەچی ئەوەتا ئێستا ناتوانین ڕووبەڕوی یەك کەس بوەستین، بەهەمووان خۆ لەبەر هیکتۆر ناگرین، ئەگەر کار وا بڕوات زۆری پێناچێ کە کەشتییەکانمان ئاگردەدا! ئاە ئەی بابا، ئەی زیوس، ئایا پێشتر هیچ شایەکی گەورەت بەم ڕادەیە کەساس و داماوو بێناز کردووە؟.. لەگەڵ ئەوەشدا من دڵنیام لەم سەفەرە شومەدا بۆ ئێرە، کەشتیەکەم بەلای هەر قوربانگە و میحرابێکی تۆدا تێپەڕی بێ، چەوری و ڕانی گام بۆ سوتاندوی، قوربانیم بۆ کردویت، بەو

تومیدەی بورجە مکومەکانی تەروادە تێك و پێك دەدەم. کەواتە ئەی سەرداری خواوەندان ئەم نوێژ و نزا و دوعایەم لێ قەبوڵ بکە —فریامان بکەوە و بەلای کەمەوە دەرفەتی هەڵاتن و ڕزگاریمان بۆ بڕەخسێنە، و ڕێ مەدە ئاخییەکان بەمجۆرە لەسەر دەستی تەروادەییەکان بەیەکجاری تیا بچن،

(٢٤٥) بەوجۆرە پاڕایەوە ولاڵایەوە، زیوس بەزەیی بەفرمێسکەکانیا هاتەوە وبەڵێنی دایێ کە گەلەکەی لە فەوتان ڕزگار بکات، و دەم و دەست شەهێنێکی بۆ ناردن کە لە هەر باڵندەیەکی دیکەی پێ هەژتربوو، ئەم شەهێنە کارمامزێکی بەچنگاڵەکانی هەڵگرتبوو، گەییە ئاستی ئەو میحرابەی کە ئاخییەکان قوربانیان بۆ زیوس تیا دەکرد، کارمامزەکەی خستە خوارەوە، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا مژدەیەك بوو، کە خەڵکەکە باڵندەکەیان بینی لای زیوسەوە هاتووە، یەکسەر ورەیان بەرز بووەوە وبەجورئەتەوە پەلاماری تەروادەییەکانیان دا.

(٢٥٣) هەرچەند داناییەکان ژمارەیان فرەبوو، بەڵام تاقە جەنگاوەرێکیان تیانەبوو بەخۆی بفشێ و بتوانێ بێ بەر لە کوڕی تیدیوس بەخۆ و عەرەبانەکەیەوە لە خەنەکەکە پەڕیوەتەوە و چووەتە شەڕ، کوڕی تیدیوس بەر لەهەر کەسێکی دی توانی جەنگاوەرێکی چەکداری تەروادەییەکان بکوژێ، جەنگاوەرەکە ئیجلاوسی کوڕی فرادمون بوو. ئەمە سەری ئەسپەکانی وەرگێڕا بوو تا هەڵێ. بەڵام هێشتا بەتەواوی پێچی نەکردبووەوە، کە دیومیدس نێزەیەکی لەنێوان هەردوو شانییەوە بەپشتیا کرد و لەسینگی چەقاند، ئیدی لەسەر عەرەبانەکەوە بەپێشا ڕما و تاقم و ئەسەلەحەکەی بەتەق و هوڕ بەسەریا کەوت.

(٢٦١) ئەوجا کوڕانی ئەتریوس- ئاگامەمنون و مینیلاوس- هاتن، ئەوجا جووتە ئەجاکس کە دلێرییان بەباڵادا بڕابوو هاتن... لەدوای ئەوانەوە ئیدومینیوس و هاوڕێکەی- میریونیس، کە هاوتای ئەریسی سامناك بوو، هاتن. ئەوسا یوریپیلوسی کوڕی ئیویمونی شێرە پیاو هات، و نۆیەمیان تیوسیر بوو کە خۆی دەدایە پاڵ سپەرەکەی ئەجاکسی کوڕی تیلامون. هەر کە ئەجاکس سپەرەکەی دەجوڵاند، تیوسیر دەیڕوانییە دەروبەر، تیرێکی دەسرەواندە ئاپورای جەنگاوەرەکان، هەر کە جەنگاوەرێکی دەنگاوت، دەکەوت و دەمرد، خێرا دەگەڕایەوە و وەکو منداڵێك پەنا بەرێتە بەر باوەشی دایکی، بۆلای ئەجاکس دەهاتەوە و خۆی دەدایە پەنای سپەرەکەی ئەو.

(٢٧٣) یەکەمین تەروادەیی کێ بووکە بەدەستی تیوسیر کوژرا؟ یەکەمین کەس ئورسیلوخوس بوو، ئەوجا ئورمینوس، ئوفیلیستیس و دیاتور و کرومیوس و ئەموباونی کوڕی بولیامون و

لیکۆفۆنتیسی نیمچە خواوەند و میلانیبوس بوون. هەر هەموو ئەمانە بەدەستی تیوسیر و تیری ئەو گلان و کوژران.گاڤێ ئاگامەمنون –سەرداری بەشەران- ئاوای بینی زۆری کەیف هات کە بەخۆ و پیرەکەوانەکەیەوە تەروادەییەکانی بەو ئاوایە شپرزە و پەرێشان کردووە. چووە لایەوە و گوتی: "تیوسیر، ئەی خۆشەویست، ئەی فەرماندەی ئەم سوپایە، بەو جۆرە تیری خۆت بهاوێژە، تا ببیە تروسکەی هیوا بۆ داناییەکان و بۆ تیلامونی بابت، ئەو بابەی کە بەساوایی هەرچەندە بەحەرامی خستبووتیەوە، بەخێو و پەروەردەی کردیت، هەرچەندە زۆر لێرەوە دوورە بەڵام سەربەزر و شەرەفمەندی بکە، رووسووری بکە. بەڵام سەبارەت بەتۆ وەعد و بەڵێنی پیاوت دەدەمێ کە ئەگەر زیوس و ئەتینا دەستیان دام و توانیم شاری ئیلیون بگرم، ئەوا دووەمین گەورەترین خەڵات و دەسکەوت، لەدوای من بۆ تۆ دەبێ ئیدی ئەم خەڵاتە سێ ئەسپ بێ یا دوو ئەسپ و عەرەبانەیەك بێ، یان ژنێ بێ و لەگەڵتا بخەوێ."

(٢٩٢) تیوسیر وەڵامی دایەوە: "ئەی مەزنی مەزنان، ئەی مەزنترین کوڕی ئوتریوس، من پێویستم بەهاندان نییە. لەو ساوە کە پاشەکشەمان بەتەروادەییەکان کردووە، تیرەکانم چاو لەڕێی تەروادەییەکانە تا بیانکوژم، تا ئیستا هەشت تیرم هاویشتووە و هەشت جەنگاوەرم لە تەروادەییەکان خستووە، بەڵام ئەم سەگە هارەم پێ ناپێکرێ."

(٣٠٠) بەدەم ئەو قسانەوە تیرێکی دیکەی گرتە هیکتۆر، بەڵام هیکتۆر خۆی لادا و تیرەکەی پێ نەکەوت، تیرەکە بەر سینگی گورجیتیونی کوڕی بریام کەوت.

(٣٠٥) ئەم کوڕە، لە کاستیانیرا بوو، کاستیانیرا لە جوانی و بەژن و باڵادا شانی لە شانی یەزدان خانمان دەدا، بریام لەشاری ئیسیمی خواستبووی. ئێستا ئەم کوڕە وەکو گوڵی خەشخاشی پڕ بەری ناو باخی تەژی گوڵان چۆن تاوە بارانێکی بەهاری لێی دەدا و مل لار دەکاتەوە، بەو ئاوایە سەری لەژێر کێوخودە قورسەکەیدا لار بووەوە.

(٣١٠) جارێکی دیکەش تیرێکی ئاڕاستەی هیکتۆر کرد، پڕ بەدڵ حەزی دکرد بیکوژێ، ئەمجارەش نەیگرت و ئەپولۆ فریای کەوت، بەڵام تیرەکە بەر گالیسکەڕانە بێباك و شەڕکەرەکەی هیکتۆر کەوت، واتە بەر ئەرخیسبتولیموس کەوت، بەر سینگی، لە ئاستی مەمکییەوە کەوت. کە ئەو لە عەرەبانەکە کەوتە خوارێ و دوا هەناسەی دا، ئەسپەکان ڕەوینەوە. هیکتۆر بەکوژرانی سایەقەکەی زۆر خەمبار بوو، بەڵام بەهۆی ئەو هەموو تیرەی لەسەری بوو، لەوێ بەجێهێشت و دەستوری بەکیبریونیسی برای کە لەلایەوە بوو، دا کە جڵەوی ئەسپەکان بگرێتە دەست. کیبریونیس بەگوێی کرد. هیکتۆر نەڕاندی

وخوێ لە عەرەبانەکەوە هەڵدایە خوارێ، پڕی دایە بەردێك و بەقەستی کوشت گرتییە تیوسیر. تیوسیر لەم کاتەدا خەریك بوو تیرێکی لە تیردانەکەی دەردێنا و دەیخستە سەر کەوانەکەی، لەو کاتەدا کە ژێیەکەی رادەکێشا تا تیرەکە بهاوێ، هیکتۆری نەبەرد، بەردەکەی خێواندێ و رێك بەر کەڵەمە رەقەکەی نێوان گەردن و سینگی کەوت، ئەمە شوێنێکی زۆر خەتەرناکە، دەست و بازووی تیوسیر سست بوو و کەوانەکەی لە دەست کەوتە خوارەوە و بەخۆیشی بەچۆکا هات. کە ئاجاکس بینی براکەی کەوت، بەغاردان بەرەولای چوو، بەدەوریا سوڕایەوە بەسپەرەکەی دایپۆشی. ئەوسا دوو دۆستە دڵسۆزەکەی، میکسیتوسی کوڕی ئیخوس، و ئالاستوری مەزن، بەپەلە خۆیان گەیاندێ و هەڵیانگرت و بەدەم ناڵەناڵی پڕ ئازارییەوە بەرەو کەشتییەکانیان برد.

(٣٣٥) لەم کاتەدا زیوسی خودانی ئۆڵەمپ جارێکی دی وورەی خستەوە بەر تەروادەییەکان، ئیدی چەشە بوون و ئاخییەکانیان بەرەو خەنەکە قوڵەکەیان راونا. هیکتۆر کە یەکپارچە جۆش و خرۆش و هێز و وورە بوو، لە ریزی پێشەوە رێی دەکرد، وەکو چۆن سەگێك دەکەوێتە سەر بەرازە کێوییەك یان شێرێك و لە دواوە قەپ بەکەفەڵ و لاتەرافیا دەکات و بەدەوریا دەسوڕێتەوە، هیکتۆریش بەو ئاوایە ئاخییەکانی راودەنا، هەر کەسێکیان دواکەوتبا دەیکوشت. وەختێ بەدەم هەڵاتنەوە لە سنگەکان و خەنەکەکە دەپەڕینەوە خەڵکێکی زۆریان لەلایەن تەروادەییەکانەوە لێ کوژرا،

(٣٤٤) ئەوانی دیکەیان بەپەرێشانی گەیینە لای کەشتییەکانیان و یەکتریان بانگ دەکرد،. هەموو بەجارێ دەستیان بۆ هەموو خواوەندەکان بەرزدەکردەوە، و هەر کەسە و لەناخی دڵەوە لێیان دەپارایەوە، بەڵام هیکتۆر بەپڕتاو ئەسپەکانی بەم لاو بەولادا تاو دەدا. و چاوەکانی وەکو چاوانی گورگون یان چاوانی ئەریسە سامناکی خواوەندی شەڕ دەگێڕا.

(٣٥٠) وەختێ خیرا ئەو حاڵەی بینی دڵی بەئارگوسییەکان سوتا. روویکردە ئەتینا و بەراشکاوی پێی گوت: "ئەیەڕۆ، ئەی کیژەکەی زیوسی سپەر هەڵگر، ئەرێ شتێ لە پێناوی ئەم دانابیانەدا نەکەین، کەوا بڕبڕ دەکوژرێن؟.. ئەگەر تەنیا بۆ ئەمجارەش بێ؟.. تۆ بڕوانە چۆن دەمرن و لەبەردەم یەك پیاودا هەڵدێن و دوایان دەبڕێتەوە. هیکتۆری کوڕی بریام غەرقی غەزەبێکی توند بووە، و ڕۆژ و ڕۆژگاری رەش کردوون".

(٣٥٧) ئەتینا وەڵامی دایەوە: "ئای کە حەزم دەکرد ئەم پیاوە لە وڵاتی خۆیدا و بەدەستی ئارگۆسییەکان بکوژرایە. بەڵام زیوسی بابم زۆر تورەیە، بەناهەق هەموو

ئاوات و خۆزگەکانی جڵەو کردووم. هەرگیز ئەوە وەبیر خۆی نایەنێتەوە کە چەندین جار کوڕەکەیم —هیرکول- ماندوو و مردوو بەدەست کارە قورسەکانی یوریستیوسەوە، ڕزگار کردوە. هیرکول هێند بەکوڵ دەگریا هاوار و فریادی دەگەییە ئاسمان، زیوس دەیناردم بۆ سەر زەوی تا کۆمەکی بکەم. ئەگەر ئەوسا پێشبینی ئەمەم دەکرد و دەمزانی —کاتێ یوریستیوس بۆ هادیس- خانەی مردووان-ی نارد تا سەگەکەی دۆزەخی لە (ئێریبوس)ەوە بۆ بێنێ، هەرگیز نەمدەهێشت بەزندوویەتی لە ئاوە قوڵەکەی ڕوباری ستیکس دەرباز بێ. کەچی سەرباری ئەوەش من دەبوغزێنێ، و تیتیس دەلاوێنێ و ڕێگەی دەدات بێ بۆلای، لاقی ماچ بکات و دەست بەردێنیدا بێنێ، لێی بپاڕێتە وە کە دەست بەباڵی ئەخیلەوە بگرێ و شکۆ و بەرزی پێ ببەخشێت. باوابێ، هەر ڕۆژێ دێ بەکیژە ئازیزە چاو جوانەکەی بانگم بکات. ئەوسا خۆم دەزانم دەبێ چ بکەم. جارێ تۆ هەڕە ئەسپە سم تیژە ڕەهەوانەکان بۆ هەردوکمان ئامادە بکە. تا من بچم لە کۆشکەکەی زیوسدا جلی جەنگ لەبەر بکەم و خۆ بۆ شەڕ ئامادە بکەم، جا با بزانم هیکتۆری کوڕی بریام لە مەیدانی شەڕدا ڕووبەڕوومان دەبێتەوە یان وەکو پیاوێکی تەروادەیی بێ ناو ونیشان لە نزیکی کەشتی ئاخییەکاندا دەکەوێ و دەبێ بەخۆراکی سەگ و قەل و داڵان."

(٣٨١) ئەتینا بەو ئاوایە قسەی کرد، هیرای قۆڵ و بازوو سپی، کیژی کرونوسی مەزن بەگوێی کرد، هەستاو چوو ئەسپەکانی، کە سەر کەللەی زێڕیان هەبوو، ئامادەکرد، ئەتینای کیژی زیوسی سپەرداریش.

(٣٨٥) کراسە جوانە دەستچنەکەی خۆی لەبەر دەرکەی کۆشکەکەی بابیا داکەند و کراسەکەی زیوسی لەبەرکرد و تەیار بوو بۆ شەڕ. ئەوجا سواری عەرەبانە پرشنگدارەکەی بوو، ئەوجا دلێرانە و توند ڕمەکەی گرت، ئەو ڕمەی دەبووە بەڵای گیانی ئەوجەنگاوەرانەی لێیان تورە دەبوو، هیرا ئەسپەکانی بەرقامچی دا، دەروازەکان خۆ بەخۆ و بەجیڕ و هۆڕ کرانەوە، ئەو دەروازانەی کە خواوەندانی سەعاتان پاسەوانیان دەکرد، و ئەمانە کاریان ئەوە بوو هاتوچۆی خەڵکی لەنێوان ئاسمانی مەزن و ئۆڵەمپدا ڕێکبخەن، بۆیان هەبوو دڕ بەهەوران بدەن یان چڕتری بکەن. ئەسپە گوێڕایەڵەکانی جووتە یەزدانخانم لەو دەروازانەوە وەدەرکەوتن

(٣٩٧) لێ کە بابەزیوس لە ئیداوە بینینی زۆر تورە بوو، یەکسەر ئیریسی زێڕینباڵی بەپەیامێکەوە بۆ لا ناردن: "هەڕە ئیریس خێرا بڕۆ و بیانگێڕەوە و مەیەڵە بێنە نك من،

جونکه ئەگەر بێن، لێمان دەبێت بەشەڕێکی خراپ و شێتانە. ئەوەی دەیڵێم ئەنجامی دەدەم. ئەسپەکانیان شەل دەکەم، هەردوکیان لە گالیسکەکەوە فڕێ دەدەمە خوارێ، و گالیسکەکەیان پارچە پارچە دەکەم. بروسکەیەکیان لێدەدەم کە تا دە ساڵ زامەکانیان خۆش نەبێتەوە، هەنگێ کیژە چاوکەسکەکەم دەزانێ شەڕی باب چ دەگەیەنێ. بەڵام زۆر لە هیرا توڕە نیم، چونکە فێرە هەمیشە دژایەتیم بکات."

(٤٠٩) زیوس قسەی خۆی کرد. ئیریس لە لوتکە بەرزەکانی ئیداوە بەرەو بەرزترین لوتکەی ئۆڵەمپ بۆی دەرچوو، وەکو با ڕێگەی دەبڕی. لەبەر دەروازەی دەرەوەی ئۆڵەمپی هەزاربە هەزارا  پێیان گەیی و پەیامەکەی پێڕاگەیاندن. گوتی: ئەوە کێوە دەچن؟ شێت بوون؟ کوڕی کرونوس ڕازی نابێ بچنە هیمدادی ئارگۆسییەکان. هەروا هەڕەشە دەکات و هەڕەشەکەشی جێبەجێ دەکات: ئەسپەکانتان شەل دەکات، لە عەرەبانەکەتانەوە تورتان دەدات و گالیسکەتان پارچە پارچە دەکات. بروسکەیەکتان لێدەدا کە تا دەساڵ برینەکانتان ساڕێژ نەبێتەوە، هەنگێ دەزانی ئەی یەزدانخانمی چاو کەسك شەڕی باوك چ دەگەنێ. بەڵام سەبارەت بەهیرا زۆر لێی پەست نییە، چونکە فێرە هەمیشە دژایەتی هەموو بڕیارەکانی بکات. بەڵام تۆ ئەی بێ شەرمی بێ حەیا و ناموس، بەچ چاو و ڕوویەکەوە شیر لە ڕووی زیوسی بابتدا هەڵدەکێشیت؟

(٤٢٥) ئیریس ئەو قسانەی کرد و بەپەلە گەڕایەوە. هیرا بەئەتینای گوت: "ئەی کیژی زیوسی سپەردار، بەڕاستی من ئامادەنیم چیتر لە پێناوی بەشەری فانیدا دژایەتی زیوس بکەین، وازیان لێ بێنە، دەژین دەمرن، هەر کەسەو چارەنووسی خۆی، (با زیوس)ش بەدڵی خۆی قەراری خۆی لەمەڕ تەروادەیی و داناییەکان بدات."

(٤٣٢) هیرا ئەو قسانەی کرد، و سەری ئەسپەکانی وەرگێڕا. یەکسەر پاسەوانەکان –نیگابانی سەعاتان- ئەسپەکانیان لە عەرەبانەکان کردنەوە و لەسەر ئاخوڕەکانیان بەستنەوە و عەرەبانەکەیان نا بەدوا دیواری حەوشەکەوە ئەوسا هەردوو یەزدانخانم لەنێو خواوەندەکانی دیدا، بەتوڕەیی و دڵی پڕ خەم و پەژارەوە، لەسەر عەرشە زێڕینەکانیان دانیشتن.

(٤٣٨) ئەوسا زیوس بەعەرەبانەکەی لە ئیداوە بەرەو ئۆڵەمپ وەڕێکەوت و گەیشتە ئەنجومەنی خواوەندان. (بوسیدون)ی خواوەندی بوومەلەرزە ئەسپەکانی لە عەرەبانەکە کردنەوە و عەرەبانەکەی لە شوێنی خۆی دانا و پەردەیەکی پێدادا. ئەوجا زیوس هات و

لەسەر عەرشە زێڕینەکەی ڕۆنیشت، ئۆڵەمپ لەژێریا لەرزی، ئەتینا و هیرا، بەتەنیا و دوور لە زیوس لە سوچێکەوە دانیشتبوون، نەقسەیان دەکرد و نەپرسیاریان هەبوو، زیوس لە مەبەستیان حاڵی بوو، گوتی: "ها ئەتینا و هیرا، بۆچی زویر و توڕەن؟ پێناچێ ماندوو و شەکەتی کوشتاری تەروادەییان بن، چونکە ئێوە زۆرتان ڕق لێیانە؟ با وابێ، چ دەبێ با ببێ، مادامێکی هێز و توانایەکی بێ هاوتام هەیە، بەهەموو ئەو خواوەندانەی کە لە ئۆڵەمپدان ناتوانن ساردم بکەنەوە و ڕێگەم لێبگرن. بەڵام ئێوە بەرلەوەی شەڕ و ئاکامە ترسناکەکانی شەڕ بدینن لەرزتان لێدێت. بۆیە پێتان دەڵێم کە ئەگەر بروسکەیەکم لێی دابان، هەرگیز نەتان دەتوانی جارێکی دی بەعەرەبانەکەتان بۆ ئۆڵەمپ، بارەگای نەمران بگەڕێنەوە."

(٤٥٧) ئەتینا و هیرا کە بەلای یەکەوە دانیشتبوون، هەر پیشیان دەخواردەوە ولەناخی خۆدا ڕقی زیاتریان لە تەروادەییەکان هەڵدەگرت. ئەتینا کڕ و کپ، ورتەی نەدەکرد، چونکە زۆر زۆر لە باری پڕبوو، لێ هیرا خۆی پێنەگیرا و گوتی: "ئەی کوڕی کرونۆسی بەسام، ئەوە تۆ چ دەڵێیت؟ ئێمە هێز و توانای بێ وێنەی تۆ دەزانین، ئێمە تەنیا جۆرە هاوسۆزییەك دەگەڵ ئەو جەنگاوەرە داناییانەدا دەکەین کە تووشی ئەم ڕۆژە ڕەشە بوون و بەرەو لەناوچوون دەچن.

(٤٦٥) جا ئێمە مادامێکی ئەمری تۆ وایە، دەستبەرداری جەنگ دەبین و بەشداری پراکتیکی لەشەڕدا ناکەین، بەڵام هەندێ ئامۆژگاری و پێشنیازان پێشکەش بەئارگۆسییەکان دەکەین تا هەموویان بەهۆی پشم و غەزەبی تۆوە نەمرن."

(٤٦٩) زیوس وەڵامی دایەوە: "ئەی هیرا، ئەگەر دەتەوێ کاری وابکەی، ئەوا سبەی بەیانی بەچاوی خۆت دەبینی کە کوڕە هەرە بەهێزەکەی کرونوس، چۆن زۆرترین ژمارەی ئارگوسییان لەنێو دەبات، چونکە هیکتۆری فیلەتەن دەست لە شەڕ و کوشتار هەڵناگرێت تا ئەخیلی کوڕی بیلیوس ڕانەپەڕێت و شەڕ نەکەوێتە بەر تەنگە شومەکانی بەرایی کەشتییەکان و لەسەر تەرمەکەی بترۆکلوس هەڵنەگیرسێت. ئیدی ئەمە ئەو فرمانەیە کە دراوە. ئیدی بەلامەوە گرنگ نییە ئەگەر بۆ بنی عەرز و دەریات ڕەوانە بکەم، کە ئیابیتوس و کرونوس لەوێ، لە تارتاروسدا بەبێ تیشکی هەتاو و بێ هیچ شنە بایەك لێی کەوتوون.. وادیارە داناسەکنێن تا بۆ ئەوێتان تور نەدەم، من گوێ بەخوتە و بۆڵەی ئێوە نادەم، چونکە گەورەترین ئاژاوەچین."

(٤٨٨) هێرا هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، لەم کاتەدا تیشکی درەخشانی خۆری شکۆمەند خۆی بەئۆقیانوسدا کرد و شەو باڵی بەسەر زەویدا کێشا. تەروادەییەکان هاتنی شەویان پێناخۆش بوو، بەڵام ئاخییەکان سێ جاران لە خودا پاڕابوونەوە کە شەویان بەسەردا بێ.

(٤٨٩) هیکتۆر پێش تەروادەییەکان کەوت و لە کەشتییەکانی دوورخستنەوە، و لە تەختانییەکی کراوەی نزیکی ڕوبارێکدا، کە لە جەنازان خاڵی بوو کۆبوونەوەیەکی پێکردن. لەوێندەر هەموو لە گالیسکەکانیان دابەزین، لەسەر ئەرزەکە دانیشتن و گوێیان بۆ وتەکانی شل کرد. ڕمێکی بەدەستەوە بوو یازدە گەز درێژ بوو، نووکی ڕمەکەی لەلای پێشەوە دەبریسکایەوە، ئەڵقەیەکی زێڕ بەدەوری ڕمەکەوە بوو، ئەڵقەکەی گرت و کەوتە قسان: "ئەی تەروادەییان و داردانیان و هاوپەیمانان گوێتان لەمن بێ. من پێم وابوو ئەمڕۆکە هەر هەموو کەشتی ئاخییەکان و سەرنشینەکانیان تێك و پێك دەدەم بەرلەوەی بۆ ئیلیون بگەڕێمەوە، بەڵام زۆر زوو شەو داهات و ئەمە فریایان کەوت، خۆیان و کەشتییەکانی سەر کەنارەکانی ڕزگار کرن. بۆیە دەبێ هەنوکە مل بۆ حوکمی شەو بدەین و خوانی ئێواریێ ئامادە بکەین، ئەسپەکان لە گالیسکەکان بکەنەوە و ئالیکیان بدەنێ. ئەوجا بەلەز بچنە شار و گاو پەزان بێنن،

(٥٠٦) بادە و شەراب ئامادە بکەن، دارێکی زۆر خڕبکەنەوە، چونکە تاکو بەیانی ئاگری دیدەوانی و چاودێری دەکەینەوە، ئاگرێکی وەها بڵێسەی بگاتە ئاسمان. چونکە لەوەیە ئاخییەکان بیانەوێ بە شەو لە دەریاوە هەڵێن، جا نابێ بێڵین ئەم کارە بەئاسانی بکەن، دەبێ هەر جەنگاوەرێکیان مۆرێکی بەپشتەوە بنرێ و لە ماڵی خۆیدا تیماری بکات، ئیدی دەبێ کاتێ خۆ وەنا و کەشتیەکانیان داوێن، هەریەکەیان تیرێ، سەرەنێزەیەکی بەربکەوێ، تا ببنە عیبرەت بۆ خەڵکانی دی و بزانن جەنگ چییە و لە تەروادەییانی ڕامکەرێن ئەسپان بترسن. ئەوجا با جاڕچییان بەناو شار بکەون و جاڕ بدەن کە گەورە و بچووك لەسەر بورجەکان کۆببنەوە. باهەر ژنێك ئاگرێکی گەورە لە ماڵی خۆیدا بکاتەوە و بەوردی چاودێری بکەن، نەبا کەمینێکی دژمن لە ناخافڵدا و لەو دەمەدا لەشکر لە دەرێی حەسارە، خۆ بەشاردا بکات. ئەی تەروادەییان تەمەشای من بکەن، با ئەمە جاریێ وەکو پێم گوتن وابێ، و ئامۆژگاریەکانم لە گوێ بگرن، بەیانی تەعلیماتی زیاترتان دەدەمێ. لە زیوس و لە هەموو خواوەندەکان دەپاڕێمەوە کە دەستمان بدەن تا ئەو

سەگانە لە وڵاتەکەمان وەدەربنەین، کە قەدەر و چارەنووس وای هانی بەدەست خۆیان و کەشتییەکانیانەوە ماندوو ببین. جا با ئەم شەو خۆمان پاس بکەین، بەڵام سپێدە زوو دەبێ ڕابین و چەك و تەدارەکی جەنگ لەخۆ بدەین و هێرشێکی بێڕەزا بکەینە سەر کەشتی ئاخییەکان. هەنگێ دەزانم کە ئاخۆ دیومیدسی بەتوانا، کوڕی تیدیوس دەمبەزێنێ و لەلای کەشتییەکانەوە بەرەو حەسارەکەم ڕاودەنێ، یان من ئەو دەکوژم و دەست بەسەر کەلوپەل و تەدارەکە خوێناوییەکەیدا دەگرم. سبەینێ ئازایەتی خۆی بۆ دەردەکەوێ و دەزانێ کە ئاخۆ بەرگەی ڕم و نێزەی من دەگرێت یان نا. پێم وایە سبەینێ زوو ئەو لە ڕیزی یەکەمی ئەو کەسانەدا دەبێ کە دەکوژرێن، و هاوڕێکانی لە دەوری خڕ دەبنەوە، ئاە بریا نەمر دەبووم و هەرگیز پیر نەدەبووم. خۆزگە وەکو ئەتینا و ئەپولۆ سەرفراز و خۆشەویست دەبووم. بەهیوام ئەمڕۆ ڕۆژی بەدبەختی و نەگبەتی ئارگۆسییەکان بێ."

(٥٤٢) هیکتۆر ئەو قسانەی کرد و تەروادەییەکان لە خۆشیا کەوتنە چەپڵە لێدان. ئەسپەکانیان، کە لە ئارەقەدا هەڵکشا بوون، لەژێر نیران هێنایە دەرێ و هەر کەسەو ئەسپی خۆی بەعەرەبانەی خۆیەوە بەستەوە. بەپەلە بۆ شار چوون و گاو پەزانیان هێنا، بادەو نانیشیان لە ماڵی خۆ هێنا و دارێکی زۆریان کۆکردەوە.

(٥٤٩) ئەوجا قوربانییەکی سەد سەرییان پێشکەش بەخواوەندان کرد، بۆن وبەرامەی گۆشتی برژاو دەگەییە ئاسمان —بەڵام خواوەندان قوربانییەکەیان قەبوڵنەکرد، چونکە حەزیان لە چارەی تەروادەو بریام وگەلی تەروادە نەدەکرد. بەو جۆرە بەدرێژایی شەو، دڵ پڕ لە هیوا، لە نزیکی سەنگەرەکانەوە بەبێداری دانیشتن و ئاگرێکی زۆریان کردەوە. وەکو چۆن ستێران لە شەوێکی کپ و بێ سروەدا بەدەوری مانگی مانگدا دەدرەوشێنەوە و هەموو هەوراز و نشێو و پەنا و پەسێرێکی سەر زەوی ڕوناك دەکەنەوە و چ شتێك ئارامی و هێمنی ئاسمان ناشێوێنێ، و هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان دەردەکەون و دڵی شوان پێیان خۆش دەبێ —بەو ئاوایە ئاگرێن چاودێری لەبەردەم ئیلیوندا، لە ناوەندی کەشتییەکان و ڕوباری ئیکسانتوسدا، دەبریسکانەوە و هەزار ئاگری پاسەوانی و چاودێری لە دەشتەکەدا دەچوو بەئاسماندا و هەر ئاگرێك پەنجا جەنگاوەری بەدەورەوە بوو و ئەسپەکان لە پاڵ عەرەبانەکاندا دەلەوڕین و چاوەنۆڕی هەڵاتنی سپێدە بوون.

# سروودی نۆیەم

## شاندی ئاشتەوایی (ئاشتێتی)

**حیکایەتەکە:**

**تەروادەییەکان دوای ئەو سەرکەوتنەی بەدەستیان هێنا، سوربوون لەسەر ئێشك گرتنی ورد، لەولاشەوە ئاخییەکان ترسیان لێی نیشتبوو و تیامابوون چۆن بەیانی بەرەنگاری هێرشی تەروادەییەکان ببنەوە، ئاگامەمنون دەیویست بار و بنەیان وەپێچن و کەشتییەکانیان بخەنەوە ئاوێ و بۆ وڵاتی خۆ بزڤرنەوە. لێ دیومیدس ڕایەکی دیکەی هەبوو، ڕای وابوو کە وەمێنن و مقاوەمەت بکەن. لێرەدا نەستور ڕابوو و پێشنیازی کرد کە شاندێك بچن بۆلای ئەخیل، چونکە ئەگەر تووڕە بوون و تۆرانی ئەو نەبایە ئاخییەکان ئەمەیان بەسەر نەدەهات. ئاگامەمنون قایل بوو، و ڕازی بوو بەوەی کە ئەو ئافرەتە دیلەی لێی داگیر کردبوو بۆ بنێرێتەوە، و سوێندی خوارد کە نە ئیلاقەی کردووە و نە لەگەڵیا خەوتووە. زێدەباری ئەمەش کە چوونەوە بۆ وڵات حەوت کیژی جوانی بداتێ لەگەڵ زەوی و زارێکی بەپیت و بڕشتدا، هەروەها دەیکات بەزاوای خۆی و یەکێك لە سێ کیژەکەی خۆی دەداتێ، و کە تەروادەش گیرا ئەوا کەشتییەکەی بۆ تەژی دەکات لە زێڕ و مس و برونز و ئاسن.. ئیدی شاندێك بەسەرۆکایەتی ئۆدیسیوس، ئامادەکرا، کە فینیکسی پەروەردەکاری (ئەخیل)یشی تیابوو. شاندەکە بەڕێگە کەنارییەکەدا ڕۆیی، گەییە ئۆردوگای مەرمیدونەکان و خۆیان بەسەراپەردەکەی ئەخیلدا کرد، کە خەریکی گیتار ژەنین بوو، پێشوازییەکی گەرمی کردن و (پتروکلوس)ی هاوڕێی ڕاسپارد کە ئەرکی میوانداری وەستۆ بگرێ. شاندەکە دڵی خۆیان بۆ کردەوە و ئەو دیاریانەیان ژمارد کە ئاگامەمنون لێبڕابوو بیانداتێ، ئەخیل ڕەفزی کرد و داوای لە پەروەردەکارەکەی کرد کە شەو لە جەم وی وەمێنێ و بەیانی لەگەڵ ئەودا بۆ وڵات بگەڕێتەوە. ئیدی باسی چارەنووسی خۆی کرد، کە ئەگەر لە تەروادەدا وەمێنێ و شەڕ**

بکات ئەوا تەمەنێکی کورت، بەڵام ناوبانگێکی زندووی بەدرێژایی ڕۆژگار دەبێت، بەڵام ئەگەر بۆ وڵات بگەڕێتەوە ئەوا ژیانێکی خۆش و تەمەنێکی درێژی دەبێت، ئەوسا فینیکس هەڵیدایێ و بیری خستەوە کە چۆن بەخێوی کردوە و لە باوەشی گرتووە، و چۆن بابی رووی لێناوە بێ بۆ تەروادە تا ئاگای لێ بێ و ڕێنوێنی بکات. چیرۆك و سەربهوردی قارەمانانی کۆنی بۆ گێڕایەوە کە چۆن خەڵکانی دڵگەورە و لێبوردە بوون. داوای لێکرد کە نوێژ و نزا بکات تا تورەییەکەی بڕەوێتەوە. ڕاستە خەتا و هەڵە پێش نوێژ و نزا دەکەوێ بەڵام نوێژ و نزا کیژانی خواوەند زیوسن. شەل و شیت و ناشیرینن، بەڵام زیوس زۆر گوێیان لێدەگرێت. ئامۆژگاری دەکات کە نوێژ بکات تا تورەییەکەی بڕەوێتەوە و مگێزی بێتەوە جێ و بەرگری لە ئاخییەکان بکات، چونکە تەروادەییەکان سۆزی کەشتییەکانیان دەسوتێنن. ئەخیل ڕەفزی کرد، ئەجاکس هەستا و قسەی کرد، شاندەکە بەسەرۆکایەتی ئۆدیسیوس بۆلای ئاخییەکان گەڕایەوە، و فینیکس لە جەم ئەخیل مایەوە. (ئاگامەمنون)یان لە واریقاتەکە ئاگادار کردەوە. (دیومیدس ڕابوو و گوتی پێویست بەئەخیل ناکات، ئاگامەمنون دەتوانێ لەشکرەکە کۆبکاتەوە و بەخۆی فەرماندەییان بکات و نایەڵن تەروادەییەکان کەشتییەکانیان بسوتێنن. ئاگامەمنون دەعوەتێکی کردن، هەموو تێر و پڕیان خوارد و خواردەوە و ئەوسا هەر کەسەو چووە خێوەتی خۆیەوە و لێی خەوت.

زەمەن:

ڕووداوەکان لە شەوی کۆتایی ڕۆژی بیست و حەوتەمدا ڕوو دەدەن.

شوێن:

شوێن کەناری دەریایە، بەردەم کەشتییەکان، دیمەنەکان بریتییە لە بارەگای ئاگامەمنون، سەرا پەردەکەی ئەخیل، ئەوجا گەڕانەوەی شاندەکە بۆ ئۆردوگای ئاخییەکان.

(١) تەروادەییەکان زۆر بەتوندی ئێشکیان دەگرت. بەڵام ترس، هاوڕێی ڕێگە، باڵی بەسەر ئاخییەکاندا کێشا و فەرماندە و ڕابەرەکانیان نائومێد بوون. وەکو چۆن بای باکور و ڕۆژاوایی لە تراکیاوە هەڵدەکەن و دەریا دەهوروژێنن، یەك دەگرن و شەپۆلی زەلام و تاریك سەر بەرز دەکەنەوە و هەرچی جەگەن و ئاوماڵکە هەیە بەهەموو لایەکیا تۆڕ دەدەن- دڵی ئاخییەکانیش بەو ئاوایە لە سینەیاندا ترساو و پەرێشان بوو.

(٩) بەترسێکی زۆرەوە کوڕی ئەتریوس فەرمانی بەقاسید و جاڕچیەکان دا کە بەبێدەنگی هەموو جەنگاوەرەکان ئاگادار بکەنەوە بێن بۆ کۆبوونەوە، دوای ئەوەی هەموو هاتن و لە شوێنی کۆبوونەوەکە ئامادەبوون، ئاگامەمنون بەدەم گریانەوە هەستاو فرمێسك وەك جۆگەیەك یان تاڤگەیەکی هەزار بەهەزار لە چاوانییەوە دەڕژا. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، ڕووی کردە ئاخییەکان و گوتی: "دۆستان، ئەی فەرماندە و شیرەتکارانی ئارگوسی، وادیارە زیوس لە هەموو ئارگوسییەك پتر منی خستووەتە داوی کوێردڵی و تەسکبینییەوە، ئەو خواوەندە دڵڕەقە مژدە و بەڵێنی دابوومێ، کە من تا شاری تەروادە نەگرم بۆ وڵاتی خۆ ناگەڕێمەوە، بەڵام وادیارە پێی ڕابواردووم، ئەوەتا ئێستاکێ ئەمرم پێدەکات، بەم حاڵە نالەبارەوە، بەم سەر شۆڕییەوە، دوای ئەوەی ئەو هەموو جەنگاوەرەم لە مەیدانی شەڕدا لە دەست داوە، بۆ ئارگوس بگەڕێمەوە. وادیارە ئەمە خواستی زیوسە، ئەو زیوسەی کە بەر لە ئێستا زۆر شاری لەگەڵ ئەرزا تەخت کردووە و زۆر شاری دیکەش تەخت دەکات، چونکە هێز و توانای ئەو لەسەرووی هەموو هێز و توانایەکەوەیە. جا با ئەم قسانە بخەینە لاوە، وەرن هەموو بەگوێم بکەن: با سواری کەشییەکانمان ببین و بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێینەوە، چونکە تەروادەمان پێ ناگیرێ."

(٢٩) ئاگامەمنون ئەو قسانەی کرد، ئاخییەکان ماوەیەکی زۆر مات و خەمبار لەجێی خۆ دانیشتن، هەر هەموویان لە ناخا ئاشتیان دەویست و حەزیان دەکرد بەسەلامەتی بگەڕێنەوە، تا لە ئەنجاما (دیومیدس)ی نەڕەشێری مەیدان هاتە قسان و گوتی:

(٣٢) ئەی کوڕی ئەتریوس، من بەم حەماقەتە قاییل نیم، ببورە کە بەو شێوەیە لە ڕووت دەوەستم، چونکە ئەمە کۆبوونەوەیەو کاری وا لە کۆبوونەوەدا ڕەوایە. تۆ هەوەڵجار لەبەردەم هەموو داناییەکاندا منت شکاندەوە، پێت گوتم کە من ترسنۆکم و جەنگاوەر نیم، هەموو ئارگۆسییەکان، لاو و پیر شایەتن و دەزانن تۆ ئەم کارەت کردووە. بەڵام کوڕی کرونوس، خودانی پلانی ڕاز ئامێز، هەر ئەو بەش و بەهرەیەی پێ داوی کە کردوتی

بەگەورەی ئێمە، بەڵام جورئەتی پێ نەداویت کە لە هەق و هێز باڵاترە. جەناب، ئایا پێت وایە رۆڵەی ئاخییان بەڕاستی ترسنۆك و زەبوونن؟ ئەگەر بەنیازی بۆ وڵات بگەڕێیتەوە، بگەڕێوە، ڕێگە کراوەیە، کەشتییەکانیش لەکەناری دەریا وەستاون و چاوەڕێی تۆن، ئەو کەشتییە زۆرانەی لە مسیناوە دووی تۆ کەوتن. بەڵام کەشتییەکانی دی لێرە دەمێننەوە تا تەروادە دەگرین و تەختی دەکەین. یان ئەگەر ئەوانیش دڵیان پێوەیە با بەکەشتییەکانیان بگەڕێنەوە، بەڵام ئێمە ستینیلوس و من دەمێنینەوە و شەڕ دەکەین تا بەئاوات دەگەین و هەرەسی ئیلیون دەبینین، چونکە ئێمە کە هاتین ئاسمانمان لە پشت بوو."

(٥٠) هەر کە دیومیدس ئەو قسانەی کرد. هەموو بەدەنگی بەرز ئافەرین و دەمخۆشیان لێکرد. ئەوسا نەستوری سوارچاك هەڵیدایێ و گوتی: "ئەی کوڕی تیودیوس تۆ لەشەڕا لە هەمووان بەهێزتری، کەس گومانی لە دلاوەریت نییە، لە تەگبیر و ڕاوێژاندا لە هەموو هاوتەمەنانی خۆت باڵاتری، هیچ ئاخیاییەك گلەیی لە قسەکانت نییە. بەڵام قسەکانت تەواو نەکردووە. تۆ هێشتا منالی —ڕەنگە لە منالترین منالی من منالتربی- بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بێ پێچ و پەنا ئامۆژگاری و نەسحەتی پاشا و سەرداری ئاخییەکانت کرد، چونکە لەسەر هەقی. بەهەرحاڵ من لە تۆ گەورەترم و دەمەوێ هەموو شتێکت تێبگەیەنم، بۆیە نامەوێ هیچ جەنگاوەرێك و تەنانەت شا (ئاگامەمنون)ش گاڵتە بەئامۆژگاری و پێشنیازەکانم بکات. هەر کەسێك حەز بە دووربەرەکی ناوخۆ بکات، کەسێکە دژمن بەگەل و قەومی خۆی، کەسێکە بێ ئەسڵ و فەسڵ، نە یاسا دەناسێت و نە بنەماڵە و کوانگی هەیە.

(٦٥) جا با ئێستا خۆ بەشەو بسپێرین و نانەکەمان بخۆین، پاسەوان و ئێشکچی بەدرێژایی خەنەکی دەوری شورەکە دابنەن، من ئەم ئەرکە بەجەنگاوەرە گەنجەکان دەسپێرم.. تۆش ئەی کوڕی ئوتریوس. کە پاشا و سەرداری هەموومانی، فەرمان بدە، دەعوەتێك بۆ ردێن سپییان و شیرەتکارەکانت ساز بکرێ، چونکە ئەم کارە هەر قابیلی تۆیە و لەتۆ دەوەشێتەوە.

(٧١) خێوەتەکانت پڕن لە بادە و شەراب، ئەو بادە و شەرابەی کە کەشتیانی ئاخیاییان ڕۆژانە لە ڕێگەی دەریاوە بۆتی دەهێنن. تۆ هەموو کەرەستەیەکی میوانداریت هەیە، زۆر شتت هەیە. کە خەڵکەکە خڕبوونەوە، بەگوێی ئەو کەسە بکە کە باشترین ڕێنوێنی و تەگبیرت بۆ دەکات —چونکە دژمن لە نزیکی کەشتییەکانی ئێمەدا ئاگرێکی زۆری چاودێریان کردۆتەوە، بۆیە ئێمە هەموو ئاخییەکان پێوستمان بەکۆبونەوەیەکی بوێرانەی

ناوێنە هەیە، کێ لە ئێمە لە حاڵی ترسدا نییە؟ ئەم شەو شەوێکە یا لە شکرەکەمان تیا دەچێ یان ڕزگار دەبێ.

(٧٩) بەو ئاوایە قسەی کرد، هەموو بەگوێیان کرد. پاسەوانەکان خێرا تەدارەکی جەنگیان لەخۆدا و بەفەرماندەیی هەر یەکێك لە تراسیمیدسی کوڕی نەستور، سکالافوس، ئیالمینوس، میریونیس، ئەفاریوس، دیبیروس، و لیکومیدسی مەزنی کوڕی کریون کەوتنە ڕێ. فەرماندەکان حەوت کەس بوون، هەریەکە و سەد جەنگاوەری ڕم درێژی لەگەڵ بوو. لەنێوان خەنەکەکە و شورەکەدا شوێنی خۆیان گرت، ئەوجا ئاگریان کردەوە و هەر کەسەو کەوتە ئامادەکردنی شیوی خۆی.

(٨٩) ئەوجا کوڕی ئوتریوس ژمارەیەکی زۆری لە ردێن سپی و شیرەتکارانی ئاخیایی بۆ بارەگاکەی دەعوەت کرد و نان و خوانێکی شایستەی بۆ چێکردن. و هەرکەس لە ئاستی خۆیەوە دەستی بۆ خۆراکە بەلەزەتەکانی بەردەمی درێژ کرد، پاش ئەوەی تێر و پڕیان خوارد و خواردەوە، پیری ناودار، نەستوری دنیادیدە، کە هەر لەکۆنەوە بەڕاو تەگبیری دروست و ڕاست بەناوبانگ بوو، یەکەم کەس بوو هەستاو بەوپەڕی نیازپاکی و ژیری ڕای خۆی خستە ڕوو،

(٩٦) گوتی: "ئەی شکۆدارەکەی کوڕی ئوتریوس، ئەی پاشای بەشەران، ئاگامەمنون، من قسەکانم بەتۆ دەست پێدەکەم و بەتۆ کۆتایی پێدێنم، چونکە تۆ پاشای هەموو گەلیت، زیوس گۆچانی فەرمانڕەوایی داوەتە دەستی تۆ، تا سەرپەرشتی کار و کردەوەیان بکەی و بیر لە چاکەیان بکەیتەوە. بۆیە پێویستە تۆ بەر لە خەڵکی دی هەم قسە بکەی و هەم گوێ بگری، بەڵکو لەسەرتە گوێ لە ڕاوێژ و پێشنیازی دروست و ژیرانەی خەڵکیش بگریت. جا با بێینەوە سەر تۆ و فەرمانەکانی تۆ، من شتێك دەڵێم کە لە جەم خۆم باشترین شتە. لەوساوە کە تۆ ئەی پاشای مەزن (ئەخیل)ت تۆراند و پیاوت ناردە سەری و (بریسیس)ت بەتۆبزی و بەپێچەوانەی ئامۆژگاریی منەوە لە خێوەتەکەی دەرهێنا و لێت داگیرکرد، چ کەسێك ڕای لەڕای من باشتری نەبووە.

(١٠٨) من زۆرم هەوڵدا کە تۆ ئەو کارە نەکەی، بەڵام تۆ تەسلیم بەڕوحزلی خۆت بوویت، قارەمانێکت شکاند کە خواوەندان بەخواوەندی خۆیان گەورە و ڕێزداریان کردبوو، کەچی تۆ شکانتەوە، (بریسیس)ت لێ داگیر کرد، بریسیس دەسکەوتی ئازایەتی خۆی بوو، تۆ تا ئێستاش هەر لای خۆت گلت داوەتەوە.بەهەرحاڵ ئێستاش نەچووە بچێ، دەکرێ بیر

ئەوە بدەینەوە کە بەدیاریی جوان، و زمانی شیرین ئاشتی بکەینەوە."

(١١٥) ئاگامەمنون شا بەرسڤی دایەوە: "ئەی پیرەمێرد، تۆ ڕاست دەکەی. من گەوجێتیم کرد. بەتەمانیم نکۆڵی و حاشا لە گەوجێتی خۆم بکەم. پیاوێك کە ئاسمان بیحوبێنێ، سوپایەك دێنێ، هاوتای سوپایەکە بۆ خۆی. ئەو کارەساتەی زیوس بەسەر سوپای ئاخییانی هێناوە، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو پیاوە دەحوبێنێ و بەو جۆرە ڕێزی لێدەنێ. من دوای سۆز کەوتم ڕیشی خۆم دایە دەست ئەقڵی خاومەوە، بۆیە لێبڕاوم بەخۆدا بچمەوە و هەڵەکانم ڕاست بکەمەوە. ئامادەم لەبری ئەو هەڵەیەی دەرهەق بەو کردوومە دیاری و پێشکەشیەکی فرە و زۆری بدەمێ. و یەك بەیەك لەبەردەم ئێوەدا بۆی بژمێرم. سێ سێکوچکەی دەدەمێ کە هێشتا لەسەر ئاگر نەنرابن، دە تالان زێڕ، بیست مەنجەڵی ئاسن، دە دوازدە ئەسپی ڕەهوان، کە هەر هەموویان لە پێشبڕکێدا دەرچوون و خەڵاتیان بردووەتەوە، هەر پیاوێك ببێ بەخاوەنی ئەم خەڵاتانەی کە ئەم ئەسپانەی من بردوویانەتەوە دەبێ بە خاوەن و زەوی و زێڕێکی زۆر، دەوڵەمەندی دەوڵەمەند دەبێت. حەوت ژنی کارامە و دەسترەنگینی دەدەمێ، ژنانی لیسبوسی، لەو ژنانەی کە بەخۆم لە ڕۆژگاری گرتنی لیسبوسدا هەڵمبژاردون، هەموویان زۆر جوانن، هەموو ئەمانەی وێدەدەم، و هەروەها کیژەکەی (بریسیوس)شی دەدەمەوە، ئەو کیژەی کە لێم داگیر کرد. سوێندی گەورەی بۆ دەخۆم کە نە لەگەڵی چوومەتە جێگەوە و نە لەگەڵیا جووت بووم، ئەگەرچی ئەمە مافی هەموو بەشەرێکە، چ پیاو و چ ژن.

(١٣٥) هەر هەموو ئەمانەی دەدەمێ، و خۆ ئەگەر خواوەندان دەستیان دام و شارەکەی بریامم گرت و وێرانم کرد، ئەوا لەو کاتەدا کە ئێمەی ئاخییایی دەکەوینە دابەشکردنی دەستکەوت و تالانی، بانگی دەکەم بێت و بەکەیفی دڵی خۆی کەشتییەکەی لە زێڕ و برونز بار بکات، و زێدەباری ئەمەش جگە لە هیلێن جوانترین بیست ژنی تەروادەیی بۆ خۆی ببات، پاشان کە چووینەوە بۆ ئارگۆسی ئاخیا، بۆ دەوڵەمەندترین وڵات، ئەوا دەیکەم بەزاوای خۆم وەکو (ئریستیس)ی کوڕم کە لەناز و نیعمەتدا دەژی تەمەشای دەکەم. من سێ کیژم هەن: کریسوتیمیس، لاودیکی و ئیفیاناسا، هەر کامیانی بەدڵ بوو بەپێشکەشی و بێ ئەوەی شیربایی بدات یا جیازی بۆ بکات، دەیدەمێ بابیگوازێتەوە بۆ ماڵی بیلیوس،

(١٤٧) جگە لەمانە جیازی و دیارییەکی هێندە زۆریشی لەگەڵدا دەنێرم کە تا ئێستا هیچ

بنیت لەگەڵ کیژەکەیدا بۆ زاوای نەناردبێ. هەروەها حەوت شاری ئاوەدانیشی دەدەمێ کە ئەمانەن: کاردامیلی و ئینوبی و هیری سەرسەوز. فیرای پیرۆز و ئەتینای پڕ مێرگوزاران، و ئیبای جوان، و (بیداسوس)ی مەڵبەندی ڕەزان، هەر هەموو ئەمانە لە نزیکی دەریان و لە تخوبی بیلوسی لمەلأن دان. دانیشتوانی ئەوێندەر هەموو دەوڵەمەند و خودان پەز و ماڵاتن، هێندەی دیاری بۆ دەبەن وەکو ئەوەی خوابێ، و دێنە ژێر گۆچانەکەی –گۆچانی فەرمانڕەوایی- و هەر ئەمرێکیان پێ بکات جێبەجێی دەکەن. هەر هەموو ئەمانەی بۆ دەکەم ئەگەر دەستبەرداری پشم و غەزەبەکەی ببێ، کارێکی وەها بکەن قایل بێ و دڵی نەرم بکەن، وەك بزانم تەنیا هادیس، بەزەیی لە دڵدا نییە و هیچ شتێك قەبوڵ ناکات –بۆیە تیرەی بەشەر، بەشەری فانی لەناو هەموو خواوەندەکاندا ڕقی زۆریان هەر لەوە. ئەمە زێدەباری ئەوەی کە من لە ڕووی تەمەنەوە لە ئەخیل گەورەترم و لەباری پاشایەتییەوە لەو کۆنتر و ڕەسەنترم، بۆیە هەقە بەگوێم بکات."

(١٦٣) نەستور هەڵیدایێ و گوتی: "ئەی مەزنترین کوڕی ئوتریوس شکۆمەند، ئەی پاشای جەنگاوەران، ئاگامەمنون، ئەم دیاریانەی تۆ بەراستی دیارین نەك گاڵتە، کەواتە با شاندێك هەڵبژێرین بەپەلە بچن بۆ خەرگەکەی ئەخیلی کوڕی بیلیوس. با ئەوانەی من هەڵیاندەبژێرم بێنە دەرێ، یەکەم فینیکسی خۆشەویستی زیوس، کە لە ڕێگەدا ڕابەرییان بکات، ئەوجا ئەجاکس و ئودیسیوس.. لە قاسید و جارچییەکانیش با ئودیوس و یوریباتیس لەگەڵیان بڕۆن. جا ئێستا با ئاو بێنن دەستمان بشۆین و فەرمانبدە هەموو بچنە خەڵوەت و خامۆشییەکی ئاینییەوە، تا لەبەر زیوس بپاڕێینەوە و نوێژ و نزای بۆ بکەین، بەڵکو ڕوحمێکمان پێدا بکات."

(١٧٣) نەستور ئەو قسانەی کرد، هەر هەموو قسەکانیان پێ خۆش بوو، خزمەتکاران ئاویان بەدەستی میوانەکاندا کرد، خوڵامان بادیەکانیان پڕ لە بادە و ئاو کرد، و بەسەر هەموو ئامادەبووانیاندا گێڕا، ئەوجا بەناوی قوربانییەوە سەرو چۆڕیان پرژاندە عاردی، هەر کەسەو بەشی خۆی خواردەوە، شاندەکە لە سەراپەردەکەی ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس هاتنە دەرێ. نەستوری سوارچاك فرمانی تەواوەتی دانێ، نیگای یەك بەیەکیانی کرد، بەتایبەتی ئودیسیوس کە هەموو توانایەکیان بخەنە گەڕ بۆ ئەوەی کوڕەکەی بیلیوس بێننە ڕەداو دڵی نەرم بکەن.

(١٨٢) هەموو لە کەناری دەریای خرۆشاودا کەوتنە ڕێ، لەبەرخۆوە لە بوسیدونی

خواوەندی زەوی و بومەلەرزە دەپاڕانەوە کە ڕوحی ئیاکۆسی باپیری ئەخیلیان بەگەڵ بخات و کۆمەکیان بکات کە بتوانن بەئاسانی دڵی ئەخیل نەرم بکەن. کە گەیینە کەشتی و ئۆردوگای مەرمیدونەکان،

(١٨٦) سەیریانکرد ئەخیل بەدەم گیتار لێدانەوە خەمی دڵی خۆی بەبا دەدات. گیتارێکی جوان، خۆش ساخت، و پایە زیوین. لەو دەسکەوت و تالآنیانە بوو کە لە کاتی گرتن و تالآنکردنی شاری ئیتوندا دڵی گرتبووی و هێنابووی. ئەخیل بەدەم لێدانی ئەم گیتارەوە بەکار و کردەوەی مەزنی قارەمانانیا هەڵدەگوت. (پاترۆکلوس)ی هاوڕێی بەتاقی تەنیا، کپ و بێدەنگ لە بەرانبەری دانیشتبوو و چاوەڕوان بوو لە گۆرانییەکەی ببێتەوە، لەم کاتەدا ئودیسیوس و ئەجاکس —ئودیسیوس لە پێشەوە بوو- وە ژوور کەوتن و لەبەردەمیا وەستان. ئەخیل بەسەرسامی هەستایە سەر پێیان و گیتارەکەشی هەر بەدەستیەوە بوو، هەروەها (پاترۆکلوس)ش کە ئەوانی بینی هەستایە سەرپێ. ئەوجا ئەخیل سڵاوی لێکردن و گوتی: "سڵاو، بەخێرهاتن ئایا بەسەردانی دۆستانە هاتوون، یان پێویستییەکی گەورە ناچاری کردوون بێن؟ بەهەرحاڵ ئێوە هەمیشە، و تەنانەت لە هەڕەتی توڕەییشمدا، لە چاوی منا ئازیزترین و بەڕێزترین ئاخیایین."

(١٩٩) ئەمەی گوت و بردنییە پێشترەوە و لەسەر ئەو بالیفانەی کە فەرشی ئەرخەوانیان پێدا درا بوو داینان. ئەوجا بە پاترۆکلوسی، کە لەنزیکیەوە وەستا بوو، گوت: "ئەی کوڕی مینوتیوس، گەورەترین بادیە لەسەر مێزەکە دابنێ، و بادەیەکی خەست بگرەوە، ئاوی کەم تێ بکە، هەریەکە و جامێکی بدەیێ، چونکە ئەمانە دۆستی ئازیزی منن، هاتوونەتە ماڵەکەم."

(٢٠٥) پاترۆکلوس، فەرمانەکانی هاوڕێکەی جێبەجێکرد، ئەوسا ئەخیل لەبەر ڕوناکی ئاگرەکەدا، مێزێکی گەورەی ڕاکێشا تا گۆشتەکانی لەسەر چاك بکەن، پشتە مەغزەی مەڕێك و بزنێکی قەڵەو و بڕبڕەی پشتی بەرازێکی قەڵەوی لەسەر دانا، ئوتومیدون گۆشتەکەی دەگرت و ئەخیل وردی دەکرد و دەیجنی و لە شیشی دەدا، و کوڕەکەی (مینوتیوس)ش ئاگری خۆش دەکرد، کە گڕی ئاگرەکە دامرکایەوە، پشکۆ زوغاڵەکانی تەخت کرد و شیشە گۆشتەکانی لەسەر ڕیزکردن، ئەوجا هەڵیگرتن و خوێی پێداکردن. کە گۆشتەکان برژان خستنییە سەر قاپ، و نانی لە سەبەتەی جوان جواندا لە دەوری خوانەکە ڕیزکرد، و ئەوجا ئەخیل گۆشت و کەبابەکەی دابەش کرد و هەر کەسەو بەشی

خوی بۆ دانا. ئەوسا ئەخیل لە بەرانبەر ئۆدیسیوس دانیشت، پاتروکلۆسی هاوڕێی گاز کرد و داوای لێکرد کە قوربانی پێشکەش بەخواوەندان بکات، یانی خواوەندان لە بیر نەکات، ئیدی پاترۆکلۆس بەشی خواوەندانی نایە سەر ئاگرەکە و میوانەکان دەستیان بۆ ئەو زیافەتەی لەبەردەمیان ڕیزکرابوو، درێژ کرد. پاش ئەوەی هەموو تێر و پڕیان خوارد و خواردەوە، ئەجاکس ئاماژەیەکی بۆ فینیکس کرد، ئۆدیسیوس حاڵی بوو، جامێکی لە بادە پڕکرد، هەڵیبڕی تا بەخۆشی و سەلامەتی ئەخیل هەڵیدا.

(٢٢٥) گوتی: بەخۆشی و سەلامەتی تۆ ئەی ئەخیل، ئێمە نە لە خێوەت و خەرگەکەی ئاگامەمنون، و نە لە سەراپەردەکەی تۆ لە خوانی ئاواو ئاوەدانمان کەم نەبووە، خواردن و خواردنەوە زۆرە، بەڵام ئێمە لە خەم و بیری ئەم شتانەدا نین، ئەی لە توخم و تۆوی زیوس، ئێمە گیرۆدەی کارەساتێکی گەورەین، و نازانین ئاخۆ بەبێ کۆمەکی تۆ دکارین کەشتییەکانمان ڕزگار بکەین، یان لە دەستیان دەدەین. تەروادەیی و هاوپەیمانەکانیان لە نزیکی کەشتییەکانی ئێمە و لەلای حەسارەکە ئۆردوگایان هەڵداوە، و لە هەموو لایەکەوە ئاگری چاودێریان هەڵایساندووە و پێم وایە هێز نییە ڕێگەیان لێ بگرێ و نەیەڵێت بدەن بەسەر کەشتییەکانماندا. (زیوس)ش لەلای دەستە ڕاستەوە چەخماخە لەسەر چەخماخە دەنێرێ و ئەمە بەمژدەی خێر دەزانن، (هیکتۆر)ش بەدەم تورە بوون و هەڵچوونێکی شێتانەوە، بەو باوەڕەوە کە زیوسی لە پشتە، نە باکی بەخواوەندانە و نە بە مرۆڤان، هێندەی دی هاروژاوە، هەموو نوێژ و وێردێکی هاتووەتە سەر ئەوەی کە زوو بەیان بدات و ڕۆژ ببێتەوە. سوێندی خواردووە کە لوتەی کەشتییەکانمان تێك و پێك بدات و ئاگر لە بۆدیەکانیان بەربدات، و ئاخییەکان وێڵ و سەرگەردان تەفر و تونا بکات. من زۆر دەترسم ئاسمان پشتیوانی بکەن و لە تەروادە و دوور لە وڵاتی خۆمان، دوور لە ئارگۆس تیابچین، کەواتە، هەرچەندە درەنگە، ڕابە و فریای ڕۆڵەکانی ئاخیا کە بەدەستی تەروادەییەکانەوە پەرێشان بوون، بکەوە و ڕزگاریان بکە. دەنا پەشیمان دەبییەوە لەوەی کە ئەم فرسەتەت لە دەستدا، کە زەرەر ڕوویدا، ئیدی چارەسەر بێ فایدەیە، تا کار لە کار نەترازاوە باش بیربکەوە و، داناییەکان لەم بەڵایە ڕزگار بکە.

(٢٥٢) ئەی دۆستی ئازیز کە بیلیوسی بابت لە بتیاوە بۆلای ئاگامەمنونی ناردیت بەمجۆرەی ئامۆژگاری نەکردیت کە: "کوڕەکەم، ئەتینا و هیرا گەر بیانەوێ هێز و توانات دەدەنێ، بەڵام تۆ جڵەو بۆ سۆزەکانت شل مەکە، چونکە هیچ شتێك لە میانڕەوی و

میهرەبانی و دلۆڤانی باشتر نیە. خۆت لەهەر هەڤڕکییەکی بێهودە دوور بگرە. بەمە پیر و گەنجی ئاخییان قەدرت دەگرن." ئەمە ئامۆژگارییەکانی ئەو بووە بەڵام تۆ لەبیرت کردوون. ئێستاش بەهومێدم خۆت هێور بکەیەوە و ئەم تورەییە وەلاوەبنەی. ئاگامەمنون ئامادەیە ئەگەر لێی ببوری، دیاری و پێشکەشیەکی زۆرت بداتێ، جا باپێت بڵێم چی بۆ داناویت و بەتەمایە چیت بداتێ. حەوت سێکوچکەی تازە کە ئاگریان بەخۆوە نەدیبێ، دە تالان زێڕ، و بیست مەنجەڵی ئاسن، دوانزە ئەسپی ڕەهوان کە لە پێشبڕکێدا خەڵاتیان بردووەتەوە.

(٢٦٦) جا هەر کەسێك ببێ بەخودانی ئەم ئەسپ و خەڵاتانە زۆر دەوڵەمەند دەبێ زەوی و زار و زێڕێکی زۆری دەبێ، چونکە ئەم ئەسپانە دەسکەوتی زۆریان بۆ ئاگامەمنون بەدەست هێناوە. ئەمە جگە لەوەی کە حەوت ژنی کارزان و دەست ڕەنگینی (لیسبوسی)ت دەداتێ، لەو ژنە جوانانەی کە لەکاتی گرتنی لیسبوس دا بەخۆی هەڵی بژاردبوون هەر هەموو ئەو ژنانەت دەداتێ و کیژەکەی (بریسیس)شت، کە لێی داگیرکردبووی بۆ دەنێرێتەوە، سوێندی گەورەش دەخوات کە نەچووەتە لای و نەئیلاقەی کردووە، هەرچەندە ئەمە مافێکی ئاسایی هەر پیاو و ژنێکە. هەر هەموو ئەم شتانە حازر و ئامادەن دەتوانی هەر ئێستا وەریان بگری. خۆ ئەگەر پاشان خواوەندان دەستیان داو توانی دەست بەسەر شاری تەرواددا بگرێت، و ئاخییان کەوتنە دابەشکردنی تاڵانی و دەسکەوتان، دەتوانی بێی و بەئارەزووی دڵی خۆت کەشتییەکەت لە زێڕ و برونز بار بکەی، دەتوانی جگە لە هیلین جوانترین بیست ژنی تەروادەیی بۆ خۆت هەڵبژێری. ئەوسا کە گەڕاینەوە بۆ شاری ئارگوسی دەبی بەدەوڵەمەندترین خودان زەوی و زار، چونکە دەبی بەزاوای ئاگامەمنون و وەکو کوڕە ئازیزەکەی خۆی( ئوریستیس) کە لەناز و نیعمەتا دەژی، تەماشات دەکات. ئاگامەمنون سێ کیژی هەن، کریسوتیمیس و لاودیکی و ئیفاناسا، دەتوانی یەکێك لەوانە هەڵبژێری و بەبێ هیچ شیربایی و جیازییەك، بەکراسی بەری خۆیەوە بۆماڵی بیلیوسی بگوازیتەوە. دیاریی و جیازییەکی وەهاش لەگەڵ کیژەکەیدا دەنێرێت کە هیچ کەسێك ئەمەی بۆ کیژی خۆی نەکردبێت، هەروەها حەوت شاری ئاواو ئاوەدانت دەداتێ کە بریتین لە: کاردامیلی و ئینوبی و هیری سەر سەوز، فیرای پیرۆز و ئەتینای پڕ مێرگ و پاوەنان، هەروەها ئیبیا، و بیداسۆسی باوەشی باخ وەزان، هەموو ئەمانە نزیکی دەریان و لە تخوب و ئاقاری بیلوسی لمەلان دان. خەڵکانی ئەو دەڤەرانە هەموو دەوڵەمەند و خاوەن وڵسات

و یەری زۆرن، و بەقەد خواوەندێك ڕێزت دەگرن و لە دیاری و پێشکەشیاندا غەرقت دەکەن و ملکەچ و گوێڕایەڵی فرمانەکانت دەبن. هەر هەموو ئەمانەت دەداتێ ئەگەر دەستبەرداری ئەم تۆران و تووڕەبوونە ببی، خۆ ئەگەر لە کانگەی دڵەوە ڕقت لە خۆی و دیارییەکانیەتی، ئەوا بەلای کەمەوە بەزەییت بەئاخییەکانی دیکەدا بێتەوە کە هەموو لەشکرەکەیان لەبەر هەڕەشەی مەرگدایە.جا ئەمانە وەکو خوایەك ڕێزت دەگرن، چونکە ئەو سەربەزییەی تۆ بەدەستی دێنی لەبەرچاویاندا زۆر گەورە دەبێت. تەنانەت دەتوانی هیکتۆریش بکوژیت، چونکە پشم و غەزەبێکی ئەهریمەنی جڵەوی لە دەست سەندووە و بێگومان داوا لە تۆ دەکات بچیتە مەیدانی، چونکە پێی وایە لەناو ئەو ئاخییانەدا کە بەکەشتی گەییونەتە ئێرە، کەس نییە هاوتای بکاتەوە و بتوانێ ڕووبەڕووی بوەستێ.

(٣٠٧) ئەخیل وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی لایرتیس، توخم و تۆوی زیوس، ئەی ئۆدیسیوسی هۆشمەند و ژیر و نێرەنگباز.. ئەلهەقی دەمەوێ نیازی خۆمت پێ بڵێم و ئەوەت بۆ ڕوون بکەمەوە کە بەتەمای چیم، تا لە بەردەممدا دانەنیشت و بکەویتە دووڕوویی و ڕیابازی چونکە من زۆرم ڕق لە کەسێکە کە قسەی دڵ و زمانی یەك نەبێ، چەندم ڕق لە دەروازەکانی هادیسە ئەوەندەش ڕقم لەو کەسانەیە. بۆیە من ئێستا قسەی دڵی خۆمت پێ دەڵێم، پێم وایە من ئەو کەسە نیم کە ئاگامەمنونی کوڕی ئۆتریوس یان هەر داناییەکی دیکە بتوانن دڵی ڕازی بکەن، چونکە ئەو هەموو شەڕەم کرد کەسێکم نەبینی پێ بزانێ و سوپاسم بکات. ئەوەی شەڕ بکات و ئەوەی نەیکات وەکو یەکن، ترسنۆك و قارەمان لەمەدا یەکسانن، مەرگیش بەم پێوانەیە مامەڵە دەکات، تەمەڵ و چالاك بۆ خۆی دەباتەوە. من وێڕای ئەوهەموو ڕەنجەی داومە هیچم دەست نەکەوتووە — هەموو ژیانم لە خەتەر و مەترسیدا بووە، وەکو چۆلەکەیەك چۆن خواردن بۆ بێچووەکانی دەبات، بەبێ هیچ سوپاس و پاداشتێك یان کرێیەك، بەو ئاوایە شەوانی دوور و درێژم بەشەونخونی ڕۆژ کردوەتەوە، بەڕۆژەوە دەیان شەڕم وێڕای ئەو جەنگاوەرانە کردووە کە لە پێناوی ژنەکانیاندا جەنگیون.دوانزە شارم بەکەشتییەکانم لە دەریادا گرت، و یازدەم لە وشکاییدا، لە دەشتە بەپیت و بڕشتەکانی تەروادەدا گرت، زۆر دەسکەوتم لەو شارانەدا بەدەست هێنا، هەموو جاری گشت ئەو دەسکەوتانەم دێنا و دەمدان بەم ئاگامەمنونەی کوڕی ئۆتریوسە، بەڵام ئەم قارەمانە کە هەمیشە لە دواوە و لای کەشتییەکانی دەمایەوە، کە ئەو تاڵانی و دەسکەوتانەی لێوەردەگرتم، بەشێکی کەمی لێدەدا بەمن و بەشە هەرە

زۆرەکەی بۆ خۆی هەڵدەگرت،

(٣٣٤) هەندێ لەو شتانەی بەدیاری بۆ فەرماندە و پاشایان دەنارد، و دەستکەوتەکانی خۆیشیان هەر بۆ خۆیان (فەرماندە و پاشاکان) دەبوو. لەناو هەموو ئاخییاندا، تەنیا ئەو ژنەی برد کە بەر من کەوتبوو، دەبا هەر بۆ ئەو بێ و بچێ لەگەڵیا بخەوێ و ڕابوێرێ. ئاخر پێم ناڵێی بۆچی دەبێ ئاخیەکان شەڕی تەروادەییەکان بکەن؟ کوڕی ئوتریوس بۆچی ئەم سوپایەی خڕکردۆتەوە و بۆ ئێرەی هێناوە؟ هەموو ئەمە لە پێناوی هیلین دا نەکراوە؟ چما لەم دنیایەدا تەنیا کوڕانی ئوتریوس ژنی خۆیان خۆشدەوێ؟ نەخێر، هەر پیاوێکی ئاقڵ و ژیر ژنی خۆی خۆشدەوێ و پێیڕا دەگات ودەیپارێزێ، منیش بەهەمان شێوە ئەو ژنەم لەناخی دڵەوە خۆش دەویست، هەرچەندە دیل بوو، و بەزەبری نێزە بەدەستم هێنا بوو، بەڵام ئاگامەمنون لە دەستی دەرهێنام و هەڵی خەڵەتاندم، با تەماحم نەخاتە بەر ولەخشتەم نەبات چونکە زۆر باشی دەناسم، و ناتوانێ دڵم نەرم بکات. ئەی ئودیسیوس پێی بێ با بۆ ڕزگار کردنی کەشتییەکانی لە ئاگر ڕاوێژ بەتۆ و فەرماندەکانی دیکە بکات.

(٣٤٧) پێشتر زۆر شتی بەبێ کۆمەکی من کردووە، شورەیەکی دروست کرد، خەنەکێکی قوڵی بەدەوریا هەڵکەند، سنگی تیژی تیادا چەقاند، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی بەری هێرشی هیکتۆر، ئەو پاڵەوانە پیاوکوژە بگرێ. لە کاتێکا تا ئەو کاتەی کە من لەڕیزی ئاخییەکاندا دەجەنگیم هیکتۆر نەیدەوێرا زۆر لە شورەکانی شار دووربکەوێتەوە، هەندێ جار تا دەروازەکانی سکای و دار بەڕووەکە دەهات بەڵام هێوەتر نەدەڕۆیی. جارێکیان لەوێ بەتەنیا چاوەنوارم کرد، بەهەزار حاڵ توانی لە دەستم دەرباز بێ. جا ئێستاکێ، کە بەنیاز نیم شەڕی هیکتۆری مەزن بکەم، سبەینێ قوربانییەك لە ڕای زیوس و خواوەندەکانی دی دەکەم. دەسکەوت و تاڵانییەکان لە کەشتییەکانم بار دەکەم و بەناو دەریایان دەخەم و،بە چاوی خۆت —ئەگەر مەبەستت بێ- دەبینی کە بەیانی زوو کەشتییەکانم بەڕووباری هیلیسبونت دا دەکشێن و دەریاوانانی کارامە و چەلەنگ بەڕێوەیان دەبەن، ئەگەر خواوەندی دەریا یاربێ و سەفەرمان سەلامەت بێ، لە زەرفی سێ ڕۆژدا دەگەمەوە خاکی بیتیا. کە هاتم بۆ ئێرە، موڵك وماڵێکی زۆرم لەوێندەر بەجێهێشت. هەرچیم لە زێڕ و مسی سور و ژنانی بەژن زراف و ئاسن وەدەستکەوتووە باری دەکەم و بۆ ئەوێندەری دەبەمەوە، ئەمە بەش و هەقی خۆمە، هەر هەموو ئەمانە

دەبێم، لە هیچیان کەم نییە، تەنیا ئەو ژنە نەبێ کە ئاگامەمنون بەتۆبزی لێی زەوت کردم. ئەم قسانەی منی وەکو خۆی بۆ بگێڕەوە، بۆ هەمووانی بگێڕەوە تا ئەگەر ئەم کەرپیاوە، ئەم بێ شەرم و حەیایە، هاتە سەر ئەوەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان داناییەکی دی فریوبدات، لێی ڕاپەڕن.
(٣٧٢) بەلای منەوە لە سەگیش کەمترە، و ناتوانێ ڕووبەڕوو تەماشام بکات. من نە کۆبوونەوەی لەگەڵ دەکەم و نەڕاوێژ و تەگبیر، هیچ کارێکی هاوبەشی لەگەڵدا ناکەم. چونکە غەڵەتی بەرانبەر کردم، فریوی دام. چیتر بەقسە لوسەکانی ناخەڵەتێم، لێگەڕێ با بەرەو نابووتی خۆی بڕوات، زیوس ئەقڵ و هۆشی لەلا نەهێشتووە. دیارییەکانی لای من پەشمن، بەخۆیشی بایەخی داوە موویەکی نییە. ئەگەر دە هێندە و بیست هێندەی تریشم بداتێ، هەرچی سەروەتی ئەم جیهانەی هەیە، و هەرچیشی لەمەودا دەستدەکەوێ، و بگرە هەموو سەروەت و سامانی ئورخومینوس یان تیبەی میسرم بداتێ کە هەموو گەنجینەکانی پڕی پڕن —ئەو تیبەیەی کە سەد دەروازەی هەیە و هەر دەروازەیەکی سەد جەنگاوەری لەسەرەو بەیەك کەرەت بەعەرەبانە و ئەسپەکانیانەوە دێن و دەچن..
(٣٨٥) ئەگەر بەقەد چەوولمی دەریایان وگڵ وخۆڵی دەشت و دەران دیاری و پێشکەشیانم بداتێ، تا باجی ئەو نەنگ وڕیسواییەی کە بووە مایەی ئازاری ئەم دڵەم، نەدات، ناتوانێ، دڵم نەرم بکات. سەبارەت بەکیژەکەی ئاگامەمنون، ئەگەر بەقەد ئەفرۆدێتیش جوان بێ، بەقەد ئەتینا هونەرمەند و دەست ڕەنگین بێ.. هەر نامەوێ و نایخوازم. با لەناو ئاخییەکاندا کەسێکی دیکەی بۆ هەڵبژێرێ، کەسێك لەمن پایەدارتر و شکۆدارتر بێ چونکە ئەگەر خواوەندان یاربن و بەسەلامەتی گەیشتمەوە وڵاتی خۆ، ئەوا پێم وایە بیلیوس خۆبەخۆ بەدوای ژندا دەگەڕێ و ژنم بۆ دەدۆزێتەوە. چی زۆرە کیژە ئاخییان زۆرن لە دەڤەری هیلاس و فتیا، کیژە میر و سەروەران، دەست بخەمە سەر هەریەکێکیان دەتوانم بیکەم بەهاوسەری ئازیز و هەڵبژاردەی خۆم. بەرەو ئەوێ دڵەی ڕەندم، بێ هیچ پەروایەك ڕامدەکێشێت، تا ژنێکی شایستە و ڕێك و پێك بێنم بەموڵك و ماڵە زۆر و زەبەنەکەی بیلیوسی پیرەبابم بژیم و ڕابوێرم. ئەوی ڕاستی بێ هیچ شتێك لای من بەئەندازەی ژیان گرینگ نییە، نە ئەو سەروەت وداراییانەی کە خەڵکی دەڵێن ئیلیون، لە کۆنا، لە ڕۆژانی ئارامی و ئاشتیدا، بەر لە هاتنی ئاخییەکان، هەیبووە و سوودی لێوەرگرتووە، ژیان دێنێ و نە ئەو گەنجانەی لە ئاستانەی مەڕمەڕینی پەرستگەکەی ئەپولۆدا لە بوتو، لەژێر

ناویرە بەردان دانراون ژیان دێنێ. دەشێت گاو گۆتاڵ و مەڕ وپەزان بەتالانی ولەڕێگەی تالانییەوە بەدەست بهێنرێ، پیاو ئەگەر پێویستی ببێ دەتوانێ سێکوچکە و ئەسپان بکڕێ، بەڵام ژیان کە ڕۆیی هەرگیز ناگەڕێتەوە، کە ڕوحی پیاو یەکجار لە زار هاتە دەرێ ئیدی نە بەتالان و برۆ و نە بەکڕین بەدەست نایەتەوە.

(٤١٠) (تیتیس)ی دایکم ڕاستییەکەی نایە قولی مستم و پێی گوتم کە دووچارەنوس بەرەو کۆتایی ژیانم بکێش دەکەن. ئەگەر لێرە بمێنمەوەو شەڕی تەروادە بکەم، ئەوا سەلامەت نابم و بۆ وڵات ناگەڕێمەوە، بەڵام ناوبانگێکی هەمیشەیی پەیدا دەکەم. خۆ ئەگەر بۆ وڵاتە ئازیزەکەم بگەڕێمەوە، ئەوا هیچ ناو وشۆرەتێکم نابێ، بەڵام تەمەنم درێژ دەبێت.. بەڵام وێڕای ئەمەش حەز دەکەم بەهەموو ئاخییەکانی دیکەش بڵێم کە بۆ وڵات بگەڕێنەوە، چونکە تەروادە بەئێوە ناگیرێت، چونکە زیوسی دووربین و دانا، باڵی بەسەرا گرتووە و دەیپارێزێ، جەنگاوەرانی تەروادەیی ورەیان زۆر بەرزە و پارچەیەکن لە ئازایەتی. جا بەپەلە برۆن وئەم پەیامەی من بەردێن سپی و سەرانی ئاخیایی بگەیەنن، تا بیر لە نەخشەیەکی لەمە باشتر بکەنەوە، نەخشەیەك کە بتوانن کەشتییەکانیان دەرباز بکەن، هەروەها لەشکری ئاخیاییەکانیش کە لە کەناری کەشتییەکان دۆش داماون، ڕزگار بکەن.

چونکە ئەم نەخشەیەی ئێستایان، مادامێکی من لەسەر تورەبوونی خۆم سوورم، سەناگرێت. سەبارەت بە "فینیکس"ش بالێرە بمێنێتەوە و شەوێ لای ئێمە بنوێت، تا سبەینێ لەگەڵ مندا سواری کەشتی ببێ و بۆ وڵاتە ئازیزەکەمان بگەڕێتەوە، هەڵبەتە ئەگەر بەخۆی گەرەکی بێ، دەنا من بەتۆبزی نایبەم."

(٤٣٠) ئەو قسانەی کرد. بێدەنگی باڵی بەسەردا کێشان، بیریان لە قسەکانی دەکردەوە. داواکەی ڕەتکردنەوە. لە ئەنجامدا سوارچاکی پیر فینیکس هەستاو رووی کردە هەمووان و لە هۆڕژنی گریانی دا، چونکە زۆر لە خەمی کەشتی ئاخییەکاندا بوو. گوتی: "ئەی ئەخیلی بەناوبانگ، ئەی وەجاخزادە، ئەگەرتۆ بەڕاستی بیر لە گەرانەوە دەکەیتەوەو بەنیازنیت چ شتێك بۆ خەلەساندنی کەشتییەکان لە سوتان بکەی، چونکە پشم و غەزەب دڵی گرتووی، من چۆنی بەبێ تۆ لێرە بمێنمەوە؟ وەختێ بابت، بیلیوس لە بیتیاوە بۆلای ئاگامەمنونی ناردی ڕایسپاردم لەگەڵتا بێم، چونکە هێشتا هەرزەکار بووی هیچت لەمەڕ جەنگ وئەو کۆڕ ومەجلیسانەی پیاوانی تیا دەردەکەون نەدەزانی، لەگەڵ تۆی ناردم تا هەموو ئەو

شتانەت فێر بکەم، هەم لە دەم ودوو وهەم لە کردار وهەڵوێستدا کارامە وبەتوانابی. جا بۆیە من قاییل نابم بەبێ تۆ وبەتەنێ لێرە بمێنمەوە —نەخێر نامێنمەوە تەنانەت ئەگەر یەکێك لە خواوەندەکانیش بەڵێنم بداتێ کە پیریم لە کۆڵ بکاتەوە وگەنجم بکاتەوە وبمباتەوە ئەو توغیانی لاوییەی. کە یەکەمجار (هیلاس)ی وڵات و مەڵبەندی ژنانی جوانم تیا بەجێهێشت نامێنمەوە. ئەو کاتە بابم ئەمینتوری کوری ئورمینوس لەسەر کەنیزەکێك رقی لێ هەڵگرتبووم، ئەو کەنیزەکەی خۆشدەویست و نازی هەڵدەگرت، و لەسەر ئەو، ژنەکەی خۆی، دایکمی سەرکۆنە دەکرد، بۆیە دایکم بەردەوام دەستە و داوێنم دەکەوت کە لەگەڵ ئەو ژنەدا بخەوم، تا پیرە پیاوەکەی (بابم) لەبەرچاو بکەوێ. ئیدی بەرە بەرە هاتمە رەداو بەگوێم کرد. بەڵام بابم یەکسەر پێی زانی و بەتوندی سەرکۆنەی کردم، لە خواوەندانی ئێرینوس پاڕایەوە کە هەرگیز منداڵی خۆم بەباوەشەوە نەگرم- ئەوەبوو زیوسی خواوەندی جیهان و یەزدانخانمی ترسناك بیرسیفونی دوعاکەیان گیرا کرد و تووك و نەفرینەکەی هاتەدی. هەنگێ هاتمە سەر ئەوەی کە بەزەبری شمشێری برندە بیکوژم، بەڵام یەکێك لە خواوەندەکان هێوری کردمەوە وبیری خستمەوە کە لۆمەی خەڵکیم لەبیر بێ تا لەنێو ئاخییەکاندا بە بابکوژ ناو نەبریم. بەڵام دڵم رێی نەدەدام لە یەك ماڵا و لەگەڵ بابە تورەکەمدا بمێنمەوە.. ئیدی دۆست و برادەر و خزم و خوێشان لێم خربوونەوە و تکایان لێکردم لەوێ لە کۆشکەکەی بابم بمێنمەوە، مەڕ وگایەکی زۆر وبەرازگەلێکی قەڵەو وچەوریان بۆ سەر بریم، و چاکیان کرد و لەسەر ئاگرێن (هیفایستوس) برژاندیان، گەلێك لە کوپە شەرابەکانی ئەو پیرەمێردە هاتە هەڵێچرین وخواردنەوە، بەدرێژایی نۆ شەوان بەدیار منەوە مانەوە و بەنۆرە ئێشکیان دەگرت، ئەو نۆ شەوە ئاگر نەکوژایەوە، ئاگرێك لەژێر بانێژەی هۆڵەکە و یەکێك لە راڕەوەکەی بەر ژوورەکەی مندا.

(٤٧٤) بەڵام کە لە شەوی دەیەمدا دنیا تاریکی کرد، دەرگای ژوورەکەمم کە زۆر بەمەحکەمی داخرابوو، کردەوە، زۆر بەئاسانی، بێ ئەوەی پاسەوانەکان یان کارەکەرەکان بم بینن، بەدیواری حەوشەکەدا هەڵزنام. ئیدی بەدەشتی پان و بەرینی هیلاسدا هەڵاتم تا گەییمە بیتیای بەفەڕ و بەرەکەت، مەڵبەندی پەز وماڵات، هانام بۆ شا پیلیوس برد، زۆر بەگەرمی پێشوازی کردم، وەکو چۆن باوکێك نازی تاقانەیەکی خۆی،کە دەبێ بەمیراتگری هەموو سەروەت وسامانە زۆرەکەی، بەو ئاوایە نازی هەڵگرتم.دەوڵەمەندی کردم، خەڵکێکی زۆری خستە بەردەستم و لە مەرزەکانی بیتیادا دەژیام و بوو بووم

بەفەرمانڕەوای دولوبییەکان.

(٤٨٥) جا ئەی ئەخیلی هاوتای خواوەندان، من ئەو کەسەم کە کردمیت بەم ئەخیلە، لە ناخی دڵەوە خۆشم دەویستی، چونکە تۆ قاییل نەدەبووی جگە لە من لەگەڵ کەسی دیدا بچیتە سەر خوان وسفرە، یان لە کۆشکەکەتدا گۆشت بخۆی، تا من نەتگرمە باوەش، دەبوایە لە باوەشت بگرم وگۆشتە برژاوەکەت بۆ ئامادە بکەم ولە زارتی بنەم تا تێر و پڕ بخۆیت، هەروەها دەبوایە شەرابم بەدەمەوە کردبای، کە هێشتا هەوەڵی منداڵیت بوو، چەندین جاران شەرابەکەی دەمت دەتفاندەوە وکراسەکەی بەرمت پیس دەکرد.. من ڕەنجێکی زۆرم بەتۆوە کێشاوە، پێتەوە ماندوو بووم، چونکە خواوەندان پێیان ڕەوا نەبینیم منداڵێکم بدەنێ و منداڵی خۆم بەخێو بکەم، جا ئەخیل، ئەی هاوتای خواوەندان، من تۆم کردبوو بەکوڕی خۆم، تا ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان پێویستم پێت بوو بەهانامەوە بێی، فریام بکەوی. بۆیە پێت دەڵێم ئاخۆ ناکرێ دەستبەرداری ئەم توڕەبوونەت ببی، هەق نییە ئەوەندە دڵڕەق ونادلۆڤان بی، تەنانەت خواوەندانیش بەهەموو توڕەیی و سام و شکۆ و دەسەڵاتێکیانەوە کە زۆر لە ئێمە باڵاترن، دەکرێ ڕازی بکرێن و دڵیان نەرم بکرێ. ئەگەر مرۆڤێك خەتایەك بکات ئەوا نوێژ بۆ خواوەندان دەکات و لێیان دەپاڕێتەوە و بخوردیان بۆ دادەگیرسێنێ وقوربانی ونەزریان بۆ دەکات ولێی خۆش دەبن. چونکە نوێژی تۆبە، کیژانی زیوسی مەزنن، ئەمانە شەل و شێت و لەنگن، چارە گرژ و پڕچرچ ولۆچن، خێڵ و قیچن. هەمیشە بەدوای هەڵە و خەتاوەن، ڕاستە خەتاو هەڵە بەهێز ولەزرۆن، بەفەرسەخان پێش هەموو نوێژان دەکەون، و بەرلە نوێژ هەر چوارنکالی زەوی تەی دەکەن، بەشەران دەخەنە هەڵدێری تاوان و خەتاوە.. نوێژ دوایان دەکەون کە زەرەرو زیانەکان چارەسەر بکەن. جا ئەوەی ڕێزی کیژەکانی زیوس بگرێ –کاتێ لێی نزیك دەبنەوە- بەهانایەوە دەچن، کە نوێژ و نزا بکات، نزاکەی قبوڵ دەکەن، بەڵام ئەگەر ڕەفزیان بکات و گوێیان لێنەگرێ، ئەوا دەچن بۆلای زیوسی کوڕی کرونوس و لێی دەپاڕێنەوە کە ئەو کەسە دووچاری هەڵە وسەرگەردانی بکات تا باجی تەواوەتی هەڵەکانی بدات.

(٥١٣) دەیسا تۆش ئەی ئەخیل، ڕێزی کیژەکانی زیوس بگرە، با دڵت نەرم بێ. ئەگەر کوڕەکەی ئوتریوس ئامادە نەبوایە ئەم دیاری و پێشکەشیانەت پێشکەش بکات، ودیارییەکانی ئایندەی کە بەتەمایە بتداتێ، نەژماردایە، واتە ئەگەر لەسەرکەللەڕەقی وقینی

خوی بەردەوام بوایە، من داوام لێنەدەکردی کە دەستبەرداری تووڕەیی خۆت ببی و فریای ئارگۆسییەکان بکەوی هەرچەندە زۆریان پێویست بە کۆمەکی تۆیە. بەڵام ئێستاکێ دیارییەکی زۆرت پێشکەش دەکات، ولە ئایندەشدا زیاترت دەداتێ. کۆمەڵێك قارەمانی ناردووە تا لێت بپاڕێنەوە، ئەمانە هەڵبژاردەترین کەسانی ناو هەموو لەشکری ئاخییانن، ئەمانە بەڕێزترین و ئازیزترین ئارگۆسیانی دڵی تۆن، کەواتە قسەیان مەشکێنە، ڕێزی هاتنەکەیان بۆ ئێرە بگرە. هەرچەندە تا ئێستا کەس تووڕە بوونەکەت بەناڕەوا نازانێ، و نەهەقت ناگرێ، بەڵام ئێمە لە بەسەرهاتنامەی قارەمانان و جەنگاوەرانی کۆندا بیستومانە ئەگەر لە یەکترش تووڕە بووبن، ئەوا بەدیاری و قسەی خۆش وزمانی شیرین ئاشتبوونەتەوە

(٥٢٧) جا من لێرەدا چیرۆکێکی کۆنی زەمانی ڕابردوو —نەك تازە- تان بۆ دەگێڕمەوە، بۆیە بۆتانی دەگێڕمەوە چونکە هەمووتان دۆستی منن، جارێکیان کورتیسەکان و ئیتولیەکان لەسەر کالیدون لێیان دەبێ بەشەڕ، ئیتولیەکان بەرگرییان لە شارە جوانەکەی کالودون دەکرد و کورتیسەکان هەوڵیاندەدا بەتەواوەتی وێرانی بکەن، یەکەمجار (ئارتیمیس)ی خواوەندی ڕاووشکار، خاوەنی بارەگا وعەرشی زێڕین، ئەم بەدبەختی و بەڵایەی بۆ ناردبوون، لەوە تووڕە بووبوو کە (ئوینیوس) لە نۆبەرەی باخ و ڕەزەکانیا هەموو خواوەندەکانی بەسەرکردبووەوە تەنیا ئەو نەبێ، هەموو خواوەندەکان قوربانی ونۆبەرانیان بەرکەوتبوو، تەنیا کیژی زیوسی مەزن بێ دیاری ونۆبەرانە مابووەوە.. بەهەرحاڵ ئەمە زادەی بیرچوونێکی ڕێکەوتەکی بووبێ یان سەهو و نەزانی، ئوینیوس هەڵەو تاوانێکی گەورەی کرد. بۆیە خواوەندی تیرئەنداز، کیژی زیوس، زۆر تووڕە بوو، بەرازێکی کێوی دڕ و دڕندەی شفرە سپی بۆ نارد. ئەم بەرازە زەرەر وزیانێکی گەورەی لێدا، ڕەزەکانی تێکدا، زۆرداری بەرداری لە ڕەگ وڕیشەوە دەرکێشا و تەختی ئەرزەکەی کردن.. بەڵام (میلیاگڕ)ی کوڕی (ئوینیوس) لە چەندین شارەوە ڕاوچی و تاژیانی خڕکردەوە و بەرازەکەی کوشت، بۆیە ئەو خەڵکە زۆرەی کۆکردەوە چونکە زۆر زەبەلاح بوو و بەچەند کەسێکی کەم نەدەکوژرا وتەنانەت پێشتر چەند کەسێکیشی کوشتبوو. بەڵام ئارتیمیس لەسەر ئەم بەرازە، لەسەر سەروکەللە وپێستە زبرەکەی، شەڕ وئاژاوەیەکی گەورەی لە بەینی کورتیەکان و ئیتولیەکاندا نایەوە. تا (میلیاگڕ)ی —خۆشەویستی ئێریس لە مەیدانی شەڕەکەدا بوو، بەخت یاری کورتیەکان نەبوو، هەرچەندە ژمارەیان زۆر بوو بەڵام نەیاندەتوانی لە دیوارەکانی دەوری شار هێوەتر بڕۆن. بەڵام کاتێ کە تووڕەبوون بەسەر دڵی (میلیاگڕ)دا زاڵ بوو، ئەو تووڕەبوونەی هەندێ

جار بەسەر خەڵکانی ژیر و ئەقڵمەندیشدا دێت،
(٥٥٥) میلیاگر لەگەڵ (ئالتیا)ی دایکیدا بەشەڕ هات ودڵی لێی تۆرا، ئیدی لە پاڵ ژنەکەیدا، لە پاڵکیلوپاترای نازدارا کونجی ماڵەوەی دەگرت وبۆ ئوردوگا نەدەچوو. کلیوپاترا لە مارپیسای پاژنە جوانی کیژی ئیڤینوس و (ئیداس)ی بەهێزترین پیاوی سەرزەمینی ئەو دەورو زەمانە بوو، واتە کیژی مارپیسا و ئیداس بوو. هەمان ئەو (ئیداس)ەی کە لەسەر کیژی پاژنە جوان، لەسەر مارپیسا، چوو بەگژ ئەپولۆی سەروەردا و تیر وکەوانی لێ ڕاکێشا. لەو سەردەمەدا بابی و دایکە نەجیبەکەی، لە کۆشکەکەی خۆیاندا (ئالسیون)یان پێ دەگوت. چونکە دایکەکە لە مەینەتیەکی هاوشێوەی مەینەتی باڵندەی (ئالسیون)ی فرەخەمدا دەگریا ودەینالاند، ئەمە ئەو کاتانە بوو کە ئەپولۆ ڕفاندبووی.. ئیدی میلیاگر لە ماڵەوە ولەگەڵ کیلیوپاترادا دەمایەوە و تورەیی خۆی هێور دەکردەوە، بەهۆی تووك ونەفرینی داکییەوە بەرغەزەب کەوتبوو. کە میلیاگر خاڵەکانی خۆی کوشتبوو، دایکی زۆر خەفەتی خوارد بوو ویەکسەر لە خواوەندان پاڕابووەوە و دەستەکانی دابوون بەعاردیدا و داوای لە هادیس و برسیفونی ترسناك کردبوو، بۆیان بەچۆکدا هاتبوو، بەدەم گریان وفرمێسکەوە لێیان پاڕابووەوە کە کورەکەی بکوژن –ئیدی (ئیرینوس)ی شەوڕۆی دڵڕەق و بێ بەزەیی لە (ئیریبوس)ەوە گوێی لێ دەبێت
(٥٧٣) ئیدی زوو بەزوو هەرا وهەنگامەی شەڕ لەبەر دەرگاکانی کالیدون بەرز دەبێتەوەو کورتیەکان هێرش بۆ قەلا و شورەکانیان دێنن، تەنگیان پێ هەڵدەچنن، ئیدی ردێن سپی و دێرینە پیاوانی ئیتولی دەستی نیاز و پێویستی بۆ میلیاگر درێژ کرد، گەورە کاهێنانی خۆیانی بۆلا نارد وتا بێتە دەرێ و یارمەتیان بدات. بەڵێنیان دایێ کە پاداشتی بدەنێ. داوایان لێکرد پەنجا پارچە زەوی لە باشترین وبەپیتترین زەوی دەشتی کالیدون هەڵبژێرێت، نیوەی ڕەز و باخ بێ و نیوەی زەوی کێڵراو بێ. پیرە "ئوینیوس"ی جەنگاوەری دێرین هاتە بەردەرگاکەی و تکای لێکرد یارمەتیان بدات. خوشکەکانی ودایکی لێی پاڕانەوە، بەلام گوێی نەدانێ، وسورتر بوو لەسەر هەڵوێستی خۆی هەروەها هاوڕێ گیانی بەگیانی وئازیزەکانی تکایان لێکرد، بەلام ئەوانیش نەیانتوانی کاری تێبکەن ودڵی نەرم بکەن، تا شەڕ گەییە بەردەرکەی ژوورەکەی و کورتییەکان کەوتنە ئەوەی بەدیوارەکاندا هەڵگەڕێن و ئاگر لە شار بەربدەن، هەنگێ ژنە جوانەکەی بەدەم گریانەوە هانای بۆ (میلیاگر) برد و هەموو ئەو مەینەتیانەی بۆ گێڕایەوە کە داگیرکەرانی شارەکەیان بەسەر خەڵکەکەیاندا

هێناوە و گوتی: پیاوان دەکوژرێن، شار بووە بەخۆراکی ئاگر، بێگانە منداڵەکانیان و ژنە پشتێن شۆڕەکانیان بەدیلی دەبەن

(٥٩٥) کە گوێی لەو بەسەرهاتە پڕسوێیە بوو، دڵی هاتە ژان، جلکی شەڕی لەبەرکرد، مەتاڵەکەی هەڵگرت وبۆی دەرچوو. بەوجۆرە بەدەنگی گازی ڕوحی خۆیەوە چوو، وشاری ئیتولیەکانی لە مەینەتی ڕزگار کرد. بەڵام خەڵاتەکانی پێشتریان نەدایێ، هەرچەند شارەکەی ڕزگار کرد، بەڵام چ شتێکی لەبری ئەو کارەی وەرنەگرت. جا کوڕی خۆم تۆش وەکو ئەو بیرمەکەوە، لەکەری شەیتان وەرە خوارێ وئەو ڕێگەیە مەگرەبەر. کە کەشتییەکان گڕیان گرت هەنگێ ڕزگارکردنیان دژوارتر دەبێت. کەواتە دیارییەکان وەربگرە و بڕۆ، چونکە هەنگێ ئاخییەکان بەئەندازەی خوایەك ڕێزت دەگرن، بەڵام ئەگەر بەبێ وەرگرتنی دیارییەکان بجەنگی، ڕەنگە تای تەرازووی شەڕەکە لە دۆڕانەوە بگۆڕی بۆ سەرکەوتن، بەڵام ئەو شکۆ وسەرفرازی و ڕێزەت نابێ."

(٦٠٦) ئەخیل وەڵامی دایەوە: "فینیکس، ئەی پیرە باب و پەروەردەکاری دڵسۆز، ئەی زادەی زیوس، من پێوستم بەو ڕێز وشکۆمەندیە نییە. ڕێز وشکۆی من —پێم وایە- لە خودی زیوسەوەیە. جا ئەم شکۆیە تا من هەبم و کەشتیم هەبێ، تا هەناسەم تیابێ و هێز لە ئەژنۆمدا هەبێ، هەردەمێنێ. جا حەز دەکەم قسەیەکت پێ بڵێم کە قسەی ناخی دڵمە، بەم گریانو پاڕانەوەیە بۆ کوڕی ئوتریوس ڕوحم ئازار مەدە. نەخەڵەتابی خۆشت بوێ، دەنا خۆشەویستی من، کە زۆرم خۆشدەویێ، لە دەست دەدەی. هەقە ئەو کەسە ببوغزێنی کە من دەبوغزێنێ. وەرە وەکو من پاشا بە، نیوەی شکۆ وگەورەیی من بۆ خۆت ببە، ئەمانی دی پەیامەکەم دەبەنەوە، تۆ لێرە بمێنەوە لەسەر نوێنێکی نەرم و شل بنووە، تا ڕۆژ دەبێتەوە، هەنگێ تەگبیر دەکەین کە بۆ وڵاتی خۆ بڕۆینەوە یان لێرە بمێنینەوە."

(٦٢٠) ئەوجا بەبێدەنگی چاوێکی لە پاترۆکلوس داگرت کە جێگەیەکی نەرم و ئەستور بۆ فینیکس ڕابخات، و تا ئەوانی دی بکەونە خۆ کە بەزووترین کات لە بارەگاکەی بڕۆن. بەڵام ئەجاکسی کوڕی تیلامون —هاوتای خواوەند- هەڵیدایێ و گوتی: "ئەی کوڕی لایرتیس، زادەی خواوەندان، ئەی ئۆدیسیوسی دانای پڕ تەگبیر، با بکەوینە ڕێ، پێم وایە هاتنەکەمان بێهودە بوو، باشتر وایە ئەم پەیامە هەرچەندە پەیامێکی خۆش نییە، بەزووترین کات بگەیەنینە داناییەکان، بگەیەنینە ئەو داناییانەی کە پێم وایە ئێستا دانیشتوون و چاوەڕوانی ئێمە دەکەن. فایدەی نییە، ئەخیل دڵە خۆ پەسندەکەی تەسلیم

بەرو وکینە کردووە، تەحاکە پیاوێکی دڵڕەقە!.. هیچ حیسابێك بۆ خۆشەویستی و دۆستایەتی هاوڕێکانی ناکات، کە لە هەر دانایییەکی ناو ئەم کەشتییانە، ناو ئەم لەشکرە پتر ڕێز و حورمەتی دەگرین.. تەحا کە پیاوێکی پێنەزانە. بەڕاستی بوغزلەزگە —پیاو کە برای یان کوڕی دەکوژرێ، ئامادەیە سوڵح بکات و خوێنبەهاکەی وەربگرێ. کە بکوژ خوێنی دا هەنگێ بەسەلامەتی لە شوێن و واری خۆی دەژی، خاوەن هەقیش کە خوێنی وەرگرت دڵی پاك دەبێتەوە. بەڵام تۆ ئەی ئەخیل، زۆر سەیرە، خواوەندان دڵێکی ڕەقی بەرد ئاسایان خستوەتە قوڵایی سینەتەوە، لە کەرب وکین پاك نابێتەوە، هەر هەموو ئەمەش لەبەر تاقە کیژێك، لە کاتێکا ئێمە ئێستا حەوت جوانترین کیژی دنیات دەخەینە بەردەست، زێدەباری چەندین دیاری دیکە. دەیسا لێبوردنت هەبێ، حورمەتی ماڵەکەت بگرە، ئاخر ئێمە، لەجیاتی هەموو دانایییەکان میوانی تۆین. ئاخر بەناوە ئێمە لەهەر هەموو ئاخییەکان لەتۆ نزیکترین!"

(٦٤٤) ئەخیل وەڵامی دایەوە: "ئەی ئەجاکس، ئەی زیوس زادە، ئەی کوڕی تیلامون، و ئەی سەرداری سوپا!.. هەست دەکەم تۆ هەمان قسەی ناو مێشك و زەینی من دەکەی، بەڵام هەرچەند بیرم دەکەوێتەوە کە کوڕی ئوتریوس چۆن لەناو ئارگۆسییەکاندا وەکو غەوارەیەکی دەربەدەر سوکایەتی پێکردم و شکاندمیەوە، دڵم هێندەی دی دێتە جۆش، کەواتە بڕۆ و پەیامی منی پێ بگەیەنە، چونکە من بەتەمانیم خۆ لە قەرەی ئەو جەنگە خوێناوییە بدەم، جا با هیکتۆری مەزن، کوڕی بریامی خانەدان بەدەم کوشت و بڕی ئارگۆسییەکان وسوتاندنی کەشتییەکانیانەوە تا ئۆردوگاکانیان بێتە پێشەوە.

کەی هیکتۆر گەییە نزیکی خەرگە وکەشتییە ڕەشباوەکەی من، پێم وایە چەند توندوتیژیش بێ، ناچار بیر لەوە دەکاتەوە کە لە شەڕ بوەستێ.

(٦٥٦) ئەو قسانەی کرد. ئەوجا ئەندامانی شاندەکە هەریەکە و جامێکی دوو قوڵفیان هەڵگرت و هەندێ شەرابیان بەناوی خواوەندانەوە بەعاردیدا پرژاند، بەپاڵ ڕیزە کەشتییەکاندا لە خەرگەکەی ئەخیل گەڕانەوە، ئودیسیوس لە پێشی هەموویانەوە دەڕۆیی. لەم لاشەوە پاتروکلوس هاوڕێکانی وکارەکەرەکانی ڕاسپارد کە جێگەیەکی نەرم و ئەستور بۆ فینیکس ڕابخەن. بەگوێرەی فەرمانەکەی ئەو جێگەیەکیان لە فەروی مەڕ وکەتانی نەرم بۆ ئامادە کرد. پیرەمێرد لەسەر ئەو جێگەیە و بەدەم چاوەڕوانی سپێدەوە خەوت، ئەخیل لە بنەبانی سەراپەردەکەی خۆی کە زۆر بەمەحکەمی داکوترا بوو، خەوت،

زینجی لە پاڵدا بوو کە لە لسبوس بەدیلی گرتبووی و لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، ئەم ژنە دیومیدی گوڵڕوخساری کیژی فورباس بوو. (پارتوکلوس)ش ڕێك لە بەرانبەر ئەخیلدا خەوت، ژنێکی ناوقەد زراڤی لە پاڵدا بوو، ئەم ژنە ناوی (ئیفیس) بوو، ئەخیل لەکاتی گرتنی سکوروسی شارەکەی ئینویوسدا گرتبووی و پێشکەش بەپاتروکلوسی کردبوو.

(٦٦٩) کاتێ شاندەکە گەییشتەوە خێوەتەکانی کوڕی ئوتریوس، ئاخییەکان یەك یەك هەستان و بەجامی زێرینەوە پێشوازییان کردن، هەر هەموویان کەوتنە پرسیار، ئاگامەمنون، گەورەی جەنگاوەرەکان، لە پێش هەموویانەوە کەوتە پرسیار و گوتی: "مژدەم بدەیێ ئەی ئۆدیسیوس، ئاخۆ بەنیازە کەشتییەکان لە سوتان ڕزگار بکات، یان ڕەفزی کرد، و هێشتاش هەر تورەیە؟

(٦٧٧) ئۆدیسیوس وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕە سەرفرازەکەی ئوتریوس ،سەرداری جەنگاوەران، ئاگامەمنون، ئەخیل هێور نەبووەتەوە، بگرە لە جاران تورەترە، خۆت و دیارییەکانت ڕەفز دەکات، نەسحەتت دەکات کە لەگەڵ ئارگۆسییەکاندا ڕاوێژ بکەی تا چارەیەك بۆ ڕزگارکردنی کەشتییەکان و لەشکری ئاخییەکان بدۆزنەوە.

(٦٨١) سەبارەت بەخۆیشی، گوتی سبەی بەیانی کەشتییەکانی دەخاتە ئاوێ. هەروەها دەڵا هەموو ئەوانی دیکەش هاندەدا کە ڕێگەی دەریا بگرنە بەر و بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێنەوە، چونکە تۆ هەرگیز بەو ئاواتە ناگەی کە تەرەوادە بگری، چونکە زیوسی دووربین باڵی بەسەردا گرتووە و دەیپارێزێ، و خەڵکەکەش سوورن لەسەر پاراستنی." ئەخیل وای گوت، ئەوانەی کە لەگەڵما بوون، ئەجاکس و دوو جارچییەکە شایەتی ڕاستی قسەکانمن، هەردووکیان جێگەی متمانە و باوەڕن. سەبارەت بە پیرە(فینیکس)ش لەوێ مایەوە تا سبەینێ ئەگەر خۆی ویستی، لەگەڵ ئەخیلدا و بەکەشتییەکانی ئەو بۆ وڵاتی ئازیز بگەڕێتەوە، ئەخیل بەتۆبزی لەگەڵ خۆیی نابات."

(٦٩٢) بێدەنگی باڵی بەسەرهەموویاندا کێشا، تاماوەیەکی زۆر بەغەمگینی دانیشتن، واقیان لەم سەرسەختییەی ئەخیل ورمابوو. لێ دیومیدسی نەڕەشێری مەیدان هەڵیدایێ و گوتی: "ئەی ئوتریوس زادەی سەربەرز، سەردار و مەزنی جەنگاوەران، ئاگامەمنون، بریا لە ئەخیلی بێ نەزیر نەدەپاڕایتەوە، خۆزیا ئەو هەموو دیاری و پێشکەشیانەت نەدەدایێ.. زۆر لەخۆی بابیە، بەم کارەی تۆ هێندەی دیکە لەخۆی بایی بوو.با بەو دەقەوە وازی لێ بێنین، کەیفی خۆیەتی دەمێنێ بابمێنێ، دەڕوات بابڕوات، پاشان کە دڵی چابوو، یان یەکێك لە خواوەندان

هاوڕاندی شەڕێك دەكات ئەوسەری دیار نەبێ. جا باواز لەم قسانە بێنین، و هەمووتان بەگوێی من بکەن، هەمووتێر وپڕمان خواردووە وخواردووەتەوە، با بڕۆین ئیسراحەت بکەین، چونکە ئیسراحەت هێز و توانا بەپیاو دەبەخشێت، بەڵام هەر کە سپێدەی جوان، بەقامکە گوڵڕەنگەکانییەوە دەرکەوت، بەلەزسوپاییەکان وگالیسکەکان لەبەردەم کەشتییەکاندا خڕ بکەرەوە وبۆ شەڕیان هانبدەو، بەخۆت لە ڕیزی پێشەوەی هەموویانەوە بجەنگە."

(٧١٠) ئەو قسانەی کرد، هەموو فەرماندەکان دەم خۆشی قسەکانیان لێ کرد، ئەوجا هەر کەسە و پێکێکی بەناوی خواوەندانەوە پرژاندە سەر زەوی و بەرەو خێوەتەکەی خۆی ڕۆیی و پاڵکەوتن و لێی خەوتن.

# سروودی دەیەم

## هەواڵدزییەکی شەوانە

**حیکایەتەکە**

**ئاگامەمنون نەیتوانی بنوێ، لەوە دەترسا تەروادەییەکان کەشتییەکانیان بسوتێنن، تەدارەکی لەخۆدا، زرێکەی لەبەرکرد و ڕم و قەڵغانەکەی هەڵگرت و بەو شەوە بەرەو لای مینیلاوسی برای وەڕێکەوت، پێی سەیر بوو کە بینی ئەویش وەکو ئەم بێدارە. داوای لە قاسید و جارچییەکان کرد بچن بۆ لای فەرماندە و شیرەتکارەکان، و کۆڕێکیان بەست و باسی ئەو وەزع و حاڵە مەترسیدارەیان کرد کە هەڕەشەی لە گریکەکان دەکرد. نەستور پێشنیازی کرد کە کەسێك بنێرن تا جاسوسی بەسەر تەروادەییەکانەوە بکات. هەموو بێدەنگ بوون، بەڵام دوای ماوەیەك دیومیدس ئامادەیی خۆی بۆ ئەم کارە دەربڕی. لێ داوای لە ئاگامەمنون کرد هاوڕێیەکی دیکەی لەگەڵدا فڕێکات، دوو کەس باشترە، ئەگەر یەکێکیان شتێك نەبینێ ئەوی تریان دەیبینێ. ئاگامەمنون داوای لێکرد بەخۆی سەرپشك بێ و ئەو کەسە هەڵبژێرێ، بەڵام ترسا مینیلاوسی برای هەڵبژێرێ، ئامۆژگاری کرد کە یەکێك هەڵبژێری کردەبێ، نەك یەکێك هەڵبژێرێ لە ماڵباتی پاشا بێ و لە عۆیەی کارەکە نەبات، چونکە لەم کارەدا مەسەلەی ڕەچەڵەك و ماڵبات لە ئارادا نییە. زۆر بەشێنەیی ئۆدیسیوس هەڵدەبژێرێ و بەجووتە بۆی دەردەچن تا جاسوسی بەسەر تەروادەییەکانەوە بکەن. لەولاشەوە هیکتۆر جاسوسێکی بەناوی (دولون) دەرکرد، تا بزانێ گریکەکان بەخۆ و کەشتییەکانیانەوە هەڵدێن یان خۆ بۆ شەڕ تەیار دەکەن. ئەم جاسوسەی هیکتۆر دەکەوێتە دەستی دیومیدس و ئۆدیسیوس، هەموو زانیارییەکی پێویستی لێ دەردێنن و دەیکوژن. ئەوسا توانیان بچنە ناو ئۆردوی تەروادەییەکانەوە و چەند کەسێك لە تراقییەکان، کە تازە لەڕێوە هاتبوونە هیمدادی تەروادەییەکان، بکوژن کە یەکێك لەوانە پاشاکەیان بوو، و دەست بەسەر هەندێ تالانی دا بگرن، ولەڕێگەی خۆیانەوە ئەو دەستکەوتانەش هەڵگرن کە بەر لە کوشتنی دولون**

لێیان سەندبوو و شاردبوویانەوە. توانی بوویان بۆ ئۆردوەکەی خۆیان بگەڕێنەوە و بەسەرهاتی جاسوسیەکەی خۆیان بگێڕنەوە. لە ئاوی دەریا خۆیان لە خوێن و خوڕ پاك بکەنەوە وبشۆن و قوربانی بەیەزدانخانم ئەتینا پێشکەش بکەن، قوربانییەکە بریتی بوو لە بادەی ناو بادیە، کە سوپاسگوزاری بوو بۆ ئەو خواوەندەی پاراستبوونی و یارمەتی دابوون بەو شەوە بگەنە ئۆردوی تەروادەییەکان.

شوێن:

بویەرەکان هەوەڵجار لە ئۆردوی ئاخییەکان، ئەوجا لەو دەشتەی نێوان هەردوو ئۆردوی تەروادەیی و گریکییەکان، ڕوو دەدەن، ئەوجا جووتە جاسووسەکەی یۆنانەکان دەگەنە ئۆردوی گریك، لەو قوڵەوە کە تراقییە ماندووەکان تازەگەیی بوونە جێ بۆ یارمەتیدانی تەروادەییەکان، و پاشان دەگەڕێنەوە بۆ ئۆردوەکەی خۆیان.

زەمەن:

دوا بەتڵی شەوی بیست و حەوتە، بەپێی گێڕانەوەی هۆمەر لە داستانەکەیدا.

(١) هەموو فەرماندە ئاخییەکان بەدرێژایی شەو بەدیار کەشتییەکانیانەوە خەوتن، بەڵام ئاگامەمنونی کوڕی ئۆتریوس، سەرداری لەشکر و سوپا، خەو نەچووە چاوی، مێشکی جەنجاڵ و مژوڵی زۆر شت بوو. وەکو چۆن کاتێ زیوسی مێردی (هیرا)ی کەزییە شۆڕ، بیەوێ بارانێکی زۆر ببارێنێ یان تۆف و بۆران هەستێنێ یان بەفرێکی ئەستور بخات، یان شەختە و زوقم کێڵگە و مەزرایان بگرێ، یان هێمای شەڕێکی دژوار بنوێنێ دەیکات بەبروسك و هوڕ و چەخماخەدانێکی ترسناك و خەڵکی هەناسە لە سینەیاندا دەتاسێ.. ئاگامەمنونیش بەو ئاوایە لە ناخی ناخییەوە هەناسەی هەڵدەکێشا، دڵی لە ناخیا دەلەرزی، هەرچەند دەیڕوانییە دەشتی تەروادە وئەو هەموو ئاگرەی بەردەم ئیلیونی دەبینی وگوێی لە دەنگی زوڕناوئەی، و هەرا و زەنای پیاوان دەبوو سەری سوڕ دەما. کە دەیڕوانییە کەشتی و لەشکری ئاخییەکان، قژی خۆی دەرنییەوە وهاواری بۆ زیوسی بەرز و باڵا دەبرد و لە ناخ و کانگای دڵییەوە دەیناڵاند. ئەوەبوو لەپڕ بیرێکی، بەلای خۆیەوە، باشی بەمێشکدا هات، ئەویش ئەوەبوو یەکسەر بچێ بۆلای نەستوری کوڕی نیلیوس. بەڵکو تەگبیرێکی ژیرانەی لەگەڵدا بکات و لەشکری ئاخییەکان لە فەوتان ڕزگار بکەن. ئیدی جلی لەبەرکرد، پێی‌وی لەپێکرد، فەروەیەکی پێستی شێری قاوەیی دا بەشانیا، فەروەیەك کە دەگەییە پێییەکانی، و ئەوجا نێزەکەی هەڵگرت.

(٢٥) هەروەها خەو نەچووە چاوانی مینیلاوس، چونکە لەوە دەترسا کە ئارگۆسییەکان شتێکیان بەسەرا بێت، ئەو ئارگۆسیانەی کە ئەو هەموو دەریایەیان لەبەرخاتری ئەو بڕی بوو تا شەڕی تەروادەییەکان بکەن. پۆستینێکی کەوڵە پڵینگی بەڵەکی دا بەشانیا، کڵ‌وخودێکی برونزی نایەسەری، ڕمێکی بەدەستە بەهێزەکانییەوە گرت. ئەوسا ملی ڕێی گرت تا بچێ براکەی لە خەو هەستێنێ، کە فەرمانڕەوا وپاشای بێ چەند و چونی هەموو ئارگۆسییەکان بوو، گەل وەکو خواوەندێك ڕێزیان دەگرت. سەیری کرد تەدارەکی جەنگی لەخۆ داوە ولەلای پێشی کەشتییەکەیەوە وەستاوە. زۆری کەیف بەهاتنی براکەی هات و پێشوازییەکی گەرمی کرد

(٣٤) (مینیلاوس)ی نەڕەشێری مەیدان گوتی: "بۆچی تەدارەکی جەنگت پۆشیوە ئەی برای بەڕێز؟ بەنیازی یەکێك لە هاوڕێکانمان بنێری تا جاسوسی بەسەر تەروادەییەکانەوە بکات؟ باوەڕ ناکەم هیچ کەسێك بەتەنێ بڕوات و ئەم کارە بۆ تۆ ئەنجام بدات، بەم تاریکە شەوە جاسوسی بەسەر دژمنەوە بکات!.. ئەم کارە پیاوێکی زۆر بەجەرگی دەوێ."

(٤١) شا ئاگامەمنون وەلامی دایەوە: "ئێمە، من و تۆ ئەی مینیلاوس پێویستمان بەکۆڕێکە کە تەگبیر وڕاوێژێك بکەین تا بتوانین ئارگوسییەکان وکەشتییەکانیان ڕزگار بکەین. وادیارە دڵی زیوس زیاتر بەقوربانییەکانی هیکتۆردا چووە تا قوربانییەکانی ئێمە. من هەرگیز نەخۆم دیتومە و نە لە زمانی کەسم ژنەوتووە، کە پیاوێك بەتاقی تەنیا، لەیەك ڕۆژا، ئەو هەموو کوشتارە سامناکەی لە خەڵکانێك کردبێ، وەکو هیکتۆر —خۆشەویستەکەی زیوس- دژی کوڕانی ئاخیایی کردویەتی، بەمەرجێ نە کوڕی یەزدانخانمێك بێ و نەزادەی خواوەندێك. کاری وەهای کردووە پێموایە دەبێتە داخێکی درێژخایەن لە دڵی ئارگوسییەکاندا بۆیە هەر ئێستا بەپەلە بەپاڵ کەشتییەکاندا بڕۆ و ئەجاکس و ئیدومینیوس گاز بکە بۆ ئێرە .منیش دەچم بۆلای نەستوری دانا وداوای لێدەکەم لە خەو هەستێ بەڵکو ئەگەر ڕازی بوو بچێ بۆلای پاسەوانە پیرۆزەکان و قسەیەکیان لەگەڵدا بکات وقەناعەتیان پێ بکات، ئەوان لە هەموو کەس زیاتر بەگوێی ئەو دەکەن چونکە کوڕەکەی ئەو و (میریونیس)ی هاوڕێی ئیدومینیوس فەرماندەی پاسەوانەکانن، جا ئێمە ئەم ئەرکە بەو دووانە دەسپێرین."

(٦٠) مینیلاوسی نەڕەشێری مەیدانی شەڕ وەلامی دایەوە و گوتی: "جا چ ئەمرێك بەمن دەکەی؟ ئایا لەوێندەر، لای ئەوان وەمێنم و چاوەڕوانی هاتنی تۆ بکەم یان هەر کە دەستور و ئامۆژگارییەکانی تۆم موو بەموو پێ ڕاگەیاندن بێمەوە بۆ ئێرە بۆلای تۆ؟ شا ئاگامەمنون وەلامیدایەوە و گوتی: "لەوێندەر وەمێنە نەبا لێکدی وون بین چونکە ئۆردوگاکە پڕە لە ڕێگە و ڕچەڕێیان. بەهەر شوێنێکدا ڕۆیشتی دەنگ هەڵبڕە وداوا لە خەڵکەکە بکە با هەستن. هەر هەموویان بەناوی خۆ و باب و تیرەیانەوە بانگ بکە. ڕێزی شایستەی هەر یەکێکیان بگرە. نەخەڵەتابی خۆت بەگەورە بزانی، دەبێ ئێمەش لەم کارەدا بەشداری بکەین پێموایە زیوس لە ڕۆژی لە دایکبوونمانەوە ئەم بارە گرانەی لەسەر شان ناوین.

(٧٢) ئیدی بەو ڕاسپاردانەوە براکەی نارد، بەخۆیشی بەرەو لای نەستور —سەردار و شوانی لەشکرییان- وەرێکەوت. سەیری کرد لە خێوەتەکەی خۆیدا، لە نزیکی کەشتییە ڕەشەکەی، لەسەر جێگایەکی نەرم ونیان خەوتووە. تاقم وتەدارەکەکەشی بەتەنیشتەوە بوو: زرێ جوانەکەی، قەڵغان وجووتە نێزەکەی و کێوخودە بریقەدارەکەی، نیتاقە بریقەدارەکەشی بەتەنیشتەوە بوو، ئەو نیتاقەی کە ئەم پیرەمێرە هەر کاتێ شەڕێکی دژوار و بەشەرکوژ هاتبا پێشێ و پێویستبا ڕابەرایەتی قەومەکەی بکات، لە پشتی دەکرد.

ئەم پیاوە هیچ حیسابێکی بۆ پیری و تەمەن نەدەکرد. سەری هەڵبڕی و خۆی بەسەر ئانیشکیا داو ڕوویکردە کوڕی ئوتریوس و لێی پرسی: "تۆ کێی وا بەم تاریکەشەوە بەتاقی تەنێ بەناو ئۆردوگاکەدا و بەکەناری کەشتییەکاندا دەڕۆیی، لە کاتێکا هەموو بەشەرە فانییەکانی دی لە غورابی خەودان؟ تۆ لە یەکێ لە هێسترەکانت دەگەڕێی یان عەودالّی یەکێك لە هاوڕێکانتی؟ قسە بکە، بەبێدەنگی بەرەو من مەیە. چیت گەرەکە؟

(٨٧) ئەوسا ئاگامەمنون –پاشا وسەرداری جەنگاوەران- وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی نەستور، ئەی کوڕی نیلیوس، ئەی مایەی شانازی و شکۆمەندی ئاخییان.. تۆ ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس دەناسیت، و دەزانیت زیوس، لەناو هەموو کەسێکا، ئەوی لە خەم و پەژارەی بەردەوام بارکردووە، تا هەناسە لە سینەمدا مابێ و هێز لە ئەژنۆکانما مابێ، بەو ئاوایە دەخولێمەوە. ئێستاش بۆیە دەرچووم چونکە خەو لە چاوانم تۆراوە، دڵم لای شەڕەکەیە و لە خەم و پەژارەی ئاخییەکاندام. زۆر نیگەرانی داناییەکانم، ئەقڵم بەهیچ کوێرا ناگات، بێتاقەت و نارەحەتم، دڵم لە سینەمدا ناهێورێ، لاقە بەهێزەکانم، باری لەشم ناتوانن. جا ئەگەر حەز دەکەی شتێك بکەی، مادام تۆش خەوت زڕاوە، وەرە با بچین سەرێکی پاسەوانەکان بدەین، تەماشایەك بکەین، نەبادا لە ماندویەتیدا خەوتبن، و پاسەوانییەکەیان هەر لە بیرش نەمابێ. دژمن لە دەوروبەر ونزیکی ئێمە هەڵیداوە، کێ دەڵا شەبەیخونێکمان ناکەنە سەر."

(١٠٢) نەستوری جرنیایی، سوارچاك و ڕامکەری ئەسپان، وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی شکۆمەند، ئەی ئاگامەمنون، سەردار و پاشای جەنگاوەران.. بێگومان زیوسی دانا هەموو ئاواتەکانی هیکتۆر نایەنێتە دی، هەموو خەون و خەیاڵەکانی ئێستاشی نایەنەدی. من پێم وایە ئەگەر ئەخیل دەستبەرداری ئەم تورەبوونەی ببێ، ئەوا هیکتۆر زۆر لە ئێمە خراپتری بەسەر دێت. لەگەڵ ئەوەشدا حەزم لێیە لەگەڵتا بێم. بەڵام وەرە باخەڵکانی دیکەش هەستێنین. با ئەمانە هەستێنین: کوڕەکەی تیودیوس –کە ڕمەوانێکی بەناوبانگە- و ئودیسیوس و ئەجاکسی خۆشرۆ، و کوڕە بەغیرەتەکەی فولیوس. بریا یەکێك چوو با کە ئەجاکسی –خودا ئاسا- و ئیدومینیوسی مەزنیشی بۆ ئێرە بانگ کردبا، چونکە کەشتییەکانیان زۆر دوورن. بەڵام من هەرچەندە (مینیلاوس)م خۆش گەرەکە و بەڕێزە لەلام، زۆرم گلەیی لێی هەیە-

(١١٥) لێم زویر مەبە، لێتی ناشارمەوە، وبەئاشکرا گلەیی لێدەکەم چونکە ئێستا ئەو

لە پرچەی خەودایە، و هەموو کارە قورسەکانی داوە بەشانی تۆدا. دەبوایە ئێستا بەناو فەرماندەکان کەوتبا و لێیان پاڕاباوە کە هیمەتێ بکەن، چونکە ئێمە لەوپەڕی مەترسی و تەنگانەداین."

(١١٩) ئاگامەمنونی پاشای جەنگاوەران وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەزبەنی تۆ گلەیی ئەوەی لێدەکەی کە تەمەڵ و خەمساردە —جا ئەمەی نە لە تەمەڵییە و نە لە بێ ئەقڵی، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە هەمیشە پشتی بەمن قایمە وچاوەڕوانی ڕابەرایەتی منە. بەڵام ئەمجارەیان بەر لە من هەستابوو. هات بۆلام و ناردم بەدوای ئەوانەدا کە تۆ ناوت بردن. دەی سا با ئێمەش بڕۆین چونکە ئێستا لەبەر دەرگاکاندا، لەناو دیدەوانەکاندا چاوەڕوانمان دەکەن، چونکە پێم گوتون لەوێندەر کۆببنەوە.

(١٢٧) نەستوری جرنیایی، ڕامکەری ئەسپان، گوتی: "ئەگەر وابێ ئارگوسییەکان نە لۆمەی دەکەن و نە لە قسە و ئەمری دەردەچن ئەگەر هەر کەسێکیان بۆ شەڕ هان بدات."

(١٣١) بەدەم قسەوە ئیلەکێکی لەبەرکرد، سەندەڵە جوانەکانی لەپێیە بریقەدارەکانی بەست، باڵاپۆشێکی ئەرخەوانی دووبەری دەڵبی فەروداری لەخۆیەوە پێچاو، ئەوجا جوامێرانە ڕمە سەر برونزنە تیژەکەی بەدەستەوە گرت، بەپاڵ کەشتییەکانا و بەناو ئارگۆسییانی بورونز پۆشدا بەڕێکەوت. نەستوری جیرنیایی، ڕامکەر و ڕابەری ئەسپان، شۆڕەسوار، بەدەنگی بەرز و یەکەمجار بانگی لە ئودیسیوس -هاوتای زیوس لە دانایی و تەگبیران- کرد. هەر کە دەنگەکەی بەر گوێ کەوت، لە خێوەتەکەیەوە هات و گوتی: "خێرە وا بەم تاریکە شەوە بەتاقی تەنیا بەپاڵ کەشتییەکاندا دەڕۆیت و بەناو ئۆردوەکە کەوتووی؟ عەودالی چیت، چ قەوماوە؟." نەستوری جیرنیایی، سوارچاك، وەڵامی دایەوە وگوتی: "ئودیسیوس، ئەی کوڕی ئیرتیس، زادەی زیوس، ئەی ئودیسیوسی بەڕاوتەگبیر، زویرمەبە، چونکە خەم و پەژارەیەکی گەورە ئاخییەکانی لە زەواق ناوە. خێرا دوامان بکەوە با هەندێ کەسی دیکەش لە خەو هەستێنین، هەندێك لەوانەی کە پێویستە ڕاوێژیان دەگەڵ بکەین، تا بزانین تەگبیریان چییە. هەڵێین یان بجەنگین!"

(١٤٨) ئودیسیوسی هۆشمەند و بەڕاوتەگبیران، خۆی بەخێوەتەکەیدا کردەوە و سپەرێکی جەواهێرنیشانی نایابی لە شان کرد و دوایان کەوت. هەوەڵجار چوون بۆلای دیومیدسی کوڕی تیودیوس سەیریان کرد هەر بەجلی شەڕەوە لە دەرێی خێوەتەکەیدا نووستوە و

هەموو ماوڕێکانی بەدەوریا خەوتوون و قەڵغان و سوپەرەکانیان کردووە بەسەرین،
(١٥٣) بەڵام نێزەکانیان ڕاست و نووك لە حەوا لە عاردی چەقێنراون، و نووکە بڕونزیەکانیان لە دوورەوە وەکو ئەوەی چەخماخەی بابا زیوس بن، دەبریسکانەوە، بەڵام دیومیدسی جەنگاوەری قارەمان لەسەر کەوڵە گاجووتێك خەوتبوو، و فەرشێکی بەڕەونەقیشی قەد و نوشت کردبوو و نابوویە ژێر سەری، نەستوری جیرنیایی، سوارچاك و ڕامکەری ئەسپان، لێی نزیك بووەوە و، پاژنەی پێی گرت و ڕایکێشا و خەبەری کردەوە، بەسەر زەنشتەوە داوای لێکرد لەزێ بکات. هاواریکرد: "ڕابە کوڕی تیدیوس هەلو. ئەم هەموو خەوە، بەم شەوە درێژە بوو بەچی؟ چما نابینی تەروادەییەکان لەو هەردوباسکەی نزیکی کەشتییەکانمان هەڵیان داوە و، هەر بەرداوێژێك لێمانەوە دوورن؟"
(١٦٢) دیومیدس یەکسەر و بەدەم ئەم قسانەوە لە خەو ڕابوو: "ئەی پیرەمێری سەرسەخت، تۆ نەماندوو دەبی و نەبێزار. چما لەنێو گەلی ئاخییاندا لەتۆ بچوکتر نینە، بەناو ئۆردوەکەدا بگەڕێن و هەموو فەرماندەکان لە خەو هەستێنن؟ بەڵام تۆ ناحەوێیتەوە.
(١٦٨) نەستوری جرنیایی، سوارچاك و ڕامکەری ئەسپان، وەڵامی دایەوە وگوتی: "بەڵێ، ئەوەی تۆ گوتت دروستە و وایە. کوڕانی بێ وێنەم هەیە. و خەڵکێکی زۆرم هەن کە هەر یەکێکیان دەتوانێ بڕوات و فەرماندەکان بێدار بکەنەوە، بەڵام ئاخیەکان کەوتونەتە تەنگانەوە، وەکو ئەوەیە لەسەر دەمی تیغێك دانیشبن، و مەرگ و ژیانیان بەندە بەم دەمەوە. جا تۆ کە لە من بچووکتری و مادامێکی بەزەییت پێما دێتەوە، خێرا هەڕە ئەجاکسی خۆشڕۆ و، ئەجاکسی کوڕی بیلیوس بێدار بکەرەوە."
(١٧٧) دوای ئەو قسانە، دیومیدس، کەوڵە شێرێکی قاوەیی درێژی دا بەشانیا، فەروەکەی دەگەییە سەر پێیەکانی. ئەوجا نێزەکەی هەڵگرت. کەوتە ڕێ، هەردوو قارەمانی نێو براوی بێدار کردنەوە و لەگەڵ خۆیدا هێنانی. ئەسا ڕۆیشتن بەسەر پاسەوانەکاندا گەڕان، بینیان فەرماندەکان هەموو لە شوێنی خۆیانن و شتاقیان نەخەوتووە، بەڵکو هەموو بێدارن و بەدیار چەکەکانیانەوە حازر وئامادەن —وەکو چۆن سەگان پاسی پەزانی ناو ئاغەڵان دەکەن، کاتێ گوێیان لە دەنگی دڕندەیەکی بێ ڕەزا دەبێ کە لە بێشە شاخاوییەکانەوە دادەگەڕێ و.. هەراو زەنای خەڵکان و حەپەی گسۆکان تێکەڵ دەبێ و خەو لە چاوان دەفڕێ —بەو ئاوایە خەو لە چاوی پاسەوانەکان، فڕی بوو، چونکە هەمیشە چاویان لە دەشتەکە بوو تا بزانن ئاخۆ تەروادەییەکان هێرشیان بۆ دەکەن یان نا. کە پیرەمێر بەبێدار

دیینی زۆر خۆشحاڵ بوو، ئافەرینی کردن و ڕووی تێکردن و گوتی: "ڕۆڵە ئازیزەکانم، وریابن، خەو زەفەرتان پێ نەبات، با نەبین بەگەپجاڕی دژمن."
(١٩٤) بەدەم ئەو قسانەوە لە خەنەکەکە پەڕییەوە، هەر هەموو ئەو سەردار وفەرماندە ئارگۆسیانەی بۆ کۆڕ و کۆبوونەوەکە گاز کرا بوون دووی کەوتن. مێریونیس و کوڕە دلاوەرەکەی لەگەڵیان چوون، چونکە ئەوانیش بۆ کۆبوونەوەکە دەعوەت کرابوون. بەو ئاوایە لە خەنەکەکە پەڕینەوە، لە شوێنێکی تەختانی کە لە تەرمی کوژراوان خاڵی بوو دانیشتن، ئێرە ئەو شوێنە بوو کە هیکتۆری ترسناک، دوای کوشتاری ئارگۆسییان، شەوی بەسەرا هاتبوو و گەڕابووەوە. بەڵا لەوێدا کۆڕیان بەست، تا تەگبیر و ڕاوێژان بکەن
(٢٠٣) هەنگێ نەستور بەر لە هەمووان ڕابوو و بەمجۆرە ڕووی دەمی تێکردن: "دۆستانی ئازیز، ئاخۆ کەسێك لەنێو ئێوەدا هەیە کە خۆی بەبێباکی و سەرکێشی خۆی بسپێرێت و بەپارێزەوە خۆی بەناو تەروادەییەکاندا بکات، یەکێك لە دژمن کە لە لەشکرەکەی خۆیان دابڕابێ برفێنێ، یان گفتوگۆ و مقۆمقۆی ناو ئۆردوگاکەیان بژنەوێ و بزانێ بیر و نیازیان چییە: ئایا بەتەمان لێرە، لە دەوری کەشتییەکانی ئێمە، دوور لە ماڵ و حاڵی خۆیان بمێننەوە، یان بەنیازن کە ئێستا بەسەر ئاخییەکاندا زاڵ بوون، بگەڕێنەوە بۆ پشت شورەکان؟ ئەگەر بتوانێ هەموو ئەمە بکات و بەسەلامەتی بۆ ئێرە بگەڕێتەوە، ئەوا ناوبانگی بەهەموو دنیادا بێوەدەبێتەوە ودەگاتە بنی ئاسمان، خەڵات و پاداشتێکی باشیش وەردەگرێت، چونکە هەر هەموو فەرماندانی کەشتییەکانمان سەرو سەرمەڕی ڕەشی بەبەرخە کۆرپەکەیەوە دەدەنێ —کە ئەمە خەڵاتە نەك گاڵتە- ئەمە جگە لەوەی دەبێ بەمیوانی هەمیشەیی هەر دەعوەت و جەژن و بەزمێکی خواردنەوەمان."
(٢١٨) هەموو کڕ وکپ بوون، بەڵام دیومیدسی نەعرەتە بەرزی مەیدان وشەڕگە هەستاو گوتی: "ئەی نەستور، پڕ بەدڵ حەز دەکەم خۆ بەئۆردوگای دژمندا بکەم، ئۆردوگای تەروداەییەکان کە لەمەوە نزیکە. بەڵام ئەگەر کەسێکی دیکەم لەگەڵدا بێ، دڵنیاتر و ئاسودەتر کارەکە ئەنجام دەدەم. چونکە ئەگەر دوو کەس پێکەوە کارێك لە ئەستۆ بگرن، باشترە، دوو ئەقڵ لە ئەقڵێك باشترە، بەڵام کەسی تەنیا چەند زیرەك و ژیریش بێ، بیری زۆر بڕ ناکات."
(٢٢٧) ئەو قسانەی کرد. زۆر کەس حەزیان دەکرد لەگەڵ دیومیدسدا بچن. جووتە قارەمان (ئەجاکس) ئامادەبوون. مێریونیس حەزی دەکرد لەگەڵی بڕوات. هەروەها کوڕەکەی نەستور،

و مینیلۆسی ڕم وەشێنی کوڕی ئوتریوس، هەروەها (ئۆدیسیوس)ش حەزی دەکرد دزە بکاتە ناو ئۆردوگای تەروادەییەکانەوە و بەڕوح حەزی لەو سەرکێشیانە دەکرد. هەنگێ ئاگامەمنون هەستاو هەڵیدایێ: "ئەی دیومیدس، ئەی کوڕی تودیوسی ئازیزی دڵەکەم، تۆ بەئارەزووی خۆت یەکێك لەم داوخوازانە هەڵبژێرە تا ببێ بەهاوڕێت. زۆر کەس حەز بەهاوڕێیەتیت دەکەن، بەڵام ئاگاداربە دوای سۆز نەکەوی لە جیاتی باشترینیان هەڵبژێری، بەبیانوی ڕێز وحورمەتی نەژادو پایەدارییەوە خراترین هاوڕێ هەڵبژێری.

(٢٤٠) بۆیە ئەو قسەیەی کرد، چونکە دەترسا مینیلاوسی قژزێڕین هەڵبژێرێ. لێ دیومیدسی نەعرەتە بەرزی مەیدانی شەڕ، ڕابوو و گوتی: "تۆ کە ئەمر دەکەی هاوڕێی دڵخوازی خۆم هەڵبژێرم، چۆن دەتوانم ئودیسیوسی خواوەند ئاسا ژبیربکەم. چونکە کەس بەئەندازەی ئەو پیاوی تەنگانە و کارێن خەتەر نییە، هەروەها ئەتینای خواوەند خۆشی گەرەکە، ئەگە ئەو لەگەڵما بێ، بۆ ناو ئاگریش بچین، بەسەلامەتی لەگەڵیا دەگەڕێمەوە، چونکە لە هەمووان ژێرتر و حەکیم ترە."

(٢٤٨) هەنگێ ئودیسیوسی مەزن، بەسەبر وتەحەمول، گوتی: "زۆر لەسەر ستایش یان لۆمەی من مەڕۆ، ئارگۆسییەکان هەموو ئەو شتانە دەزانن کە تۆ دەیڵێی. بابڕۆین، چونکە شەو درەنگە و بەیان لە ئەنگاوتندایە، مەخابن ستێران زۆر خێرا جمان، دوو سێیەکی شەو بوری، تەنیا یەك سێیەکی شەو بەدەستەوە ماوە.

(٢٥٤) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، خێرا جلی جەنگیان لەبەرکردن، تراسومیدیسی شێرە پیاوی مەیدان، شیرێکی دوو دەم وسپەرێکی دایێ، چونکە ئەوانەی خۆی لە کەشتییەکەیدا بەجێهێشتبوون. کێوخودێکی لە چەرمەگا دروستکراوی بێ شاخ و یاڵی لەسەری کرد، واتە تەنیا کێوێك بوو بۆ پاراستنی سەر. هەروەها (میریونیس)ش تیروکەوانێك و تیردانێك و شیرێکی دایە ئودیسیوس، کێوخودێکی چەرمی دایێ کە لە ناوەوە بەمکومی بەسیرمە تەنرابوو، لە دەریشەوە بەددانی سپی بەرازە کێوییەکی کەڵبە بریقەدار—کە زۆر بەقایمی وەستایانە بەدەوری کێوەکەدا دروا بوو- هەروەها لە ناوەوە بەرێکی کولاڤی (لباد) پێوەنرا بوو. (ئوتولوکس) ئەم کێوەی لە ئیلیون، وەختێ خۆی دابوو بەماڵە قایمەکەی (ئەمینتوری کوڕی ئورمینوس)دا دزی بوو. ئەوسا دابووی بەئمفیداماسی سیتیرانی، تا بیبا بۆ سکاندیا، ئیدی ئەمفیداماس وەکو دیاری میوانداری دابووی بەمولوس، کە ئەمیش دابووی بە (میریونیس)ی کوڕی، ئێستاش ئەوەتا بەسەری (ئودیسیوس)ەوە.

(۲۷۱) که جووته قارەمان جەنگیان لەبەرکرد، فەرماندەکانیان لەوێ بەجێهێشت و بەڕێکەوتن. خواوەند ئەتینا، قورینگێکی بەدەستی ڕاستیدا، نزیك لە ڕێگەکەی وان، بۆ ناردن، هەرچەند لە بەر تاریکی قورینگەکەیان نەبینی، بەڵام گوێیان لە دەنگی بوو. ئودیسیوس کە گوێی لە دەنگی ئەو باڵندەیە بوو خۆشحاڵ بوو بەمجۆرە کەوتە نزا و پاڕانەوە لە ئەتینا

(۲۷۷) ئەی کیژی زیوس، ئەی سپەروەر، ئەی ئەو کەسەی هەمیشە یارمەتیدەرم بووی، و لە هیچ کارێکم بێ خەبەرنیت، گوێم لێبگرە، وەکو جاری جاران فریام بکەوە، کارێکی وەها بکە کە بەسەربەرزی بۆ لەشکرگاکەی خۆمان بگەڕێینەوە، کارێکی وەها بکە ناوبانگێکی باش بەدەست بێنین، کارێکی گەورەی ئەوتۆ ئەنجامبدەین کە بۆ ئێمە سەربەرزی بێ و بۆ تەروادەییەکان مایە و سەرچاوەی خەم و پەژارە بێ، و بەسەلامەتی بۆلای کەشتیەکانمان بگەڕێینەوە.

(۲۸۳) دوای ئەو (دیومیدس)ی دلاوەری دەنگ دلێری مەیدانی شەڕ کەوتە نزا و پاڕانەوە و گوتی: "گوێ لە نزای منیش بگرە ئەی کیژی زیوس، ئەی ئەوکەسەی لە شکست نایەی، پشتیوانیم بکە وەکو چۆن پشتیوانی بابە مەزنەکەم (تیدیوس) بووی کاتێ کە ئاخییەکان وەکو پەیك وپەیامبەری ئاشتی بۆ تیبەیان نارد، ئەوە بوو ئاخییەکانی لە نزیکی ڕەخی ڕوباری ئیسوبوس بەجێهێشت و چوو بۆ شار و پەیامی ئاشتی بۆ کادیمۆسەکان برد، بەڵام لەڕێگەی گەڕانەوەدا بەکۆمەك و پشتوانی تۆ چەندین کاری مەزنی کردبوو. جا ئێستا بەهەمان شێوە پشتیوانی لە منیش بکە، بمپارێزە. شەرت بێ منیش گوێرەکە مێچکەیەکی یەك ساڵەی، تەوێڵ پان، ساغ و سەلیم، کە کەس نەی خستبێتە ژێر نیر. بۆ تۆ و لە پێناوی تۆدا سەر ببڕم و قۆچەکانی لە زێڕاو بگرم!"

(۲۹۵) بەو جۆرە نوێژ و نزای خۆیان کرد، ئەتیناش دوعا و نوێژەکەی قبوڵ کردن، ئەوسا وەکو دوو شێر لەژێر باڵی شەوی تاریکدا بەناو لاشەی کوژراواندا، بەناو سپەر وجەنگەوزاران و خوێنی ڕەشدا، ملی ڕێگەیان گرت.

(۲۹۹) لەولاشەوە هیکتۆر نەیهێشت تەروادەییەکان بخەون، هەرچی شازادە و سەرکردە و ڕاوێژکاری ناو سوپاکەی هەبوو، کۆی کردنەوە و پێی گوتن: "من نەخشەیەکم بەدەستەوەیە، کێ بەڵێنم دەداتێ جێبەجێی بکات، بەرانبەر بەپاداشتێکی گەورە و گران؟.. پاداشتێك کە ئەوە ڕەنجەبێنێ. عەرەبانەیەك و دوو ئەسپی گەردن درێژی

دەدەمێ، دوو ئەسپی سینەپان، جوانترین ئەسپانی تیژڕەوی ناو کەشتی ئاخییەکان... دەیانکەمە دیاری بۆ ئەو پیاوەی بوێرێ —سەربەرزییەکیش بۆ خۆی بەدەست دێنێ- و بچێت بۆ ناو کەشتی ئاخییەکان، و بکەوێتە سوسە و بزانێ کە ئاخۆ وەکو جاران پاسەوانی کەشتییەکانیان دەکەن، یان ئەو ئاخیانەی کە ماندویەتی بێ تاقەتی کردوون و زۆری بازوی ئێمە لە پەلوپۆی خستوون، لە بیری هەڵاتندان و وازیان لە ئێشك گرتن هێناوە ؟!"

(٣١٣) ئەو قسانەی کرد، هەموو مات و بێدەنگ بوون، لەنێو تەروادەییەکاندا جەنگاوەرێك هەبوو بەنێوی دلون، کوڕی یومیدیسی، پەیاماوەری ئاسمانی بوو. پیاوێکی دەوڵەمەند بوو، زێڕ و بڕۆنزێکی زۆری هەبوو. ڕواڵەتی دزێو وناشرین بوو، بەڵام لە ڕاکردندا سوك بوو. تاقە برای پێنج خوشکان بوو. هەستا ڕوویکردە تەروادەییەکان و هیکتۆر و گوتی: "ئەی هیکتۆر من دڵی ئەم کارەم هەیە، دڵم تەژی دلاوەری و بێباکییە، من دەچمە نزیکی کەشتییەکان و هەموو هەواڵێکی دژمن دێنم: بەڵام تۆ چۆگانەکەت، چۆگانی فەرمانڕەواییەکەت هەڵبڕە و سوێند بخۆ کە ئەسپەکان و عەرەبانە برونزییە بەنەخش و نیگارەکەم دەدەیتێ، ئەوەی کە لەژێر کوڕە بێ نەزیرەکەی بیلیوس دایە. هەنگێ منیش بۆتی دەسەلمێنم کە بەخۆڕایی نارۆم و هەواڵدزێکی بێ کەڵك نابم و ئەوەی تۆ بەتەمایت بۆتی بەدی دێنم، چونکە من یەکرێ خۆم بەئۆردوگای دژمندا دەکەم، ناوەستمەوە تا دەگەمە سەراپەردەکەی ئاگامەمنون کە پێم وایە حاڵی حازر خەریکی کۆبوونەوەیە لەگەڵ شازادە و سەران و ڕاوێژکارانی ئاخیاییدا تا قەراری خۆ بدەن کە هەڵێن یان شەڕ بکەن."

(٣٢٨) دوای ئەو قسەیە هیکتۆر گۆچانەکەی هەڵبڕی، سوێندی خوارد، گوتی: "ئەی زیوس، تۆ بەخۆت شایەدبە بەسەرمەوە، ئەی مێردی هیرا، خودان چەخماخە و بروسکەی بەگرم و هوڕ.. تۆ بەشایەد دەگرم کە لەنێو خەڵکی تەروادەدا هیچ کەسێك سواری ئەم ئەسپانە نابێ جگە لە تۆ ئەی دولون، وا من ڕایدەگەیەنم کە تۆ دەبی بەخاوەنی سەرفرازیان و هەمیشە شانازیان پێوە دەکەیت.

(٣٣٢) هەرچەند ئەو سوێندێکی بێهودەی خوارد، بەڵام دڵگەرمییەکی زۆر بوو بۆ (دولون). تیروکەوانەکەی لە شان کرد، کەوڵە گورگێکی بۆری لەبەرکرد، کڵوێکی پێستە پشیلەی کێوی لەسەرنا، نێزەیەکی تیژی هەڵگرت، بەرەو کەشتییەکان ملی ڕێگەی گرت. بەڵام

چارەنووس وای نەنووسی بوو جارێکی دی بگەڕێتەوە و هەواڵان بۆ هیکتۆر بێنێتەوە، هەر کە لە ئاپورای ئەسپ و جەنگاوەرەکان دوورکەوتەوە، بەسەرێکی پڕ جۆشەوە، ملی ڕێگەی خۆی گرت. ئۆدیسیوسی زیوس زادە هەستی کرد کەسێك دێتە پێشەوە، بەهاورێکەی گوت: "بڕوانە دیومیدیس، ئەوە یەکێکە لە ئۆردوگای دژمنەوە دێ، جا نازانم دەیەوێ هەواڵدزی بەسەر کەشتییەکانمانەوە بکات، یان بەنیازە جەنازەی مردوویەك ڕووت بکاتەوە. باوازی لێ بێنین بەبەردەمماندا ڕەت بێ و ماوەیەکی کەم بەدەشتەکەدا بڕوات، ئەوجا دوای بکەوین و بەپەلە بیگرین، ئەگەر زانیت هەڵدێ و نایگەینێ، ئەوا بەزەبری نێزە بەرەو کەشتییەکانی بەرەو لە ئۆردوگاکەی خۆیانی دوور بخەرەوە تا بەهیچ جۆرێ دەرفەتی ئەوەی نەبێ بۆ شار هەڵێت."!

(٣٤٩) دوای ئەم قسەیە، خۆیان لە بەینی جەنازەی مردووەکاندا مەڵاسدا. دولون هەستی بەهیچ نەکرد، بێ پەروا و گەوجانە، بەلەز بەبەردەمیاندا ڕەت بوو. هەر کە مەیدانە هێسترێك لێیان دوورکەوتەوە (مەیدانە هێستر لە جووتدا درێژترە لە هی گاجووت) بەغار دوای کەوتن، کە گوێی لە دەنگ بوو بەبێدەنگی وەستا، لە دڵی خۆیدا وای مەزەندە کرد کە دوو دۆستن و لەلای تەروادەییەکانەوەوبەفەرمانی هیکتۆر هاتوون تا بگەڕێتەوە. بەڵام کە بەئەندازەی تیراوێژێك یان کەمتر لێی نزیك بوونەوە، زانی ئەمانە دژمنن، تا هێز لەلاقیدا بوو پێی وەغارێوە نا. بەڵام دوای کەوتن، وەکو چۆن جووتێ تاژی کەڵبەتیژ، مەعلان و کارامە، لە بێشەڵانێکی چڕدا پەلاماری کارمامزێك یان کەروێشکە کێوییەك دەدەن، و نێچیرەکە بەدەم غاردانەوە دەقیژێنێ.. بەو ئاوایە کوڕەکەی تیودیوس و ئودیسیوس (دولون)یان دایە بەر ولە ئۆردوگاکەی خۆیان دابڕی. کاتێ خەریك بوو بەدەم غاردانەوە بەرەو کەشتییەکان دەگەییە ناوەندی پاسەوانەکان، ئەتینا هێزێکی زیاتری وەبەر کوڕەکەی تیودیوس نا، تا هیچ ئاخیاییەکی برونز پۆش نەتوانێ بەوە بنازێ کە ئەو یەکەم جەزرەبەی لەو جەنگاوەرە (دولون) وەشاندووە و پێش دیومیدس کەوتووە. ئەوە بوو دیومیدیس بەڕمەکەیەوە پەلاماری داو تێی خوڕی: "بوەستە، دەنا بەر ڕمت دەدەم، چونکە پێم وانییە بتوانی لە چنگی من دەربچیت ولە مەرگی خۆت هەڵێی!"

(٣٧٢) دیومیدس ئەوەی گوت و ڕمەکەی خێواندێ. بەڵام بەئانقەست و بەخواستی خۆی نەیپێکا. ڕمەکە بەسەرشانی ڕاستیدا ڕەت بوو. نووکەکەی لە عاردی چەقی. دولون ڕەق ڕاوەستا. لە ترساندا کەوتە لەرزین، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، کەوتە دانەچۆقە. جووتە

فەرمانی بەهانکە هانك خۆیان گەیاندێ، باسکیان گرت، بەدەم گریانەوە کەوتە پاڕانەوە و گوتی: "مەمکوژن، دەست بەسەرم بکەن. من خۆمتان لێدەکڕمەوە، چونکە برونز و زێڕ و ئاسنێکی زۆرم لە ماڵەوە هەیە، و زۆر وەستایانە و هونەرمەندانە دروستکراون. جا ئەگەر بابم ببیستێتەوە کە من هێشتا زندووم و لای ئاخییەکانم، ئامادەیە لەو سەروەت و سامانە سەربەهایەکی مۆڵتان بداتێ.

(٣٨٢) ئودیسیوسی بەردەبار وەڵامی دایەوە و گوتی: "مەترسە، بیری مەرگ لەخۆ دوور بخەوە. وەرەو ڕاستیم پێ بڵێ: چ شتێك وای لێکردویت بەتاقی تەنیا لە سوپاکەی خۆت دووربکەویتەوە و بەرەو کەشتییەکانی ئێمە بێی، لە کاتێکا عالەم گشت خەفتەن؟ ئایا هاتووی ئەم جەنازە یان ئەوجەنازە ڕووت بکەیەوە؟ یان هیکتۆر ناردووتی کە جاسوسیمان بەسەرەوە بکەی؟.. یان تەنیا سەرکێشی و چاو قایمی ئەمەی پێکردویت؟"

(٣٩٢) دولون، بەدەم لنگە لەرزێوە وەڵامی دایەوە: "هیکتۆر بەوەعد و بەڵێنانی شیرین خەڵەتاندمی، بەڵێنی عەرەبانە برونز نیشان و جووتە ئەسپە ڕەهوانەکەی کوڕی بیلیوسی دامێ.. فەرمانی دامێ کە شەوێ بێ خشپە خۆم بەئۆردوگای دژمندا بکەم، تا بزانم ئاخۆ وەکو جاران ئێشکی کەشتییە تیژڕۆکانیان دەگرن، یان گورزی ئێمە لە پەلوپۆی خستوون و لە بیری هەڵاتندان و لە شەکەتی خۆیاندا بەنیازی دیدەوانی شەوانە نین؟!".

(٤٠٠) ئودیسیوس بەدەم زەردەخەنەیەکەوە وەڵامی دایەوە: "ئەلهەقی تۆ لە دڵی خۆتا بەتەمای خەڵاتی زۆر گەورە بوویت، ئەسپەکانی کوڕی ئیکۆس! بەڵام زەحمەتە هیچ بەنی بەشەرێك جگە لە خودی ئەخیل، کە دایکی لە نەمرانە، بتوانێ ئەو ئەسپانە بەرزەفت بکات و لێیان بخوڕێ.. بەهەرحاڵ باواز لەمە بێنین وەرە ڕاستیم پێ بڵێ وەختێ کە بۆ ئێرە هاتیت، هیکتۆرت –شوانی سوپا- لە کوێ بەجێهێشت؟..چەك وئەسەلەحەکەی لە کوێیە، ئەسپەکانی لە کوێن؟ تەروادەییەکان لە کوێ ئێشك دەگرن؟ شوێنی کەمین و بۆسەکانیان لە کوێیە؟ تەروادەییەکان چۆن کاتی ئێشك و خەوی خۆیان ڕێکدەخەن؟.. چ نەخشە وپلانێکیان لەژێر سەردایە؟ ئایا هەر لە نزیکی کەشتیەکانی ئێمە و دوور لە ماڵی خۆیان دەمێننەوە، یان دوای ئەوەی شکستیان بەئاخییەکان هێناوە، بەتەمان بۆ ناو شاری خۆ بگەڕێنەوە؟

(٤١٢) دولونی کوڕی یومیدیس وەڵامی دایەوە و گوتی: "هەموو ڕاستییەکت پێ دەڵێم، هیچ شتێکت لێ ناشارمەوە: هیکتۆر ئێستا لە گوێی قەبرەکەی ئیلیوس، دوور لە هەرا

و ڕەدا، کۆبوونەوە لەگەڵ ئەندامانی ئەنجومەنی شیرەتکاری خۆیدا دەکات. سەبارەت بەشوێنی ئێشکچییەکان، هیچ ئێشکچییەکی تایبەتی و دیاریکراونییە کە پاسەوانی لەشکر بکات. هەموو ئەوانەی کە بەدەوری ئاگرەکانەوە دانیشتوون، بێدارن و یەکتر بۆ پاسەوانی ئاگادار دەکەنەوە. بەڵام ئەو هاوپەیمانانەی لە وڵاتانی ترەوە هێنراون، دەخەون و کاری پاسەوانی بەتەروادەییەکان دەسپێرن. چونکە ژن و منداڵەکانیان لێرە نین و دوورن!"

(٤٢٣) ئودیسیویس گوتی: "باشە پێم بێ، ئایا لەناو جەنگاوەرە تەروادەییەکاندا دەنوون، یان بەجیا دەنوون. ئەمەم بۆ شەرح بکە تا باش تێبگەم."

(٤٢٦) دولون وەڵامی دایەوە: "ئەمەشت پێ دەڵێم، کارییانەکان و تیر هاوێژەکان کە بریتیین لە پیونیان، لیلیجەکان، کوکونانەکان و بیلاسجیونی دلاوەر، لە ڕەخی دەریادا دەنوون. بەڵام لیسییەکان، میسییە شکۆمەندەکان،

(٤٣١) لەگەڵ فیریژیەکان و میونییەکاندا بەخۆ و عەرەبانەکانیانەوە لە بەرانبەر تیمبەر هەڵیانداوە. بەڵام تۆ بۆچی لەهەر هەموو ئەم شتانە دەپرسیت؟.. ئەگەر دەتەوێ بگەیتە ئاپورای تەروادەییەکان، ئەوە تراکییەکانە کە تازە گەییونەتە جێ و لە هەموو هێزەکانی ترەوە دوورن، و پاشەکەشیان (ریسیوس کوڕی ئیونیوس) لەگەڵە. ئەسپەکانی جوانترین ئەسپن کە لە ژیانمدا دیتومن، ئەسپی زەلام زەلام، لە بەفر سپی ترن، دەڵێی بان لە تیژیدا دەستێکی ڕەنگین گالیسکەکەی بەزێڕ وزیو ڕازاندوەتەوە، چەك وتەدارەکێکی زێڕی لەگەڵ خودا هێناوە، هەر حەز دەکەی تەماشای بکەی، هونەروسەنعەتی وا هەر نەبووەتەوە، ئەوەندە جوانە زیاتر بۆ ئەوە دەشێت خواوەندان لەبەری بکەن نەك بەشەرانی فانی. جا ئێستا یان بمبە بۆ لای کەشتییەکانتان، یان بەکۆت وزنجیران بمبەستەوەو لێرەم بەجێبهێڵە، تا دەچیت و دەگەڕێیتەوە و دڵنیا دەبیت لە دروستی و نادروستی قسەکانم."

(٤٤٧) دیومیدس نیگایەکی تورەی کرد و گوتی: "ئەی دولون هەرچەندە زانیاری باشت داینێ، بەڵام دڵی خۆت بەوە خۆش مەکە کە لە چنگی ئێمە دەرباز ببی، ئەگەر ئازادت بکەین و ڕێگەت بدەین بڕۆیت، بێگومان جارێکی دیکە دێیتەوە سەر کەشتییەکانمان جا چ بەجاسوسی بێ چ بەهێرشی جەنگاوەرانە، بەڵام ئەگەر بتکوژم و ژیانت لەبەر ببڕم، چیتر نابی بەبەڵای گیانی ئارگۆسییەکان.

(٤٥٤) ئەو قسانەی کرد، دولون دەستی بۆ ردێنی برد تا زیاتر لێی بپاڕێتەوە، لێ

دیومیدس شیرێکی لە ناوەندی گەردنی داو هەردوو دەمارەکەی گەردنی بڕی، سەری بەسەر عاردەکەدا غل بووەوە وهێشتا هەر قسەی دەکرد. ئەوجا کێوەکەی و کەوڵە گورگەکە و تیروکەوان و ڕمە درێژەکەیان برد. ئودیسیوس ئەو شتانەی وەکو ڕێز بۆ ئەتینا خواوەندی تالآنی و دەستکەوتان، بۆ ئاسمان هەڵبری و بەدەم نوێژ ونزاوە گوتی: "خواوەندا ئەم دیاریانە قەبوڵ بکە، دڵخۆش بە، ئێمە پێشکەش بەتۆی دەکەین. بەر لە هەموو خواوەندانی ئۆڵەمپ لەتۆ دەپاڕێینەوە، سا تۆش بەرەو ئەسپان و شوێنی نووستنی تراکیەکان ڕابەر ورێنوێنمان بە."

(٤٦٥) بەدەم ئەوپەیڤانەوە دەستکەوتەکانیان برد ولەسەرگزیچارێکیان دانا، نیشانەیەکی دیاریان دانا، هەندێ نەیجەیان هەڵکەند ولقوپۆی گزیچارەکەیان شکاندەوەووەکو نیشانە دایان نا، تا لە تاریکی شەودا و لە گەڕانەوەدا لێیان ون نەبێت. ئەوجا بەجووتە بەناو زرێ و ئەسلەحە و خوێنی مەییودا بەرێکەوتن، زۆر زوو گەیینە ناو ئاپورای جەنگاوەرە تراکییەکان. هەموو خەوتبوون، ماندووی ڕێگە بوون، بەسێ ریزی ڕێك و پێك خەوتبوون و هەرکەسە وچەك وتفاقی خۆی لە تەنیشت خۆیەوە لە عاردی دانابوو. هەرجەنگاوەرێکیش جووتێ ئەسپی بەتەنیشتەوە بوو. "ریسوس" لە ناوەڕاستیاندا نووستبوو، ئەسپەکانیشی بەتەنیشتییەوە بوون و بەرەشمەکانیان بە قەراخی گالیسکەکەیەوە بەسترابوونەوە. هەوەڵجار ئودیسیوس بینی، پیشانی (دیومیدیس)ی داو گوتی: "دیومیدیس، ئەمە ئەو پیاوەیە، هۆ وەش ئەو ئەسپانەیە کە دولون، ئەوەی کوشتمان، بۆی باسکردین، هێز و توانای خۆت بنوێنە، چەك بۆ ڕۆژێکی وانەبێ بۆچی باشە. خێراکە مەوەستە یان ئەسپەکان بکەوە، یان ئەگەر بەباشی دەزانی تۆ ئەم جەنگاوەرانە بکوژە و من خەمی ئەسپەکان دەخۆم."

(٤٨٢) ئەوسا ئەتینا هێندەی دی دڵ و دەرونی دیومیدسی جۆشدا. بەڕاست وبەچەپی خۆیدا کەوتە کوشتار. هەرکەسێك کە شمشێرەکەی ئەوی دەگەییشتێ ناڵەیەکی ترسناکی لێ بەرز دەبووەوە، زەوی لە خوێنا سوور بوو. وەکو چۆن شێر بەناو مێگەلە پەز و بزنانی بێ شوان دەکەوێ و دڕندانە لاکان دەخات، بەو ئاوایە کوڕی (تیدیوس)ش بەناو جەنگاوەرانی تراکی کەوت ودوانزە مێری لێکوشتن. ئودیسیوسی بەردەباریش، لەدوای کوڕی (تیدیوس)ەوە هەردوو لاقی کوژراوەکانی دەگرت و دەیخستنە لاوە، بۆیە ئەمەی دەکرد، تا ئەسپە یاڵ جوانەکان بەئاسانی بتوانن ڕێبکەن،و وەختێ بەسەر لاشەکاندا

دەیەڕنەوە نەڕەوێنەوە، چونکە تازە بوون و بەو دیمەنانە ڕانەهاتبوون، کاتێ کوڕی تیدیوس هاتە سەر پاشا ئەویشی کوشت. ئەم پاشایە سیانزەمین کەس بوو کە گیانی شیرینی چوون هەنگوینی لێ سەند، لەو دەمەدا بەسەختی هەناسەی دەدا، چونکە کوڕی ئوینوس لەو شەوەدا و بەپێی نەخشەیەکی ئەتینا، وەکو مۆتەکەیەکی شوم بەدیار سەرییەوە وەستا بوو. لەوماوەیەدا ئودیسیوسی بەجەرگ و بەردەبار، ئەسپەرەهوانەکانی کردەوە و هەوسارەکانیانی پێکەوە بەست و بەنێو ئاپورای نووستوەکاندا، بەرکەوانەکەی دان و دووری خستنەوە، لەبیری چوو بوو قامچییە درەخشانەکەی نێو گالیسکە گەوهەر نیشانەکەی پاشا لەگەڵ خۆیدا بێنێ، ئەوسا فیکەیەکی نزمی کێشا تا دیومیدس ئاگادار بکاتەوە.

(٥٠٣) بەڵام دیومیدس لە جێی خۆی نەجولا، بیری لەوە دەکردەوە کارێکی سەرکێشانە و بێباکانەی تر ئەنجام بدات، دوودڵ بوو لەنێوان ئەوەی گالیسکەکەی پاشا، کە چەك وتفاقە ناياب و گەوهەر نیشانەکانی تیابوو، بەهەردوو مژانەکەی بگرێ و ڕایکێشێت و بیبات یان زرێکەی بکاتەوە و هەڵیگرێت، یان باشتر وایە زۆرترین ژمارەی تراکیان بکوژێ ؟ لە کاتێکا لە دڵی خۆیدا بیری لە هەموو ئەمانە دەکردەوە، ئەتینا لێی هاتە پێشێ و گوتی: "ئەی کوڕی تیودیوسی مەزن ئێستا بیر لەوە بکەوە بۆلای کەشتییەکان بگەڕێیتەوە، دەنا ناچار دەبی بەهەڵاتن بۆ ئەوێ بگەڕێیتەوە، هەڵاتن ئەمما هەڵاتن!... چونکە لەگینە خواوەندێکی دیکە بێت و تەروادەییەکان بێدار بکاتەوە."

(٥١٢) دیومیدس، دەنگی خواوەندی ناسییەوە، یەکسەر خۆی هەڵدایە سەرپشتی یەکێك لە ئەسپەکان. ئودیسیوس کەوانێکی پێدا کێشا و بەپڕتاو بەرەو کەشتییە خێراکانی ئاخییان بۆی دەرچوو.

(٥١٥) بەڵام ئەپولۆی زیوین کەوان، کە ئەتینای لەگەڵ کوڕەکەی تیودیوس دا بینی، زۆر توڕە بوو، خۆی بەئۆردوی تەروادەییەکاندا کرد و (هیبوکون)ی ڕاوێژکاری تراکییەکان و خزمی (ریسوس)ی لە خەو هەستاند، هیبوکون ڕابوو، سەیری کرد ئەسپەکان لە جێی خۆ نەماون، و جەنگاوەرەکان لە خوێنی خۆدا بەدەم دوا گیانەڵێوە دەگەوزن، بەدەنگی بەرز ناڵاندی و بانگی هاورێ ئازیزەکەی خۆی (ریسوس)ی کرد. هەرا و هەنگامەیەکی بێ وێنە لەناو تەروادەییەکاندا بەرپا بوو، هەموو بەپەلە هاتن، وبەترس و سەرسامی دەیانڕوانییە ئەو کوشتارە ترسناکەی کە ئەم دوو جەنگاوەرە لە تەروادەییەکانیان کردبوو، و بەرەو

ئەسپییەکانی خۆیان گەڕابوونەوە.

(٥٢٦) کاتێ گەیشتنەوە ئەو شوێنەی کە جاسوسەکەی (هیکتۆر)یان تیا کوشتبوو، ئۆدیسیوس ئەسپەکانی ڕاگرت، کوڕی تیدیوس خۆی هەڵدایە خوارێ، دەسکەوتە خوێناوییەکانی دایە دەست ئۆدیسیوس و ئەوجا سواری ئەسپەکەی بووەوە: ئەسپەکانی بەرشەلاق دا، جووتە ئەسپ وەك ئەوەی بەخواستی خۆ بڕۆن، بەرەو کەشتییەکان دەرپەڕین. نەستور بەر لە هەر کەسێك گوێی لە دەنگی جوارناڵەی ئەسپەکان بوو، گوتی: "دۆستان، ئەی فەرماندە وشیرەتکارانی ئارگوسییان، شتێك هەیە، نازانم ڕاستە یان درۆ؟ بەلام دڵم ئەمرم پێدەکات بیلێم، دەنگێك دێتە گوێم لە دەنگی چوارناڵەی ئەسپان دەچێت. ئومێدەوارم دیومیدس و ئۆدیسیوس بن، کە بەم ئەسپە سەرکێشانەوە لە ئۆردوگای تەروادەییەکانەوە گەڕابنەوە، بەلام لەناخی دڵمەوە لەوە دەترسم کە نەبادا ئازاترین ئاخییان تووشی بەلایەك بووبن، چونکە هەراو زەنای تەروادەییەکانیش دێتەگوێ."

(٥٤٠) هێشتا بەتەواوەتی لە قسەکانی نەبوو بووەوە کە جووتە قارەمان گەیینە جێ و لە ئەسپەکان دابەزین.. هاوڕێکانیان هەموو شاد و خۆشحاڵ بەدەست گوشین و ئافەرین و ستایش پێشوازیان کردن. نەستوری جیرنیایی، سوارچاك وڕامکەری ئەسپان، بەر لە هەمووان کەوتە پرسیاران: "ئەی ئۆدیسیوس! ئەی ناودار، ئەی فەڕ وشکۆی مەزنی ئاخییان.. پێم بێ چۆن ئەم ئەسپانەت وەدەست هێنا؟ ئایا لەنێو ئاپورای تەروادەییەکانەوە دەرت هێناون؟ یان خواوەندێك ئەم دیارییەی پێداوی؟ کە وەکو تیشکی هەتاو دەبریسکێنەوە. من هەمیشە لە مەیدانی جەنگدا بووم و تەروادەییەکان باش دەناسم، هەرچەندە جەنگاوەرێکی دێرینە سالم و کەس ناتوانێ لۆمەم بکات گەر لە کۆتایی لەشکردا، لە نزیکی کەشتییەکان مابمەوە، بەلام هەرگیز ئەسپانی واهیم نەدیوە و بەخەیاڵما نەهاتووە، بۆیە پێم وایە خواوەندێکتان تووش بووە و ئەم ئەسپانەی داونەتێ. چونکە هەردوکتان لەلای زیوسی هەورەوان و ئەتینای کیژی، ئەتینای سپەروان، ئەتینای چاوکەسك ئازیزن.

(٥٥٤) ئۆدیسیوسی بەردەبار وەلامی دایەوە: "ئەی نەستور، ئەی کوڕەکەی نیلیوس، ئەی فەڕو شکۆی ئاخییان، ئەگەر خواوەندان بیانەوێ، دەتوانن ئەسپانی لەمانە چاکترمان بدەنێ، چونکە توانای خواوەندان بێ سنورە. بەهەرحاڵ ئەی پیری گەورەم، ئەم ئەسپانەی کە تۆ لێیان دەپرسیت، تازە لە تراکیاوە هاتوون، دیومیدسی دلاوەر

یاساکەیان و دوانزە کەسی ناودارو ئازای لێکۆشتن. بەڵام چواردەمینیان جاسوسێك بوو کە لە نزیکی کەشتییەکان کوشتمان، هیکتۆر و تەروادەییەکان ناردبوویان تا جاسوسی بەسەر ئۆردوگاکەمانەوە بکات."

(٥٦٤) ئەوەی گوت وبەدەم پێکەنینەوە ئەسپەکانی لە خەنەکەکە پەڕاندەوە، ئاخییەکانی دیکەش بەخۆشی و شادی بەگەڵی کەوتن. هەر کە گەیینە خەرگە مکوم و قایمەکەی کوڕی تیودیوس، بەهەوساری قایش ئەسپەکانیان لەسەر ئاخوڕێك بەستەوە کە لەوەپێش ئەسپەکانی (دیومیدس)ی لێی بەسترابوونەوە وخۆشترین گەنمیان دەخوارد. ئەوجا ئودیسیوس میراتییە خوێناوییەکانی (دولون)ی بەپێشی کەشتییەکەیەوە هەڵواسی، تا قوربانییەکی پیرۆز بۆ ئەتینا بەرپا بکرێ، بەڵام ئەوان بەدوو قۆڵی خۆیان بەدەریادا کرد و ئارەقەکەی جەستە و گەردن و ڕانیان شت. کە ئاوی دەریا هەموو ئارەقەکەی لەشی پاك کردنەوە و دڵیان فێنك بووەوە و بوژانەوە، خۆیان بەگەرماوانی درەخشاندا کرد و خۆیان شت. کە خۆیان بە ئاو شت. لەشی خۆیان بەزەیت چەور کرد، لەسەر خوان دانیشتن. لە بادیەیەکی پڕ لە شەرابی کوکتێل، جامیان لە شەرابی بەلەزەتی چوون هەنگوین پڕ کرد وبەناوی قوربانی وبەخۆشی ئەتینا چەند دڵۆپێکیان پرژاندە سەر زەوی.

# سروودی یازدەیەم

## ئەخیل چاودێری شەڕەکە دەکات

**حیکایەتەکە:**

**لەگەڵ سپێدەدا، زیوسی خودای خواوەندان، ویستی هەردوو ئۆردووەکە بهاروژێنێ و بەیەکیاندا بدات تا تەروادەییەکان گوشار بخەنە سەر ئاخییەکان و ئەخیل ڕوحمی بتلیسێتەوە و تورەییەکەی برەوێتەوە، ئەوەبوو پاش ئەوەی بینی هێمنی باڵی بەسەر هەردووك ئۆردوگاکەدا کێشاوە، بەتایبەتی ئاخییەکان کە لە جەنگ بێزار بوو بوون و دەیانویست بۆ وڵاتی خۆ بگەڕێنەوە، ئەوەبوو خواوەندی دووبەرەکی و ئاژاوەی بۆ ناردن. خواوەندی ئاژاوە دابەزی، لە بەینی خێوەتەکانی ئەخیل و خێوەتەکانی ئۆدیسیوسدا کە بەرانبەر بەیەك هەڵدرابوون، وەستا، کەوتە گێرەشێوێنی و ئاژاوە نانەوە، کارێکی وای کرد جۆش و خرۆشی شەڕیان تێگەڕا و ئارەزووی گەڕانەوە بۆ وڵاتیان فەرامۆش کرد. ئاگامەمنون و دیومیدس و ئۆدیسیوس و نەستور کەوتنە هاندان و ورە بەرزکردنەوەی ئاخییەکان، وسازدانیان بۆ شەڕ. لەولاشەوە تەروادەییەکان چاودێری هەموو جموجۆڵێکیان دەکرد وڕیزەکانی خۆیان ڕێکدەخست بۆ بەرپەرچدانەوەی هەر هێرشێکی کوتوپڕ. شەڕێکی قورس و توند بەرپا دەبێت و هەندێ سەرکردە و فەرماندەی تەروادەییەکان دەکوژرێن. لەنێو جەنگاوەرەکاندا شا ئاگامەمنون و دیومیدس و نەستور و دکتۆر ماکاون دەردەکەون. زیوس کە بینی ئاخییەکان خەریکە سەردەکەون و زاڵ دەبن، ئیریسی قاسید و پەیامبەری خواوەندانی نارد تا بەهیکتۆری قارەمانی تەروادەییەکان بڵێ کە نەچێتە ڕیزەکانی پێشەوە، تا شا ئاگامەمنون بریندار دەبێت و لەشەڕ دەکشێتەوە. هیکتۆر چاوەڕوانی دەرفەتی گونجاو دەکات، ئیدی ئاگامەمنون بریندار دەبێت، هاوڕێکانی فریای دەکەون، لە عارەبانەکەی دایدەگرن و بەعارەبانەیەکی خێرا بۆلای کەشتییەکان دەگەڕێتەوە تازامەکەی تیمار بکەن. تای تەرازووی شەڕەکە بەرە بەرە دەگۆڕێت و بەلای تەروادەییەکاندا قورس دەبێت، هیکتۆر**

وپاریس لەناویاندا دەردەکەون، دیومیدس ونەستور دەپێکرێن، لە شەڕەکە دەکشێنەوە وزامە سەختەکانیان تیمار دەکەن. لەم ماوەیەدا ئەخیل چاودێری ڕەوت وئاڕاستەی شەڕەکەی دەکرد، نەستور دەبینێ بەگالیسکەکەی دەگەڕێتەوە و دکتۆرە زامدارەکەشی لەگەڵە، هاورێ دڵسۆزەکەی خۆی، واتە پتروکلوس دەنێرێ تابزانی ئەو بریندارەی ناو گالیسکەکەی نەستور کێیە. پتروکلوس بەڕێگە کەنارییەکەی بەردەم کەشتییەکاندا دەڕوات، دەگاتە ئەو شوێنەی نەستور و بریندارەکەی لێ دابەزین، دەکەونە قسە، نەستوری پیری پڕ ئەزموون و بەدەم و زمان ئەوە دەگێڕێتەوە کە چۆن کاتێ وەکو ئەخیل گەنج بووە شەڕی دەکرد، و بەزمانی لوس قەناعەت بەپتروکلوسی لاو دەکات کە پێویستە ئەخیل بەشداری شەڕ بکات، تا لەشکرەکەیان نەشکێت و تا تەروادەییەکان کەشتی گریکەکان نەسوتێنن. پێی گوت ئەگەر ئەخیل نەیویست بەخۆی بەشداری بکات، بارێگە بەتۆ بدات ئەی پتروکلوس داخڵی شەڕ ببی، بەمەرجێ زرێکەی خۆیت بداتێ، چونکە کە تەروادەییەکان بەو زرێیەوە بتبینن دەترسن و وا دەزانن تۆ ئەخیلی، بەو کارە ئاخییەکان لە کارەساتێکی گەورە دەرباز دەکەیت، و کەشتییەکان لە سووتان دەپارێزی.

زەمەن:

بەپێی تەقویمی هۆمەر لە ئیلیادەدا، ڕووداوەکان لە ڕۆژی بیست و هەشتەمدا ڕوودەدەن.

شوێن:

شوێن بریتییە لە دەشتەکەی نێوان تەروادە و ڕەخی دەریا، جگە لە دیمەنی یەکەم کە زیوس فەرمان بەپەروەردگاری ئاژاوە و دووبەرەکی دەدات، ئاژاوە بنێتەوە تا شەڕ هەڵگیرسێت.

(١) ئێستا کاتێ (ئیبوس)ی پەروەردگاری سپێدە لە جێگە و لە پاڵ (تیتونوس)ی مێردی هاتەدەرێ، تا ڕوناکی بەسەر خواوەندان و بەشەراندا پەخش بکاتەوە، زیوس، خواوەندی دووبەرەکی بەبەیداخی شەڕەوە بۆلای کەشتی ئاخییەکان نارد. خواوەندی گۆڕین لە نزیکی کەشتییە ڕەشەکەی ئۆدیسیوس دا، کە لەناوەڕاستی کەشتییەکاندا بوو، وەستا، تا دەنگی لە هەر لایەکەوە ببیسترێ، چ لەلای خێوەتەکانی ئەجاکسی کوڕی (تیلامون)ەوە و چ لەلای خێوەتەکانی (ئەخیل)ەوە، ئەم دوو قارەمانە کە بەهێز و توانای خۆیان دەنازین، کەشتییەکانیان لەمپەڕ و لەوپەڕی کەشتیەکان ڕاگرتبوو. خواوەندی دووبەرەکی و ئاژاوە لەوێدا وەستا، بەدەنگێکی بەرز و بەشێوەیەکی سامناك هاوارێکی کرد و دڵی ئاخییەکانی پڕکرد لە زات و جورئەت، بەجۆرێ جۆش و خرۆشیان تێگەڕاو ورەیان بەرز بووەوە کە شەڕو کوشتاریان پێ خۆشتر بوو لەوەی بەکەشتییەکانیان بۆ وڵاتی ئازیزیان بگەڕێنەوە.

(١٥) کوڕی ئوتریوس بەدەنگی بەرز فەرمانی بەئارگۆسییەکان دا کە تەدارەکی جەنگ لەخۆبدەن وبۆ شەڕئامادەبن .بەخۆیشی زرێکەی لەبەرکرد. هەوەڵجار لاقبەندە جوانەکانی لە لاقان بەست و لەلای پاژنەیەوە بەئاغزونەی زیوین دایخست، و ئەوجا ئەو سینەبەندەی پۆشی کە سینیراس وەکو نیشانەی میوان پەروەری بەدیاری دابوویێ. سینیراس، بەڕاستی لە قوبرسدا بەو دوورییە، هەواڵی ئەوەی ژنەوتبوو کە ئاخییەکان بەتەمای هێرشن بۆ سەر تەروادەییەکان، ئەم هەواڵە لە هەموو شوێنێکدا بڵاوبوو بووەوە،

(٢٢) بۆیە ئەم سینەبەندەی بەپاشا بەخشی بوو. ئەم سینەبەندە بەجۆرەها نەخش و نیگار ڕازابووەوە، بە دە داوی لاجوەرد، دوازدە هێڵی زێڕ، بیست هێڵی قورقوشم، کۆمەڵێك ماری لاجوەردی ملخوار، سێ لەم لاو سێ لەولاوە ڕازابووەوە، ڕێك وەکو ئەو ڕەنگینکەوانەی کوڕی کرونوس لە هەوراندا وەکو ئامازەیەك بۆ بەشەران داینابوو. ئەوجا شمشێرە زێڕنیشانەکەی لە شان کرد، کێێنە زیوەکەی بەزنجیری زێڕ هەڵدەواسرا. ئەوجا زرێ گەورەکەی هەڵگرت، ئەو زرێیەی کە هەمووبەدەنی لەشەڕا دادەپۆشی. زرێیەکی جوان بوو، دەبازنەی برونزی لە هەموو لایەکەوە پێوە بوو، هەروەها بیست کەوانەی قورقوشمی بریقەداری پێوە بوو، بازنەیەکی لاجوەردی تۆخیشی بەناوەندە بوو. گۆرگۆنێکی دزیوی نیگا شومی لەسەر نەخش کرابوو، پەروەردگارانی ترس و ئاژاوە دەوری ئەو نەخشەیان دابوو. حەمایلێکی زیوین بەزرێکەدا شۆڕ بوو بووەوە، ئەژدیهایەکی پێچاو پێچی سێ

سەری لەسەر نەخشێنرابوو، هەر سێ سەرەکەی لەیەك گەردنەوە هاتبوونە دەرێ و هەریەکەیان ڕوو لەلایەك بوو. ئەوجا ئاگامەمنون کێوخودەکەی لەسەرنا کە بەچوار قوبە ویاڵی ئەسپ ڕازبووەوە. ئەوجا دوو ڕمی نوك برونزینی برندەی هەڵگرت، نووکە برونزییەکان تا دووری دوور دەبریسکانەوەو پرتەویان دەگەییە ئاسمان، لەم کاتەدا هیرا وئەتینا بەهەورە بروسکەیەکی قایم پیرۆزباییان لە شای (میسین)ی دەوڵەمەند کرد.

(٤٧) ئیدی هەر جەنگاوەرێك ئەمری بەمیرئاخوری خۆی کرد کە گالیسکەکان بەیەك ڕیز و لە کەناری خەنەکەکە ڕابگرن. ئەوجا جەنگاوەرانی سەراپا چەكوزرێ کەوتنە جموجوڵ و چوونە بێشەوە. بەر لە سپێدە هاوار وهەنگامەیەکی سامناکی بێ ڕانەوە هەستا. جەنگاوەرەکان زۆر پێش گالیسکەڕانەکان بەڕیز گەیینە خەنەکەکە. زیوس کردی بەچەخماخە و هەورە بروسکەیەکی سامناك، لە ئاسمانەوە ئاونگی خوێناوی باراند، ئەمە ئاگادارییەك بوو کە بەو زووانە ژمارەیەکی زۆر لە فەرماندە ئازاکان هەواڵەی هادیس دەکات.

(٥٦) لەولاشەوە تەروادەییەکان بەقەدیالێکەوە، لە دەوری هیکتۆری مەزن، پولیداماسی بێ وێنە، ئایناس کە تەروادەییەکان بەقەد خواوەندێك ڕێزیان دەگرت، سێ کوڕەکەی ئەنیتنور: (بولوبوس) و ئەجینوری مەزن و ئاکامسی لاوی جوان میناکی خواوەند خربوونەوە.

(٦٠) هیکتۆر لەنێو جەنگاوەرەکانا و لەڕیزی پێشەوە سپەر بەدەست وەستا بوو. وەکو چۆن ئەستێرەیەکی شوم لە بن هەورانەوە دەردەکەوێ، وخێراو جارێکی دی دەکەوێتەوە بن هەوران و لەچاو ون دەبێت، هیکتۆریش بەو ئاوایە جارێ لە ناوەندی جەنگاوەرانی ڕیزەکانی پێشەوەو گاڤێ لە ناو جەنگاوەرانی ڕیزەکانی دواوە دەردەکەوت و فەرمانی بە جەنگاوەرەکان دەدا، سەراپای لە برونزدا بوو، وەکو بروسکەی بابازیوسی سپەروەر بریسکە بریسکی بوو.

(٦٧) خەڵکی تەروادە وخەڵکی ئاخیایی پەلاماری یەکتریان دەدا و لێکدیان دەکوشت، ڕێك وەکو چۆن دوو دەستە دروێنەوان لە کێڵگەی جووتیارێکی دەوڵەمەندا، ڕووبەڕووی یەکدی دەڕۆن و بەداسە تیژەکانیان گەنم وجۆ دەدورنەوە و سواڵەی گەورە گەورە فڕێ دەدەن، هیچ لایەك لەم دوو لەشکرە لەبیری هەڵاتن نەبوو، هەر جەنگاوەرێك بەرانبەری لە جەنگاوەرێك گرتبوو، وەکو گورگی تورە پەلاماری یەکیان دەدا. خواوەندی دووبەرەکی

وبەفرەمە، گوێی لە ئاە وناڵە دەبوو، و چاوانی خۆی بەم دیمەنە زاخاو دەدا: تاقە خواوەندێك بوو كە شایەتی ئەم شەڕە پڕ سوێیە بوو.

خواوەندەكانی دی ئارام و هێمن لەجێی خۆیان، لەسەر لوتكەی ئۆڵەمپ دانیشتبوون، كە لەوێدا هەریەكەیان كۆشكێكی بەشكۆی قوت كردوەتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا خوتە و بۆڵەی ئەوەیان بوو كە زیوس پشتیوانی خەڵكی تەروادەیی دەكرد. بەڵام خواوەندی گەورە، دەربەستی ئەم خوتە و بۆڵەیەیان نەبوو، دوور لەوان ولە گۆشەیەكدا دانیشتبوو،و بەهەموو شكۆ و سامێكی خۆیەوە دەیڕوانییە خوارێ، تەمەشای شاری تەروادە،و كەشتی ئاخییەكان، و بریسك و هوڕی برونز، و بكوژان و كوژراوانی دەكرد.

(٨٤) تا دنیا ڕوناكتر دەبووەوەو ڕۆژی پیرۆز بەرزتر دەبووەوە، تیرو ڕمی هەردوو لەشكر زیاتر بەسەر زیاتر بەسەر یەكتردا دادەباری. جەنگاوەرانی هەردوولا كۆمەڵ كۆمەڵ دەكەوتن و لە خوێنی خۆدا دەگەوزین، بەڵام لە چێشتەنگاودا، لەو دەمانەدا كە داركەر لە بێشەیەكدا، دوای ئەوەی بازووەكانی لە بڕینی داری زەلام ماندوو دەبێ، ولەكار بێتاقەت دەبێت، وبرسێتی برستی لێدەبڕێ ولە پەنا شاخێكدا دەكەوێتە ئامادەكردنی خۆراكی خۆی، ئا لەو دەمانەدا، داناییەكان گوڕیان بەستەوەو بەدەم هاواری هاندانی یەكترەوە هێرشیان برد وڕیزەكانی جەنگاوەرانی تەروادەییان تێكشكاند. ئاگامەمنون پێشیان كەوت و خۆی بەناوجەرگەی دژمندا كرد و بەر لە هەمووان گەییە سەر (بینور)ی فەرماندەی سوپا و كوشتی، ئەوجا (ئولیوس)ی هاوڕێ و میر ئاخوری بینور لە گالیسكەكەی دابەزی وبەرەنگاری ئاگامەمنون بووەوە. ئاگامەمنون پەلاماری دا و ڕمێكی لە تەوێڵیدا، ڕمەكە نەچەمی و كێوخودەكەی بڕی و مێشكی پژانە ناو كێوخودەكەی و دەم و دەست گیانی سپارد.

(٩٩) ئاگامەمنون، جل وكەلوپەلە جەنگییەكانی لەو دوو مردووە داماڵی، بەسینگی سپی درەوشاوەوە لەو گۆڕەی بەجێهێشتن. ئەوجا چوو بۆ گیانی ئیسوس و ئەنتیفۆس، كوڕانی پریام كە یەكێكیان زادەی حەرام و ئەویتریان فەرزەندی ڕاستەقینە و حەڵاڵزادەی بوو. هەردوكیان لەیەك گالیسكەدا بوون —بیژەكەیان دەیهاژۆت و ئەنیتفۆسی دلاوەریش لە پاڵیا شەڕی دەكرد. ئەم جووتە كاتی خۆی كە لە مێرگەكانی بناری چیای ئیدادا پەزەكانی بابیان دەلەوەڕاند ئەخیل بەدیلی گرتبوونی وبەشولی تەڕ كەلەپچەی كردبوون، بەڵام پاشان بە سەربەها(فدیە) ئازادی كردبوون. ئێستاش ئاگامەمنون كە شێلگیرتر بوو

بوو، بەهێزە سینگی ئیسوسی لەسەرووی مەمکییەوە شەق کرد و شمشێرێکی خێواندە بناگوێی ئەنتیفوس و لە گالیسکەکەوە خستییە خوارەوە. کە بەپەلە هەڵیکوتایە سەریان تا چەك و ئەسلەحە باشەکانیان لێ داماڵا، یەکسەر ناسینییەوە، چونکە پێشتر، کاتێ (ئەخیل)ی خۆشرۆ لە ئیداوە بەدیلی بۆلای کەشتییەکانی هێنابوون، دیتبوونی.جا وەکو چۆن کاتێ شێرێك دەدا بەسەر لانەی ئاسکێکدا و بەقەپاڵ بەردەبێتە بێچووەکانی و دەیانخوات و حەیاتیان لەبەر دەبڕێ، دایکەکەیان (ئاسکەکە) ئەگەر لەو نزیکانەش بێ، ناتوانێ هیچ شتێك بکات، و لە ترسی گیانی خۆی، لە پەلاماری ئەو درندە بەهێزە هەڵدێ و تا هێز لە لاقیا بێ پێ وەغاریوە دەنێ وخۆی بەچڕە دارستانێکا دەکات، بەهەمان شێوە هیچ جەنگاوەرێکی تەروادەیی نەیتوانی فریای جووتە کوڕەکەی پریام بکەوێ و ڕزگاریان بکات، چونکە هەموو تەروادەییەکان لەبەر ئارگۆسییەکان هەڵدەهاتن.

(١٢٢) ئەوجا نۆرە هاتە سەر پیساندر و هیبولوخوسی کوڕانی ئەنتیماخۆسی بەردەبار، هەمان ئەو ئەنتیماخۆسەی کە پاریس بەزەبری بەرتیل و دیاری وای لێکردبوو لە هەمووان پتر دژی گێڕانەوەی هێلین بوو بۆ مینیلاوسی قژ زەرد. شا ئاگامەمنون پەلاماری جووتە کوڕانی ئەم پیاوەی دا، هەردوکیان لە یەك گالیسکەدا بوون و هەوڵیاندەدا ئەسپەرەهوانەکانیان هێور بکەنەوە، چونکە جڵەوەکانیان لەدەست بەربوو بوو و ئەسپەکان ڕەویابوونەوە و هەر تاویان دەدا. کوڕەکەی ئوتریوس میناکی شێر پێشی لێگرتن. هەردوکیان لەسەر گالیسکەکەوە کەوتنە پاڕانەوە وگوتیان: "ئەی کوڕی ئوتریوس مەمانکوژە، سەربەهایەکی فرەی ئازادی ئێمە وەردەگریت. کۆشکەکەی ئەنتیماخۆسی بابمان پڕە لە گەنجی زۆر وزەبەندی برونز و زێڕ و ئاسنی هونەرمەندانە سیقاڵکراو.بابمان سەربەهایەکی بێ شومارتان دەداتێ گەر بزانێ ئێمە بەزیندویی لای ئاخییەکانین."

(١٣٦) ئا بەو جۆرە جووتە برا بەدەم گریان و پاڕانەوەوە دەیانویست دڵی پاشا نەرم بکەن، کە لە پڕ وەڵامێکی ڕەقی دانەوە و گوتی: "مادامێکی کوڕی ئەنتیماخۆسی بەردەبارن، ئەو ئەنتیماخۆسەی کە کاتی خۆی، وەختێ مینیلاوس لەگەڵ ئودیسیوسی مەزندا بەنوێنەرایەتی ئێمە بۆ تەروادە هاتبوو، لە ئەنجومەنی تەروادەییەکان دا پێشنیازی کردبوو کە هەر لەوێ بیکوژن و ڕێگەی نەدەن جارێکی دی بۆلای ئاخییەکان بگەڕێتەوە،. مادامێکی کوڕی ئەو پیاوەن دەبێ ئێستا بەڕاستی سزای ئەو ڕەفتارە گەوجانەیەی باوکتان بدەن

(١٤٣) ئەوەی گوت و بەنێزەکەی سینگی پیساندروسی شەق کرد و لە عەرەبانەکە بەربووەوە و بەدەما کەوتە سەر زەوی. هیپولوخۆس لە گالیسکەکە خۆی هەڵدایە خوارێ تا هەڵا، بەڵام ئاگامەمنون خۆی گەیاندێ بەشمشێر هەردوو باسك و سەری پەڕاند و سەری وەکو گۆ بەناو ئاپوراکەدا غلبووەوە. ئەو دووانەی لەوێندەر بەجێهێشت، و ئاخییەکانی دووی خۆی خست و بەرەو جەرگەی شەڕەکە پێشڕەوی کرد. پیادەکانیان، ئەو پیادانەیان دەکوشت کە لەژێر گوشاردا هەڵدەهاتن و دەرەڤین، سوارەکانیان، سوارەی دژمنیان دەکوشت و ڕاودەنا. تەپوتۆزی ژێر پێی ئەسپان بەری ئاسمانی گرتبوو، ئاگامەمنون بەئامان و زەمان نەدەوەستا و بەدەم هاندانی ئاخییەکانەوە هێرشی دەبرد. وەکو چۆن ئاگرێکی بەترەف بەردەبێتە دارستانێکی چڕ و بەدەم باوە بەهەموو لایەکدا دەڕوات و درەختان خۆ لەبەری ناگرن و بڕ بڕ دەکەونە سەر زەوی، بەو ئاوایە سەری تەروادەییە هەڵاتووەکانیش بەدەم پەلامار و شمشێری ئاگامەمنونەوە دەکەوتنە سەر زەوی و غل دەبوونەوە. گەلێك لە جووتە ئەسپی ڕەسەنیش گالیسکەی خاڵییان بەمەیدانی شەڕەکەدا ڕادەکێشا، و بەعەزرەتی سایەقەکانیانەوە بوون کە کوژرا بوون و بووبوونە کەسەر بۆ هاوسەرەکانیان و سیسارکە کەچەڵان دەوروخونیان دەدان.

(١٦٣) بەڵام زیوس، هیکتۆری لە مەودای ڕم و تیر، لە کوشتار و هەراو هەنگامەی خوێن ڕشتن دوورخستەوە و پەنای دا. بەڵام کوڕی ئوتریوس هەر پێشڕەوی دەکرد. هاواری لە داناییەکان دەکرد و بۆ شەڕی هاندەدان. گوڕیان بەستەوە بەرەو گۆڕەکەی ئیلیوسە پیر، ئیلوسی کوڕی داردانوس، کە لە ناوەڕاستی دەشتەکەدا بوو، پێشڕەویان کرد، لە دار هەنجیرە کێوییەکە بەرەو شار ڕەت بوون —کوڕی ئوتریوس، بەدەستانی خوێناییەوە دوای تەروادەییەکان کەوتبوو و نەعرەتەی دەکێشا، بەڵام کاتێ گەیینە دەروازەکانی سکای و دار بەڕووەکە، لەوێندەر وەستان و چاوەڕوانی گەییشتنی جەنگاوەرەکانی دیکەیان کرد.

(١٧١) هێشتا هەندێك لە تەروادەییەکان لە ناوجەرگەی دەشتەکەدا هەر هەڵدەهاتن. وەکو چۆن شێرێك لە شەوێکی تاریکدا پەلاماری گاگەلێك دەدات و گاگەلەکە لە ترسا دەرەوێتەوە و هەر یەکەی بەلایەکدا هەڵدێ، بەڵام یەکێکیان بەردەکەوێ و شێرەکە هەوەڵجار ملی دەشکێنێ وئەوجا خوێنەکەی دەلێسێتەوە وجەرگ وهەناوەکەی دەخوات، بەو ئاوایە ئاگامەمنون لە نزیکەوە نیشتە سەر تەروادەییەکان و هەر کەسێکیان بەدەم

هەڵدێنەوە دوا بکەوتبایە دەیکوشت، زۆر کەس بەزەبری ڕم و شیری کوڕەکەی ئۆتریوس لەعەرەبانەکانیانەوە سەرەنگون کران و بەدەما یان بەپشتا کەوتنە خوارەوە.

(١٨١) بەڵام گاڤێ گەییە نزیکی حەسارە بەرزەکە و شار، خواوەندی بابی بەشەران و خواوەندان لە ئاسمان هاتەخوارێ و لەسەر لوتکەی چیای ئیدای فرەکانیاوان دانیشت و چەخماخەیەکی بەدەستەوە بوو. ئیریسی زێڕین باڵی بەپەلە نارد تا پەیامێکی بۆ بگەیەنێ. و گوتی: "ئەی ئیریس بەپەلە بکەوەڕێ و ئەم قسانە بەهیکتۆر بگەیەنە، پێی بێ تا ئەو کاتەی ئاگامەمنون دەبینێ لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکانییەوە هێرش دێنێ و قردەخاتە تەروادەییان خۆی بخاتە لاوە و پاشماوەی لەشکرەکەی هان بدات کە بەرەنگاری دژمن ببنەوە و بەرەڤانی بکەن، بەڵام ئەو کاتەی کە ئاگامەمنون بەنێزەیەك یا تیرێك دەپێکرێ و بۆ ناو گالیسکەکەی دەبرێ، هەنگێ من هێزێکی ئەوتۆی دەدەمێ کە بەدەم کوشت و کوشتاری دژمنەوە بڕوات تا دەگاتە لای کەشتییە مکومەکانیان و ڕۆژئاوا دەبێ و تاریکی پیرۆز باڵ بەسەر هەموو شتێکدا دەکێشێت.

(١٩٥) ئەو فەرمانەی دا. ئیریسی گوێڕایەڵ بەقسەی کرد. هەر لاقێکی کرد بەدووان و لە لوتکەکانی ئیداوە بەرەو تەروادەی پیرۆز داگەڕا، هیکتۆری بینی کە لەسەر گالیسکەکەی خۆی وەستابوو. ئەو خواوەندە چاپوکرەفتارە لە هیکتۆر نزیك بووەوە و پێی گوت: ئەی کوڕی پریام، ئەی هیکتۆر، ئەی بەردەباری هاوتای خودایان، بابە زیوس ناردومی تا پەیامی ئەوت پێ ڕابگەیەنم —تا ئەو کاتەی ئاگامەمنون دەبینی لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکانیا هێرش دێنێ و قردەخاتە تەروادەییان، دەبێ خۆت دوور بگری و فەرمان بەلەشکرەکەت بدەی کە خۆ ڕابگرن و بەرەنگاری دژمن ببنەوە. بەڵام هەر کە ئاگامەمنون بەنێزەیەك یان تیرێك پێکراو بۆ ناو گالیسکەکەی برا، هەنگێ زیوس دەستت دەدات و هێزێکی وات دەداتێ کە بەدەم کوشت و کوشتاری ئاخیانەوە بگەیتە لای کەشتییەکان وتا ڕۆژئاوا، کاتێ تاریکی باڵ بەسەر هەموو شتێکدا دەکێشێت هەر لێیان بکوژی و ببڕی."

(٢١٠) ئیریس)ی تیژڕەو ئەو قسانەی کرد وڕۆیی. هیکتۆر بەتەواوی جلکی جەنگەوە خۆی لە گالیسکەکەی هەڵدایە خوارێ، هەردوو ڕمەکەی بادەدا و لێرە و لەوێ بەناو لەشکرەکەیدا دەگەڕا و هانی دەدان کە خۆ بگرن و بەرەنگاری دژمن ببنەوە، و ئاگری شەڕێکی قورسی خۆشکرد. بەو جۆرە تەروادەییەکان ورەیان هاتەوە بەر وهاوسەنگی

خوێن بەدەست هێنایەوەو لە هەنبەر ئاخییەکان وەستان، لەولاشەوە ئاخییەکان زیاتر کوشتاریان بۆ هێنان، بەمجۆرە شەڕەکە بەلانسی خۆی وەرگرت و کەوتنە بەرانبەری یەك. ئاگامەمنون لەو ناوەندەدا دەیویست لەپێش هەمووانەوە هێرشبەرێ و پەلامار بدات.

(٢١٨) ئێستا ئەی خواوەندانی شیعر، ئەی ئاکنجیانی کۆشکانی سەر چیای ئۆلەمپ، پێم بلێن، کێ لە تەروادەییەکان، یا لە هاوپەیمانانی تەروادەیی، یەکەم کەس بوو کە ڕووبەڕووی ئاگامەمنون بووەوە؟.. یەکەم کەس (ئەفیداماسی کوڕی ئەنتینور) بوو کە هەم بەهێز و توانا و هەم بەکەلەگەتی بەناوبانگ بوو، لە دەڤەری تراکیای بەپیت و بەرەکەت، مەلبەندی ڕانوپەزان گەورە بوو بوو. کییسی باپیری، کیسیسی بابی دایکی هەر بەمنالی لای خۆی بەخێوی کردبوو. کیسیس بابی تیانوی نەشمیلانە بوو.. کاتێ (ئەفیداماس) بالق بوو، باپیری ویستی هەر لەوێ گلی بداتەوەو کیژەکەی خۆی دایێ. بەلام کە دەنگ و باسی هێرشی ئاخییەکان بۆ سەر تەروادە بیّو بووەوە، بەو تازەزاوایبە بووکەکەی بەجێهێشت و بەدوازدە کەشتی نووك باریکەوە بەرەو تەروادە وەرێکەوت. کەشتیەکانی لە برکوت بەجێهێشت، بەپێیان کەوتە ڕێ تا گەییە تەروادە. کەشتی نووك باریکەوە بەرەو تەروادە وەرێکەوت. کەشتیەکانی لە برکوت بەجێهێشت، بەپێیان کەوتەڕێ تا گەییە تەروادە. ئەم پیاوە یەکەم کەس بوو کە بەرەنگاری ئاگامەمنون بووەوە. بەلام کاتێ ئەم جووتە بەرەو ڕووی یەکترچوون و لەیەکدی نزیك بوونەوە، کوڕی ئوتریوس دەستی کردەوە، ڕمەکەی سەری کرد و بەر ئەفیداماس نەکەوت. ئەفیداماس بەهەموو هێزێکییەوە ڕمێکی سرەواندە ناوقەدی، بەرپشتێنەکەی کەوت لەژێر زرێکەیەوە، بەلام پشتێنەکەی نەبڕی، سەری نێزەکە بەر بەشە زیوینەکەی پشتێنەکە کەوت ، وەکو قورقوشم خواربووەوە. ئاگامەمنون گرتی بەڕمەکەدا و وەکو شێری تورە لە دەستی ئەفیداماسی دەرهێنا، ئەوجا هەلیکێشایە شمشێر و سەری پەڕاند. بەو جۆرە ئەو لاوە خێر لەخۆ نەدیوە لەوێدا وەکو پەیکەرێکی برونز کەوت، لە پێناوی بەرگری لە هاوولاتیانی خۆی، دوور لە ژنەکەی کوژرا، دوور لەو ژنەی کە پێی شاد نەبوو، هەرچەندە پێشەکی سەد چێلی دابوویێ، و بەلێنی دابوویێ دوایی هەزار سەر مەڕ یان بزنیشی لە ڕانوپەزە بێ شومارەکانی خۆی بداتێ. هەنگێ ئاگامەمنون جەنگامێرەکانی لێ دامالی و بەکەشو فشەوە بۆ ناو ئاخییەکان گەڕایەوە.

(٢٤٨)کە کوونی کوڕە گەورەی ئەنیتنور، جەنگاوەری دیاری ناو جەنگاوەران، کوژرانی

براکەی بینی،لە خەفەت و حەژمەتا بەرچاوانی تاریك بوو. بەرِمەکەیەوە بەجۆرێ خۆی دایە پەنا کە ئاگامەمنون نەیبینی، ئەوجا بەپەلە نێزەیەکی سرەواندێ و بەر باسکی کەوت و لە خوار ئانیشکییەوە دیوادەر شەقی کرد، ئاگامەمنونی شای بەشەران راچڵەکی، بەڵام دەستی لە شەرِ و کوشتار هەڵنەگرت، بەخۆ رمەکەیەوە وەکو با پەلاماری (کوون)ی دا. کوون هەردوو لاقی (ئەفیداماس)ی برای —کە لە باوکی بوو- بەکەسەرەوە رادەکێشا و هاواری لە جەنگاوەرە دلێرەکانی قەومی خۆی دەکرد کە فریای بکەون.. لەو کاتەدا ئەو براکەی بەناو ئاپورای خەڵکەکەدا رادەکێشا، ئاگامەمنون بەرِمە دارینە برونز نیشانەکەی جەزرەبەیەکی گەیاندێ، و بەدەم راکێشانی براکەیەوە کوشتی، ئەوجا لێی نزیك بووەوە و ملی پەراند، بەو جۆرە جووتە کورِی ئەنتینور، بەدەستی شا ئاگامەمنوونی کورِی ئوتریوس هەواڵەی هادیس کران.

(٢٦٤) ئاگامەمنون تا ئەو دەمەی خوێن لە برینەکەی دەرِۆیی، بەرِم وشیر وبەردان پەلاماری تەروادەییەکانی دەدا، بەڵام کە خوێنەکەی وەستایەوە وبرینەکەی وشك بوو، ئازار و ژانەکەی زیادی کرد. وەکو ئەو تیرە تیژ و تاڵەی ژانی منالبوون، هەناوی ژنێك شەق دەکات، ئەو تیرەی کە کیژانی هیرا، ئیلیتیانی دلرِەق دەیهاون و ناخۆشترین ژان بەو ژنە رەوا دەبینن، ئاگامەمنون خۆی گەیاندە سەر گالیسکەکەی و فەرمانی بەمیرئاخورەکەی دا کە ئەسپەکان بەرەو کەشتییەکان تاو بدات، هەرچەندە گیرۆدەی ئازارێکی کوشندە بوو، بەڵام بەدەنگی بەرز هاورِێکانی هانداو گوتی: "ئەی دۆستان، ئەی شازادە وسەرانی لەشکر، ئێستا لەسەر ئێوەیە بەرگری لە کەشتییەکان بکەن، چونکە زیوسی بەردەبار، چاوی بەرایی نادات تا ئێوارێ شەرِی تەروادەییەکان بکەم."

(٢٨٠) ئەو قسانەی کرد. گالیسکەرانەکە رِووی ئەسپەکانی بەرەو کەشتییەکان وەرگێرِاو قامچییەکی لێدان و وەکو با بۆی دەرچوون. لەو دەمەدا کە بەو خێراییە پاشای زامداریان لە مەیدانی شەرِەکە دوور دەخستەوە، سینگیان لە کەفی لالغاویاندا سپی هەڵگەرِا و لاتەنگەیان یەکپارچە بوو بەگەرد و تۆز

(٢٨٤) کاتێ هیکتۆر بینی ئاگامەمنون لە مەیدانی شەرِەکە دوور دەکەوێتەوە، بەدەنگی بەرز هاواری لە تەروادەیی و لیسییەکان کرد و گوتی: "ئەی تەروادەییان، لیسییان و جەنگاوەرانی داردانی، پیاوبن و رِۆژ رِۆژی ئێوەیە، ئەوا سەرکردەی ئاخییەکان، کە لەهەر هەموویان ترسناکتر بوو، لە مەیدان کشایەوە، زیوس دەرفەتێکی گەورەی پێ بەخشیوم.

دەی خێرا ئەسپە بەجۆش و خرۆشەکانتان بەڕیزەکانی دژمندا بدەن تا سەرکەوتنێکی شکۆدار بەدەست بێنن."

(٢٩١) بەو قسانە ورەی تەروادەییەکانی بەرزکردەوە، وەکو چۆن ڕاوچییەك تانجییە کەڵبە سپییەکانی بەردەداتە شێرێك یان بەرازە کێوییەك، بەو ئاوایە هیکتۆری هاوتای ئێریسی (بەشەرکوژ)ش تەروادەییەکانی بەردایە گیانی ئاخییەکان و بەخۆیشی بەدڵی پڕ هومێدەوە خۆی گەیاندە ڕیزی پێشەوە و بەجۆرێ کەوتە شەڕ وکوشتار لەتوایە گەردەلولێکی سەرکێشە و بەتوڕەییەوە خۆی لە دەریا دەداو لە بنی بنەوە ئاوەکەی دەهەژێنێ.

(٢٩٩) وەختێ زیوس دەستی هیکتۆری دا و شکۆمەندی پێ بەخشی کێ بوون ئەوانەی یەکەمجار بەدەستی وی کوژران، کێ بوون ئەوانەی کە لە ئەخیرا بەدەستی ئەو کوژران؟ هەوەڵجار ئەسایوس و ئۆتونوس و ئۆبیتس، دلوبسی کوڕی کلیتیوس و ئۆفیلتیوس و ئەجیلاوس و ئەسیمنوس و ئۆروس و سەرەنجام هیبونوسی شێری مەیدان بەدەستی وی کوژران. ئەمانە ئەو فەرماندانە بوون کە هیکتۆر کوشتنی و ئەوجا هێرشی بردە سەر ئاپورای لەشکرەکەیان، وەکو چۆن بای ڕۆژاوا هەورانی سپی باشور ڕادەماڵی وبەتوڕەیی خۆی پێدا دەدا و خێزاو و شەپۆلی دەریا بەرز دەکاتەوە وبەدەم غەزەوی بای شێتەوە بەهەموو لایەکدا پەرش و بێودەبێتەوە، بەو ئاوایە کوڕی پریام خۆی بەئاپورای لەشکری ئاخییاندا دەدا و سەرێکی زۆری لێ دەپەڕاندن و لە خاکی دەگەوزاندن.

(٣١٠) لەوکاتەدا هەموو شتێك ئاوەژوو بووەوە، هیچ هیوایەك نەما، ئاخییەکان سەرگەردان و شپرزە بەرەو کەشتییەکانیان هەڵدەهاتن. ئەوەبوو ئۆدیسیوس هاواری بۆ دیومیدس برد: "ئەی کوڕی تیودیوس ئەوە چمان لێ قەوماوە، بۆچی بەمجۆرە ورەمان بەرداوە؟ پیاوی باش وەرە پشتی من بگرە، هەر حەیامان دەچێ گەر هیکتۆر دەست بەسەر کەشتییەکاندا بگرێ."

(٣١٦) دیومیدس پەرسڤی دایەوە وگوتی: "هەرچییەك دەبێ با ببێ، من بەرگری دەکەم، بەڵام هەموو هەوڵێکی ئێمە بێهودە دەبێت، چونکە زیوس لێبڕاوە ئەمڕۆکە سەرکەوتن بەنسیبی تەروادەییەکان بکات نەك ئێمە."

(٣٢٠) ئەمەی گوت و نێزەیەکی لە تیمبرایوس داو لە گالیسکەکەی خستییە خوارەوە، (ئۆدیسیوس)ش (مولیون)ی میرئاخوڕی ئەو فەرماندەیەی کوشت. هەردوکیان لەو گۆڕە کەوتن. جووتە قارەمان ئەوانیان لەوێ بەجێهێشت وخۆیان بەریزەکانی دژمندا، وەکو چۆن

دوو بەرازە کێوی ئازایەتی خۆیان بیر دەکەوێتەوە و لەپڕ لەو تاژیانەی کە بەدوویانەوەن هەڵدەگەڕێنەوە و پەلاماریان دەدەن و لەت و پەتیان دەکەن، ئەو جووتەش بەو شێوەیە لە تەروادەییەکان هەڵگەڕانەوە و کەوتنە کوشتنیان. ئاخییەکان زۆر مەمنونی ئەم کارەیان بوون، چونکە کەمێك لە هێرش وپەلاماری هیکتۆر حەوانەوە.

(٣٢٨) ئەوسا عەرەبانەیەك و دوو مێری دیکەیان، دوو مێری زۆر عەگید، کوڕانی (میروپس)ی بیرکوتی کە باشترین نەهێنبین بوو، وکوڕەکانی ئاگادار کردبووەوە کە نەچنە جەنگ، جەنگی بەشەرکوژ، بەڵام بەگوێیان نەکردبوو وقەدەر و چارەنووس بەرەو مەرگی رەشی برد بوون. دیومیدسی کوڕی تیدیوس هەردووکیانی کوشت و سپەرەکانی لێدامالین، هەروەها لە هەمان کاتدا (ئودیسیوس)ش هیبوداماس و (هیبیروخوس)ی کوشت.

(٣٣٦) لەم کاتەدا کە کوڕەکەی کرۆنوس لە لوتکەی ئیداوە دەیڕوانییە خوارەوە، لێبڕا کە هیچ لایەك بەسەر لایەکەی تردا زاڵ نەبێ، هەردووتاکی تەرازووی شەڕەکەی بەرانبەر کرد.جەنگاوەران خەریکی کوشتنی یەکتر بوون. کوڕەکەی تیودیوس بەڕمەکەی سمتی (ئاگاستروفوس)ی کوڕی (بیون)ی پێکا.لەو کاتەدا عەرەبانەکەشی لەلاوە نەبوو تا هەڵا، لەوپەڕی غەفڵەتا بوو، چونکە بەئەمری خۆی میرئاخورەکەی ئەسپەکانی لە سوچێکا ڕاگرتبوو و ئەمیش بەپێیان بەرەو ڕیزەکانی پێشەوە دەڕۆیی تا لە پڕ کوژرا! هیکتۆر کە دیومیدس و ئودیسیوسی بینی چ حەشرێك دەکەن! لە نەعرەتەی داو هێرشی بۆ بردن و تەروادەییەکان دوای کەوتن. کە دیومیدس بینینی دڵی داخورپا، ڕوویکردە ئودیسیوس کە بەلایەوە وەستا بوو، گوتی: "ئەم بەڵای گیانە، هیکتۆری مەزن و ترسناك هێرش بۆ ئێمە دێنێ، وەرە با لە جێی خۆ بوەستین و بەرەنگاری ببینەوە وپاشەکشەی پێ بکەین.

(٣٤٩) بەدەم ئەو قسەیەوە نیشانی گرتەوەو ڕمەکەی هاویشت، پیرە ڕم نیشانەی پێکا، ڕێك بەر قوبەی کێوخودەکەی هیکتۆر کەوت، بەڵام نووکی برونزینی نێزەکە، کێوخودە برونزینەکەی نەبڕی و نەگەییە گۆشت. ئەم کێوخودە سێ چینولۆیە کە دیاری خواوەند ئەپولۆ بوو پاراستی. هیکتۆر پاشە و پاش گەڕایەوە و تێکەڵی قەرەباڵغییەکە بوو، کەوتە سەر چۆکان و

(٣٥٥) بەدەستە بەهێزەکانی خۆی گرتەوە، دنیا لەبەرچاوی تاریك بوو. کوڕەکەی تیودیوس لەگەڵ هاویشتنی ڕمەکەیدا بەرەو جەنگاوەرانی ڕیزی پێشەوە هێرشی برد،

ڕێك بەرەو ئەو شوێنەی کە ڕمەکەی لە عاردی چەقی، لەو دەمەدا هیکتۆر وەئاگاهاتەوە، سواری گالیسکەکەی بوو و خۆی بەناو ئاپۆرەی تەروادەییەکاندا کرد و لە مەرگ ڕزگار بوو.بەڵام دیومیدس ڕم بەدەست دوای کەوت و گوتی: "ئەی سەگ، ئەوا جارێکی دیکەش لەمردن ڕزگارت بوو، هەرچەندە ژیانت لە غەرغەرەدا بوو. جارێکی دیکەش ئەپولۆ، کە بەر لە چوونە شەڕ لێی دەپاڕێیتەوە فریات کەوت، بەهەرحاڵ من لە ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دیکەدا، ئەگەر خواوەندێك دەستم بدا دەتکوژم. بەڵام ئێستا بادوای ئەوانی دی بکەوم و هەر کێم بەردەست کەوت بیکوژم."

(٣٦٨) بەدەم ئەم قسانەوە، ڕۆیی تا (کوڕەکەی بیون) لە چەکەمەنییەکانی ڕووت بکاتەوە. لێ پاریسی قژ جوانی مێردی هیلین، کە لە پشت پایەیەکی مەزارەکەی ئیلوسی کوڕی داردانوس، کە گەورە پیاوێکی زەمانی کۆنی تەروادەییەکان بوو، و هەر ئەوان ئەم مەزارەیان بۆ دروست کردبوو، لەو کاتەدا کە دیومیدس سینەبەندەکەی لە بەرۆکی ئاگاستروفس دادەماڵی، کڵوخودە قورسەکەی لەسەری دادەکەند، و سپەرەکەی لە شانی دەکردەوە، پاریس ڕێك لەو کاتەدا نیشانی لێگرتەوە، تیرێکی هاویشتێ، سەری پێی ڕاستی شەق کرد و لە عاردەکە چەقی. پاریس بەدەم قاقای پێکەنینەوە لە حەشارگەکەی هاتە دەرێ و بەتەوسەوە گوتی: "بریندار بوویت، تیرەکەم بەفیڕۆنەچوو، بریا تیرەکەم ئاراستەی سکت کردباو بم کوشتبای، هەنگێ تەروادەییەکان، کە وەکو چوون بزن لەبەردەم شێردا دەلەرزن، لێت دەترسن، لەشەڕت دەخەلەسین."

(٣٨٤) دیومیدس بێباکانە وەڵامی دایەوە: "ئەی کەوانداری خوێڕی، ئەی فشەکەر، ئەی ژنانی.. پیاو ئەو پیاوەیە بەرانبەر پیاو بگرێ، بریا وەکو پیاو بەچەکەمەنییەکانتەوە دەهاتییە بەرانبەرم. هەنگێ نەتیر و کەوانەکەت و نەتیرە خێراکانت دادیان نەدەدای. تۆ بەخۆڕایی بەخۆت دەفشی، چونکە تۆ تەنیا سەری یەك پێت ڕوشاندوم. وا دەزانم ئەمە تیری کچێکە یان هی منالێکی لاسار و گەوج! زامی تیری ترسنۆك و نێرەموکان هیچ نییە. بەڵام تیرێك من بیهاوم لە نێزە قورستر دەبێت، بەر هەر کەسێك بکەوێ یەکسەر دەیکوژێ،

(٣٩٢) هەنگێ ژنەکەی ڕوومەتی بۆ دەڕنێ، منالەکانی هەتیو دەکەون، بەخۆیشی لە خوێنی خۆیدا دەگەوزێ، جەنازەکەی بۆگەن دەکات، لەجیاتی ژنان لەسەر کوشتەی بکەن شین، سەرگەڕان تێی دەوروکێن."

(٣٩١) ئەو قسانەی کرد و ئۆدیسیوسی ڕمباز خۆی گەیاندە سەری، وەکو قەڵغان لەبەردەمیا وەستا و خۆی کردە سپەری، (دیومیدس) لە پشت ئەوەوە دانەوییەوەو تیرە تیژەکەی لە پێی دەرهێنا، ئازارێکی تیژ بەگیانیا هات، ئەوجا خۆی هەڵدایە سەر گالیسکەکەی و فەرمانی بەمیرئاخورەکەی دا، کە بەپەلە بۆلای کەشتیەکانی بەرێ، چونکە هەستی بەئازارێکی زۆر دەکرد.

(٤٠١) ئۆدیسیوس لەوە بەدواوە بەتاقی تەنێ مایەوە، هەموو ئارگوسییەکان لە ترسا هەڵاتبوون و بەجێیان هێشتبوو. لە تورەییدا دەلەرزی و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "چ بەدبەختیەکە، چ شتێك چاوەڕوانم دەکات؟.. چ قەباحەتێکە گەر لەبەر ئەم غەوارانە هەڵێم، ئەگەر بەتەنیاش بمێنمەوەو بگیرێم ئەوا عوزر لە قەباحەت خراتر، چونکە کوڕەکەی کرونوس داناییەکانی دیکەی تۆقاندوون و هەموو هەڵاتوون... بەڵام بۆچی دڵ بەم شێوەیە دەمدوێنێ؟ چونکە من دڵنیام کە هەر ترسنۆك وبوودەڵان مەیدان چۆڵ دەکەن، قارەمانی بێباك هەرگیز سەنگەر چۆڵ ناکات، یا دەکوژێ یان دەکوژرێ

(٤١١) لە کاتێکا لە دڵی خۆیدا بەو شێوەیە بیری دەکردەوە، ئاپۆرەی تەروادەییانی سپەرلەبەر لێی هاتنە پێشێ و دایانە ناو و بەمەش خۆیان گیرۆدەی شەڕ و مەرگ کرد. وەکو چۆن کۆمەڵێك تاژی و لاوی سەرەڕۆ، بەرازێکی کێوی هەڵدەستێنن و دەوری دەگرن و بەرازە لەنێو بێشەیەکی تەنگ و چڕوە دەردەپەڕێ و کەڵبە سپییەکانی لە بەینی شەویلاگە کوورەکانییەوە گردەکاتەوە، بەڵام تاژییەکان دەوری دەگرن و تەنگی پێ هەڵدەچنن، و دەنگی لێك سوونی ددانەکانی بەرز دەبێتەوەو چەند ترسناکیش بێ هەر دەوری بەرنادەن، تەروادەییەکانیش بەو ئاوایە پەلاماری (ئۆدیسیوس)یاندا. لێ ئۆدیسیوس لێیان هاتە دەست بەڕمەکەی کەوتە گیانیان یەکەمجار لە (دیوبیتیس)ی داو شانی دیوادەرکرد، ئەوجا تون و ئینوموس)ی کوشت. پاشان کاتێ (خیرسیداماس) لە گالیسکەکەیەوە خۆی هەڵدایە خوارێ، ئۆدیسیوس ڕمێکی کرد بەژێر زرێکەیدا و قەبرغەی کون کرد، کەوتە خوارەوەو لەتاو ئازار چنگی بەئەزەکەدا دەکرد و لەوێندەر گیانی دەرچوو.. ئەوسا وازی لەوانە هێنا و بەربووە (خاروبسی کوڕی هیباسوس) و برای (سوکوس)ی خانەدان. (سوکوس)ی خواوەند ئاسا بەپەلە چووە هانای براکەیەوە، و لە ئۆدیسیوس نزیك بووە و گوتی: "ئەی ئۆدیسیوس، ئەی مەزن و ناودار، ئەی ئەو سەرکردەیەی کە هەم لە فێڵ و تەڵەکەدا وەستایت و لەشەڕ و کوشتار تێرنابی، ئەمڕۆ کە

یا ساناری بەوەوە دەکەی کە کوڕانی (هیباسوس)ت کوشت و چەك وتەدارەکەکانیانت برد، یان بەسەرەنێزەی من لەناو دەچیت."

(٤٣٤) بەدەم ئەوقسانەوە ڕمێکی سرەواندە سپەرەکەی ئۆدیسیوس –ڕمەکە ،سپەرەکەی بڕی و بەسینە بەندە مکومەکەیدا ڕەت بوو، لەلاوە گۆشتەکەی هەڵدڕی. لێ خواوەند ئەتینا نەیویست هەناوی ئۆدیسیوس ببڕێ. ئۆدیسیوس کە زانی زامەکەی کاری و کوشندە نییە، کشایەوەو ڕوو لە سوکوس گوتی: "هەی خوێری، بێگومان ئەجەلت هاتووە. تۆ منت لە شەڕ و کوشتاری تەروادەییەکان خست، بەڵام دڵنیام ئەمڕۆکە ولێرەدا بەدەست و نێزەی من دەکوژرێی و سەربەرزی بۆ خۆ وەدەست دێنم و ڕوحت هەواڵەی هادیسی خواوەندی ئەسپانی ڕەسەن دەکەم.

(٤٤٦) سوکوس وەرچەرخا تا هەڵێ، بەڵام فریانەکەوت، چونکە لەگەڵ وەرچەرخاندا، نێزەکەی ئۆدیسیوس لە پشتی ولە بەینی هەردووك شانی چەقی وتا قوڵایی سینەی ڕۆیی، کەوتە سەر زەوی و ڕمبەی هات. ئۆدیسیوس زۆری کەیف بەم کارەی خۆی هات و گوتی: "سوکوس، ئەی کوڕی هیباسوسی ڕامکەری ئەسپان. مەرگ زوو گەییە سەرت و لێی دەرباز نابی: ئەی کڵۆڵی نەگبەت، تەنانەت لە مردنیشدا داك و بابت ناتوانن چاوانت بنوقێنن، سیسارکە کەچەڵان بەسەر لاشەکەتدا باڵ لێك دەدەن و پارچە پارچەت دەکەن و ئەو جووتە چاوەت دەردێنن. بەڵام من ئەگەر ئەجە لم بێ، ئەوا ئاخییان بەڕێزەوە دەمنێژن و پرسەم بۆ دەگرن."

(٤٥٦) بەدەم ئەو گوتانەوە، نێزە قورس و سامناکەکەی سۆکۆسی لە لەشی خۆی و سپەرە مکومەکەی دەرکێشا، کە نێزەکەی دەرهێنا خوێن لە زامەکەیەوە فیچقەی کرد و ترسی لێنیشت، بەڵام کە تەروادەییە بەهیمەتەکان بینیان ئۆدیسیوس خوێنی لەبەر دەڕوات، بەیەك دەنگ هاواریان کرد و پێکڤە هێرشیان بۆ برد. کشایەوەوتا هێز لە گەرویدا بوو سێ جار هاواری بۆ هاوڕێکانی کرد، هەر سێ جارەکە مینیلاوسی فیلەتەن، خۆشەویستی ئێریس، گوێی لە هاوارەکەی بوو، بۆیە ئاوری لە ئاجاکس کە لە نزیکییەوە وەستابوو، دایەوە و پێی گوت: "ئەی ئەجاکس، ئەی زیوس زادە، ئەی کوڕی تیلامون، ئەی سەرداری گەلی خۆت، هاواری ئۆدیسیوسی بێباك، ورەبەرز لە گوێمدا دەزرنگێتەوە، لەوە دەچێ تەروادەییەکان لە هاوڕێکانی دایان بڕی بێ و بەتاقی تەنیا بەگیریان هێنابێ. وەرە با خۆ بە ئاپۆرەی لەشکرەکەدا بدەین و بەهانایەوە بچین، دەترسم وێڕای ئازایەتی

و بیباکییەکەی، تەروادەیەکان بێکەس کوژی بکەن و ببێ بەداخ و کەسەری هەتاهەتایی داناییەکان.

(٤٧٢) ئەو قسانەی کرد و کەوتەڕێ. ئەجاکسی بەهەیبەت بەگەڵی کەوت. (ئۆدیسیوس)یان بینی کە تەروادەییەکان دەوریان گرتبوو و هێرشیان بۆ دەبرد، وەکو چۆن کۆمەڵە هاسێك دووی کەڵە کێوییەکی تازە پێکراو بەتیری کابرایەك دەکەون و کەڵە کێوییەکە تازامەکەی گەرمە بەهەموو هێزێکییەوە غار دەدات، بەڵام کە تیرەکە کاری تێدەکات و برینەکەی سار دەبێتەوە، هاسەکان لە کوێستانێکی چڕە دارستانی سێبەردا، بەگیری دێنن و سەری تێ دەژنن، بەڵام لە پڕێکا یەکێك لە خواوەندەکان، بۆ نەگبەتی، شێرێکی دڕندە لەو ناوە قوت بکاتەوە، هاسەکان هەریەکە بەلایەکدا هەڵێت و بێوەی لێبکەن، و شێرەکە بە تەنیا بکەوێتە خواردنی نێچیرەکە: تەروادەییەکانیش بەو ئاوایە لە هەر قۆڵێکەوە پەلاماری (ئۆدیسیوس) ی هۆشمەندو بەردەبارییان دەدا، لێ ئەم قارەمانە بە نێزەکەی بەرگری دەکرد و ئەجەلی لە خۆی دوور دەخستەوە. ئەوجا ئەجاکس بە خۆو سپەرەکەیەوە کە لە قەڵادەچوو، بەرەو قارەمان چوو و لە بەردەمیا وەستا. تەروادەییەکان پەرت و بێو بوونەوە و هەریەکەیان بەلایەکدا هەڵات. هەنگی مینیلاوس دەستی (ئۆدیسیوس) ی گرت و لەو تەنگانەیەی دەرهێنا، تا میرئاخورەکەی ئەسپ و عارەبانەکەی بۆ هێنان. بەڵام ئەجاکس شێلگیرانە کەوتە پەلاماردانی تەروادەییەکان، (دوریکلوس) ی کوشت،دوریکلوس کوڕی ناشەرعی پریام بوو، ئەوجا باندوکوس و لوساندر و یوراسوس و بولارتیسی بریندار کرد، وەکو چۆن روبارێك بە بارانی زیوس هەستابێ و لە لوتکەی هەرەبەرزی چیاوە بەرەو دەشت بە گوڕبێتە خوارێ و هەر دار بە ڕوو وسنوبەرێکی بێتە ڕێ رایماڵێت و هەرچی قوڕاو هەیە لەگەڵ خۆیدا بەرەو دەریا رای بدات، (ئەجاکس) ی فیلەتەنیش بەو ئاوایەو دڕندانە دوژمنانی بەو دەشتەدا رادەماڵی و هەر جەنگاوەر و ئەسپێکی هاتبا ڕێ دەیکوشت.

(٤٩٧) هیکتۆر هێشتا ئاگای لەم شکستە نەبوو کە ئەجاکس بە سەری هێنابوون، چونکە لەو پەڕی قۆڵی چەپی شەڕگەکەداو لە نزیکی کەنارەکانی سکاماندروس دا دەجەنگی. و شەڕ شەڕ نەبوو، بەڵکو قەسابخانە یەك بوو لەو گۆڕە. هەر سەری جەنگاوەر بوو دەپەڕی و دەکەوتە سەر زەوی. نەستورو (ئیدومینوس) ی دلێر نەعرەتەی شەڕیان لێدەدا. هیکتۆر لە ناو جەرگەی شەڕەکەدا بوو، لەو کاتەدا کە جەنگاوەران تێك ڕژابوون، ئەو بەزەبری

نیرەکەی و باڵادەستی و کارامەیی لە سوار چاکی‌دا کاری یەجگار سەیری ئەنجام دەداو بڕبڕ جەنگاوەرانی لاوی درویّنە دەکرد. کەچی لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر پاریسی مێردی هیلینی قژ چڕو جوان. نەهاتبایە دەست و بە تیرێکی سێ سوچ شانی راستی ماکایونی دلاوەری سەرداری جەنگاوەرانی نە پێکابوایە و لە قارەمانێتی نەخستبایە، ئاخییەکان پاشەکشەیان نەدەکرد، هەنگێ ئاخییەکان ترسی ئەوەیان لێ نیشت کە شەڕەکە بە زیانی ئەوان بگۆڕێت و تەروادەییەکان ماکایون بکوژن. بۆیە ئیدومینیوس دەم ودەست، ڕوویکردە نەستورو گوتی:

(٥٠٩) ئەی نەستوری کوڕی نیلیوس، ئەی مایەی شکۆو سەرفرازی ئاخییان، خێرا سواری گالیسکەکەت بەو(ماکایون)ش لە گەڵ خۆتا سوار بکەو ئەسپە بە هێزەکانت بەوپەڕی خێرایی بەرەو کەشتیەکان تاو بدە. دکتۆرێك بەتەنیا لە پۆلە جەنگاوەرێك باشترە، چونکە دەتوانێ تیرو نێزان لە زامان دەربێنێ و بەگژوگیایان زامان چارەسەر بکات."

(٥١٥) نەستوری جیرنیایی، رامکەرو رابەری ئەسپان، بەگوێی ئیدومینیوسی کرد، یەکسەر سواری گالیسکەکەی بوو. ماکایونی کوڕی دکتۆری بەناوبانگ (ئاسکلیپوس)شی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرت، هەنگێ قامچییەکی لە ئەسپەکان داو جووتە ئەسپ، بەرەو کەشتییەکان بۆی دەرپەرین، چونکە بە دڵ تامەزرۆی ئەوە بوون بگەنە ئەوێ.

(٥٢١) ئەوجا کە (سبریون)ی میرئاخۆری هیکتۆر تەروادەییەکانی لەو پەشێویەدا بینی، پێی گوت:"ئەی هیکتۆر ئێمە کە ئێستا چنگ لەسەر شان ئەم داناییانە ڕاودەنەین و شەڕێکی سامناك دەکەین، کەچی تەروادەییەکانی دیکە، بەخۆو بە ئەسپەکانیانەوە. لە قۆڵەکانی ترەوە شپرزەو پەشێو ڕاو دەنرێن. ئەجاکسی کوڕی تیلامون راویان دەنێت. بە گەورەیی و پانی سپەرەکانیا دەیناسمەوە: با ئێمەش بە عەرەبانەو ئەسپەکانەوە بۆ ئەوێ بچین، شەڕ لەوێ گەرمەو پیادەو سوارە تێك رژاون و یەکدی دەکوژن و هەراو بەزمی شەڕ دنیای پڕ کردووە."

(٥٣١) ئەوەی گوت و قامچی یەکی شڵپ بە ئەسپە یاڵ جوانەکان دا کێشا، کە هەستیان بە قامچییەکە کرد، گالیسکەکە بە خێرایی بە بەینی تەروادەیی و ئاخیەکاندا، و بەسەر کوژراوەکان و سپەرو قەڵغانەکانیاندا دەرپەڕی، تەوەری گالیسکەکە لە خوێن دا هەڵکیشا، هەروەها ئەو خوێنەی لە ژێر گوشاری سمی ئەسپەکانەوە دەپرژا، تەگەر و قەراخی گالیسکەکەی سورکرد. هیکتۆر شێلگرانە خۆی بە ئاپۆرەی جەنگاوەرەکاناداو خۆی

بە ناوجەرگەی شەڕەکەدا کرد. هەرکە هات شێرازەی دانایییەکانی پچڕاندو پەرێشان و پەشێوی کردن، چونکە نێزەکەی بۆ دەمێکیش نەدەهێوری، بەڵێ، بەشیرو تیرو نێزەو خڕکە بەردانەوە خۆی بە ئاپۆرەی دانایییەکانا دا، و کەسی نەبوارد.جگە لە ئاجاکسی کوڕی (تیلامون). چونکە ئەگەر شەڕی کەسێکی لە خۆی باشتری بکردایە. زیوس توڕە دەبوو.

(٥٤٤) هەنگێ زیوس لەسەر عەرشە بەرزەکەیەوە کەوتە هاندانی ئەجاکس کە هەڵێت. ئەجاکس زۆر سەری سوڕما. سپەرە حەوت توێیەکەی دا بە شانیاو نیگایەکی حەسرەتباری ئاپۆرەی دژمنی کرد. پشتی تێکردن و وەکو گیان لەبەرێکی دڕندە بەدەم پاشەکشەوە ئاوڕی دەدایەوەو بە ئەسپایی دەکشایەوە.

(٥٤٨) وەکو چۆن جوتیاران و سەگەکانیان شێرێکی لاواز لە ئاغەڵی چێێن پاس دەکەن بە درێژایی شەوێ ئێشکان دەگرن و نایەڵن قەڵەوترین چێلی نێو گاگەلەکە برفێنێ، بەلاّم لە برسیتی دا خۆی بە ئاغەڵەکەدا دەکات و هیچ شتێکی پێ نابرێت، چونکە دەستانی بەهێز لە هەموو لایەکەوە تیری بەسەرا دادەبارێنن و شولەی ئاگری هەڵایساو، چەند برسی و توڕەش بێ دەیترسێنێ و سڵی پێ دەکاتەوە، و لەگەڵ سپێدەدا بەنائومیدی و دڵ خەمینی لەسوچێکەوە خۆی دەربازدەکات. (ئەجاکس)ش وەکو ئەو شێرە بەخەمینی و نە بەدڵی لەبەر تەروادەییەکان هەڵدەهات، چونکە زۆر خەمی کەشتی ئاخییەکانی بوو. یان وەکو چۆن کەرێك بەناو کێڵگە گەنمێك دەکەوێ و منالان تێی بەردەبن و چەندین داری تیا دەشکێنن، بەلاّم ئەو لەسەر لەوەڕی خۆی بەردەوام دەبێ و گوێ بەمناڵەکان نادات،چونکە دەست و بازویان بێ هێزە و ئازارێکی کەمی پێ دەگەیەنن، بەهەرحاڵ مناڵەکان زۆر بەزەحمەت کەرەکە دەردەکەن، بەلاّم دوای ئەوەی تێر و پڕ دەخوات. بەو ئاوایە تەروادەییەکان و هاوپەیمانەکانیان کە لە هەموو لایەکەوە بەهانای تەروادەوە هاتبوون، ئاجاکسی دلاوەری کوڕی (تیلامون)یان دابووە ناو و لێکدا لێکدا نێزەیان بەناوەندی سپەرەکەیدا دەکێشا و ڕاویان دەنا و تەنگیان پێ هەڵدەچنی. بەلاّم ئەجاکس جار جارێ دلاوەری و ئازایەتی خۆی وەیاد دەهاتەوە، ئاوڕی دەدایەوە و ڕووبەڕووی جەنگاوەرانی تەروادەیی، ڕامکەری ئەسپان دەوەستایەوە، و هەندێ جار هەڵدەهات، بەلاّم ڕێی پێگرتن و نەیهێشت بگەنە کەشتییە تیژڕۆیەکان، چونکە بەتاقی تەنیا لەنێوان تەروادەیی و ئاخیەکاندا وەستاو بەجۆش و خرۆشەوە شەڕی دەکرد. ئەو

تیرانەی که بەدەستانی بەهێز تێی دەگیران هەندێکیان بەر سپەرە گەورەکەی دەکەوتن وزۆریشیان لە ناوەندی هەردوو لەشکرەکەدا، وێڕای ئەوەی تینوی گۆشت و خوێنی ئەو بوون، بەرلەوەی بیگەنێ و بریندار بکەن، دەکەوتنە سەر زەوی.

(٥٧٥) کاتێ (یوریبیلوس) کوڕە ئازاو ناودارەکەی (ئویمون)، ئەجاکسی بینی کەوتوەتە ژێر ڕەحمەتی بارانی تیران، خۆی گەیاندێ، نێزەکەی هاویشت، (ئەبیساون)ی کوڕی (فوسیوس)ی فەرماندەی جەنگاوەرانی پێکا، نێزەکە ڕێك بەر جگەری کەوت و یەکسەر بەچۆکا هات. یوریبیلوس هەڵیکوتایە سەری و چەك و تەدارەکەکەی لێ داماڵی، بەڵام کە پاریسی قۆز، قۆز وەکو خواوەند، بینی یوریبیلوس چەك و تەدارەکەکەی (ئەبیساون) دادەماڵا، یەکسەر کەوانەکەی لێ ڕاکێشا و تیرەکەی ڕانی ڕاستی سمی، قەدی تیرەکە شکا، بەڵام سەری تیرەکە هەر لە ڕانیا مایەوە، هەنگێ بەژێر باڵی هاوڕێکانیا گەڕایەوە تا خۆی لە دێوی مەرگ بپارێزێ. ئەوجا بەدەنگێکی بەرز هاواری لە داناییەکان کرد و گوتی: "ئەی دۆستان، ئەی شازادە و سەرانی ئارگوسیان، خێراکەن، فریای ئەجاکس بکەون، زۆر لە تەنگانەدایە، باوەڕ ناکەم بەسەلامەتی لەم شەڕە دەربازبێ، خێرا فریا بکەون و قارەمانی مەزن، ئەجاکسی کوڕی تیلامون ڕزگار بکەن.

(٥٩٢) (یوریبیلوس)ی بریندار، بەو شێوەیە قسانی کرد. ئارگوسییەکان بەهانایەوە چوون، سپەر بەشان و نێزە بەدەست دەوریاندا، ئەجاکس بەرەو ئەمان دەهات، کە گەییە ناویان ئاوڕی دایەوەو بەبێباکی بەرانبەری لە دژمن گرت.

(٥٩٦) ئاگری شەڕ خۆش بوو. لەم کاتەدا ئەسپەکانی نیلیوس کە لە ئارەقەدا هەڵکشابوون، نەستوریان بەسواری عەرەبانەکەی لە مەیدانی شەڕگەکە دەبردە دەرێ، (ماکایون)ی فەرماندەی سوپای لەگەڵدا بوو. ئەخیل کە چاودێری شەڕەکەی دەکرد بینیانی، ئەخیل لەبەردەم کەشتییە گەورەکەیدا وەستابوو و دەیڕوانییە ئەو هەراو هەڵێ و کوشت و کوشتارە قورسە. هەر لە جێی خۆیەوە بانگی لە (باتروکلوس)ی هاوڕێی کرد.

باتروکلوس هەر کە گوێی لە دەنگی بوو ڕێك لە شێوە و هەیئەتی ئەریسی خواوەندی جەنگدا بەدەنگییەوە هات، کە لە ڕاستیا ئەمە سەرەتای ئەو نەگبەتییە بوو کە گرتی، گوتی: "ها ئەخیل بۆچی گازم دەکەی؟ چیت لە من دەوێ؟ ئەخیلی تیژڕۆ وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی کوڕە پاکزادەکەی (مینیوتیوس)ی مەزن، ئەی ئازیزەکەی دڵم، پێم وایە هەر ئێستا ئاخییەکان دێن و بەسەر دەست و پێی مندا دەکەون و لێم دەپاڕێنەوە،

چونکە کەوتوونەتە تەنگانەیەکی وەهاوە کە تەحەمول ناکرێ، جا پاترۆکلۆس، ئەی نازپەروەردەی زیوس، هەر ئێستا بەڕاکردن برۆ و لە نەستور بپرسە کە ئەو بریندارەی لە شەڕەکەی هێناوەتەوە کێیە. لە پشتەوە لە ماکایونی کوڕی ئاسکیلپیوس دەچێت، بەڵام ناتوانم ڕووی بدینم، چونکە ئەسپەکان زۆر بەخێرایی غار دەدەن.

(٦١٦) پاتروکلوس، بەگوێی هاوڕێ ئازیزەکەی کرد، و بەقەراخ سەراپەردە و بەردەم کەشتی ئاخییەکاندا بەغار بۆی دەرچوو.

(٦١٨) کاتێ نەستور و ماکایون گەیشتنە بەردەم سەراپەردەکانی نەستور، لە گالیسکەکە دابەزین (یوریمیدون)ی میرئاخوڕی نەستور ئەسپەکانی لە گالیسکەکە کردنەوە. ئەوجا نەستور و ماکایون لە قەراخی دەریاکەدا، خۆیان دایە بەر شنەی بایەکە، تا جلە ئارەقە هەڵکشاوەکانیان هیشك بکەنەوە، کە ئارەقەکەیان وشك بووەوە وەژوور کەوتن و دانیشتن. هیکامیدی، کە قژێکی لول و جوانی هەبوو، شەرابێکی خۆش و بەلەزەتی بۆ ئامادە دەکردن. ئەمە کیژی (ئەرسینوس)ی جەنگاوەری دلێر و خانەدان بوو، کاتێ ئەخیل شاری (تینیدوس)ی گرتبوو و تالآنی کردبوو، نەستور ئەم کیژەی لەوێندەر بەدیلی هێنابوو. ئاخییەکان بۆیە ئەم کیژەیان بەنەستور دابوو، چونکە لە هەموویان ژیرتر و بردەبارتربوو. هیکامیدی هەوەڵجار مێزێکی جوانی لەبەردەمدا دانان، مێزێك کە پایەکانی لەلاجیوەردی شین بوو و یەجگار هونەرمەندانە و وەستایانە دروست کرابوو،

(٦٢٩) ئەوجا سەبەتەیەکی برونزی لەسەردانا، لەگەڵ پیازێکدا تا بیکەن بەمەزەی شەرابەکەیان، هەندێ هەنگوینی زەردی ڕوون و هەندێ ئاردەسپەندی لە سەبەتەکەدا دانا. لە پاڵ ئەوانەشدا، جامێکی زۆر جوانی، لەسەر مێزەکە دانا کە پیرەمێر لە ماڵەوە لەگەڵ خۆیدا هێنابووی، ئەم جامە بەنەخش و نیگاری زێڕین نەخشێنرا بوو، چوار دەسکی هەبوو، جووتێ کۆتری زێڕین بەسەر هەر دەسکێکییەوە هەبوو کە دانیان دەخوارد، دوو پایەش لەژێر جامەکەدا بوو. ئەم جامە ئەگەر لە شەراب تەژی بووایە، جگە لە نەستور زۆر زەحمەت بوو هەر پیرەمێرێکی دیکە لەسەر مێزەکە بەرزی بکاتەوە..بەڵام نەستوری پیرەمێر زۆر بەئاسانی هەڵیدەبڕی. هیکامید کە لە یەزدانخانم دەچوو، بادەیەکی شیرین و خەستی کردە جامەکەوە. ڕەندەیەکی برونزی هێنا و پەنیری بزنی لە ڕەندە داو تێیکرد، و ئاردێکی سپی بەسەردا پرژاند، هەر کە شەرابەکە ساز بوو، خوڵکی کردن تا تینوێتیانی پێ بشکێنن. دوای ئەوەی دەستیان بەخواردنەوە کرد و تینوێتی خۆیان

شکاندن، بەدوو قۆڵی کەوتنە قسە و باسان، لەم دەمەدا پاترۆکلوسی هاوتای خودایان، لەبەر سەراپەردەکەدا پەیدا بوو.

(٦٤٥) نەستوری بەناوبانگ کە ئەوی بینی خێرا هەستا، دەستی پاترۆکلوسی گرت و هێنایە ناو خێوەتەکەوەو داوای لێکرد دانیشێت، بەڵام پاترۆکلوس دانەنیشت و گوتی: "ئەزبەنی ئەی نازپەروەردەی زیوس، وەختی دانیشتن نییە، زۆرم لێ مەکە، ئەو پیاوەی کە ناردومی تا لێت بپرسم ئەو جەنگاوەرە زامدارە کێ بوو کە هێناتەوە بۆ ئۆردوگاکە، پاڵەوانێکی گەورە و دڵناسکە، زوو تورە دەبێ. بەڵام قەیدی نییە، من خۆم جەنگاوەرە زامدارەکە دەناسم، ماکایونی ڕابەری جەنگاوەرانە، بەیارمەتیت ئێستا ڕێم بدە با وەکو تەتەرێك هەواڵەکە بۆ (ئەخیل) بەرمەوە. تۆ بەخۆت ئەی پیر، ئەی زیوس زادە، باشی دەناسیت و دەزانی چ ماڵێکە، و هەمیشە لەسەر پێیە بۆ لۆمەکردن، تەنانەت لۆمەکردنی ئەوانەش کە لۆمە هەڵناگرن!"

(٦٥٥) نەستوری جیرنیایی، وەڵامی دایەوە: "ئەخیل لە کەیەوە ڕوحمی تلیساوەتەوە و، وا بەمجۆرە کەوتۆتە خەمی ڕۆڵەکانی ئاخیایی؟ زۆریان پێکراون. نازانێ چ خەم و پەژارەیەك باڵی بەسەر هەموو نکالانی لەشکرگەدا کێشاوە، زۆربەی فەرماندە نەبەزەکانمان، یان لە دوورەوە بەتیر پێکراون یان بەنێزە بریندار بوون و لەناو کەشتییەکاندا لە جێدا کەوتوون. دیومیدسی پاڵەوانی کوڕی تیدیوس بریندارە، هەروەها ئودیسیوس و ئاگامەمنونیش بریندارن، و (یوریبیلوس)ش بریندارە و تیرێك بەر ڕانی کەوتووە، منیش تۆزێ لەمەوپێش ئەم پیاوەم لە شەرگەکە هێنایەوە، ئەویش بریندارە و تیری بەرکەوتووە، لەگەڵ ئەمەشدا، ئەخیل بەهەموو ئازایەتی و دلاوەرییەکیەوە جگە لە خۆی گوێ بەداناییەکان نادات و بەزەیی پێیاندا نایەتەوە. ئاخۆ چاوەڕوانی ئەوەیە کە کەشتییەکان بەسەر ئاخییەکاندا بسوتێن و ئێمەش یەك لەدوای یەك ببین بەتوێشوی تیغی شەڕ؟

(٦٦٨) سەبارەت بەمنیش، ئەو هێز و شنگەی جارانم نەماوە، ئاه، بریا دەمتوانی جارێکی دی گەنج ببمەوە، هەمان ئەو هێز و توانایەم بەدەست دێناوە کە لە شەڕی ئیلیسدا هەم بوو، ئەوان پەز وماڵاتەکەی ئێمەیان تالانکرد و من (ئوتومونیوس)ی دلاوەری کوڕی (هوبایروخوس)م کە لە ئیلیس دەژیا بەقەستی خوێنداری و تۆڵەسێنی کوشت. لەو دەمەدا کە من تالانی و دەسکەوتەکانم ڕادەدا، ئەو لە ڕیزی پێشەوەی ئەو شوانانەی کە کۆی کردبوونەوە، پێگیری دەکرد و پەز و ڕانەکانی خۆی پاس دەکرد، ڕمێکم خێواندێ

و ناوەڕاستی نێوچەوانی گرت و کەوت و گیانی دەرچوو، ئەو قەوم و قیلەیەی لە دەوری بوون هەموو ترسان و هەڵهاتن.. بەڵام تاڵانیەکی بێ شومارمان لە دەشتەوە هێنابوو: پەنجا سەرچێڵ و ڕانە مەڕێکی فرە، پەنجا سەر بەراز و گەلە بزنێکی زۆر. سەد و پەنجا ماینی جوانو لەبەر.. هەموو ئەمانەمان شەوێ کرد بەبیلوسدا، بەشارەکەی نیلیوسدا، نیلیوس کە بینی من بەو لاوییە، و بۆ یەکەمجار چوو بوومە شەڕەوە و بەو هەموو دەسکەوت و تاڵانییەوە گەڕابوومەوە، زۆر شادمان بوو. لەگەڵ سپێدەی بەیانیدا، جارچییان بانگەوازیان کرد کە هەر کەسێك هەق و داوایەکی لەسەر ئیلیس هەیە لێرە خڕببنەوە، هەنگێ ڕابەرانی پیلیان کۆبوونەوە تا ئەم دەستکەوتانە دابەش بکەن. بەڕاستی ژمارەی ئەوانەی کە دەبوایە (ئیپیان)ەکان قەرەبوویان بکەنەوە زۆر بوون، واتە ئیپیانەکان قەرزاربارى زۆر کەس بوون، ئێمە لەبەر کەمی ژمارەمان لە بیلوسدا، زۆر چەوساوە بووین، کاتی خۆی هیراکلیسی بەزەبر و زەنگ هات و بەتەواوەتی لە زەواقی ناین، ئازاترین پیاوانی کوشتین. ئێمەی کوڕانی (نیلیوس)ی بێ هاوتا دوانزە کەس بووین، جگە لە من هەموو ئەوانی دی کوژران. لەوە بەدواوە ئیپیانانی سەراپا برونز و مەستی ئەم سەرکەوتنانە، سوکایەتیان پێدەکردین و پیلان و نەخشەی بێ مانایان بۆ چەوساندنەوە و ئازاردانمان دەنایەوە. ئەوە بوو نیلیوسی پیر، گاگەلێك و ڕانەمەڕێکی گەورەی بەشوانەکانیانەوە بۆ خۆی هەڵبژارد، بەهەمووی سێ سەد سەر دەبوو. چونکە هەقێکی فرەی لەسەر ئیلیسییەکان هەبوو، چوار ئەسپی ڕەسەنی بەعارەبانەکانیانەوە ناردبوو تا لە ئیلیس بەشداری جریدبازی بکەن، خەڵاتەکە سێ پایەیەك بوو. بەڵام (ئوجیاس)ی پاشای ئەوێندەر، دەستی بەسەر ئەو ئەسپانەدا گرت و میرئاخوڕەکانیانی بەخەمینی و دڵتەنگی ناردبووەوە. جا پیرەمێرد کە لەو ڕەفتار و گوفتارانە پەست و توڕە بوو، بەشێکی زۆری لەم تاڵانی و دەستکەوتانە بۆ خۆی هەڵگرت، و پاشماوەکەی دا بەخەڵکەکەی خۆی تا بەیەکسانی بەسەر خۆیاندا دابەشی بکەن.

(٧٠٦) بەو جۆرە هەموو کاروبارەکانمان ڕێکخست، لە هەموو لایەکی شاردا قوربانیمان پێشکەشی خواوەندان کرد، بەڵام لە ڕۆژی سێیەمدا ئیپیانییەکان بەقۆشەنێکی بێ شومارەوە، بەگالیسکەیەکی فرەوە و هەموو خۆیان پڕ چەك کردبوو، برایانی (مولیون)ش کە چەکیان لە خۆ دابوو، لەگەڵیاندا هاتبوون ئەم برایانە هێشتا لە فەند و فێڵی شەڕو شۆڕ و قارەمانبازی بێ خەبەر بوون. ئەمانە هاتن و لە دەوری شاری ترییس هەڵیاندا،

ئەم شارە لەسەر گردێکی کەناری ڕوباری (ئەلفیوس)ی مەرزی بیلیوسی لمەڵان دامەزرا بوو، ئەوانە بەتەمابوون ئەم شارە تەخت بکەن، و لە دەوری شار هەواریان خستبوو. بەڵام کە بەدەشت و باسکەکاندا بڵاوبوونەوە، شەوێ ئەتینا بەپەلە لە ئۆلیومبسەوە هات بۆ لامان و ئەمری پێکردین کە خۆ بۆ جەنگ تەیار بکەین.. ئەو جەماوەرەی لە بیلیوس خڕبووبوونەوە بەئاسانی بەدەنگییەوە هاتن، چونکە خەڵکانێکی تامەزرۆ و تینوی شەڕ بوون. بەڵام نیلیوس قاییل نەبوو من چەك هەڵگرم، ئەسپەکانی لێ شاردمەوە، چونکە وای مەزەندە دەکرد من هێشتا باڕم، و هیچ لە فەند و فێڵی شەڕ نازانم. لەگەڵ ئەمەشا، من هەرچەندە بەپیادەیی دەجەنگیم توانیم لەنێو سوارەکاندا ناوێ دەربکەم، ئەتینا بەو شێوەیە منی بەرەو ڕووی دژمن برد. لە کاتێکا جەنگاوەرانی ئێمە لەسەر ڕوباری مینویوس، کە لە نزیکی ئەریندا دەڕژایە دەریاوە چاوەڕوانی هەڵاتنی سپێدەمان دەکرد، دەستە دەستە لەشکریانی پیادە پەیوەندیان پێوە دەکردین. لەوێندەرەوە، هەموو چەکدار و پڕ چەك وەڕێکەوتین و بۆ نیوەڕۆ گەییشتینە کەناری ڕوباری (ئەلفایوس)ی پیرۆز. لەوێ قوربانی گەورەمان بۆ زیوسی مەزن کوشتەوە، گایەکمان بۆ ئەلفایوس و گایەکی ترمان بۆ بوسایدون کوشتەوە. بەڵام بۆ ئەتینای چاوکەوە گوێرەکەیەکی ناسکمان سەربڕی. هەنگێ لەشکر هەموو پێکەوە شیوی ئێوارەمان خوارد، هەر بەچەکەکانمانەوە لە کەناری ڕوبارەکەدا پاڵ کەوتین.

(٧٣٢) ئیپیانییەکان ئابڵوقەی شاریان دابوو و سووربوون لەسەر ئەوەی لەگەڵ زەویدا تەختی بکەن، کە لە ناکاو بانگی (ئیریس)یان گەییە گوێ، هەر کە هەتاو گزنگیدا، ناوی زیوس و ئەتینامان لێهێنا و دەستمان بەشەڕ کرد. کە بەزمی شەڕ لەنێوان پیلوسیان و ئیپیاندا گەرم بوو، من یەکەم جەنگاوەر بووم کە ڕەقیبەکەی خۆم کوشت و دەستم بەسەر ئەسپەکانیاگرت، ڕەقیبەکەم (مولیوس)ی دلاوەری ڕمباز، زاوای ئوجیاس و مێردی ئاگامیدی زێڕین پرچ بوو، کە سوود و قازانجی هەموو گژو گیایانی سەر ڕووی زەوی دەزانی. لەو کاتەدا ئەم جەنگاوەرە دەهاتە پێشێ، نێزەیەکم تێ سرەواند

(٧٤٢) وەختێ کەوت ولە عاردی گەوزا، خۆم هەڵدایە سەر گالیسکەکەی و لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکاندا گیرسامەوە، کە ئیپیانییەکان بینیان سەرداری سوارەکانیان (ئەو جەنگاوەرەی کە سەرامەدی ئەوانی دی بوو، لە خاك و خوێندا گەوزا، هەریەکەیان بەلایەکدا هەڵاتن، منیش وەکو باوبۆران بەسەریاندا داباریم و پەنجا گالیسکەم لێگرتن و

کە هەریەکەیان دوو جەنگاوەری بەسەروە بوو و بەزەبری نێزەی من لە خاك و خوێندا گەوزان. بێگومان دەمتوانی کوڕانی (ئاکتۆر) واتە برایانی (مولیون)ش بکوژم ئەگەر بابە ڕاستەقینەکەیان، بوسیدونی خواوەندی بوومەلەرزە فریایان نەکەوتبا و لە تەمومژێکی ئەستوری نەپێچابانەوە ولە شەڕگەکەی دوور نەخستبوانەوە. ئەوجا زیوس سەرکەوتنێکی گەورەی بەنسیبی پیلیوسیان کرد، چونکە ئێمە بەدرێژایی دەشتەکە دوای دژمنانمان کەوتین، جەنگاوەرانمان کردە تێشوی تیغ و کوشتمانن، جلوبەرگی شەڕمان لێداماڵین تا بە ئەسپەکانمانەوە گەییشتینە گەنمەجاڕەکانی بوپراسیونی نزیکی تاوێری ئولینی و هەردەوباسکی ئەلیسیون، لەوێدا ئەتینا گەڕاندینییەوە، هەروەها لەوێدا بوو کە من دوا جەنگاوەری دژمنم کوشت و بەجێم هێشت، ئەوسا ئاخییەکان بەسواری ئەسپەکانیان و بەچوار ناڵە لە( بوپراسیون)ەوە بۆ بیلیوس گەڕانەوەو لە ناو خواوەنداندا سوپاسی (زیوس)یان کرد و لەنێو بنیادەماندا سوپاسی نەستوریان کرد.

(٧٦٢) ئەگەر من بەپاڵەوان بژمێردرێم و، ڕۆژێ لە ڕۆژان شتێك بووبم شایستەی یادکردنەوە، من لەناو جەنگاوەرەکاندا، و هەمیشە هەر وابووم. بەڵام ئازایەتی و دلاوەری ئەخیل تەنیا بۆ خۆیەتی و هەر خۆی پێی شادمانە، پێم وایە ئەو ڕۆژەی کە لەشکرەکەمان نابوت دەبێت زۆر خراپ پەشیمان دەبێتەوە. ئاە، ئەی دۆستی ئازیز، لە بیرتە ئەو ڕۆژەی مینیویتیوس لە (بیتیا)وە بۆلای ئاگامەمنونی ناردی چ ئەمرێکی پێکردی؟ من و (ئودیسیوس) لەوێ بووین، لەناو ماڵەکەوە گوێمان لە هەموو شتێك بوو، گوێمان لێ بوو کە چی پێدەگوتی، چی پێدەفەرمووی، بۆیە هاتبووین بۆ ماڵە ئاوەدان و پڕ خەڵکەکەی بلیوس تا لە خاکی بەپیت و بەرەکەتی ئاخیادا لەشکرێك خڕبکەینەوە و ڕێك بخەن. کە هاتینە ژوورەوە مینویتیوس و تۆ و ئەخیل)مان لەوێدا بینی. پیری ڕامکەری ئەسپان، لە حەوشی سەراکەیدا دوو ڕانی قەڵەوی گای بۆ زیوسی چەخماخەوەشان دەبرژاند، و جامێکی زێڕینی بەدەستەوە بوو و بادەیەکی ئاگرینی بەسەر ئەو قوربانیانەدا دەپرژاند کە لەسەر ئاگرەکە بوون. ئێوە هەردووکتان خەریکی چاککردن و برژانی گۆشت بوون، ئێمەش بەدوو قۆڵی لەبەر دەرگاکە وەستابووین. ئەخیل بەپەلە هات، دەستی گرتین و بردینییە ژوورەوە و خوڵکی کردین دانیشین و بەڕووخۆشی و پیاوانە، بەپێی داب و نەریتی میوانداری پێشوازی کردین و ڕێزی گرتین.

(٧٨٠) کە تێر و پڕمان لە گۆشت و شەراب خوارد و خواردەوە، من یەکەم کەس قسەم

کرد. داوام لێکردن کە بێنە ڕیزی ئێمەوە و لەگەڵمانابن. ئێوە هەردوکتان پێتان خۆش بوو لەگەڵماندا بن و بابتان زۆریان ڕێنوێنی و ئامۆژگاری کردن. (بیلیوس)ی پیر، (ئەخیل)ی کوڕی ئاموچیاری دەکرد کە هەمیشە لە ڕیزەکانی پێشەوە بجەنگێ و دایمە پێشەنگ و سەرامەدی هاوڕێکانی بێ. (مینویتیوس)ی کوڕی ئاکتورش ئاوای بەتۆ گوت: "کوڕی خۆم،ئەخیل لە ڕووی ڕەسەن و ڕەچەڵەکەوە لە تۆ زیاترە، بەڵام لە ڕووی تەمەنەوە تۆ لەو زیاتری. ئەو زۆر لە تۆ بەهێز و تواناترە، لەسەر تۆیە ئاموچیاری و ڕێنوێنی بکەی، ئەگەر بەباشی قسەی بۆ بکەی بێگومان بەرفرمانت دەبێ و لەبەر بەرژەوەندی خۆی بەگوێت دەکات." ئەوها بوو ئامۆژگارییەکانی پیرەمێر، بەڵام تۆ لە بیرت کردووە. بۆچی ئێستا ئەم قسانە بەئەخیل نالێی، لەوەیە گوێت لێبگرێ؟.. کێ دەزانێ، لەوەیە خواوەندێك یارمەتیت بدات و بتوانی بەقسەکانت دڵی نەرم بکەی و بیهێنێتە ڕەدا، جێی خۆیەتی مرۆڤ بەقسەی دۆستی خۆی بکات. ئامۆژگاری کردنی دۆست کارێکی پەسەندە. بەرهەحاڵ ئەگەر لە دڵی خۆیدا لە پێشبینییەك دەترسێت، یان دایکە گرانقەدرەکەی شتێکی لەمەڕ زیوس و نیازی زیوس پێ گوتووە، با تۆ لە جیاتی خۆی بنێرێت و لەشکری مەرمیدونەکان دوای تۆ بکەون، بەڵکو بەختت یار بێ و کێوڕۆژنەیەکی ئومێد و ڕزگاری لە داناییەکان بکەیتەوە. با ئەخیل چەکەمەنییەکانی خۆیت بداتێ و بەسپەر و چەکەکانی ئەوەوە بچیتە مەیدانی شەڕ، چونکە تەروادەییەکان وادەزانن ئەویت و لە شەڕ هەڵدێن، و ئاخییەکان نەفەسێ تازە دەکەنەوە، چونکە جەنگی بێ ئامان تەنگی پێ هەڵچنیوون و حەوانەوەی لێ هەڵگرتوون، جا تۆ وەکو لاوێك دەتوانی بەئاسانی دژمنی ماندوو بەرەو شاری خۆیان ڕاوبنەیت و لە کەشتی و خێوەتەکانمان دووریان بخەیتەوە.

(٨٠٤) بەو قسانە هەستی پاتروکلۆسی لە ناخەوە جوڵاند، پاتروکلۆس بەبەر ڕیزی کەشتییەکاندا کەوتە غار بۆلای ئەخیلی کوڕی ئیاکوس. پاتروکلوس، کاتێ گەییە ئاستی کەشتییەکانی ئودیسیوس، ئەو مەیدانەی کۆبوونەوەیان تیا دەکرد یا قوربانیانی واجبیان بۆ خواوەندان تیا دەکرد، لەوێدا تووشی یوریبیلوسی کوڕی ئیومون بوو کە تیرێك بەر ڕانی کەوتبوو و بەشەلە شەل لە ئۆردوگاکەوە دەهاتەوە. ئارەقە لەسەری و ناو شانیەوە دەچۆڕا، خوێنێکی خەست لە زامە کارییەکەیەوە فیچقەی دەکرد، بەڵام ورەی بەر نەدابوو، و ئەقڵی لە جێی خۆدا بوو. کاتێ کوڕی مینویتیوس بەو حاڵەوە بینی دڵی پێی سووتا و گریان ئەوکی گرت و بەسۆز وگودازێکی ڕاستەقینەوە دواندی و گوتی:

(٨١٦) ئەی سەران و دەم سپیانی کڵۆڵ وبەدبەختی داناییان، ئایا لە چارەتان نووسرا بوو، بەو شێوەیە، دوور لە دۆستان و خاکی نیشتمان ببن بەخۆراکی سەگانی تەروادە؟ ئەی (یوربیلوس)ی خانەدان و دلێر، ئەی قارەمانی نازپەروەردەی زیوس تۆ پێم بێ ئایا ئاخییەکان دەتوانن بەرەنگاری هیکتۆری سامناك ببنەوەو لە پێشڕەوی ڕایگرن، یان لە حاڵی نابوتیان؟".

(٨٢٣) یوریبیلوسی زامدار وەڵامی دایەوە: "ئەی پاترۆکلوس! ئەی زیوس زادە! ئاخییەکان لە ئێستا بەدواوە هیچ چارێکیان نییە تەنیا ئەوە نەبێ کە لای کەشتییەکانیان بمرن. چونکە ئەوانەی لەمەوپێش دلێرترین جەنگاوەر بوون و فەرماندەمان بوون، ئێستا لە ناو کەشتییەکاندا کەوتوون و بەدەستی تەروادەییەکان، کە هێز و تواناییان سات بەسات ڕوو لە زیادیە، بریندار بوون. بەڵام تۆ وەرە فریام کەوەو بمبە بۆ ناو کەشتییە ڕەشەکەم و ئەم تیرە لە ڕانم دەربێنە و بەئاوی گەرم ئەم خوێنە ڕەشە خەستەی لێ بشۆ، و هەتوانێکی باش لە برینەکەم بنێ، هەتوانێکی کاریگەر، کە دەڵێن تۆ لە (ئەخیل)ەوە فێری چۆنیەتی گرتنەوەی بووی و ئەویش لە (خایرون)ەوە (دادپەروەرترین ئەسپە مرۆڤ) فێری بووە. چونکە جووتە پزیشکەکەی ئێمە، بودالیروس و ماکایون، وەکو بیستوومە یەکێکیان زامدارە و لە سەراپەردەکەی خۆیدا کەوتووە و خۆی پێویستی بەدکتۆرودەوا ودەرمانە، وئەوی تریشیان لە دەشتەکەدایە و لەشەڕی بەرگریدا ڕووبەڕووی تەروادەییەکان وەستاوە.

(٨٣٧) کوڕی دلاوەری مینویتیوس وەڵامی دایەوە: "باشە چۆن دەبێ ئەم شتانە ڕوو بدەن؟ ئەدی تەگبیرمان چییە ئەی یوریبیلوسی قارەمان؟ من بەرێوەم بۆ لای ئەخیل، و پەیامێکی نەستوری جیرینایی، قەڵا و سەنگەر، یارویاوەری ئاخییانم پێیە بۆی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا بەم حاڵە خەتەرەوە بەجێت ناهێڵم.

(٨٤٢) ئەو قسەیەی کرد و ناو قەدی گرت و بەرەو سەراپەردەکەی برد. کە خوڵامەکەی بینینی بەپەلە کەوڵەگایەکی بۆ ڕاخست، تا لەسەری پاڵ بکەوێ. پاترۆکلوس، یوریبیلوسی لەسەر پاڵخست. بەچەقۆیەکی تیژ ڕانی شەق کرد و تیرە تیژەکەی کە کەسیرە و بێتاقەتی کردبوو، لێ دەرهێنا، بەئاوی شیرتێن ئەو خوێنە ڕەشەی لە برینەکەی دەڕۆیی، شت، ئەوجا ڕەگی گیایەکی تاڵی ئازار شکێنی بەدەستی خۆی کوتی و نایە سەر برینەکەی، ئەم دەرمانە ئازارەکەی نەهێشت.زامەکەی وشك بوو وخوێنەکەی وەستایەوە.

# سروودی دوانزەیەم

## هیکتۆر پەلاماری دیوارەکە دەدا

**حیکایەتەکە:**

**شەڕ لەنێوان تەروادەیی و ئاخییەکاندا گەرم بوو. هیکتۆر توانی ئاخییەکان بەزێنێ و لە دیوارەکە ئاودیویان بکات. بولیداماس پێشنیازی بۆ هیکتۆر کرد کە بەپیادە پەلاماری دژمن بدەن، گوتی ئەگەر پاشەکشە بکەن و بگەڕێنەوە کەس نابێ بگاتە شار و هەواڵ و باسان بەرێ. بۆیە دەبێ بەبێ عارەبانە و ئەسپان پێشڕەوی بکەن. بولیداماس بەو جۆرە قسەی کرد و هیکتۆر زۆری کەیف بەقسەکانی هات، بەهەموو تاقم و ئەسلەحەکەیەوە خۆی هەڵدایە سەر زەوی، کە تەروادەییەکانی دیکە ئەویان بەو ئاوایە بینی ئەوانیش چاویان لەوکرد. هەر کەسە و گالیسکەکەی خۆی دایە دەست میرئاخوڕەکەی تا ڕێکی بخات و بەریز ڕایبگرن و ئامادە بێ. ئیدی هێرشیان برد و دلێرییەکی زۆریان نواند. بەڵام داڵێکیان بینی کە بەچنگ مارێکی هەڵگرتبوو، مارەپێچی کردەوە وبەرەودوا هەڵگەڕایەوە و پێوەی دا، داڵەکە مارەکەی بەردایەوە و لەنێو ئاپۆڕەی تەروادەییەکاندا کەوتەوە، بولیداماس ترسا و بەهیکتۆری گوت، هەرچەندە لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەندا، بەهەق و بەناهەق سەرزەنشتی دەکات، هەرچەندە هەق نییە قسە لە قسەی ئەودا بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئەم قسەی دڵی خۆی دەکات، بولیداماس پێی وابوو ئەم ڕووداوە نیشانەیەکی زیوسە و بۆ ئەوانی ناردووە تا پاشەکشە بکەن. بەڵام هیکتۆر وەڵامی دایەوەو گوتی: "تۆ داوام لێدەکەی لە ڕێگەی باڵندەیەکی کێوییەوە حوکم بدە. چ دەبێ ئەگەر ئەم تەیرە بەیانی بفرێ یان ئێوارە، ئەگەر بەلای چەپما بڕوات یان بەلای ڕاستما؟ با بە گوێی ئاموچیاری زیوسی مەزن، سەرداری بەشەر و خواوەندان بکەین و متمانە بەو بکەین. تەنیا یەك نیشانە هەیە و بەس، ئەویش ئەوەیە پیاو لە پێناوی وڵاتی خۆیدا بخەبتێ. تۆ بۆچی**

ئەوەندە دەترسیت؟ ئەگەر هەر هەموومان لای کەشتی ئاخیەکان بکوژرێین، ئەوا تۆی تیانیت، تۆ ناکوژرێیت، چونکە نە پابەندی و نەئازایت. ئەگەر حەز دەکەی شەڕ مەکە، بەڵام ئەگەر ئەوانی دی بۆ شەڕ نەکردن هان بدەیت و ساردیان بکەیتەوە، دڵنیابە لەڕمی من ناخەلەسیت." شەڕ بەردەوام بوو، خەڵکانێکی ئازا و قارەمان دەرکەوتن و ناویان دەرکرد لە گریکەکان برایانی ئاجاکس (ئەجاکس و برایەکی لەبابی تیوسیر) دەرکەوتن، لە تەروادەییەکانیش ساربیدون و گلوکوس دەرکەوتن. گلوکوس زامدار بوو و پاشەکشەی کرد و ساربیدون مایەوە. لێرەدا هیکتۆر بەشێوەیەکی قارەمانانەی بێ وێنە پریدایە قفڵی دەروازەکان، دەروازەیەکی لەباری هەڵبژارد، بەردێکی هەڵگرت کە بەدوو گەنج هەڵنەدەگیرا، توانی دەرگاکەی پێ لەق بکات، پاشان بەبەردێکی گەورە و قورس قفڵەکانی شکاند، کەلێنێکی تەنگی بۆ وەژوور کەوتنی تەروادەییەکان کردەوە. بەدرێژایی ئەم پشتێنەیە شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. کوشتارێکی زۆر لە هەردوولا کرا. بەڵام تای تەرازووی سەرکەوتن بەلای تەروادەییەکاندا قورس بوو، چونکە ویستی زیوس وابوو.پاشەکشەی گریکەکان بۆلای کەشتییەکانیان لە سەرەتادا خاو بوو، هەر کەسێکیان کە دەسوڕایەوە و پشتی دەکەوتە دژمن یەکسەر دەپێکرا و دەکەوت، هەنگێ خۆیان گورج کردەوە تا پەنا وەبەر کەشتییەکانیان بەرن و خۆیان قوتار بکەن.

زەمەن:

ڕووداوەکان، بەگوێرەی تەقویمی هۆمەر لە ڕیزبەندی داستانەکەیدا، لە ڕۆژی بیست و هەشتەمین ڕوودەدەن.

شوێن:

ڕووداوەکان لەبەردەم حەسارەکەدا (دیوار) ڕوو دەدەن، جەنگاوەرەکان لە عەرەبانەکانیان دادەبەزن، هیکتۆری مەزن کەلێنێکیان بۆ دەکاتەوە، لێوەی دەچنە ژوورەوەو ئاخییەکان بەرەو کەشتییەکانیان ڕاو دەنەن.

(٢٨) ئەو کاتەدا کە کوڕە دلاوەرەکەی مینویتیوس، یوریپیلوسی زامداری لە خێوەتەکەیدا دەرمان و تیمار دەکرد، ئارگوس و تەروادەییەکان بەربووبوونە یەکدی و شەڕیان دەکرد. نە خەنەكو نە دیوارە بەرزەکەی دانابیەکان، ڕێگەیان لە هێرشی تەروادەییەکان نەدەگرت. ئەم دیوارەیان بۆیە دروست کردبوو تا کەشتییەکانیان بپارێزێ، و خەنەکەکەشیان بۆیە لە دەوری هەڵکەند بوو تا هەم کەشتییەکانیان و هەم تالآنی و دەسکەوتی سەر کەشتییەکانیان بپارێزێ. بەڵام کە ئەم کارەیان کردبوو قوربانی گەورەیان (قوربانی سەد سەر) بۆ خواوەندان نەکردبوو. بەم پێیە بەبێ ڕەزامەندی خواوەندان دروست کرابوو، بۆیە مەحاڵ بوو ئەو دیوارە تاماوەیەکی زۆر خۆی بەپێوە بگرێ. تا ئەو زەمانەی کە هیکتۆر زندوو بوو، و تا ئەو زەمانەی ئەخیل توڕە و تۆراو بوو، و شارەکەی شا پریام لە شوێنی خۆی بوو و وێران نەکرابوو، دیوارە مەزنەکەی ئاخییەکانیش پایەدار بوو. بەڵام کاتێ کە هەموو جەنگاوەرە دلێرەکانی تەروادە کوژران، گەلێك لە ئارگوسییەکان بەدەستی دژمن کوژران و هەندێکیان ڕزگاربوون، شاری تەروادە لە ئاخر و ئۆخریساڵی دەیەمدا تالآن و وێران کرا،. ئارگۆسییەکان جارێکی دی سواری کەشتییەکانیان بوون و بەرەو وڵاتی ئازیزی خۆ زڤرینەوە.. هەنگینێ پوسیدون و ئەپولۆ هاتنە سەر ئەوەی ڕووی هەموو ڕووبارە خوڕەکان بکەنە ئەو دیوارە و وێرانی بکەن، هەموو ئەو ڕووبارانەی لە کۆجارەکانی ئیداوە بەرەو دەریا دەکشێن؛ واتە ڕوبارانی: ریسوس، هیپاتابوروس، کاریسوس، رودیوس، و گرینیکوس و ئیسوپوس و سکاماندروس و سیمویس، ئەو ڕوبارانەی کە گەلەك قەڵغانی چەرمین، کێوخودی فرەو جەنگاوەرانی بێ شوماری بەرەچەڵەك نیمچە خواوەندان، لە کەنارییاندا کەوتبوونە سەر زەوی وژێر گڵ، ئەپولۆ بۆ ماوەی نۆ ڕۆژان ئاوەڕۆی هەر هەموو ئەو ڕوبارە خوڕانەی ئاڕاستەی ئەو دیوارە کرد. (زیوس)ش هاوکات بارانی لە پەستاوی دەباراند تا هەرچی زووترە ئەو دیوارە بڕوخێنێ و بەرەو دەریا ڕایماڵێت. پوسیدون بەخۆیشی، سێ لقەیەکی بەدەستەوە گرتبوو، و کەوتبووە وێزەی دیوارەکە و هەر هەموو ئەو دار و بەردەی ئاخییەکان پێوەی ماندوو بوو بوون و کردبوویان بەو دیوارە، هەر هەمووی بەرەو دەریا ڕاماڵی.

(٢٩) هەر شتێك لە کەناری ڕوباری بەخوڕی هیلیسبونت بوو هەر هەمووی پاك کردەوە و لەگەڵ زەویدا تەخت و هەمواری کرد. دیوارەکە لە بەین چوو، کەناری ڕوبارەکە پڕ لە لم و خیز بوو، ئەوجا ڕوبارەکانی بۆ ئاوەڕۆکانی خۆیان گەڕاندەوە.

(١٤) ئەمە بڕیار و نەخشەی ئایندەی پوسیدون و ئەپۆلۆ بوو. بەڵام ئێستا ئاگری شەڕو هەرا و زەنای جەنگ لە دەوری ئەم دیوارە مکومەدا بڵێسەی دەسەند و پشتیوانەی دیوارەکە لەژێر ئەو جەزرەبانەدا کە پێی دەکەوت دەنگی دەدایەوە.

ئارگوسییەکان، کە قامچی زیوس زراوی بردبوون، لە ترسی هیکتۆر خزابوونە ناو کەشتییەکانیان، ئەو هیکتۆرەی کە وەکو جاران، بەوپەڕی هێزەوە دەجەنگی ولە تۆ وایە زریان و باهۆزێکی هاروژاوە. وەکو چۆن شێرێك یان بەرازە کێوییەك لەنێو ئاپۆرەی کۆمەڵێك ڕاوچی و تاژیدا ڕقی هەڵدەستێ و لێیان دەگەڕێتەوە، و ڕاوچییەکان وەکو دیوار لەبەردەمیا ڕیز دەبەستن و پەیتا پەیتا نێزەی دەهاوێ، بەڵام دڵی ترس نەناسی ئەو درندەیە نەدەترسێت ونەبیر لە هەڵاتن دەکاتەوە، بەڵام دەزانێ چارەنووسی هەر مەرگە. بۆیە هەندێ جار دەگەڕێتەوە و هەوڵدەدات بەتۆبزی ڕیزی شکارچییەکان بشکێنێ، و پەلاماریان دەدات و لەگەڵ هەر پەلامارێکیا ڕاوچییەکان پاشەکشەیەك دەکەن، بەڵا هیکتۆریش بەو ئاوایە خۆی پەلاماری دەدا و داوای لە جەنگاوەرەکانی دەکرد کە لە خەنەکەکە بپەڕنەوە.

(٥٠) بەڵام ئەسپەکان نەدەوێران بپەڕنەوە وبەدیار خەرەندەکەوە دەوەستان و بەدەنگی بەرز دەیانحیلاند، چونکە خەرەندەکە زۆر پان بوو، و بازدان بەسەریا کارێکی ئاسان نەبوو، چونکە ئەم بەرو ئەوبەری و سەرانسەری هەوراز و هەڵدێربوو، و سنگێکی زۆر و چڕیان لەم بەر و لەوبەری خەرەندەکە داکوتا بوو، ئاخییەکان ئەم سنگانەیان بۆ بەرگری لەخۆ داکوتبا، بۆیە ئەسپ بەعەرەبانەوە نەیدەتوانی بپەڕێتەوە. بەڵام پیادەکان هەوڵیان دەدا بپەڕنەوە. هەنگێ بولیداماس چوو بۆلای هیکتۆر و گوتی: "ئەی هیکتۆر، ئەی فەرماندەکانی دیکەی تەروادەییان و هاوپەیمانان! ئەوپەڕی شێتییە ئێمە هەوڵبدەین ئەسپەکانمان بەعەرەبانەکانەوە لەم خەرەندە بپەڕێنینەوە، پەڕینەوە دژوارە، چونکە ئەمبەر و ئەبەری یەکپارچە سینگی تیژە پشتەوەی دیوارە، بۆیە ناکرێت بەعارەبانەوە لێی بپەڕینەوە، ئەمە کارێکی نەکردە نییە، ئەمە جگە لەوەی کە شوێنەکە زۆر تەنگە و پێم وایە بەخۆرایی خۆمان ئەزیەت دەدەین و خۆمان دەخەینە تالوکەوە. ئەگەر زیوس، زیوسی دەنگ بەرز چوون هەورە بروسکە، سوورە لەسەر لەناوبردنی دژمنەکانمان و بەنیازە کۆمەکی تەروادەییەکان بکات،

(٦٩) ئەوا لە هەمووان زیاترم پێ خۆشە بەزووترین کات ئەم خواستەی خۆی بەدی

بینی، زۆر شادمان دەبم بەچاوی خۆم ئاخییەکان بدینم هەر ئێستا ودوور لە وڵاتی ئارگۆس بەبێ ناوونیشان مەحو ببنەوە. بەڵام ئەگەر هەڵگەڕانەوە ولێمان هاتنە دەست ولە کەشتییەکانیان دوورخستینەوە، وکەوتینە داوی ئەو خەرەندەوە، پێم وایە تاقە زەلامێکمان لێ دەرناچێت کە بتوانێ ئەم هەواڵە بۆ شار بەرێتەوە. وەرن بەگوێی من بکەن و با هاوڕێ ومیرئاخورەکانمان ئەسپەکان لە قەراخی خەرەندەکە ڕابگرن و ئێمەش هەموو سەراپا چەکدار، تێکرا بەپای پیادە شوێنی هیکتۆر بکەوین، ئەگەر ئەوە ڕاست بێ کە ئەمڕۆ ڕۆژی کۆتایی ئاخییەکانە، ئەوا خۆیان لەبەرمان ناگرن و بەرەنگارمان نابنەوە."

(٨٠) پولیداماس قسەی خۆی کرد. هیکتۆر بەتەگبیرەکەی زۆر خۆشحاڵ بوو. یەکسەر بەتاقم و تەدارەکی جەنگەوە خۆی لە عەرەبانەکەی هەڵدایە خوارەوە. تەروادەییەکانی دیکەش کە ئەویان بینی، چاویان لێکرد و لە عەرەبانەکانیان دابەزین. هەموویان عەرەبانەکانیان بەمیرئاخورەکانیان سپارد وداوایان لێکردن عەرەبانەکان بەرێکو پێکی و بەریز لە ڕەخی خەرەندەکە ڕابگرن و چاوەڕوانیان بکەن. ئەوجا جەنگاوەرەکان بەسەر پێنج هێزدا دابەش بوون،و ڕیزیان بەست و هەر هێزێك تۆزێ دوورتر لە هێزەکانی دی دوای فەرماندەکانیان کەوتن. ئەوانەی لە ژێر فەرماندەیی هیکتۆر و (پولیداماس)ی بێ وێنەدا بوون هەم ژمارەیان زۆرتر بوو هەم ئازاترین جەنگاوەرانی لەشکرەکە بوون، خوا خوایان بوو لە دیوارەکە تێبپەڕن وشەڕ ببەنە بەردەم کەشتییەکان، سیبریون وەکو فەرماندەی سێیەم بەگەڵیان کەوت، چونکە هیکتۆر عارەبانەکەی بەجەنگاوەرێکی کەم جورئەت تر لە سیبریون سپاردبوو. هێزی دووەم بەفەرماندەیی پاریس، ئالکانوس و ئاجینور بوو، هێزی سێیەم بەڕابەرایەتی هیلینوس و دیفوبوس، کوڕانی پریام بوو، وئەم جووتە برایە فەرماندەیەکی دیکەشیان لەگەڵدا بوو، ئەویش ئاسیوسی قارەمان بوو، ئاسیوس کوڕی هیرتاکوس بوو، کە بەئەسپە ڕەشە ڕەسەنەکانی کە لە کەناری ڕوباری سیلیسدا پەروەردە بوو بوون لە (ئەریسبی)یەوە بۆ مەیدانی شەڕ هاتبوو. ئینیاسی کوڕی ئەنخیس، لەگەڵ ئارخیلوخوس و ئاکاماس)ی کوڕانی ئەنتینور، کە هەردووکیان زۆر شارەزای فەند و فێڵی جەنگ بوون، ڕابەرایەتی هێزی چوارەمی دەکرد. (سارپیدون)ش ڕابەرایەتی هێزی هاوپەیمانە دلێرەکانی دەکرد و دوو هاورێشی بۆ خۆی هەڵبژارد کە پێی وابو دوای خۆی ئازاترین جەنگاوەری هێزەکەن، ئەوانیش گلاوکوس و ئەستیروپایوس)ی دلاوەر بوو. دوای ئەوەی هەموو خۆیان دایە پەنا قەڵغانەکانیان کە لە چەرمی گا دروست

دڕابوون، دەستیان بەهێرش بۆ سەر دانابییەکان کرد، پێیان وابوو کە دژمن خۆی ڕاناگرێت وهەر ئێستا تەفر و تونایان دەکەن و لە کەناری کەشتییەکانیاندا تیا دەچێت.

(١٠٨) بەڵآ، هەموو تەروادەییەکان و هاوپەیمانەکانیان کە لە دوورەوە هاتبوون، یەکسەر بەگوێی (پولیداماس)یان کرد، تەنیا ئاسیوسی کوڕی هیرتاکۆس نەبێ، کە نەیویست عارەبانە و ئەسپەکانی ومیرئاخورەکەی لەوێ بەجێبهێڵێ. بەڵکو بەوانەوە بەرەو کەشتییەکان پێشڕەوی کرد —چەند گەوج بوو!- غافڵ بوو لەوەی کە جارێکی دیکە لە تالوکە دەرباز نابێ و ناتوانێ بەکەش وفشەوە بەسواری عەرەبانە و ئەسپەوە بۆ تەروادە بگەڕێتەوە. بەڵآ وادیارە بەر لەوەی فریای گەڕانەوە بکەوێ، قەدەری شووم پێشوەختە ئەوەی لە چارەنووسی بوو کە بەنێزەی (ئیدومینیوس)ی کوڕی دیوکالیون بکوژرێ، ئەوە بوو ڕووی کردە لای چەپی کەشتییەکان، واتە ڕووی کردە ئەو شوێنەی کە ئاخییەکان بەخۆ و بەعەرەبانەکانیانەوە بەپەلە پڕوزێ لە دەشتەکەوە دەگەڕانەوە بۆلای کەشتییەکانیان، عەرەبانە و ئەسپەکانی بەرەو ئەوێندەر هاژۆت، تا گەییە دەروازەکان، سەیری کرد لەسە گازی پشتن و کێلون نەدراون، بەڵکو دەرگاوانەکان خستبویاننە سەر پشت، بەڵکو بتوانن جەنگاوەرەکانی هاوڕێیان، ئەوانەی لە شەڕەگەکەوە بەرەو کەشتییەکان هەڵدەهاتن ڕزگار بکەن، بەڵآ ئاسیوس کە گیرۆدەی جۆش و خرۆشی خۆی بوو بوو، بەرەو ئەوێندەر ئەسپەکانی تاودا، جەنگاوەرەکانیشی بەهەمان جۆش و خرۆشەوە دووی کەوتبوون و بەدەنگی بەز لە نەعرەتەیان دەدا، چونکە ئەو خەیاڵ خاوانە لە دڵی خۆدا دەیانگوت کە ئاخییەکان لەبەریان ناوەستن و لەنێو کەشتیەکانیاندا تیا دەچن. نەیاندەزانی کە لە بەر دەروازەکاندا ڕووبەڕووی ئازاترین جووتە جەنگاوەری لاپیتیانی شەڕکەری ڕمباز دەبنەوە، کە یەکێکیان پولیپوتیسی کوڕی بیرتیوس بوو، و ئەوی تریان (لیونتیوس)ی هاوتای ئێریسی خواوەندی جەنگ و بەڵای گیانی بەشەری فانی بوو. ئەم جووتە لەبەردەم دەروازەکاندا وەستان، وەکو چۆن دوو دار بەڕووی بەرزی پڕ لق و پۆپی سەرکۆجاران ڕۆژ بەڕۆژ وساڵ بەساڵ زیاتر خۆڵە بەر باو بۆران ڕادەگرن، چونکە ڕەگیان بەقوڵی لە خاکدا داکوتاوە، ئەو جووتەش بەهەمان شێوە، پشت بەهێز و بازووی خۆیان چاوەڕوانی هێرشی ئاسیوس بوون و لە جێی خۆ نەدەبزوان. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، تەروادەییەکان سپەرە چەرمینەکانیان بەرز کردبووەوە و یەکراست بەرەو دیوارە مکومەکە دەڕۆیشتن و پێشڕەوییان دەکرد. لەدەوری پاشایان (فەرماندە)

ئاسیوس، ئیدامینوس و ئوریستیس و ئەداماسی کوڕی ئاسیوس، تویون، ئوینوماس خڕ بوونەوە و هورایان دەکێشا و نەعرەتەیان لێدەدا. بەڵام ئەو دوو جەنگاوەرەی لاپیت تا ماوەیەکی زۆر لەودیو دیوارەکەدا مانەوە و ئاخییەکانیان هاندەدا کە بەرگری لە کەشتییەکانیان بکەن. بەڵام کاتێ کە دیتیان تەروادەییەکان بەرەو دیوارەکە هێرش دێنن و داناییەکان هەڵدێن و هاوار دەکەن، هەردووکیان لە دەروازەکەوە وەدەرکەوتن و ڕووبەڕووی تەروادەییەکان وەستان و کەوتنە شەڕ، وەکو چۆن دوو بەرازە کێوی کە لە ناوەندی بێشە و کۆجارێکدا لەلایەن کۆمەڵێك ڕاوچی و تاژییەوە دەورە بدرێن، و خۆ بەدار و بەردا دەدەن و دار و درەختەکەی دەوروبەریان تێکدەشکێنن و درەختەکان لە ڕەگو ڕیشەوە دەردێنن،

(١٤٩) جیرەجیری کەڵبە و ددانە تیژەکانیان سەعاتە ڕێیەك دەڕوات، وتا ڕاوچییەك فرسەتیان لێ دێنێ و بەجەزرەبەیەك گیانیان دەستێنێ، بەو ئاوایە دەنگێکی تیژ لە سینەبەندە برونزییەکانی ئەم دوو جەنگاوەرەوە کە ڕووبەڕوی‌و دژمن وەستا بوون و سینگیان دەدایە بەر جەزرەبەی وان، هەڵدەستا. ئەم جووتە ،دلاوەرانە و پشت بەو جەنگاوەرانەی سەردیوارەکە و پشت بەهێزی بازووی خۆیان دەجەنگین. جەنگاوەرانی ئاخیایی لەسەر دیوار و بورجە قایمەکانەوە، بۆ ئەوەی هەم بەرگری لەخۆ بکەن و هەم خێوەت و کەشتییە خۆشبەزەکانیان پاس بکەن،بەردیان داویشت. وەکو چۆن زریان و باهۆزێکی تووش چرە هەوران ڕاماڵێ و بەئاسماندا پەرتی بکات و ببێ بەتەرزە و بەلەز بەسەر عاردیدا داباریێ، بەو ئاوایە بەرد و تیر و نێزان، هەم لەدەستی تەروادەییان و هەم لە دەستی ئاخییەکانەوە دادەباری. وەختێ گابەردان بەر کێوخود وسپەرە قۆقزەکانی هەردوولا دەکەوت، دەبوو بەتەق و هوڕێکی ترسناکی ئەوتۆ ئەوسەری دیار نەبوو. هەنگینێ ئاسیوسی کوڕی هیرتاکوس ناڵاندی و دای بەڕان و ئەژنۆی خۆیدا، و بەبێزارییەوە هاواری کرد: "ئەی باب، ئەی زیوس، بێگومان تۆش ئەهلی درۆیت، پێم وانەبوو کە قارەمانانی ئاخیایی بتوانن خۆ لەبەر هێز و بازووی لەشکان نەهاتووی ئێمە بگرن، کەچی ئەوەتا وەکو زەرگەتانی ناو قەد باریك، یان پورە هەنگێك کە بەقەد پاڵێکی تووشەوە و لەکەناری ڕێگەیەکدا شاریان کرد بێ، شارەکەی خۆیان بەجێ نەهێڵن و بەرگری لە بێچوەکانیان بکەن و دژی ئەو کەسانە بوەستن کە پەلاماریان دەدەن، بەو ئاوایە ئەوانیش، هەرچەندە تەنیا دوو کەسن سوورن لەسەر ئەوەی بەردەروازەکە بەرنەدەن، تا دەکوژرێن هەر بکوژن."

(١٧١) ئەو قسانەی کرد، بەڵام ئەو قسانە ئەقڵی زیوسی نەبزواند، چونکە زیوس لای خۆیەوە لێبڕا بوو کە سەرکەوتن وسەربەرزی هی هیکتۆر بێ! بەهەرحاڵ شەڕ گەرم بوو، هەرکۆمەڵە جەنگاوەرێك لە دەوری دەروازەکەیەوە خەریکی شەڕ بوون، خۆزیا دەمتوانی وەکو خوایەك هەموو ئەو دیمەنانە بگێڕمەوە. ئاگری شەڕ لەهەر چواردەوری دیوارە بەردینەکەوە بڵێسەی دەسەند، ئاگرێك کە خواوەندان هەڵیانگیرساند بوو.. ئارگۆسییەکان بەهەموو خەم و پەژارەیەکیانەوە، خۆیان بەناچار دەزانی بەرگری لە کەشتییەکانیان بکەن. هەموو ئەو خواوەندانەی کە لەناخەوە تەرەفداری ئارگوسییەکانیان دەکرد، خەمبار بوو بوون، بەڵام جووتە لاپیتیانی مەردانە شەڕی خۆیان دەکرد.

(١٨٢) هەنگێ پولیبوتیس، کوڕەی دلاوەرەکەی پیریتوس، نێزەیەکی لە کڵاوخودەکەی داماسوس دا، ئەو کڵاوخودەی کە گۆناپۆشیشی پێوە بوو، کڵاوخودەکە بەرگەی نەگرت، سەرە نێزەکە کونی کرد، ئێسکی سەری بڕی، مێشکی لەناو کڵاوخودەکەدا پژا و داماسوس لە هەڕەتی دلاوەریدا، بەدەم شەڕەوە کوژرا. ئەوجا بیلون و ئورمینوسی کوشت. لینیوسی ئێریس زادە، هیبوماخوسی کوڕی ئەنتیماخۆسی بەسەرە نێزەیەك کوشت، سەرەنێزەیەکی بەکەمەریا کێشا و کوشتی. ئەوجا هەڵیکێشایە شمشێرەکەی و هەڵیکوتایە سەر ئەنتیفاتیس و شمشێرێکی لێدا و بەدەما تەختی سەر زەوی کرد، ئەوجا پڕی دایە مینون و ئیامینوس و ئوریستیس و یەك لەدوای یەك کوشتنی و تەختی سەر عاردی بوون.

(١٩٥) بەڵا لەو دەمانەدا کە ئەو جووتە لاپیتیانییە، خەریکی داماڵینی چەك و تفاقی ئەو قارەمانانە بوون. ئەو جەنگاوەرە لاوانەی کە دوای پولیداماس و هیکتۆر کەوتبوون هێشتا بەدوو دڵی و ڕاڕایی ولە قەراغی خەرەندەکە وەستا بوون، ئەوانە زۆرترین و دلاوەرترین جەنگاوەرنی تەروادەیی بوون کە بەپەرۆشەوە بوون لە دیوارەکە تێپەڕن و کەشتییەکان ئاگر بدەن، ئەمانە لە نزیکی خەرەندەکە وەستابوون ونەیاندەزانی چ بکەن، چونکە لەو دەمەدا کە دەیانویست لە خەرەندەکە بپەڕنەوە هێمایەکی ئاسمانیان بینی بوو—داڵێکیان لە دوورەوە بینی بوو کە بەرەو ئەوان هاتبوو. ئەم داڵە بەلای چەپی سوپاکەیاندا فری بوو و بەسەر سوپاکەدا تێپەڕی بوو. ئەم داڵە مارێکی ئەستوری سوری وەك خوێنی بەچنگ هەڵگرتبوو، مارەکە هێشتا ڕوحی تیا مابوو و لە جموجوڵدا بوو، خۆی هەڵدەسوڕاند تا وەزن بکات، لەم هەوڵ و تەقەلایەدا بوو کە لە پشتەوە پێچێکی کردەوە ودووجاری

بەدالەکەوە دا، جارێك بەملییەوە و جارێك بەسینگییەوە، داڵەکە لەتاو ئازاری خۆی مارەکەی بەردایەوە وکەوتە ناوەڕاستی ئاپۆرەی جەنگاوەرەکان. داڵەکە قیژەیەکی تیژی کرد وخۆی دایە دەم باوە، تەروادەییەکان بەدیتنی ئەو مارە خۆش خەت وخاڵە، بەو ئافەریدە سەیرەی زیوسی خواوەندی سپەروەر، کە لە ناوەڕاستیاندا کەوتبووەوە، ترسیان لێنیشت. پولیداماس چوو بۆلای هیکتۆری بێ پەروا و بێباك وگوتی: "ئەی هیکتۆر، نازانم بۆچی هەمیشە لە ئەنجومەنی ڕاوێژکاریدا، یا لە ئەنجومەنی جەنگیدا، ئەگەر ڕاوبۆچوونی دلسۆزانەو دروستیش دەربڕم هەر پێت ناخۆشە و سەرزەنشتم دەکەی؟ چونکە پێت وایە هیچ کەسێك چ لە ئەنجومەن و چ لە مەیدانی شەڕدا بۆی نییە قسە لەقسەی تۆدا بکات، بەڵکو دەبێ هەمیشە پشتیوانی تۆ بێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا من ئەمڕۆ بەمەسڵەحەتی دەزانم و قسەی خۆمت پێ دەڵێم؛ با نەچینە سەر کەشتییەکان ولەوێ شەڕی داناییەکان نەکەین. چونکە پێم وایە ئەنجامی شەڕەکە بەمجۆرە دەبێت، لە کاتێکا تەروادەییەکان پەرۆشی ئەوە بوون لە خەرەندەکە بپەڕنەوە، ئەو داڵە بەسەر سەریانەوە دەرکەوت، داڵێکی بەرزە فڕ، لەلای چەپەوە بەسەر سوپاکەدا تێپەڕی. مارێکی ئەستور چوون خوێنی هێشتا زندووی بەچنگ هەڵگرتبوو، بەڵام داڵەکە بەر لەوەی بگاتەوە هێلانەکەی، مارەکەی بەناچاری بەرداوەتەوە و بەو ئاواتە نەگەییوە کە بیبات و بیدات بەبێچوەکانی- ئێمەش هەمان شتمان بەسەر دێت.

(٢٢٤) ئەگەرچی دەتوانین بەزەبری هێز و بازوو دەروازەکان بشکێنین، دیواری ئاخییەکان بڕوخێنین، ئاخییەکان ناچار بکەین پاشەکشە بکەن، بەڵام ناتوانین بەرێك و پێکی بەهەمان ڕێگەدا بگەڕێینەوە، بەڵکو زۆر تەروادەیی لەدوای خۆ بەجێدێڵن کە ئاخییەکان بەزەبری نێزەی برونزی دەیانکوژن، ئەو ئاخیانەی بەرگری لە کەشتییەکانیان دەکەن. هەر پێشگۆیەك شارەزای لێکدانەوەی ڕازە ئاسمانییەکان بێ، واهی شرۆڤەی ئەم ڕووداوە دەکات و خەڵکیش متمانەی پێدەکەن.

(٢٣٠) هیکتۆر مۆرەیەکی لێکرد و گوتی: "بولیداماس، ئەم تێڕوانینەی تۆم. بەدڵ نییە، ئەگەر بتەوێ تێڕوانین و خوێندنەوەی لەمە باشتر هەیە. خۆ ئەگەر ئەم قسەیەت بەڕاستی و بەجددی بێ مانای وایە خواوەندان ئەقڵیان تێکداوی، چونکە من وای دەبینم کە تۆ داوام لێدەکەی ئامۆژگاری وبەڵێنەکانی زیوسی خواوەندی بروسکە و چەخماخە وهەنگامە ئەنگێز، ئەو بەڵێنەی بەخۆی دایمێ و سەری ڕەزامەندی بۆ جێبەجێکردنی لەقاند، لەبیر

بەڵام تۆ داوام لێدەکەی باوەڕ بەداڵاشانی باڵ درێژبکەم، کە نەدەمەوێ بیریان لێبکەمەوە، بەکەمترین نیگەرانی و ترسم لێیان هەبێ، بەڵامەوە یەکسانە بەلای ڕاستا بەرەو سپێدە و هەتاو بفڕێ یان بەلای چەپدا و بەرەو تاریکی و خۆرئاوا بفڕێت. ئێمە دەبێ پابەندی گوێڕایەڵی ئامۆژگاری و بەڵێنەکانی زیوسی مەزن، سەرداری هەموو بەشەرێن فانی و هەموو نەمران بین. باشترین فاڵ و تێڕوانی ئەوەیە مرۆڤ لە پێناوی وڵاتی خۆیدا بخەبتێ. نازانم بۆچی تۆ لەشەڕ و کوشتار دەترسیت؟... تەنانەت گەر قەرار وابێ هەر هەموومان لە دەوروبەری کەشتی ئاخییەکان بکوژرێین، ئەوا تۆی تیانیت، چونکە تۆ پیاوی کوشت و کوشتار نیت و زاتی شەڕت نییە و تا هەڵاتن وەستا بێ... ئەگەر حەزدەکەیت شەڕ مەکە، بەڵام ئەگەر هەر جەنگاوەرێکی دی لەشەڕ سارد بکەیەوە، ئەوا ڕاستە و ڕاست پێت دەڵێم کە دەبی بەتێشوی نێزەی من و لە مردن ناخەلەسی."

(٢٥١) هیکتۆر ئەو قسانەی کرد وکەوتە پێشڕەوی، تەڕوادەییەکان بەدەم هورا وهەرایەکی سەیرەوە دوای کەوتن. زیوسی بروسکە بەدەست، لە لوتکەکانی ئیداوە باهۆزێکی هەڵکرد مەپرسە، تۆز و بایەکی چڕ سەری کەشتییەکانی گرت، بەم کارەی دڵی ئاخییەکانی سارد کردەوەو لە جۆش و خرۆشی خستن. سەرفرازی وشکۆ و سەرکەوتنی بەهیکتۆر و تەڕوادەییەکان بەخشی، ئیدی تەڕوادەییەکان بەپشتیوانی هێما ئاینی و سەیرەکانی زیوس و بەپشتیوانی هێز و بازووی خۆ کەوتنە هەوڵ وتەقەللای ئەوەی کە دیوارە مەزنەکەی ئاخییان بشکێنن وبڕوخێنن. سنگەکانیان دەرهێنا، کۆڵەکەکانی بورجەکەیان لەقاند، ئەو کۆڵەکانەی کە ئاخییەکان کردبوویان بەپشتیوانەی دیوارەکە. تەڕوادەییەکان ئەم کۆڵەکانەیان بەرەو لای خۆ ڕادەکێشا بەو ئومێدەی بەم شێوەیە بورجەکە دەڕوخێت. بەڵام داناییەکان بەم حاڵەشەوە هەر دەست بەردار نەدەبوون، بەسپەرە چەرمینەکانیانەوە سەنگەریان گرت، و کە تەڕوادەییەکان بە بن دیوارەکەدا دەهاتنە پێشێ، بارانی تیر و نێزەیان بەسەردا دەباراندن.

(٢٦٥) برایانی ئەجاکس بەدرێژایی دیوارەکەدا دەهاتن و دەچوون، خۆیان بەهەموو شوێنێکدا دەکرد، جەنگاوەرەکانیان هاندەدا و ورەی ئاخییەکانیان بەرز دەکردەوە. بەقسەی خۆش و ستایش دڵی جەنگاوەرەکانیان بەدەست دێنا و ئەگەر یەکێکیان بدیبوایە کە دەیەوێ خۆی بدزێتەوە وشەڕ نەکات، دەکەوتنە سەرزەنشتی ودەیانگوت: "ئەی دۆستانی گریکی، ئەمڕۆ بۆ هەمووان ڕۆژی کار و هیمەتە، بۆ ناوداران و دلاوەرانی

ئارگوسی، هەروەها بۆ ئەوانەی لەڕیزی دووەما دێن، و تەنانەت بۆ ئەوانەش کە لەو دوو پلەیە کەمترن، چونکە بەخۆتان دەزانن پیاوان لە جەنگدا، لەیەك ئاست و تواناادا نین. کەواتە هیچ کەسێك، لە نەعرەتەی ترس ئەنگێز و سامناکی جەنگاوەرانی تەروادەیی نەترسێت و پاشەکشە نەکات و بۆلای کەشتییەکان نەگەڕێتەوە، هەموو پێکەوە، یەك دەست و یەك دەنگ، یەکتر هانبدەن و بەرەو پێش هێرش بەرن، بەو ئومێدەی زیوسی ئۆلەمپی، خواوەندی بروسکە بەدەست، بەهاناتانەوە بێت، و هێز و توانای ئەوەمان بداتێ بەرپەرچی دژمن بدەینەوەو بەرەو شاریان بکەینەوە."

(٢٧٧) ئا بەو جۆرە برایانی ئەجاکس بەبانگ و هاوار ئاگری شەڕی ئاخییەکانیان خۆش کرد، وەکو چۆن لە ڕۆژێکی زستاندا گلێرە وتەرزە بەباوە دەبارێ، کاتێ کە زیوسی بەردەبار، دەیەوێ تیری خۆی بۆ بەشەران بنوێنێ—جڵەوی بایان بەر دەدات، بەبەردەوامی تەرزە و گلێران دا دەکات، تا لوتکە بەرزەکانی کۆجاران و هەردە و باسکان، دەشتی سەوزەزاری بەپیت و بەرەکەتی داچێنراوی دەستی بەشەران دادەپۆشێت، ئەوجا بایەکەی دەخات و بەفر لە بەندەران و کەناری دەریا دەکەوێ، شەپۆل خۆی پێدا دەکێشێت و بۆ دووری ڕادەدات و هەموو شتەکانی دەوروبەر بە باسریشك پڕ دەبێتەوە، ئابەو ئاوایە هەردوولا، تەروادەیی و ئاخییان کەوتبوونە بەردەفرکێ وبەردیان بەسەریەکدیدا دادەباراند و هەراوزەنایەکی سامناك لە دەوری دیوارەکە بەرپا بوو بوو.

(٢٩٠) لەگەڵ ئەوەشدا نە تەروادەییەکان و نە هیکتۆری مەزن تا ئەو کاتە نەیانتوانی دەروازەکان بشکێنن وکەلێن بخەنە دیوارەکە، چونکە هێشتا زیوسی بەردەبار، ساربیدونی کوڕی نەناردبوو، وەکو چۆن شێرێك بەردەبێتە گاگەلێکی سلۆك، بەو ئاوایە بەربێتە گیانی ئارگوسییەکان، بەڵام ساربیدون هەر کە ئیزنی وەرگرت یەکسەر سپەرەخڕەکەی دایە بەردەم خۆی، ئەو سپەرە جوان و بونزییەی کە بەچەکوش کوترابووەوە و هەموار کرابوو، ئەو ئاسنگەرەی کە کوتابوویەوە، ناوەکەی بەچەندین توێی چەرمەگا ئاخنی بوو، بەبزماری زێڕ ئەڵقا و ئەڵق دای کوتابوو.

(٢٩٨) ئەو سپەرەی لە بەردەم خۆیەوە بەرز کردەوەو جووتێ ڕمی بەدەستەوە گرتو کەوتە ڕاوەشاندنیان و ئەوجا سارپیدون وەکو شێرێکی پەروەردەی کۆجاران کە دەمێ بێ بەعەزرەتی گۆشت وراوەوە بێ ملی ڕێگەی گرت، و نەفسی تەمەحکاری هانیدا خۆی بەئاغەڵێکی مکومی پەزاندا بدات وپەلاماری ڕانەکە بدات، با شوانان بەسەگ و

تیرەسەوە لە پاسەوانی ڕان و ئاغەڵەکەدا بن، ئەو هەر نەگەڕێتەوە یا خۆی بەڕانەکەدا دەدات و بەرخێك دەفڕێنێ، یان وەکو قارەمانێکی سەرامەد وپێشەنگ بەڕمی دەستێکی مەعلان دەپێکرێ. بەو ئاوایە ڕوحی سارپیدۆنی نیمچە خواوەند هانی دەدا کە پەلاماری دیوارەکە بدات و سەنگەرەکان تێك بشکێنێ. ئەوجا ڕووی دەمی کردە (گلوکوس)ی کوڕی هیبولوخوس و گوتی: "ئەی گلوکوس، بۆچی لە لیسیادا لە هەموو کەس زیاتر ڕێزی من و تۆ دەگیرێت، باشترین شوێنی خوان بۆ ئێمە دادەنرێ، باشترین خواردن و پڕترین جام لەبەردەم ئێمەدا دادەنەن؟ بۆچی هەموو خەڵکی وەکو خواوەند سەیری ئێمە دەکەن؟ وێڕای هەموو ئەمەش دەڤەرێکی بەرین و پان و پۆڕمان لە کەنارێن ڕوباری ئیکسانتوس هەیە، کە هەر هەمووی ڕەز وبێستان و کێڵگەی گەنمە ،هەر هەمووی هی ئێمەیە، بۆیە دەبێ لە ڕیزی پێشەوەی لیسیاییەکانەوە بجەنگین، تا بەیەکدی بڵێین: "ڕاستە سەرانی ئێمە لە لیسیادا بەرخی قەڵەو دەخۆن، باشترین بادە دەخۆنەوە، بادەی بەلەزەت وەکو هەنگوین، بەڵام لە شەڕو جەنگاوەریشدا دیارو لەبەر چاون، و لە ڕیزی پێشەوەی لیسیاییەکاندا دەجەنگن." ئاە ئەی دۆستی بەڕێز، ئەگەر بە خۆدزینەوە لەم شەڕە، بمان توانیبا لە پیری ومەرگ بخەلەسێین، من هەرگیز لە ڕیزەکانی پێشەوەدا نەدەجەنگیم و ناچار نەدەبووم تۆش بۆ مەیدانی شەڕ بنێرم تا سەرفرازی بدەست بێنی. بەڵام لەبەر ئەوەی مەرگ بەهەزار هەزار شێوە بەسەر سەرمانەوە دەسوڕێتەوە، و هیچ بنیادەمێك نییە بتوانێ خۆی لێیان بدزێتەوە و هەڵێت، کەواتە با بەپێی خۆمان بەرەو پێشەوە بڕۆین، یا پاڵەوانێك بگەیەنینە شۆرەت و سەرفرازی، یان ئێمە ئەو بکوژین و پێی بگەینە شۆرەت و سەرفرازی."

(٣٣٩) ئەو قسانەی کرد و گلوکوس ملی دا، ئەوجا بەجووتە کەوتنە پێشی لەشکرێکی قەوغای لیسیان، مینلستیوسی کوڕی بیتیوس کە چاوی پێیان کەوت هەترەشی چوو، چونکە ئەو جووتە پەیامەرەی وێرانی و بەدبەختی، ڕاستە و ڕاست بەرەو ئەو بەشەی دیوارەکە، کە ئەو پاسەوانی دەکرد، دەهاتن. بەنیگەرانییەوە ڕوانییە سەرانسەری دیواری ئاخییەکان، ئێ بەڵکو یەکێك لە فەرماندەکان بدینێ و هاوڕێکانی لە تالوکە دەرباز بکات. برایانی ئاجاکسی بینی، ئەو جووتەی کە لە کوشت و کوشتار نە تێر دەبوون و نە ماندوو، هەروەها (توسیر)ش کە تۆزێ لەوەپێش لە سەراپەردەکەیەوە بۆ مەیدانی شەڕ هاتبوو، لە نزیکیانەوە وەستا بوو. بەڵام هەراو زەنایەکی وەهابوو ئەگەر بەهەمو هێزی خۆیشییەوە

بانگی کردبان، دەنگی نەیاندەگەییشتێ.تەقو هوڕی پێکادانی سپەر وکێوخود ونێزە وتیژ، دەگەییە کەشکەشانی فەلەك. هەروەها تەق و هوڕی ئەو دەروازانەی کە داخرا بوون وتەروادەییەکان لە بەردەمیا وەستا بوون وهەوڵیان دەدا بیانشکێنن و بەتۆبزی کەلێنێکی تێ بخەن و وەژوور بکەون. بۆیە یەکسەر (توتیس)ی تەتەری بۆلای ئەجاکس نارد و گوتی: "ئەی توتیس-ی مەزن، خێرا برۆ ئەجاکس بانگ بکە، ئەگەر بتوانی هەردوکیان بانگ بکەی باشترە، پێیان بێ فریامان بکەون دەنا هەموو شتێك لێرە هەرەس دێنێ. سەرانی لیسیایی تەواو تەنگیان پێ هەڵچنیوین، ئەمانە لە کۆنەوە بەشەرکەری وشەرڤانی بەناوبانگن. خۆ ئەگەر لەوێش شەڕ گەرمە، بەلای کەمەوە، با ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون بەتەنیا بێتە هیمدادمان، با (تیوسیر)ی کەوانداری زەبەردەستیش لەگەڵ خۆیدا بێنێ.

(٣٥١) قسەکانی ئەوی هەڵگرت و بەڕاکردن بەپەنای دیواری ئاخییەکاندا بۆی دەرچوو. کە گەییە نك جووتە ئاجاکس وەستاو خێرا پێی گوتن: ئەی سەروەرانی لیسیان، کوڕەکەی پیتیوس داواتان لێدەکات کە بچن بۆلای ئەو تا ماوەیەك یارمەتی بدەن. ئەگەر دەتوانن هەردوکتان برۆن باشترە، دەنا کار لەکار دەترازێ و بەو زووانە هەموو شتێك کۆتایی دێت، سەرانی لیسیایی تەواو تەنگیان پێ هەڵچنیوین، ئەوانە هەر لە کۆنەوە شەرڤان و پیاوی مەیدان بوون، خۆ ئەگەر بەخۆیشتان گیرۆدەی شەڕ وشۆڕن، هەرچۆنێك بووە با ئەجاکسی کوڕی تیلامون بێت، با (تیوسیر)ی کەوانداری زەبەردەستیش لەگەڵیا بێت."

(٣٦٤) ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون یەکسەر پەیامەکەی وەرگرت و دەست بەجێ ڕوویکردە کوڕی ئولیوس و گوتی: "تۆ و لیکومیدیسی شێرە پیاو لێرە بمێننەوە و کارێکی وەها بکەن داناییەکان شەڕ بکەن ئەمما شەڕ. من دەچم بۆ ئەوێ و شەڕی لیسیان دەکەم، هەر کە لەشکرەکەمان لە خەتەر خەلەسی و پێویستیان بەیاردەی من نەما بەپەلە بۆ ئێرە دەگەڕێمەوە."

(٣٧٠) ئەجاکسی کوڕی تیلامون ئەوەی گوت و بۆی دەرچوو، تیوسیری باوك براشی لەگەڵیا چوو. (پاندیون)ش لەگەڵیاندا چوو وکەوانە کەمەییەکەی تیوسیری هەڵگرت. بەپەنا دیوارەکەدا ڕۆیشتن و گەییشتنە ئەو شوێنەی کە مینیتیوس بەرگری لێدەکرد، هێزەکەی مینیتیوس شەکەت و ماندوو بوو. سەران و شیرەتکارانی لیسیان وەکو گێژەڵوکەیەکی ڕەش خۆیان بەسەنگەرەکاندا دەدا، لێرەدا تووشی یەکدی بوون و شەڕێکی توند دەستی

پیکرد و نەعرەتەی جەنگ بەرز بووەوە

(٣٧٨) ئەجاکسی کوڕی تیلامون، هەوەڵجار ئیپیکلیسی، جەنگاوەرە ئازاکەی دۆستی سارپیدۆنی کوشت، بەگاشە بەردێکی ناقۆڵای ئەوتۆ، کە پیاوانی ئەم ڕۆژگارە، تەنانەت لە تافی لاوییشدا، بەئاسانی ناتوانن هەڵیگرن. کوشتی. ئەجاکس ئەوبەردەی لە سەنگەرەکانی سەر دیوار و بورجەکانەوە هەڵگرت و تێی سرەواند. و کۆوخودە چوار قوببەییەکەی ئیپیکلیسی ورد و خاش کرد ومێشکی ئەو جەنگاوەرەی پرژاندو وەکو مەلەوانێك خۆی هەڵداتە ئاوەوە، لەو سەرەوە کەوتە خوارەوە و گیانی دەرچوو. بەڵام تیوسێر، کەبینی گلوکۆسی دلاوەری کوڕی هیبولوخوس بێ باکانە هێرشیان بۆ دێنێ،و سەیری کرد بازووی ڕوتەو هیچ زرێیەکی پێوەنییە، نیشانەی لێگر تەوەو برینداری کردو بەمە لە شەڕەکەی دوور خستەوە، گلاوکوس بە دزییەوە خۆی لە دیوارەکەوە هەڵدایە خوارێ، تا نەوەك یەکێك لە ئاخییەکان بە برینداری بیدینێ و بیەوێ بیکوژێ و شانازی و سەرفرازییەك لەسەر حەساوی ئەو بۆ خۆی بەدەست بێنێ. بەڵام ساربیدون هەر کە بینی گلاوکوس لە دیوارەکە خۆی هەڵدایە خوارێ و مەیدانی چۆڵ کرد، زۆر خەمناك بوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ورەی بەرنەداو دەستی لەشەڕ هەڵنەگرت، نێزەیەکی سرەواندە ئەلکماوونی کوڕی نەستور و نێزەکەی پێدا چەقی و ئەوجا نێزەکەی ڕاکێشاو ئەلکماوون بەدەم ڕاکێشانی نێزەکەوە هات و بەسەرسەرا کەوت و تەق وهوڕ لە چەکەمەنییە برونزییەکانی بەرز بووەوە.ئەوسا سارپیدون بەهەردووك دەست لە یەکێك لە سەنگەرەکانی سەر دیوارەکە نەوی، سەنگەرەکە لەژێرەوە هەڵکەندرا، و سەر دیوارەکە هیچی پێوە نەماو کەلێنێك لەبەردەم ئاپۆرەی جەنگاوەرەکاندا کرایەوە.

(٤٠٠) ئەجاکس و تیوسێر هاوزەمان هێرشیان بۆ سارپیدون برد. تیوسێر تیرێکی هاویشتێ بەر بەندی درەخشانی سینەبەندەکەی کەوت. بەڵام زیوس دێوانی مەرگی لە کوڕەکەی دوورخستنەوە، تا لەبەر کەشتییەکاندا نەکوژرێ. هەنگێ ئەجاکس پەلاماری دایێ و نێزەیەکی بەسپەرەکەیدا کێشا، بەڵام سەری نێزەکە سپەرەکەی نەبڕی و نەچووە ژوورەوە، لێ لە هێرش و پەلاماری خست. سارپیدون کەمێك لە سەنگەرەکە دوورکەوتەوە، ئەگەرچی بەتەواوەتی چۆڵی نەکرد، چونکە لە کانگەی دڵەوە بەهومێدی وەدەست هێنانی شکۆ و سەرفرازی بوو. ئەوجا ئاوڕی دایەوەو هاواری لە لیسییەکان کرد و گوتی: "ئەی لیسیان بۆچی ساردبوونەتەوە، کوا دلاوەری و ئازایەتییەکەتان؟

من کەلێنێکم خستووەتە دیوارەکەوە، جا چەند بەهێز و توانابم زەحمەتە بتوانم بەتەنیا ڕێگەتان تالای کەشتییەکان بۆ بکەمەوە. وەرن باپێکەوە هێرش بەرین، تا زیاتر بین، کارەکە ئاسانتر دەبێت."

(٤١٣) لیسییەکان لە سەرزەنشتەکانی پاشاکەیان شەرمەزار بوون و بەتین و تاوێکی زیاترەوە لە دەوری خواوەندو ڕابەرەکەیان خڕبوونەوەو کەوتنە شەڕ. ئارگۆسییەکانیش لەودیوی دیوارەکەوە جەنگاوەرەکانی خۆیان تەیار دەکرد وسەنگەرەکانیان قایم دەکرد. کاری هەردوولایان قورس ودژوار بوو. لیسیان، ئەو جەنگاوەرە بە زەبرانە، دوای ئەوەی کەلێنێکیان خستە دیوارەکە، نەیاندەتوانی ڕێگە بۆلای کەشتییەکان بکەنەوە، نێزەوانانی داناییش نەیاندەتوانی لیسییەکان لەم دیوارە، کە تەواو لێی نزیك بوو بوونەوە، دوور بخەنەوە و بیان ڕەتێنن. بەڵام وەکو چۆن دوو پیاوی ئەندازە بەدەست لەسەر زناك و بەردی نیشانەی بەینی دوو کێڵگەی هاوبەش بەشەڕ دێن و کەسیان دەستبەرداری هەقی خۆیان نابێ و شەڕەکەیان لەسەر بستۆکەیەك زەوییە، ئا بەو جۆرە تەنیا پەنامگەیەك دوو لەشکرەکەی لێکدی جیادەکردەوە. لەسەر ئەم سەنگەر و پەنامگایەوە تیر و نێزەیان بە سپەرێن سەنگین وسینەبەندی یەکتردا دەدا، زۆربوون ئەوانەی کە برونزی دڵڕەق چوو بوو بەجەستەیاندا وبریینداری کردبوون. هەندێ لە جەنگاوەرەکان کە بەدەم شەڕەوە وەرچەرخابوون، لە پشتەوە لێدرابوون و بریندار بووبوون، هەندێکی دیکەش کە ژمارەیان زۆر زیاتر بوو، بەو تیر و نێزانەی کە سپەرەکانی بڕی بوون و لەشی سمی بوون، ئاسیویان پێ گەیی بوو، پەنامگاکە وسەنگەرەکان لە هەموو لایەکەوە خڵتانی خوێن بوون و خوێنیان لێ دەچکا، خوێنی بەشەر، خوێنی جەنگاوەرانی هەردوو لەشکرەکە، تەروادەیی و ئاخییەکان. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، تەروادەییەکان هەرچیان دەکرد ودەکۆشا، نەیاندەتوانی ئاخییەکان بتارێنن و ڕاوبنەن. هەردوو لایان بەرانبەر بەیەکتر وەستا بوون. وەکو چۆن ژنێکی ئیشکەری تەشی ڕێسی ئابڕومەندی بەئینسافی ڕاستی پەروەری دروستکار تەرازوویەك بەدەستەوە دەگرێت و ئەو خوریەی کە گوزەرانی لە سەرێتی دەکێشێ وسەنگەکە دەخاتە تایەکی و خورییەکە دەخاتە تایەکەی تری و دەیەوێ هاوسەنگی بکات، تا پارەیەکی کەم بۆ منداڵەکانی بەدەست بێنێ، بەو ئاوایە شەڕەکەیان هاوتاو هاوسەنگ بوو، هەردوو تاکی تەرازووی شەڕەکەیان بێ کەم و بێ زیاد بەرانبەر بوو، تا زیوس، تای تەرازووی شکۆ و سەرکەوتنی بەلای هیکتۆری کوڕی پریام

دا قورس کرد و یەکەم کەس بوو لە دیواری ئاخییەکانەوە ئاودیو بوو و لە نەعرەتەی داو تەروادەییەکانی بانگ کرد: "ئەی تەروادەییان، ئەی سوارچاکان، ڕامکەری ئەسپان. هەرِنە پێش، دیواری ئاخییەکان بڕوخێنن، کەشتییەکانیان بسوتێنن."

(٤٤٢) بەو شێوەیە هاواری لێکردن و جۆشیدان، هەموو گوێڕایەڵ و یەکپارچە بەرەو دیوارەکە هێرشیان برد، ودەست بەرم و نێزە پەلاماری مەتەرێزەکانیان دا. هیکتۆر پڕیدایە گاشە بەردێك کە لەبەر دەروازەکەدا کەوتبوو، هەڵیگرت. گاشەکە لەژێرەوە پان و لەسەرەوە تیژ بوو، ئەم بەردە هێندە گەورە بوو بەئاسانی بەدوو زەلامی هەرە بەهێزی وەکو زەلامانی ئەم ڕۆژگارە هەڵنەدەگیرا تا لە عەرەبانەیەك باری بکەن. بەڵام هیکتۆر بەتاقی تەنیاو بەئاسانی هەڵیگرت، چونکە زیوسی بەردەباری فرە ڕاوتەگبیر، بۆی سووك کردبوو، وەکو چۆن شوانێك بەدەستێك خوری بەرانێك دەگرێت، و هەڵیدەگرێت و بەبارێکی قورسی نازانێ، بەو ئاوایە هیکتۆر ئەو گاشە بەردەی بەئاسانی هەڵگرت بەرەودەروازە بەرزەکە هات،

(٤٥٥) تا ئەو دەروازە دەرەکییەی کە دەرگاکانی ناوەوەی دەپاراست پێ بشکێنێ، ئەم دەرگایانە دەرگای دووتاکی بەرز و مکوم بوون و لەناوەوە بەدوو کێلون و قفلێك داخرابوون. هیکتۆر بەردەکەی هێناو لە نزیکی ئەم دەروازەیە وەستا، لاقی لێ بێوکردەوە، ئەژنۆکانی ڕاست کردەوە، ئەوپەڕی هێزی دایە خۆ، ڕێك کێشای بەناوەڕاستی دەرگاکەدا، دوو شیش و قفڵەکە شکان، بەردەکە بەهەموو قورسییەکی خۆیەوە لە دەرگاکە وەژوورکەوت و تەق و هوڕ لە دەرگاکە هەستا، شیشەکان بەرگەیان نەگرت، دەرگاکان لە گرێژنە دەرچوون و هەر لەتێکی بەلایەکدا پەڕی. هەنگێ هیکتۆری دلاوەر وەکو شەوێکی تاریك و ناگەهانی خۆی بەژووردا کرد، سەراپای لە برونزا دەبریقایەوە ودوو نێزەی بەدەستەوە بوو، کە خۆی هەڵدایە ئەودیوی دەروازەکانەوە هیچ کەسێك، جگە لە خواوەندان، نەیدەتوانی ڕووبەڕووی بوەستێ و نەیەڵێ پێشڕەوی بکات! لەو کاتەدا کە بەتاو لە دەروازەکە تێدەپەڕی ئاگرێکی سامناك لە چاوانی دەباری، ئاوڕێکی لە ئاپۆرەی تەروادەییەکان دایەوە و فەرمانی دانێ کە لە دیوارەکەوە سەرکەون. یەکسەر فرمانەکەیان جێبەجێکرد. یەکسەر جماعەتێك بەدیوارەکەدا سەرکەوتن و هەندێکی دی لە دەروازە مکومەکەوە وەژوورکەوتن. هەنگێ داناییەکان بەشەپرێوی و ترسێکی زۆرەوە و بەرەو کەشتییەکانیان هەڵاتن و هەراو زەناو پەشێوییەکی زۆر لە هەموو لایەکەوە هەستا.

# سروودی سیانزەیەم

## شەڕی بەردەم کەشتییەکان

**حیکایەتەکە:**

**زیوس پێی وابوو هیکتۆری گەیاندوەتە پێگەیەك دەتوانێ سەرکەوتن بەسەر ئاخییەکاندا بەدەست بێنێ. بۆیە دڵنیابوو کە هیچ یەکێك لە خواوەندەکان خۆلەو شەڕە هەڵناقورتێنن. لێ پوسیدون، خواوەندی بومەلەرزە، باڵادەستی تەروادەییەکانی پێ قووت نەچوو، لە ڕەفتاری زیوس پەست بوو، لە کۆشکەکەی کە لەژێر دەریادا بوو، هاتەدەرێ و گالیسکەکەی ئامادەکرد و بەپەلە ڕۆیی تا تای تەرازووەکە، بەرلەوەی هیکتۆر. ئاخییەکان لەناو بەرێ و کەشتییەکانیان بسوتێنێ، هاوسەنگ بکاتەوە. ئیدی هەموو زندەوەرانی دەریا بەدەم سترین و ڕەقسینەوە بەگەڵ خواوەندەکەیان کە بەگالیسکە دەریای دەبڕی، کەوتن .پوسیدون خۆی خستە هەیئەتی کالخاسی تێڕوانەوەو کەوتە جۆشدانی ئاخییەکان و بەرزکردنەوەی ورەیان. ئیدی ئاخییەکان دوای ئەوە پشوویەکیان وەبەر هاتەوە و توانیان ڕێگەی پێشڕەوی زیاتر لە تەروادەییەکان بگرن. ئەمەش دەگەڕایەوە بۆ جووتە ئاجاکس (ئەجاکسی کوڕی تیلامون و ئەجاکسی کوڕی ئۆیلیوس) کە زانیان پوسیدون بەدەنگی کالخاسی تێڕوان (غەیبزان) قسان دەکات. بەقسەکانی وی هێزیان تێگەڕاو بەهەموو توانایانەوە چوونە شەڕەکەوە، پوسیدون کە ئەمفیماخۆسی کوڕی دەکوژرێ زۆر بێزار دەبێت، بۆیە ڕووی دەمی کردە ئاخییەکان و بەدەنگی (تاوس)ی کوڕی ئەندریمون دواندنی و هانیدان، بەڵکو هەندێ شێوازی فێرکردن کە چۆن زیان بەتەروادەییەکان بگەیەنن، شەڕ گەرم بوو و گەلێك لە تەروادەییەکان کوژران، بەڵام وێڕای ئەمەش پاشەکشەیان نەکرد، ئەگەرچی پێشڕەویشیان نەکرد. دیفوپوس هانا بۆ ئینیاس دەبا کە (ئەلکاتوس)ی زاوای لە شەرگەکە دوور بخاتەوە، کوشتارێکی توند لەو دەڤەرەدا دەکرێت و ئینیاس دکارێت ئاخییەکان بداتە داوە.**

بەڵام بارودۆخەکە خراپ و خراپتر بوو، پولیداماس ناچار بوو واقیعە نالەبارەکە بۆ تەروادەییەکان باس بکات، و ئەوە نیشان بدات کە چۆن هیکتۆر کەوتۆتە ناوجەرگەی شەڕێکەوەو وەکو ئەوەیە بازنەیەکی ئاگر دەوری دابێ. جا مادامێکی تەروادەییەکان ئێستا دەتوانن پاشەکشە بکەن، با بەرلەوەی ڕێگەی پاشەکشەیان لێ بگیرێ و کۆتاییان بێت، پاشەکشە بکەن. داوای لە هیکتۆر کرد کە فەرماندەکان لەبەرەکانی دواوە خڕ بکاتەوە و ڕاوێژیان لەگەڵدا بکات. هیکتۆر قەناعەت بەم بۆچوونە بەجێیە دەکات، بەسەر ڕیزەکانی پێشەوەدا دەگەڕێ و ئەلکساندەر (پاریس)ی برای دەبینێ و سەرزەنشتی دەکات، بەڵام پاریس بەرگری لەخۆی دەکات و دەڵێت ڕەنگە لە ڕۆژێکی غەیری ئەم ڕۆژەدا نەچووبایە شەڕەوە، بەڵام لەم ڕۆژەدا بۆیە شەڕ دەکات چونکە خەتەری بارودۆخەکە دەزانێ. گفتوگۆیەك دەکەوێتە نێوان ئەجاکسی کوڕی تیلامون و هیکتۆرەوە و هەردوکیان هەرو گەڤ لێکدی دەکەن: ئەجاکس هەڕەشەی وێرانکردنی تەروادە دەکات و هیکتۆر هەڕەشەی سوتاندنی کەشتییەکان و لەنێو بردنی ئاخییەکان دەکات. لەو دەمانەدا تەیرێك لەقۆڵی ڕاستەوە دەفرێ و هەموو ئاخییەکان ئەمە بەمژدەی خۆشی دەزانن و پێی کەیف خۆش دەبن، وا مەزەندە دەکەن کە زیوس ئێستا بڕیاری داوە سەرکەوتنیان بەنسیب بکات، بەڵام زیوس بڕیاری وای نەدابوو. لایەنگری تەروادەییەکان بوو.

زەمەن:

ڕۆژی بیست و هەشتەمی گێڕانەوە هۆمەرییەکەیە.

شوێن:

ڕووداوەکان لەنێوان دیوارەکە و کەشتی گریکەکاندا ڕوودەدەن، تەنیا دەرچوونی پوسیدون بەگالیسکەکەی لە دەریاوە، نەبێ.

(١) زیوس، کاتێ کە هیکتۆر و تەروادەییەکانی گەیاندنە نزیکی کەشتییەکان، دەست بەرداریان بوو تامژۆلی شەڕی لە پەستاو بێ برانەوەی خۆیان بن، ئەوجا چاوە پرشنگدارەکانی لەوان گواستەوە، تا لە دوورەوە بڕوانێتە وڵاتی تراسیانی سوارچاك، وڵاتی میسیانی ئەهلی دوئێلان، وڵاتی هیپومولگانی ناودار کە خواردنیان شیری مایینان بوو، و وڵاتی ئابییان کە ڕاسترین و دادوەرترین خەڵکانی ڕووی زەوی بوون. چیتر بەچاوە پرشنگدارەکانی نەیدەڕوانییە تەروادە، چونکە وای زەن دەکرد کە لەوە بەدواوە هیچ خواوەندێك ناچێتە هیمدادی تەروادەییەکان یان دانابیەکان.

(١٠) لێ پوسیدونی خواوەندی بوومەلەرزە. هەر چاوی لە شەڕگەکە و کوشت و کوشتارەکە بوو، لەسەر بەرزترین لوتکەی ساموس، ساموس تراس، کە کۆجارێکی چڕە دارستان و بێشەڵان بوو، دانیشتبوو و دەیڕوانیە شەڕەکە، لەوێندەرەوە هەر هەموو ئیدا و شاری پریام و کەشتی ئاخییەکانی دەبینێ. بەڵا لە دەریا هاتبووە دەرێ و لەوێ ڕۆنیشتبوو. دڵی بەو ئاخییانەی کە لەبەر تەروادەییەکان شکابوون دەسووتا، زۆر لە زیوس تورە بوو.

(١٧) یەکسەر لە لوتکەی کۆسارە هەزار بە هەزارەکەوە داگەرا، زۆر بەلەز هەنگاوی دەناو دەچووە پێشێ، چیایە بەرز و لێرەوارە چڕەکان لەژێر هەنگاوە خواوەندانەکەیدا هاتنە لەرزین. سێ هەنگاوی هەڕاوی نا. لە چوارەمین هەنگاودا گەییە جێی مەبەست: گەییە ئیگ، کە لەوێدا لە قوڵایی دەریادا، کۆشکێکی بەشکۆی زێڕینی بەبریق و باقی جاویدانی بۆ خۆی دروست کردبوو. کە گەییە ئەوێندەر جووتە ئەسپە برونزینەسم و ڕەهوان و زێڕین یاڵەکانی لە عەرەبانەکە بەست.

(٢٥) بەخۆیشی جلێکی سەراپا زێڕی لەبەرکرد. قامچییەکی زێڕینی، کە زۆر هونەرمەندانە دروست کرابوو، گرتە دەست، سەرکەوتە سەر عەرەبانەکە، بەسەر شەپۆلەکاندا و بەچوار ناڵە کەوتە ڕێ. لە ڕێگەیدا هەرچی گیانەوەرانی دەریایی هەبوو لە هەموو لایەکەوە دەرپەڕین و لە قوڵایی دەریاوە هاتنە دەرێ، چونکە هەموویان پاشا وسەرداری خۆیان دەناسییەوە. دەریا بەخۆشحاڵییەوە لەبەردەمیا کرایەوە، ئا بەو جۆرە ئەسپەکان وەکو با بۆی دەرچوون، هێندە خێرا دەڕۆیین کە چێوەی برونزینی تەگەرەکانی تەڕ نەدەبوو. بەو چەشنە ئەسپە بەشکۆکان خاوەنەکەیان بەرەو کەشتی ئاخییەکان دەبرد.

(٣٢) لە قوڵایی دەریادا و لەنیوەی ڕێگەدا، لەنێوان تینیدوس و ئیمبروسدا، ئەشکەوتێکی

ئەورە مەبوو. پوسیدونی خواوەندی بوومەلەرزە، لەوێ ئەسپەکانی ڕاگرت، لە گالیسکەکەی کردنەوە، ئالفێکی خوایی کردە بەریان تا بلەوەڕن، پێوەندی زێڕینی لە شکان نەهاتوو و لە کرانەوە نەهاتووی خستە پێیان، تا بێ هیچ جوڵەیەك لەوێ، لەو شوێنەدا چاوەڕوانی گەڕانەوەی خواوەند پوسیدونی خاوەنیان بکەن. دوای ئەوە بەخۆیشی بەرەو لەشکری ئاخییەکان چوو.

(٣٩) تەروادەییەکان کە هەموو خڕ بووبوونەوە و میناکی گڕو بڵێسەی مەشخەڵان یان تۆف و زریان دوای هیکتۆر کەوتبوون، بەجۆش و خرۆشەوە دەجەنگین و نەعرەتەیان دەکێشا، پێیان وابوو دەست بەسەر کەشتی ئاخییەکاندا دەگرن و هەموو قارەمان و سەرکردەکانیان لەوێدا، لە نزیکی کەشتییەکاندا دەکوژن. بەڵام پوسیدون، ئەو خواوەندەی کە زەوی لە باوەش دەگرێ و دەی لەرزێنێ، ئارگۆسییەکانی بۆ شەڕ دندە دەدا، تازە لە قوڵایی دەریاوە هاتبووە دەرێ و ڕەنگ و دەنگی کالخاسی تێڕوانی گرتبووە خۆ تا بەرەنگ و دەنگی ئەو ئاخییەکان بدوێنێ.

(٤٦) هەوەڵجار ڕووی کردە جووتە ئاجاکس، کە بەخۆیان تاسەمەندو تامەزرۆی شەڕ و بەرگری بوون و گوتی: "ئەی جووتە ئاجاکس، ئەگەر ئێوە بیر لە دلاوەری و قارەمانێتی بکەنەوە، نەك هەڵاتنی خەتەرناك، دەتوانن لەشکری ئاخییان لە فەوتان ڕزگار بکەن. من ترسی ئەوەم نییە تەروادەییەکان کە بەزۆر هاتونەتە سەر دیوارەکە، لە هیچ شوێنێکی دیکە سەربکەون، چونکە ئاخییانی ئازا ڕووبەڕوویان دەبنەوە و ڕێگەی پێشڕەویان لێدەگرن، بەڵام من لێرە دەترسم، دەترسم بەڵایەکمان بەسەردا بێ، چونکە ئەم کابرا سەرشێتە کە دەڵێی مەشخەڵانی ئاگرە، لەم قوڵەوە ڕابەرایەتی تەروادەییەکان دەکات و فەرمانی هێرشی داوە، مەبەستم هیکتۆری مەزنە کە خۆی هەڵدەنێ و لافی ئەوە لێدەدا کە کوڕی زیوسی هەرە بەتوانایە. بەڵام دوورنییە خواوەندێك دەرفەت بێنێ و دندەتان بدات کە دلێرانە پایەداری بکەن و فرمان بەجەنگاوەرەکانی دیکەش بدات چاو لە ئێوە بکەن، جا لەم حاڵەدا دەتوانن هیکتۆر بەهەموو هێز و توانا و جۆش و خرۆش و ئازایەتییەکیەوە لە کەشتییەکان دوور بخەنەوە.. تەنانەت ئەگەر ئولومپی (زیوس) بەخۆی جۆشی بدات و هێزی پێ ببەخشێت."

(٥٩) خواوەندی بوومەلەرزە ئەو قسانەی کرد و گۆچانی فەرمانڕەواییەکەی بەهەردوو قارەمانا کێشا، دڵی پڕکردن لە جۆش و خرۆش و تین و تاوی شەڕ. ئەوجا سووکی

و دورجی بەدەست و پێو لاق وجەستەیان بەخشی. ئەوسا وەکو چۆن بازێکی تیژ باڵ بەسەر چیایەکی بەرز بەرزەوە بەهەردوو باڵ هاوسەنگی خۆی رادەگرێ و لەنگەر دەگرێ، ئەوجا بەوپەڕی خێرایی بەدوی تەیرێکی دیکەدا بەرەو دەشتایی دادەگەڕێ، بەو ئاوایە بۆی دەرچوو و لە چاوان وون بوو. هەوەڵجار ئەجاکسی تیژڕەو، ئەجاکسی کوڕی ئولیوس، ئەوی ناسییەوە. یەکسەر بەئەجاکسی کوڕی تیلامونی گوت: "ئەجاکس ئەوەی داوای لێدەکردین بەرگری لە کەشتییەکانمان بکەین، یەکێك بوو لە خواوەندەکانی ئۆڵەمپ، کالخاسی تێروان و پێشگۆ نەبوو، کاتێ کە ڕۆیی لە پشتەوە ناسیمەوە، خواوەندان بەرەفتاری خودایانەی لاق و پێیان دا بەئاسانی دەناسرێنەوە. سەیرە دڵم لە جاران زیاتر ئارەزوومەندی شەڕ وکوشتارە، لاقەکانم لە خوارەوە و دەستەکانم لەسەرەوە تامەزرۆی شەڕن."

(٧٦) ئەجاکسی کوڕی تیلامون پەرسڤی دایەوە: "منیش هەستدەکەم دەستەکانم لە جاران زیاتر تامەزرۆی گرتنی نێزەکەمن، هەستدەکەم لە جاران بەهێزتر بووم. لاقەکانم بەرەو شەڕ بکێشم دەکەن.تەنانەت تاسەمەندی ئەوەم بەتاقی تەنێ ڕووبەڕووی هیکتۆری کوڕی پریام ببمەوە، هیکتۆری هەمیشە پڕ جۆش و خرۆش، ببمەوە و شەڕی تەن بەتەنی لەگەڵ بکەم."

(٨١) ئەو جووتە جەنگاوەرەی کە خواوەند دڵی پڕ لە تین و تاوی شەڕ کردبوون بەو ئاوایە یەکتریان دەدواند. لەم کاتەدا خواوەندی پارێزەری زەوی، چوو بۆلای ئەو ئارگۆسییانەی لەبەرەی دواوە و لای کەشتییەکان ماندویەتیان دەردەکرد، کەوتە هاندانیان. ئەو ئارگۆسییانەی کە لە شەکەتیدا چوارپەلیان سست بوو بوو، و بەدیتنی تەروادەییەکان کە بەکۆمەڵ لە دیوارە مەزنەکە پەڕی بوونەوە، دڵیان پڕ لە خەم و پەژارە بووبوو، کە دەیانڕوانییە ئەو تەروادەییانە و ئومێدی ئەوەیان نەبوو لە بەدبەختی و ڕۆژە ڕەشی ڕزگار بن، خوڕ خوڕ فرمێسك بەچاویاندا دەهاتە خوارێ. بەڵام خودانی بوومەلەرزان بەپەلە بەناویان کەوت و گروپە بەهێزەکانی بۆ جەنگ و بەرگری و هێرش هاندەدان.

(٩١) هەوەڵجار چوو بۆ لای تیوسیر و لیتوس و، بینیلوسی قارەمان، تواس و دیبیروس و میریونیس و ئەنتیلوخوسی نەعرەتە کێشانی جەنگان، بەم قسە ڕوون و ڕەوانانە کەوتە جۆشدان و دنەدانیان: "ئەی لاوانی ئاخیایی شەرم بتانگرێ! من دڵنیام کە ئەگەر بجەنگن، کەشتییەکانمان ڕزگار دەبن،

(١٢٤) بەڵام ئەگەر خۆ لەشەڕ بدزنەوە و سستی بنوێنن، ئەوا ئەمڕۆ دەبێ بەڕۆژی تەروادەییەکان وگاڵەمان پێدەکەن! ئاە، خودایا من چی دەبینم، دیاردەیەکی فرە ترسناك دەبینم، هەرگیز تەسەورم نەدەکرد ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم حاڵە ڕوودبات: تەروادەییەکان گەییونەتە نزیکی کەشتییەکانمان! ئەو تەروادەییانەی کە جاران لەو ڕەوە ئاسکە سلۆکانە دەچوون، لە بێشە و لێرەواراندا، دەبوون بەنێچیر و تێشووی خۆراکی تۆڕی و پڵنگ و گورگان، و ئەو ئاسکانەی بۆ ئەوە لە دایك بوون تا سەرگەردان و بێ ئامانج ڕوو بکەنە هەر لایەك، بەدوور لە ئازایەتی و بێ بەهرە لە شادی بژین، شادیی جۆش و خرۆشی جەنگ. تەروادەییەکان بەو ئاوایە و بەهەمان شێوە، بەلای کەمەوە تا ئێستا، نەیاندەتوانی لە هەنبەر هێزی بازووی ئاخییان و بەزم و ڕەزمی شەڕی ئەواندا، تەنانەت بۆ دەمێکیش بوەستن و پایەداری بکەن. کەچی ئێستاکێ لە دووری شارەکەی خۆیاندا و لە نزیکی کەشتییەکانی ئێمەدا دەجەنگن! دیارە بێ ئەزمونی سەردار و تەمەڵی و خەمساردی جەنگاوەرانی ئاخیایی کە لە سەردارەکەیان پەستن و لە ڕقی ئەو خۆ لەشەڕ دەدزنەوە و مل نادەن بەرگری لە کەشتیە تیژڕۆکان بکەن، تەروادەییەکانی بەسەرا دلێر و ئازا کردوین، و ئاخییەکان خۆیان داوەتە پاڵ کەشتییەکان تا ببنە توێشوی تیغی تەروادەییەکان. بەڵام ئەگەر ئاگامەمنونیش لە سنوری خۆی دەرچووبێ و ئەخیلوسی مەزنی کوڕی بیلیوسی ڕەنجاندبێ و سوکایەتی پێ کردبێ و سەرچاوەی ئەم کارەساتەمان بێ، ئەوا ئێمە هەقی ئەوەمان نییە دەستبەرداری جەنگ بین. با تا زووە ئەم دەردە لە خۆماندا تیمار بکەین، دڵی دلێران زوو سارێژ دەبێ. هەڵبەتە سستی و خۆ دزینەوە بۆ ئێوە نەهاتووە و شەرم و نەنگێکی گەورەیە، چونکە ئێوە ئازاترین خەڵکانی ناو لەشکرەکەن! من گازاندە لە کەسێکی ترسنۆك و تەمەڵ کە خۆی لە شەڕ بدزێتەوە ناکەم و لێی زویر نابم، چونکە یەکجار ترسنۆك و زەبوونە و تەواو، بەڵام سەبارەت بەئێوە، من لە کانگەی دڵمەوە لێتان توڕەم ئەی خەمساردانی تەمەڵ. ئێوە بەم خەمساردییە هێندەی دی بارمان گران دەکەن! بیر بکەنەوە، با هەر کەسە و لەلای خۆیەوە بیر لەو نەنگ و شەرمەزارییە بکاتەوە کە بەسەرمان دێت، شەڕێکی قورس لە ئارادایە و دەستی پێکردووە. هیکتۆری فیلەتەن، ئەو جەنگاوەرە دلێرە، ئەو نەعرەتە کێشەی مەیدانی شەڕ، شەڕی هێناوەتە نزیکی کەشتییەکانی ئێمە، دەروازە و دەرگاکانی شکاندوە و،

(١٢٥) پوسیدون بەو جۆرە قسەی بۆ ئاخییەکان کرد و بۆ شەڕ و پێشڕەوی هاندان.

ئازاترین جەنگاوەران لە دەوری جووتە ئاجاکس خڕبوونەوە و ڕیز ئارایی و ئامادەگیان هێندە ڕێك و پێك و بێ کەموکوڕی بوو نەئێریسی خواوەندی شەڕ و نە ئەتینای ڕێکخەری لەشکران نەیاندەتوانی ڕەخنەو ئیرادیان لێ بگرن. بەڵا، هەڵبژاردەی ئەو جەنگاوەرانەی کە ئێستا چاوەڕوانی هێرشی هیکتۆر و تەروادەیەکانیان دەکرد، دیوارێکە بەشەرییان دروستکرد، نێزە لە پاڵ نێزە، سپەر لە پاڵ سپەر، سینەبەند لە پاڵ سینەبەند، کڵوخود بەپاڵ کڵوخودەوە، جەنگاوەر لە پاڵ جەنگاوەر هەموو پاڵیان دابوو بەیەکەوە، هێندە بەپاڵ یەکەوە بوون ئەگەر دابنەوینایەتەوە گوڵینك ویاڵی سەر کڵوخودەکانیان لێکدی دەخشی. بەو جۆرە بەڕیز وەستان و بەجۆش و خرۆشەوە نێزەکانیان بادەدا و تینوو تامەزرۆی شەڕ بوون و دڵیان بۆ هێرش و پەلامار لێی دەدا،

(١٣٦) ئەوجا ئاپۆرەی تەروادەییەکان پێکەوە کەوتنە پێشرەوی، هیکتۆر کەوتبووە پێشیان و ڕاستە و ڕاست ملی دەنا، وەکو چۆن تاوێرێك بەقەدپاڵێکا غل دەبێتەوە، بارانی بەخوڕی زستان لە لوتکەی چیایەکەوە هەڵی کەندبێ و بەگوڕ و بەتەپەتەپ بەناو بێشەیەکدا بێتە خوارەوە و هەرچییەکی بێتە ڕێگە ڕایماڵا، تا دەگاتە دەشتێکی ڕاستانی و وێڕای هەموو گوڕ بەستنەوەیەکی لە تل بوونەوە دەوەستێ..هیکتۆرش بەو ئاوایە بۆ دەمێك ترسی خستە دل ئاخییەکانەوە کە بێ هیچ کۆسپ و بەربەستێك بەدەم کوشتارەوە بەنێو سەراپەردە و کەشتی ئاخییەکانەوە تێدەپەڕێت و تا دەگاتە دەریا ناوەستێتەوە. بەڵام کە ڕووبەڕووی ڕیزی بتەوی جەنگاوەران بووەوە، زۆر بەتوندی ئامبازی بوونەوەو لەجێی خۆیدا وەستاندیان. چونکە کوڕانی ئاخیایی بەشیر و نێزەی دوفلیقانە بەرەنگاری بوونەوە و دووریان خستەوە. هیکتۆر گەڕایە دواوە وهەستی کرد وره بەرزییەکەی لە دەست دەدات، پڕ بەزار هاواری لە تەروادەییەکان کرد: "ئەی تەروادەییان و لێسیان، ئەی دردانیان، ئەی جەنگاوەرانی دلێر و لەزەبر، لە شوێنی خۆتان مەجوڵێن، پایەداری بکەن! ئاخییەکان ناتوانن تاماوەیەکی زۆر پاشەکشەم پێ بکەن، ئەگەرچی وەکو قەڵایەکی بەشەری لە بەرانبەرم وەستاون. نەخێر، وا دەزانم خۆ لەبەر زەبری نێزەی من ناگرن و پاشەکشە دەکەن، ئەگەر ڕاست بێ کە بەهێزترین خواوەندان، مێردە بروسکە ئەنگێزەکەی هیرا پشتیوانم بێ، ئەوا ئەم نێزەیە تارومارتیان دەکات.

(١٥٥) بەو قسانە هەر هەموویانی جۆشدا. دیفوبوسی کوڕی پریام کە ئارەزووی سەرفرازی و شکۆمەندی دەکرد، بەخۆ و سپەرەکەیەوە لە ڕیز هاتە دەرێ، خۆی دابووە پەنا

سپەرەکەی و بەلەز دەچووە پێشێ. میریونیس بەنێزەکەی نیشانەی لێگرت، نێزە درەخشانەکەی قەراخی سپەرەکەی دیفۆبوسی گرت کە لە چەرمی گا دروست کرابوو، نێزەکە سپەرەکەی نەسمی.. چونکە نێزەکە پێشتر لە دەسکەکەیەوە شکابوو، دیفوبوس کە لە نێزەی ئەو جەنگاوەرە بەنموودە ترسا بوو، کە دیتبووی بەرەو رووی دێت، سپەرە چەرمینەکەی لەخۆی دوور گرتبوو و باش خۆی دابووە پەنای. بەڵام میریونیسی قارەمان بەناو ئاپۆرەی لەشکرەکەی خۆیاندا گەڕایەوە، تورە بوو لەوەی کە هەم سەرفرازی و سەرکەوتنەکەی لە دەست چوو و هەم نێزەکەی. بەپەنا کەشتییەکاندا وبەغاردان چوو بۆ خێوەتەکەی خۆی تا ئەو نێزە درێژە بێنێ کە لەوێندەر داینا بوو.

(١٦٩) ئەوانی دی لەسەر شەڕی خۆ بەردەوام بوون، هەراو هەنگامەی شەڕ دەگەییە تاقی ئاسمان و دانە دەمرکایەوە.(تیوسێری کوڕی تیلامون) یەکەم کەس بوو کە ڕەقیبەکەی خۆی کوشت، ڕەقیبەکەی (ئیمبریوسی کوڕی مینتور) بوو کە ڕەوە ئەسپی فرەی هەبوو، ئەم جەنگاوەرە بەر لە هاتنی کوڕانی ئاخیایی لە بیدایوم دادەنیشت و (میدیسیکاستی) کیژی ناشەرعی پریامی خواستبوو.. بەڵام کە کەشتی و لەشکرێن داناییەکان هاتن، ئەویش جارێکی دی بۆ ئیلیون (تەروادە) گەڕایەوە، لەناو تەروادەییەکان بەناوبانگ بوو، هەر لە ماڵەکەی پریامدا دەژیا، و پریام وەکو کوڕەکانی خۆی مامەڵەی لەتەکدا دەکرد.. ئەوە بوو کە کوڕەکەی تیلامون نێزەکەی کردبوو بەبناگوێیدا و کە نێزەکەی ڕاکێشابووەوە، ئیمبریوس درێژا ودرێژ کەوت وەکو چۆن درەختێکی دەرداری زەلام بەبیورێکی برونزی ببڕێتەوە و لە لوتکەی شاخێکەوە بەربێتەوە و لە دوورەوە ببینرێ کە بەهەموو لق و پۆپ و گەڵا و گۆڵەکەیەوە بکەوێتە سەر زەوی.. ئەویش بەو ئاوایە کەوت و تەق و هوری تەدارەکە جەنگییەکەی بەرز بووەوە. تیوسێر پڕی دایێ کە چەکەمەنیەکەی لێ داماڵا و بیبات، بەڵام لەو کاتەدا کە خەریکی ئەو کارە بوو، هیکتۆر پەلاماری دا، ڕمێکی تێ سرەواند، بەڵام تیوسێر بینی و خۆی لەبەر ڕمەکە لادا، ڕمەکەی هیکتۆر ڕێك بەر سینگی ئەمفیماخۆسی کوڕی کتیتوسی کوڕی ئەکتۆر، کەوت، کە لەو دەمەدا بەرەو شەڕەکە دەهات، بەدەم تەق و هوڕی قەڵغانەکەیەوە کەوتە سەر زەوی. هیکتۆر بەپەلە هەڵیکوتایە سەری تا کێوخودەکەی کە لاجانگەکانی داپۆشی بوو لێ داماڵا، ئەجاکس یەکسەر بەنێزە درەخشانەکەی نیشانەی لێگرتەوە، بەڵام برینداری نەکرد، چونکە هیچ شوێنێکی لەژێر سینەبەند و سپەرە سامناکەکەیەوە دیارنەبوو. بەڵام ڕمەکە ڕێك بەر ناوەندی سپەرەکەی

کەوت و بۆ دواوەی گەڕاندەوە و لە هەردوو جەنازەکە دوورکەوتەوە و ئاخییەکان رایانکێشان و دووریان خستنەوە. ئەوجا ستیخیوس و مینیستیوس، جووتە فەرماندەی ئەتینا، جەنازەکەی ئەمفیماخوس)یان بۆ پشت لەشکرەکە گواستەوە. بەڵام (ئیمبریوس) لەلایەن هەردوو ئەجاکسی فیلەتەنەوە گوێزرایەوە، وەکو چۆن دوو شێر ئاسکێك لە تاژیان دەسەننەوە و بەقەپاڵ و بەناو بێشەیەکی بەرزی چڕدا هەڵیدەگرن و دەیبەن، بەو ئاوایە جووتە ئەجاکسی جەنگاوەر، جەنازەی ئیمپریوسی جەنگاوەریان هەڵگرت و دووریان خستەوە و سینەبەند و سپەرەکەیان لێ داماڵی. ئەوجا کوڕەکەی ئولیوس، لە تۆڵەی (ئەمفیماخوس)دا سەرەکەیان بڕی و وەکو گۆ بەسەر خەڵکەکەدا هەڵیدا و لەبەرپێی هیکتۆردا کەوتەوە.

(٢٠٦) خواوەندی دەریایان ئێستا زۆر تورە بوو، چونکە ئەمفیماخۆسی نەوەی کوژرابوو. بەپەلە کەوتە ناو ئۆردوگا و کەشتی ئاخییەکان تا بۆ شەڕ هانیان بدات و داوی بەڵایەکی گەورە بۆ تەروادەییەکان بنێتەوە. لە ڕێگەدا ڕێکەوتی (ئیدومینیوس)ی کرد، کە لەلای برادەرێکیەوە کە تازە لە مەیدانی شەڕەوە هێنرابووەوە و زرانی بریندار بوو بوو، هاوڕێ جەنگاوەرەکانی هێنابوویانەوە، دەگەڕایەوە. ئیدومینیوس دوای ئەوەی پزیشکەکانی ڕاسپارد کە ئاگایان لە تیمارکردنی بێ، بۆ سەراپەردەکەی خۆی دەگەڕایەوە، چونکە تامەزرۆی ئەوە بوو کە جارێکی دیکە بەپەلە بۆ شەڕگەکە بڕوات و ڕووبەڕووی تەروادەییەکان ببێتەوە. پۆسیدون خۆی خستە هەیئەتی تواسی کوڕی ئەندریمون)ەوە و تا بەرەنگ و دەنگی ئەو قسەی لەگەڵدا بکات. ئەو (تواس)ەی کە لە سەرانسەری پلورون و کالیدونی شاخاویدا حوکمڕانی دەکرد و لە دەڤەرەکەی خۆیدا خەڵکەکە ڕێزی خواوەندێکیان لێدەنا. پێی گوت: "ئەی ئیدومینیوس، ئەی دەمڕاستی کریتیان، کوا ئەو هەڕ و گیڤەی کوڕانی ئاخیایی لە تەروادەییەکانیان دەکرد، چی بەسەرهات؟)

(٢٢١) ئیدومینیوسی سەرداری کریتییەکان وەڵامی دایەوە: "ئەی تواس، پێم وایە هیچ کەسێك درێغی نەکردووە، هیچ جەنگاوەرێك شایستەی گلەیی نییە، چونکە ئێمە هەموومان دەتوانین شەڕ بکەین و پیاوی مەیدانین. کەس نییە لە ترسا بگەڕێتەوە یان خۆی بدزێتەوە. بەڵام پێم وایە ئەمە ویستی زیوسی بەتوانایە و زۆری پێ خۆشە ئاخییەکان بەگومناوی لێرەدا و دوور لە ئارگۆس تیابچن و نەمێنن. بەڵام تۆش ئەی تواس جاران شەڕڤانێکی بێ وێنە بوویت، هەر بەخۆتەوە نەدەوەستایت، بەڵکو ئەوانەشت هاندەدا کە ڕەخاوەتیان

دەکرد، ورەت بەرز دەکردنەوە، ئێستاش دەست بەرداری ئەم کارە مەبە، وڕاکە و یەکە بەیەکە ورەیان بەرزبکەوە.

(٢٣١) پۆسیدونی زەوی لەزرێن وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی ئیدومینیوس، بریا ئەوەی لەم ڕۆژەدا سستی دەنوێنێ و خۆی لەشەڕ دەدزێتەوە، هەرگیز بەسەلامەتی لە وڵاتی تەروادە نەگەڕێتەوە و لێرەدا ببێ بەتوێشو و خۆراکی کسۆکان. باواز لەم قسانە بێنین، هەرە سپەرەکەت هەڵگرە و وەرەوە بۆ ئێرە و دوام بکەوە، هەقی خۆیەتی کارێکی وەها بکەین و ئەگەر هیمەتمان یەك بخەین ڕەنگە بتوانین یارمەتییەك پێشکەش بکەین، ئەگەرچی ئێمە تەنیا دوو کەسین. بەڵام ترسنۆکانیش بەیەکێتی ئازا دەبن، و دەشێت ڕووبەڕووی ئازایان ببنەوە.

(٢٤٠) ئەوسا خواوەند گەڕایەوە بۆ ناوجەرگەی شەرەکە. کە ئیدومینیوس گەییە سەراپەردەکەی خۆی، جلی جەنگی پۆشی و دوو ڕمی هەڵگرت و بەغاردان وەردەکەوت، وەکو ئەو چەخماخەیەی کە کوڕی کرونوس دەیگرێتە دەست و لە بەرزایی ئۆڵەمپی درەخشانەوە دەیهاوێ تا بەهۆیەوە هێما و نیشانەیەك بەبەشەران بدات و لە دووری دوورەوە دەبریقێتەوە.

(٢٤٥) بەو ئاوایە جلە جەنگییەکانی ئیدومینیوس بەدەم غاردانەوە دەبریقایەوە. ئیدومینیوس هێشتا زۆر لە سەراپەردەکەی دوور نەکەوتبووەوە کە تووشی میریونیسی یارو یاوەری بوو کە هاتبوو بۆنێزە، ئیدومینیوس گوتی:

(٢٤٩) "میریونیس، ئەی کوڕی مولوس، ئەی تیژڕەو، ئەی ئازیزترین هاوڕێم، بۆچی هاتوویت و بۆ مەیدانی شەڕ و نەبەردت چۆڵ کردووە، ئایا بریندار بوویت؟ یان بەدوای مندا هاتوویت و پەیامێکت پێیە بۆم؟.. بەڵام من پێویستم بەوە نییە کەس بێ بەدواما، من حەزم لەوە نییە لە خێوەتەکاندا بمێنمەوە، بەڵکو ئارەزووم مەیدان و مێرخازییە."

(٢٥٤) میریونیسی حەکیم بەرسقی دایەوە: "ئەی ئیدومینیوس، ئەی سەرداری کریتیانی سەراپا برونز، دەچم ڕمێك دێنم، ئەگەر لەسەراپەردەکانتا ڕم مابێ، چونکە نێزەکەی خۆمم لە سپەرەکەی دیفوبوسی لەخۆباییدا شکاند.

(٢٥٩) ئیدومینیوسی سەرداری کریتییەکان بەرسقی دایەوە و گوتی: "برۆ، لەسەراپەردەکەی مندا لە جیاتی نێزەیەك بیست نێزە. دەبینی، بەڕیز و بەرانبەر دەرگاکە هەڵپەسێردراون، ئەم نێزانە هی ئەو جەنگاوەرە تەروادەییانەیە کە کوشتومن و چەکم

کردوون، چونکە من هەرگیز لە دوورەوە شەڕی دژمن ناکەم، بەڵکو هەمیشە لە نزیکەوە شەڕی دژمن دەکەم، بۆیە وێڕای ئەم نێزانە گەلەك سپەری قۆقز و کڵوخود و زرێی پرشنگهاوێژم هەن.

(٢٦٦) میریونیسی دوورئەنێش وەڵامی دایەوە: "منیش لە خێوەتەکەم و لە کەشتییە ئامال ڕەشەکەمدا، پاشماگەی چەکەمەنی تەروادەییەکانم هەیە، بەڵام لەبەردەستا نین و خێوەتەکەم زۆر لە شەڕگەکەوە دوورە کە بتوانم بەئاسانی بگەمە ئەوێندەر و ڕم بێنم. منیش لە ئازایەتی غافڵ نیم، هەمیشە لەشەڕدا کە شایستەیی ودلاوەری وناوداری تیا دەردەکەوێ، لە ناوەندی جەنگاوەرانی ڕیزی پێشەوەدا بووم، خۆ ئەگەر ئاخییانی برونز پۆشی دیکە بەمە نەزانن، ئەوا تۆ بەچاوی خۆت منت لە جەرگەی شەڕدا دیتوە.

(٢٧٤) ئیدومینیوس بەرسقی دایەوە: "من تۆ دەناسم، ئاگاداری شایستەیی و دلاوەری تۆ هەم، بۆچی ئەم قسانە بۆ من دەکەی؟ ئێستا ئەگەر ئازاترین کەسانی دەوروبەری کەشتییەکانمان لە کەمین یان بۆسەیەکدا تاقی بکرێنەوە کە، لەوێدا ئازایەتی و ترسنۆکی دەردەکەوێ، چونکە پیاوی ترسنۆك بەردەوام ڕەنگی دەگۆڕێ، ئۆقرە ناگرێ، ڕوحی لە سینەیدا ئارام ناگرێ، ئەژنۆکانی دەلەرزن، هەر ئەم پێ و ئەو پێ دەکات، دڵی لە سینەیدا بەتوندی لێدەدا و بیر لە مردن دەکاتەوە و کار دەگاتە ئەوەی دانەچۆقەی پێ بکەوێ. بەڵام ئازا ڕەنگی خۆی ناگۆڕێ، ترسی لێ نانیشێت، کە لەگەڵ جەنگاوەراندا بۆ دژمن دەچێتە بۆسەوە، ناپەشۆکێ، بەڵکو خواخوایەتی بۆ ئەو کارە هەڵبژێردرێ.

(٢٨٦) تەنانەت ئەگەر ئازاترین جەنگاوەرانیش بۆ ئەم کارە هەڵبژێردرێن، کەس نییە بتوانێ گاڵتە بەئازایەتی و هێزی تۆ بکات. چونکە ئەگەر لە هەرەتی شەڕدا لە دوورەوە تیرێکت پێ بکەوێ، یان لە نزیکەوە و لەشەڕی تەن بەتەندا بپێکرێی، ئەوا نە لە دواوە و نە لەپێشتەوە ناپێکرێی، بەڵکو لەو کاتەدا کە بۆ ڕیزەکانی پێشەوە تاو دەدەی ڕمەکە بەسکتا دەچێت یان سینگت شەق دەکات. بەڵام باواز لەم قسانە بێنین و لەوەی پتر وەکو مناڵان خۆ بەقسەوە مژول نەکەین، نەوەك گلەییمان لێبکرێ! ڕاکە بۆ خێوەتەکەی من و نێزەیەکی ئەستور و قایم بۆ خۆت بێنە."

(٢٩٥) دوای ئەمە میریونیسی هاوتای ئێریسی تیژڕەو بەپەلە ڕۆیی، ڕمێکی برونزی لە سەراپەردەکە هەڵگرت و بەورەیەکی بەرزەوە دوای ئیدومینیوس کەوت. وەکو چۆن ئێریسی قڕکەر و بەڵای گیانی بەشەران بەرەو مەیدانی شەڕ دەچێت و (ترسی) چاو

ئەترس و سەرکێشی کوڕی بەگەڵی دەکەوێ و ترس دەخاتە دڵی ئازاترین قارەمانەوە، وەکو چۆن ئەم دوانە لە تراسیاوە، دێن تا بچنە پاڵ ئیفیریان یا ئیفیلجیانی دلاوەر، و گوێ بەداوا و پاڕانەوەی هیچ لایەنێکی دوو سوپا شەڕکەرەکە نادەن، و بەڵکو سەرکەوتن و سەرفرازی بەنسیبی یەك لایان دەکەن. میریونیس و ئیدومینیوس، ی —فەرماندە جەنگاوەرانیش- بەو ئاوایە و بەو شێوەیە بەجلی برونزینی درەخشانی شەرەوە بەرەو مەیدانی شەڕ چوون. میریونیس هەوەڵجار رووی کردە ئیدومینیوس و گوتی: "ئەی کوڕی دیوکالیون، لە کوێوە دەست بەشەڕ بکەین؟ لە قۆڵی ڕاستەوە، لە ناوەڕاستەوە، یان لە قۆڵی چەپەوە؟ چونکە پێم وانییە کە ئاخییانی پۆڕشۆڕ لە هیچ قۆڵێکەوە لە جەنگاوەریان کەم بێ.

(٣١١) ئیدومینیوس —فەرماندەی کریتییەکان- بەرسڤی دایەوە و گوتی: "لە ناوەڕاستەوە خەڵکانێکی دیکە هەن کە پیاوانە بەرگری دەکەن- هەردوو ئەجاکس و تیوسیر کە باشترین کەوانداری ئاخیانە، ئەمە جگە لەوەی کە شەڕڤانێکی باشیشە. هیکتۆری کوڕی پریام، چەند ئازا بێ، چەند بەهێزیش بێ، چەند بێ ئامان بێ، زۆر زەحمەتە دەرەقەتی ئەوانە بێت و بەرهەقیان بکات و ئاگر لە کەشتییەکان بەربدات، ئەگەر کوڕەکەی کرونوس بەخۆی بروسکەی خێرای گڕدار لە کەشتییەکان نەدات. ئەجاکسی زادەی تیلامون، دەرفەتی سەرکەوتن و سەرفرازی بەهیچ بنیادەمێکی دیمیترخۆر، کە بشێت بەبرونز یان بەگاشە بێتە کوشتن نادات. تەنانەت لەشەڕی تەن بەتەن دا لە هەنبەر ئەخیلی سەفدریش دا ناگەڕێتەوە، بەڵام لە گرێوی ڕاکردندا، هەڤرکی لەگەڵ ئەخیلدا ناکرێ. کەواتە بابچین بۆ قۆڵی چەپ تا بزانین دەبینە مایەی سەربەرزی کەسێك، یان کەسێك دەبێتە مایەی سەربەرزی ئێمە، تا بزانین دەکوژرێین یان دەکوژین.

(٣٢٨) دوای ئەو قسانە، میریونیسی میناکی ئێریسی تیژڕەو پێشکەوت، تا گەییشتنە ئەو شوێنەی لەشکرەکە، کە ئیدومینیوس دیاری کردبوو.

(٣٣٠) کاتێ تەروادەییەکان ئیدومینیوس) کە وەکو مەشخەڵی ئاگر دەهاتە پێشێ و لەگەڵ یاوەرەکەیدا باشترین زرێیان پۆشی بوو، کەوتنە هوراکێشان و هەر هەموویان بەرەو پیری چوون، شەڕێکی قورس و سامناك لە بەرایی کەشتییەکاندا هەڵگیرسا. وەکو چۆن گێژەڵوکەی با، لە ڕۆژێکا کە گەردو تۆزێکی زۆر دەنیشێتە سەر ڕێگە و بان، بەلورە لور لێی دەدات و میناکی هەورێکی چڕ دەیبا بەحەلحەلەی ئاسماندا.. بەو

دوایە سەرلنێوانیاناهەڵگیرسا، هەموو تامەزرۆ و تاسەمەندی ئەوە بوون بەبرونزی تیژ لەشەڕگەکەدا یەکدی بکوژن. شەڕی قرکەر و بەڵای گیانی بەشەران گەرم بوو، هەردوو لەشکر بەڕم و شیرەوە پەلاماری یەکتریان دەدا، مەیدانی گیان ئەستێنێ جەنگ پڕ بوو لە ڕمی درێژی ئامادە و لەسەر پێ بۆ سمینی سینگی یەکتر.. بریق و هوڕی کێوخود، پرشنگی زرێ و سینەبەندی تازە سیقاڵکراو، درەوشانەوەی سپەری ئەو جەنگاوەرانەی بەربووبوونە یەکدی چاوی دەخستە ڕێشکە و پێشکە و کەس نەبوو بەدیتنی ئەم شەڕە کوشندەیە شادمان بێ، یان خەمبار نەبێ، مەگەر یەکێکی زۆر دڵڕەق.

(٣٤٥) ئا بەو جۆرە دوو کوڕە بەتواناکەی کرونوس (زیوس و پۆسیدون) بەئانقەست ئەو هەموو بەڵا و مسیبەتەیان بەسەر ئەو قارەمانانەدا دێنا. لەلایەکەوە زیوس خوازیاری سەرکەوتنی تەروادەییەکان و هیکتۆر بوو، نەك بەو نیازەی کە بیەوێ هەموو خەڵکی ئاخیایی لە بەرانبەر ئیلیوندا لەناوبەرێ، بەڵکو بەو مەبەستەی کە جۆرە سەربەرزی و سەرفرازییەك بەتیتس و کوڕە هێژاکەی (ئەخیل) ببەخشێت. لەلایەکی دیکەوە پوسیدون کە بەپەنامەکی لە بنی دەریای کەف ئالودەوە هاتبووە دەرێ، خۆی بەناو ئارگوسییەکاندا کرد و هانی دەدان، چونکە زۆری لاناخۆش بوو کە دەیبینی بەدەستی تەروادەییەکان دەشکێن و دەبەزن، زۆریش لە سەروەری خواوەندان (زیوس) تورە و بێزار بوو.زیوس و پوسیدون) هەردووکیان لەیەك توخم و تۆ و لەیەك ڕەگ و ڕەچەڵەك بوون، بەڵام زیوس بەر لە پوسیدون لە دایك بوو بوو، بۆیە لەو زاناتر بوو، لەبەرئەوە پۆسیدون زاتی ئەوەی نەبوو بەئاشکرا یارمەتی ئاخییەکان بدات، بۆیە هەمیشە دەچووە پێستی یەکێك لە ئادەمیانەوە وبەناو سوپای ئاخیان دەکەوت و بۆ شەڕی دنەدەدان. بەو جۆرە ئەم دووانە سەرو گرێیان لەم سەر و لەوسەری پەتی کێشمانەکێشی ئەم شەڕە سامناك و هاوسەنگە دابوو، و هەریەکەیان بەهەواداری لە یەکێك لەم دوو لەشکرە ڕەقیبە، ئەم پەتەیان ڕادەکێشا و گرێ کوێرەکەیان توندتر و گەورەتر دەکرد، و ئەم گرێیانە ئەژنۆی زۆر جەنگاوەریان شکاند و کوژران.

(٣٦١) لەم کاتەدا ئیدومینیوس، ئەگەرچی داوی سپی کەوتبوونە سەری کەوتە هاندنی داناییەکان و پەلاماردان و ڕاونانی تەروادەییەکان، خۆی بەئاپۆرەی تەروادەییەکاندا کرد، (ئوتریونیوس)ی کوشت. ئوترونیوس ئاکنجی کابیسوس بوو، کەڵکەڵەی سەرفرازی و ناوداری تازە بەرەو شەڕگە و مەیدانی بکێش کرد بوو. ئەم پیاوە داخوازی کاساندرای

خێری پریامی کردبوو کە جوانترین کیژی بوو. بەڵام هیچ دیاری و مارە بڕانەیەکی بەکیژێ نەدابوو، بەڵام بەڵێنی دابوو کە کارێکی شایستە و گەورە ئەنجام بدات: بەڵێنی دابوو کوڕانی ئاخییایی، بەتۆبزی لە خاکی تەروادە وەدەربنێ. پریامی پیریش بەڵێنی دابویێ کە کاساندری دەداتێ و سوێندی بۆ خواردبوو، بۆیە ئۆترینوس بەهەموو هێز و توانای خۆیەوە بەئومێدی ئەو بەڵێنانەی بابی دەجەنگی. بەڵام ئیدومینیوس، لەو دەمەدا کە ئەو بەرەو ڕووی دەهات، ڕمێکی درەخشانی خێواندێ و ئەو زرێیەی لەبەری کرد بوو دادی نەداو سەرەنێزەکە ڕێك چوو بەسکیا و هەڵیدڕی و بەتەق و هوڕی جلوبەرگی جەنگەوە کەوتە سەر زەوی، ئیدومینیوس کە بەمەرگی ئەو شاد و سەرمەست بوو، هاواریکرد: "ئەی ئۆترینوس، من لە هەموو پیاوانی دنیام بەزیاتر دەزانیت، گەر بهاتبا هەموو ئەو بەڵێنانەی بەپریامی زادەی (داردانوس)ت دابوون هێنابانە دی، ئەو پریامەی کە بەڵێنی دابوو کیژەکەیت بداتێ. ئێمەش دەتوانین بەڵێنی واهیت بدەینێ، جوانترین کیژانی کوڕی (ئۆتریوس)ت بدەینێ، لە ئارگۆسەوە بۆتی بێنین، ئەگەر تۆ لەگەڵ ئێمەدا بی و شاری ئاوەدان و مکوم و فرە خەڵکی ئیلیون وێران بکەی. جاوەرە لەگەڵ ئێمەدا، با لەناو کەشتییەکانماندا لەسەر ئەم خزمایەتی و ئیزدیواجە ڕێك بکەوین، تا بەخۆت دڵنیا بیت کە ئێمەش ماڵە خەزورانی بەخشندەین و داوای شتی زۆرت لێناکەین!"

(٣٨٣) ئیدومینیوس، دوای ئەو قسانە، لاقێکی گرت و بەناوجەرگەی شەڕە سەختەکەدا ڕایکێشا و بردی، بەڵام (ئاسیوس) هاتە بەرەوە تا تۆڵەی هاوڕێکەی (ئۆترینوس) بسەنێ، بەپێیان لە پێشی جووتە ئەسپەکەیەوە دەڕۆیی، کە میرئاخوڕەکەی ڕاستەوخۆ لە پشتییەوە دەیهاژۆتن و هەناسەیان بەر شانی دەکەوت. هەموو هێڤییەکی ئاسیوس ئەوە بوو، جەزرەبەیەك لە ئیدومینیوس بدات، بەڵام ئیدیومینیوس لەو چابوکتر بوو، نێزەکەی، لەژێر چەناگەیەوە بەگەرویدا کرد، نێزەکە گەروی دیواو دەرکرد، وەکو چۆن دار بەڕویەکی زەلام یان سپیدارێك یان سنۆبەرێك کە کەشتی سازان بەبیوری تازە دەمەزەردکراو بۆ دروست کردنی کەشتی دەیبڕنەوە و شڵپ دەکەوێتە سەر زەوی، (ئاسیوس)ش بەو شێوەیە لەبەردەم عەرەبانە و ئەسپەکانیا تەختی زەوی بوو، بەدەم ئاە وناڵەوە دەتلایەوە و چنگی لە خوێن و خۆڵەکەی ژێری گیر دەکرد. میرئاخوڕەکەی کە ترسا بوو، زاتی نەکرد سەری ئەسپەکان وەرگێڕ و هەڵا و خۆی لە دەستی دژمن ڕزگار بکات: ئیدی ئەنتیلوخوسی دلاوەر خێرا نێزەیەکی کێشا بەناو قەدیا و ئەو زرێ برونزییەی کە لەبەریا

بووە دادی نەدا و نێزەکە لەسکیا ختم بوو. بەدەم ئاوزینگدانەوە لە گالیسکە مکومەکەیەوە کەوتە خوارەوە، ئەنیلوخوسی جەنگاوەری بەباشار، کوڕی نەستور ئەسپەکانی لەبەری تەروادەییەکانەوە بۆ ناو ئاخیاییە پڕ چەکەکان برد.

(٤٠٢) ئەوجا دیفوبوس کە یەجگار خەمباری مەرگی ئاسیوس بوو، لە ئیدومینیوس نزیك بووەوەو ڕمە پرشنگدارەکەی سرەواندێ، بەڵام ئیدومینیوس کە زۆر بەوردی چاودێری دەکرد، خۆی لەبەر ڕمە برونزییەکەی لادا، خۆی دایە پشت سپەرە کەمەییەکەی. سپەرەکەی بەچەرمی گا و برونزی بریقەدار پۆشرا بوو و هەمیشە لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەگرت. بەدوو میل بەهەردووك باڵیەوە بەسترابوو.. خۆی لە پشت ئەم سپەرەوە دانەواندەوەو نێزە برونزییەکە لە سپەرەکە خشی و دەنگێکی تیژی لێوە هات و بەتیژی تێپەڕی. لەگەڵ ئەوەشدا ڕمەکە بەخۆڕایی و بەبێهودە لە دەستی قورسی دیفوبوس دەرنەچوو، بەڵکو بەر هوپسینوری کوڕی هیپانوس —سەرداری جەنگاوەران- کەوت، جگەری لەژێر پەڕەی دڵییەوە هەڵدڕی و دەم و دەست کەوتە سەر چۆك. دیفوبوس، زۆری کەیف بەمە هات و شاد و سەرمەست دەستی بەهاوار کرد: "بێگومان، ئاسیوس بەخۆڕایی نەمرد، تۆڵەی کرایەوە، پێم وایە بەدڵێکی خۆشەوە بەرەو هادیس، پاسەوانی دەروازە مکومەکان دەچێت، چونکە من یاوەرو هاوڕێیەکەم لەگەڵی ناردوە!"

(٤١٧) ئارگۆسییەکان ئەو قسانەیان پێ ناخۆش بوو. ئەنتیلوخۆس، ئەو جەنگاوەرە مەزنە لە هەمووان پەست تر و تورەتر بوو. بەڵام وێرای ئەو خەم و پەژارەیەش، هاوڕێ ئازیزەکەی فەرامۆش نەکرد، بەڵکو بەغاردان خۆی گەیاندە دیاری و لە هەموو لایەکەوە بەسپەرەکەی داپۆشی. دوای ئەوە دوو کەس لە ئەمەکدارترین هاوڕێیانی، واتە (میکیستیوسی کوڕی ئاخیوس) و (ئالاستور)ی پاکزاد، هەڵیانگرت و بەدەم ناڵە ناڵی بەرزەوە بەرەو کەشتییەکانیان برد. بەڵام تورەیی ئیدومینیوس هەر دانەمرکایەوە، لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە یان جەنگاوەرێکی تەروادەیی لە شەوی تاریکی مەرگدا بنێژێ، یان خۆی بەکوشت بدات و ڕۆژ ڕەشی و نەگبەتی لە ئارگوسییەکان دوور بخاتەوە. لەم کاتەدا (ئەلکاتوس)ی کوڕی ئازیزی ئیستیس، و نازپەروەردەی زیوس دەرکەوت. ئەلکاتوس زاوای ئەنخیسیس بوو، مێردی (هیپودامیا)ی کیژە گەورەی ئەو بوو، هیپودامیا، لە ماڵی بابیا خۆشەویستی داك و بابی بوو. لە هەموو کیژانی هاوسونحی خۆی زیرەکتر و جوانتر و دەست ڕەنگین تر بوو. لەبەرئەوە (ئیسیتس)ی ناودارترین جەنگاوەری سەر زەمینی پان

و بەرینی تەروادە، ئەوی خواستبوو. ئەو جەنگاوەرەی کە ئەو ڕۆژە پۆسیدون، بەدەستی ئیدومینیوس کوشتی، بەرچاوانی تاریك بوو، لاقە بەهێزەکانی وشك بوون، نە توانی بگەڕێتەوە و پاشەکشە بکات و نە توانی خۆی لە نێزەکەی ئیدومینیوس لابدات، بەڵکو ڕەق وەکو ستونێك یان درەختێکی زەلام لە جێی خۆی وەستاو ئیدومینیوس نێزەیەکی سرەواندە ناوقەدی و

(٤٣٩) زرێکەی بەری، کە تا ئێستا جەستەی دەپاراست، شەق کرد و تەق و هوری لێ هەستاو خاوەنەکەی ڕمبەی لێ هەستاو کەوتە سەر زەوی، نێزەکە لە دڵی چەقی، کە هێشتا هەر لێی دەدا، دەسکی ڕمەکەی دەلەرزان، تا ئێریسی ترسناك حەیاتی لەبەربڕی. ئیدومینیوس بەفشینێکی زۆرەوە، شاد و سەرمەست، بەدەنگی بەرز هاواری کرد: "ئەی دیفوبوس، تۆ کە بەخۆت دەفشیت، ئایا ئێمە بۆمان نییە ئێستا هاوار بکەین کە سێ پیاومان لە تۆڵەی ئەو پیاوەدا کوشت کە تۆ کوشتت؟ نەخێر، قوربان، ئەگەر ڕاست دەکەی وەرە بەرانبەرم، هەنگێ دەزانی ئەم زیوس زادەیەی کە بۆت هاتۆتە مەیدان کێیە. زیوس هەوەڵجار مینیوسی هێنایە دنیا، مینیوسی سەرداری کریت، مینیوس (دیوکالیون)ی بێ وێنەی خستەوە، (دیوکالیون)ش منی خستەوە تا لە دەڤەری کریتدا ببمە گەورە و سەرداری خەڵکانێکی زۆر.ئێستاش کەشتییەکانم بۆ ئەم دەڤەرەیان هێناوم تا ببمە بەڵای گیانی تۆ و بابت و تەروادەییەکان."

(٤٥٥) ئەو قسانەی کرد. دیفوبوس دوو دڵ بوو لەوەی چ قەرارێك بدات، ئایا بگەڕێتەوە و لەنێو تەروادەییە ئازاکاندا هاورێ و یاریدەدەرێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت، یان بەتاقی تەنێ ڕووبەڕووی ئیدومینیوس ببێتەوە؟.. کە باش بیری کردەوە، وای بەچاکتر زانی کە بچێ ئینیاس بدۆزێتەوە، کە دۆزییەوە سەیری کرد لە ڕیزی دواوەو لەناو ئاپۆرەی خەڵکەکە وەستاوە، ئینیاس هێشتا هەر لە پریام پڕ بوو، چونکە ئەم پاشایە، وێڕای ئازایەتی و دلێری ئینیاس وەکو پێویست ڕێزی لێ نەدەنا، دانی بەئازایەتییەکەیدا نەدەنا. دیفوبوس لێی نزیك بووەوە و ڕێك و ڕەوان پێی گوت: "ئەی ئینیاس، ئەی سالار و ڕاوێژکاری تەروادەییان، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە یارمەتی مێردی خوشکەکەت بدەی، ئەگەر ڕاست دەکەی خەمی خزمانت دەخۆیت و لە بیری ئەوانڕای.. خێرا دوام بکەوە، با جەنازەکەی (ئەلکاتوس)ی مێردی خوشکەکەت ڕزگار بکەین، ئەو (ئەلکاتوس)ەی کە تۆی بەمنداڵی لە ماڵەکەی خۆیدا بەخێو کرد.. ئیدومینیوسی ڕمبازی بەناوبانگ کوشتویەتی."

(٤٧٨) بەو قسانە دڵی (ئینیاس)ی جۆشدا، ڕۆیی و بەگیانی پڕ جۆشی شەڕەوە کەوتە تاقیبی ئیدومینیوس. بەڵام ئیدومینیوس بەهیچ جۆرێ وەکو منداڵێکی لاوازی بێ توانا نەترسا و لەجێی خۆی وەستا، وەکو چۆن بەرازێك لە ئەشکەوتێکی دوورە دەستی چیایەکدا، گوێی لە هەراو هەنگامەی هاتنی کۆمەڵێك ڕاوچی دەبێ، و خۆی بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ئامادە دەکات، مووی ڕەپ دەکات، گڕ لە چاوانی دەبارێ، ددانەکانی جیڕ دەکاتەوەو دەکەوێتە بەرگری لەخۆی

(٤٧٦) بەو شێوەیە ئیدومینیوسی ڕمبازی ناودار هەستایە سەرپێ و بێ ئەوەی تاقە هەنگاوێك پاشەکشە بکات، دەیڕوانییە هێرشی ئینیاسی جەنگاوەری بەزەبر، بەڵام ئاوڕی لە ئەسکالافوس، ئەفاریوس، دیبیروس و میریونیس و ئەنتیلوخۆس کە هەموویان جەنگاوەری ئازابوون، دایەوە و داوای کۆمەکی لێکردن، گوتی: "گەلی برادەرینە، فریام بکەون، من بەتەنیام، وا ئینیاسی تیژڕەو هێرشم بۆ دێنێ، من لە توانای ئەو دەترسم، و جەنگاوەرێکی بەترەفی مەیدانی شەڕە، ئەمە جگە لەوەی کە لە هەرەتی لاویدایە و، لاوییش لوتکەی هێزی مرۆڤە. ئەگەر من بەم ئەقڵەی ئێستامەوە لە تەمەنی ئەودا دەبووم، هەنگێ هەر زوو یا ئەو سەرکەوتنی گەورەی بەدەست دێنا یان من!"

(٤٨٧) دوای ئەو قسانە، هەموو بەیەك دڵ وگیان وەکو یەك جەنگاوەر، سپەر لە شان لە پاڵیا وەستان. لەولاشەوە ئینیاس هانای بۆ هاوڕێکانی، بۆ دایفوبوس و پاریس و ئەجینور)ی ڕابەرانی تەروادەییان برد کە پشتیوانی لێبکەن. ئیدی یەکسەر وەکو چۆن پەزان لە لەوەڕگەوە بەرەو ئاو خواردنەوە دوای بەران دەکەون و شوانەکەیان زۆر دڵخۆش دەبێت.. بەو شێوەیە (ئینیاس)ش کە بینی جەنگاوەرەکان دوای کەوتوون، دڵی خۆش بوو.

(٤٩٦) ئیدی شەڕێکی توند لە دەوری جەنازەکەی ئەلکاتوس دەستی پێکرد، هەر ڕم بوو و بەڕمی دەگوت بەولاوە، بەڕمان بەربوونە گیانی یەکدی، سینەبەندەکانیان کە ڕمیان بەردەکەوت دەزرنگانەوە. ئەو دوو قارەمانەی کە لەوانی دی بێباك تر بوون، واتە ئینیاس و ئیدومینیوس، کە هەردوکیان لە ئێریس دەچوون و هاوتای ئەو بوون، لە پشتی هەمووانەوە مانەوەو لە هەوڵی ئەوەدا بوون بەبرونزی دڵڕەق و بێ بەزەیی یەکدی شەق و پەق بکەن.هەوەڵجار ئینیاس نیشانەی لە ئیدومینیوس گرتەوە، بەڵام ئیدومینیوس کە ئەوی بینی بەرەو ڕووی دەهات خۆی لە سەرەنێزەکەی لادا، نێزەکەی ئینیاس سەری

درد و بەگڤە گڤ تێپەڕی و بەسەرا لە عاردی چەقی. ئەوجا ئیدیومینیوس نێزەی خۆی هاویشت و ڕێك ناوقەدی (ئوینوماوس)ی گرت و زرێکەی شکاند و ورگ و ڕیخۆڵەی ڕژایە ئەو گۆڕە و کەوتە سەر ئەرزەکە و بەهەردوو دەست چنگی لەخاك و خۆڵەکەی ژێری گیر دەکرد. ئیدومینیوس نێزەکەی لە جەستەی ڕاکێشایەوە، بەڵام نەیتوانی چەکەمەنییە جوان و چاکەکانی دی لە شانی داماڵێ، چونکە لە هەموو لایەکەوە تیری بەسەردا دادەباری و بەرە بەرە هێز وشنگی لەبەر دەبڕا و توانای شەڕی نەدەما،

(٥١٣) نەدەیتوانی خۆی لەسەر پێیان ڕابگرێ و هێرش بەرێ و خۆی بەرزێ و سپەر و چەکەمەنییەکانی داپۆشێت و نە خۆی لە بەر خەڵکی لابدات. هەرچەندە هەوڵی دەدا بەرگری لەخۆی بکات و ئەجەلی بێڕوحم و بەزەیی لە خۆی دووربخاتەوە، بەڵام لاقە سست و قورسەکانی نەیاندەتوانی بەپەلە لە مەیدانی شەڕەکەی دوور بخەنەوە. لە کاتێکا کە هێدی هێدی پاشەکشەی دەکرد، دیفوبوس، کە ڕقی زۆری لێی بوو، بەنێزە درەخشانەکەی نیشانەی لێگرت، بەڵام ئەمجارەش نێزەکەی سەرچوو، و بەر (ئەسکالافوس)ی کوڕی ئێریش کەوت، نێزە قورس و گرانەکە ناوشانی دیواودەرکرد، ئەسکالافوس تەپاو تل کەوتە سەر زەوی و چنگی لە خاك و خۆڵەکەی ژێری گیر کرد.

(٥٢١) لەگەڵ ئەمەشدا ئێرسی ترسناکی دەنگ گەورە، هێشتا نەیدەزانی کە کوڕەکەی لە جەرگەی شەڕدا، کوژراوە. چونکە بەفەرمانی زیوس لە لوتکەکانی ئۆڵەمپدا و لەژێر هەورانی زێڕیندا دانیشتبوو، لە هەمان ئەو شوێنەی کە خواوەندەکانی دیکەش دوور لە گێروگازی جەنگ لێی دانیشتبوون.. لەم کاتەدا، شەڕڤانان لە دەوری جەنازەکەی ئەسکالافوس سەرقاڵی شەڕی ڕووبەڕوو و تەن بەتەن بوون. دیفوبوس کڵوخودە پرشنگدارەکەی لەسەری داماڵی. بەڵام میریونیسی هاوتای ئێریس پڕی دایێ و نێزەیەکی بەبازوویدا کێشا و کڵوخودەکە بەتەق و هوڕ لە دەستی کەوتە خوارەوە. ئەوجا میریونیس وەکو داڵاش جارێکی دی پەلاماری دایەوە و ڕمەکەی لە بازووە بریندارەکەی دەرهێنا و بۆ ناو ئاپۆڕەی هاوڕێکانی گەڕایەوە. بەڵام (پولیتیس)ی برای دیفوبوس، باسکی لەناوقەدی هاڵاند و لە هەراو هەنگامەی شەڕەکەی دوور خستەوە، تا گەیاندییە میرئاخوڕەکەی کە لە پشتی شەڕەکەوە بەعەرەبانە مکوم و ئەسپە خۆشبەزەکانییەوە چاوەڕوانی دەکرد، لەوێوە بەدەم ناڵەناڵی پڕ ئازار و چۆڕە چۆڕی خوێنی برینی تازەیەوە بۆ شاریان بردەوە.

(٥٤٠) جەنگاوەرەکانی دی لەسەر شەڕی خۆ بەردەوام بوون، هات و هاواری بەردەوامی

سەر دەگەییە ئاسمان. لەم کاتەدا ئینیاس، پڕیدایە ئەفاریوسی کوڕی کالیتور، کە دەسوڕایەوە تا شەڕی ئەو بکات، پڕیدایێ و بەنێزە تیژەکەی قوڕگی هەڵدڕی، سەری بەلادا خواربووەوەو سپەر و کێوخودەکەی بەسەریا کەوتن ومەرگی دژمنی ژیان تێی ئالاّ. ئەوسا ئەنتیلوخوس فرسەتی هێنا، هەرکە توون وەرسوڕاو پشتی کەوتە ئەو پەلاماری داو نێزەیەکی لێداو شادەماری پشتی پچڕی، و توون بەپشتا کەوتە سەر زەوی و دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردنەوەو داوای لە هاوڕێکانی دەکرد ڕزگاری بکەن.

(٥٥٠) بەڵام ئەنتیلوخۆس هەڵیکوتایە سەری تا زرێ وسپەروچەکەمەنییەکانی دی لێ دادەماڵێت، وزۆر بەسلۆکیو وریاییەوە ئەم کارەی دەکرد. چونکە تەروادەییەکان لە هەموو لایەکەوە دەوریان داو لە هەموو قۆڵێکەوە سپەرە پانو درەخشانەکەیان دایە بەر نێزە و ڕمان، بەڵام نەیانتوانی سپەرەکەی بسمن و جەستەی نەرم و ناسکی ئەنتیلوخوس بە برونزی دڵڕەق و بێ بەزەیی هەڵبدرن، چونکە پوسیدونی، هەژێنەری زەوی، بەوریاییەوە، کوڕەکەی نەستوری لە تیر و نێزان دەپاراست.. جا ئەنتیلوخوس هەرگیز خۆی لە دژمن و ڕەقیب نەدەدزییەوە، بەڵکو ڕووبەڕوویان دەبووەوەو شەڕی دەکردن و هەمیشە لەناوجەرگەی شەڕدا بوو. ڕمەکەی وەستانی بۆ نەبوو، هەمیشە حازر و ئامادە بوو،و بەهەر چوارنکالدا بای دەدا، هەمیشە تاسەمەندی ئەوە بوو لە دوورەوە بیگرێتە جەنگاوەرێکی دژمن و بیپێکێ یان لە نزیکەوە هەڵکوتێتە سەری و هەڵیدڕێت.

(٥٦٠) لەو کاتەدا کە ئەنتیلوخۆس بەو جۆش و خرۆشەوە، و لەناوجەرگەی شەڕەوە نیشانەی لە دژمن دەگرتەوە، ئەداماسی کوڕی ئەسیوس بەدی کرد، پەلاماری دا و نێزەیەکی برونزی تیژی خێواندێ و بەر ناوەڕاستی سپەرەکەی کەوت، بەڵام پۆسیدونی کەوەگیس کە ژیانی ئەنتیلوخۆسی بەلاوە گرنگ بوو، کاریگەری نێزەکەی بەتاڵ کردەوە. نیوەی نێزەکەی لە سپەرەکەی ئەنتیلوخۆسدا، وەکو مێخرنجیرێك لە ئاگردا دەمەزەرد کرابێ و زاخاو درابێ، مایەوە. نیوەکەی تری کەوتە سەر زەوی، ئەوجا ئەداماس بەماتە مات بەرەو ناو جەنگاوەرەکانی خۆی هەڵات تا خۆی لە دێوی مەرگ ڕزگار بکات و بدزێتەوە، بەڵام میریونیس دوای کەوت و ڕمێکی خێواندێ و ڕێك چوو بەبەینی ناوکی و ناوگەڵیدا، شەبەقی زامێکی پڕ سوێی تێخست. واتە نێزەکەی کرد بەناوگەڵیا، ئەداماس کەوت بەسەر ئەو پەیکانەدا کە پیکای، و کەوتە لەقەفرتێ میناکی ئەو جوانەگایەی کە گاوانان لە چیادا بەپەتێك دەیبەستنەوە و بەهەموو هێزێکیانەوە بەرەو خۆیان ڕایدەکێشن

و لەقەفرتێ دەکات، بەو ئاوایە جەنگاوەری زامدار بۆ چەند دەمێك لەقەفرتێی کرد، بەڵام زۆری نەخایاند، کە (میریونیس)ی قارەمان گەییە سەری و نێزەکەی لە لەشی دەرهێنا و تاریکی مەرگ باڵی بەسەر چاوانی ئەداماس دا کێشا.

(٥٧٦) ئەوجا هیلینوس بەشمشێرە درێژەکەی کە لە تراکیا زاخاو درابوو، هەڵیکوتایە سەر (دیبیرۆس) لە نزیکەوە کێشای بەلاجانگیا و کڵوخودەکەی لەسەری پەڕاند و کەوتە سەر ئەرزەکە و لەو کاتەدا کە بەژێر دەست و پێی جەنگاوەرەکانا غل دەبووەوە، یەکێك لە ئاخییەکان هەڵیگرتەوە، بەڵام تاریکی مەرگ چاوانی (دیبیروس)ی داخست.

(٥٨١) بەڵام مینیلاوسی دلاوەری نەعرەتەکێشی مەیدانی جەنگ و شەڕان، بەمە زۆر دڵگران و نارەحەت بوو، ئەو قارەمان و پاشایە نێزە تیژەکەی هەڵگرت و بەدەم هەڕەشە و نێزە بادانەوە بەپەلە بەرەو رووی هیلینوس چوو، (هیلینوس)ش لای خۆیەوە تیروکەوانی ڕاکێشا، هاوکات هێرشیان بۆ یەکتری برد، یەکێکیان بەنێزەکەی و ئەویتریان بەتیروکەوانەکەی،

(٥٨٦) بەو جۆرە کوڕی پریام تیرێکی هاویشت، بەر سینەبەندەکەی مینیلاوس کەوت، بەڵام تیرەکە گەڕایەوەو ڕۆیی. وەکو چۆن پاقلە ڕەشە یان نۆك لە خەرمانداو لەبەر بایەکی توند و بەدەستی جوتیارێکی بەهێز لەسەرەند دەدرێ و لە سەرەندەکە دەکەوێتە خوارەوە، بەو ئاوایە تیرەکە بەسپەرەکەی مینیلاوس کەوت و گەڕایەوەو دوورکەوتەوە. بەڵام مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس، نەعرەتەکێشی مەیدانی شەڕ، نێزەیەکی گرتە ئەو دەستەی کە کەوانەکەی گرتبوو، ئەو کەوانەی زۆر بەچاکی و وەستایانە سیقال کرابوو و ڕەونەقی هەڵهێنا بوو. نێزەی برونزین لەکەوانەکە تێپەڕی و بەر دەستەکە کەوت، هیلینوس بۆ ناو هەڤاڵەکانی خۆی هەڵهات تا لە دێوی مەرگ بخەلەسێ. لەو کاتەدا دەستی بەلاقەد یا شۆڕ بوو بووەوە و نێزە دەرداری (جۆرە درەختێکە)یەکەی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا. بەڵام ئەجینوری هەژی نێزەکەی لە دەستە زامدارەکەی دەرهێنا، و زامەکەی بەو قۆچەقانییە خورییە بەست کە بەهاورێ و میرئاخورەکەی بوو.

(٦٠١) ئەوجا پیساندر ڕاست و بەپەلە بەرەورووی مینیلاوسی سەرفراز چوو، بەڵام چارەنووسی شووم بەرەو مەرگی دەبرد چونکە دەبوایە لە جەرگەی شەڕدا بەدەستی تۆ بکوژرێ ئەی مینیلاوس. کە ئەو جووتە لێکدی چوونە پێشێ و کەوتنە شەڕەوە نێزەکەی کوڕی ئوتریوس نیشانەی نەپێکا و سەرچوو.پیساندر سپەرەکەی مینیلاوسی هەژی پێکا،

بەڵام نەیتوانی سپەرەکە شەق بکات و دیواودەر کونی بکات، سپەرەکە وەکو خۆی مایەوە و نێزەکە لە دەسکەکەیەوە شکا. پیساندر لە دڵی خۆیدا شادمان بوو و ئومێدی بەسەرکەوتن پەیدا کرد.

لێ کوڕی ئوتریوس هەڵیکێشایە شمشێرە زیونیشانەکەی و پەلاماری پیساندری دا. (پیساندر)ش تەورزینێکی برونزی لە پشت سپەرەکەیەوە دەرهێنا، دەسکێکی درێژی لەدار زەیتونی مشت و ماڵ دراوی پێوە بوو، هەردوو جەنگاوەر لە یەك کاتدا پەلاماری یەکتریان دا. ئەلهەقی پیساندر قوبەی کۆوخودەکەی مینیلاوسی پێکا –کە بەباڵی ئەسپ گولینگی بۆ کرابوو، ڕێك ژێر باڵەکەی پێکا- بەڵام مینیلاوس لەوکاتەدا کە پیساندر بەرەو رووی دەهات، نیشانی لێگرتەوە و ڕێك ناوچەوانی، سەرووی کەپووی پێکا، ئێسکەکەی شکاند و هەردوو چاوە خوێناوییەکەی دەرپەڕین و کەوتنە سەر خۆڵەکەی بەر پێی. بەخۆیشی بەپشتا کەوتە سەر زەوی، مینیلاوس پێی خستە سەر سینگی و زرێ و چەکەمەنییەکانی لێ داماڵی و بەغروری سەرکەوتنەوە هاواریکرد: "ئەی تەروادەییانی لەخۆ ڕازی، ئەی ئەوانەی لە جەنگ و شەڕ تێر نابن، بەو شێوە دەبێ بەسواری ئەسپەرەهوانەکانتان کەشتی دانابییەکان بەجێ بهێڵن. ئێوە کە نەنگ و شەرمەزاریتان بەسەر هێنام، ئەی سەگانی چەپەڵ، ئێوە کە ئەو هەموو نەهەقی و بەدکرداریەتان دەربارەی من کرد، هیچ لە غەزەبی زیوسی بروسکەوان، زیوسی میواندۆست، خواوەندی میوانو خانەخوێ ،نەترسان،

(٦٢٥) ئەو (زیوس)ەی ڕۆژێ لە ڕۆژان شارە شکۆدارەکەتان وێران دەکات.. ئێوە ئەوەن بێ هیچ هۆ و بیانوویەك، کە لەسەرای خێزانەکەمدا بەگەرمی پێشوازی کران، میواندارییتان لێکرا، کەچی هەستان خۆی و سەروەت و سامانەکەیتان لە کەشتی ناو بەدەریادا رفاندتان.. ئێستاش گەرەکتانە کەشتییەکانمان لە دەریادا بسووتێنن، دەتانەوێ قارەمانانی ئاخیایی بکوژن. نەخێر بەو ئاواتە ناگەن، ڕۆژێ دێ ناچاربن دەست لەشەڕ هەڵگرن!.. ئەی بابە زیوس، خەڵکی دەڵێن تۆ لە دانایی و ئەقڵمەندیدا لەسەرووی هەمووانی، لەسەرووی خواوەندان و بەشەرانی، کەچی هەر تۆ سەرچاوەی ئەم هەموو بەدبەختی و کوێرەوەرییانەی، تا ئەو کاتەی تۆ ئەم خەڵکە شەڕخوازانەت خۆش بوێ، پشتیوانیان لێبکەی، دەست بەرداری شەڕ نابن و لە کوشت و کوشتار تێرنابن!.. بنیادەمان لە هەموو شتێك تێر و بێزار دەبن، لە خەو، لە ڤیان و ئەڤین، لە ستران ولاوژەی دڵگیر، لە ڕەقسین

و سایی.. کە هەر هەموو ئەمانە زۆر لەشەڕ خۆشترن و مایەی کامەرانی بەشەرن، کەچی تەروادەییەکان هەمیشە هەر تینوی شەڕن،

(٦٤٠) مینیلاوسی بێ وێنە ئەو قسانەی کرد و سپەڕ وزرێ خوێناوییەکەی لە لەشی پیساندروس داماڵی و دانی بەهاوڕێکانی و بەخۆی گەڕایەوە بۆ ناو جەنگاوەرەکانی ڕیزی پێشەوەی شەڕەکە.

(٦٤٣) لەم کاتەدا (هارپالیون)ی کوڕی شا پیلایمنس، کە لەگەڵ بابە ئازیزەکەیدا بۆ شەڕی تەروادە هاتبوو، و چارەنووسی ئەوە بوو کە جارێکی دی بۆ خاکی نیشتمان نەگەڕێتەوە. بەڵا هارپالیون هێرشی بۆ برد، لە نزیکەوە نێزەکەی گرتە سپەرەکەی کوڕی ئوتریوس (مینیلاوس)، بەڵام نەیتوانی سپەرەکە بسمێ و ببڕێ، جا بۆ ئەوەی لە مردن بخەلەسێ بەلەز بۆ ناو ئاپۆرەی هاوڕێکانی گەڕایەوە، بەدەم پاشەکشەوە ئاوڕی هەموو لایەکی دەدایەوە نەوەك یەکێك دەرفەتی لێ بێنێ و بەبرونز برینداری بکات.کەچی هێشتا بەتەواوەتی پاشەکشەی نەکردبوو، کە میریونیس تیرێکی نوك برونزی سرەواندێ و بەر سمتی ڕاستی کەوت و ئێسکەکەی بڕی و گەییە میزەڵدانی. هارپالیون هەر لە جێوە کەوت و بەباوەشی هاوڕێ ئازیزەکانییەوە گیانی دەرچوو، وەکو کرمێك کەوتە سەر زەوی و خوێنێکی ڕەشی لەبەر دەڕۆیی و زەوییەکەی تەڕ کرد. بافلاگونییە دلێر و ورە بەرزەکان دەوریاندا و لە گالیسکەکەیان بار کرد و بەخەم و پەژارەوە بۆ تەروادەی پیرۆزیان برد، باوکیشی بەدەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە لەگەڵیاندا ڕۆیی و هیچ سەربەهاو هێزێك نەبوو کوڕە مردووەکەی بۆ بژێنێتەوە!

(٦٦٠) پاریس بەمردنی هارپالیون زۆر خەمبار و تورە بوو، چونکە کاتی خۆی لەنێو هەموو بافلاگونیەکاندا میوانی ئەو بوو، پاریس لە حەژمەتاو لە داخی دڵی خۆی تیرێکی نوك برونزی بەئاسماندا هاویشت.. جا پیاوێك هەبوو بەناوی یوخینور، ئەم پیاوە کوڕی پولیدوسی غەیبزان و نجومگەربوو، کە پیاوێکی دەوڵەمەند و خانەدان و ئازابوو، کە کۆشك و ماڵەکەی لە کورینت بوو، ئەم پیاوە (یوخینور) وەختێ کە بەسواری کەشتی بەرەو تەروادە دەچوو، دەیزانی بەرەو پیری مەرگ دەچێت، چونکە بابە پیرەکەی، پولیدوس زۆرجار پێی گوتبوو کە یا بەدەم نەخۆشی و دەرد و ئازارێکی سەختەوە لە ماڵەوە دەمرێ، یان لە ناوەندی کەشتی ئاخییەکاندا، بەدەستی تەروادەییەکان دەکوژرێت. بۆیە هەوڵی دەدا هەم لە ئازاری لۆمەی ئاخییەکان بخەلەسێ و هەم لە نەخۆشی و ئازاری نەخۆشی..

جا تیرەکەی پاریس بەر ئەم پیاوە کەوت، ڕێك لەێر گوێچکەیەوە بەر شەویلاگەی کەوت، یەکسەر گیانی دەرچوو، و تاریکی مەرگ باڵی بەسەر چاوەکانیا کێشا.

(٦٧٣) ئا بەو جۆرە وەکو ئاگری هەڵایساوی نێڵە نێڵ بەگژ یەکدی دا دەچوون و شەڕی یەکتریان دەکرد. بەڵام هیکتۆری خۆشەویست و نازپەروەردەی زیوس، نەی بیستبوو، و نەیزانی بوو کە ئارغیفییەکان (ئارگۆسییەکان) لە قۆڵی چەپی شەرگەکەوە هێرشیان هێناوەتە سەر جەنگاوەرەکانی و ئەگەر کار وا بڕوات بەم زووانە سەرکەوتن و سەرفرازی بۆ خۆ وەدەست دێنن، چونکە پوسیدونی خواوەندی پارێزەر و هەژێنەری زەوی ئارگۆسییەکانی بۆ شەڕ هاندەدا و بەهێزی بازووی خۆیشی یارمەتی دەدان. بەڵام هیکتۆر ڕووی کردە ئەو شوێنەی کە هەوەڵجار لێوەی وەژوور کەوت، ڕوویکردە دەروازە و دیوارەکان، ڕوویکردە ئەو شوێنەی کە دڕی بەدانابیانی سپەرداردا، ئەو شوێنەی کە کەشتییەکانی ئەجاکس و پوتیسیلاوس هاتبوونە کەنار و لەنگەریان گرتبوو، کە حەسارەکە لەو ئاستەدا زۆر نزم بوو. ئا لەوێدا، لەو شوێنەدا شەڕی پیادە و گالیسکە زۆر گەرم بوو. لەوێدا، بیوتیان، یونیان —کە جلی دەڵب و شۆڕیان لەبەر بوو- لوکریان، پیتیان و ئیپیانی جەربەزە و بەناوبانگ دەبوایە هەموو هێز و توانای خۆیان بخەنە کار تا هێرشی هیکتۆری دلێر بۆ سەر کەشتییەکان ڕابگرن. بەڵام هەرچیان دەکرد و دەکۆشا نەیاندەتوانی هیکتۆری مەزن کە لە مەشخەڵی ئاگر دەچوو لە کەشتییەکان دوور بخەنەوە. ناودارانی ئاتینی هەڵبژێردرابوون کە لەبەرەی پێشەوە بجەنگن، ئەمانە مینستیوسی کوڕی بیتیوس، بەیاریدەی فیداس و ستیکیوس و بیاسی نەبەز ڕابەرایەتی دەکردن. میگیسی کوڕی فیلیوس و ئەمفیون و دراکیوس ڕابەرایەتی ئیپیانییەکانیان دەکرد. میدون وبودارکیسی شێرە پیاو سەرداری بیتیان بوون. هەڵبەتە میدون کوڕی ناشەرعی ئۆلیوس و برای ئەجاکس بوو، ئەمە لە فیلاکیدا و دوور لە خاکی نیشتمانی خۆی دەژیا، چونکە برایەکی (ئێریوبیسی) زڕدایکی خۆی، واتە ژنی ئۆیلیوسی کوشتبوو، (بودراکیس)ش کوڕی ئیفیکلوسی کوڕی فیلاکوس بوو، ئەم دووانە وەکو سەرکردەی پیتیان، سەراپا چەك شانبەشانی بوتیەکان وەستان و جەنگاوەرانە و جوامێرانە بەرگرییان لە کەشتییەکان دەکرد.

(٧٠١) ئەجاکسی کوڕی گوربزی ئۆلیوس، بۆ دەمێکیش لە ئەجاکسی کوڕی تیلامون دوور نەدەکەوتەوە. وەکو چۆن دوو جوانەگای سورخن پێکەوە و لەژێر یەك نیردا گاسن و هەوجارێکی قورس ڕادەکێشن و کێڵگەیەکی فراوان دەکێڵن و لە بنی شاخەکانیانەوە

تا سمەری سمەکانیان لە ئارەقەدا هەڵدەکشێت، و تەنیا نیرەکە تا کۆتایی کێڵانی کێڵگەکە لێکدیان جیادەکاتەوە، بەو ئاوایە جووتە ئەجاکس شانبەشانی یەکدی و نزیك بەیەکتر ڕێیان دەکرد. کۆمەڵە جەنگاوەرێکی شایستە بەدووی کوڕەکەی تیلامونەوە بوون، کە هەر کاتێ ماندوو بوایە و ئارەقەی بکردبوایەوە، سپەرەکەیان لێ دەستاند و بۆیان هەڵدەگرت. بەڵام (لوکریان)ەکان دوای کوڕەکەی ئولیوس کە جەنگاوەرێکی یەجگار ئازا بوو، نەکەوتن، چونکە ئەوانە ئەزموونی شەڕی دەستەویەخەیان نەبوو، ئەمە جگە لەوەی کە نە کێوخودی برونزیان لەسەر بوو نەسپەری بازنەیی و نە نێزەی لە درەختی بناو دروست کراویان هەبوو. بەڵکو بەپشتیوانی تیروکەوان و قۆچەقانییە لە بەن دروستکراوەکانیان دوای ئەجاکس کەوتبوون و بۆ شەڕی تەروادە هاتبوون، جا بەو تیر و بەردانەی کە بەو جەنگەوزارانە دەیان هاویشت هێزی جەنگاوەری تەروادەییەکانیان تێك دەشکاند. لەو کاتەدا کە ئەوانەی لە پێشەوە بوون و سپەر و زرێ لەبەر و نێزە بەدەست شەڕی تەروادەییەکان و هیکتۆری برونزپۆشیان دەکرد و ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، ئەوان لە پشتەوە و لە حەشارگەکانی خۆیانەوە تیر و بەردیان بەسەریاندا دەباراند. بەو جۆرە تەروادەییەکان بەرە بەرە ورەیان بەردەدا، چونکە ئەو تیرو بەردانە تەواو شپرزەی دەکردن.

(٧٢٣) دوای ئەوەی تەروادەییەکان چی وای نەمابوو دەستبەرداری کەشتی و خێوەتەکان بن و بەرەو تەروادەی بەردەم ڕەشەبا پاشەکشە بکەن، ئەگەر پولیداماس فریا نەکەوتبا و جارێکی دی بەهیکتۆری نەگوتبا:"ئەی هیکتۆر لێك حاڵی بوون لەگەڵ تۆدا یەجگار ئەستەمە، تۆ گوێ لە ڕاوێژ و ئامۆژگاری کەس ناگریت.چونکە خواوەند لەواری جەنگ و نەبەردا بەسەری کردویتەوە و بەهرەو توانایەکی فرەی داویتێ، لە خەڵکانی دیکە باڵا دەست تری، دەتەوێ لە ئامۆژگاری و ڕێنوێنی و بەردەباریشدا لە خەڵکانی دیکە زاناتر و هوشیار تر بی. بەڵام تۆ ناتوانی لەیەك کاتدا و لە هەموو بوارەکاندا هەر بەهرەدارتر و باڵادەست تر بی.ئەوە بەشی خواییە. زیوس بەهرەی شەڕ و شەڕڤانی بەهەندێك دەدات، بەهرەی سەما و ڕەقسین بەهەندێکی دی، و بەهرەی سێتارژەنی و گۆرانی بەهەندێکی دی دەدا، جا زیویسی دوورئەنێش و دوور بین ئەقڵ و زیرەکییەکی سوودمەند بەیەکێکی دی دەدات کە خەڵکێکی زۆر سوودی لێ دەبینن، ئەم ئەقڵمەندە زانایە بەکۆمەکی ئەقڵی خۆی، زۆر کەس لە خەتەر و تالوکە و فەوتان ڕزگار دەکات، و ئەو کەسە هەر خۆی قەدر

وجوانیی ئەو بەهرەیە دەزانێ. جا بۆیە من ئەوەی بەئەقڵمدا هاتووە و بەباشترین ڕێنوێنی دەزانم بەتۆی دەڵێم: ئەوی ڕاستی بێ ئاگری شەڕ دەورا و دەوری گرتویت و،

(٧٣٦) تەروادەییەکان، تەروادەییە دلێرەکان کە ئێستا لە بورج و دیوارەکە تێپەڕیوون، هەندێکیان بەتەنێ و بەچەکی تەواوەوە لە دوورەوە وەستاون، هەندێکی دیکە کە ژمارەیان کەمترە، بەپەڕاگەندەیی لە بەینی کەشتییەکاندا شەڕی دژمن، دژمنێکی فرە ژمارە دەکەن. کەواتە خێراکە بۆ بەرەی پاشەوە بگەڕێوە و هەموو فەرماندە ئازاکانت بۆ ئێرە بانگ بکە، تا پێکەوە تەگبیرێك بکەین و بزانین ئاخۆ هێرش بەرینە سەر کەشتییەکان بەو ئومێدەی کە خوا سەرکەوتنمان وە نسیب بکات، یان تا کار لەکار نەترازاوە بەسەلامەتی پاشەکشە بکەین. من بۆ خۆم لەوە دەترسم ئاخییەکان تۆڵەی تەواوەتی دوێنێمان لێ بکەنەوە، چونکە لەوێ، لەلای کەشتییەکانیان پیاوێکی پشوو درێژ هەیە کە هەرگیز لەشەڕ وەڕز نابێ و چاوەڕوانە، پیاوێك کە پێم وانییە تا ماوەیەکی زۆر هەر دوورە پەرێز دەبێ.

(٧٤٨) هیکتۆر زۆری کەیف بەڕاوتەگبیرە بەجێیەکەی پولیداماس هات، و یەکسەر بەهەموو چەك و تاقمەکەیەوە، خۆی لە عەرەبانەکەی هەڵدایە خوارێ و ڕوویکردە پولیداماس و گوتی: "پولیداماس تۆ هەموو فەرماندە ئازاکان لێرە خربکەوە و منیش دەچم بۆ ئەوێندەر، بۆ شەڕەکە و هەر کە دەستوری تەواوم دانێ بەلەز دەگەڕێمەوە."

(٧٥٤) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، بۆی دەرچوو، لە تۆ وایە چیایەکی سەر بەبەفر و بەستەڵەکە، و نەعرەتەیەکی بەرزی کێشا و لەناو هەموو تەروادەیی و هاوپەیمانەکانیانا دەنگی دایەوە. هەر کە گوێیان لە دەنگی بوو هەموویان لە دەوری پولیداماسی کوڕە شکۆدارەکەی پانتوس خڕبوونەوە، بەڵام هیکتۆر لە ڕیزەکانی پێشەوەدا بوو و چاوی بۆ دیفوبوس، هیلینۆسی شازادەی مەرد ورەند، بۆ ئەداماسی کوڕی ئەسیوس و ئەسیوسی کوڕی هیرتاکۆس دەگێڕا، بەڵام بێهودە بەتەمای دیتنیان بوو، چونکە هەندێکیان لای کەشتی ئاخییەکان کەوتبوون و گیانیان دەرچوو بوو، بەدەستی ئارگۆسییەکان کوژرا بوون.هەندێکی دیکەیان بریندار بووبوون دوور و نزیك پەنایان بردبووە بە بورج و حەسارەکانی شار. بەڵام لە قۆڵی چەپی شەڕە تووشەکەوە پاریسی مەزن، پاریسی مێردی هیلینی شۆخ و شەنگی بینی کە جەنگاوەرەکانی بۆ شەڕ دنەدەدا، لێی چووە پێشێ و گوتی: "پاریس، ئەی شوم، ئەی شملی شەڕ، ئەی جوانخاس، ئەی شەیدای مێبازی، ئەی خاپینۆك.. درۆزن، پێم ناڵێی کوا دیفوبوس و شا هیلینوس؟ کوا داماسی

کوڕی ئەسیوس و ئەسیوسی کوڕی هیرتاکۆس؟ ئەی ئوتریونیوس لە کوێیە ؟.. ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە "ئیلیون" لە بەرزییەوە دەکەوێتە خوارێ و وێران دەبێ، و ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە لە فەوتان ناخەلەسیت.

(٧٧٤) ئەلکساندەری جوانخاس، قۆز میناکی خواوەندان وەڵامی دایەوە و گوتی: "تۆ ئەمڕۆکە بەناهەق من سەرزەنشت دەکەی، هەر ڕۆژێك درێغیم لە شەڕ کردبێ، ئەمڕۆکە درێغیم نەکردووە، چونکە دایکم بەترسنۆکی منی نەهێناوەتە دنیا، لەو ڕۆژەوە کە تۆ شەڕت هێناوەتە نزیکی کەشتییەکان، و ئێمە دوات کەوتوین، لێرەدا و لە یەکبینە شەڕی دانایییەکان دەکەین. بەڵام سەبارەت بەو هاوڕێیانەی کە لێیان دەپرسیت، هەر هەموویان مردون جگە لە دیفوبوس و میری بەجەرگ هیلینوس، کە زیوس لە مەرگ ڕزگاری کردن، هەردوکیان بەبازووی برینداروە، کە بەڕمی درێژ بریندار بوون، بۆ ئیلیون گەڕاونەتەوە. جا ئێستاش بەکەیفی دڵی خۆت بکە و بۆ ئەو شوێنەمان ببە کە دڵ و ڕۆحت گەرەکیەتی، بەدڵ و گیان دوات دەکەوین.تا هێز و توانامان تیا بێ درێغی ناکەین، جا پیاو چەند ئازا بێ و چەند تامەزرۆی شەڕ بێ، هەر ناتوانێ لە توانای خۆی زیاتر بجەنگێ.

(٧٨٨) بەو قسانە دڵی براکەی نەرم کرد، بەدوو قۆڵی بەرەو ئەو شوێنە چوون کە شەڕ گەرم بوو، پولیداماس، سپریون، فالیس، ئورتیوس، پولفیتوس، پالمیس، ئەسکانیوس و موریسی کوڕانی هیپوتیون.. کە دوێنێ بەیانی لە (ئەسکانیا)ی بەپیت و بەرەکەتەوە بۆ یارمەتی پریام هاتبوون، هەموو لەوێندەر خڕ بوونەوە و دەوریان گرتن، زیوس هەموو ئەمانەی جۆشدا و بەرەو شەڕی کێشان. وەك چۆن لە ئەنجامی هەورە بروسکەیەکی زیوسەوە، گێژەڵوکەیەکی سەرشێت بەسەر عاردیدا هەڵبکاو بەگڤ و هۆڕێکی سامناك خۆی بەدەریادا بکات و شەپۆلانی گەورە و کەف چەرینی یەك لەدوای یەك بەرەو کەناری دەریا دوای یەکتر دەکەون، بەو ئاوایە تەروادەیییەکان ڕیز لەدوای ڕیز بەخۆ و سپەرە پرشنگدارەکانیانەوە دوای فەرماندەکانیان کەوتن، هیکتۆری هاوتای ئیریسی قرکەری بەشەران ڕابەرایەتی هەموویانی دەکرد. هیکتۆر سپەرە بازنەییەکەی لە پێش خۆیەوە گرتبوو، ئەو سپەرەی کە لە چەند چینە چەرمێکی ئەستور دروست کرا بوو، و لۆیەکی برونزینشی لێنرا بوو. کێوخودێکی پرشنگدارشی لەسەربوو کە تا لاجانگ و گۆناکانی داپۆشی بوو. هیکتۆر لە سایەی ئەم سپەرەدا ڕابەرایەتی جەنگاوەرەکانی دەکرد و ئاوری ئەم لاو ئەولای دەدایەوە تا بزانێ کە ئاخۆ بەدوایەوەن یان نا. بەڵام وێڕای

ئەمەش نەیتوانی دڵی ئاخییەکان بلەرزێنێ، ئەجاکس یەکەم کەس بوو لێی هاتە پێشێ و ڕووبەڕووی وەستا و پێی گوت: "ئەی جەنگاوەری دلێر، وەرە پێشترەوە، بۆچی لە هەوڵی ئەوەدای بەبێهودە جەنگاوەرەکانی ئێمە بترسێنێ؟ ئێمەش جەنگاوەری کارامە و بەئەزموونین، بەڵام وا غەزەبی زیوسی دڵڕەق گرتووینی، بێگومان پڕبەدڵ بەهومێدی ئەوەی کەشتییەکانمان بسوتێنێ و بەتاڵانیان بەری

(٨١٣) بەڵام ئێمەش بازوومان هەیە، بەهێزی بازوو بەرگرییان لێدەکەین. بەرلەوەی تۆ کەشتییەکانمان وێران بکەی، ئێمە شارە ئاوەدان و قەرەباڵغەکەتان بەدەستی خۆمان وێران دەکەین. جا من پێت دەڵێم کە ئەو ڕۆژە نزیك بووەتەوە.. کە بەناچاری هەڵێیت و لە زیوس و خواوەند نەمرەکانی دیکە بپاڕێیتەوە، کە ئەسپە یاڵ شۆڕەکانت، کە بەناو گەرد و تۆزی دەشتا بەرەو تەروادەت دەرفێنن لە تەیری تیژ باڵ، لەواشە تیژ ترین لەژێرتا.

(٨٢١) لەو دەمەدا کە ئەو بەو شێوەیە قسەی دەکرد، تەیرێك بەلای دەستە ڕاستا بەئاسماندا فڕی، جەنگاوەرانی ئاخیایی بەم نیشانە و مژدە خواییە خۆشحاڵ بوون، ورەیان بەرز بووەوە و بەشادییەوە هورایان کێشا.لێ هیکتۆری ناودار بەرسڤی دایەوە و گوتی: "ئەجاکس، ئەی درۆزنی خاپینۆك! ئەی فشەکەری لەخۆبایی، ئەی پاڵەوانە درۆینە، ئەم هەڕەشانە چییە؟ من وەکو چۆن دڵنیام کە هەمیشە فەرزەندی زیوسی سپەردار و هیرای ژنی ئەوم، وەکو چۆن دڵنیام ئەتینا و ئەپولۆ ڕێزم دەگرن، لەوەش دڵنیام کە ئەمڕۆ ڕۆژی بەدبەختی و نەگبەتی ئارگۆسییەکان دەبێت، و تۆش ئەگەر جورئەتی ئەوەت هەبێ چاوەڕوانی نێزە درێژەکەی من بکەی، ئەوا لە زومرەی مردووەکان دەبیت، ئەو نێزەیەی کە جەستەی سپی و ناسکی زەمەق ئاسات ئەنجن ئەنجن دەکات، هەنگێ کە لەبەردەم کەشتی ئاخییەکاندا دەکەویت، بەگۆشت و غەز و بەزی لەشت کسۆك‌ودالێن تەروادەییەکان خەنی دەکەیت.

(٨٣٣) ئەو قسانەی کرد و لە پێشی جەنگاوەرەکانییەوە کەوتە ڕێ، جەنگاوەرەکانیش بەدەم هاواری بەرزەوە دوای کەوتن و هەموو سوپا لە دوایەوە لە نەعرەتەیاندا. ئارگۆسییەکانیش بەهاوار و نەعرەتەکێشان وەڵامیان دایەوە، بەبێ ئەوەی ورە بەر بدەن یان بترسن، ڕووبەڕووی هێرشی ئازاترین تەروادەییان وەستانەوە، هاوار و نەعرەتەی هەردوو سوپاکە ئاسمانی شەق کرد و گەییە عەرشی عەزیمی نوربەخشی زیوس.

# سروودی چواردەیەم

## هیرا، زیوس تەفرە دەدات

**حیکایەتەکە:**

**نەستور لە خێوەتەکەی خۆیدا بوو، گوێی لە هەرا و زەنایەکی بەرز بوو، وەدەرکەوت و چاوی بەفەرماندە یۆنانییەکان و بەئاگامەمنون کەوت کە چاودێری شەڕەکەی دەکرد سەیری کرد تەروادەییەکان لە سەرکەوتنێکی گەورەدان، بۆیە ترسی ئەوەی لێ نیشت ئارغیفییەکان (ئارگۆسییان) قڕیان تێبکەوێت، پێشنیازی کرد گریکەکان بەرەو کەشتییەکان پاشەکشە بکەن، چاوەڕوانی ئەوە بکەن زیوس دەستبەرداری تەروادەییەکان بێ و ئاوڕێکی بەخێر لە ئارگوسییەکان بداتەوە لێ ئۆدیسیوس هەستی بەمەترسی ئەم پێشنیازە کرد و ڕەتی کردەوە و داوای کرد شەڕ بەردەوام بێ ،چونکە پاشەکشە بۆلای کەشتییەکان دەیکردە وێرانی و سوتانی کەشتییەکان و مردن لە غەریبی و دووره وڵاتی. ئەو ڕایەش کە بریندار نابێ شەڕ بکات هەر ڕایەکی هەڵەیە بریندار دەتوانێ لەبەرەی پاشەوە جەنگاوەران هانبدات، ئەگەر جاری دووەم بریندار بووەوە با بۆلای کەشتییەکان پاشەکشە بکات. پوسیدون لە بارەگاکەی خۆیەوە لەژێر دەریا وەدەرکەوت و کەوتە دنەدانی ئاخییەکان بۆ شەڕ و خۆڕاگری و پێی ڕادەگەیاندن کە دەست بەسەر تەروادەدا دەگرن. کاتێ هیرا بینی ئاخییەکان لە مەترسیدان ناردی بەشوێن ئەفرۆدێتی خواوەندی جوانی و ڤینادا داوای لێکرد هەندێ لەو شتانەی بەئەمانەت بداتێ کە ئەقڵی بەشەر و خواوەند دەبات، ئیدی کەمەربەنێکی دایێ کە هەموو شتێکی تیا بوو بۆ فریودان و ڕاکێشانی خواوەندان و بەشەران. ئەوسا پەنای بۆ خواوەندی (خەو) برد و داوای لێکرد یارمەتی بدات ،بەڵام ڕەفزی کرد چونکە جارێك یارمەتی دابوو، زیوس لێی توڕە بوو بوو و ئەگەر خۆی لە جەرگەی تاریکی شەودا نەشاردبوایەوە لەوەبوو بیکوژێت. ئیدی بەڵێنی دەداتێ کە بچووکترین یەزدانخانمی جوانی و ناز و نیعمەتی کە زۆری حەز لێبوو بۆ بکات بەبووك و بیداتێ.**

دوای ئەوەی پۆسیدون بەئاوی ڕوباری ستیکس سوێندی بۆ خوارد، ئەم سوێندەی کە خواوەندانش ناتوانن لێی ژێوان ببنەوە و نەیبەنە سەر، ئەویش (خواوەندی خەو) قاییل بوو و لەگەڵیا ڕۆیی. هیرا چوو بۆلای زیوس و بەکەمەربەنەکەی ئافرۆدێت هەستیارترین ئارەزووی بزواند و فریوی دا و چووە ناو نوێنەکەیەوە، لەوێدا دوای ڕاموسانێکی قوڵ و دەست لە ملانێ و هاوباخەڵی، خەوی لێکەوت. هیرا داوای لە (خەو) کرد پوسیدون ئاگاداربکاتەوە کە زیوس نووستووە و دەتوانێ بەئارەزووی خۆی یارمەتی ئاخییەکان بدات، هەنگێ پوسیدون بێ خەم کەوتە هاندانی جەنگاوەرەکان، داوای لێکردن کە هەر جەنگاوەرێکی بەهێز زرێ و سپەری گەورە و چاك هەڵگرێ و زرێ و سپەرە بچوك و خراپەکەی خۆی بدات بەجەنگاوەری لاواز، ئیدی ئاخییەکان خۆیان ڕێکخست و توانیان بەکەڤرێکی گەورە هیکتۆر بپێکن و بۆ ماوەیەك وەکو (خەو) بەپۆسیدونی ڕاگەیاند تەروادەییەکان لە کەشتییەکانیان دوور بخەنەوە.

زەمەن:

هومەر، هێشتا لە ڕۆژی بیست و هەشتەمی گێڕانەوەکەیدایە.

شوێن:

شوێنی بویەر و ڕووداوەکان هەمە جۆرە: ئۆڵەمپ و ئیدا و کەناری دەریا کە شەڕ لەوێدا گەرمبوو. شوێنێکی دیکەش هەیە،کە هیکتۆریان بۆ گواستەوە ئەویش ڕوباری (ئیکسانتوس) بوو.

(١) نەستور لە خێوەتەکەی خۆیدا دانیشتبوو و مەی دەخواردەوە، بەڵام هەرا و زەنای جەنگ گەییە گوێی، ڕوویکردە کوڕەکەی ئەسکیلیبیوس و گوتی: "ئەی ماکایونی پاکزاد، ئەی خانەدان ئەمە چییە؟ هەراو زەنای جەنگاوەران لە نزیکی کەشتییەکانی ئێمەوە دێت، و تادێ زیاتر دەبێ تۆ لێرە دانیشە و بادەی خۆت بخۆرەوە، تا هیکامیدی زلف شۆڕ حەمامت بۆ گەرم بکات و خوێنی وشکەوە بووی سەر زامەکەت بشویت. منیش دەچمە دەرێ تا بزانم لە مەیدانی شەڕ چ باسە.

(٩) ئەو قسەیەی کرد و سپەرەکەی (تراسیمیدسی) کوڕی تراسیمیدسی ڕامکەری ئەسپان، کە لە خێوەتەکەی ئەودا دانرا بوو، ئەو سپەرە مکومەی لە برونزدا دەبریقایەوە، هەڵگرت. چونکە تراسیمیدس سپەرەکەی بابی بردبوو.. ئەوسا نەستور نێزەیەکی مکومی نوك تیژی برونزینی هەڵگرت و هەر کە لە خێوەتەکە هاتەدەرێ هەڵوەستەیەکی کرد ،دیمەنێکی ناجۆری بینی سەیری کرد ئاخییەکان خراپ شکاون، هەموو سەرگەردان و پەرێشان، حەسارەکەیان ڕوخاوە و هەریەکە و بەلایەکدا لەبەر تەروادەییەکان هەڵدێن. جا وەکو چۆن دەریایەکی گەورەی بەشەپۆلان ئاوس، چاوەڕوانی هەڵکردنی بایەکی توند و سەرکێش دەکات ،مات و مەنگ و سەرگەردان بەهیچ لایەکدا ناڕوات، تاوەکو بایەك لەلای زیوسەوە دێ و ئاراستەی دەکات. نەستوری پیرەمێردیش بەو شێوەیە تیامابوو نەیدەزانی وەگەڵ هێزی شەڕڤانانی ئاخیایی بکەوێ یان بڕوات و منەی ئاگامەمنون بکات. لە ئەنجامدا بڕیاریدا کە واچاکترە بڕوات بۆلای کوڕەکەی ئوتریوس، لەگەڵ ئەوەشدا جەنگاوەرەکان لە گەرمەی شەڕدا بوون و یەکتریان دەکوشت ،و تەق و هوڕی زرێ و قەڵغانە برونزییەکانیان، لەژێر زەبری نێزە و شیر و تیری یەکدیدا دەنگی دەدایەوە.

(٢٧) نەستوری پیر، ڕێکەوتی سەران و پاشایانی دەست پەروەردەی زیوسی کرد، واتە ڕێکەوتی کوڕی تیودیوس و ئودیسیوس و ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوسی کرد کە لە کەشتییەکانیانەوە دەهاتن و هیلاك و ماندوو لەگەڵ ئەو فەرماندە ناودارانەدا بوون کە بریندار بوو بوون، کەشتییەکانیان لە مەیدانی شەڕەکە دوور خرابوونەوە، چونکە یەکەم کەشتیانی کەنارەکە بوون، حەسارەکەش لە پشتی سەنگەرەکانەوە ڕۆنرابوو، ئیدی شوێنەکە تەنگ بوو بوو و کەنارەکە بەهەموو بەرینییەکی خۆیەوە جێی هەموو کەشتییەکانی لێ نەدەبووەوە، ئەمەش شوێنی جەنگاوەرەکانی تەنگ کردبوو، ئیدی کەشتییەکانیان لابردبوو و بەڕیز و لەدوای یەك ڕایانگرتبوون و کەنداوەکەیان پڕ کردبوو.

ئەم سەرکردانە، نێزە بەدەست و خەمبار و دڵتەنگ دەهاتن تا شەڕەکە بدینن، کە تووشی نەستوری پیر بوون دڵیان داخورپا و ترسیان لێنیشت، هەنگێ ئاگامەمنون بەدەنگی بەرز پێی گوت: "ئەی نەستور، ئەی کوڕی نیلیوس، ئەی مایەی شکۆ و سەرفرازی ئاخییان: بۆچی دەستبەرداری ئەم شەڕە بەشەرکوژە بوویت و بۆ ئێرە هاتوویت؟ لەوە دەترسم هیکتۆری لەشکرشکێن قسە و هەڕەشەکەی خۆی هێنابێتە دی. چونکە ڕۆژێك لە کۆبوونەوەیەکی خۆیاندا بەتەروادەییەکان دەڵێت کە تا کەشتی ئاخاییەکان نەسوتێنێ و نەمانکوژێت بۆ ئیلیون (تەروادە) ناگەڕێتەوە. کەچی وا هەست دەکەم هەموو ئەو هەڕ و گیڤانەی دێنە دی. هاوار بەماڵم! وادیارە ئاخییەکانی دیکەش وەکو ئەخیل لەدڵی خۆیاندا لێم پڕن و تەنانەت ئامادەنین بەرگری لە کەشتییەکانی خۆیانیش بکەن!

(٥٢) ئەوجا نەستوری جیرنیایی، سوارچاك و ڕامکەری ئەسپان بەرسڤی دایەوە و گوتی: "بەڵێ، ئەو شتانە لەم کاتەدا خەریکە دێنەدی، قسەکانت دروستن و تەنانەت زیوسی بروسکە دەنگیش ناتوانێ و نایەوێ نەخشەیەکی دیکە دانێ و گۆڕان لەم حاڵە بکات! سەیرە ئەو حەسارەی کە پشتمان پێی قایم بوو و واماندەزانی پەناگەیەکی لەشکان نەهاتووە بۆ کەشتییەکانمان و بۆ خۆمان هەرەسی هێناوە. تەروادەییەکان شەڕێکی توند و بێ ئامان لە نزیکی کەشتییە خێراکانمان دەکەن و بڕ بڕ جەنگاوەرەکانمان دەکوژن ،و هورا و نەعرەتەی شەڕ دەگاتە ئاسمان. جا ئەگەر بیرکردنەوە سودێکی هەبێ، ئێستا ئەوەمان لەسەرە تەگبیرێکی خۆمان بکەین و بیر لەوە بکەینەوە کە چۆن بتوانین ئەم کارە بگەیەنینە ئەنجام ،بەڵام سەبارەت بەجەنگ من ناڵێم بەخۆمان بچینە جەنگەوە. چونکە پیاوی شەکەت و زامدار ناتوانێ شەڕ بکات."

(٦٤) ئاگامەمنونی پاشای بەشەران وەڵامی دایەوە: "ئەی نەستور، ئەوا تەروادەییەکان شەڕیان هێناوەتە کەنار کەشتییەکانمان، نە حەسارە مکومەکە و نە ئەو خەنەکەی کە داناییەکان زۆری پێوە ماندوو بوون ،و لە دڵی خۆیاندا بەهیوا بوون کە ببێتە لەمپەر و سەنگەر و خۆیان و کەشتییەکانیان دەپارێزن، نەمان و فریامان ناکەون. جا من پێموایە ئەمە ویستی زیوسی بەتوانایە کە ئاخییەکان لێرە و دوور لە ئارگوس، غەریب و گۆڕ غەریب و بێ ناوونیشان بکوژرێن. من ئەوسا ئەمەم بۆ دەرکەوت کە زیوس پڕ بەدڵ و ڕاستگۆیانە یارمەتی داناییەکانی دەدا ،بەڵام ئەمڕۆکە بایداوەتەوە بەلای دژمنەکانماندا و پایە و سەرفرازی خواوەندانی نەمریان پێ دەبەخشێت، لە ڕادەبەدەر مدارایان دەکات و

هێزی لەبەر ئێمە بڕیوە و دەستی بەستوینەتەوە. جا وەرن بەقسەی من بکەن با هەموو کەشتییەکانی کەنارەکە بۆ ناو دەریاکە دوور بخەینەوە و لەوێ لەنگەر بگرین تا شەو دادێ. جا ئەگەر شەو و تاریکی شەو تەروادەییەکانی لەشەڕ خست ،ئەوا دەتوانین هەموو کەشتییەکانمان بکێشینەوە بۆ ناو دەریا چونکە هەڵاتن لە کارەسات و ڕۆژ ڕەشی، با بەشەویش بێ، نەنگ نییە .مرۆڤ ئەگەر لە کارەسات و مەرگ هەڵێ باشترە لەوەی ڕووبەڕووی ببێتەوە و ببێ بەقوربانی."

(٨٢) هەنگێ ئۆدیسیوس برۆکانی وێك هێنانەوە. نیگایەکی تورەی کرد و گوتی: "ئەی کوڕی ئۆتریوس، ئەم قسەیە چی بوو کە لە زارت دەرهات! ئەی بێنەوا! بریا فەرماندە و پاشای سوپایەکی دی دەبووی. سوپایەکی ترسنۆك و دوور لە هەر سەرفرازییەك نەك پاشا و فەرماندەی ئێمە. ئێمەیەك کە زیوس لە چارەی نووسیوین هەر لە منالییەوە تا پیری لەناو ئاگری شەڕی بەڵای گیانی بەشەڕاندا بژین تا ئەو کاتەی دوا بەیەکمان لەناودەچین و دەفەوتێین! ئەوە تۆ بەڕاستی دەتەوێ شاری تەروادەی فرە ڕێگاوبان، ئەو شارەی کە ئێمە ئەو هەموو ڕەنجەمان لە پێناویدا داوە، هەروا بەئاسانی بەجێ بهێڵی؟ تا زووە زارت لێکبنە نەبادا ئاخییەکانی دی ئەم قسە نابەجێیە لەزاری کەسێکەوە بژنەون کە حەکیمانە قسە دەکات و دارعەسای پاشایەتی لە دەستدایە و حوکمرانی ئەم هەمو لەشکرە گوێڕایەڵە دەکات. من ئەم تەگبیر و ڕایەی تۆ بەنابەجێ دەزانم و قەبوڵم نییە: تۆ دەتەوێ لە کاتێکا شەڕ لەوپەڕی گەرمیدایە کەشتییەکانمان بۆ ناو دەریا بکێشینەوە تا تەروادەییەکان کە ئێستا لە حاڵی هێرشدان و مەستی سەرکەوتنن بەئاواتی خۆ بگەن و بەتەواوەتی لەناومان بەرن. جا ئەگەر ئاخییەکان ببینن کەشتییەکان بۆ ناو دەریا کێشراونەتەوە ،سارد دەبنەوە و هێرش ناکەن. پاشەکشە دەکەن و هەر چاویان لە هەڵاتن و خۆدزینەوە دەبێت. هەنگێ ڕاو تەگبیرەکەی تۆ ئەی سەرداری لەشکرکێش، سەری هەموومان دەخوات."

(١٠٣) ئاگامەمنونی پاشای جەنگاوەران وەڵامی دایەوە: "ئەی ئۆدیسیوس، ئەلهەقی بەم ئیرادە توندەت ژانت بردە دڵمەوە. بەڵام خۆ من فەرمانم بەئاخییەکان نەداوە کە هەر دەبێ کەشتییەکانیان بۆ ناو دەریا بکێشنەوە. خۆ ئەگەر کەسێك هەبێ –گەنج بێ یان پیر- ڕاوتەگبیرێکی لەمەی من باشتری پێ بێ، زۆر خۆشحاڵ دەبم."

(١٠٩) هەنگێ (دیومیدس)ی قارەمان و نەعرەتەکێشی مەیدانی شەڕ، لە ناوەندیانەوە

هەستا و گوتی: "ئەو پیاوە تەگبیرکەرەی تۆ دەڵێیی نزیکە، ئەگەر بتانەوێ گوێ لە من بگرن و کەستان لەبەرئەوەی بەتەمەن لە هەمووتان بچووکترم گاڵتەم پێ نەکەن، ئەوا زووبەزوو دەیدۆزینەوە. من شانازی بەوەوە دەکەم کە لە باوکێکی ڕەسەن و خانەدان بووم، ئەویش (تیودیوس)ە کە لە خاکی تبس دا (تیبە) نێژراوە. بورتیوس سێ کوڕی بێ وێنەی دەبن. دوانیان ئاگریوس و میلاس لە پلیورون و کالودونی سەختدا دەژیان ،سێیەمیان ئونیوسی سوارچاك، کە باپیرەی من بوو و لەوانی دی ئازاتر و پیاوانەتر بوو، لە زاگە و زێدی خۆی مایەوە. بەڵام بابم پاش سەرگەردانییەکی زۆر لە ئارگۆس دا گیرسایەوە. هەڵبەتە زیوس و خواوەندەکانی دی ئیرادەیان لەسەری بووە، یەکێك لە کیژەکانی ماڵباتی (ئەدراستوس)ی خواست و ماڵێکی ئاوەدان و پۆشتە و پەرداخ و دەوڵەمەندی پێکەوەنا، زەوی و زار گەنمەجاڕێکی زۆری هەبوو، ڕەز و باخ و بێستانێکی گەورە و خۆشی هەبوو و پەز و مەڕ و ماڵاتێکی فرەی هەبوو، لەنێو ئارگوسییەکاندا دیار و لە ڕمبازیدا بەناوودەنگ بوو .بێگومان ئێوە بەخۆتان ئەمانەتان ژنەوتووە و ئاگادارن، بۆیە ئەوەی من لێرەدا دەیلێم ڕاست و دروستە .بۆیە ئێوە ناتوانن پێم بڵێن کەسێکی نارەسەن و ڕەچەڵەك بزرە و ئەو قسە و تەگبیرانەی کە ئێستا ڕێکورەوان پێتانی دەڵێم بەفشە بزانن و بەهەندی نەگرن. من دەڵێم هەرچەندە شەکەت و زامدارین ،بەڵام مادامێکی پێویستە، دەبێ بچینە شەڕەوە جا با لەوێ خۆ لە هەتەر و مەودای ڕمان دوور بگرین، نەبا جارێکی دیکە بریندار ببینەوە. خۆ هیچ نەبێ دەتوانین ئەوانی دی دندە بدەین و بۆ شەڕیان بنێرین. ئەوانەی کە تا ئێستا بەهۆی تووڕەییانەوە کەناریان گرتووە و بەهیچ جۆرێ شەڕ ناکەن.

(١٣٣) ئەو قسانەی کرد و هەموو فەرماندەکان قسەکەیان پەسەند کرد و بەڕابەرایەتی ئاگامەمنونی پاشای جەنگاوەران وەڕێکەوتن.

(١٣٥) پۆسیدونی خواوەندی زەوی هەژێن کە پەی بەڕاوتەگبیرەکەیان برد، خێرا خۆی لێگۆڕین و لە شێوە و هەیئەتی جەنگاوەرێکی پیردا بەگەڵیان کەوت. دەستی ڕاستی ئاگامەمنونی گرت و بەزمانێکی ڕوون و ڕەوان پێی گوت: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئێستا باوەڕی تەواوم وایە کە دڵی ڕقنی ئاخیل ،بەدیتنی کوشتار و شکست و هەڵاتنی ئاخییەکان یەجگار شادمان دەبێت، تووڕەیی وغەزەب هەموو ئەقڵێکی لێ سەندۆتەوەو چاك و خراپ لێکدی جیاناکاتەوە. بریا ئەو ڕقە دەیکوشت و یەکێك لە خواوەندەکان بەڵایەکی بەسەردا

دنیا. بەڵام سەبارەت بەتۆ خواوەندانی پیرۆز ،بەهیچ جۆرێ تورە نین.. نا نا لێت تورە نین. من پێموایە سەران و ردێن سپیانی تەروادەیی بەو زووانە بەسواری ئەسپەکانیان تۆز لەو دەشتە هەڵدەستێنن و بەپەلەپرووزێ کەشتی و خێوەتەکانی ئێوە بەجێدێڵن و بەرەو شارەکەی خۆیان هەڵدێن و تۆش بەچاوی خۆت ئەم بەزینەیان دەبینی."

(١٤٧) بەدەم ئەو قسانەوە ڕوویکردە دەشتەکە و بەدەنگێکی بەرز لە نەعرەتەی دا. ئەو دەنگەی لە ناخی خواوەندی زەوی هەژێنەوە دەرچوو دەتگوت دەنگی نۆ، دە هەزار جەنگاوەرە کە لە گەرمەی شەڕدا نەعرەتە دەکێشن. ئەو دەنگە جۆش و خرۆشێکی وەهای خستە جەرگی ئاخییەکانەوە کە یەکسەر ڕووبەڕووی سەختترین شەڕ و نەبەرد بوەستنەوە.

(١٥٣) هیرای زێڕین عەرش، لە لوتکەی ئۆڵەمپەوە ڕوانییە خوارەوە، کە بینی ئەو کەسەی جاران هەم برای بوو و هەم شوبرای، بەپەلە بەمەیدانی شەڕەکەدا دێ و دەچێت، زۆر حۆشخاڵ بوو. بەڵام لە هەمان کاتدا ئاوڕیدایەوە و سەیری کرد زیوس لەسەر لوتکەی چیای فرە کانیاو و سەرچاوەی ئیدادا دانیشتووە، دیتنی زیوس زۆری پەست و بێزار کرد. هەنگێ هیرای گرانقەدر، کەچاوانی لە چاوی ئاسکان دەچوو، دانیشت و لە فکران ڕاچوو کە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە، تا زیوسی سپەروانی پێ لە خشتە بەرێ و بیخافڵێنێ و بیری لەلای شەڕەکە نەهێڵێ. لە ئەنجاما وای بەباشزانی کە بەجوانترین شێوە خۆ برازێنێتەوە و جوانترین و باشترین جل لەبەر بکات و بچێت بۆ ئیدا، بەڵکو زیوس ئارەزووی ببزوێ و لەگەڵیا جووت بێ و هەمبێزی بێ و سەرەنجام خاو ببێتەوە و نەرمە خەوێکی لێ بکەوێ و ئاگای لە شەڕگەکە و جەنگەکە نەمێنێ.

(١٦٦) هەنگێ هیرا چوو بۆ ژوورەکەی خۆی. ئەو ژوورەی کە هیفایستوسی کوڕی بۆی دروست کردبوو و دەرگاکانی بەکلیل و کێلونێکی نهێنی دادەخران و جگە لە خۆی (هیرا) بەهیچ خواوەندێکی دیکە نەدەکرانەوە. خۆی بەو ژوورەدا کرد. دەرگا پرشنگدارەکانی لە خۆی داخست. هەوەڵجار زەیتێکی خوایی هێنا و لەشی ئارەزوو بزوێنی خۆی پێ پاك کردەوە. ئەوسا عەترێکی خوایی و زەیتێکی بۆن خۆشی ئەوتۆی بەخۆیدا کرد، کە هەر پێی نابایە کۆشکە برونزین ئاسمانەکەی زیوسەوە بۆنی هەموو ئەرز و ئاسمانی پڕ دەکرد. پاش ئەوەی ئەو عەتر و زەیتەی لە بەدەنی نەرم شل و جوانی دا، ئەوجا بەدەستی خۆی قژی شانە کرد و پرچە درەخشانەکەی هۆنییەوە و لە ترۆپکی سەرە یەزدانییەکەیەوە

بەرەوخوار ڕژابوو. ئەوجا جلێکی بۆنداری لەبەرکرد کە ئەتینا بەتایبەتی بۆی دروستکردبوو و هەموو هونەر و دەستڕەنگینی خۆی تیا بەکارهێنا بوو و بەهەزاران تەرز ڕازاندبوویەوە .هیرا ئەم جلەی بەدەرزیلەی زێڕین لە دەوری سینگ ومەمکی قایم کرد..ئەوجا پشتێنێکی سەد ڕیشوویی لە کەمەری بەست. ئەوجا هەر یەکێك لە گوێچکەکانی کە زۆر وەستایانە سمرابوون، بەگوارەیەکی سێ نقێمی شۆڕی بریقەداری یەجگار جوان ڕازاندەوە.

(١٨٣) ئەوجا شابانۆی ئاسمان سەرپۆشێکی جوانی بەسەرا دا ،کە لە سپێتیدا وەکو هەتاو پرشنگی دەهاویشت. جووتێ تەقتەقیلەی جوانی لەپێیە درەخشانەکانی کرد. دوای ئەوەی بەو هەموو شتانە خۆی ڕازاندەوە، لە ژوورەکەی وەدەرکەوت.. ئافرۆدێتی گاز کرد و لە خواوەندەکانی دیکەی دوورخستەوە و پێی گوت: "ئەی کیژی ئازیزم من داوایەکم لە تۆ هەیە نازانم بۆمی جێبەجێ دەکەی یان ڕەفزی دەکەی؟ چونکە من هەواداری ئاخییەکانم و تۆ لایەنگری تەروادەییەکانی.

(١٩٣) ئافرۆدێتی کیژ زیوس وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی هیرا، ئەی یەزادنخانمی هەژی و پایەبەرز، ئەی کیژی کرونۆسی مەزن.. ڕاز و خواستی دڵت بێ، دڵم دەڵێت ئەگەر لە تواناmدا بێت و کارێکی کردەنی بێ بۆتی ئەنجام بدەم."

(١٩٧) هەنگێ هیرا، خواوەندی هەژێ، ڕاستی لێشاردەوە و گوتی: "دەمەوێ ئەو ڤیان و ئارەزووەی کە تۆ خواوەندان و بەشەرانی پێ ڕام دەکەی و دەیانخەینە ژێر ڕکێفی فرمانی خۆتەوە، بەئەمانەت بمدەیتێ. بەتەمام بۆ ئەوپەڕی سنوری زەوی بەپیت و بەرەکەت بچم و سەردانی (ئوقیانوس)ی بابی خواوەندان و (تیتیس)ی دایکیان بکەم. چونکە کاتی خۆی وەختێ زیوسی دەنگ بروسکە، بابی خۆی ،کرونۆسی مەزنی لەژێر عاردی و بنی دەریادا لە قوڵایی تارتاردا حەپس کرد. ئەوان منیان لە دەستی "ریا" سەند و گرتیانمە خۆ و بەمیهر و سۆزێکی فرەوە بەخێو و پەروەردەیان کردم. هەقیان بەسەرمەوە هەیە و دەمەوێ بچمە دیدەنی وان و ئاشتیان بکەمەوە. چونکە زۆر دەمێکە لە یەکدی تۆراون و چوون بەقینا و تەنانەت لەگەڵ یەکتریشدا ناخەون و.. جا ئەگەر من بکارم بەقسە دڵیان نەرم بکەم وجێگە تێکەڵ بکەنەوە و ببنەوە بەهاوجێ و لەگەڵ یەکدیدا بخەون، بۆ هەتاهەتایە لە دڵیاندا ئازیز و لە چاویاندا هەژی دەبم."

(٢١١) ئەفرۆدێتی دەم بەپێکەنین وەڵامی دایەوە و گوتی: "ناتوانم داواکەت ڕەت بکەمەوە هەر ماقولیش نییە چونکە تۆ هاو باخەڵی زیۆسی سالار و سەروەری خواوەندانی."

(٢١٤) بەدەم ئەو قسانەوە کەمەربەندە زەرکفتەکەی لە پشتی کردەوە کە بەشێوەیەکی یەجگار سەیر دروستکرابوو. وێنە و دیمەنی هەموو جۆرە ئارەزووبزوێنیەکی لەسەر نەخشێنرابوو: وێنەی ڤیان، وێنەی دڵداری و ئاشقێنی، وێنەی ئارەزوو و ئارەزووکاری، وێنەی دەست لە ملانێ و ئامبازبوون. وێنەی ئیلاقە و گان کە ئەقڵ و هۆشی ئەقڵمەندترین ئاوەزداری دەبرد. بەڵا کەمەربەندەکەی لە پشتی کردەوە و نایە ناو دەستی هیرا و گوتی: "ئەم کەمەربەندە زەرکفتە کە بەشێوەیەکی زۆر سەیر دروستکراوە و وێنەی هەر هەموو جۆرە ئارەزوو بزوێنییەکی لەسەر نەخشێنراوە ،ببە و لە پشتی خۆتی بکە، من دڵنیام کە هەموو ئاواتێکی دڵت دێتەدی و بەنائومێدی ناگەڕێیتەوە."

(٢٢٢) هیرای هەژی، چاو کەژاڵ، بەدەم زەردەخەنەوە کەمەربەندەکەی وەرگرت و بەپێکەنینەوە لە پشتی کرد.

(٢٢٤) ئەوسا ئەفرۆدێتی کیژی زیوس بۆ ماڵەکەی خۆی نرفڕییەوە. بەڵام هیرا وەکو تیر لە لوتکەی ئۆڵەمپەوە داگەڕا. بەسەر پیری و ئیماتی دڵگیردا تێپەڕی. ئەوجا بەسەر لوتکەی کۆجارە بەفر گرتووەکەی مەڵبەندی تراسیاندا، تراسیانی سوارچاکدا تێپەڕی بەبێ ئەوەی پێی بەعاردی بکەوێ. ئەوسا کێوی ئوتوسی بڕی و بەسەر شەپۆلی دەریادا خۆی گەیاندە (لیمنبوس) شارەکەی (تواس)ی ناودار. ئیدی لەوێدا چاوی بەخواوەندی (خەو)ی برای (مەرگ) کەوت. دەستی گرت و ڕاست و ڕاست پێی گوت: "ئەی خەو، ئەی فەرمانڕەوای هەموو خواوەندان و بەشەران ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان گوێت لێگرتووم، ئەوا ئێستاش هاتووم و ئەمجارەش گوێم لێبگرە و ئەم داوایەم بۆ جێبەجێ بکە ،تا ماوم منەتبار و سەناگۆت دەبم:وەختێ من چوومە جێگاکەی زیوسەوەو لە گەڵیا جووت بووم ،تۆ چاوانی درەخشانی ویم لەبن برژانگەکانییەوە بۆ لێکبنێ و بیخەرە خەو. من لە جیاتی ئەوە کورسییەکی زێڕی خاڵیسەت بەدیاری دەدەمێ ،کە هەرگیز نەسوێ و نەپوێ ،کوڕە شەلەکەم (هیفایستوس)ی بازوو ئەستور بۆتی دروست دەکات و لەژێریدا جێ پێیەکت بۆ دادەنێ کە دەتوانی هەر کاتێ بۆ شەراب خواردنەوە لەسەر کورسییەکە دانیشتیت پێیە جوانەکانتی لەسەر دابنەیت!"

(٢٤٢) خواوەندی (خەو) وەڵامی دایەوە: "ئەی هیرا، ئەی خواوەندی هەژی ،کیژی کرونۆسی مەزن.. من دەتوانم خەو لەهەر خواوەندێکی دیکە بخەم. تەنانەت شەپۆلە سەرکێشەکانی (ئۆقیانوس)ش کە باوکی هەموانە ،بخەوێنم. بەڵام زیوسی کوڕی کرونۆس

ناتوانم لێی نزیك ببمەوە. ئەگەر خۆی داوام لێنەكات چاویت بۆ لێك نانێم، من ئەزموونی پێشترم لەگەڵ تۆدا هەیە و بۆم بووە بەدەرس و پەند. ئەو ڕۆژەی كە هێراكلیسی شێردڵی كوڕی زیوس تەروادەی وێران كردبوو، لە ڕێگەی دەریاوە دەگەڕایەوە، من لەو ڕۆژەدا هەموو هێزی لەشكان نەهاتووی خۆم خستە كار و گیانی زیوسی سپەروانم خەواند. تۆ لە دڵی خۆتا دژمنایەتی كورەكەی ئەوت دەكرد. ڕووی گێژەنگ و باهۆزێكی دژوارت كردە دەریا و دەریا هەستاو "هێراكلیس"ت هەواڵەی كوس كرد و لە خزم و كەسوكاری خۆیت دوور دوورخستەوە. كە زیوس ڕابوو زۆر توڕە بوو. كەوتە گەڕان بەناو هەموو خواوەندەكاندا ،بەتایبەتی لە من دەگەڕا. ئەگەر بیدیبام و بەردەستی كەوتبام لەوەبوو لە ئاسمانەوە تورم بداتە دەریاوە و لەناوم بەرێ. باش بوو شەو، ئەو شەوەی كە خواوەندان و بەشەران لەژێر فەرمانیدان، فریام كەوت. ئەوە بوو لە شەو پاڕامەوە و لاڵامەوە زیوس وێڕای توڕەیی و غەزەب ،گەڕایەوە و ئارام بووەوە .چونكە دەترسا شتێك بكات شەو توڕەبێ.. كەچی تۆ هەمدیس هاتووی كارێكت بۆ بكەم كە لە تواناەمدا نییە!"

(٢٦٣) هێرای هەژی، هێرای چاوكەژاڵ وەڵامیدایەوە: "ئەی خەو بۆچی بیر لەم شتانە دەكەیەوە؟ چما پێتوایە زیوسی بروسكەدەنگ بەهەمان گەرمیی كە لەسەر هێراكلیسی كوڕی توڕە بوو لەسەر تەروادەییەكانیش دێتە جواب؟ نەخێر.. خێراكە من یەكێك لە جوانترین كیژانی (شاریت)ت دەدەمێ تا بیكەی بەژنی خۆت و ببێ بەهاوسەرت و لە سەرانسەری ژیاندا هەر دڵدارت بێ. (پاسیتا)ت دەدەمێ، ئەو پاسیتایەی كە زۆر دەمێكە شەیدایت و حەزت لێیەتی!"

(٢٦٩) خواوەندی (خەو) بەدڵی پڕ لە خۆشییەوە وەڵامی دایەوە و گوتی: "كەواتە وەرە بەشەپۆلی ڕوباری ستیكسی پیرۆز سوێندم بۆ بخۆ. دەستێكت بخە سەر زەوی پڕ فەڕ و بەرەكەت و ئەوی تریان بخە سەر ڕوباری درەخشان تا هەردوكیان شایەت بن، تا هەموو خواوەندانی تارتار ئەوانەی دەوری "كرونوس"یان داوە شایەت بن كە تۆ بەڕاستی جوانترین كیژی شاریت واتە پاسیتای یەزدانی نەژاد دەدەی بەمن و دەبێ بەهاوسەر ودڵداری سەرانسەری ژیانم. ئەو پاسیتایەی لەمێژە بەعەزرەتیەوەم.

(٢٧٨) هێرای زیوین بازوو ،بێ چەند و چون داواكەی جێبەجێكرد. بەو جۆرەی كە (خەو) دەیویست ،هەموو خواوەندەكانی ژێر زەوی (تارتارۆس) كە (تیتان)یان پێدەگوترێ، بەشایەت گرت و سوێندی خوارد. دوای تەواوكردنی سوێند خواردنەكە، هەردووكیان

خوێیان له تەمومژێکی چڕەوە پێچا و شارانی لیمنوس و ئەمبروس)یان بەجێهێشت و بەپەلە کەوتنە ڕێ. لە لیکتوم دا لە دەریا هاتنە دەرێ و گەیینە لوتکەی ئیدا، ئیدای کۆجاڕی فرە سەرچاوە و مەڵبەندی درندە و هۆڤیان. ئەوجا هاتنە سەر زەوی و کەوتنە ڕێگە. ترۆپکی دار و درەختانی بێشەکە لەژێر پێیاندا کەوتنە لەرزین. خواوەندی (خەو) لەوێدا وەستا. تا زیوس نەیبینێ، بەدار کاژێکی فرە بەرزدا هەڵزنا، بەرزترین دارکاژی ئیدا بوو .تا چاو بڕ دەکات چوو بوو بەئاسماندا. لەوێدا و لە شێوەی مەلێکی کێوی خۆشخواندا کە خواوەندان (کالخیس) ،و خەڵکی (کیمیندس)ی پێ دەڵێن، خۆی لەنێو لق و پۆپەکانیا حەشاردا. ئەوجا هیرا بەپەلە چوو بۆ (گارگاروس)ی بەرزترین لوتکەی ئیدا، زیوسی جڵەوداری هەورانی گەواڵ گەواڵی بینی، کە بەو ڕازاوەییە بینی هەمان ئەو سۆز و ئارەزووە بەسەریا زاڵ بوو کە یەکەمین جار بەدوو قۆڵی و بەدوور لە چاوی داك و بابە ئازیزەکانیان بەشەیدایی تێکەڵاوی یەکدی بوون و جووت بوون.

(٢٩٦) زیوس لەبەردەمیا وەستا و گوتی: هیرا بەچ نیازێك لە ئولمبسەوە بەبێ ئەسپ و عەرەبانە بۆ ئێرە هاتوویت؟

(٣٠١) هیرا یەکسەر چیرۆکێکی هەڵبەست و گوتی: "دەمەوێ بۆ ئەوپەڕی مەرزی زەوی سەرچاوەی فەڕ و بەرەکەت بچم، تا دیدەنی (ئۆقیانوس و تیتس)ی باب و داکی هەموو خواوەندان بکەم. ئەوانەی کە لە ماڵی خۆیاندا منیان بەمیهر و سۆز و نازێکی فرەوە بەخوادن و پەروەردە کرد. دەمەوێ سەردانیان بکەم و ئەگەر بتوانم ئاشتیان بکەمەوە. دەمێکە شەڕیانە و لێکدی جودان و لەگەڵ یەکتردا ناخەون. ڕق، سەر و دڵی گرتوون. بەڵام ئەسپەکانم لە بناری ئیدای فرە سەرچاوەدا ڕاگرتوون و لەسەر پێن کە بەزەوی و بەدەریادا بمبەن. جا ئێستاش لەبەر تۆ لە ئۆڵەمپەوە بۆ ئێرە هاتووم. هاتووم پرست پێبکەم چونکە دەترسام ئەگەر بەبێ پرسی تۆ بۆ ماڵی ئوقیانوسی بێ بن بچم تورە ببی."

(٣١٢) هەنگێ زیوسی جڵەوداری هەوران گوتی: "هیرا تۆ دەتوانی کاتێکی دی بچیتە دیدەنی ئۆقیانوس. ئێستا وەرە با لە نوێنی ڤیاندا بەکامی لەزەت پێکەوە بخەوین. هەرگیز بەم ڕادەیە حەز و ئارەزووم نەچووەتە سەر هیچ یەزدانخانم و هیچ ژنێکی بەشەری. تەنانەت ئەو کاتەش کە کەوتبوومە داوی ئەڤینی ژنەکەی ئیکسونەوە و بەبیرتونی بەردەبار وەکو خواوەند ئاوسم کرد.. یان ئەوکاتەی کە ئاشقی (دانای) پاژنە

ئاسك و جوانی کیژی ئاکریسیوس بوو بووم و (پیرسیوس)ی قارەمانی قارەمانانی هێنایە دنیاوە.یان ئەو کاتەی کە ئاشقی کیژە هەرە بەناوبانگەکەی (فینیکس) بووم و هەردووك (مینوس و ڕادامانت)م لێی بوو. یان ئەو زەمانەی لە تبس (تیبە) شەیدای سیمیلی یان ئەلکیمینی بوو بووم، کە لە ئەلکیمنی، هیراکلیسی سەرکێش و چاونەترسم بوو و لە سیمیلی (دیونیسوس)ی دڵرفێنی بەشەران یان ئەو ڕۆژگارەی کە ئاشقی (دیمتر)ی دۆتمیری جوانی، زێڕین قژی، چین لەسەر چین بووم .یان ئەو کاتەی (لیتو)ی جوانکیلە دڵی بردبووم. تەنانەت سەبارەت بەتۆش ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو ئەمڕۆکە بۆت نەجولاوم، ئێستا ئارەزوویەکی سەیرم چووەتە سەرت!"

(٣٢٩) هیرای هەژی زیرەکانە کەوتە قسان و گوتی: "ئەی بەسامترین کوڕی کرونوس، ئەوە تۆ چ دەڵێیت؟.. دەتەوێ لە لوتکەی ئیدادا کە لە هەموو لایەکەوە دیارە، لەگەڵ یەکدیدا بخەوین و جووت بین؟ ئەدی ئەگەر یەکێك لە خواوەندەکان بمانبینێ و بچێت بۆ هەموو خواوەندەکانی بگێڕێتەوە ؟ خۆ ئەوسا حەیام دەچێت و ناتوانم جارێکی دیکە بێمە ماڵەکەی تۆ. بەڵام ئەگەر هەر سووری لەسەر ئەمە و زۆرت حەز لێیە، ئەوا (هیفیایستوس)ی کوڕی ئازیزت ژوورێکی یەجگار مکومی بۆ دروست کردویت، دەرگاکانی کێلونی قایمیان هەیە، هەستە بابچین بۆ ئەوێندەر مادامێکی ئەوەندەت حەز لە جوتبوونە!".

(٣٤١) زیوسی هەورەوان بەرسڤی دایەوە و گوتی: "هیرا پێویست ناکات لەوە بترسیت خواوەندێك یان بنیادەمێك بمانبینێ، چونکە لە پەڵە هەورێکی چڕ و توندی زێڕینی وەهات دەپێچمەوە کە تەنانەت هەتاویش کە تیشکەکانی هەوران دەبڕێت نەتوانێ بماندینێ."

(٣٤٦) کوڕەکەی کرونۆس بەدەم ئەو قسانەوە هاوسەرەکەی لە هەمێز گرت. زەوییەکەی ژێریان بوو بەمێرگوزارێکی خۆش، پڕ لە نیلۆفەری گەش و پاراو ،گوڵێن زەعفەران و سنبلی چوون دانەی ئاونگ، لە ئەرزەکەی بەرزکردنەوە. لەوێندەر لەنێو تەمومژێکی جوانی زێڕین، کە ئاونگ و خوناوی پرشنگداری لێ دەتکا دەست لە ملان بوون.

(٣٥٢) بەو جۆرە خواوەندی ئاسمانان لە لوتکەی گارگاردا هاوسەرەکەی لە هەمێز گرتبوو ،و ڤیان و خواوەندی خەو بەسەریا زاڵ بوو بوون. لەو کاتەدا خەوی شیرین، بەپەلە بەرەو کەشتی ئاخییەکان غاریدا تا ئەم هەواڵە بگەیەنێتە پوسیدونی هەژێنەری زەوی. ئیدی خۆی گەیاندە پوسیدون و بەڕاشکاوی ئەم قسانەی پێگوت: "ئەی پوسیدون، ئەی هەژێنەری زەوی، فرسەتە فریاکەوەو یارمەتی داناییەکان بدە. ئەگەر بۆ ماوەیەکی

خەمیش بووە، سەرکەوتن و سەرفرازیان بەنسیب بکە، چونکە من خەوێکی شیرین و خۆشم لێخستووە و هیراش بەجوانی خۆی فریویداوەولەگەڵی خەوتووە.

(٣٦١) خواوەندی خەو دوای ئەم قسانە بەرەو ناو تیرەی بەشەران بەڕێکەوت. بەمەش دەرفەتێکی پتر بۆ پۆسیدون ڕەخسا کە یارمەتی داناییەکان بدات.. خواوەندی خەو خۆی گەیاندە ڕیزەکانی پێشەوەی هێزی داناییان و کەوتە دندەدانیان بۆ شەڕ و گوتی: "ئەی ئارگۆسیان ،ئایا جارێکی دیکەش کارێکی وەها بکەین هیکتۆری کوڕی پریام سەربکەوێ .دەست بەسەر کەشتییەکانماندا بگرێ و سەرفرازی لەسەر حەساوی ئێمە بەدەست بێنێ؟ ئەو بەئاشکرا ئەو مژدەیە بەخۆی دەدات، چونکە ئەخیل هێشتا تووڕەیە و سورە لەسەر ئەوەی لە سەراپەردەکەی خۆی نەیەتە دەرێ. بەڵام ئێمە ئەگەر پشتی یەکدی بگرین و دلێرانە بجەنگین، نەبوونی (ئاخیل)مان زۆر پێوە دیار نابێ. جا ئێوە هەموو وەرن و من چیتان پێ دەڵێم باوا بکەین. با هەمووومان چاکترین و گەورەترین سپەری لەشکرەکە هەڵگرین. هەموو کڵوخودە بریقەدارەکان لەسەر بکەین. درێژترین ڕمان بەدەستەوە بگرین، و بەو شێوەیە پێشڕەوی بکەین. من بەخۆم پێشتان دەکەوم. مژدەتان دەدەمێ کە هیکتۆری کوڕی پریام بەهەموو دلێری و شەڕڤانییەکیەوە ماوەیەکی زۆر خۆی لەبەرمان ڕاناگرێت. جا با جەنگاوەرە ئازاکان ،ئەوانەی سپەرەکانیان بچووکە، سپەرەکانیان بدەن بەو جەنگاوەرانەی کە لەوان کەمتر ئازان و سپەری گەورەتر بۆ خۆیان هەڵگرن.

(٣٧٨) ئەو قسانەی کرد، ئارگوسییەکان بەگوێیان کرد و ملکەچی فەرمانەکەی بوون. خودی پاشاکانیش (فەرماندە) هەرچەندە شەکەت و بریندار بوون ،کەوتنە کاری سازدانی جەنگاوەرەکان بۆ شەڕ: کوڕی تیدیوس و ئودیسیوس و ئاگامەمنون کەوتنە گەڕان بەسەر لەشکرەکەدا و کەوتنە گۆڕین و گۆڕینەوەی تفاقی شەڕ. ئازایان و جەنگاوەرانی ڕیزی پێشەوە مکومترین و باشترین چەکەمەنیان پۆشی و ئەوانەی دی هەر کەسە و بەگوێرەی توانای خۆی چەکەمەنی پۆشی. دوای ئەوەی ساز و تەیار بوون، کەوتنە پێشڕەوی و پۆسیدون سەرئامەدیان بوو. شمشێرێکی سامناکی تیژی وەکو ئەڵماسی بەدەستە بەهێزەکەی هەڵگرتبوو. کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد لێی نزیك ببێتەوە.

(٣٨٩) لەولاشەوە هیکتۆری مەزن هێزەکانی خۆی سازدا و ئەوجا پۆسیدونی قژکەوەیی و هیکتۆری شکۆدار ئاگری شەڕیان هەڵگیرساند: یەکێکیان پشتیوانی تەروادەییەکان بوو

و ئەویتریان پشتیوانی ئارگوسییەکان. سامناکترین شەڕ لەنێوان هەردوو هێزی هێرشبەردا هەڵگیرسا، دەریا هەستا شەپۆل و پێلان لە کەنارەکانەوە گەییە ئۆردوگا و هۆبە و کەشتییەکان، هەراو هەنگامەی شەڕ بەڕادەیەك بەرزبوو نە هاڕەو هاژەی شەپۆلی دەریای بەر بای بورياس، نە نێڵە نێڵی ئەو ئاگرەی لە بێشەیەکی ترۆپکی چیا بەردەبێ و با پتر نێڵی دەدا، نەدەگەییە هاوار و نەعرەتەی شەڕکەرانی تەروادەیی و ئاخاییان کە پەلاماری یەکیان دەدا.

(٤٠٢) هەر کە ئەجاکس ڕووەو هیکتۆر وەرسوڕایەوە و هێرشی برد، هیکتۆری مەزن ڕمەکەی ئاڕاستە کرد و ئەنگاوتی، ڕمەکە بەر ئەو دوو حەمایلەی سەر سینگی کەوت ،حەمایلێکیان هی سپەرەکەی بوو و ئەویتریان هی شمشێرە زیوکفتەکەی بوو. ئەم دوو حەمایلە لە ئاسیویان خەلەساند .هیکتۆر زۆر تورەبوو لەوەی کە ڕمە تیژەکەی بەبێهودە لە دەستی دەرچوو بوو. بەپەلە و بۆ وەی لە مردن بخەلەسێ بەناو ئاپۆرەی هاوڕێکانیا گەڕایەوە. لەو کاتەدا کە دەگەڕایەوە، ئەجاکسی کوڕی تیلامون گاشەیەکی خێواندێ .بەردێکی زۆر لەژێر دەست و پێی شەڕڤانەکان کەوتبوو. کە هێنابوویان تا لەکاتی لەنگەرگرتنی کەشتییەکان لە کەناری دەریادا بیاندە بەر ئەملاو ئەولای کەشتییەکان و ڕایانبگرن. یەکێك لەو گاشانەی هەڵبری و کێشای بەسەر سینگی هیکتۆرا ،ڕێك لە نزیکی ملیا بەر قەراخی سپەرەکەی کەوت. جەزرەبەکە هێندە بەهێزبوو هیکتۆر وەکو گێژەڵوکە بەدەوری خۆیدا خولایەوە و خولایەوە.. وەکو چۆن دار بەرووبەیەك بەر بروسکەی بابە زیوس دەکەوێ و لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵدەکەنرێ و دەکەوێتە سەر زەوی و چەرە دووکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە، هەر کەسێك لە تەنیشی بێ زراوی لە بروسکەکەی زیوسی مەزن دەتۆقێ. بەو ئاوایە هیکتۆری فیلەتەن کەوت و لە عاردی گەوزا و ڕمەکەی لە دەست پەری .بەڵام زرێ و کێوخودەکەی و جلوبەرگە جەنگییەکەی بەتەق و هوڕ بەسەریا کەوتن.

(٤٢١) هەنگێ کوڕانی ئاخیایی بەدەم نەعرەتە کێشانەوە هێرشیان بۆ برد. بەو ئومێدەی کە بەرەولای خۆیان بکێشی بکەن. بەدەم هێرش و پەلامارەوە تەروادەییەکان تیر باران دەکرد. بەڵام هیچ یەکێکیان نەیانتوانی سەروەری جەنگاوەران لە دوور یان لە نزیك بریندار بکات، چونکە پێشتر ئازاترین جەنگاوەرانی تەروادەیی دەوری هیکتۆریان گرتبوو: پولیداماس، ئیناس، و ئاجینۆری مەزن و سارپیدۆنی ڕابەری لیسیان و گلوکۆسی بێ وێنە. هەر هەموو ئەوانی دیکەش لە خەمی هیکتۆردا بوون و سپەرە بازنەییەکانیان بۆ

خردبوو بەقەڵغان و مەتاڵ. ئەوجا هاورێکانی خستیانە سەر دەستیان و لە جەرگەی شەڕەکەیان دوورخستەوە و بردیان بۆ ئەو شوێنەی کە ئەسپەڕەهوانەکانی لە دەرێی مەیدانی شەڕەکە، لەگەڵ میرئاخورەکەی و گالیسکە گەوهەر نیشانەکەیدا لە چاوەڕوانی ئەودا بوون. ئیدی جەنگاوەری زامداریان بەدەم ئازار و ناڵەناڵەوە بۆ شار برد. کاتێ گەیینە بواری ڕوباری ئیکسانتوس، ئەو ڕوبارەی زیوسی نەمر هێنابوویە ئاراوە، هیکۆتریان لە گالیسکەکەی داگرت و لە عاردەکەیان دانا. ئاویان بەسەروچاویا پرژاند، بوژایەوە و چاوانی هەڵێنا. ئەوجا هەستایە سەر چۆکان و خوێنێکی ڕەشی هەڵهێنا. بەڵام لەپڕ بەپشتا کەوتە سەر زەوییەکە و پەردەیەکی تاریك چاوانی داپۆشی. زامەکەی هێشتا زۆر بەئازار و سوێ بوو.

(٤٤٠) ئارگۆسییەکان کە بینیان هیکتۆر لە مەیدانی شەڕەکە دوورخرایەوە، هێندەی دی چەشە بوون و زۆر بەتوندی هێرشیان بردە سەر تەروادەییەکان. لەم دەمەدا ئەجاکس، کوڕە چاپوکەکەی ئویلیوس هەڵیکوتایە سەر (ستانیوس)ی کوڕی ئیفوس و بەنێزەکەی بریینداری کرد.

(٤٤٥) ستانیوس، کوڕی پەری دەریایی (نییس) بوو. نییس پەرییەکی یەجگار جوان بوو. (ئینوپس)ی شوانی پەزان لە نزیکی کەنارەکانی ساتنیون لەگەڵیا جووت بوو بوو. ستانیوسی لێ بوو بوو. جا کوڕەکەی ئویلیوس هەڵیکوتایە سەری و نێزەیەکی کرد بەقەبرغەیا و ستانیوس بەپشتا کەوت و مرد. تەروادەیی و داناییەکان شەڕێکی قورسیان لە دەوری جەنازەکەی دەستپێکرد. ئەوسا پولیداماسی کوڕی پانتوس هەڵیکێشایە نێزە و بەغاردان چوو بۆلای تا بەرگری لێبکات و تۆڵەی بسەنێ. نێزەیەکی خێواندە (پروتیونور)ی کوڕی ئەریلیکوس و شانی ڕاستی دیواودەرکرد و ئەم جەنگاوەرە زامدارە کەوتە سەر زەوی و لە خوێنی خۆیدا گەوزا و چنگی بەخاکەکەی ژێری خۆیدا کرد. هەنگێ پولیداماس شاد و سەرمەست بەدەنگی بەرز بەدیارییەوە هاواری کرد: "ئەو نێزەیەی کە ئێستا لە دەستی کوڕە جوامێرەکەی پانتوس هاتەدەرێ، بەفیڕۆ نەچوو. بەڵکو ئەرغیفییەك بەجەستەی خۆی گرتییەوە و پێموایە کاتێ کە دەچێت بۆ هادیس وەکو دارعەسایەك بەدەستییەوە دەگرێت و خۆی بەسەریا دەدات."

(٤٥٨) بەو جۆرە کەوتە خۆهەڵکێشان و بەخۆ فشین، ئەرگۆسییەکان بەمە زۆر خەمین و دڵتەنگ بوون. بەتایبەتی ئەجاکسی کوڕی تیلامون چونکە پروتونیور لەبەر پێی ئەودا

کەوتبوو. بۆیە کاتێ کە پولیداماس دەگەڕایەوە، پەیکانێکی خێواندێ، لێ پولیداماس خۆی لەبەری لادا و لە دێوی مەرگ خەلەسی. پەیکانەکە بەر ئەرخیلوخۆسی کوڕی ئەنتینور کەوت. چونکە خواوەندان مەرگیان لە چارەی نووسی بوو، پەیکانەکە ڕێك بەر دوا مۆرەغەی نێوان مل و سەری کەوتبوو، هەردوو دەمارەکەی بڕی بوو. سەر و زار و دفنی بەر لەلاق و ئەژنۆکانی گەیینە سەر زەوی. لەو دەمەدا (ئەجاکس)ش ڕوویکردە (بولیداماس)ی بێ وێنە و تا زاری گرتی هاواری کرد: "ئەی پولیداماس، تەماشا بکە و ڕاستیم پێ بێ، ئایا ئەم جەنگاوەرە شایستەی ئەوە نەبوو لە تۆڵەی پروتوینور بکوژرێ؟ پێدەچێت لە بنەماڵەیەکی ڕەسەن و خانەدان بێ. ئەگەر برای ئەنتینوری سوارچاك نەبێ، بێگومان کوڕیەتی، چونکە زۆر لەو دەچێت."

(٤٧٥) هەرچەند ئەو قسانەی کرد، بەڵام زۆر چاك دەیزانی کێی کوشتوە .تەروادەییەکان زۆر دڵتەنگ و خەمبار بوون. لەم کاتەدا ئاکاماس کە هاتبووە دیار جەنازەی برایەکەی ،برۆماخوسی بیوتی بەڕمەکەی بریندار کرد. چونکە بروماخۆس لەلاقی براکەی وی نەوی بوو و ڕایدەکێشا و دەیویست بیبات. ئیدی ئاکاماس شاد و سەرمەست، بەدەنگێکی پڕ لە خۆ پەسەندی و بەرز هاواری کرد: "ئەی ئارگوسیان، ئەی تیرەندازانی کارامە، ئەی ئەوانەی لە هەڕ و گیف ناکەون ماڵوێرانی و مەینەتی هەر بۆ ئێمە نییە. ئێوەش ڕۆژێ لە ڕۆژان وەکو ئێمە دەکوژرێن. تەماشا بکەن چۆن (بروماخۆس)ەکەتان بووە بەتێشوی نێزەی من و لەو گۆڕە کەوتووە! بۆیەم کوشت تا تۆڵەی خوێنی براکەم کۆن نەبێ.. بۆیە هەقە هەمووکەسێك خۆزیا بخوازێ کە لە شەڕا خزم و کەسێکی لەگەڵدا بێ، تا ئەگەر کوژرا تۆڵەی بستێنێ!"

(٤٨٦) ئارگۆسییەکان بەتەوس و توانجەکانی قەڵس بوون .بەتایبەتی پینیلیوس لەوانی دی تورەتر بوو. هێرشی بردە سەر ئاکاماس بەڵام ئاکاماس.لێ ئاکامس لە شوێنی خۆی نەوەستا. بەڵام پینیلیوس، (ئەلیونیوس)ی کوڕی (فورباس)ی پێکا. فورباس دەوڵەمەند بوو. خودانی مەڕ و ماڵات و پەزێکی زۆر بوو. کە هرمس لەنێو هەموو تەروادەییەکانا ئەوی زیاتر چوو بووە دڵەوە و سامانێکی زۆری دابوویێ .دایکی ئەلیونیوس تەنیا ئەو کوڕەی لە فورباس بوو بوو. پینیلیوس ڕمێکی خێواند بوویێ کە ڕێك بەرچاوی کەوتبوو. گلێنەی چاوی دەرپەڕی بوو. ڕمەکە چوو بوو بەچاویا و لە پشتی ملییەوە دەرچوو بوو. ئەلیونیوس کەوتبوو و باسکەکانی بێوکردبوونەوە. لێ پینیلیوس هەڵیکێشایە شمشێرە

نیزەکەی و لە ملی دا، سەری بەکێوخودەکەیەوە پەڕییە سەر زەوی. ڕمەکە هەر لە چاویا چەقی بوو. پینیلیوس وەکوسەری کۆکنار سەرەکەی بەڕمەکەوە بەرزکردەوە و نیشانی تەروادەییەکانی داو بەخۆپەسەندییەوە هاواریکرد: "ئەی تەروادەییان، ئۆباڵم بەگەردنتان ،بڕۆن و لە زمانی منەوە بەداك و بابی (ئەلیونیوس)ی جەنگاوەری ناودار بڵێن کە لەماڵی خۆیاندا پرسەی بۆ بگێڕن. چونکە ژنەکەی (پروماخوس)ی کوڕی (ئەلجینور)ش کاتێ ئێمەی لاوانی ئاخیایی بەکەشتییەکانمان لە خاکی تەروادەوە دەگەڕێینەوە بەدیداری مێردەکەی شاد نابێت!"

(٥٠٦) کە ئەو قسانەی کرد هەموو ترسیان لێ نیشت و هەر کەسە و دەیڕوانیە دەوروبەر تا ڕێگەیەك بدۆزێتەوە و خۆی لە مەرگ ڕزگار بکات.

(٥٠٨) جا ئەی یەزدانخانمانی هونەر، ئەی دانیشتوانی ئۆڵەمپ، ئێستا پێم بڵێن: کێ یەکەمین ئاخیایی بوو، وەختێ هەژێنەری زەوی ڕەوتی شەڕەکەی گۆڕی ،دەسکەوت و تالآنی خوێناوی هەڵگرتەوە؟ ئەجاکسی کوڕی تیلامون یەکەم کەس بوو .ئەوە بوو هیرتیوسی کوڕی گیرتیوسی فەرماندەی میسینییە دلاوەرەکانی کوشت.. ئەنتیلوخوس دەستی بەسەر میراتی هەردوك فالسیس و میرمیرودا گرت. هەروەها میریونیس هەردوك موریس و هیبوتیونی کوشت. (تیوسیر)ش بروتون و پیریفتسی کوشت. هەروەها مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس، هوپیرینوری سەروەری گەلەکەی خۆی ،لە قەبرغەوە بریندار کرد. سەری نێزە برونزییەکە ورگ و ڕیخۆڵەی دڕی و ڕوحی لە شەبەقی زامەکەیەوە دەرچوو و تاریکی باڵی بەسەر چاوەکانیا کێشا. بەڵام ئەجاکسی کوڕی ئویلیوس لە هەمووان زیاتری کوشت، چونکە کەس نەبوو لە خێرایی و ڕاونانی دژمندا، کاتێ کە زیوس ترسی خستبوونە دڵەوە و هەڵدەهاتن! بگات بەودا!

# سروودی پانزەیەم

## زیوس بێدار دەبێتەوە

**حیکایەتەکە:**

**دوای ئەوەی هیرا لەگەڵ خواوەندی خەودا پیلانێکیان لە زیوس کرد و خەوێکی قوڵیان لێخست، زیوس کە ڕابوو سەیری کرد تای تەرازووی شەڕەکە بەلای ئاخییەکاندا قورس بووە. یەکسەر زانی هیرا دەستی لەم فێڵەدایە. لەو ماوەیەدا پوسیدون ئازاد و سەربەست دەکەوێتە هاندان و جۆشدانی ئاخییەکان، بەرادەیەك خەریك بوو هێزی تەروادەییەکان ڕامالن. زیوس پەی بە هەموو شتێك برد.ناردی بە شوێن هیرادا،کە یەکسەر پەی بەوە برد کە چی دەوێت. ویستی بەر قامچیانی بدات. ئەو پیلانەی بیرخستەوە کە چۆن دژی ئەمی گێڕا بوو. ئەوە بوو لێیدا بوو، و بەقژ هەڵیواسی بوو و دوو تۆپەڵە ئاسنی بەلاقییەوە بەستبوو تا قەدری عافێت بزانێ و فێر بێ چۆن گوێڕایەڵی مێردەکەی بێ... ئیدی کەوتە سوێند خواردن کە نیازی خراپ نەبووە و ئەگەر پیلانی مەبەست بوایە لەگەڵ پۆسیدوندا ڕێك دەکەوت، پوسیدون لە خۆیەوە ئەو ڕەفتارەی کردووە. کاتێ کە سوێندی گەورەی خوارد (سوێندە بەئاوی ڕوباری ستیکس، کە ڕوبارێکە لە جیهانی ژێریندا –هادیس-) زیوس بزەیەکی بۆ کرد و یەکسەر ناردی بەدوای ئیریسی پەیکی خواوەندان و ئەپولۆی خواوەندی روناکی و هونەران. ئیریسی نارد بۆ لای پوسیدون کە شەرم لە خۆی بکات و بەپەلە بۆ ماڵەکەی خۆی، لەژێر ئۆقیانوسدا، بگەڕێتەوە، چونکە بەسەرپێچی کردن لە فەرمانەکانی زیوسی مەزن، خۆی بەزندانی کردن دەدات، بەزیندانیکردن لەگەڵ تیتانەکانی قوڵایی تارتاروسدا، کە بیرێکی قوڵە لە هادیسدا، لەژێر دەریا و زەویدا. ئەپولۆشی نارد بۆلای هیکتۆر کە بەگاشەکەی ئەجاکس پێکرا بوو و خوێنی هەڵێنابوو و چی وای نەمابوو بمرێت. ئەپولۆ دەڕوات و هیکتۆر تیمار دەکات و چاك دەبێتەوە و وەکو جاران بەگوڕ و تینەوە دەچێتە شەڕی ئاخیاییەکان و زیانێکی گیانی گەورەیان پێدەگەیەنێ. وەختێ زیوس**

دەبروسکێنێ، هیکتۆری زاڵ و باڵا دەست ئەمە بەرەمز و مژدە دەزانێ کە گوایە زیوس لە پشتییەتی. ئەجاکسی بەزیوش ئەمە بەرەمزی غەزەب و سوربوونی زیوس لەسەر شکستی ئاخییەکان لێکدەداتەوە، هەرچەند ئەجاکس دەزانێ کە ئەم شکستە کاتییە. تەروادەییەکان تەنگ بەئاخییەکان هەڵدەچنن و دەگەنە نزیکی کەشتییەکانیان و هیچی وایان نامێنێ ئاگر لە کەشتییەکانیان بەر بدەن، ئەگەر خۆراگری و قارەمانێتی ئەجاکس نەبوایە کە کەوتبووە هاندانی قومەکەی و داوای لێکردبوون ورەیان بەرز بێ و پشت بەخۆ ببەستن، چونکە نەحەسارێك مابوو بیانپارێزێ و نەشارێك هەبوو، جەنگاوەری تازە نەفەس بنێرێتە هیمدادیان و فریایان بکەوێ و تای تەرازووەکە بەلای ئەواندا قورس بکات، دەنا گۆڕ غەریب و دوور لە نیشتمان دەمرن. هیکتۆر گەییە سەر یەکێك لە کەشتیەکان، داوای لە تەروادەییەکان کرد کە ئاگری بۆ بێنن، بەڵام ئەجاکس بەرگری دەکرد و ڕێگەی لەهەر کەسێك کە ئاگری هێنابا دەگرت، و بەمەش کەشتییەکانی لە چنگی ئاگر ڕزگار کرد.

زەمەن:

هەموو بویەرەکان لە ڕۆژی بیست و هەشتەمینی گێڕانەوە هۆمەرییەکەدا ڕوودەدەن.

شوێن:

جگە لە ئیدا و ئۆلەمپ کە زیوس لەوێندەر فەرمان بەئەپولۆ و ئیریس دەدات، هەموو بویەرەکان لە کەناری دەریادا و لەبەردەم کەشتی و خێوەتەکاندا ڕوودەدەن.

(١١) خانێ تەروادەییەکان، بەدەم هەڵاتنەوە لە خەنەکە سنگرێژەکە پەڕینەوە و ژمارەیەکی زۆریان لەلایەن داناییەکانەوە لێ کوژرا، هەموو سەراسیمە و سەرگەردان و ترساو و پەشۆکا و لەبەردەم گالیسکەکانیاندا وەستان. زیوس لەسەر لوتکەی ئیدا و لە پاڵ هیرای زێرینعەرش لە خەو رابوو. هەر کە هەستایە سەر پێیان، چاوی بەتەروادەیی و ئاخییەکان کەوت. تەروادەییەکان شپرزەوپەشۆکاو هەڵدەهاتن، و ئاخییەکانیش، کە پوسیدون پاشا لە ناوەڕاستیاندا دیار بوو، چنگ لەسەر شان دوایان کەوتبوون و راویان دەنان. هیکتۆری بینی لە دەشتەکەدا کەوتووە و هاورێکانی لە دەوری دانیشتوون. بەحاڵ هەناسەی پێدەدرا و ئازار شپرزەی کرد بوو، بیری رۆیی بوو و خوێنی هەڵدەهێنا، چونکە ئەوەی لێی دابوو لاوازترین و بێ هێزترین ئاخییان نەبوو، بەڵکو بەهێزترینیان بوو.

(١٢) سەروەری خواوەندان و بەشەران کە بەو حاڵەوە بینی زۆری بەزەیی پێدا هاتەوە، نیگایەکی سامناکی هیرای کرد و گوتی: "ئەی هیرا، ئەی ئەو خواوەندەی هەڵکردن لەگەڵتا زەحمەتە، بۆ بەفەند و فێڵ هیکتۆری پاکزادت لە مەیدانی شەڕ وەدەرناوە و لەشکر و قۆشە نەکەیت دووچاری شکست و هەڵاتن کردووە. وام دێ بەخەیاڵدا کە بەر قامچیانت بدەم و بەمەش ببی بەیەکەم کەس کە باجی ئەم فیتنەگێرییە بدات. ئایا ئەو رۆژەت بیرچووەوە کە بەئاسمانەوە هەڵواسرابووی، دوو سندانم بەهەردوو لاقتەوە بەستبوو، کەلەپچەیەکی زێرینم لە دەستانت کردبوو کە هێز نەبوو بتوانێ بیان پچڕێ؟ تۆ ئەو دەمانە لە ئاسماندا و لەنێو هەوراندا هەڵواسرا بووی، و خواوەندان لە ئۆلەمپی سەربەرزەوە تورە بوو بوون، بەڵام نەیانتوانی لێت نزیك ببنەوە یان رزگارت بکەن.. من هەر کەسێك بهاتبایە هاناتەوە دەم گرت و لە ئاستانەی دەروازەی ئۆڵەمپەوە بەرەو زەوی تورم دەدا و هێز و توانای لێدەبرا. وێڕای هەموو ئەمەش، ئەم سزا سامناکە نەیدەتوانی ئەو هەموو دەرد و ئازارەی سەبارەت بەچارەنووسی هیراکلیسی کورم لە دڵمدا کەڵەکە بوو بوو، دابمرکێنێتەوە، کە تۆ بەکۆمەکی بای (بورياس) هەڵتخەڵەتاند و رەهەنەی دەریات کرد و ئەوجا هەواڵەی (کوس)ی ئاوا و ئاوەدانت کرد. بەڵام من فریای کەوتم، و گەڕاندمەوە بۆ (ئارگوس)ی مەلبەند و پاوانی ئەسپان، ئەگەرچی زەحمەتێکی زۆری کێشا بوو. من بۆیە ئەم شتانەت بیردەخەمەوە، تا دەستبەرداری حیلەبازییەکانت ببی، و تا بزانی کە ئەم ئەشقبازییەی کە تۆی لەلای خواوەندەکانەوە بۆ ئێرە کێشاوە، تا لەگەڵ مندا بخەوی و جووت ببی و ئەوجا هەڵم بخەڵەتێنی دادت نادا."

(٤٦) هیرای هەژی، چاوکەژاڵ، کە گوێی لەو قسانە بوو ڕاجفری و بەڕاشکاوی گوتی: "بەزەوی، بەئاسمانی پان و بەرین، بەئاوی ستیکس، کە ئەمە گەورەترین سوێندی خواوەندانە، سوێند دەخۆم، و هەروەها بەسەری موبارەکی خوایانەی تۆ و بەنوێنی ژن و مێردایەتیمان کە نامەوێ بەسوێندی درۆ و بۆ هیچ شتێك بیلەوتێنم، سوێند دەخۆم کە (پوسیدون)ی زەوی هەژێن، بەفیتی من و بەحەزی من تەروادەییەکان و هیکتۆری نەخستوەتە تەنگانەوە و یارمەتی داناییەکان نادات، نەخێر، ئەمە بەحەزی دڵی خۆی دەکات و بۆیەش دەیکات چونکە کاتێ ئاخییەکانی بینی شکستیان هێناوە و لە پەنا کەشتییەکانیاندا چاوەڕوانی مەرگن، زۆری بەزەیی پێیاندا هاتەوە. من بەش بەحاڵی خۆم، ئەی خواوەندی هەورەوان، ئامادەم پوسیدون ئامۆژگاری بکەم کە بەرەو ئەو شوێنە بڕوات کە تۆ دەفەرموویت.

(٤٧) دوای ئەو قسانە، سەروەری خواوەندان و بەشەران بزەیەکی شیرینی بۆ کرد و بەڕاشکاوی پێی گوت: "ئەی هیرای هەژی، ئەی چاوکەژاڵ. ئەگەر تۆ لە ئێستا بەدواوە لە کۆڕ و کۆبوونەوەی خواوەندانی نەمردا هاوئاهەنگی دەگەڵ مندا بکەی و هزر و بیری خۆت دەگەڵ هزرینی مندا یەك بخەی، ئەوا پوسیدون ناچار دەبێ بیری خۆی بگۆڕێت، و بەدڵی تۆ و من بکات. جا تۆ بۆ ئەوەی دروستی ئەم قسانەت بسەلمێنی ئێستا بڕۆ بۆ ناو خێڵی خواوەندان، ئیریس و ئەپولۆی تیرەندازی بەناوبانگ، ئاگادار بکەوە کە بێن بۆ ئێرە، تا ئیریس بچێ بۆلای قۆشەنی ئاخییان، بۆلای ئەو زرێپۆشانە و بەپوسیدون پاشا بێ کە دەست لە شەڕ هەڵگرێ و بۆ ماڵەکەی خۆی بگەڕێتەوە، ئەپولۆش جارێکی دی هیکتۆر بۆ شەڕ ساز بداتەوە و ئەو دەرد و ڕەنجەی ئازاری دەدەن لە بیر بباتەوە و جارێکی دیکە ئاخییەکان ڕاوبنێ و ترس و لەرز بخاتە دڵیانەوە و بەرەو کەشتییەکانی ئەخیلی کوڕی بیلیوس هەڵێن. هەنگێ ئەخیل (پاتروکلوس)ی هاوڕێی بۆ شەڕەکە دەنێرێ، و هیکتۆری مەزن لە بەرانبەر ئیلیوندا بەنێزەکەی خۆی دەیکوژێت.دوای ئەوەی ئەو (پاتروکلوس) گەلێك لە جەنگاوەرەکان دەکوژێت، کە سارپیدونی کوڕی من یەکێك دەبێت لەوان. هەنگێ ئەخیل بەمەرگی پاتروکلوس زۆر تووڕە دەبێت و لە تۆڵەی ئەودا هیکتۆر دەکوژێت. ئیدی لەوە بەدواوە کارێکی وەها دەکەم ئاخییەکان، تەروادەییەکان ڕاوبنەن تا ئامۆژگارییەکانی ئەتینا دێنەدی و ئاخییەکان دەست بەسەر تەروادەی عاسیدا دەگرن. بەڵام من تا ئەو کاتەش لە ئاخییەکان نابورم و ڕێگە بەهیچ خواوەندێك نادەم یارمەتی داناییەکان بدات تا

حوری ئاواتەکەی کوڕی بیلیوس نەیەنمەدی، وەکو چۆن لە هەوەڵەوە بەڵێنمدا و سەرم بۆ (تیتیس)ی دایکی لەقاند کاتێ دەستی لە ئەژنۆم وەرینا و تکای لێکردم کە سەرفرازی بەکوڕەکەی (ئەخیل)ی وێرانکەری شاران ببەخشم."

(٧٨) دوای ئەو قسانە، یەزدانخاخم، هیرای زیوین بازوو، باسك چەرمووی بازوو ناسك، قسەکانی هەڵگرت و بەپەلە لە کۆساری ئیداوە بۆ ئولەمبوسی سەربەرز کەوتەرێ. وەکو چۆن کەسێك بەباڵی خەیاڵ بەسەر وڵاتانی پان و پۆڕدا دەڕوات و لە دڵی خۆیدا دەڵێت کە ئێستا دەگەمە ئێرە یان ئەوێ و خۆزیا خەیاڵیەکانی بەپەلە دێنەدی.. هیرای هەژی-ش بەو ئاوایە بۆی دەرچوو، تا گەییە ئولیمبوسی هەزار بەهەزار، سەیری کرد هەموو خواوەندەکان لە ماڵی زیوسدا گردبوونەتەوە، هەر کە ئەویان بینی بەرزە پێ لەبەری هەستان و بەپیرییەوە چوون، بەرێزەوە جامە بادەکانیان پێشکەش کرد. بەڵام هیرا هەموو جامەکانی ڕەت کردەوە، تەنیا جامەکەی تیمیس، یەزدانخانمی جوان و قەشەنگی وەرگرت، کە بەر لە هەمووان گەیی بووە پێشوازی و لێی پرسی بوو: "بۆچی هاتوویت بۆ ئێرە هیرا؟ پەرێشان دیاری، پێدەچێت زیوسی کوڕی کرونوس، مێردەکەت، ترساندبیتی!"

(٩٣) هیرای زیوین بازوو وەڵامی دایەوە و گوتی: "تیمیس ئەوە لە من مەپرسە، بەخۆت دەزانی کە مێردەکەم چەند توندە تەبیعەت و کەڵەمەڕەق وسەر سەختە. تۆ هەموو خواوەندەکانی ناو کەم کۆشکە بێ جیاوازی لەسەر خوانەکە خڕبکەوە و دەعوەتیان بکە، هەنگێ لەگەڵ هەموویاندا گوێت لێ دەبێ کە زیوس چ کارێکی شومی بەدەستەوەیە و چی دەوێت. من دڵنیام هیچ خەلقەندەیەك، نە بنیادەم و نەخواوەند، دڵی بەو فەرمانانە خۆش نابێت!"

(١٠٠) هەنگێ هیرای هەژی لە جێی خۆی دانیشت. هەرچی خواوەند لە کۆشکەکەی زیوسدا هەبوو، پەست و بێتاقەت بوون. هیرا بزەیەکی کاڵی بۆ کرد، بەڵام گرژی نێوچەوانی و وێکهاتنەوەی برۆکانی بەسەر برژانگە کەوەییەکانییەوە نەڕەوییەوە. ئەوجا ڕویکردە هەموویان و بەتوڕەییەوە گوتی: "ئێمە گەوجین، ئێمە شێتین کە دژایەتی زیوس دەکەین!.. ئێمە لە هەوڵی ئەوەداین لێی نزیك ببینەوە تا بەخوایشت بێ یان بەتۆبزی لە ویستی خۆی ژێوانی بکەینەوە، بەڵام ئەو بێ خەم و خەیاڵ دوور لە ئێمە لێی دانیشتووە و باکی بەکەسمان نییە، چونکە پێی وایە بێ هیچ چەند و چون و گەنگەشەیەك لەهەر

هەموو خواوەندە نەمرەکان بەتواناتر و بەهێزترە. بۆیە بتانەوێ و نەتانەوێ دەبێ بەهەموو بڕیارە هەڵەکانی قاییل بن و بەهەر بەڵایەك کە بەسەرتانێ دێنێ ڕازی بن.ئەوەتا بۆ نموونە ئێریسی دوچاری ڕەنج و ڕۆژ ڕەشییەکی کوشندە کردووە، (ئەسکالافوس)ی کوڕی لەشەڕدا کوژراوە. ئەو پیاوەی کە ئێریس لە هەموو کەسێکی خۆشتر دەویست و دەیگوت لە خوێنی ئەوە."

(١١٣) کاتێ ئێریس گوێی لەو قسانە بوو، هەردوو دەستی کێشان بەڕانە قەوی و بەهێزەکانیا و بەدەم ناڵینەوە گوتی: "ئەی ئەوانەی لە ئۆڵەمپدا دەژین، کەستان گلەییم لێ مەکەن، ئەگەر پەیوەندیم بەهێزی ئاخییەکانەوە کرد و چوومە لای کەشتییەکانی وان و تۆڵەی مەرگی کوڕەکەم بکەمەوە، ئەگەر زیوس بەر بروسکەی داوم و کوشتومی و لە خاك و خوێنی گەوزاندووم، هەر دەچم!".

(١١٩) دوای ئەو قسانە فەرمانی بە (ترس) و (ئاژاوە)دا کە عەرەبانەی بۆ لە ئەسپەکانی ببەستن، بەخۆیشی جلکی درەخشانی جەنگی لەبەرکرد. لەوە بوو شەڕێکی تووش بکەوێتە نێوان زیوس و خواوەندەکانی دییەوە، ئەگەر ئەتینا، کە بەخەمی هەموو خواوەندەکانەوە بوو، فریا نەکەوتبا و لەسەر عەرشەکەی هەڵنەستابا و لەدەرکە وەردەنەکەوتبا، و کێوخودەکەی لەسەر ئێریس دانەکەندبا و سپەرەکەی لە شانی نەکردباوە و ڕمە برونزییەکەی لە دەستە بەهێزەکەی دەرنەهێنابا و لەلایەکەوە دای نەنابایە. ئەوجا کەوتە سەرزەنشتی ئێریس و گوتی: "ئەی سەرشێت، ئەوە تۆ هۆش و ئەقڵت نییە، بێگومان تیا دەچیت!.. ڕاستە دوو گوێت هەن، بەڵام وادیارە نابیستن، گوێت لە هێرا نەبوو چی دەگوت، خۆ تۆزێ لەمەوپێش لەلای زیوسی ئولەمپاییەوە هات؟.. یان دەتەوێ دوای ئەوەی خۆت دوچاری گەورەترین بەدبەختی بوویت، بەناچاری و نائومێدی بۆ ئولیمپوس بگەڕێیتەوە و دەرگای گەورەترین بەدبەختی و نەگبەتی لە خواوەندەکانی دیکە بکەیتەوە ؟ واز بێنە دەنا زیوس دەستبەرداری تەروادەیی و ئاخییاییە ئازاکان دەبێ و بەخۆی دێت بۆ ئولیمپوس تا سزامان بدات. هەر هەموومان، تاوانبار و بێ تاوانمان دەگرێت. بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم دەستبەرداری ئەم تووڕەبوونەت ببە، تووڕەبوون لە ڕای مەرگی کوڕەکەت، چونکە تا ئێستا و لەمەودواش زۆر کەسی هاوترازی ئەو و بەهێزتریش کوژراون و دەکوژرێن، بەڕاستی زۆر زەحمەتە هەموو تیرەی بەشەر لە مردن دەرباز بکرێن."

(١٤١) ئەو قسانە (ئەریس)ی سارد کردەوە و کارێکی وەهای کرد کە بێتەوە لەسەر عەرشەکەی خۆی دانیشێتەوە. بەڵام هیرا ئەپولۆ و ئیریس –پەیکی خواوندان-ی گازکردنە دەرێی کۆشکەکە و بەراشکاوی پێی گوتن کە: "زیوس ئەمری کردووە بەزووترین کات بچن بۆلای لە لوتکەی ئیدا. کاتێ گەییشتنە ئەوێندەر و چوونە بەردەستی، هەرچییەکی ویست و هەر ئەمرێکی کرد دەبێ بۆی ئەنجامبدەن."

(١٤٩) هیرا هەژی ئەو قسانەی پێگوتن و دووبارە گەڕایەوە و لەسەر عەرشەکەی دانیشتەوە.. ئەپولۆ و ئایرینس بەپەلە و تا هێز لە لاقیاندا بوو بەرەو ئیدای مەڵبەندی فرە سەرچاوە، مەڵبەندی گیانەوەرانی هۆڤی وەڕێکەوتن. زیوسی بروسکە دەنگیان بینی لەسەر لوتکەی گارگاروس دانیشتووە و هەورێکی بۆن خۆش، تاج ئاسا دەوری سەری داوە. هەنگێ بەدوو قۆڵی لەبەردەم زیوسی هەورەواندا بەڕێزەوە وەستان. کوڕی کرونوس بەدیتنیان نەتوڕە بوو و نەنارەحەت، چونکە زۆر بەزوویی فەرمانی ژنەکەیان جێبەجێ کرد بوو.

(١٥٧) هەوەڵجار ڕوویکردە ئایریس و بەڕوونی و ڕاشکاوی پێی گوت: "ئەی ئایریسی تیژڕۆ! برۆ و ئەم فەرمانانەی من بەپوسیدون پاشا بگەیەنە، چیت پێ دەڵێم وەکو خۆی بۆی بگێڕەوە، ئەمری پێ بکە کە دەستبەرداری جەنگ و کوشتار بێ، یان پەیوەندی بەخێڵی خواوەندانەوە بکات، یان بڕوات بۆ بنی دەریا. خۆ ئەگەر سەرپێچی لە فەرمانەکانی من کرد و نەیویست بەهەندیان بگرێ و ئەنجامیان بدات، با باش بیر لەوە بکاتەوە کە ئاخۆ هێز و توانای ئەوەی هەیە لە ڕووی من و هێزی منا بوەستێ، چونکە من بەئاشکرا ڕایدەگەیەنم کە زۆر لەو بەهێزترم، زۆر لەو گەورەترم.. کەچی ئەو لە دڵی خۆیدا، بێ سڵکردنەوە خۆی بەهاوتای من دەزانێ.. منێك کە هەموو خواوەندەکانی دی لێم دەترسن!"

(١٦٨) دوای ئەو قسانە، (ئایریس)ی تیژڕۆ، گوێڕایەڵانە، وەکو چۆن پروشە بەفر یان تەرزە بەدەم گێژەڵوکەی (بوریاس)ەوە لە ئاسمانەوە بەخێرایی دێتە خوارێ، بەو ئاوایە لە لوتکەکانی ئیداوە بەرەو دەشتی تەروادەی پیرۆز داگەڕاو لەبەردەم خواوەندی بەرزی زەمینەوان و هەژێنەری زەویدا وەستاو گوتی: "ئەی زەمینەوان. ئەی پارێزەری زەوی، ئەی قژ ڕەش، من پەیامی (زیوس)م بۆ هێناویت، زیوسی سپەروان، ئەمرت پێدەکات کە دەستبەرداری شەڕ و کوشتار بیت و یا بچیتەوە ناو خێڵی خواوەندان، یا بچیتەوە بنی دەریای درەخشان. خۆ ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانیت کرد، و بەهەندت نەگرتن، بەخۆی دێت بۆ ئێرە و شەڕت لەگەڵدا دەکات.. و ئەمری بەوەیە خۆتی لێ بپارێزیت،

چونکە بەئاشکرا ڕایدەگەیەنێ کە لە تۆ بەهێزتر و گەورەترە، کەچی ویڕای ئەوەش لەوە ناترسیت لە دڵی خۆتا، خۆت بەهاوکوف و هاوتای کەسێك دەزانی کە هەموو خوداوەندەکان لێی دەترسن!"

(١٨٤) خواوەندی ناودار و هەژێنەری زەوی، زۆر توڕە بوو و بەرسڤی دایەوە: "ئەم قسانە چییە! من توانای ئەو دەزانم، بەڵام ئەگەر پێی وایە دەتوانێ بەبێ ویستی خۆم ناچارم بکات سەری بۆ دانەوێنم، ئەوا خەیاڵی خاوە، چونکە من لە ئەسڵ و فەسڵدا هاوترازی ئەوم. ئێمە سێ براین، هەرسێکمان لە (کرونوس و ریا)ین: زیوس، و من، و هادیسی پاشای مردوان لە جیهانی ژێرین. هەموو شتەکان دابەش کران بەسەر سێ بەشی یەکسانەوە، و هەر کەسە و بەشی خۆی وەرگرتووە. کاتێ کە قورعەمان ڕاکێشا دەریای کەفچەڕین بەر من کەوت، بوو بەنیشتمانی هەتا هەتاییم... هادیس تاریکی بەتەمتومانی پێ بڕا. (زیوس)ش ئاسمانی بەرینی سەر هەوا و هەورانی پێ بڕا. بەڵام زەوی و ئولیمبوسی سەربەرز تاوەکو ئێستا شەریکییە لەنێوان هەموومانەدا.

(١٩٣) لەبەر ئەمە، مل بۆ زیوس نادەم، چەند بەهێزیش بێ ملکەچی ویستی ئەو نابم، با لە سێیەکە بەشەکەی خۆیدا دانیشێت، و هەڕەشەی هێز و بازووم لێ نەکات، وەکو ئەوەی من خوێڕیلەیەکی ترسنۆك بم. با ئەو هەڕەشانە بۆ کچ و کورەکانی خۆی بنێرێت، ئەوانەی لە پشتی ئەو بوون. ئەوانەی کە ملکەچ و گوێڕایەڵی هەر فرمانێکی دەبن!"

(٢٠٠) ئایریسی تیژڕۆ بەرسڤی دایەوە و گوتی: "ئەی زەوی پارێز، ئەی قژ ڕەش، ئایا بەڕاستی دەتەوێ ئەم پەیامە درشت و زبر و ناشرینە بۆ زیوس ببەمەوە؟ یان دڵ دەگۆڕیت و نەرم دەبیت؟ ئاقڵمەندان هەمیشە بەهێمنی بیردەکەنەوە.. تۆ بەخۆت دەزانی کە خواوەندانی تۆڵە (ئێرینوس)ەکان هەمیشە لەژێر خەرمانی کوڕی گەورەدا (زیوس)ن.

(٢٠٥) پوسیدون، دیسان وەڵامی دایەوە: "ئەی یەزدانخانم، ئەی ئایریس، تۆ ڕاست دەکەی، چەند خۆشە پەیام ئاوەر وریا و زیرەك بێ!.. بەڵام من داخ و کەسەری ئەوەم لە دڵدایە کە کەسێکی هاوتای خۆت، کە قەدەر و چارەنووس کردبێتی بەهاوتەراز و هاوتای، بێت هەڕەشەت لێ بکات.. بەهەرحاڵ من هەرچەندە زۆر توڕە و نارازیم بەڵام ملی بۆ دەدەم. جا قسەیەکی دیکەشم هەیە دەمەوێ بەتۆی بڵێم، ئەم قسەیە لەناخی دڵمەوە دەردەچێ، بەڵام هەر بەینی خۆمان بێ. ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر بەنیازە بەپێچەوانەی ئارەزوو و مەبەستی من و ئەتینای کۆکەرەوەی دەستکەوت و تالانی جەنگی، و هیرا و

هێرمیس، و شاهیفایستوس ڕەفتار بکات، ئیلیونی سەربەرز و هەزار بەهەزار لە وێرانی بپارێزێ، و خۆی لەسەر خستنی ئاشکرای ئاخییەکان دووربگرێ، با چاك بزانێ کە ڕق و کینەی ئێمە لەبن نایەت و وشك ناکات."

(٢١٨) پوسیدۆنی زەوی لەرزێن، ئەو قسانەی کرد و لەشکر و قۆشەنی ئاخییاییەکانی بەجێهێشت و چوو خۆی بەبنی دەریادا کرد. جەنگاوەرانی ئاخیایی بێ پشت و پشتیوان مانەوە! ئەوجا زیوسی هەورەوان، ڕویکردە ئەپولۆ و گوتی: "ئەی ئەپولۆی ئازیز و هەژی، ئێستا تۆ بڕۆ بۆلای هیکتۆری برونزپۆش، چونکە پۆسیدونی زەوی پارێز ڕۆیشتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی، بۆ بنی دەریا و باشیکرد کە خۆی لە پشم و غەزەبی من دوورگرت، چونکە ئەگەر وای نەکردبا، تەنانەت خواوەندەکانی دیکەش، ئەوانەی لە تارتاردا، دەوری (کرونوس)یان داوە هەراوزەناو هەنگامەی ئەم شەڕەیان دەژنەوت. جا ئەمە بۆ هەردوولامان، چ بۆ من و چ بۆ ئەو، باشترە. قازانجی ئەو لەوەدا بوو، وێڕای تورەییەکەی، مل بۆ من بدات، دەنا ئەم ناکۆکییە بەئاسانی کۆتایی نەدەهات. جا ئێستا تۆ سپەرە بەگێز و گولینگەکەی من هەڵگرە و بەهەموو هێزی خۆتەوە بای بدە، تا قارەمانانی ئاخییایی بترسێنێ و بتارێنێ. جا ئەی ئەپولۆ، ئەی تیرەندازی دوور هاوێژ، بەخۆت هیکتۆری مەزن تیمار بکە.. و لەو ماوەیەدا کەرب و کینێکی وەهای بخە دڵەوە کە ئاخییەکان خۆ لەبەر هێرش و پەلاماری نەگرن و بەپەلە پروزێ بۆلای کەشتییەکانیان هەڵێن و تا کەنداوی هیلسبونت نەوەستنەوە، هەنگێ بەخۆم بیر لەوە دەکەمەوە کە چ بڵێم و چ بکەم تا ئاخییەکانیش بتوانن پشوویەك بدەن و بینێك تازە بکەنەوە و برێك بحەوێنەوە.

(٢٣٦) ئەپولۆ-ی گوێڕایەڵ قسەکانی بابی وەرگرت و میناکی واشەیەکی تیژباڵی دژمنی کۆتران، کە بەڕاستی لە هەموو فرندەیەك تیژترە، لە بەرزاییەکانی ئێداوە داگەڕا. سەیری کرد هیکتۆری مەزن، کوڕی پریامی پاکزاد، پاڵ نەکەوتووە، بەڵکو دانیشتووە. تازە بەهۆش هاتبووەوە و کەوتبووە ئەوەی هاوڕێکانی دەوری بناسێتەوە، لە ئارەقەکردنەوە و هەناسەبڕکێ کەوتبوو، بەئیرادەی زیوسی سپەروان ژیابووەوە. ئەپولۆ هاتە دیاری و گوتی: "ئەی هیکتۆر، ئەی کوڕی پریام! بۆچی وا سست و بێ تاقەتی، بۆچی دوور لە جەنگاوەرەکانی دیکە، لێرە دانیشتوویت؟ چ دەردێك پەریشانی کردویت؟."

(٢٤٦) هیکترۆ بەکێوخودە درەخشانەکەیەوە وبەدەنگێکی کز وەڵامی دایەوە: "ئەی میرەبان، تۆ کیهە خواوەندی کە وا ڕووبەڕوو لە من دەپرسیت؟ چما نازانی کە ئەجاکسی

دیتی، ئەو کاتەدا کە من لای کەشتی ئاخییەکان، هاوڕێکانیم دەکوشت، گاشە بەردێکی بەسەر سینگمدا کێشا و کۆڵەواری کردم و ناچاری کردم لە مەیدانی شەڕ وەدەربکەوم؟.. لە دڵەوە بەخۆم دەگوت ئەمڕۆ دیدار بەقیامەت دەبم و دەچمە دیدەنی مردووەکان و سەرای هادیس، چونکە گیانم گەیی بووە کونەلوتم."

(٢٥٣) دیسان ئەپولۆی تیرەندازی دوور هاوێژ، گوتی: "ورەت بەرز بێ، چونکە ئەو پاسدارەی کوڕی کرونوس لە کۆساری ئیداوە ناردویەتی تا یارمەتیت بدات، پاسدارێکی بەهێزە: شا ئەپولۆیە، منم، منی شمشێرزێڕین، هەمان ئەوخواوەندەی لە کۆنەوە تا ئێستا لە ئازار و ئاسیوانی پاراستوویت، نەك هەر خۆت، بەڵکو بەرگری لە شارە بەرزەکەشت کردووە. جا ئێستا ئەمر بەسوارە زۆر و زەبەندەکانت بکە بەخۆ و بەعەرەبانەکانیانەوە بەرەو کەشتییە ناو بەتاڵەکان هێرش بەرن، منیش وا لە پێشەوە دەڕۆم و ڕێگەتان بۆ خۆش دەکەم و قارەمانانی ئاخییایی ناچار دەکەم بگەڕێنەوە و هەڵێن."

(٢٦٢) ئەپولۆ، بەو قسانە ورەی سەرداری جەنگاوەرانی بەرز کردەوە و تین و تاوی شەڕی لە گیانیا بوژاندەوە. وەکو چۆن ئەسپێکی تێر ئالیك، فێرە خۆشتن و مەلە، پێوەنەکەی دەپچڕێ و بەناز و نێسکە دەکەوێتە دەشت و خۆی بەڕووبارێکی مەنگ و جواندا دەکات، سەری بەرز دەگرێت و یاڵەکەی بەسەرشان و ملیا شەپۆل دەدا.. ئەوجا غروور وئارەزوو، شاد و سەرمەستی دەکات و لاقەکانی بەرەو پاوانی ماین و ئەسپانی دەبەن.. هیکتۆرش کاتێ کە گوێی لە قسەکانی ئەپولۆ بوو، بەو ئاوایە و تا هێز لەلاقیا بوو پێی وەغارێوە نا تا سوارەکان و میرئاخوڕەکان ڕێکبخات و ورەیان بەرز بکاتەوە و بۆ شەڕیان هانبدات.

(٢٧٠) جا وەکو چۆن دەشتەکیان بەخۆ و بەتاژییەکانیانەوە دەکەونە سەر کەڵە ئاسکێك یان بزنە کێوییەك و لەپڕ نێچیرەکە خۆی دەداتە پەنا تاوێرێکی بەرز و ئەستونی یان خۆی بەبێشەیەکی چڕ و پڕدا دەکات و لێیان ون دەبێ، و ناچار دەکەونە هەرا و هەڵا و لەجیاتی نێچیرەکە بدۆزنەوە، شێرێکی بەیاڵ و باڵ لە بانگ و فریادی نێچیرڤانەکان هەڵدەستێ و دێتە ڕێگەیان، و هەموو سارد دەبنەوە و ناچار ڕێگەی هەڵاتن دەگرنە بەر، بەو ئاوایە هێزی ئاخییەکان بەشمشێران و نێزەی دووفلیقانە دژمنیان ڕاو دەنا، کە لەپڕ هیکتۆریان بینی پێشی جەنگاوەرەکانی کەوتووە، هەموو ترسیان لێ نیشت و دڵیان داخورپا و هەموو ئازایەتییەکیان هاتە سەر لاقیان.

(٢٨١) ئەوجا تۆواسی کوڕی ئاندرومون، کە دلێرترین ئیتولیان بوو، لە ڕمبازیدا باڵادەست بوو، لە شەڕدا خۆڕاگر و بێ باك بوو، و کەلە کۆڕ و کۆبوونەواندا وەختێ کە لاوان دەکەوتنە گەنگەشە و باسان کەم کەس لە ئاخییەکان هاوتای دەکردەوە. بەڵا تۆواس بەمتمانەیەکی زۆرەوە هەستایە سەر پێیان و ڕویکردە ئاپۆرەی خەڵکەکە و گوتی: "کوڕینە گوێ بگرن.. ئەوەی چاوانی من دەیبینێ بەڕاستی موعجیزەیەکی گەورەیە، من نازانم هیکتۆر چۆن هەستاوەتەوە وجارێکی دی لە مەرگی مسۆگەر خەلەسیوە ؟.. ئەلهەقی هەر یەکێك لە ئێمە لەدڵی خۆیدا دڵنیابوو کە بەدەستی ئەجاکسی کوڕی تیلامون کوژرا.. وا دیارە یەکێك لە خواوەندەکان جارەکی دی زیندووی کردووەتەوە، ئەو هیکتۆرەی پێشتر زۆری لە ئێمەی داناییان کوشت، وا جارێکی دی تێمان کەوتوەتەوە، دیارە دەبێ دەستی زیوسی لە پشت بێ، دەنا هەرگیز زاتی نەدەکرد جارێکی دیکە بەم شێوەیە پێش لەشکرەکەی بکەوێ و بجەنگێ.. بۆیە وەرن بە قسەم بکەن و چیتان پێ دەڵێم وا بکەن، باهێزی سەرەکی قۆشەنەکەمان کۆبکەینەوە و بەرەو کەشتییەکان پاشەکشە بکەن، بەڵام خۆمان، ئەوانەی خۆمان بە هەڵبژاردەی قۆشەنەکە دەزانین، لە شوێنی خۆمان دەمێنینەوە و نێزە بەدەست هەوڵدەدەین ڕووبەڕوی ببینەوە و پێشی لێ بگرین، پێم وایە هەنگێ، بەهەموو جۆش و خرۆشێکییەوە، لەوە دەپرینگێتەوە کە خۆی بەئاپۆرەی داناییەکاندا بدات."

(٣٠٠) بەو ئاوایە قسەی کرد، هەموو بەدڵ گوێیان لێگرت و فەرمانەکەیان پەسەند کرد. هەر هەموو ئەوانەی لەگەڵ ئەجاکس و شا تیدومینیوس، و تیوسیر و میریونیس و میگیس"ی هاوتای ئێریس دا بوون، باشترین جەنگاوەری خۆیان خڕ کردەوە و ڕووبەڕووی هیکتۆر و تەروادەییەکان کەوتنە شەڕ، بەڵام هێزی سەرەکی قۆشەنەکە لە پشتیانەوە بەرەو کەشتییەکان پاشەکشەیان کرد.

(٣٠٦) تەروادەییەکان بەکۆمەڵ و بەڕابەرایەتی هیکتۆر کەوتنە هێرش و پێشڕەوی. ئەپولۆ خۆی لە پەڵە هەورێکەوە پێچا بوو و پێشی هیکتۆر کەوتبوو. ئەو سپەرە بەگێژ و گوڵینك و ڕیشودارە سامناکە پرشنگدارەی هەڵگرتبوو، کە (هیفایستوس)ی ئاسنگەر بۆ زیوسی دروستکردبوو تا هەڵیگرێت و ترس و لەرز بخاتە ناو جەنگاوەرانەوە. ئەپولۆ ئەو سپەرەی هەڵگرتبوو و بەرەو پێش ڕابەرایەتی تەروادەییەکانی دەکرد.

(٣١٢) ئارگۆسییەکانیش ڕیزەکانی خۆیان یەك خستبوو چاوەڕوانی هاتنی ئەوانیان

دەکرد. بانگ و نەعرەتەی شەڕ لە هەردووك لا بەرز بووەوە، هەر تیر بوو و لە کەوانان دەردەپەڕی و هەر نێزە بوو بەدەستانی بەهێز دەهاوێژران، هەندێکیان لە جەستەی جەنگاوەراندا ختم دەبوون، هەندێکیان ئەگەرچی تامەزرۆی گۆشتی سپی و ناسك بوون، لە نیوەی ڕێگەدا و بەرلەوەی بەئاوات بگەن، دەکەوتنەوە ولە عاردی دەچەقین! تا ئەو کاتەی سپەرەکە بەبێ جوڵە لە دەستی ئەپولۆدا بوو، تیری هەردوو لەشکرەکە، ئامانجی خۆیان دەپێکاو گیانی جەنگاوەرانیان دەکێشا، بەڵام کاتێ کە بەتەواوەتی بۆ داناییەکان دەرکەوت و سپەرەکەی ڕاوەشاند و بەدەنگی بەرز لە نەعرەتەی شەڕی دا، هەموو نەتەرەیان بەردا و ئازایەتی و دلێریان لە بیرچووەوە. وەکو چۆن دوو درندە لە تاریکە شەوێکدا پەلاماری گاگەلێك یان ڕانە پەزێکی بێ شوان دەدەن و هەراسان و پەراگەندەیان دەکەن.. بەو ئاوایە ترس و لەرز کەوتە دڵ و دەروونی ئاخییەکان و ڕێگەی هەڵاتنیان گرتەبەر، چونکە ئەپولۆ ترسی خستبووە دڵی ئەوان و سەرکەوتن و سەرفرازی بەتەروادەییەکان و بەهیکتۆر بەخشی بوو.

(٣٢٨) هەنگێ ئیدی هەر کەسە و پەلاماری یەکێکی تری دا، شەڕ لە نێو ئەم دەستە پەراگەندانەدا دەستی پێکرد. هیکتۆر هەردووك (ستیخیوس) و (ئەرکیسلاوس)ی کوشت، ستیخیوس ڕابەری (بیویتان)ەکان بوو وئەرکیسلاوس دۆستی گیانی بەگیانی مینیستیوس بوو. ئینیاس هەردووك "میدون" و"ئیاسوس"ی کوشت. میدون کوڕی حەرامزادەی (ئویلیوس)ی نیمچە خوا بوو، برای ئاجاکس بوو، لە فولاکی و دوور لە وڵاتی خۆی دەژیا، چونکە پیاوێکی خزمی باوەژنەکەی خۆی، واتە (ئەریوبیس)ی کوشتبوو کە ئویلیوس مارەی کردبووەوە. بەڵام ئیاسوس، ڕابەری ئاتنیان بوو، و کوڕی (سیفلوسی کوڕی بوکولوس) بوو. بەڵام پولیداماس، میکیستیوس)ی کوشت. (پولیتیس)ش، (ئەخیوس)ی کوشت کە دەستی لە زیان شت بوو و هاتبووە ڕیزی پێشەوەی چەند جەنگاوەرێکەوە. هەروەها کلونیوس بەدەستی ئەجینوری مەزن کوژرا..( پاریس)ش (دایوخوس)ی کوشت. لەو کاتەدا کە لە ڕیزەکانی پێشەوە هەڵدەهات، پاریس لە پشتەوە نیشانی لێگرتەوە و ڕێك دەفەی شانی پێکاو ڕمەکە دیوادەری کرد.

(٣٤٣) لەو کاتەدا کە تەروادەییەکان خەریکی ڕوتکردنەوە و داماڵینی چەکەمەنی کوژراوەکان بوون، ئاخییەکان بەسەر خەنەکە سنگ ڕێژەکەدا بازیان دەدا و شپرزە و سەرگەردان بەهەر لایەکدا هەڵدەهاتن و پەنایان بۆ ناو حەسارەکە دەبرد. ئەوجا هیکتۆر

با میرلە گەروویدا بوو هاواری لە تەروادەییەکان کرد: "هەڕنە پێش بۆ سەر کەشتییەکان، واز لەم تالانی و دەسکەوتە خوێناویانە بێنن. هەر کەسێك بدینم بۆ ئەودیو حەسارەکە بگەڕێتەوە و لە کەشتییەکان دوور بێ، بەدەستی خۆم دەیکوژم. خوشك و براکانیشی جەنازەکەی بەدەست ناهێنن تا ڕێورەسمی شەوتنگەی بۆ ئەنجام بدەن، بەڵکو کسۆکان لەبەردەم شارەکەماندا ونجڕ ونجڕی دەکەن.

(٣٥٢) دوای ئەو قسانە، ئەسپەکانی بەر قامچی دان و بانگی لە تەروادەییەکان کرد کە یەکڕیز هێرش بەرن، هەموو بەیەك دەنگ لە نەعرەتەیان داو شان بەشانی ئەو، کەوتنە تاودانی ئەسپ و عەرەبانەکانیان و بوو بەهەراو هەنگامەیەك ئەوسەری دیار نەبوو. ئەپولۆ لە پێشیانەوە و بەپێیەکانی خۆی هەردوو ڕەخی خەنەکەکەی دەروخاند و دەیخستە ناوەندی خەنەکە قوڵەکەوە و بەمەش ڕاڕەوێکی پانی بۆ جەنگاوەرەکان دروستکرد کە پانییەکەی بەئەندازەی ڕمهاوێژێك دەبوو، کە پیاوێکی بەهێز بۆ تاقیکردنەوەی هێزی بازووی خۆی بیهاوێژێ. هێزی تەروادەییەکان، سەف لەدوای سەف بەو ڕاڕەوەدا پەڕینەوە، ئەپولۆ بەخۆ و سپەرە سامناکەکەیەوە کەوتبووە پێشیان. حەساری ئاخییەکان زۆر بەئاسانی هەرەسی هێنا، وەکو چۆن منداڵێك لە ڕەخی دەریا بەلم ماڵێك دروست دەکات و پاشان بەنووکە شەقێك خاپوری دەکات، تۆش ئەی تیرەنداز (ئەی ئەپولۆ) بەهەمان شێوە ڕەنج و ماندووبوونی ئاخییەکانت بەفیڕۆ داوترس ولەرز و پەشێویت خستە ناویانەوە.

(٣٦٧) بەو جۆرە ئاخییەکان لە دەوری کەشتییەکانیان خڕبوونەوە، کەوتنە هاندان و ورە بەرزکردنەوەی یەکدی، دەستە و دوعا لەبەر هەموو خواوەندەکان دەپاڕانەوە. بەتایبەتی نەستوری جیرنیایی، قەڵا و مەترێزی ئاخیان دەستەودوعا ڕوو لە ئاسمانی پڕ ئەستێرە، دەپاڕایەوە و دەیگوت: "ئەی بابە زیوس، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان، یەکێك لە ئێمە لە ئارگۆسدا، ئارگۆسی پڕ لە گەنمەجاری بەپیت و بەرەکەتدا، ڕانێکی چەوری گوێرەکە یان مەڕی لە پێناوی تۆدا برژاندووە و لێت پاڕاوەتەوە کە بەسەلامەتی بیگێڕیتەوە بۆ ماڵ و تۆش سەری ڕەزامەندیت بۆی لەقاندووە و دوعاکەیت گیرا کردووە، ئەوا ئێستا ئەوە بەڵێنانە وەبیر خۆت بێنەوە، ئەی خواوەندی ئولیمبی لە ڕۆژی ڕەش بەدوورمان بکە، مەیەڵە تەروادەییەکان لەناومان بەرن.

(٣٧٧) نەستور بەو جۆرە پاڕایەوە: زیوس دوعا و نزاکەی گیرا کرد، بەهەورە بروسکەیەکی توند وقایم وەڵامی پیرەمێردی کوڕی (نیلیوس)ی دایەوە. بەڵام تەروادەییەکان کاتێ گوێیان

لە هەورە تریشقەکە بوو، بەتین وتاوێکی زیاترەوە کەوتنە پەلاماردانی ئارگوسییەکان، وەکو چۆن شەپۆلی گەورەی دەریای بەرین، بەدەم بای بوریاسەوە بەلورە لور دێت و بەسەر بۆدی کەشتییەکدا سەردەکەوێ و دەیەوێ نقومی بکات، بەو ئاوایە جەنگاوەرانی تەروادەیی بەدەم هورا و نەعرەتەی بەرزەوە هەڵیانکوتایە سەر حەسارەکە و شکاندیان و عەرەبانە و ئەسپەکانیان بردە ژوورەوە و پەیکان بەدەست شەڕەکەیان گەیاندە نزیکی کەشتییەکان. تەروادەییەکان لەسەر گالیسکەکانیانەوە شەڕیان دەکرد و ئارگۆسییەکان لە بەرزییەوەو لەسەر کەشتییە بۆرەکانیان دانیشتبوون، و بەقایمترین گورزی دار بەڕوو، چەکی دەریاوانان، کە سەرەکەی لە برونز گیرا بوو، بەرگرییان لەخۆ دەکرد.

(٣٩٠) کاتێ کە ئاخیایی و تەروادەییەکان لە دەوروبەری حەسارەکە و دوور لەکەشتییەکان شەڕیان دەکرد، پاتروکلوس لە خێوەتەکەی (یورپولوس)ی دلێر و جوامێردا دادەنیشت، بەقسەی خۆش سەرگەرمی دەکرد، و هەتوانی گیایی لە برینەکەی دەنا تا ئازاری بشکێ و ساڕێژ ببێتەوە. بەڵام هەر کە بینی تەروادەییەکان هێرش بۆ حەسارەکە دێنن و داناییەکان لە ترسا هاواریان لێ بەرزبووەتەوە و شپرزەو پەشۆکاو لەبەریان هەڵدێن، ئاهێکی قوڵی هەڵکێشاو بەدەم خەم وکەسەرەوە گوتی: "ئەی یورپولوس، هەرچەند دەزانم تۆ پێویستت بەهاوکارییە، بەڵام بەهیچ جۆرێ ناتوانم لەلای تۆ بمێنم، چونکە بەڕاستی شەڕێکی قورسە. با یەکێك لە هاوڕێکانت یا خوڵامەکانت بێن تیمار و پەرستاریت بکەن! من دەبی هەر ئێستا و بەپەلە بچمە دەف ئەخیل وئەگەربتوانم بۆ شەڕی هانبدەم، کێ دەزانێ، لەوەیە بەپشتیوانی خواوەندێك، بتوانم قەناعەتی پێ بکەم، هەندێ جار قسەی دۆست زۆر کاریگەرە."

(٤٠٥) دوای ئەو قسەیە لە خێوەتەکە وەدەرکەوت و بەهەشتاو چوو بۆلای ئەخیل. ئاخییەکان خۆیان لەبەر هێرشی تەروادەییەکان ڕاگرتبوو، ئەگەرچی تەروادەییەکان بەژمارە کەمتر بوون، بەڵام ئارگوسییەکان نەیانتوانی لە کەشتییەکان دووریان بخەنەوە. هەروەها تەروادەییەکانیش نەیانتوانی ڕیزی ئاخییەکان تێك بشکێنن و ڕێگە بۆ ناو خێوەت و کەشتییەکانیان بکەنەوە. وەکو چۆن دارتاشێکی وەستاو شارەزا لە هەموو ڕاز و ڕەمزێکی هونەرەکەی و پشت ئەستور و بەهرەدار بەئامۆژگارییەکانی ئەتینا، کە دەیەوێ کەشتییەك دروست بکات، هەموو تەختەکان بەیەك پێوانە وسەنگ وئەندازە ڕێك وراست و لەجێی خۆیان دەدانێ، شەڕەکەش بەو ئاوایە لەنێوان هەردوولادا یەکسان و لەیەك ئاستدا بوو.

(٤١٥) هیكتۆر ڕاستەوخۆ بەرەو ئەجاكسی مەزن ملی نا، شەڕی هەردووكیان لەسەر كەشتییەك بوو، نە هیكتۆر توانی پاشەكشە بەئەجاكس بكات و كەشتییەكە بسوتێنێ، و نەئەجاكس توانی هیكتۆر كە خواوەندێك ڕێنوێنی دەكرد، لە كەشتییەكە دوور بخاتەوە.
(٤١٩) لەم كاتەدا ئەجاكسی بەجەوهەر، نیشانەی لە كالیتوری كوڕی كلیتیوس،گرتەوە كە مەشخەڵێكی بەدەستەوە بوو بەرەو كەشتییەكە دەهات، ڕێك ناوەندی سینگی پێكاو كەوتە سەر زەوی و مەشخەڵەكەی لەدەست بەربووەوە.هیكتۆر هەر كە بینی ئامۆزاكەی لەبەردەم كەشتییە بۆرەكەدا كەوت و لە خاك و خوێن گەوزا، بەدەنگی بەرز هاواری لە تەروادەیی و لیسییەكان كرد و گوتی: "ئەی تەروادەییان، لیسیان، و داردانیان پەلامار بدەن، هێرش بەرن و نەكەن بەبستیش بگەڕێنەوە، خێرا كوڕەكەی كلیتیوس دەرباز بكەن، دەنا ئاخییەكان ئەسلەحەكەی دەبەن، لە بەینی كەشتییەكاندا كەوتووە، خێرا كەن.
(٤٣٠) دوای ئەو قسانە پەیكانێكی سرەواندە ئەجاكس، پەیكانەكەی هەتەری كرد، بەڵام لەجیاتی ئەو (لوكوفرون-ی كوڕی ماستور) و خوڵامی ئەجاكسی پێكا. هەرچەند لوكوفرون خەڵكی سیتیرا بوو، بەڵام لای ئەجاكس دەژیا، چونكە پیاوێكی لە ستیرای پیرۆز كوشتبوو. ڕمە برونزییە تیژەكەی هیكتۆر سەری ئەوی لەسەروو گوێیەوە، لەو كاتەدا كە لە پاڵ ئەجاكسدا وەستا بوو، دیوا ودەركرد و لەسەر كەشتییەكەوە بەسەرا بەر بووەوە و لە خاك و خوێنا گەوزا و چوار پەلی سست بوو. ئەجاكس لە حەژمەتا لەرزی و ڕوویكردە براكەی و گوتی: "ئەی تیوسیری ئازیز، ئەی مرۆڤە میهرەبانەكە، دۆستە دڵسۆزەكەی هەردووكمان كوژرا، كوڕەكەی ماستور، كە لە ستیراوە پەنای بۆ ئێمە هێنابوو، و لە كۆشكەكەی خۆمانا وەكو كەسێكی نزیكی خۆمان ڕێزمان دەگرت، وەك داك و بابی خۆمان ڕێزمان دەگرت، كوژرا، لە دەستمان چوو. ئا ئێستا هیكتۆری هەژی كوشتی، كوا تیرە كوشندەكانت، كوا ئەو كەوانەی كە ئەپولۆ دایتێ، بۆ كەیتە؟
(٤٤٢) تیوسیر گوێی لێ بوو،بە هەشتاو خۆی گەیاندە دەف وی، كەوان و تیردانەكەی بەدەستەوە بوو. هەر زوو كەوتە تیرەندازی بەرەو تەروادەییەكان. تیرێكی لە كلیتوسی كوڕی بیسینور، هاوڕێی پولیداماس، كوڕی پانتوس دا وكوشتی. كلیتوس هەوساری ئەسپەكانی گرتبوو و بەدژواری دەیتوانی بەرهەقیان بكات، دەیویست بەمە خزمەتێكی تەروادەییەكان و هیكتۆر بكات، بەڵام ئەسپەكانی بۆ شوێنێ تاودابوون كە شەڕ زۆر گەرم بوو. لەو كاتەدا بەڵای بۆ نازڵ بوو، كەسیش نەیتوانی ئەم بەڵایەی لێ دوور بخاتەوە،

چونکە تیرەکە پشتە ملی دیوا وەرکرد، لە گالیسکەکەی کەوتە خوارەوە. ئەسپەکان جڵەویان بەر بوو و عەرەبانە بەتاڵەکەیان بەتەق و هوڕ ڕادەکێشا، لە تۆ وایە دەیانەوێ بیخەنە لایەکەوە.پولیداماس هەرکە ئەم ڕووداوەی بینی، بەهەشتاو خۆی گەیاندە بەردەم ئەسپەکان. بە (ئەستونوسی کوڕی بروتیاون)ی سپاردن، و لێی دوویات کردەوە کە لە شوێنێکی نزیکە دەست ڕایان بگرێت. ئەوجا گەڕایەوە بۆ ڕیزەکانی پێشەوەی شەڕەکە.

(٤٥٨) ئەوجا تیوسیر، تیرێکی دیکەی دەرهێنا تا بیگرێتە هیکتۆری سەراپا برونزینە پۆش، ئەگەر ئەم تیرە لەو کاتەدا کە هیکتۆر خۆی دەنواند، بیپێکایە، هەڵبەتە ژیانی لەبەر دەبڕی و شەڕی دەوروبەری کەشتییەکان یەکلایی دەبووەوە. بەڵام زیوسی دانا کە چاوێکی هەر لەسەر هیکتۆر بوو، لەم خەتەرە غافڵ نەبوو، ئەم شکۆ و سەرفرازییەی بەتیوسیری کوڕی تیلامون ڕەوا نەبینی، لەو دەمەدا کە ئەو کەوانەکەی ڕادەکێشا، ژێیەکەی پچڕاند و، تیرەکە هەتەری کرد و کەوانەکە لە دەستی بەربووەوە. هەنگێ تیوسیر تورەبوو و ڕوویکردە براکەی و گوتی: "بەداخەوە، تۆ بڕوانە، وادیارە یەکێك لە خواوەندەکان بەر بەرەکانیمان دەکات و هەموو ڕیسەکەمان لێدەکاتەوە بەخوری. کەوانەکەی لە دەستم خست و ژێیەکەی پچڕاندم، ئەو ژێیەی کە تازە بادراوە و ئەم بەیانییە بەتازەیی خستوومەتە سەری و ئەزموومە تا دڵنیابم تیرێکی زۆری پێ دەهاوێژرێ و پەکم ناخات."

(٤٧٢) هەنگێ ئەجاکسی تیلامونی مەزن وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئەی دۆست، واز لە تیروکەوانەکەت بێنە، چونکە خواوەندێك هەیە ئێرەیی بەسەرفرازی ئاخییەکان دەبات، بۆیە لە دەستی تۆی سەندووە. هەرە نێزەکەت هەڵگرە، سپەرێك بدە بەشانتا و بکەوە شەڕی تەروادەییەکان.. جەنگاوەرەکانی دیکەش دنەبدە بۆ شەڕ، تا دژمنان، چەند لە ئێمەش بەهێزتربن، بەبێ شەڕ و کوشتار، و بەئاسانی نەتوانن دەست بەسەر کەشتییە مکومەکانماندا بگرن. دەی سا دەست لە دەست و.. بەرەو شەڕ". ئەوجا تیوسیر تیروکەوانەکەی برد و لە خێوەتەکەی خۆیدا داینا. سپەرێکی چوارلۆی لە شان کرد، کێوخودێکی یەجگار نایابی لەسەرنا کە بەگێز و گوڵینگ و یاڵی ئەسپ ڕازابووەوە. نێزەیەکی قورسی نووك برونزی هەڵگرت و خێرا پەیوەندی بەئەجاکسەوە کرد.

(٤٨٤) هیکتۆر گاڤێ کە بینی کەوانەکەی تیوسیر لەکار کەوت، بەدەنگی بەرز هاواری لە تەروادەییان و لیسیان کرد: "ئەی تەروادەییان، لیسیان و داردانیانی جەرگەی شەڕ،

ئەمرو ڕۆژ ڕۆژی پیاوانە، مەردایەتی خۆ بنوێنن و لێرەدا و لەلای ئەم کەشتیانە دلێری خۆتان بسەلمێنن. بەچاوی خۆم بینیم کە چۆن زیوس کاریگەری تیری تیرەندازێکی ژێهاتی ئەوانی بەتاڵ کردەوە.
مرۆڤ زۆر بەئاسانی دەتوانێ ئەوە بخوێنێتەوە کە زیوس کەنگێ پشتیوانی لە بەشەران و جەنگاوەران دەکات و کەنگێ پشتیان تێدەکات، وەکو چۆن ئێستاکێ لەگەڵ ئێمەدایە و دژی ئارگۆسییەکانە. دەیسا پۆل پۆل بەرەو کەشتییەکان هەڕنە پێش و پەلامار بدەن، شەڕ بکەن، جا ئەگەر کەسێکتان بەتیر یا نێزەی دژمن کوژرا، با بەدڵنیاییەوە چاو لێك بنێ. چونکە سەربەرزییە پیاو لە پێناوی نیشتمان و زێدی خۆیدا بمرێت، بێگومان ژن و منداڵ و ماڵەکەی لەدوای ئەو، سەربەرز و سەلامەت و دوور لەهەر ئاسیو و وەیەك دەبن، بەتایبەتی وەختێ ئاخییەکان بەخۆ و کەشتییەکانیانەوە بۆ نیشتمانی ئازیزیان بگەڕێنەوە."
(٥٠٠) بەو قسانە یەك بەیەکی تەرواددەییەکانی جۆشدا، (ئەجاکس)ش لەولاوە کەوتە دنەدانی جەنگاوەرەکانی و گوتی: "ئەی ئارگوسیان شەرم لەخۆ بکەن، هیچ چارێکمان نییە تەنیا ئەوە نەبێت کە بەرگری لە کەشتییەکانمان بکەین و دژمن دوور بخەینەوە، دەنا هەر هەمووومان دەکوژرێین و تیا دەچین. پێتان وایە ئەگەر هیکتۆری خودەدرەخشان دەست بەسەر کەشتییەکاندا بگرێ دەتوانن بەپێیان بۆ خاکی وەتەن بگەڕێنەوە؟ گوێتان لێ نییە هیکتۆر چۆن یەك بەیەکی هێزەکەی جۆش دەدا تا کەشتییەکانمان بسوتێنن؟ ئەمریان پێدەکات کە لە بیریان بێ کە بۆ شەڕ هاتوون نەك شایی و هەڵپەڕکێ. باشترین نەخشە و پلان ئەوەیە کە هێز و بازووی خۆمان بخەینە کار و شەڕی مان و نەمانیان لەگەڵدا بکەین، ئیدی ئەمە یەك جارە و دەبڕێتەوە، یان دەمرین یان دەژین، زۆر باشترە لەوە ماوەیەکی زۆر شەڕێکی بێهودە بکەین و نەتوانین تۆڵەی خۆمان لە خەڵکانێك بکەینەوە کە بەهیچیان نازانین و زۆر لە ئێمە کەمترن!"
(٥١٤) بەو قسانە بوژاندنییەوە و ورەی بەرزکردنەوە. لەم کاتەدا هیکتۆر، "سکیدیوس"ی کوڕی پیریمیدس، سەرداری فوسیدیانی کوشت. (ئەجاکس)ش لایوداماسی فەرماندەی جەنگاوەرانی پیادە، کوڕی ئەنیتنوری ناوداری کوشت. پولیداماس، (ئوتوس)ی سیلینی هاوڕێی کوڕی فیلیوس و سەرداری (ئیپیان)ی کوشت. کە میگیس ئەمەی بینی ڕمێکی سرەواندە پولیداماس، بەڵام پولیداماس خۆی دانەواندەوە وڕزگاری بوو، چونکە ئەپولۆ ویستی لەسەر نەبوو کە کوڕی پانتوس لەم شەڕەدا بکوژرێت، بەڵام ڕمەکە لە دوڕ سینەی

کرویسموس چەپی و شەقی کرد، خێرا گلاو کەوتە سەر زەوی، میگیس کەوتە داماڵینی چەك و ئەسلەحەکەی، لەم کاتەدا دولوبسی کوڕی لامبوس لێی هاتە دەست. لامبوس کوڕی لاومیدون بوو، جا دولوبسی کوڕی شارەزای هەموو جۆرە شەڕێك بوو. بەڵا لێی هاتە دەست و ڕمەکەی هاویشتە سپەری کوڕەکەی فیلیوس و لە نزیکەوە هێرشی بردبووە سەری. بەڵام زرێ نایابەکەی کوڕی فیلیوس فریای کەوت و لە مردن پاراستی. فیلیوس ئەم زرێیەی لە ئیفرای کەنارەکانی ڕوباری سیلیس هێنابوو، شا ئیوفیتیسی خانەخوێی دابویێ، تا لە شەڕا لەبەریبکات و خۆی پێ بپارێزێ. هەمان ئەو زرێیە بوو کە ئێستا کوڕەکەی لە مردن ڕزگار کرد.

(٥٣٦) ئەوجا (میگیس)ش ڕمی خۆی هاویشت و ترۆپکی کێوخودە برونزییەکەی (دولوپس)ی پێکا، گوڵینگی کێوخودەکەی کە لە یاڵی ئەسپ دروستکرابوو برد بەئاسمانا و کەوتە سەر زەوی. لە کاتێکا میگیس بەگژ "ولوپس"دا دەچوو، و هێشتا هەر بەهێڤی سەرکەوتن بوو، مینیلاوسی دلێر هاتە هیمدادی، دەست بەڕم لە پەنایەکی پێوارەوە وەستا. لە پشتەوە نێزەیەکی خێواندە شانی دولوپس، پەیکانەکە لە سینگییەوە دەرچوو، دلۆپس بەدەما تەختی زەوی بوو. بەدوو قۆڵی پڕیان دایێ تا چەك و ئەسلەحە برونزییەکەی لێداماڵن.. بەڵام هیکتۆر هەموو خزمەکانی گاز کرد.. لە هەمووان زیاتر کەوتە لۆمەی کوڕەکەی هیکیتاون، میلانیپۆسی دلاوەری کرد، کە تا دژمن هێشتا دوور بوو، لە بیرکوتی خەریکی بەخێوکردنی گاوگۆتاڵ بوو، بەڵام کاتێ کە کەشتی ئاخییەکان هاتن —ئەویش جارێکی دی بۆ تەروادە گەڕایەوە و لەنێو تەروادەییەکاندا بوو بەسەرامەد و ناوی دەرکرد و لەپاڵ پریامدا کە وەکو یەکێك لە کوڕەکانی خۆی مامەڵەی لەتەکدا دەکرد، دەژیا. جا هیکتۆر هەوەڵجار لەو تورە بوو و بەناو.، ناوی ئەوی هێناو گوتی: "ئەمە ڕاستە ئەی میلانیپوس، ئێمە ئاوها سست و خەمسارد بین؟ باشە دڵت بۆ خزمە کوژراوەکەت نایەشێت؟ نابینی بکوژانی دولۆپس چۆن لە چەك و ئەسلەحەکەی ڕووکاون تا بیبەن؟ دوام کەوە، وەختی دوورە شەڕ بەسەرچوو، تەنیا ئەوەمان بۆ ماوەتەوە لە نزیکەوە شەڕی ئارگۆسییەکان بکەین، جا یا بیانکوژین، یا هەموو تەروادەی سەربەرز و بەبرج و حەساران بگرن و خەڵکەکەی بکوژن."

(٥٥٩) دوای ئەو قسانە کەوتەڕێ، (میلانیپوس)ی قارەمان وەکو نیمچە خواوەندێك هەنگاو بەهەنگاو شوێنی کەوت. لەولاشەوە ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون کەوتە

هاندانی ئارگوسییەکان: "دۆستان، ئەمڕۆ ڕۆژی هیمەتە، پیاوانە دەست بکەنەوە. ئاگادار بن، ئەمە شەڕە شەڕ، کەس سستی نەنوێنێ و گلەیی هاوڕێکەی نەهێنێتە سەر خۆی و بۆ هەتا هەتایە خۆی شەرمەزار نەکات. ئەوانەی شەرمیان بەخۆیەو مەیدانی شەڕ بەجێ ناهێڵن، سەربەرزن، ئەگەری ڕزگار بوونیان زیاترە.. ئاکامی هەڵاتن ڕیسوایی و سەرشۆڕییە!"

(٥٦٥) بەو ئاوایە جەنگاوەرەکانی هاندا، ئیدی ئەوانیش خۆبەخۆ ورەیان بەرز بووەوە و ئارەزووی بەرەنگاربوونەوەی دژمنیان لە دڵا وروژا، وەکو دیوارێکی برونزی دەوری کەشتییەکانیان دا، (زیوس)ش لەولاوە تەروادەییەکانی لێ هاندەدان. مینیلاوسی دلێر و نەعرەتەکێشی جەنگ کەوتە دنەدانی ئەنتیلوخوس، گوتی: "ئەی ئەنتیلوخۆس، تۆ لە هەموو ئاخییەکان گەنجتری، نە لە تۆ گورج و گۆڵتر و سوکەڵەتریان تیایە، نە لە تۆ بێباکتر و ئازاتریان تیایە لە شەڕدا. پەلامارێك بدە و یەکێك لە تەروادەییەکان بکوژە.".

(٥٧٢) مینیلاوس، ئەو قسانەی کرد و ڕۆیی، بەڵام ئەنتیلوخۆسی پڕ کردبوو، ئەوە بوو خێرا لە ڕیزەکانی پێشەوەی جەنگاوەرەکانەوە بۆی دەرچوو، دوای ئەوەی بەپارێزەوە ئاوڕێکی دەوروبەری دایەوە، نێزە پرشنگدارەکەی هاویشت، هەر کە ڕمەکەی هاویشت تەروادەییەکان لەبەردەمیا گەرانەوە! ڕمەکەی بەهەتەر نەچوو بەڵکو میلانیپوسی ناودار و دلێری کوڕی هیکیتاونی پێکا، ڕێك سینگی، لە نزیکی مەمکییەوە، لەو کاتەدا کە بەرەو شەرکە دەهات، شەق کرد. بەدەم تەق و هوڕی ئەسلەحەکەیەوە کەوتە سەر زەوی و تاریکی باڵی بەسەر چاوەکانیدا کێشا. هەنگێ ئەنتیلوخۆس وەکو چۆن تاژییەك هەڵدەکوتێتە سەر کارمامزێك کە لە کاتی لە لان دەرچووندا، ڕاوچییەك بریندارى دەکات و چوارپەلی سست دەبێ... بەو ئاوایە ئەنتیلوخۆسی دلێر و شەڕڤان، هەڵیکوتایە سەرت ئەی میلانیپوس تا چەك و ئەسلەحەکەت لێ داماڵا و بەتاڵانی بەرێ. بەڵام هیکتۆری ناودار بینی، لە گەرمەی شەڕدا بەرەو ڕووی چوو. بەڵام ئەنتیلوخوس، هەرچەندە جەنگاوەرێکی لەزەبر بوو، بەڵام زاتی نەکرد لە جێی خۆی وەمێنێ، بەڵکو وەکو درندەیەك کەتنێکی کردبێ، سەگێکی کوشتبێ یان گاوانێکی لە پەنا گاگەلەکەیدا کوشتبێ، و بەرلەوەی خەڵکی لێ ئاگادار بێتەوە هەڵێت!.. بەو شێوەیە کوڕەکەی نەستور لەژێر هەرا و هەنگامەی سامناکی تیر بارانی تەروادەییەکان و هیکتۆردا هەڵهات و تا نەگەییە ناو هێزی لەشکرەکەی خۆیان نەوەستاو نە ئاوڕی دایەوە.

(٥٩٢) بەڵام تەروادەییەکان میناکی شێری دڕندە و چاوبرسی گۆشتی کاڵ بەرەو کەشتییەکان هێرشیان دەبرد و ویستی (زیوس)یان جێبەجێ دەکرد کە لە پەستاو بێ پسانەوە جۆشی دەدان و ورەی دەخستنە بەر ئەوان، و باشاری لەبەر ئارگوسییەکان دەبڕی و سەرفرازی و سەرکەوتنی پێ ڕەوا نەدەبینین و تەروادەییەکانی بەسەردا زاڵ دەکردن. لەدڵی خۆیدا لێبڕا بوو کە شکۆ و سەرفرازی بەهیکتۆری کوڕی پریام ببەخشێت. تا بتوانێ ئاگرێکی لە دامرکانەوە نەهاتوو لە کەشتییە نووك تیژەکان بەربدات، و بەمە دوعا و نوێژ و نزاکەی (تیتیس) بەبێ منەتی گیرا بکات. ئیدی زیوس چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە بەچاوی خۆی بڵێسەی کەشتیەکی گڕگرتوو بدینێ، چونکە لەسەری بوو لەو ساتەوە، کارێکی وەها بکات کە تەروادەییەکان پاشەکشە بکەن و لەلای کەشتییەکان بگەڕێنەوە و لەبەر ئارگوسییەکان هەڵێن و سەرفرازی و سەرکەوتن بە ئارگوسییەکان ببەخشێت.. بەم مەبەست و نیازەوە هیکتۆری کوڕی پریامی هاندەدا کە پەلاماری کەشتیەکان بدات. جا هیکتۆر بەخۆیشی زۆر تاسەمەندی ئەو کارە بوو و سەری پێوە نەبوو بۆ ئەنجامدانی، ئەم پاڵەوانە سەراپای ڕق و تووڕەیی بوو، میناکی ئەریس نێزەکەی بادەدا، یان وەکو چۆن ئاگرێك لە کۆسارێکدا بەردەبێتە بێشە و لێڕێکی چڕە دارستان و نێڵە نێڵ دەیسوتێنێ، بەو ئاوایە دەمی کەفی کردبوو و چاوەکانی لەژێر برۆ سامناکەکانیەوە گڕیان لێ دەبووەوە و بەدەم شەڕ و پەلامارەوە کڵوخودەکەی بەشێوەیەکی ترسناك بەسەر سەر و لاجانگەکانیەوە دەلەرییەوە.

(٦١٠) زیوس لە ئاسمانەوە ئاگاداری دەکرد. هەرچەند بەتەنیا شەڕی ژمارەیەك جەنگاوەری دەکرد، بەڵام زیوس سەرفرازی و سەرکەوتنی پێ ڕەوا بینی بوو، چونکە تەمەنی کورت بوو و ئەجەلی نزیك بوو، و (ئەتینا پالاس)ش زۆری پەلەی ئەو ڕۆژەی بوو کە بەدەستی کوڕەکەی بیلیوس بکوژرێ. لەم کاتەدا، هیکتۆر کە خولیای تێکشکانی ڕیزی هێزەکانی دژمن بوو، لەهەر شوێنێکدا قەرەباڵغی جەنگاوەران زیاتر باو پڕ چەك تر بان خۆی بەوێدا دەدا. بەڵام بەو هەموو جۆش و خرۆش و تین و تاوەوە کە هەیبوو، نەیدەتوانی کەلێنیان تێبخات و تێکیان بشکێنێ، چونکە ئاخییەکان یەکریزوەکو دیوار لە بەردەمیا دەوەستان، یان وەکو چۆن تاوێرێکی زەلام لە کەناری دەریایەکی کەف چەڕیندا، سەربەرز و خۆڕاگر لەبەردەم باو باهۆزی سەرشێت و شەپۆلانی بێ ڕەزای ڕوبارەکەدا دەوەستێ و ناجوڵا، داناییەکانیش بەهەمان شێوە ورە بەرز و خۆڕاگر لەبەردەم تەروادەییەکاندا دەوەستان

و هەڵدەهاتن. بەڵام لە ئەنجامدا هیکتۆر کە گڕی قینی لێ دەبووەوە، وەکو مەشخەڵی ئاگر خۆی بەناویانا کرد، وەکو چۆن شەپۆلێکی تورە و بێ ئامان لە ئەنجامی هەور و هەڵا و باهۆزێکی سامناکەوە هەڵدەکات و شەپۆلی با دەیداتە پێش و دەیکێشێت بەکەشتییەکی بچکۆلەدا و کەشتییەکە بەجارێ لە کەفاودا ون دەبێ و بایەکە لورە لور لە بایەوانەکەی هەڵدەستێنێ و زراوی کەشتیوانەکان دەتۆقێنێ و بەفەلاکەت لە مردن دەرباز دەبن.. ئاخییەکانیش بەهەمان شێوە زەنەقیان لە هیکتۆر چوو بوو. بەڵام هیکتۆر وەکو چۆن شێرێکی درندە پەلاماری گاگەلێکی بێ شومار، کە لە سەوزەزارێکی بژونی دەوری گوڵاوێکی بەریندا دەلەوەڕن، دەدات، و گاوانێکی ناشیان بەدیارەوەیە و هێشتا ناتوانێ شەڕی درندەیەکی وادڕ بکات کە بەتەمایە مانگایەکی شاخ پێچاو پێچی لێ بسەنێ، سەیردەکەی جارێ خۆی دەگەیەنێتە پێشی گاگەلەکە و جارێ دێتە دواوە، بەڵام شێرەکە لە ناوەڕاستەوە خۆی بەگاگەلەکەدا دەدات و مانگایەك دەخات و هەڵیدەدڕێ و دەیکات بەتێشوو،مانگاکانی دی هەموو تۆقیو و هەراسان پەراگەندە دەبن و دەکەونە هەڵاتن. بەو ئاوایە هەموو ئاخییەکان، بەترس و لەرزەوە لەبەر هیکتۆر و بابە زیوس هەڵدەهاتن. بەهەرحاڵ هیکتۆر تەنیا (بیرفیتیس)ی میسینی کوڕی (کوبریوس)ی کوشت، کە جاران فەرمانی (شا یوریستیوس)ی بۆ هیراکلیسی پاڵەوان دەبرد. هەرچەندە بابی ئەم کوڕە کەسێکی ناو بزر و خوێریلە بوو، بەڵام کوڕەکەی، لەهەموو بوارێکی گورج و گۆڵی و شەڕ و شەرڤانییەوە لەسەرووی هاوتەمەنانی خۆیەوە بوو، لە زیرەکی و ئاقڵیدا لە ڕیزی پێشەوەی پاڵەوانانی میسینیدا بوو.. ئەو بووە مایەی سەرکەوتن و سەرفرازی هیکتۆر. کەکاتێ دەگەڕێتەوە، پێی لە داوێنی سپەرەکەی، کە بەخۆی هەڵیگرتبوو، تاسەر پێیەکانی شۆڕ بوو تا لە نێزە و ڕمان بیپارێزێ، هەڵنووتا بوو. بەپشتا کەوتبوو، لەکاتی کەوتنا تەق و هوڕێك لە کێوخودەکەی هەستا بوو، هیکتۆر خێرا هەستی پێکرد. بەهەشتاو خۆی گەیاندە سەری، بەدیارییەوە وەستا، ڕمەکەی لە سینگی چەقاند، لە نزیکی هاوڕێ ئازیزەکانیا کوشتی، ئەو هاوڕێیانەی هەرچەند زۆر بۆی بەداخ بوون، نەیانتوانی فریای بکەون، چونکە بەخویانیش زراویان لە هیکتۆر تۆقی بوو.

(٦٥٣) خۆیان گەیاندەوە لای کەشتییەکانیان، خۆیان دایە پەنای یەکەمین ڕیزی کەشتییەکان، کەشتییەکانی ڕیزی پێشەوەی قەراخ دەریاکە. بەڵام تەرواد‌ەییەکان هێرشیان بۆ هێنان، ئارگۆسیەکان بەناچاری لەوێش پاشەکشەیان کرد، بەڵام ئەمجارە لە نزیکی

خیوەتەکانیاندا گردبوونەوە، دەستە دەستە وەستان و بەناو ئوردوگاکەدا پەراگەندە نەبوون، شەرم و ترس ڕای گرتبوون، لە پەستاو بێ پسانەوە، تا زاریان دەیگرت یەکتریان بانگ دەکرد و ورەی یەکیان بەرز دەکردەوە، بەتایبەتی نەستوری جیرنیایی، قەڵا و پشت و پشتیوانی ئاخییان، یەك یەك بەناوی خۆیانەوە گازی دەکردن و تکا و ڕجای لێدەکردن و دەیگوت: "گەلی دۆستان، براینۆ، یەك بگرن، خۆ لە نەنگی و شەرمەزاری دوور بگرن، ژن و منداڵەکانتان وەبیر بێننەوە، موڵك وماڵەکانتان وە بیربێننەوە، داك و بابتان، ئەوانەی مردوون یا زندوون وەبیر بێننەوە. من بەناوی هەموو ئەوانەوە، لێرەدا داوا لە ئێوە دەکەم کە دلێرانە خۆ بگرن، پشت مەکەنە دژمن، ڕێگەی هەڵاتن مەگرن، من بەناوی ئەوانەوە قسان لەگەڵ ئێوەدا دەکەم، چونکە ئەوان ئێستا لێرە نین.

(٦٦٧) بەو قسانە زات و غرەتی وەبەرنانەوە. ئەتینا پەردەی تاریکی لەسەر چاویان لابرد، بەچاوی خۆیان و بەوپەڕی ڕوونی هەردوو بەری کەشتییەکان و بەری مەیدانی شەڕەکەیان بینی.بەچاوی خۆیان هیکتۆری نەعرەتەکێشی مەیدانی شەڕ و هاوڕێکانیان بینی، هەم ئەوانەی پاشەوە کە بەشداری شەڕیان نەدەکرد و هەم ئەوانەی کە لە نزیکی کەشتییەکاندا شەڕیان دەکرد.

(٦٧٤) ئیدی (ئەجاکس)ی پاڵەوان نەیتوانی لەوەی پتر وەکو ئاخییەکانی دی هەر لە دوورەوە بوەستێ، بەهەشتاو بەسەر کەشتییەکاندا، لەم کەشتییەوە بۆ سەر ئەو کەشتی پازی دەدا، ڕمێکی درێژی بەدەستەوە بوو.. ڕمی شەڕی دەریایی، کە بەئەڵقە لێك دەدرا، نزیکەی بیست و دوو گەز درێژبوو. وەکو چۆن شۆڕەسوارێکی ئەسپناس، چوار دانە ئەسپ لەنێو گەلە ئەسپێکدا هەڵبژێرێ و جەلەیان بکات و بەپەلە لە دەشتەوە و بەشارێیەکی قەرەباڵغدا بەرەو شارێکی مەزنیان تاو دەدات و پیاوان و ژنان دەستە دەستە تەماشای دەکەن، ئەویش دڵنیاو ئاسودە لە هەرەتی چوارناڵەی ئەسپەکاندا، لەسەر ئەسپێکەوە خۆی هەڵدەداتە سەر ئەسپێکی دی و دەرواتە پێشێ.. (ئەجاکس)ش بەهەمان شێوە و بەهەشتاو لە کەشتییەکەوە خۆی هەڵدەدایە سەر کەشتییەکی دیکە و دەنگی دەگەییە ئاسمان و لە پەستا و بێ پسانەوە، بەهاواری سامناك داناییەکانی بۆ بەرگری لە کەشتی و خێوەتەکانی خۆ هاندەدا.

(٦٨٨) هیکتۆرش هەر بەو دەقەوە لەناو ئاپۆرەی تەروادە زرێپۆشەکاندا نەمایەوە، بەڵکو وەکو چۆن هەڵۆیەکی تیژ باڵ، کە پۆلە باڵدارێکی وەکو قازە کێوی یان قورینگ یان

قووی ملدرێژ دەبینێ لە ڕەخی ڕووبارێکدا چینە دەکەن، خۆی پێیاندا دەدا.. هیکتۆرش بەهەمان شێوە هەڵیکوتایە سەر کەشتییەکی شینباوی پێشی پێشەوە، زیوس بەدەستە بەتواناکانی خۆی بەرەو پێشەوەی پاڵدا و جەنگاوەرانی تەروادەیی هاڕوژاند کە دوای بکەون.

(٦٩٦) دیسان، شەڕێکی توند لە نزیکی کەشتییەکان هەڵگیرسایەوە. هێندە بەجۆش و خرۆش شەڕی یەکتریان دەکرد، لە تۆ وایە ئەمە یەکەم شەڕیانە و هەرگیز ماندوو نین. جەنگاوەرانی هەردوو هێزەکە بەمجۆرە بیریان دەکردەوە: ئاخییەکان قەناعەتیان وابوو کە نابێ خۆ بدزنەوە و هەڵێن و دەبێ هەموویان لەوێدا بمرن. هەموو تەروادەییەکیش لە دڵی خۆیدا بەتەما بوو ئاگر لە کەشتییەکان بەربدات و هەموو پاڵەوانانی ئاخیایی بکوژێ.

(٧٠٣) بەو بیروباوەڕەوە هەردوو هێزەکە بەرانبەریان لێکدی گرتبوو، شەڕی یەکتریان دەکرد. لەم بەینەدا هیکتۆر دەستی گەیاندە پێشی کەشتییەکی زۆر جوان، تیژڕۆ لە ئاوی دەریادا، ئەو کەشتییەی کە "پروتیسیلاوس"ی هێنابوو بۆ تەروادە و جارەکی دی بۆ وڵاتەکەی خۆیی نەبردەوە.لە دەوری کەشتییەکەی ئەودا ئاخییەکان و تەروادەییەکان لە شەڕێکی دەستە و یەخەدا کەوتنە کوشت و بڕی یەکدی، وا تێکەڵی یەکتر بوو بوون تیروکەوان و نێزەی درێژ بەکار نەدەهات، بەتەوری تیژ و، گورزی گران، شیری قورس و قەمە و سونگی دوو شاخە!.. یەکتریان هەڵدەدڕی، ژمارەیەکی زۆر لە شمشێرانی گران و جوان، بەحەمایلی ڕەش و دەسکی جەواهیر نیشان، دەکەوتنە سەر زەوی، هەندێکیان لە دەست و هەندێکیان لە شانی جەنگاوەران بەدەم شەڕەوە دەکەوتنە سەر زەوی... زەوی لە خوێندا ڕەش هەڵدەگەڕا! بەڵام هیکتۆر کە دەستی بەسەر کەشتییەکەدا گرت، ئیدی نەگەڕایەوە، بەڵکو لە پێشەکەیدا وەستا و هاواری لە تەروادەییەکان کرد و گوتی: "ئاگر بێنن و هەموو بەیەکدەنگ لە نەعرەتەی شەڕ بدەن. زیوس ئەمڕۆی بەئێمە بەخشیوە، ڕۆژێکە لەسەرووی هەموو ڕۆژەکانەوە.. لەم ڕۆژەدا ئەو کەشتیانە وێران دەکەین کە بەپێچەوانەی ویستی ئاسمانەوە بۆ ئێرە هاتوون و بەبار ئازار و بەڵایان بەهۆی ترسنۆکی ردێن سپییەکانمانەوە بۆ هێناوین، ئەو ردێن سپیانەی کە کاتێ من دەمویست لە دەوری کەشتییەکاندا بجەنگم،ڕێیان نەدەدام و نەیاندەهێشت لەشکرەکە شوێنم بکەوێ. جا ئەگەر زیوسی دووربین، ئەوسا هەندێ ئەقڵی ئێمەی گومڕا کردبوو، ئەمڕۆکە بەخۆی هانمان دەدات و ڕێنوێنیمان دەکات."

(٧٤١) ئەو قسانەی کرد و شێلگیرانە تر پەلاماری ئارگۆسییەکانی دا، بەڵام ئەجاکس ماوەیەکی زۆر لە جێیەکەی خۆی نەمایەوە. چونکە تیر وەکو باران بەسەریا دادەباری. چونکە هەمیشە سڵی لە مردن دەکردەوە، هەندێك پاشەکشەی کرد، لەسەر کەشتییەکە دوور کەوتەوە، خۆی کرد بەشوێنی سەوڵەوانەکاندا، کە حەوت پێیان بەرز بوو، لەوێدا خۆی لە بۆسەنا، لەوێوە دەیروانییە دژمن، هەر هەموو ئەو کەسانەی بەمەشخەڵەوە دەچوونە پێشێ، بەپەیکانەکەی دووری دەخستنەوە، هەروەها لە پەستاو بێ پسانەوە، هاواری دەکرد و داناییەکانی هاندەدا و دەیگوت: "براینۆ، ئەی جەنگاوەرانی دانیایی، ئەی خزمەتگوزارانی ئێریسی خواوەندی جەنگ، مەردی مەیدان بن یاران! عەزمتان جەزم بکەن. ئایا لاتان وایە کە هێزێن پشتیوانتان لە پشت بێ، یان دیوارێکی لەمە قایمتر جەنگاوەرەکانتان بپارێزێ؟... نە شارێکی بەبورج و قەڵامان لێوە نزیکە کە پەنای بۆ بەرین تا لەوێندەرەوە هێزێکی تازە بێنین، کە تای تەرازووی شەڕەکەمان بۆ قورس بکات... ئێمە واین لە دەشتێکا، پێشمان تەروادەییانی سەراپا چەکدار و زرێپۆشە و پشتمان دەریایە، و دوورین لە وڵاتی خۆمان، ڕزگاری و سەلامەتیمان لەشەڕدایە، نەك لە سستی و خۆ دزینەوە."

(٧٤٢) ئەو قسانەی کرد و دەست بەنێزە حازر و ئامادە.. هەر تەروادەییەك کە بەمەشخەڵی ئاگرەوە بەرەو کەشتییەکان دەهات، تا دڵی هیکتۆر خۆش بکات، ئەجاکس بەڕمەکەیەوە لێی دەهاتە دەست و یا ڕاوی دەنا یان برینداری دەکرد. بەو جۆرە دوانزە کەسی لە شەڕێکی دەستەو یەخەدا، لە بەردەم کەشتییەکاندا بریندار کرد!.

# سروودی شانزەیەم

## کوژرانی پـتروکلوس

**حیکایەتەکە:**

**تەروادەییەکان توانیان گریکەکان بشکێنن. شەڕ گەییە بەر کەشتییەکەی پاتروکلۆس. پاتروکلۆس کە ئەمەی بینی بەهەڵەداوان چوو بۆلای ئەخیل و بویەرەکەی بۆ گێڕایەوە. بۆی ڕوونکردەوە کە چۆن کەشتییەکان لەبەر هەڕەشەی ئاگردان، هەموومان لێرە گۆڕ غەریب و دوور لە وڵاتی خۆ دەمرین. داوای لە ئەخیل کرد کە سپەر وکڵاوخودو هەموو ئەسلەحەکەی خۆی بداتێ، تا ئەگەر تەروادەییەکان دیتیان وابزانن ئەخیلە و بترسن و هەڵێن.ئەخیل بەپێشنیازی هاوڕێکەی قایل دەبێت. نوێژە بادانە بۆ خواوەندەکان دەکات. بەجامێك کە لە باوڵەکەی خۆیدا شاردبویەوە و جگە لە ئەخیل خۆی کەسی دی نەدەستی تێوەدابوو و نەپێی خواردبووەوە. دوای ئەوەی نوێژەکەی کرد جامەکەی خستەوە جێی خۆی. پاتروکلۆس خۆی بەمەیدانی شەڕەکەدا دەکات و تاڵاو بەتەروادەییەکان دەنۆشێت. ئەو تەروادەییانەی خەریك بوو کەشتییەکان بسوتێنن، تەنانەت کەشتییەکیانیش سووتاند.ئەگەر پاتروکلۆس نەبوایە کارەسات ڕوویدەدا. ئەو پاتروکلۆسەی کە بەڕاست و بەچەپا کوژراو و برینداری لە تەروادەییەکان دەخست و ئۆتومیدونی میرئاخوری لەگەڵ بوو، ئۆتومیدون سایەقی عەرەبانە و ئەسپە خۆشبەزە تایبەتییەکانی ئەخیل بوو. بەڵام پاڵەوانێکی تەروادەیی دێتە مەیدانی پاتروکلۆس، ئەو پاڵەوانە ناوی گلوکوس بوو و کوڕی زیوس بوو. زیوس دەیەوێ خۆی تێکەڵ بکات و کوڕەکەی ڕزگار بکات. بەڵام هیرا لە ئاکامی مەترسییەکانی ئەم کارەی ئاگادار دەکاتەوە. چونکە ئەمە پێچەوانەی ئەو قەدەر و چارەنووسەیە کە مەرگی لە چارەی کوڕەکەی نووسیوە. جا لەم حاڵەدا نەدەتوانێ ئەو چارەنووسە ڕەت بکاتەوە و نەدەتوانێ ڕێ لە خواوەندەکانی دیکەش بگرێ کە کوڕەکانیان لەشەڕ بپارێزن و بخەلەسێنن، چونکە چاو لەو دەکەن. ئیدی دەستبەرداری ئەو کارە بوو و هەر لەوەندەیا**

وەستا کە ئەپولۆی نارد تا لەدوای مردن جەنازەی کورەکەی بۆ وڵات و زێدی خۆی بەرێتەوە. برا و کەسوکار و هاورێکانی بیدێنن و رێورەسمی پرسەی بۆ ئەنجامبدەن. ئیدی پاتروکلۆس لەسەر کوشتاری بێ وێنەی خۆی بەردەوام دەبێت. تەروادییەکان لە کەشتییەکانەوە بەرەو دەشتەکە راودەنێت، بەڵام بەپێچەوانەی ئامۆژگارییەکەی ئەخیلەوە، لەوێوە ناگەرێتەوە، هەر دەرواتە، ئەگەر ئەپولۆ رێی لێنەگرتبا لەوە بوو لە حەساری تەروادەش ئاودیوبێ. ئیدی لێرەوە پاتروکلۆس ساردەبێتەوە، تا دەکوژرێ. بەر لەدوا هەناسە بە هیکتۆر دەڵێت کە بەمردنی ئەم شاد نەبێت. چونکە بەخۆیشی لەلای حەسارەکانی تەروادە و بەدەستی ئەخیل دەکوژرێ. ئەخیل زۆر خەمین دەبێت و گلەیی لە پاتروکلۆس دەکات کە پێشبینییەکەی پێ گوتووە و دڵی خۆی بەوە دەداتەوە کە لەوەیە ئەخیل یەکەمجار جەزرەبەی هیکتۆر بخوات و بەمەش بەر لە هەمووان بچێ بۆ جیهانی ژێرین. (هادیس).

زەمەن:

رۆژی بیست و هەشتەمینی گێرانەوە هۆمەرییەکەیە.

شوێن:

ئەم سرووده سێ شوێنی تیایە، ئیدای کۆسار، کەناری دەریا کە شەرەکە لەوێندەرە و لە دەوروبەری کەشتییەکانە، شوێنێکی دیکەش کە سەر حەسارەکەیە و ئەپولۆ لەوێ دەوەستێ.

(١) بەو جۆرە لە دەوری ئەو کەشتییە مکومەدا جەنگاوەران شەڕیان دەکرد. پاترۆکلۆس بەدەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە چووە نك ئەخیلی سەرداری جەنگاوەران. فرمێسك بەجۆرێ لە چاوانی دەڕژا، لە تۆ وایە کانییەکی لێڵە و لە تاشە بەردێکی بەرز و دیوار ئاساوە دەڕژێتە خوارێ. کە ئەخیلی گورج و گۆڵ بەو شێوەیەی بینی دڵی پێی سووتاو بەپەرۆشەوە پێی گوت: "ئەی پاترۆکلۆس بۆچی دەگریت، دەڵێی کچێکی منداڵیت و بەدووی دایکیا غار دەدات و دەیەوێت لە باوەشی بگرێت و چنگ لە داوێنی گیر دەکات و لە ڕۆیینی دەکات و بەدوو چاوی بەفرمێسکەوە بۆی دەڕوانێ تا لە هەمێزی بگرێت. تۆ وەکو ئەو کیژە ڕوندك دەڕێژی ئەی پاتروکلوس... هیچ خەبەرێکت پێیە بە(مورمیدون)ەکانی بڵێی یان بەمنی بڵێی؟ ئایا هەواڵێکی (پتیا)ت لایە کە هەر تۆ بیزانی؟.. ئەوەی من بیزانم مینوتیوسی کوڕی ئەکتور هێشتا زندووە، بیلیوسی کوڕی ئەیاکوس زرك و زندوو لەنێو مورمیدونەکاندا دەسوڕێتەوە. خۆ ئەگەر ئەو دووانە مردبان، زۆرمان خەفەت بۆ دەخواردن. یان تۆ خەمباری ئارگوسییەکانی کە چۆن لە پاڵ کەشتییە ناو بەتاڵەکانیاندا بەهۆی بێ شەرت و پەیمانی خۆیانەوە دەکوژرین؟.. ڕاستیم پێ بێ و هیچم لێ مەشارەوە، تا هەردووکمان ئاگاداری وەزع و حاڵەکان بین".

(٢٠) پاتروکلۆسی سوارچاك هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و وەڵامی دایەوە: "ئەی ئەخیل، ئەی کوڕی بیلیوس، ئەی سەرکردەی هەرە دیاری ئاخییان، لێم تورە مەبە، نەگبەتی ئاخییان نەگبەتییە نەك گاڵتە، هەر هەموو ئەوانەی قارەمان بوون، ئێستا لەناو کەشتییەکاندا کەوتوون و بریندارن، هەیانە لە دوورەوە ئەنگێوراون، هەیانە لە نزیکەوە. دیومیدسی کوڕی تیدیوس بەپەیکان بریندار بووە، ئودیسیوسی ناودار بەڕمبازی و ئاگامەمنون بەشمشێر بریندار بوون.

(٢٧) هەروەها (یوریبیلوس) ڕانی بریندارە و تیری پێکەوتووە. هەموو دکتۆر و حەکیمە شارەزاکان لە دەوریان خڕبوونەتەوە و سەرگەرمی تیمارکردنیانن و هەتوان لە زامەکانیان دەنەن. کەچی تۆ، ئەی ئاخیل هەر مێشیش میوانت نییە و بەخەیاڵتدا نایەت. ئومێدەوارم هەرگیز دووچاری ئەم ڕق و کینەیە نەبم کە لە دڵی تۆدایە، جا ئەگەر تۆ ئەمڕۆکە فریای ئارگۆسییەکان نەکەوی و لەم بەڵایەیان ڕزگار نەکەی، کێ دەتوانێ بەخۆی بنازێ و داوای یارمەتیت لێ بکات؟ نەوەکانی داهاتوو چۆنت باس بکەن؟ ئەی دڵڕەق، نا، نە بیلیوسی شۆڕەسوار بابتە و نە تیتیس داکتە، ئوقیانوسی تاریك و تاوێرانی سەخت تۆیان هێناوەتە

دنیا. بۆیە ئەوەندە دڵڕەقیت و ژێوان بوونەوە نازانی. جا ئەگەر خۆت لە پێشبینییەکی تایبەتی دەدزییەوە، یان ئەگەر دایکە هێژاکەت لەزاری (زیوس)ەوە پێشگویی یان ڕازێکی پێ گوتوویت، بەلای کەمەوە لەشکری (مرمیدون)ەکانم بەگەڵ بخە، با بچم بۆ شەڕەکە، بەڵکو ئەمە ڕێکەوتە بتوانم ببم بەمەشخەڵی ڕزگاری داناییەکان. هەروەها ڕێگەم بدە کە سپەر و چەك و ئەسلەحەکەی تۆ لەبەر بکەم، بەڵکو تەروادەییەکان بەتۆم بزانن و بترسن و پاشەکشە بکەن و کوڕانی ئاخیایی ئاهێکیان تێبگەڕێ و هەناسەیەك بدەن. چونکە ئێستا ماندوون و شەڕ بڕستی لێ بڕیون. جا هەنگێ ئێمەی تازە نەفەس، دەتوانین بەهاسانی بەگژیاندا، بەگژ جەنگاوەرە ماندووە تەروادەییەکاندا بچین و بەشەڕ لە کەشتی و خێوەتەکانمان دووریان بخەینەوە و بەرەو شار ڕاویان بنەین".

(٤٦) پاتروکلۆس بەو شێوەیە لەبەر ئەخیل پاڕایەوە. غافڵ بوو لەوەی بۆ مەرگی خۆی دەپاڕایەوە و دێوی مەرگ بەرەو خۆی بکێشی دەکرد. ئەخیلی گورج و گۆڵ لەناخی خۆیدا هەژا، وەڵامی دایەوە و گوتی: "مەخابن! ئەی پاتروکلۆس، ئەی نەوە و نەتیرەی زیوس، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ من باکم بەهیچ پێشگۆییەك نییە، دایکیشم لە زاری زیوسەوە هیچ ڕازێکی پێ نەگوتوم. بەڵام من خەمبار و پەستی ئەوەم کە لەناو لەشکرەکەی خۆمدا، کەسێك بێت خەڵاتەکەم لێ زەوت بکات، چونکە لەمن بەهێزترە، ئەمە زۆرم ئەزیەت دەدات، مەگەر هەر خۆم بزانم لەناخی دڵمدا چەند بەمەوە تلاومەتەوە. ئەو کیژەی ئاخییەکان وەکو پاداشت بۆیان هەڵبژاردم.. ئەو کیژەی من دوای وێران کردنی شارێکی مکوم و قایم و پڕ جەنگاوەر، بەزەبری نێزەکەی خۆم بەدەستم خستبوو، شا ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوسی بەتوانا، سووك و باریك لە دەستی دەرهێنام وەکو ئەوەی لە غوڵامێکی زەبوون و غەوارەی زەوت بکات. بەهەرحاڵ ئەوەی چوو چوو، ڕق و کینەش هەتا سەر لە دڵی مرۆڤدا نامێنێ. هەرچەندە من گوتومە تا شەڕ و نەعرەتەی شەڕ و کوشتار یەخەم پێ نەگرێ و نەگاتە سەر کەشتییەکانی خۆم دڵم چاك نابێتەوە. بەڵام قەیدی نییە تۆ وەرە چەك و ئەسلەحەکانی من لە شان بکە و ڕابەڕایەتی مرمیدونە تامەزرۆکانی شەڕ بکە. ئەگەر ڕاستە و هەوری ڕەشی ئاپۆڕەی تەروادەییەکان دەوری کەشتیەکانیان داوین،

(٦٧) و ئارگۆسییەکان بۆ کەناری دەریا پاشەکشەیان کردووە و تەنیا تیلماسکە زەوییەکیان بەدەستەوە ماوە. هەموو شاری تەروادەیان لێ هاوڕوژاوە و هاتۆتە دەست..

ئەوالەبەرئەوەیە کە لە نزیکەوە پرشنگی کێوخودەکەی من نابینن!... ئەگەرشا ئاگامەمنون قەدری منی گرتبا و دووربینانە مامەڵەی لە تەکما کردبا، کارێکم دەکرد تەروادەییەکان چنگ لەسەر شان هەڵێن و دۆڵ و جۆیبارەکان پڕ بوایەن لە لاشەی کوژراوەکانیان. بەڵام ئێستا کە شێری مەیدان و سەروەری شەرگەن، و دەوری هێزەکەی ئێمەیان گرتووە، لەبەرئەوەیە کە نێزە لە دەستی (دیومیدسی کوڕی تیودیوس)دا هەڵناسوڕێ تا بەرگری لە ئاخییەکان بکات، من تا ئێستا گوێم لێ نەبووە، تاقە هورا و نەعرەتەیەکی شەڕ لە زاری ناپەسندی کوڕی ئوتریوسەوە بێتە دەرێ!... ئەوەی لە دەوروبەری مندا دەنگ دەداتەوە، تەنیا هورا و نەعرەتەی هیکتۆری کوشتۆخە کە فەرمان بەتەروادەییەکان دەدات و ئەوانیش بەیەك دەنگ نەعرەتەکەی بۆ دەسەننەوە، دەشت و دەریان پڕکردوە و دوای ئاخییان دەبڕنەوە. وێڕای ئەمەش ئەی پاتروکلۆس، مەردانە هەڵمەت بەرە، پەلامار بدە و کەشتییەکان ڕزگار بکە، دەنا تەروادەییەکان دەیان سوتێنن و ڕێگەی گەڕانەوەی دڵخواز لە ئارگوسییەکان دەبڕن. جا گوێ بگرە بادوا ئامۆژگاری خۆمت بخەمە مێشکەوە، ئەگەر دەتەوێ سەرفرازی و سەرکەوتنێکی گەورە بۆ هەموو خەڵکی ئاخیایی بەدەست بێنم و ئەو نازدارەم لەگەڵ کۆمەڵێك پاداشت و دیاریی زیادەدا بۆ بگەڕێننەوە، هەر کە تەروادەییەکانت لە کەشتییەکان دوورخستەوە، یەکسەر بگەڕێوە. ئەگەر مێردە بروسکە دەنگەکەی هیراش پشتیوانی کردیت، بەبێ من و لە دووی من شەڕی تەروادەییانی شەڕڤان بکەی، چونکە بەمە زیان بەفەڕ و شکۆی من دەگەیەنی، نەخەڵەتابی بەدەم نەشئەی شەڕ و کوشتار و سەربڕینی تەروادەییانەوە بەرەو تەروادە بچی، چونکە دوور نییە یەکێك لە خواوەندانی نەمر لە لوتکەی ئولیمبوسەوە بۆت دابەزێ —بەتایبەتی ئەپولۆ کە تەروادەییەکانی زۆر خۆشدەوێ. بەڵکو هەر کە کەشتییەکانت ڕزگار کرد ئیدی لەوێندەرەوە بگەڕێوە و شەڕەکە بۆ هەردوو لەشکرەکە بەجێ بێڵە با لەو دەشتەدا دوای یەکتر ببڕنەوە. ئاە، ئەی زیوس، ئەتینا، ئەپولۆ، ئومێدم بەقاپی ئێوەیە کە تاقە کەسێك لە تەروادەییەکانی ئەوێ بەسەلامەتی دەرنەچێ.. قڕ بکەوێتە ئارگۆسییەکان، تەنیا ئێمە هەردووکمان ڕزگار بین و بتوانین تارای پیرۆزی سەر سەری تەواردە لابەرین!

(١٠١) ئەو قسانەیان لەگەڵ یەکتردا کرد. بەڵام ئەجاکس زۆری بۆ هاتبوو، لە هەموو لایەکەوە تیری بۆ دەهات.. ویستی زیوس بەسەریا زاڵ بوو. تەروادەییەکانیش کە لەسەرکەوتنا

بوون بەنگەتاویان کردبوو. هەر نێزە بوو تەقەی لە کڵوخودە بریقەدارەکەی هەڵدەستان و دەنگی دەدایەوە. شانی چەپی لەژێر باری قورسی سپەرە بریقەدارەکەیدا، کە بەردەوام دەیجولاند، شل و کول بوو. وێڕای ئەمەش تەروادەییەکان بەهەموو گوشارێکیانەوە، نەیاندەتوانی بەباراندنی تیر بەسەریا، بۆڕێ پێ بدەن و.. ئیدی شەکەت و ماندوو بەحاڵ هەناسەی بۆ دەدرا، ئازای لەشی لە ئارەقەدا هەڵکشابوو، هەموو دەلیڤەیەکی لێ گیرا بوو، و ژیانی لە خەتەرێکی گەورەدا بوو.

(١١٢) ئێستا، ئەی یەزادنخانمانی هونەر، خواوەندانی شیعر، ئەی ئەوانەیماڵتان لەسەر ئولیمبوسە، پێم بێژن چۆن ئاگر بەربووە کەشتی ئاخییەکان.. هیکتۆر خۆی گەیاندە نزیکی ئەجاکس و بەشمشێرە گەورەکەی، دانەیەکی کێشا بەنێزە بناوییەکەی ئەجاکسدا و ڕێك سەرەکەی پەڕاند و هەنگێ ئەجاکس بەبێهودە نێزەکەی بادەدا، چونکە پەیکانە برونزییەکەی پەڕی بوو و بەتەق و هوڕ لەو ناوە غل دەبووەوە. هەنگێ ئەجاکس ڕاجفری و لە دڵی خۆیدا زانی کە زیوس دەستی بەرداری بووە و هیچی بەدەستەوە نەهێشت کە بەرگری لەخۆی پێبکات، و لێبڕاوە سەرکەوتن و سەرفرازی بەتەروادەییەکان ببەخشێت. بۆیە پاشەکشەی کرد و خۆی لە هەتەری نێزان دوورخستەوە. هەنگێ تەروادەییەکان ئاگریان لە کەشتییەکە بەردا و گڕ و بڵێسەیەکی وای لێ هەستا کە لە دامرکانەوە نەدەهات.

(١٢٤) ئەخیل کە بڵێسەی ئاگری بینی کێشای بەڕانی خۆیدا و بەپاترۆکلۆسی گوت: "ڕابە ئەی شۆڕەسواری پاکزاد، ڕابە ئەی نەوە و نەتیرەی زیوس، سەیرە من گڕی ئاگرێکی بێ ئامان لەلای کەشتییەکانەوە دەبینم.. هەر خوا بکا دەست بەسەر کەشتییەکانماندا نەگرن، دەنا هیچمان نابێ پێی بگەڕێینەوە! بەپەلە چەك و ئەسلەحەکەی من لە خۆت بدە تا من لەشکری (مرمیدون)انت بۆ خڕ دەکەمەوە."

(١٣١) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، جلکی برۆنزی بریقەداری پۆشی، هەوەڵجار لاقبەندە جوانەکانی لە لاق کرد و بەئاوزوونەی زیوین لە پاژنەیەوە بەستنی. ئەوجا زرێیە بریقەدارە بەنەخش و نیگار و گران بەها و پڕ ئەسێرەکەی نەوەی ئیکۆسی لەبەرکرد. ئەوجا شمشێرە بونزییە زیوکفتەکەی لە شان کرد، سپەرە پان و گەورەکەی هەڵگرت، کڵوخودەکەی لەسەرنا، کڵوخودەکەی یەجگار وەستایانە دروستکرا بوو، بەیاڵی ئەسپ ڕازێنرابووەوە، یاڵە ئەسپەکە لە دوورەوە بەشێوەیەکی ترسناك دەجولا. جووتێ ڕمی

خوسدەستی هەڵگرت، بەڵام نێزە گران و درێژ و قایمەکەی ئەخیلی هەڵنەگرت، (١٤١) چونکە لەناو ئاخییەکان کەس نەیدەتوانی بەکاری بێنێ، جگە لە ئەخیل کە زۆر جوانی بەکاردێنا. ئەم نێزەیە لە داری بناو بوو، خیرون لە لوتکەیەکی چیای بیلیون بڕی بووی و دابووی بەبیلیوس تا لە ئایندەدا ناودارترین جەنگاوەران لەناوبەرێ. پاترۆکلۆس، فەرمانی بەئوتومیدون کرد کە بەپەلە نێر لە ئەسپەکان بکات و لە عەرەبانەکەیان ببەستێ. ئوتومیدون، جەنگاوەرێك بوو کە پاتروکلوس لەدوای ئەخیلی سەفدرِ لە گشت کەسێکی خۆشتر دەویستو لە شەڕدا لە هەموو کەس پتر وەفاداری پاتروکلوس بوو، لە هەموو کەس زووتر فەرمانەکانی جێبەجێ دەکرد و بەدەنگییەوە دەچوو. ئوتومیدون هەردوو ئەسپەکەی، (ئیکسانتوس و پالیوس)ی خستنە ژێر نیر، ئەم ئەسپانە لە ڕۆیشتندا وەکو با وابوون، ئەم ئەسپانە زادەی جووت بوونی پودارج و خواوەندی بای ڕۆژئاوا بوون، لەو دەمەدا کە پودارج لە میرگوزارێکدا لە کەناری ئۆقیانوسدا دەلەوەڕا، لەگەڵ بای ڕۆژئاوادا (زفیر) جووت دەبێ و بەو ئەسپانە ئاوس دەبێت. ئوتومیدون (پیداسوس)ی بەناوبانگیشی زین کرد و لە عەرەبانەکەی بەست، ئەم ئەسپە ئەخیلی کە شاری ئیتونی وێران و تاڵان کرد بوو لەوێوە لەگەڵ خۆی هێنابووی، هەرچەند ئەم ئەسپە، ئەسپێکی دنیایی ئاسایی بوو، بەڵام هاوتای ئەسپانی ئاسمانی نەژاد و خوایی دەکردەوە!

(١٥٥) بەهەرحاڵ ئەخیل بەخۆی بەناو خێوەتەکان کەوت، و فەرمانی بەهێزی مەرمیدونەکان دا کە جلکی شەڕ لەبەر بکەن و بۆ جەنگ تەیار بن. ئەوانیش وەکو چۆن گەلەگورگێکی دڕندە، لە چیایەکدا کەڵە کێوییەکی شاخ گەورە ڕاو دەکەن و هەڵیدەدڕن و سەری تێ دەژنن و، دەمیان لە خوێنا سور دەبێت، ئەوجا بەکۆمەڵ و بەدەم لستنەوەی زمانە درێژەکانیانەوە بەرەو سەرچاوەو کانییەکی مەنگ دادەگەڕێن، زاریان لە ئاوەکە وەردەدەن و بەدەم قرقێنەی خوێنەوە تێر و بێ باك، دەمیان پاك دەکەنەوە. بەو ئاوایە ڕابەران و دەم سپیان و ڕاوێژکارانی مورمیدون، بەپەلە لەدەوری یاوەرە ئازاکەی ئەخیلی گورج و گۆڵ و زادەی ئیکوس خڕ دەبوونەوە. ئەخیلی نەبەزیش لە ناوەندیاندا وەستا بوو و هەم ئەسپەکان و هەم جەنگاوەرە سپەر بەدەستەکانی هاندەدا.

(١٦٨) ئەخیلی خۆشەویستی زیوس بەخۆ و هێزێکی پەنجا کەشتییەوە بەرەو تەروادە هاتبوو. هەر کەشتییەك پەنجا جەنگاوەری بەسەرەوە بوو، پێنج فەرماندەش، لەوانەی کە ئەخیل متمانەی تەواوی پێیان هەبوو و پشتی پێیان ئەستور بوو دانران کە ڕابەرایەتیان

بخەن. بەخۆیشی کە لە هەمووان بەهێز و تواناتر بوو سەرپەرشتی و سەرکردایەتی هەموانی دەکرد. دەستەی یەکەم لەژێر فەرماندەی (مینیستیوس)ی زرێ درەخشاندا بوو، ئەمە کوڕی سپێرکیوس بوو، کە ڕوبارێك بوو لە ئاسمانەوە هەڵدەقوڵا.. پولیدورای نازەنین، کیژی بیلیوس، لەگەڵ سپێرکوسدا کە ڕوبارێکی زادەی زیوس بوو، جووت بوو بوو، و ئەم کوڕەی بوو بوو. واتە پولیدورا لەگەڵ خواوەندێکدا جووت بوو بوو. بەڵام پیاوێك بەناوی (بوروس)ی کوڕی (پێریریس) هات و بەزەبری سەروەت و سامانی زۆر دایکی خواست و ئیدی سپێرکیوس وەکو کوڕی (بوروس) ناسرا.

(١٧٨) (یودوروس)ی قارەمان ڕابەری دەستەی دووەم بوو. ئەمە کوڕی کیژێکی بێ شوو بوو، کوڕی (پولیمل)ی کچی فیلاس بوو، پولیمل ئافرەتێکی زۆر خەرامان و سەماکارێکی داهێنەر بوو، هرمسی بەتوانا و ناودار بەچاوی خۆی لەو ئاهەنگەدا کە کۆری ژنانی گۆرانیبێژ لەسەر شەرەفی یەزدانخانم ئارتەمیس-ی شکارچی ئازا و زێڕین کەوان دەیان گێڕا، دیتبووی و دڵبەندی بوو بوو. ئیدی هێرمیسی چاکەکار، خۆی بەنهۆمی سەرەوەدا، بەنهۆمی ژناندا کردبوو، و بەدزییەوە لەگەڵی جووت بوو بوو و بە (یودوروس) ئاوسی کردبوو. هەمان ئەم (یودوروس)ە کە لە گورج و گۆڵیدا بێ وێنە و لەشەڕدا دلێر و ئازا بوو. کاتێ کە (ئیلیتیا)ی خواوەندی مامانی ژنان، (یودوروس)ی زایاندبوو و هێنابوویە دنیای ڕۆشنەوە و ساوای تاین تیشکی هەتاوی بینی، ئەخیلیکسی کوڕی ئەکتوری دلاوەر دایکی خواست واتە (پولیمل)ی خواست. هەڵبەتە دوای ئەوەی دیاریی و مارەییەکی بێ شوماری دایە. بەڵام باوکی پولیمل، واتە فیلاسی پیر (یودوروس)ی گرتە ژێر باڵی خۆی، وەکو کوڕێکی ڕاستەقینەی خۆی پەروەردەی دەکرد و خۆشی دەویست. پیساندروس)ی کوڕی میمالوس، باشترین ڕمبازی نێو مرمیدونەکان، لەدوای پاتروکلوسی دۆستی گیانی بەگیانی ئەخیل، سەرکردە و فەرماندەی دەستەی سێیەم بوو. (پیرە فینیکس)ی شۆڕەسوار فەرماندەی دەستەی چوارەم بوو. و ئەلکیمیدون)ی کوڕی لیرسیوس فەرماندەی دەستەی پێنجەم بوو.

(١٩٨) ئەخیل پاش ئەوەی هەموو جەنگاوەرەکانی تەیار کرد و ڕابەر و سەرکردەی بۆ هەر دەستەیەك دیاریی کرد و دەستەکانی دەست نیشان کرد، هەنگێ هەموویانی کۆکردەوە و ڕووی تێکردن و گوتی: "ئەی (میرمیدون)ەکان من ئەمرتان پێدەکەم، ئەوەتان لەبیر نەچێت بەدرێژایی توڕەبوونەکەی من، چۆن لەناو کەشتییەکانەوە هەڕەشەتان لە

تەرواددەییەکان دەکرد، هەموو هەر گازاندەتان لەمن دەکرد، دەتانگوت، ئەی زاڵم خۆت کوڕی بیلیوس، بێگومان دایکت بەڕق و کینە پەروەردەی کردویت، بۆیە هێندە دڵرەقی، تۆ هاوڕێکانت بەتۆبزی و بێ ویستی خۆیان لەناو ئەم کەشتییانەدا بەستوەتەوە. تۆ کە ئەوەندە دڵرەق و کینە لەدڵ بی، وەکو لە کەشتییەکانماندا دانیشتووین خۆ بۆ وڵاتی خۆمان بگەڕێینەوە باشترە.. هەمیشە کە خڕدەبوونەوە بەو شێوەیە لۆمەتان دەکردم. جا ئێستا کاتی ئەوە هاتووە، خۆ بنوێنن، شەڕێکی گەورەتان لەبەردەمە، شەڕێك کە تا ئێستا بەعەزرەتییەوە بوون و تامەزرۆی بوون، جا کێ پیاوی مەیدانە با مەردانە شەڕی تەروادەییەکان بکات، ئەوە عەرز و ئەوە گەز".

(٢١٠) هەر کە ئەو قسانەی کرد، هەموو جەنگاوەرەکان جۆش و خرۆشیان تێکەوت. کە گوێیان لە دەنگی پاشاکەیان بوون دەستەکان زیاتر یەکیان گرت و دایانە پاڵ یەکدی. وەکو چۆن بەنایەك وەستایانە چینە بەرد لە پاڵ یەکتردا لەسەر یەك دادەنێ و دیوارێکی بەرز بۆماڵێك دروست دەکات تا لە بای بپارێزێ، بەو ئاوایە سپەر و کێوخودی مرمیدونەکان یەکیان گرت، سپەر لە سپەر دەخشی و کێوخود لە کێوخود و جەنگاوەر لە جەنگاوەر، گوڵینگەی سەر کێوخودە بریقەدارەکانیان کە سەریان دەجوڵاند، لە یەکتری دەدا.

(٢١٨) بەو شێوەیە هەموو تەیار و ئامادەبوون، پاتروکلوس و ئوتومیدون لە پێشی هەمووانەوە، چەك و ئەسلەحەیان لە خۆ دەدا و لێبڕابوون ڕابەرایەتی مرمیدونەکان بکەن. لێ ئەخیل چوو بۆ ناو خێوەتەکەی خۆی، سەری باوڵێکی یەجگار جوانی بەنەخش و نیگار و جەواهێرنیشانی هەڵدایەوە، کە (تیتیس) زیوین لاق دوای ئەوەی پڕی کردبوو لە جلوبەرگ و شانێلان و نوێنی ئەستوری نایاب تا لەسەرمای بپارێزێ، دابویە. ئەم باوڵە جامێکی تیابوو یەجگار جوان بوو، ئەم جامە کەس بادەی ئاگرینی ڕەونەقداری پێ نەخواردبووەوە، ئەویش ئامادە نەبوو لەم جامەدا بادە پێشکەش بەهیچ کەس و تەنانەت هیچ خواوەندێکیش بکات تەنیا زیوسی بابی نەبێ. جامەکەی لەم باوڵە دەرهێنا، هەوەڵجار بەگۆگرد پاکی کردەوە و ئەوجا بەئاوی پاك شۆردی، دوای ئەوەی دەستەکانی شت پڕی کرد لە بادەی ئاگرین ڕەنگ. ئەوجا هاتە ناوەندی هۆڵەکە و کەوتە نزاکردن و پاڕانەوە، ئەوجا بادەکەی بەڕەسمی ئایینی پرژاندە سەر زەوی و ڕوانیە ئاسمان، پاڕانەوە و بادە پرژێنییەکەی لە چاوانی زیوسی بروسکەوان پەنهان نەبوو، ئەوجا گوتی: "ئەی شا زیوس، ئەی سەروەری دودونا، خواوەندی بیلاسیجی، ئەی ئەو کەسەی لە دووری دوور دەژیت، ئەی ئەو کەسەی

لە دوندی سەهۆڵبەندانا دەتپەرستن، و لەوێوە ئیلهام بەلێزانە (سیلییەکانت) دەبەخشێت، ئەوانەی کە پێیان ناشۆن و لەسەر زەوی دەنوون. جاران کە لەبەرت دەپاڕامەوە و نزام دەکرد، دوعات گیرا دەکردم، ئەوە بوو تۆڵەت سەندمەوە و کارەساتت بەسەر هێزی ئاخییەکان هێنا، ئێستاش لەبەرت دەپاڕێمەوە، ئەم نوێژ و نزایەم لێ قەبوڵ بکە. من بەخۆم لەناو ئاپۆرەی کەشتییەکان دەمێنمەوە، بەڵام هاوڕێکەم بەرابەرایەتی هێزی زۆر و زەبەندی مرمیدونەکان بۆ شەڕ و کوشتار دەنێرم: ئەی زیوس، ئەی ئەو کەسەی هەموو شتێك دەبینی ،سەرکەوتنی بەنسیب بکە. زات و جەسارەت بخە دڵییەوە، تا هیکتۆر بزانێ کە ئاخۆ میرئاخوڕ و هاوڕێکەم بەبێ من و بەتەنیا دەتوانێ شەڕ بکات، یان دەستەکانی تەنیا کاتێ دەکەونە کار کە من لە مەیدانی شەڕدا بم.. ئەوا دوای ئەوەی شەڕ و هەرای لە کەشتییەکان دوورخستەوە، بەسەلامەتی، بەخۆی و هەموو ئەسلەحەکانییەوە، لەگەڵ هەموو هاوڕێکانیا، ئەوانەی شەڕی دەستەو یەخە دەکەن، بیگەڕێنەوە بۆ ئێرە."

(٢٤٩) بەو ئاوایە پاڕایەوە، زیوسی بەردەبار و عەلیم بەهەموو شتان، گوێی لێ بوو، بەشێك لە دوعاکانی گیرا کرد، و بەشێکی ڕەفز کرد. ڕازی بووکە پاترۆکلوس شەڕەکە لە کەشتییەکان دووربخاتەوە، بەڵام ڕازی نەبوو بەسەلامەتی لەشەڕی بگەڕێنێتەوە.

(٢٥٢) کە ئەخیل لە نوێژی بادە پرژێنی بۆ زیوس بووەوە، خۆی بەخێوەتەکەیدا کرد و جامەکەی خستەوە ناو باوڵەکەی.

(٢٥٥) بەڵام خێرا لە ژوور وەدەرکەوتەوە، چونکە حەزی دەکرد ئەو شەڕە سەختەی نێوان تەروادەیی و ئاخییەکان بدینێ.

(٢٥٧) لەو کاتەدا هێزەکەی پاترۆکلۆس بەرەو مەیدان وەڕێکەوت بەو ئومێدەی تەروادەییەکان ببەزێنن. وەکو چۆن منداڵان شارە زەردەواڵەیەکی قەراخ شاڕێیەك دەهاڕوژێنن و هەر کەسێك بەو ناوەدا بڕوات پێوەی بدەن، یان ڕێبوارێك بەڕێکەوت تووڕەیان بکات، ئیدی هەر زەردەواڵەیەك بەمەبەستی بەرگری لە بێچووەکانی پەلاماری بدەن.. مرمیدونەکانیش بەهەمان شێوە، تووڕە و تامەزرۆ لە کەشتییەکانەوە بۆی دەرچوون و بانگەواز و نەعرەتەی شەڕیان دەگەییە ئاسمان.ئەوجا پاترۆکلۆس بەدەنگی بەرز هاواریکرد: "ئەی مرمیدونەکان، ئەی یاوەرانی ئەخیلی کوڕی پیلیوس، مەردی مەیدان بن، بەهەموو هێز و تواناوە شەڕ بکەن، بەڵکو دەتوانین سەرفرازی بۆ کوڕەکەی بیلیوس، بۆ ڕەشیدترین و دلێرترین پیاوی ناو ئارگوسییەکان، بۆ خۆی و بۆ جەنگاوەرەکانی

بەدەست بێنین.. تا ئاگامەمنونی لەخۆی ڕازی، کوڕی ئوتریوس بزانێ چ غەڵەتێکی کردووە کە ڕێزی دلێرترین و ڕەشیدترین ئاخیایی نەگرتووە."

(٢٧٥) هەر کە ئەو قسانەی کرد، هێزەکەی هاڕوژا و هەموو پێکەوە هێرشیان بۆ تەروادەییەکان برد. بانگەواز و هورا و نەعرەتەی ئاخییەکان بەشێوەیەکی سەیر لەناو کەشتییەکاندا دەنگی دایەوە. لێ تەروادەییەکان کوڕە دلاوەرەکەی مینویتوس و میرئاخوڕەکەیان بینی کە سەراپا لە چەك و ئەسلەحەدا دەبریقانەوە، دڵیان داخورپا و هێزەکانیان شپرزە بوون، چونکە وایان هەستکرد کە کوڕە جەربەزەکەی بیلیوس دەستبەرداری پشم و غەزەبەکەی بووە و لەگەڵ ئاگامەمنوندا ئاشتبووەتەوە، بۆیە هەر جەنگاوەر بوو ئاوڕی ئەم لاو ئەولای دەدایەوە تا ڕێگەیەك بۆ هەڵاتن بدۆزێتەوە و خۆی لە مەرگی مسۆگەر دەرباز بکات.

(٢٨٤) پاتروکلوس یەکەم کەس بوو کە نێزە درەخشانەکەی خێواندە ناوجەرگەی ئاپۆڕەی تەروادەییەکان، کە لە نزیکی کەشتییەکەی پروتیسیلاوسی دلاوەردا تێکچڕژا بوون. (بیریخمیس)ی ڕابەی شۆڕەسوارانی (بیونیان)ی پێکا، کە بیونیانەکانی لە دەڤەری ئەمیدونی کەنارەکانی ڕوباری بەرینی (ئەکسیوس)ەوە هێنابوو، نێزەکەی پاتروکلۆس شانی ڕاستی پێکا و دیواودەری کرد و هاوارێکی بەرزی لێ بەرزبووەوەو بەپشتا کەوتە سەر زەوییەکە، ئیدی پەشێوی کەوتە نێو هاوڕێ بیونیانەکانی دەوروبەری، چونکە پاتروکلوس بەکوشتنی فەرماندەکەیان کە لە شەڕڤانیدا سەرتۆپیان بوو، ترس و پەشێوی خستبووە دڵی هەموویانەوە. بەو جۆرە پاتروکلۆس لە کەشتییەکە دووری خستنەوە و توانی ئەو ئاگرەی گەیی بووە نیوەی کەشتییەکە، دامرکێنێتەوە. تەروادەییەکان بەدەم هەرا و زەنایەکی سەیرەوە پاشەکشەیان کرد، داناییەکان لەنێو کەشتییەکانەوە بەدەم نەعرەتە و هوراکێشانی بەردەوامەوە بۆیان دەرچوون. وەکو چۆن زیوسی هەورەوان و خێوی بروسکان، گەواڵە هەورێکی چڕ و توند لە لوتکەی چیایەکی بەرز ڕادەماڵێ و دەیبا بۆ دوور، یەکسەر هەموو چیاکان و بەندەن و دۆڵەکان دەردەکەون و ئاسمان ڕوناك دەبێتەوە.. ئاخییەکانیش بەهەمان شێوە کاتێ کە ئاگری وێرانکەریان لە کەشتییەکان دوورخستەوە کەمێك ڕوناکی کەوتە دڵیان و ئاسودە بوون. بەڵام تین و تاوی شەڕ هێشتا هەر لە ئارادا بوو، چونکە تەروادەییەکان بەتەواوەتی مەیدانیان چۆڵ نەکردبوو و گوشاری ئاخییەکان بەتەواوەتی لە کەشتییەکانی دوور نەخستبوونەوە. هەر پگیرییان دەکرد و

مەگەر بەزەبری شەڕ و کوشتار لە کەشتییەکان دوور بخرابانەوە.

(٣٠٦) ئیدی شەڕ تەشەنەی کرد، هەر فەرماندە بوو لە دووی دەرفەت دەگەڕا و جەنگاوەر و فەرماندەیەکی دەکوشت. هەوەڵجار کوڕە دلێرەکەی مینویتیوس، (ئەریلیکۆس)ی بەدی کرد کە دەسوڕایەوە تا هەڵبێت، ڕێك لەو کاتەدا نێزەیەکی سرەواندێ و ئەستوراییی ڕانی پێکا و ئێسکەکەی شکا و بەدەما کەوتە سەر زەوی. مینیلاوسی نەبەز، کەلێنێکی بچوکی لە زرێکەی (تواس)دا بەدی کرد و نێزەیەکی خێواندێ و یەکسەر کوشتی. لە کاتێکا کوڕەکەی فولیوس چاودێری ئەمفیکلوسی دەکرد، کە پەلاماری ئەوی دەدا، بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە لە خەنیمەکەی تەڕ دەست ترە، نێزەیەکی سرەواندە ئەستوراییی ڕانی، نووکی نێزەکە هەر هەموو دەمار و ماسولکەکانی جنی و پەردەی تاریکی بەسەر چاوەکانیا دادرایەوە.

(٣١٦) بەڵام کوڕانی نەستور! کە یەکێکیان ئەنتیلوخۆس بوو، پەلاماری ئەتیمنیوسی دا، بەنێزە تیژ و بڕندەکەی ورگ و ڕیخۆڵەی هەڵدڕی و بەدەما کەوت. بەڵام ماریس، کە لەو نزیکانە بوو، ویستی تۆڵەی براکەی بکاتەوە، بەڕمەکەیەوە هێرشی بردە سەر ئەنتیلوخۆس، و بەدیار جەنازەی براکەیەوە وەستا، بەڵام تراسییمیدسی خواوەند ئاسا، زۆر لەو تەردەست تر بوو. یەکسەر و بەرلەوەی دەست لە ئەنتیلوخوس بکاتەوە، جەزرەبەیەکی گەیاندە سەرووی شانی، نووکی تیژی ڕمەکە کۆتایی باڵی هەڵدڕی و ماسولکەکانی جنی و گەییە سەر ئێسکەکەی، بەدەم هاوارەوە کەوتە سەر زەوی و چاوانی سپی بوون. بەمجۆرە ئەم جووتە هاوڕێیەی سارپیدون بەدەستی کوڕانی نەستور کوژران و هەواڵەی (ئێرێبوس)ی جیهانی ژێرین کران. ئەمانە هەردووکیان کوڕانی ئەمیسودوروس بوون، ئەو (ئەمیسودوروس)ەی کە خیمیرای ترسناکی پەروەردەکرد بوو، خیمیرا ئەو دێوە بوو کە بوو بووە مایە مەینەتی و نەگبەتی خەڵکانێکی یەجگار زۆر. ئەوجا ئەجاکسی کوڕی ئۆیلیوس، هەڵیکوتایە سەر کلیوبولوس و لە شەڕێکی دەستەویەخەدا بەزندوویەتی گرتی. هەر لەوێدا بەشمشێرێکی بڕندە لە ملی دا، سەرانسەری شمشێرەکەی خڵتانی خوێن بوو، ئیدی ڕۆژی تەواو بوو و تاریکی مەرگ چاوانی داخست.

(٣٣٥) ئەوسا بینیلوس و لوکون لەیەك کاتدا و بەنێزەکانیان پەلاماری یەکتریاندا. بەڵام نێزەکانیان سەرچوون، بۆیە سەرلەنوێ و لەیەك کاتدا بەشمشێر کەوتنە پەلاماری یەکتری. لوکون، تا توانی شمشێرەکەی کێشا بەترۆپکی کۆوخودی خەنیمەکەیدا، شمشێرەکە

خردەبڕ لە دەسکەکەیەوە شکا، بەڵام بینیلیوس ڕێك لە ملی خەنیمەکەی و لەژێر گوێیدا، ملی تەواو بڕی، تەنیا بەپارچە چەرمێکەوە بەسەرییەوە مایەوە و گیانی لەبەر بڕی. میریونیس بەپێیان دوای ئەکاماس کەوت، ڕێك لەو کاتەدا کە دەیویست سەر بکەوێتە سەر عارەبانەکەی، نێزەیەکی خێواندە شانی ڕاستی و یەکسەر لە عەرەبانەکە بەربووەوە و ژیان لە چاوانی ئاوا بوو. ئەوجا ئیدومینیوس بەنێزە دەمی (ئیریماس)ی دیواو دەرکرد، نێزەکە تا ژێر مێشکی ڕۆییشت و ئێسکە سپییەکانی ورد و خاش کرد، ددانەکانی لەق بوون و خوێن لەهەردوو چاوییەوە فیچقەی کرد، و دەم و لوتی پڕ بوو بوون لە خوێن و تەمومژی مەرگ لە چاوانی ئاڵا.

(٣٥١) بەو جۆرە هەر فەرماندەیەکی دانایی خەنیمێکی خۆی کوشت. وەکو چۆن کۆمەڵە بەرخ و کاریلەیەك بەهۆی خەمساردی شوانەوە، لە چیا و چۆڵاندالە مێگەل دادەبڕێن ولەپڕ گەلە گورگێکی دڕندە چاویان پێیان دەکەوێ و تێیان دەکەون و چونکە ناتوانن بەرگری لەخۆ بکەن بێ ترس و بیم پەلاماریان دەدەن، داناییەکانیش بەهەمان شێوە کەوتنە سەر تەروادەییەکان، کە بەجۆرێ نەترەیان بەردا بوو و ئازایەتیان بیر چوو بووەوە کە تەنیا لاقیان لە بیر مابوو.

(٣٥٨) ئەجاکسی مەزن، لە هەوڵی ئەوەدا بوو کێوخودەکەی هیکتۆر بەر نێزە برونزییەکەی بدات، بەڵام هیکتۆر وەکو جەنگاوەرێکی چەلەنگ و ئەزموونداری مەیدانی شەڕ، شانە پانەکانی بەزرێیەکی چەرمەگا داپۆشی بوو، و خشەی تیرە بلەزەکان و گڤەی سەرە نێزەکانی ئاگا لێ بوو. بەتەواوەتی ئەوەی لا ڕوون بوو کە دەرفەتی سەرکەوتن ڕوو لە کزییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێگیری دەکرد و دەیویست هاوڕێ دڵسۆزەکانی لە فەوتان ڕزگار بکات.

(٣٦٤) وەکو چۆن کاتێ زیوس بایەکی توند هەڵدەکات و هەورێکی توند لەسەر لوتکەی ئولیمپوسەوە بەرەو ئاسمان ڕادەماڵا و پەراگەندەی دەکات و دنیا ڕوناك دەبێتەوە، بەو ئاوایە تەروادەییەکانیش بەدەم هەرا و زەنا و پەشێوییەکی فرەوە لە کەشتییەکان دوور دەکەوتنەوە و هەڵدەهاتن. جارێکی دیکە، بەڵام بەسەرگەردانی و بێ سەر و بەری لە خەنەکەکە دەپەڕینەوە. بەڵام هیکتۆر کە سەراپای لە چەك و ئەسلەحەدا بوو، بەسواری عەرەبانە و ئەسپەرەهوانەکانی لە مەیدانی کوشتار دوورخرایەوە، بەناچاری لەشکری تەروادەییەکانی، کە لەبەردەم خەنەکەکەدا گیرۆدە بوو بوو، بەجێهێشت. گەلێك لە

ئەسپانی ژێر گالیسکەکان لە چاڵەکەدا مژانی گالیسکەکەیان دەشکا و عەرەبانە و خێوی عەرەبانەکان بەجێ دەمان و ئەسپەکان هەڵدەهاتن. پاتروکلوس دوای تەروادەییەکان کەوتبوو و هاواری لە داناییەکان دەکرد و هانی دەدان و تەنیا بیری لەنەهێشتنی تەروادەییەکان دەکردەوە. تەروادەییەکان پەراگەندە بوو بوون و هەموو رێگا و بانەکان پڕبوو بوو لە هات و هاواری ئەوان، تەپوتۆزی ژێر پێیان گەیی بووە بنی هەوران و دنیای تاریك کردبوو، ئەسپانی خۆشبەز و سمخڕ تا هێز لە لاقیاندا بوو غاریان دەدا و لە کەشتی و ئۆردوگاکە دوور دەکەوتنەوە بەرەو شاری ئیلیون (تەروادە) تاویان دەدا.

(٣٧٧) بەڵام پاتروکلوس بەدەم هورا و نەعرەتەکێشانەوە، کوێ قەوغابوایە و پڕ بوایە لە هەڵاتووان گالیسکەکەی بۆ ئەوێندەر تاو دەدا. هەر جەنگاوەری تەروادەیی بوون لە گالیسکەکانیانەوە بەسەرا بەردەبوونەوەو دەکەوتنە ژێر تەگەری گالیسکەکانەوە و گالیسکەکان بەتەق و هوڕسەرنگون دەبوون. بەڵام ئەوئەسپە ڕەسەن وئاسمانی نەژادانەی کە خواوەندان بەدیاریی بە (بیلیوس)یان بەخشی بوو، بەسەر خەنەکەکەدا بازیان دا و لە پێشرەوی خۆ نەکەوتن. دڵی پاتروکلۆس هانی دەدا کە دوای هیکتۆر بکەوێ و زاماری بکات. بەڵام ئەسپەرەهوانەکانی هیکتۆر بەچوار ناڵە دووریان خستبووەوە. وەکو چۆن لە ڕۆژێکی خەزانیدا، زەوی ڕەشباو دەکەوێتە ژێر گوشاری بۆران و باوە، کاتێ کە زیوس لەو بەشەرانە دەچێ بەقینا کە لە ئاپۆڕەی شارا، بەتۆبزی حوکمی چەوت وهەڵە دەدەن و لە هەموو دادوەرییەك دوور دەکەونەوە و گوێ بەتۆڵەی خواوەندان نادەن، بارانێکی سێیَو ئاسا دادەکات، هەموو ڕووبارەکان هەڵدەستن، لافاو بەبەینی گردەکاندا ڕێگەی خۆی دەکاتەوە و هەموو شتێك ڕادەماڵآ و لە چیاکانەوە بەگوڕ دەڕژێتە دەریاکانەوەو هەموو کێڵگە و دەستکەوت و ڕەنجی خەڵکی وێران دەبێ و بەفیڕۆ دەچێت.. بەو ئاوایە ئەسپانی تەروادەییەکان لەژێر گوشاردا دەیانحیلاند و هەڵدەهاتن.

(٣٩٤) پاتروکلوس، پاش ئەوەی دەستەکانی یەکەمی دانە بەر هێرش و پەلامار و تاراندنی و پەراگەندەی کردن، جارێکی دی بەرەو کەشتییەکانی ڕاپێچ کردنەوە و نەیهێشت بەکامی دڵ بگەنەوە شاری تەروادە، لە بەینی کەشتییەکان و ڕووبارەکە و حەسارە بەرزەکەدا بەگیری هێنان و بەئارەزووی خۆی کوشتاری لێدەکردن و تۆڵەی هاوڕێ زۆرە کوژراوەکانی خۆی لێ دەستاندنەوە. هەوەڵجار بەڕمە ڕەخشانەکەی یەکێکی بەسەر سنگی (پرونوس)دا، کە بەئاستەم لە سوچێکی زرێکەوە دیار بوو، کێشا، چوار

پەی سست بوو، بەسەر زەویدا ڕما و ڕمبەی لێوە هات. ئەوجا هەڵیکوتایە سەر تیستوری کوڕی ئینوپس، کە بەچیچکانەوە لەنێو گالیسکەکەی، لە ترسا خەیاڵی ڕۆیی بوو، جڵەوەکان لە دەستی بەربوون،پاتروکلوس پڕیدایە وڕمەکەی لە کاجێرەی ڕاستی چەقاند و وەکو چۆن ماسیگرێك لەسەر تاوێرە کەڤرێکی قەراخ دەریا دانیشتبێ، ماسییەکی گەورە بەداو وقولاپە ڕەخشانەکەیەوە ببێ، و بەهەموو هێزی خۆیەوە ڕایبکێشێت و بیکوتێت بەزەویدا، پاتروکلوس بەهەمان شێوە، بەنێزە ڕەخشانەکەی خۆی، تیستوری بەزاری بەشەوە لەسەر عەرەبانەکەیەوە ڕاکێشا و کوتای بەعاردیدا و بەدەما کەوت و یەکسەر ڕوحی دەرچوو.. لەو کاتەدا ئێریلاوس بەرەو ڕووی چوو. گاشەیەکی بەتەپڵی سەریدا کێشا و مێشکی پژاندە ناو کێوخودە قورسەکەی، وکەوتە سەر زەوی و مەرگ لە هەمێزی گرت. ئەوجا ڕیزی لەمانە گرت و یەك یەك کوشتنی و لە خاك و خوێنی گەوزاندن: ئێریماس و ئەمفوتێروس و ئیبالتیس و تلیبولیموس و ئیخوسی کوڕی داماستور و پیریس و ئیفوس و ئیبوس و بولیمیلوس)ی کوڕی ئەرجیاس.

(٤١٩) وەختێ سارپیدون هاوڕێکانی بینی کە بەجلی دەڵبی بێ پشتێنەوە بەدەستی پاتروکلۆسی کوڕی مینوتیوس دەکوژرێن، بەدەنگی بەرز کەوتە سەرزەنشتی لیسیانی هاوتایانی خواوەندان و گوتی: "ئەی لیسیان شەرم لەخۆ بکەن، بۆ کوێ هەڵدێن؟ خۆ بگرن، بەرگری بکەن، من بەخۆم ڕووبەڕووی ئەم پیاوە دەبمەوە تابزانم ئەم پیاوە زاڵ و سەرکەوتووە کە ژمارەیەکی زۆری لە جەنگاوەرانی دلێرمان کوشتووە و ئەو حەشرەی بەسەر تەروادەییەکاندا هێناوە کێیە!

(٤٢٦) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، یەکسەر بەچەك و ئەسلەحەکەیەوە خۆی لە عەرەبانەکەیەوە هەڵدایە خوارەوە. کە پاتروکلۆس لە بەرانبەرەوە بینی، ئەویش لە عەرەبانەکەیەوە خۆی هەڵدایە خوارێ. وەکو چۆن دالّ بەچنگ و دەنووك، بەقاوقیژ بەردەبنە یەکدی، ئەو دووانەش بەهەمان شێوە بەربوونە یەکتری.

(٤٣١) وەختێ کوڕی کرونۆس، زانا بەهەموشتان، لە ئاسمانەوە دیتنی، بەزەیی پێیاندا هاتەوە، ڕوویکردە هیرای خوشك و ژنی و گوتی: "مەخابن، قەدەر وای لە چارەی سارپیدۆنی هەرە ئازیزی دڵی من نووسیوە کە بەدەستی پاتروکلۆسی کوڕی مینویتیوس بکوژرێ! دوو دڵم لەوەی کە ئایا تا زندووە لەم شەڕەی دەرباز بکەم و بۆ لیسیای بەپیت و بەرەکەتی بنێرم، یان وازی لێ بێنم بەدەستی کوڕی مینویتیوس بکوژرێ.

(٤٤٠) هیرای هەژی وەڵامی دایەوە: "ئەی کرونۆس زادەی سامناك ئەوە چ دەڵێی؟ ئەمە یەکێکە لە بەشەران، ئەجەل و تەمەنێکی دیاریکراوی هەیە، بەتەمای لە مەرگ ڕزگاری بکەی؟.. تۆ بەکەیفی خۆت بکە، بەڵام ئێمە، خواوەندەکانی دی بەمە قاییل نابین. بەڵام من شتێکی دیکەت پێ دەڵێم و قسەکەم بخە قوڵایی دڵتەوە، تۆ ئەگەر سارپیدون بەسەلامەتی بۆماڵی خۆی بنێریتەوە، ئەوەت لە بیر بێ کە ڕەنگە خواوەندێکی دیکەش هەبێ بخوازێ کوڕە ئازیزەکەی لەم شەڕە قووسە دەرباز بکات.چونکە گەلێك لە کوڕانی خواوەندان لە دەوروبەری شاری تەروادەدا خەریکی شەڕن، تۆ بەم کارەت ڕقی گەلێك لە خواوەندەکان هەڵدەستێنی. جا تۆ ئەگەر ئەم جەنگاوەرەت لە دڵا شیرین و ئازیزە، دڵت بۆی دەیەشێت، وازی لێ بێنە بابکوژرێ، با لەم شەڕە سەختەدا و بەدەستی پاتروکلۆسی کوڕی مینویتیوس بکوژرێ، هەر کە ڕوحی دەرچوو هەنگێ هەردوو پەروەردەکاری مەرگ و خەونی شیرین بنێرە با بیبەنەوە بۆ وڵاتی بەرینی لیسیا، لەوێ براو کەسوکار و خزمانی پرسەی بۆ دەگرن و ڕێوڕەسمی کفن و دفنی بۆ ئەنجامدەدەن و گۆڕی بۆ هەڵدەبەستن و پەیکەری بۆ دەتاشن، ڕێز و حورمەتی مردووانیش هەر ئەمەیە."

(٤٥٨) سەرداری خواوەندان و بەشەران بەقسەی کرد. بەڵام وەکو ڕێز بۆ کوڕەکەی، بۆ کوڕە ئازیزەکەی کە پاتروکلۆس تۆزێکی دی لە خاکی تەروادەی بەپیت و بەرەکەتدا و دوور لە وڵاتی خۆی دەیکوشت، ڕێژنە بارانێکی خوێنی بەسەر زەویدا باراند.

(٤٦٢) کاتێ ئەو جووتە بەلەز بەرەو ڕووی یەکتر دەچوون، پاتروکلوس نێزەیەکی لە تراسیدیموسی دلێر، لە خوڵام و میرئاخوڕە ڕەشیدەکەی سارپیدون شا داو، ورگ و ڕیخۆڵەی دڕی، سلی سارکردەوە. هەنگێ سارپیدۆن نێزەیەکی سرەواندە پاتروکلۆس، کە سەرچیغ چوو، ڕمەکە بەر شانی ڕاستی ئەو ئەسپە کەوت کە (پیداسوس)ی نابوو، ئەسپەکە بەدەم گیانەڵێوە حیلەیەکی بەرزی کرد و کەوتە سەر ئەرزەکە و بەدەم ناڵیینەوە گیانی دەرچوو. جووتە ئەسپەکەی دیکەش شپرزە بوون، نیرەکەی سەر ملیان جیرە جیرێکی وشکی لێوەهات، و هەوسار و لغاوەکانیان تێك ئاڵا، چونکە ئەسپەکەی دیکە لە عاردی کەوتبوو. بەڵام ئوتومیدون کە بەرمبازی بەناوبانگ بوو، توانی ئەو گرفتە چارەسەر بکات، شمشێرە تیژەکەی هەڵکێشا و هەوساری ئەسپە کوژراوەکەی بڕی. ئەسپەکانی دیکە هەستانەوە و جڵەوەکانیان لێ بەسترایەوە و بەرەو مەیدانەکە... جووتە جەنگاوەر کەوتنەوە گیانی یەکدی.

(٥٠٢) سارپیدون نیشانەی لەشانی چەپی پاتروکلوس گرتەوە، لێ نێزەکە سەری کرد و نەیپێکا. ئەوجا نۆرەی پاتروکلۆس هات، نێزەیەکی خێواندێ و رێك پەردەی دڵی پێکا. وەکو چۆن کەشتی سازان، لە کۆسارێکدا بەتەور و بیوری تیژ دار بەڕوویەك یان دار چنارێك یان دار سنۆبەرێکی بەرز دەبڕنەوە تا کەشتی لێ دروست بکەن، وەکو چۆن ئەو دارانە بەدەم بیورانەوە رمبەیان دێ و دەکەونە سەر زەوی. ئەویش بەو جۆرە رمبەی هات و لەبەردەم عەرەبانە و ئەسپەکانیا تەخت بوو. بەدەم ئاە وناڵەوە لە خاك و خوێندا دەتلایەوە. وەکو چۆن شێرێك دزە دەکاتە نێو گاگەلێکی تەپۆ و گایەکی بێ باك و خەنەیی دەگرێت و گایەکە بەدەم گابۆرەوە لەژێر چنگی شێرەکەدا گیان بەدەر نابات، بەو شێوەیە فەرماندەی جەنگاوەرانی لیسیان لەژێر چنگی پاتروکلۆسدا بەربەرەکانی مەرگی دەکرد، هاواری لە هاورێ دڵسۆزەکەی دەکرد و دەیگوت: "ئەی گلاوکوس، ئەی قارەمانی قارەمانان، ئێستا ئەو رۆژەیە کە بیسەلمێنی رمباز و جەنگاوەرێکی نەبەزی. ئەو رۆژەیە کە تەنیا بیر لە شەڕ و شەڕڤانی بکەیەوە، ئەگەر راست دەکەیت و پیاوێکی بەهێزی، خۆت بگەیەنە فەرماندانی لیسیان و هانیان بدە کە لە تۆڵەی سارپیدوندا بجەنگن، نەیەڵن خوێنی سارپیدۆن بەفیرۆ بچێت. ئەوجا بەخۆت وەرە بەرگریم لێ بکە با قەڵغانەکەم بەتاڵان نەبرێ، چونکە ئەگەر ئاخییەکان چەك و ئەسلەحەکەم لێ داماڵن، ئەوا من و ناوی من دەبنە مایەی شەرمەزاریت و لێت نابنەوە، بەدرێژایی تەمەنت لێت نابنەوە. من ئێستا لە بەینی کەشتی ئاخییەکاندا کەوتووم، هەوڵی خۆت بدە و هەموو هێزەکەمان جۆش بدە و بخە گەڕ."

(٥٠٣) بەدەم ئەو قسانەوە گیانی دەرچوو.. مەرگ باڵی بەسەر هەردوو چاو و کونە کەپویدا کێشا. پاتروکلۆس پێی خستە سەر سینگی، نێزەکەی لە لەشی دەرکێشا، ماسولکەی پەردەی دڵی لەگەڵ نێزکەدا دەرهات، نووکی نێزەکە و گیانی سارپیدون لەیەك کاتدا دەرچوون. مەرمیدونەکان فریا کەوتن ئەسپەکان رابگرن، ئەو ئەسپانەی کە بەدەم حیلاندنەوەو بەبێ خێو لە حاڵی هەڵاتندا بوون. کاتێ گلاوکوس گوێی لە قسەکانی سارپیدون بوو زۆر خەمین و دڵتەنگ بوو، چونکە نەیدەتوانی فریای بکەوێ و یارمەتی بدات. بەدەست بازووی خۆی گرت و توند گوشی چونکە زامەکەی دەیەشا.. لەو کاتەدا کە بەرگری لە هاورێکانی دەکرد و بەرەو حەسارە بەرزەکە هێرشی دەبرد، تیوسیر لە دوورەوە تیرێکی تێ سرەواند بوو و زامداری کردبوو. ئەوجا کەوتە پاڕانەوە لە ئەپولۆی

دوور نەنگێوە و گوتی: "خواوەند گارا! ئەی شاها، لەهەر شوێنێ هەی، لە وڵاتی بەپیت و بەرەکەتی لیسی یان لە تەروادە، یان لەهەر شوێنێکی دیکەی کە دەتوانیناڵە و پاڕانەوەی پیاوێکی خەمبار و کەسەرداری میناکی من بژنەوی.. من ئێستا لێم قەوماوە، ئەم زامە ترسناکەم پێوەیە، ئازار لە هەردوو دیوەوە بازووی گەمارۆ داوم، خوێنەکەی ناوەستێتەوە.. نە دەتوانم شمشێر بگرم و نەدەتوانم شەڕی دژمن بکەم. ئەمە جگە لەوەی کە سارپیدونی فەرماندەمان، کوڕی زیوس، ئازاترین جەنگاوەر، کوژراو زیوس لەسەر کوڕەکەی نەهاتە جواب. جا شاها لێت دەپاڕێمەوە کە ئەم زامە ترسناکەم سارێژ بکە، ئازارەکەم بشکێنی و هێزم وەبەر بخەیەوە، تا بتوانم یارانی لیسی خۆم خڕ بکەمەوە و لەگەڵ ئەواندا لەسەر کوشتەی ئەم پیاوە شەڕ بکەم."

(٥٢٧) گلاوکوس بەو جۆرە پاڕایەوە، ئەپولۆ دوعاکەی گیرا کرد، یەکسەر ئازارەکەی سووک کرد، ئەو خوێنە تۆخەی لەبەر برینە خەتەرناکەکەی دەڕۆیی وەستاندەوە، هێز و تین و تاوی پێ بەخشییەوە، گلاوکۆس لە دڵەوە هەستی بەمە کرد، سوپاسی خواوەندی بەتوانای کرد کەوا زووبەزوو دوعاکەی گیرا کرد. ئەوجا کەوتە ناو تەروادەییەکان و هانیدەدان کە لە پێناوی سارپیدوندا بجەنگن، ئەوجا بەهەشتا و بەبەینی تەروادەییەکاندا ڕۆیی بۆلای بولیداماسی کوڕی پانتوس، و بۆلای ئەجینوری مەزن، ئەوجا چوو ئینیاس و هیکتۆری کۆوبرونزی دۆزییەوە و ڕێك و ڕەوان پێی گوت: "ئەی هیکتۆر تۆ بەتەواوەتی ئەو هاوپەیمانانەت فەرامۆش کردوون کە دوور لە وڵات و کەسوکاری خۆ لە پێناوی تۆدا ژیانی خۆبەخت دەکەن، کەچی تۆ هیچ یارمەتییەکت نەداون

(٥٤٠) ئەوەتا سارپیدۆنی ڕابەری لیسیان، لیسیانی جەنگاوەر لەو گۆڕە کەوتووە، ئەو سەردارەی کە بەدادگەری و لێهاتویی خۆی لیسییەکانی لە چەپاڵەی ڕۆژگار دەپاراست، ئێریسی برونزین، بەدەستی پاتروکلۆس، بەنێزەی پاتروکلۆس بەکوشتی داوە. براینۆ فریای بکەون، دڵتان تەژی تۆڵە بکەن و مەیەڵن مەرمیدونەکان چەك و ئەسلەحەکەی لێ دامالن و جەنازەکەی بشێوێنن و تۆڵەی هەموو ئەو داناییانەی لێ بکەنەوە کە لە پاڵ کەشتییە لەزەکانیاندا کردمانن بەتێشوی نێزەکانمان."

(٥٤٨) کە ئەو قسانەی کرد، خەمێکی کوشندە باڵی بەسەر هەموو تەروادەییەکاندا کێشا. هەرچەندە سارپیدون غەوارە بوو و لە دوورەوە هاتبوو، بەڵام قەوم و قیلەیەکی زۆری لەگەڵ هاتبوون... و پیاوی شەڕ و مەیدان بوو، بۆیە هەمیشە کۆڵەکە و پشتیوانی

تەرواددەییەکان و شارەکەیان بوو. کە تەروادەییەکان گوێیان لەو قسانە بوو بەجارێ جۆشان و ڕاستەوخۆ بەڕابەرایەتی هیکتۆر کە زۆر بەداخ بوو بۆ سارپیدون، بەرەو داناییەکان هێرشیان برد. بەڵام پاتروکلۆسی سینگ توکن، کوڕی مینویتیوس کەوتە هاندانی ئاخییەکان و یەکەمجار ڕووی کردە هەردوو ئەجاکس، کە بۆ خۆیان هەمیشە ئامادەی شەڕ بوون و لەسەر پێیان بوون، گوتی: "ئەی جووتە ئەجاکس، بتان بینم چۆن بەرەنگاری دژمن دەبنەوە، بەهەمان هیمەت و شەهامەتی جارانەوە، بگرە بەهیمەتێکی پترەوە بەرەنگاری دژمن ببنەوە، مژدەتان لێ بێ، یەکەم پیاو کە لە حەساری ئاخییەکان ئامدیو بوو، کە سارپیدۆن بوو، ئەوەتا کوژراوە و لەوگۆڕە کەوتووە. هەوڵبدەن لاشەکەی بەدەست بێنن و چەك و ئەسلەحەکەی لێ دامالین و جەنازەکەی هەر بۆ ئەتك بشێوینین، بەزەبری نێزەی برونزین هەر یەکێك لەو هاوڕێیانەی کە دەیانەوێ جەنازەکەی دەرباز بکەن بکوژین."

(٥٦٢) برایانی ئەجاکس خوا خوای ئەو قسانە بوون، و خۆبەخۆ تامەزرۆی هێرش و پەلامار و ڕاونانی دژمن بوون. دوای ئەوەی هەردوو لەشکر خۆیان ئامادەکرد، تەروادەییان و لیسیان لەلایەك و مەرمیدونان و ئاخییان لەلایەکی دی، لە دەوروبەری جەنازەکەی سارپیدون تێك بەربوون، هورا و نەعرەتەیان دەگەییە ئاسمان، دەنگ و تەق و هوڕی قەڵغان و چەك و ئەسلەحە زراوی پیاوی دەتۆقان. زیوس دنیای تاری کرد و شەوێکی ئەنگوستە چاو باڵی بەسەر ئەم مەیدانە سامناکەدا کێشا، تا ژمارەیەکی زۆرتری جەنگاوەران لەسەر کوشتەی کوڕەکەی بکوژرێن.

(٥٦٩) تەروادەییەکان، هەوەڵجار توانیان پاشەکشە بەئاخییە چاو تیژەکان بکەن. ئەوە بوو ئیبیجۆسی جوامێری کوڕی ئاگاکلیسی مێرخاس و خانەدانیان کوشت. ئیبیجۆس پێشتر میر و پاشای شارە جوان و ئاوەدانەکەی بودیون بوو. بەڵام پاش ئەوەی شۆڕەسوارێکی مێرخازی خزمی خۆی کوشتبوو، پەناوی وەبەر بیلیوس و (تیتیس)ی لاق زیوین هێنابوو، ئەوانیش ناردبوویان بەگەڵ ئەخیلی سەفدر بکەوێ و بچێ بۆ تەروادەی مەڵبەندی ئەسپانی ڕەسەن و شەڕی تەروادەییەکان بکات. لەو کاتەدا کە خەریك بوو لاشەکەی سارپیدونی هەڵدەگرت، هیکتۆری پاکزاد، گاشەیەکی بەتەپڵی سەریدا داو لەناو کێوخودە قورسەکەیدا شەقی کرد، یەکسەر بەدەما ڕمایە سەر جەنازەکەی سارپیدون و مرد.

(٥٧٨) پاتروكلۆس بەمەرگی هاوڕێكەی زۆر خەمبار و توڕە بوو. وەكو چۆن واشەیەك دوای قەلەڕەش و ڕیشۆڵان دەكەوێ و لەبەری هەڵدێن، تۆش ئەی شۆڕەسواری مێرخاس، ئەی پاتروكلۆس بەو ئاوایە لە تۆڵەی هاوڕێكەتدا، بەدڵی پڕ لە قینەوە هەڵتكوتایە سەر لیسی و تەروادەییەكان. گاشەیەكی كێشا بەملی ستینیلاوسی خۆشەویستدا، ستینیلاوسی كوڕی ئیتایمینیس، و هەرچی دەمار و ئێسكی هەبوو هاڕی بەسەریەكدا. ئیدی جەنگاوەرەكانی ڕیزی پێشەوە و هیكتۆری بەشكۆ، پاشەكشەیان كرد. بەئەندازەی ڕم هاوێژێك، كە یەكێك لە پێشبڕكێیەكدا بۆ تاقیكردنەوەی هێزی بازووی خۆی و بردنەوەی خەڵات بیهاوێ، یان لەشەڕدا و لەژێر گوشاری دژمنێكی كوشتۆخدا بیهاوێ، تەروادەییەكان بەو ئەندازەیە پاشەكشەیان كرد و دووركەوتنەوە .گلاوكۆس، ڕابەری لیسیانی سپەروانان یەكەم كەس بوو كە ئاوڕی دایەوە و (باتوكلیس)ی نەفسبەرزی كوشت، باتوكلیس كوڕی ئازیزی خالكون بوو، و لە هیلاسدا دەژیا، لەڕووی دەوڵەمەندی و دڵاوایییەوە لەنێو مەرمیدونەكاندا بەناویانگ و سەرامەد بوو. گلاوكوس ڕمێكی كرد بەسنگیا، گلاوكۆس كاتێ لەنكاو ئاوردەداتەوە دەبینێ (پاتوكلیس) ها وەدوایەوە و خەریكە دەیگرێت، بۆیە سەر نێزەیەك دەكات بەسەر سینگدا و دەیكوژێت. مردنی ئەم جەنگاوەرە خەمێكی گەورەی خستە دڵی ئاخییەكانەوە. چونكە یەكێك بوو لە شەڕڤانە هەرە چەلەنگەكان، بەڵام تەروادەییەكان زۆر شادمان بوون و بەكۆمەڵ دەوری جەنازەكەیاندا. هەڵبەتە ئاخییەكانیش ورەیان بەرنەدا و بەهەموو هێز و توانای خۆیانەوە هێرشیان بۆ بردن.

(٦٠٣) هەنگێ میریونیس جەنگاوەرێكی تەروادەیی پڕ چەكی كوشت، ئەم جەنگاوەرە لایوگونوسی كوڕی ئونیتۆر بوو كە لێزانی زیوس بوو لە كێوی ئیدا، لەنێو قەوم و قیلەی خۆیدا بەئەندازەی خوایەك ڕێز و حورمەتی هەبوو. میریونیس یەكێكی كێشا بەبن شەویلاگە و گوێیدا و دەم و دەست ژیانی لەبەر بڕی و چاوانی سپی بوون. ئینیاس نیشانی لە میریونیس گرتەوە و بەهێڤی بوو كاتێ كە بەقەڵغانەكەیەوە دەهاتە پێشێ، لە كونێكەوە بیپێكێ، لێ میریونیس ئەوی دەبینی، بۆیە خۆی بۆ پێشەوە دانەواندەوە و نێزەكە بەسەریا تێپەڕی و لەودیوییەوە لە زەوی چەقی و هەر دەلەرییەوە تا ئێریس لەوێندەر هێزی تیا نەهێشت. بەو جۆرە ڕمەكەی ئینیاس بەهەتەر چوو. ئیدی ئینیاس زۆر توڕە بوو و ڕووی تێكرد و گوتی: "ئەی میریونیس، هەرچەندە لە سەما و هەڵپەڕكێی جەنگیدا چالاك بی، ئەگەر نێزەكەم دەیگرتی بۆ هەمیشە لە جوڵە دەخستی!"

(٦٢٠) میریونیس کە بەڕمبازی بەناوبانگ بوو وەڵامی دایەوە و گوتی: "ئینیاس چەند ئازا ونەبەردبی، زۆر زەحمەتە بتوانی کۆتایی بەژیانی هەرکەسێك بێنی کە بەمەبەستی بەرگری لە خۆی ڕووبەڕووی تۆ ببێتەوە. چونکە تۆش بەشەرێکی فانیت وەکو من. بەهەموو ئەو باوەڕ و متمانەیەوە بەدلاوەری و هێزی بازووی خۆتت هەیە، ئەگەر بەر نێزەی من بکەوی، بێگومان دەبیتە مایەی سەرفرازی من و گیانت بەرەو هادیسی خێوی ئەسپانی ڕەسەن دەفرێت."

(٦٢٧) ئەو قسانەی کرد. کوڕە دلاوەرەکەی مینویتیوس قسەکانی ئەوی لە گیان خۆش نەبوو، بەسەرزەنشتەوە پێی گوت: "ئەی میریونیس، بۆچی بەو شێوەیە قسە دەکەی؟ تۆ کەسێکی مێرخازی جەنگاوەری، تەروادەییەکان بەقسەی توند و تاڵ وجنێوان پاشەکشە ناکەن و دەستبەرداری جەنازەکە نابن، بەڵکو دەبێ زۆریان لە بکوژرێ و بخرێنە چاڵەوە، ئەنجامی جەنگ لە هێزی بازوودایە،.بەلام ئەنجامی گەنگەشە و قسان لە وشەدایە و جێی وشە مەجلیس و کۆڕە. بۆیە دەبێ دەستبەرداری قسان بین و بایەخ بەشەڕ و کوشتار بدەین."

(٦٣٢) بەدەم ئەو قسانەوە کەوتە پێشڕەوی و میریونیسی فانی و هاوتای خواوەندان کەوتە دووی. وەکو چۆن ڕمبەی تەوری دارکەران لە بێشەیەکی چیاییدا، لە دوورەوە دێ و دەنگ دەداتەوە، هەرا وزەنای جەنگاوەرەکانیش لەو دەشتە بەرینەدا و، تەق و هوڕی برونزان و قەڵغانانی مکوم و ناياب، کە بەر تیر و نێزەی دووسەری یەکتر دەکەوتن لە مەیدانەکە دەنگی دەدایەوە و ڕمب و هۆڕێك بوو ئەوسەری دیار نەبوو. کەس نەبوو ساربیدۆن بناسێتەوە —هەرچەندە شوێنەکەیان دەزانی- چونکە لە ترۆپکی سەرییەوە تا بنی پێیەکانی جێ ڕم و خوێن و خۆڵ بوو. شەڕ لە دەوری لاشەکەی ئەو گەرم بوو، وەکو چۆن مێش و مەگەسان لە وەرزی بەهارا و لە مەرزایەکدا لە دۆلکە شیرێکی لێو ڕێژ دەوروکێن و خڕ دەبنەوە، بەو ئاوایە جەنگاوەرەکانیش لە دەوری جەنازەکە خڕبوو بوونەوە و کەوتبوونە گیانی یەکدی. زیوس چاوە پرشنگدارەکانی لە هەرا و هەنگامەی ئەو شەڕە سەختە لانەدەبرد، بەبەردەوامی چاودێری جەنگاوەرەکانی دەکرد و دوو دڵ و وازواز بیری لە کوشتن و مەرگی پاتروکلۆس دەکردەوە: ئایا بەنێزەی هیکتۆری مەزن، لەشەڕی سەر جەنازەکەی سارپیدون بکوژرێ و هیکتۆر چەك و ئەسلەحەکەی لێ داماڵێت؟.. یان جارێ وازی لێ بێنێ تا ژمارەیەکی دیکەی جەنگاوەران بکوژێت و

بەهوییێ؟.. بەدەم ئەم بیرانەوە وای بەباش زانی کە جڵەو بۆ هاوڕێ و میرئاخوڕ و خولامە ئازاکەی (ئەخیل)ی کوڕی بیلیوس شل بکات تا تەروادەییەکان و هیکتۆری کێو برونزی بەرەو شاری تەروادە ڕاوبنێ و ژمارەیەکی دیکەیان لێ بکوژێت. ئەوە بوو هیکتۆر ترسی لێ نیشت و بەلەز سواری گالیسکەکەی بوو و ڕێگەی هەڵاتنی گرتە بەر و فەرمانی بەتەروادەییەکانی دیکەش دا کە وەکو ئەو هەڵێن

(٦٥٨) چونکە هەستی کردبوو کە زیوس ڕای خۆی گۆڕیوە و ئێستا دژی ئەوە. هەروەها لیسیانی دلاوەریش کە دیتیان پاشاکەیان کوژراوە و جەنازەکەی لەنێو کوشتەی کوژراوەکانی دیکەدا کەوتووە و زۆر جەنگاوەری دیکەش بەسەریا کوژراون، ورەیان بەردا و ئاژاوەیان تێکەوت. هەنگێ مورمیدونەکان سپەرە درەخشانەکەی سارپیدون و چەك و ئەسلەحەکەیان لێ داماڵی کوڕە ئازاکەی مینویتیوس دانی بەهاوڕێکانی تا بۆ ناو کەشتییەکانی ببەن. هەنگینێ (زیوس)ی هەورەوان و خێوی هەورە تریشقان بەئەپولۆی گوت: "ئەپولۆی ئازیز، نهو هەرە، سارپیدون لە تیر ڕەسی جەنگاوەران دوور بخەوە، ئەو خوێنە ڕەشەی لێ پاك بکەوە، ئەوجا بیبە و لە ئاوی زوڵاڵی ڕووبارێك بیشۆ و، بەعەنبەری بەهەشتی چەوری بکە، و جلکی خوایی لەبەر بکە، ئەوجا بیدە دەستی دوو حەماڵی چەلەنگ و گورج و گۆڵ، تا بیبەن بۆ جووتە برای جمکانە (خەو و مەرگ) تا بەلەز بۆ لیسیای بەپیت و فەڕی بەرنەوە، و لەوێ براکانی و کەسوکاری پرسەی بۆ دابنەن و لەسەر گردێکی بنێژن و کۆتەڵی بۆ هەڵبەستن، چونکە ئەمە هەقی مردوانە!"

(٦٧٦) دوای ئەو قسانە، ئەپولۆ فەرمانی بابی بەجێهێنا، لە لوتکەکانی ئیداوە بەرەو ناوجەرگەی شەڕەکە داگەڕا. یەکسەر سارپیدۆنی مەزنی لە هەتەری ڕمان دوور خستەوە، لە ڕووباردا شۆردی، بەئەمبرۆز چەوری کرد و جلکی خوایی لەبەرکرد و بەدوو حەماڵی زۆر گورج و گۆڵی سپارد، تا بیبەن بۆ جووتە برای جمك (خەو و مەرگ) کە لەچاو تروکانێکدا گەیاندیانەوە دەڤەری بەپیت و بەرەکەتی لیسیا.

(٦٨٤) ئەوجا پاترۆکلۆس بەدەم هاندانی ئۆتومیدون و ئەسپەکانیەوە، کەوتە دووی تەروادەیی و لیسییەکان، ئەمەشی لەبەر غروور و گەوجێتی بوو. دەنا ئەگەر فەرمانی کوڕەکەی (بیلیوس)ی لە عەرزی نەدابا، بێگومان لە مردن دەخەلەسی و لەهەر وەی و ئاسیوێك بەدوور دەبوو. لێ ئەندێشە و نیازی زیوس هەمیشە لە ئەندێشە و نیازی بەشەرێن فانی بەهێزترە. زۆرجار پیاوی ئازا و ڕەشید بەهەڵاتن دەدات و بەمەش بەئاسانی

سەرفرازی و سەرکەوتنی لە کیس دەدات، یان خێرا بادەداتەوە و پیاو بۆ شەڕ هاندەدا وەکو چۆن ئێستا دلێری و بێباکی دەخستە دڵی پاترۆکلۆسەوە

(٦٩٢) ئەی پاترۆکلۆس. کاتێ خواوەندان بەرەو پیری مەرگی خۆتیان دەبرد، هەوەڵین و دوایەمین جەنگاوەرانێ کە بەدەستی تۆ کوژران کێ بوون؟.. هەوەڵینیان ئەدراستوس، ئۆتونوس، ئیخیلوس، پیریموس-ی کوڕی میجاس و ئەبیستور و میلانیپوس بوون و دوایینیان ئاسوس، مولیوس، و بولارتیس بوون.. ئەوانە بەدەستی تۆ کوژران، ئەوانی دی بۆ خۆ هەڵاتن و وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون!

(٦٩٨) کوڕانی ئاخیایی خەریك بوو بەڕابەرایەتی پاترۆکلۆس، کە ڕمەکەی بەهەر چوارنکاڵدا هەڵدەسوڕاند و بادەدا دەست بەسەر تەروادەدا بگرن. ئەگەر ئەپولۆ خۆی نەگەیاندبایە سەر حەسار و بورجە مکومەکە و بیری لە فەوتانی نەکردباوە و پشتیوانی لە تەروادەییەکان نەکردبا. پاترۆکلۆس سێ جاران پێی نایە سەر سوچێکی حەسارە بەرزەکە.. ئەپولۆ سێ جاران دایە دواوە و پاشەکشەی پێکرد، بەدەستە نەمر و پیرۆزەکانی خۆی لە سپەرەکەیدا. بەڵام کە جاری چوارەم وەکو خواوەندێك هێرشی برد، ئەپولۆ بەدەنگێکی سامناك هاواری لێکرد و ڕێك و ڕەوان پێی گوت: "ئەی پاترۆکلۆس، ئەی نەوە ونەتیرەی زیوس بگەڕێوە، چونکە تەقدیر وای لە قەڵەم نەداوە کە شاری تەروادەییانی دلاوەر بەزەبری نێزەی تۆ بگیرێت، تەنانەت بەدەستی (ئەخیل)ش کە لە هەموو ڕوویەکەوە زۆر لە تۆ زیاترە.

پاترۆکلۆس دوای ئەو قسانە، ماوەیەکی زۆر دوور کەوتەوە تا خۆی لە پشم و غەزەبی ئەپولۆی دوور ئەنگێوە بپارێزێت.

(٧١٢) هیکتۆر لەم کاتەدا بەخۆ و ئەسپە خورتەکانیەوە لەبەر دەروازەکانی سکابیدا وەستابوو. دوو دڵ بوو لەوەی کە ئایا هەمدیس بچێتەوە ناو شەڕەکە و دەست پێبکاتەوە، یان فەرمان بەهێز و لەشکرەکەی بدات کە پاشەکشە بکەن و خۆ بدەنە پەنا حەسار و بورجەکان؟.. لە کاتێکا ئەو لەم بیرانەدا بوو کە ئەپولۆ لە شێوە و هەیئەتی (ئاسیوس)ی لاوی جوامێر و بەهێزدا، کە خاڵی هیکتۆری شۆڕەسوار و برای هیکوبا و کوڕی دوماس بوو کە لە فریجیای نزیکی ڕوباری سانگاریوسدا ئاکنجی بوو، بەڵا لە شێوەی ئاسیوسدا لە هیکتۆری شۆڕەسوار نزیك بووەوە و پێی گوت: "ئەی هیکتۆر بۆچی دەست لەشەڕ هەڵگرتووە؟ ئەمە لە تۆ ناوەشێتەوە. ئاه، ئەگەر من لە تۆ بەهێزتر دەبووم، هەنگێ

دەمرانی چۆن پەشیمانم دەکرییەوە لەوەی کە دەستبەرداری شەڕ بوویت. ئێستاش ئەچووە بچێ، بەخۆ و بەئەسپەکانتەوە پەرماری پاتروکلۆس بدە. ڕەنگە بتوانی بیکوژیت و ئەپولو سەرکەوتن و سەرفرازیت پێ ببەخشێت!

(٧٢٦) ئەپولۆ دوای ئەو قسانە خۆی کرد بەشەریکی شەڕەکە، هیکتۆری مەزن فەرمانی بەسیبریونی ئەقڵمەند دا کە ئەسپەکان بەرەو مەیدانی شەڕ باژوێ. بەڵام ئەپولۆ، بەرێی خۆیدا ڕۆیی، خۆی بەناو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا کرد، ترسێکی زۆری خستە دڵی ئارگۆسییەکانەوە. سەرکەوتن و سەرفرازی بەتەروادەییەکان و هیکتۆر بەخشی. هیکتۆر چاوپۆشی لە هەموو داناییەکانی دی کرد و هەوڵی کوشتنی نەدان، بەڵکو ئەسپە بەهێز و ڕەهوانەکانی بەرەو پاتروکلۆس تاودا. هەنگێ پاتروکلۆس خۆی لە گالیسکەکەی هەڵدایە خوارێ

(٧٣٤) بەدەستی چەپی ڕمێکی هەڵگرتبوو و بەدەستەکەی دیکەی بەردێکی تیژ و ناهەموار و پڕ بەدەستی هەڵگرتبوو. ئەوجا گوری بەستەوە و بێ ئەوەی لە خەنیمەکەی بترسێت بەردەکەی هاویشت، بەردەکە ڕێك بەر تەوێڵی سیبریونی گالیسکەڕان و میرئاخورەکەی هیکتۆر، و کوڕە ناشەرعییەکەی پریامی خانەدان کەوت کە جڵەوی ئەسپەکانی بەدەستەوە بوو. ئێسکی ناوچەوانی شکا، هەردوو برۆی چوونە ناوەوە، هەردوو چاوی دەرپەڕین و لەبەر پێیدا کەوتنە سەر زەوی. هەنگێ وەکو چۆن مەلەوانێك بەسەرا خۆی هەڵدەداتە ئاوەوە، بەو ئاوایە لە عەرەبانە نایابەکەیەوە کەوتە خوارەوە و حەیاتی لەبەر بڕا. تۆش ئەی پاتروکلۆسی سوارچاك، بەریش خەنەوە ڕووت تێکرد و گوتت: "تۆ بڕوانە ئەم پیاوە ڕۆح سوك و گورجە، چەند بە مەعلانی مەلە دەکات! ئەگەر کەسێك بیدینێ چۆن لە گالیسکەکەیەوە خۆی هەڵدەدا، وا دەزانێ لە کەشتییەکەوە خۆی هەڵدەداتە ناو شەپۆلانی دەریایەکی پڕ ماسی تا مەیگۆیان بگرێ، و تەنانەت لە ئاوی لێڵیشدا دەیانگرێت. چونکە من بەچاوی خۆم بینیم چەند بەسوکی و گورجی لە عەرەبانەکەیەوە خۆی هەڵدایە سەر ئەرزەکە. پێدەچێت تەروادەییەکان مەلەوانانی زۆریان تیابێ."

(٧٥١) بەدەم ئەو قسانەوە بەرەو سیبریون چوو، لە شێرێك دەچوو کە بەدەم پەلاماردانی ئاغەڵێکەوە، لە سینگی درابێ و بریندار کرابێ، و دڕی و ئازایەتییەکەی بووبێ بەبەڵای گیانی. ئەی پاتروکلۆس تۆش بەمیناکی ئەو شێرە، دڕ و دڕندە هەڵت کوتایە سەر سیبریون! لەولاشەوە هیکتۆر لە گالیسکەکەی خۆی هەڵدایە خوارێ. لەسەر کوشتەکەی

سیبریون کەوتنە شەڕ، وەکو چۆن دوو شێری برسی لە ترۆپکی چیایەکدا لەسەر کەلاکی کەڵەکێوییەك دڕندانە بەگژ یەکدیدا دەچن، ئەم دوو قارەمانەش، کە هەردوکیان لە نەعرەتە کێشانی شەڕ بوون، پاترۆکلۆسی کوڕی مینۆیتیوس و هیکتۆری درەخشان لەسەر کوشتەی سیبریون دەچوون بەگژ یەکدیدا و هەر یەکێکیان قەستی سەری ئەوی تریانی دەکرد و دەیویست بەبرونزی دڵڕەق جەستەی هەڵدڕێ، لە کاتێکا هیکتۆر سەری لاشەکەی گرتبوو و بەئامان و زەمان بەری نەدەدا و (پاترۆکلۆس)ش لاقی گرتبوو و تا هێزی تیابوو ڕایدەکێشا و ئەوانی دیکەش، تەروادەییەکان و ئارگۆسییەکان بەچوار دەوریاندا لە شەڕێکی سەختدا بوون. وەکو چۆن بای ڕۆژهەڵات و بای ڕۆژئاوا لە دۆڵێکی تەنگی کۆسارێکدا بەسەر بێشەیەکی چڕە دارستانی گەزیچار و بناو و بەڕووانی پڕ لق و پۆپدا هەڵدەکەن و لق و پۆپی دارەکان دەهەژێنن و بەناو یەکدا دەچن و قرچ و هوڕی شکانی لقەکان دنیا پڕ دەکات... بەو ئاوایە

(٧٧٠) تەروادەیی و ئاخییەکان بەربوو بوونە گیانی یەکدی و قڕیان دەخستە یەکدی بێ ئەوەی هیچ لایەکیان بیر لە پاشەکشە و هەڵاتن بکەنەوە. چەند ڕمێکی تیژ لە دەوروبەری سیبریون کەوتنەوە و زۆر تیری باڵدار هاوێژران و گەلێك خڕکە کەڤران بەر زرێیان دەکەوتن و هێزەکان هەر سەرگەرمی شەڕی خۆ بوون لە دەوری سیبریون، کە لە عاردەکە کەوتبوو و بۆ هەمیشە جڵەوی ئەسپەکانی بەردا بوو.

(٧٧٧) ڕم و نێزەی هەردوولا تاوەکو بولێڵی ئێوارێ هەر بەردەوام بوو، هەر جەنگاوەر بوو و دەکوژرا. بەڵام کاتێ ڕۆژ بەرەو خۆرنشین داکشا و نیران لە ملی گاجووتان کرانەوە، دەرکەوت کە ئاخییەکان زۆر لە تەروادەییەکان بەهێزتر و باڵادەست تر بوون. جەنازەکەی سیبریونی قارەمانیان دوور خستەوە و لە تیر ڕەس و هەرا و هەنگامەی تەروادەییەکانیان دەربازکرد و چەك و ئەسلەحەکەیان لێ داماڵی. ئەوجا پاترۆکلۆس، وەکو ئێریسی زەرۆپ، بەدەم نەعرەتە کێشانێکی سامناکەوە سێ جاران هێرشی بردە سەر تەروادەییەکان و بە هەر سێ هێرشەکە سێ مێری لێخستن. بەڵام ئەی پاترۆکلۆس کاتێ بۆ جاری چوارەم میناکی خواوەند هێرشت برد، ئەجەلت نزیك دەبووەوە، چونکە ئەپولۆ هاتە ناو شەڕەکەوە تا وەکو جەنگاوەرێکی سامناك ڕووبەڕووت ببێتەوە. کاتێ کە بەنێو ئاپۆرەی خەڵکەکەدا دەڕۆیی، پاترۆکلۆس نەی بینی، چونکە خۆی لە پەڵە تەمێکی چڕەوە پێچا بوو، بەرەو ڕووی پاترۆکلۆس دەڕۆیی. ئەپولۆ لە پشتییەوە وەستاو بەناولەپ یەکێکی

کێستا بەپشتیا و بەنێو شانە پانەکانیدا، چاوانی پاترۆکلۆس تاریك بوون و سەرە گێژکەی پێکەوت. ئەپولۆ کڵوخودەکەی لەسەری پەڕاند و بەتەق و هوڕ کەوتە ژێر دەست و پێی ئەسپانەوە و گوڵینکەکانی کە لە یاڵی ئەسپ دروست کرابوون، لە خوێن و خۆڵدا لەوتان. تا ئەو کاتە قەرار نەبوو کە ئەو کڵوخودە بکەوێتە سەر زەوی و بلەوتێ، چونکە ئەو کڵوخودە سەری پیاوێکی نیمچە خواوەندی میناکی ئەخیلی دەپۆشی و سەرو تەوێڵی شیرینی ئەوی لە ئاسیوان دەپاراست. بەڵام ئێستا زیوس، توڕی دا تا هیکتۆر لە کاتێکا کە ئەجەلی نزیك دەبووەوە لەسەری بکات.نێزەکەی پاترۆکلۆس، هەرچەندە نێزەیەکی قورس و بتەو وسەرەکەی برونز بوو، لە دەستیا شکاو کەڵکی بڕا. ئەوجا حەمایلی سپەرکەی کە سەراپای دادەپۆشی پچڕا، سپەرەکە لەبەری کەوتە خوارەوە، ئەپولۆی کوڕی زیوس زرێکەشی لێ داماڵی.

(٨٠٥) لێرەدا، هەست و هۆشی پاترۆکلۆس ئاڵۆزکا، چوارپەلی خاو بووەوە، بەواقی وڕەوە لەجێی خۆی وەستا. لەم کاتەدا جەنگاوەرێکی داردانی، بەنێزە بڕندەکەی و لە پشتەوە و لە بەینی هەردوو شانیا یەکێکی پێدا کێشا. ئەم جەنگاوەرە یوفوربوسی کوڕی پانتوس بوو، کە لە ڕمبازی و سوارچاکی و گورج و گۆڵی و زەرۆپیدا لەهەر هەموو هەڤڕك و هاوتەمەنانی خۆی زەبەردەستتر بوو. سەیر ئەوەیە کە یەکەمجار سواری گالیسکە بوو، بیست دانە جەنگاوەری لەسەر گالیسکەکانیانەوە هەڵدێرا بوو! ئەمە یەکەم دەرسی بوو لەواری شەڕ و کوشتاراندا! ئەی پاترۆکلۆس، ئەی شۆڕەسوار، ئەم جەنگاوەرە یەکەم کەس بوو ویەکەم ڕمی سرەواندە تۆ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا نەیخستیت، بەڵکو دوای ئەوەی ڕمەکەی لە جەستەت دەرکێشایەوە، بەپەلە پاشەکشەی کرد و خۆی بەنێو ئاپۆڕەی خەڵکەکەدا کرد و خۆی ونکرد. لەمەیدانی شەڕەکەدا چاوەنۆڕی پاترۆکلۆسی نەکرد، هەرچەندە پاترۆکلۆس بێ چەك و ئەسلەحە بوو. بەڵام پاترۆکلۆس کە جەزرەبەکەی خواوەند و ڕمەکە کەسیرەی کردبوو، لە ترسی ژیانی خۆی بۆ ناو ئاپۆڕەی لەشکرەکەی خۆی پاشەکشەی کرد. هەنگێ هیکتۆر کە بینی پاترۆکلۆسی مێرخاس ووەبەرز بەنێزەی بڕندە پێکراوە و پاشەکشە دەکات، بەنێو ئاپۆڕەی هێزەکاندا بۆی کشا، خۆی لێ نزیك کردەوە و تاهێزی تیابوو نێزەیەکی کرد بە بەرورگیدا ودیواودەری کرد، پاترۆکلۆس ڕمبەی لێ هەستاو لە عاردی گەوزا، لەشکر و هێزی ئاخییەکان زۆریان پێ ناخۆش و لەبەر گران بوو. وەکو چۆن شێرێك وبەرازە کێوییەکی پشوو درێژ، لە کانگای دڵی پڕ

جوڕەییانەوە لە لوتکەی چیایەکدا، لەسەر کانیاوێکی چکۆلە، کە هەردوکیان دەخوازن ئاوی لێ بخۆنەوە، دەبێ بەشەڕیان و لە ئەنجامدا بەرازە کێوییەکە هانکە هانکی پێ دەکەوێ و شێرەکە بەزەبری هێز و توانای خۆی بەسەریا زاڵ دەبێت.. بەهەمان شێوە کوڕە مێرخازەکەی مینویتیوس دوای ئەوەی ژمارەیەکی زۆری لە تەروادەییەکان کوشت. هیکتۆری کوڕی پریام، حەیاتی لەبەر بڕی. لە نزیکەوە ڕمێکی لێدا و بەکەش و فشەوە بەدیارییەوە وەستاو ئەم قسانەی دا بەگوێیدا: "ئەی پاتروکلۆس تۆ، وا بزانم، پێت وابوو کە دەتوانی شارەکەمان وێران و تالآن بکەی، ژنانی تەروادە لە ئازادی مەحروم بکەیت و لە کەشتیان باربکەیت و بۆ خاکی وڵاتە ئازیزەکەتیان بەری، ئای لە خۆت نەفامێ، هیکتۆر و ئەسپە ڕەهوانەکانی هیکتۆر بۆ بەرگری لەوان هاتوونەتە مەیدانی شەڕ، من لەنێو خەڵکێن شەڕڤان و جەنگاوەری تەروادەدا بەڕمباز بەناوبانگم و بەزەبری نێزەکەم نیری کۆیلەیتیان لێ دوور دەخەمەوە، بەڵام تۆ لێرەدا دەبیت بەخۆراکی قەل و داڵان. هەی نەگبەت تەنانەت (ئەخیل)ش بەهەموو دلاوەری و جوامێرییەکیەوە فریات نەکەوت، کە پێم وایە کاتێ بەڕێی کردی فرمانی پێدایت و ڕای سپاردیت کە: "ئەی سەروەری سواران، ئەی پاتروکلۆس، تا زرێ خوێناوییەکەی هیکتۆری کوشتۆخ، مەردم کوژ، لەبەریا نەدریت بۆلای من و کەشتییە ناو بەتاڵەکان مەگەڕێوە!" هەڵبەتە وای ڕاسپاردویت و تۆی ساویلکەی خەڵەتاندووە و بۆ شەڕی ناردوویت."

(٨٤٣) ئەی شۆڕەسوار، ئەی پاتروکلۆس، بەوپەڕی بێ هێزییەوە بەرسڤت دایەوە: "ئەی هیکتۆر ئەمجارەیان هەقی خۆتە بەخۆ بفشی، چونکە زیوسی کوڕی کرونوس، و ئەپولۆ سەرکەوتنیان پێ بەخشیت. ئەوان بەم ئاسانییە سندمیان کردم، هەر ئەوان چەکیان کردم، چەك و ئەسلەحەکەیان لێ داماڵیم، دەنا بیست پیاوی وەکو تۆ هێرشیان بۆ هێنابام، هەر هەموویانم دەکرد بەتێشووی ڕمەکەم. قەدەر و ئەپولۆی کوڕی لیتو، لە تیرەی خواوەندان، کوشتیانم. لە تیرەی بەشەرانیش یوفوربوس لێی دام. تۆش بکوژی سێیەمی منی. جا من قسەیەکی دیکەشت پێ دەڵێم و قسەکەم لە دڵی خۆتدا هەڵگرە: "تۆ زۆر ناژیت، مەرگ و چارەنووس لە بۆ سەدان بۆت، تۆ بەدەستی ئەخیلی بێ هاوتا دەکوژرێیت. هەر کە ئەو قسانەی کرد، ئیدی مەرگ باڵی بەسەردا کێشا، و دوا هەناسەی جەستەی بەجێهێشت و بەپەلە بەرەو هادیس چوو و چارەنووسی ئەو بەدەم شین و گرینەوە ماڵاوایی لە هەرزەکاری و تافی پیاوەتی پاتروکلۆس کرد. هەرچەند ئەو مردبوو

بەدەم هێکتۆر هەر قسەی لەگەڵدا دەکرد: "ئەی پاتروکلۆس بۆچی پێشبینی مەرگی مسۆگەری من دەکەی؟ کێ دەزانێ، لەوەیە ئەخیلی کوڕی (تیتیس)ی پۆڕ جوان، لە پێشدا بەر نێزەی من بکەوێ، و گیانی لە دەست بدات؟"

(٨٦٢) ئەو قسانەی کرد و ئەوجا پێی نایە سەر لاشەکە و نێزە بڕندەکەی لە زامەکە، کە هێشتا تازە بوو دەرکێشا. بەدەم دەرهێنانی نێزەکەیەوە، جەنازەکەی بەپشتدا خست. ئەوسا بەلەز و نێزە بەدەست بەرەو ئوتومیدونی خواوەند ئاسا، خوڵام و میرئاخوڕی زەرۆپی کوڕی ئیکۆس چوو، بەڕاستی تامەزرۆی کوشتنی بوو، لێ ئەسپە جاویدانەکان، ئەو ئەسپانەی کە خواوەندان وەکو دیاری بە (بیلیوس)یان بەخشی بوو، بەلەز لە شەرگەکەیان دوورخستەوە.

# سروودی حەڤدەیەم

## شەڕ لەسەر جەنازەکەی پاترۆکلۆس

**حیکایەتەکە:**

**مینیلاوس کە جەنازەکەی پاترۆکلۆس دەبینێ زۆر دڵتەنگ و خەمین دەبێت. دەچێتە پێشێ تا جەنازەکە، کە لەو دەشتە و لە نزیکی حەساری تەروادەییەکان کەوتووە، بپارێزێت. یوفورپوس هەوڵدەدات مینیلاوس لە پترۆکلۆس دوور بخاتەوە تا دەستکەوتەکان و میراتییەکانی بۆ خۆی بەرێ، بەتایبەتی کە جەنازەی برایەکەی یوفورپوس لەنك گریکەکان ماوەتەوە، بەڵکو بیگۆڕێتەوە لەگەڵ هەموو ئەو جەنازە تەروادەییانەی لەلای گریکەکانن. هەموو تەروادەییەکانیش ڕادەی دۆستایەتی نێوان ئەخیل و پاترۆکلۆس دەزانن و دڵنیان کە ئەخیل هەر سەربەهایەك(فدیە) کە تەروادەییەکان داوای بکەن، لە پێناوی پاترۆکلۆسدا دەیدات. ئیدی مینیلاوس، یوفورپوس دەکوژێت. ئەپولۆ زۆر لە چۆنیەتی داماڵینی چەك و ئەسلەحەکەی لەلایەن (مینیلاوس)ەوە پەست دەبێت. شێوازێکی دزێو و ناشرینە و خواوەندان پێی قاییل نابن، بۆیە چوو بۆ لای هیکتۆر و زات و غیرەتی نایەبەر، هێرشی بردە سەر مینیلاوس، مینیلاوس پاشەکشەی کرد و کەوتە سۆراغی ئەجاکس تا هیکتۆر جەنازەکەی پاترۆکلۆس نەبات. لێ هیکتۆر زرێ و ئەسلەحەکەی پاترۆکلۆسی داماڵی و ڕایکێشایە لایەکەوە، تاسەری ببڕێت و لاشەکەی فڕێ بداتە بەر کسۆکانی تەروادە. لەم ماوەیەدا مینیلاوس لەگەڵ ئەجاکسدا دەگەڕێتەوە، هیکتۆر دوور دەکەوێتەوە وفریا ناکەوێ سەری پاترۆکلۆس ببڕێت. میرئاخۆر و گالیسکەڕانەکەی پاترۆکلۆس زۆر خەمین دەبێت، هەروەها ئەسپە ئاسمانی نەژادەکانیشی دڵتەنگ دەبن و بۆی دەگرین، زیوس دڵی پێیان دەسوتێ و سێبوریان دەداتەوە. شەڕ لەنێوان گریك و تەروادەییەکان هەڵدەگیرسێت و زۆر کەس بەسەر جەنازەکەی پاترۆکلۆسەوە دەکوژرێن. مینیلاوس تەتەرێك دەنێرێ هەواڵ بگەیەنێتە**

ئەخیل کە هاوڕێ ئازیزەکەی کوژراوە و لە بن حەساری تەروادەییەکاندا کەوتووە، بەو مەبەستەی کە گوایە هەر کە ئەخیل هەواڵەکە بژنەوێ یەکسەر دێتە مەیدان. بەڵام لەوە غافڵ بوو کە ئەخیل تەنیا بەزرێ و سپەر و ئەسلەحە تایبەتییەکەی خۆیەوە دێتە مەیدان. جا کە هیکتۆر دەستی بەسەر ئەو چەکەدا گرتبوو، بۆیە هاتنە مەیدانی ئەخیل نەدەچووە ئەقڵەوە. لە ئەنجامدا گریکەکان دکارن جەنازەکە هەڵگرنەوە و لەو گالیسکەیەی بار بکەن کە جووتێك ئەسپی ئاسمانی نەژادیلەژێردا بوو. بەپەلە بۆ دەف کەشتییەکانی دەبەن و گریکەکان پاشەکشە دەکەن و تەروادەییەکان تا ئەودیوی حەسارەکە ڕاویان دەنەن و زیانێکی گیانی زۆریان لێ دەدەن.

زەمەن:

بویەرەکانی ئەم سرووده بەگوێرەی گێڕانەوە هۆمەرییەکە لە ڕۆژی بیست و هەشتەمدا، دوای خۆرئاوا و بەرلەوەی تاریکی بەتەواوەتی باڵ بەسەر شەرڤانەکاندا بکێشێت، ڕوودەدەن.

شوێن:

دەشتەکەی نێوان تەروادە و کەنارەکەیە، واتە دەوروبەری خەنەکەکە و حەسارەکە و کەشتییەکان.

(١)مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس، خۆشەویستی ئێریس کە بینی پاترۆکلۆس لە مەیدانی شەڕدا وبەدەستی تەروادەییەکان کوژراوە، لەنێو جەنگاوەرانی ڕیزی پێشەوە وەدەرکەوت، بەبریسکە بریسکی سپەر و ئەسلەحەکەیەوە بەرەو لای پاترۆکلۆس چوو، لاقی بەسەر جەنازەکەیدا بڵاوکردنەوە، وەکو چۆن نۆنگینێ بەدەوری نۆبەرەکەیدا دەسوڕێتەوە و هیچ پێشینەیەکی دایکایەتی نییە، و بەدەم ژانەوە دەبۆڕێنێ.. (مینیلاوس)ی پۆرزەردیش بەو ئاوایە نێزە بەدەست و سپەرلەبەر هەردوو لاقی بەسەر جەنازەکەی پاترۆکلۆسدا بڵاوکردەوە و ئامادەبوو هەر کەسێك کە بخوازێ جەنازەکەی ببات بیکوژێت. لێ کوڕەکەی (پانتوس)ش کە نێزەیەکی بتەوی گەزیچاری بەدەستەوە بوو، لە مەرگی پاترۆکلۆسی بێ وێنە غافڵ نەبوو، هاتە نزیکەوە و ڕوویکردە (مینیلاوس)ی خۆشەویستی ئێریس و گوتی: (ئەی مینیلاوس)ی کوڕی ئوتریوس، ئەی نەوە و نەتیرەی زیوس، ئەی ڕابەری قۆشەنان.. واز لەم جەنازەیە بێنە. دەستبەرداری چەك و ئەسلەحە خوێناوییەکەی ببە. هیچ کەسێك لەتەروادەییەکان و هاوپەیمانە بەناوبانگەکانیان، لە شەڕاو بەر لە من پاترۆکلۆسی بریندار نەکردووە. جا وازبێتە با ناوێکی باش لە ناو تەروادەییەکاندا دەربکەم، دەنا دەتکوژم و لە ژیانی شیرینت، شیرین وەکو هەنگوین، دەکەم."

(١٨) هەنگی مینیلاوسی پۆرزەرد، کەڵلەیی بوو و هاواری کرد: "ئەی زیوسی بەتوانا، بەخۆت دەزانی غرور و بەخۆ نازین کارێکی شایستە نییە، نە پڵنگ، نە شێر، و نەبەرازە کێوی کە ڕقێکی هۆڤیان لە دڵدایە، بەئەندازەی کوڕانی پانتوس، کوڕانی نێزە بەدەست و ڕمباز بەهێز و توانای خۆ ناخورن و نانازن. تەنانەت (هیپرنور)ی براتیش بەو کەڵلە ڕەقییە تیاچوو و خێری لە جوانی خۆی نەبینی، کاتێ بەدەم جوێن و قسەی سوکەوە هێرشی بۆ هێنام وایدەزانی بودەڵەترین جەنگاوەری ناو دانابیەکانم. بۆیە فریا نەکەوت بەپێی خۆی بۆ وڵات بگەڕێتەوە و خۆشی بخاتە دڵی ژنەکەی و داك و بابە مەزنەکەیەوە. پێموایە ئەگەر تۆش لەڕووم بوەستی بەهەمان دەردت دەبەم و دەتکوژم. جا بۆ ئەوەی توش نەبی، و بەرلەوەی کار لەکار بترازێ ژێربە و بگەڕێوە بۆ ناو جەماعەتی خۆت.

(٣٤) یوفروبۆس گوێی بەقسەکانی نەدا و گوتی: "بەڕاستی مینیلاوس، ئەی زیوسزادە، ئێستا کاتی ئەوە هاتووە تۆڵەی خوێنی براکەم بدەی. کە زۆرت شانازی بەکوشتنییەوە کرد، ڕاستە ژنەکەیت بەتازە بووکی بێوەژن کرد، خەمێکی لە ڕادەبەدەرت خستە دڵی داك و بابیەوە، من کارێکی وەها دەکەم کە ببێتە سێبوری دڵی ئەو نەگبەتانە، ئەگەر بەخت

یار و یاوەرم بێ و سەری تۆ وچەك و ئەسلەحەکەت بەرم و بیخەمە بەردەستی (پانتوس وفرۆنتیس)ی هەژی.

جا وەختی ئەوە هاتووە، ئەم حیسابە پاك بکەینەوە و شەڕێکی لەسەر بکەین، ئیدی خوا یا بەمنی دەدا یان بە تۆ!"

(٤٣) هەر کە ئەو قسانەی کرد، ڕمێکی کێشا بەسپەرە بتەوەکەی مینیلاوسدا، لێ نێزە برونزییەکە سپەرەکەی نەبڕی و نوکەکەی چەمییەوە. هەنگێ مینیلاوسی کوڕی ئۆتریوس بەدەم ویرد و نزاوە بۆ زیوسی بابی، بەنێزەکەیەوە پڕیدایە یوفورپوس، لەو کاتەدا کە دەگەڕایەوە، مینیلاوس نێزەیەکی بە ئەوکیدا کرد. بەهەموو هێزییەوە پاڵی بەنێزەکەوەنا، نێزە بڕندەکە، گەرووە ناسکەکەی دیواودەرکرد، بەدەم تەق و هوڕی زرێ و چەك و ئەسلەحەکەیەوە کەوتە سەر زەوی. قژی کە وەکو پۆڕی خواوەندانێکی شاد وابوو، و بەتەوقە و قردێلەی زێڕ و زیو بەسترابوو، خڵتانی خاك و خوێن بوو. وەکو چۆن دار زەیتونێکی جوان، نەمامێکی ناسك، کە پیاوێك لە شوێنێکی دوورە دەستی چۆڵ و فرە ئاودا ڕواندبێتی و لق و پۆپەکەی بۆ خۆ پاراستن بەدەم هەموو بایەکەوە بێ و بچێت و لەو کاتەدا کە سەراپا لە شکۆفەدا سپی بچێتەوە، لەپڕ گێژەڵوکە و باهۆزێکی سەرکێش بێت و ڕیشەکێشی بکات و تەختی زەوی بکات. (مینیلاوس)ش بەو ئاوایە یوفروبوسی ڕمبازی بەناوبانگی کوشت و لە چەك و ئەسلەحەکەی ڕووتی کردەوە. یان وەکو چۆن شێرێکی کێوی پشت قایم بەهێز و توانای خۆی، پەلاماری باشترین گوێرەکەی ناو گاگەلێك دەدات، لە پێشا ملی دەشکێنێ و ئەوجا خوێنەکەی دەمژێ و هەموو جەرگ و هەناوەکەی دەخوات و گاوان و کسۆکان بەهەرا و زەنا و حەپە حەپ دوورا و دوور دەوری دەگرن، لێ ناوێرن پەلاماری بدەن، و ڕەنگیان زەرد هەڵدەگەڕێ، بەو ئاوایە هیچ تەروادەییەك زاتی نەدەکرد بچێ ڕووبەڕووی مینیلاوس ببێتەوە: خۆ ئەگەر کوڕەکەی ئوتریوس بەشێوەیەکی ئاسایی زرێکەی کوڕی پانتوسی داماڵی بوایە، هەرگیز ئەپولۆی تورە نەدەکرد و نەدەچوو هیکتۆری لێ هانبدات تا پەلاماری بدات. ئەوە بوو خۆی خستە پێستی (مینتیس)ی سەرداری کیکونیان و چوو بۆ لای هیکتۆر و پێی گوت: "ئەی هیکتۆر تۆ بەخۆڕایی دوای شتێك کەوتووی کە نایگەیتێ، تۆ لە دووی ئەسپەکانی کوڕی (ئیکوس)ی بەردەباری، ئەمە خەیاڵە، چونکە هیچ بەشەرێکی فانی ناتوانێ ڕامیان بکات تەنیا ئەخیل نەبێ، ئەویش لەبەرئەوەی دایکی یەزدانخانمە. جا ئەوەتا مینیلاوسی کوڕی

ئۆتریوس، پارێزگاری لە جەنازەکەی پاتورکلۆس دەکات، یوفورپوسی کوڕی بانتوس، شامێری تەروادەییانی کوشتووە."

(٨٢) دوای ئەو قسانە، خواوەند خۆی بەشەڕگەکەدا کردەوە. بەڵام هەورەتەمی خەمێکی بەسوێ لە ڕوحی هیکتۆر ئالا بوو. ڕوانییە ڕیزی جەنگاوەرەکان، سەیری کرد یوفورپوس لە عاردی کەوتووە وهێشتا خوێنی لەبەر دەڕوات و مینیلاوس زرێ و ئەسلەحەکەی لێ دادەماڵێت. هیکتۆر کە سەراپای لە چەك و ئەسلەحەدا دەبریقایەوە، لە نەعرەتەی داو بەهەشتاو دڕی بەریزەکانی پێشەوە داو لە تۆ وایە مەشخەڵی هیفایستوسە و کەس ناتوانێ بەری پێ بگرێت و دایمرکێنێتەوە. کوڕەکەی ئۆتریوس گوێی لە نەعرەتەکەی بوو، زۆر شڵەژا و ترسی لێنیشتو لە دڵی خۆیدا گوتی: "جا چ بکەم؟ ئەگەر من ئەم چەکە مەزنانە و پاتروکلۆس، کە لە پێناوی کەرامەت و سەربەرزی مندا کوژراوە لەو گۆڕەدا بەجێبێڵم، ئەوا دەترسم دانابیەکان بمدینن و لێم بچن بەقینا و بڵێن داوەشێی پیاو!، ئەگەر بەتەنێ و لە پێناوی کەرامەتدا شەڕی هیکتۆر و تەروادەییەکان بکەم، دەترسم لە هەموو لایەکەوە گەمارۆم بدەن، ئەوان زۆر و من تەنیا باڵ، چونکە هیکتۆری خودەرەخشان هەموو تەروادەییەکان بەرەو ئێرە دێنێ، نازانم بۆچی دوودڵم؟ هەر جەنگاوەرێك دژی ویستی خوا بوەستێ و شەڕی جەنگاوەرێك کە خواوەندێك پشتیوانی لێ بکات، ئەوا بەڵایەکی گەورەی بەسەردا دێت و ژێوان دەبێتەوە. بۆیە هیچ یەکێك لە دانابیەکان لۆمەم ناکات ئەگەر بدینێ لە بەرانبەر هیکتۆر هەڵهاتووم. چونکە خواوەندان یار و یاوەرین. لەگەڵ ئەمەشدا ئەگەر بتوانم ئەجاکسی نەعرەتەکێشی مەیدانی شەڕان وەدۆزم، ئەوسا بەدوو قۆڵی دەگەڕێینەوەو نەك شەڕی هیکتۆر، شەڕی خواش دەکەین تا جەنازەکەی پاتروکلۆس ڕزگار بکەین و بیدەینەوە بەکوڕەکەی بیلیوس و ئەمە لە هەموو مەترسییەکانی دیکە ئەهوەنترە."

(١٠٦) ئەو لەم بیرانەدا بوو کە هێزی تەروادەییەکان بەرابەرایەتی هیکتۆر هێرشیان هێنا. مینیلاوس ناچار پاشەکشەی کرد و جەنازەکەی بەجێهێشت. وەکو چۆن پیرە شێرێکی تووکن کە کسۆکان و شوانان لە ئاغەڵێك بەزەبری نێزە و هەرا و زەنا وەدەری دەنەن، بەداخ وکەسەرەوە و بەدەم هەڵاتنی ناچارییەوە جارجارە ئاورێك دەداتەوە، مینیلاوسی کوڕی (ئۆتریوس)ش بەهەمان شێوە هەڵات و لاشەکەی پاتروکلۆسی بەجێهێشت. کاتێ گەییشتەوە ناو ئاپۆڕەی هێزەکانی خۆیان کەوتە نۆڕین و ملەقوتێ بەدوای ئەجاکسی

جوامێری کوڕی تیلاموندا. زوو بەزوو لە قۆڵی چەپی شەڕگەکەدا بەدی کرد، کە شەڕی دەکرد و هاوڕێکانی بۆ شەڕ و خۆراگری جۆشدەدا، چونکە ئەپولۆ ترسێکی زۆری تیا بێوکردبوونەوە.

(١١٨) بەهەشتاو چوو بۆلای و گوتی: "ئەجاکس، ئەی هاوڕێی دڵسۆز.. خێرا وەرە لەگەڵم بافریای جەنازەکەی پاترۆکلۆس بکەوین، بەڵکو بتوانین جەنازەکەی هەڵگرینەوە و بۆ ئەخیلی بەرینەوە، هەرچەندە هیکتۆری کێوڕەخشان، چەك و ئەسلەحەکەی لێ داماڵیوە و بردویەتی."

(١٢٢) ئەجاکس بەو قسانە جۆشی سەند و خێرا لە ڕیزی جەنگاوەرەکانی پێشەوە هاتەدەرێ و لەگەڵ مینیلاوسی پۆڕزەردا وەڕێکەوتن. هیکتۆر، کە چەکەمەنی و ئەسلەحەکەی لە جەنازەکە داماڵی بوو، خەریك بوو جەنازەکەی ڕادەکێشا کە دووری بخاتەوە تا بەبرونزی برندە سەری لەلاشەکەی جیابکاتەوە و لاشەکەی فرێ بداتە بەر سەگانی تەروادە. بەڵام ئەجاکس، بەخۆ و قەڵغانەکەیەوە کە دەتگوت شورەو حەساری شارە، هاتە بەرەوە. هیکتۆر پاشەکشەی کرد و بۆ ناو ئاپۆرەی هاوڕێکانی گەڕایەوە. خۆی هەڵدایە سەر گالیسکەکەی، چەك و ئەسلەحە نایابە تالآنییەکەی دایە دەست تەروادەییەکان تا وەکو نیشانەی شانازییەکی گەورە بۆ شاری بەرنەوە. ئەجاکس بەدیار کوڕەکەی (مینویتیوس)ەوە وەستاو بەقەڵغانەکەی خۆی داپۆشی، وەکو چۆن شێرێك، کۆمەڵە ڕاوچییەك لە بێشەیەکدا تووشی دەبن، و بەدیار شەپاڵەکانییەوە، دەوەستێ و بەهێز و توانای خۆیەوە دەنازێ، و برۆکانی وێك دێنێتەوە و چاوەکانی دادەپۆشێت. بەو شێوەیە ئەجاکس بەرگری لە پاترۆکلۆسی جەنگاوەر کرد و خۆی بەسەر جەستەکەیدا دابوو و مینیلاوسی کوڕی (ئوتریوس)ش لەلایەوە بەدڵێکی پڕ لە پەژارە و کەسەرەوە وەستا بوو.

(١٤٠) ئەوجا گلۆکوسی کوڕی هیپولوخۆس، ڕابەری لیسیان، بەتوڕەییەوە مۆرەیەکی لە هیکتۆر کرد و ئەم قسە توند و ناخۆشانەی پێ گوت: "هیکتۆر تۆ بە ڕواڵەت هیچت نەهێشتووەتەوە و شامێری مەیدانی، بەڵام لەشەڕا هیچ نیت.. تۆ بەخۆڕایی ئەم هەموو ناوەت دەرکردووە، تۆ بابایەکی ترسنۆکی بودەڵەی، جا ئێستا بیر لەوە بکەوە کە چۆن بەخۆت، بەبێ ئەوەی بەتەمای خەڵکانی دەریێ تەروادەبی، شارەکەت، نیشتمانەکەت ڕزگار بکەی. چونکە چیتر لیسیان لە پێناوی شاردا ناچنەوە شەڕی دانابیان، چونکە

وادیارە شەڕی بەردەوامی ئێمە دژی دژمنانی ئێوە بێهودەیە، ئاخر هەی بێ نەوا، تۆ چۆن دەتەوێ بەهەر نرخێ بووە کەسێکی ناوبزر، کەم پایەتر لە سارپیدون لەگەرمەی ئاگربارانی شەڕدا دەرباز بکەیت، لە کاتێکا دەست بەرداری سارپیدۆنی میوان و هاوسەنگەرت بوویت، کە ببێ بەقوربانی و نێچیری دەستی داناییەکان؟.. دەستبەرداری کەسێك بوویت، کە تا ئەو کاتەی ژیا، بۆ ئێوە، بۆ شار و بۆ تۆ، یار و یاوەرێکی بەرجەستە و دیار بوو.. ئەوەندەت غیرەت و شەهامەت نەبوو کە لە چنگی کسۆکانی دەربێنی!جا ئەگەر لیسیان بەگوێی من بکەن لە ئێستاوە بۆ وڵاتی خۆ دەگەڕێینەوە و تەروادەش دەدەینە دەست چارەنووسی خۆیەوە و باوێران بێ. بەڕاستی ئەگەر تەروادەییەکان شەهامەت و بوێری ئەو کەسانەیان هەبووایە کە لە پێناوی وڵاتی خۆدا دەخەبتن و بەگژی دژمندا دەچن،

(١٥٧) ئێستا حەوت زەمان بوو (پاتروکلۆس)مان بردبووە ناو شاری ئیلیون (تەروادە)وە، ئەگەر بمان توانیبا ئەو پیاوە، واتە جەنازەکەی ئەو پیاوە بۆ شارەکەی شا پریامی مەزن بێنین و لە شەڕەکەی دوور بخەینەوە، هەڵبەتە ئارگوسییەکان یەکسەر چەك و ئەسلەحە و جەنازەکەی (سارپیدون)یان بۆ دەگێڕاینەوە. چونکە یار و خولامی جەنگاوەرێکی کوشتووە کە لە دلاوەری و مێرخاسیدا لەهەر هەموو ئەو ئاخیانەی کە کەشتییەکانیان سەرانسەری کەنارەکەی داگیرکردووە، زیاترە. کەچی تۆ نەوێرای لە شەڕێکدا کە لەسەر تۆ و لە پێناوی تۆدا دەکرێ، بەگژ ئەجاکسی گەڕنۆسدا بچی، هەر تەماشای چاویشی بکەی، چونکە زۆر لە تۆ ئازاترە!"

(١٦٩) هیکتۆر تووڕە بوو، برۆکانی وێك هێنانەوە و گوتی: "ئەی گلاوکۆس، تۆ پیاوێکی مەزنی، من بەتەمای ئەم قسە ڕەقانە نەبووم لەتۆ، بۆچی بەو غرورەوە قسان دەکەی؟ دۆستی ئازیز، من لە دڵی خۆمدا دەمگوت تۆ لەهەر هەموو دانیشتوانی لیسیای ئاوەدان و پڕ فەڕ و بەرەکەت بەئاوەزتر وبەردەبارتری، لێ ئێستا، دوای ئەوەی گوتت کە من لە ئەجاکس دەترسم، گومانم لە بەردەباریت پەیداکرد.. من هەرگیز لە شەڕ و لە هەرا و هەنگامەی گالیسکان نەترساوم. بەڵام ویست و ئیرادەی زیوس لە هەمووان بەهێزترە، زیوس زۆرجار پیاوی ئازاو بوێرترین جەنگاوەر دووچاری هەڵاتن دەکات تا سوك و ئاسان سەرکەوتن و سەرفرازی لە دەست بدات.. کەچی هەر خۆی جارێکی دی بۆ شەڕ و کوشتاری هاندەداتەوە.. جا برادەری ئازیز وەرە لای منەوە و تەماشا بکە تا بزانی کە من بەدرێژایی ئەم ڕۆژە وەکو تۆ دەڵێی ترسنۆك بووم، یان ئازاترین جەنگاوەری دانایی لە

بەرانبەر مندا ناتوانێ پاسی جەنازەکەی پاترۆکلۆس بکات."

(١٨٣) دوای ئەو قسانە بەدەنگی بەرز تەروادەییەکانی بۆ شەڕ دەنگدا وگوتی: "ئەی تەروادەییان، لیسیان، داردانیان، ئەی کوڕانی تەنگانە و شەڕی دەستە ویەخە، پیاوبن و بیر لە تۆڵە بکەنەوە، مەردانە شەڕ بکەن تا من چەك و ئەسلەحەکەی ئەخیلی بێ وێنە بپۆشم.. ئەو چەك و ئەسلەحە جوانەی کە لە پاترۆکلۆسی گەڕناسم گرت، دوای ئەوەی کە کوشتم."

(١٨٨) هیکتۆری کێوڕەخشان، دوای ئەو قسانە لە مەیدانی شەڕەکە دوور کەوتەوە، بەغاردان دوای ئەو هاوڕێیانەی کەوت کە زرێکەی ئەخیلیان بۆ تەروادە دەبردەوە. زۆر دوور نەکەوتبوونەوە. لە دووری شەڕەکە، لە دووری ئەو سەرچاوەی فرمێسك و ئاە وناڵەیە وەستا، چەك و ئەسلەحەکەی خۆی کردەوە و دای بەشەرڤانانی تەروادەیی، تا بۆ تەروادەی پیرۆزی بەرنەوە، بەخۆیشی چەك و ئەسلەحەکەی ئەخیلی کوڕی بیلیوسی پۆشی.. ئەو چەك و ئەسلەحەیەی کە خواوەندان بەدیاری دابوویان بە بیلیوس. ئەویش کە پیر بوو بوو دابووی بەکوڕەکەی (ئەخیل). جا کوڕەکەی هەرچەندە هەمان جلوبەرگی جەنگی پۆشی، بەڵام نەگەییە تەمەنی پیری!

(١٩٨) کاتێ زیوسی هەورەوان و خێوی گێژەڵوکان لە دوورەوە هیکتۆری بینی چەك و ئەسلەحەکەی ئەخیلی نیمچە خواوەند دەپۆشێت، سەرێکی بۆ لەقاند و لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئاە، ئەی کڵۆڵی نەگبەت!.. هەرگیز بیر لە مەرگی خۆت ناکەیتەوە، کەسات بەسات لێت نزیکتر دەبێتەوە، بیر لە مەرگی خۆت ناکەیەوە و چەك وئەسلەحەی خودایانەی پیاوێك دەپۆشیت کە هەموو جەنگاوەران لەبەری دەلەرزن. تۆ یاوەرە میهرەبان و دلێرەکەیت کوشت، بەشێوەیەکی ناشایستە چەك و ئەسلەحەکەت لەسەر وشانی داماڵی، بەهەرحاڵ بۆ ماوەیەك هێز و توانایەکی گەورەت پێ دەبەخشم، ئەمەشم لەبری ئەوەیە کە هەرگیز لە شەڕ ناگەڕێیتەوە و ئەندروماك چەك و ئەسلەحەکەی کوڕی (بیلیوس)ت لە دەست وەرناگرێت."

(٢٠٩) کوڕی کرۆنۆس ئەو قسانەی کرد و برۆ چڕ و پڕەکانی وێك هێنانەوە. هیکتۆر زرێ و ئەسلەحەکەی ئەخیلی پۆشی و رێك لەبەریا وەستا، ئەوجا ئێریسی خواوەندی شەڕڤانی و سامناکی ،خۆی وەبن پەڕەی ڕوحیا کرد. سەراپای بوو بەهێز و جۆش و خرۆش و ئازایەتی. ئەوجا بەرەو لای هاوپەیمانە بەناوبانگەکانی کەوتەڕێ بەچەك و ئەسلەحە

ڕەحسانەکەیەوە دەتگوت کوڕە جوامێرەکەی (بیلیوس)ە، هیکتۆر بەسەر جەنگاوەرەکانا دەگەڕا و قسەی لەگەڵ یەك بەیەکیاندا دەکرد و هانی دەدان: میستلیس، گلاوکۆس، میدون، تیرسیلوخوس، ستیروپایوس، دیسینور، هیپوتوس، فورکیس، کرومیوس، و ئینوموسی لێزان و پێشگۆ هەر هەموو ئەوانەی بەم قسە گەرمانە جۆشدا وگوتی: "گوێ بگرن ئەی دراوسێیان، ئەی ئەوانەی بەهەزاران لە دەڤەرەکانی دەوروبەرەوە هاتوون، من هەر بۆ کەیف و هەوەس لێرەم خڕ نەکردونەتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەم بانگ کردوون، کە بەخواستی دڵ، هاوڕێ لەگەڵ مندا ژنان و منداڵانی تەروادە، لە چەپۆك و ئاسیوی ئاخییایی شەڕانی بپارێزن.. جا بەو نیاز و مەبەستە من هەموو شتێکم لە دەمی خەڵکی وڵاتەکەم گرتووەتەوە تا ئێوە پۆشتە و پەرداخ و تێر و پڕ بن، خاوەنی دیاریی و سامان بن، ورە بەرز و دلێر و ئازابن.. دەیسا با هەر کەسە و لەلای خۆیەوە پەلاماری دژمن بدات، ئیدی یا دەمرێ یا دەژێ، ئەمە سونەتی گەمەی شەڕە، نهێنی لەزەتی شەڕ لەمەدایە. هەر کەسێك جەنازەکەی پاتروکلۆس بێنێ و بیگەیەنێتە ناو تەروادەییانی سوارچاك، و ئەجاکس ببەزێنێ، من دەسکەوت و تاڵانییە جەنگییەکانی برا بەش لەگەڵدا بەش دەکەم.. ئەمە جگە لەوەی کە لە شکۆ و سەربەرزیشدا دەبێ هاوتراز و هاوتای من."

(٢٣٣) هەر کە ئەو قسانەی کرد، هەموو دەستبەجێ، نێزە بەدەست کەوتنە هێرش بۆ سەر داناییەکان، هەر کەسە و لەدڵی خۆیدا لێبڕا بوو کە ئەم تاڵانییە گەورەیە لە دەستی کوڕەکەی تیلامۆن دەربێنێ. لێ ئەمە خەیاڵ پڕوێکی گەوجانە بوو، چونکە ئەجاکس هەر وا بەئاسانی دەستبەردار نەدەبوو، و خەڵکێکی زۆری لێ دەکوشتن و دەبوو ژیانی خۆ لەسەر ئەو جەنازەیە دابنەن! ئەوجا ئەجاکس ڕوویکردە مینیلاوسی گەڕناس و گوتی: "ئەی مینیلاوس، ئەی هاوڕێی دڵسۆز، ئەی نازپەروەردەی زیوس.. پێم وانییە ئێمە، هەردووکمان بەسەلامەتی لەم شەڕە دەرباز بین و بۆ وڵاتی خۆ بزڤڕینەوە.

(٢٤٠) من خەمی جەنازەکەی (پاتروکلۆس)م نییە کە بەو زووانە دەبێ بەتێشووی سیسارکە کەچەڵە و کسۆکانی تەروادە، بەڵکو خەمی تۆ و خەمی خۆممە. هیکتۆر و هێزەکەی سەرانسەری دەشتەکەیان داگیر کردووە و میناکی باهۆز هەموو لایەکیان لێ تەنیوین و لەوە دەچێت فەوتان و لەنێوچوونمان مسۆگەر بێت، بەڵام وێڕای ئەمەش ئەگەر دەنگت بڕ دەکات، بانگی ئازاترین جەنگاوەرانی دانایی بکە با فریامان بکەون."

(٢٤٦) ئەو قسانەی کرد. مینیلاوسی شێرە پیاوی مەیدان، بەگوێی کرد و بەدەنگی

بەرز هاواری کرد: "ئەی دۆستان، ئەی ئاقڵمەندان و پیاو ماقوڵانی ئارگوسی، ئەی هاو بەزمان و هاو سفرە و هاوخوانانی کوڕانی ئوتریوس، ئەی ئەوانەی لەسەر خەزێنەی گشتی لەگەڵ ئاگامەمنون و مینیلاوسدا بادەتان دەنۆشی، ئەی سەردارانی هێز و لەشکرە بەڕێزەکانتان، ئەی ئەوانەی کە زیوس سەرفرازی و شکۆی پێ بەخشیون! زۆر زەحمەتە بتوانم یەك بەیەك بتان ناسمەوە و بانگتان بکەم، چونکە شەڕێکی زۆر گەرم لە چوار دەورمە، بەڵام بەخۆتان بیر لەوە بکەنەوە، کە چەند شەرمەزارییە دەستبەرداری جەنازەکەی پاترۆکلۆس ببین و ببێ بەخۆراکی سەگانی تەروادەییان."

(٢٥٦) دوای ئەو قسانە، ئەجاکسی زەرۆپ، کوڕی ئیلیوس، یەکەم کەس بوو، گوێی لە هاوارەکەی بوو، بەر لە هەمووان و بەناوجەرگەی شەڕ و کوشتارەکەدا خۆی گەیاندێ. لەدوای ئەو ئیدومینیوس و میریونیسی یاوەری، میریونیسی هاوتای ئیریسی قڕکەری بەشەڕان بەدەنگییەوە چوون، ئیدی لەدوای ئەوانەوە کۆمەڵە جەنگاوەرێکی دیکە بەپەلە بەدەم هاوارەکەوە چوون و بەشداری شەڕەکەیان کرد، ئەوەندە زۆربوون، کێ دەتوانێ یەك یەك ناویان بەرێت؟

(٢٦٢) دوای ئەوە تەروادەییەکان، بەرابەرایەتی هیکتۆر هەموو بەجارێ هێرشیان برد. وەکو چۆن شەپۆلێکی گەورە لەڕێژگەی ڕوبارێکی خواییەوە هەڵدەستێ و بەهاژە هاژ سەری خۆی دەکێشێت بەتاوێرانی هەردوو بەری ڕوبارەکەدا و دەنگدەداتەوە. تەروادەییەکانیش بەهەمان شێوە و بەدەم هاتوهاوارەوە دەستیان بەهێرش کرد. لێ ئاخییەکان بەیەك دڵ و بەیەك گیان دەوری جەنازەکەی کوڕی (مینویتوس)یان گرت و قەڵغانە برونزییەکانیان بۆی کردە چەپەر. هەروەها زیوسی کوڕی کرونوس، کێوخودە ڕەخشانەکانیانی بەپەڵە هەورێکی تاریك داپۆشی، چونکە کاتێ کە کوڕەکەی مینویتیوس لە ژیانا بووو خولام و یاوەری کوڕەکەی ئیکۆس بوو، زیوس ڕقی لێی نەبوو، بۆیە پێی ڕەوانەبوو ئێستا پشتی تێ بکات و ببێ بەنێچیر و خۆراکی کسۆکانی نەیارە تەروادەییەکانی، بۆیە هاوڕێکانی هاندا تا بەرگری لێبکەن!

(٢٧٤) لەسەرەتادا تەروادەییەکان، پاشەکشەیان بەئاخییە چاوتیژەکان کرد، و بەترس و لەرزەوە جەنازەکەیان بەجێهێشت. بەڵام تەروادەییەکانیش نە توانیان هیچ کەسێك لە ئاخییەکان بکوژن و نە جەنازەکەش ببەن. بەڵام ئاخیاییەکان تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم بەو حاڵەوە مانەوە، چونکە ئەجاکس، ئەو ئەجاکسەی جگە لە کوڕەکەی بیلیوس، لەڕووی

چەلەنگی و ئازایەتییەوە سەرتۆپی هەموو داناییەکان بوو، هەر زوو گەڕاندنیەوە، (٢٨٠) و یەکسەر پەلاماری دژمنی داو دڕی بەهێزەکانی پێشەوەیان دا، وەکو چۆن بەرازە کێوییەك لە چیاو چۆڵاندا، لە بێشەیەکدا، پەلاماری ئەو ڕاوچی و سەگانە دەدا کە دێنە ڕێگەی و هەریەکەیان بەلایەکدا ڕاودەنێت، بەڵا بەو ئاوایە ئەجاکسی ڕەسەن، کوڕی شا تیلامون بەئاسانی پەلاماری هێزی تەروادەییەکانی داو زۆر زوو دڕی پێدان و بیۆوەی پێکردن، بە تایبەتی ئەو هێزانەی کە دەوری (پاتروکلۆس)یان دابووو بەتەمای ئەوە بوون جەنازەکەی بدزن و بۆ شارەکەی خۆیانی بەرنەوە تا خۆیانی پێوە بابدەن و هەڵنێن.لەو کاتەدا هیپوتوسی ناودار، کوڕی پیلاسیجی، لە گەرمەی شەڕەکەدا، حەمایلی شمشێرەکەی لە هەردوو لاقی جەنازەکە بەستبوو ڕایدەکێشا، تا بەمە دڵی هیکتۆر و تەروادەییەکان ڕازی بکات. بەڵام لەپڕ هەمان بەڵا و کارەساتی بەسەرهات کە پێشتر بەسەر ئەوانە هاتبوو کە دەیانویست جەنازەکە بڕفێنن. چونکە کوڕەکەی تیلامون دڕی بە جەنگاوەرەکان داو لە نزیکەوە نێزەیەکی کێشا بەکیۆخودە برونزییە ڕوپۆشدارەکەیدا، کیۆخودەکە بەرگەی ڕمە مکوم و درێژەکەی نەگرت و لە ئاستی نووکی نێزەکەوە دیواودەربوو، مێشکی پژا و لەگەڵ نووکی خوێناوی نێزەکەدا هاتەدەرێ.هەنگێ چوارپەلی سست بوو، دەستی لەلاقی پاتروکلۆسی گەرنۆس بەربوو. بەخۆیشی کەوت بەسەر جەنازەکەی پاتروکلۆسدا. بەو جۆرە دوور لە خاکی لاریسای ئاوا و ئاوەدان، مەڵبەندی فەڕ و بەرەکەت مرد و فریای ئەوە نەکەوت چاکەی داك و بابی، کە بەخودانیان کردبوو بداتەوە، چونکە تەمەنی کورت بوو و ئەجەلی بەدەستی ئەجاکسی فیلەتەن هات. ئەوسا هیکتۆر هاتە دەست، نێزە ڕەخشانەکەی خێواندە ئەجاکس. بەڵام ئەجاکس فریای خۆی کەوت، خۆی لەبەر ڕمەکە لادا، ڕمەکە ڕێك بەبناگوێیدا تێپەڕی و ڕمە ڕۆیی و بەر سخیدوسی کوڕی ئیفیتوس، سەرداری فوسیدیان کەوت، کە لە دەڤەری پانوپیوسی بەناوبانگ دەژیا و حوکمی ژمارەیەکی یەجگار زۆری خەڵکی دەکرد. ڕمەکە ڕێك بەر ئێسکی ملی کەوت، لە دەفەی شانییەوە دەرچوو، بەدەم تەق و هوڕی زرێ و سپەرەکەیەوە ڕمبەی لێوەات و کەوت.(ئەجاکس)ش لای خۆیەوە هاتە دەست و نیشانەی لە فورکۆسی کوڕی (فینوپس) گرتەوە، کە بەرگری لە جەنازەکەی هیپوتوس دەکرد. ڕمەکە تەختی زرێکەی دڕی و ورگ و ڕێخۆڵەی کەوتە ئەو گۆڕە و فۆرکوس کەوتە سەر زەوی و چنگە کرێی لە عاردەکە دەکرد. هەنگێ هیکتۆری ڕەخشان و هێزەکانی پێشەوە کەوتنە پاشەکشە و

ئەرگۆسییەکان کەوتنە هوراکێشان و هەردوو جەنازەکەی فورکوس و هیپوتوس)یان برد وجەنگەوزارەکانیان لە شانیان داماڵی.

(٣١٩) دەبوایە تەروادەییەکان، بەهۆی ترسنۆکی خۆیانەوە جارێکی دی لەبەر ئاخییانی خۆشەویستی ئیریس بۆ تەروادە هەڵێن، ئارگۆسییەکان، وێڕای ناقاییلی زیوس، خەریك بوو بەزەبری هێز و ورەبەرزی خۆیان سەرفرازی و سەرکەوتن بەدەست بێنن، گەر ئەپولۆ فریا نەکەوتبا و بەخۆی (ئیناس)ی هان نەدابا، ئەپولۆ خۆی دەگۆڕێ و لە شێوەی (پیریفاس)ی کوڕی (ئوبوتوس)دا کە هەموو تەمەنی وەکو هەواڵچی و خوڵام لە خزمەتی بابی ئیناسدا بەدڵسۆزی بەسەر بردبوو. دەچێتە لای ئیناس و دەڵێت: "ئیناس، ئایا ناتوانی، هەرچەند ئاسمانیش دژمان بێت، کارێکی وەها بکەیت ئیلیون (تەروادە) ڕزگار بکەی؟ من خەڵکانێك دەناسم، چونکە متمانەیان بەتوانای خۆ هەبووە، لە ئازایەتی خۆیان و گەل و سوپایان دڵنیابوون، وێڕای ناقاییلی زیوس، تەحەدایان کردووە و وڵاتی خۆیان پاراستووە.. هەرچەندە زیوس پتر خوازیاری سەرکەوتنی ئێوەیە تا دانایییەکان، کەچی بەخۆڕایی ورەتان بەرداوە و لەبەر دژمن هەڵدێن و ناجەنگن!"

(٣٣٤) ئینیاس کە چاوی بڕی بووە خاوەنی ئەو قسانە، یەکسەر ئەپولۆی ناسییەوە. بانگی لە هیکتۆر کرد: "هیکتۆر، ئەی سەرانی تەروادەیی و هاوپەیمانان، بەڕاستی شەرمەزارییە بۆ ئێمە، لەبەر ئاخییانی، خۆشەویستێن ئیریس، ترسنۆکانە بڕەڤێن و بەرەو تەروادە ببینەوە. یەکێك لەخواوەندەکان، کە ئێستا لەلاما وەستاوە، پێی ڕاگەیاندم کە زیوسی سەرداری خواوەندان و بەشەران هێشتاش لەشەڕدا پشت و پشتیوانی ئێمەیە، جا باڕاستە و ڕاست پەلاماری دانایییەکان بدەین و نەیەڵێن جەنازەکەی پاتروکلوس هەڵگرنەوەو بەئاسانی بۆ لای کەشتییەکانیانی بەرنەوە."

(٣٤٢) دوای ئەو قسانە، بەپەلە خۆی گەیاندە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکان، کە هەموو گەڕانەوە و ڕووبەڕووی ئاخییەکان بوونەوە. ئینیاس ڕمێکی سرەواندە (لیوکریتوس)ی کوڕی (ئەریسباس)ی خوڵام و یاوەری (لیکومیدوس)ی جوامێر، لکومیدوسی دۆستی ئیریس کە بینی کەوت زۆری بەزەیی پێداهاتەوە، بۆیە خۆی گەیاندێ، بەڕمە ڕەخشانەکەی ئەبیسارۆنی سەرلەشکری کوڕی (هیباسوس)ی لەناوقەدەوە ولەژێرناوکیا پێکا. یەکسەر قەڵەمی ئەژنۆی شکا. ئەپیسارون لە بونیای مەڵبەندی پیت و بەرەکەتەوە هاتبوو، جگە لە ئەستیروپایوس لە هەموو ئەوانی تر شەڕڤانتر و ئازاتر بوو. هەنگێ ئەستیروپایوس،

ئەکانی دا کە تۆڵەی بکاتەوە، بەڵام بێ سوود بوو

(٣٥٥) بەڵام فایدەی نەبوو، چونکە ئەوانەی دەوری جەنازەکەی (پاترۆکلوس)یان گرتبوو، بەسپەرەکانیان قەڵایەکیان لە دەوری دروست کردبوو و هەموو نێزە بەدەست بەرگرییان لێدەکرد. ئەجاکس، نەترس و بێباك لەلای ئەم جەنگاوەرەوە دەچوو بۆلای ئەو جەنگاوەر و پەیتا پەیتا داوای لێدەکردن کە پاشەکشە نەکەن، لە هاوڕێکانیان دانەبڕێن و کەس لەپێش کەسەوە هەر بۆ خۆنواندن پەلاماری دژمن نەدات. بەڵکو دەبێ یەك ڕیز لە دەوری جەنازەکە وەمێنن و شەڕی دەستە و یەخە بکەن. بەو جۆرە بوو فەرمانی ئەم قارەمانە زەلامە. خوێن وەکو جۆبیارێکی ئەرخەوانی عاردی گرت. جەنازەی کوژراوانی هەردوولا لەسەر یەکدی کەڵەکە بوو. چونکە دانایەکانیش شەڕێکی خوێناویان دەکرد، ئەگەرچی ژمارەی کوژراوانی ئەمان زۆر لە هی دژمنەکانیان کەمتر بوو. چونکە ئەمان یەکریزتر بوون و لە خەمی ئەوەدا بوون بەرگری لە یەکتر بکەن و مەرگ لەیەکتری پاس بکەن.

(٣٦٦) بەو جۆرە وەکو ئاگرێکی هەڵایساوی بەنێڵە نێڵ، تورە و ترۆ پەلاماری یەکتریان دەدا، گەرد و تۆزی شەڕ بەجۆرێ بەری ئاسمانی گرتبوو، نەتدەزانی شەوە یان ڕۆژ. چونکە نە هەتاو دیار بوو نە هەیڤ. هەموو فەرماندە و جەنگاوەرە مێرخاسەکان لەو بستۆکەیەدا شەڕیان دەکرد کە جەنازەکەی کوری (مینوتیوس)ی لێکەوتبوو.لێ تەروادەیی و ئاخییەکانی دی، کە سەراپا چەکدار بوون، زۆر بەشێنەیی و کاوەخۆ لە هەوای ئازادا و لەبەر تیشکی هەتاودا شەڕیان دەکرد. ئاسمان ساف و سایەقە، نە لە دەر و دەشتانەوە و نە لە کێوسارانەوە پەڵە هەورێك نەدەبینرا. ئەوانە ناو بەناو ئیسراحەتێکیان دەکرد و ئەوجا دەستیان بەشەڕ دەکردەوە و خۆیان لە ڕم و پەیکانی یەکدی دەپاراست.. و لە یەکترەوە دووربوون.واتە دوورە شەڕیان دەکرد. بەڵام ئەوانەی لە ناوجەرگەی شەڕەکەدا بوون کە تاریکی و مەرگ لەیەك کاتدا دەوری گرتبوون، زۆر پەریشان بوون و برونزی دڵرەق سینگی بێ باکترین فەرماندە و جەنگاوەری هەڵدەدری. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دووان لە جەنگاوەرە هەرە بەناوبانگەکان، تراسومیدیس و ئەنتیلوخوس، هێشتا نەیاندەزانی کە پاترۆکلۆسی کەڵەمێر کوژراوە، بەڵکو وایاندەزانی هێشتا زندووە و لەڕیزی پێشەوەی هێزەکانیانەوە شەڕی تەروادەییان دەکات. ئەو دووانە لە شوێنێکی دوور شەڕیان دەکردو خەمی گەورەیان ئەوە بوو هاوڕێکانیان لە مەرگ بپارێزن و بەگوێرەی فرمانی نەستور کە ناردبوونی بۆ شەڕ، تا شەڕ لە کەشتییەکان دوور بخەنەوە.

(٣٨٧) بەدرێژایی ئەو ڕۆژە شەڕێکی بێ ئامان کرا. لاق و ئەژنۆ و پێی جەنگاوەرەکان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو..هەروەها دەست و بازوو وچاوانیان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو، و هەردوو لەشکر لەسەر کوشتەی پاتروکلۆسی مەزن، خولام و یاوەری ئەخیل، شەڕیان دەکرد و لە خوێن و خۆڵ و ئارەقەدا غەرق بوو بوون. وەکو چۆن کۆمەڵە زەلامێکی بەهێز، بەهەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، کەوڵێکی تەڕ و فرە چەوری جوانەگایەکی زەلام، لەهەر چوار دەورەوە، و هەر کەس بەلای خۆیدا ڕایدەکێشێت تا ڕاییبخەن و ئاوەچك ببێ و چەوریيەکەی ببێ بەهەڵم و کەوڵەکە بەهەموو لایەکدا پان ببێتەوە.
(٣٩٣) بەهەمان شێوە هەردوو هێزە هەڤرکەکە، لە شوێنێکی زۆر تەنگدا کێشمانەکێش لاشەکەی پاتروکلۆسیان ڕادەکێشا، تەروادەییەکان بەئومێدی ئەوەبوون بۆ ئیلیونی ببەن و ئاخییەکان بەهیڤی ئەوە بوون بیگەیەننە لای کەشتییەکانیان. ئیدی شەڕێکی درندانەی ئەوتۆ لەسەر ئەو لاشەیە بەرپا بوو بوو کە نە بەئێریسی خواوەندی شەڕ و نە بەئەتینا، وێڕای ئەوەی زۆر لەو وەزعە تورە بوون. نەدەکوژایەوە!
(٤٠٠) زیوس، ئەو ڕۆژە، لە تۆڵەی پاتروکلۆسدا ئەو شەرە بێ ئامان و قورسەی بەسەر پیاوان و ئەسپاندا داسەپاند. ئەخیلوس هێشتا لە مردنی دۆستەکەی ئاگادار نەبوو، چونکە شەڕەکە لە دووری کەشتییەکان و لە بناری حەساری تەروادەییەکان بوو. بۆیە هەرگیز بەخەیاڵیش ئەوەی بەبیردا نەهاتبوو کە پاتروکلۆس مردبێ. بەڵکو لەو باوەڕەدا بوو کە بگاتە دەروازەکان، ئیدی لەسەر فەرمانی ئەو، دەگەڕێتەوە و بەسەلامەتی دێتەوە. ئەوی ڕاستی بێ ئەخیل بەهیچ جۆرێ تەسەوری نەدەکرد کە پاتروکلۆس بەبێ ئەو یان تەنانەت لەگەڵ ئەویشدا بتوانێ ئەو شارە بگرێ و وێرانی بکات. چونکە دایکی کە جار جارێ بەتەنێ لەگەڵیا دادەنیشت ئەمەی پێ گوتبوو و لە نیاز و مەبەست و حیکمەتەکانی زیوسی مەزنی ئاگادار کردبووەوە. بەڵام دایکی تا ئێستا هیچ شتێکی لەمەڕ ئەم کارەساتە گەورەیە پێ نەگوتبوو. پێی نەگوتبوو یاوەرە هەرە ئازیز و خۆشەویستەکەی کوژراوە!
(٤١٢) ئەوانی دی لە دەوری لاشەکە، بەنێزەی بڕندە بەربوو بوونە یەکدی. کوڕ ئەو کوڕە بوو بەرانبەرەکەی بکوژێت. ئاخییایە برونز پۆشەکان بەیەکتریان دەگوت: براینۆ، بەڕاستی مایەی نەنگ و شەرمەزارییە جارێکی دی بەرەو کەشتییەکان پاشەکشە بکەین، باشتر وایە ئەم ئەرزە لێرە شەق بەرێ و قووتمان بدات، نەك کارێکی وەها بکەین،

تەروادەییەکان، ڕامکەرانی ئەسپان، جەنازەکەی پاتروکلۆس بگرن و بۆ شارەکەی خۆیانی بەرن و خۆیانی پێوە بنوێنن!!

(٤٢٠) لەولاشەوە، جەنگاوەرانی دلێری تەروادەیی دەیانگوت: "دۆستان، ئەگەر قەراربێ هەر هەموومان بەدیار ئەم جەنازەیەوە بکوژرێین، نابێ شتاقمان پاشەکشە بکەین!" ئەو قسە و باسانە لە هەردوولا دەکرا و بەو جۆرە یەکتریان بۆ شەڕ هاندەدا. ئیدی شەڕ بوو ئەمما شەڕ، دەنگ و تەق و هوری ئاسن و برونز دەگەییە ئاسمانی مسین. جووتە ئەسپەکەی کوڕی ئیکۆس، لەشەڕ دوورکەوتنەوە، کاتێ کە دیتیان گالیسکە ڕانەکەیان بەدەستی هیکتۆری کوشتۆخ کوژراوە دەستیان بەگریان کرد.

(٤٢٨) ئەگەرچی ئۆتومیدونی جوامێری کوڕی دیوریس، هەندێ جار بەتوندی بەر قامچی دەدان، هەندێ جار بەنەرمی و بەقسەی خۆش دەیدواندن، زۆرجاریش هەڕەشەی لێدەکردن، بەڵام شتاقیان بەتەما نەبوون بۆلای کەشتییەکان.. بوهیلیسپونتی پان و بەرین، تەنانەت بۆ مەیدانی شەڕەکە و بۆلای ئاخییەکان بگەڕێنەوە. وەکو کێلی قەبری پیاوێك یان خانمێك، هەردوو ئەسپەکە بێ جوڵە و ڕەق لە شوێنی خۆدا چەقی بوون و دەیانڕوانییە گالیسکە شکۆدارەکە و سەریان دادەخست و فرمێسکی گەرم لە چاوانیانەوە دەبارییە سەر ئەرزەکە و شینی خاوەنەکەیان بوو. یاڵو بژیان کە لەژێر نیرەکەوە هاتبووە دەرێ، بێ ڕەونەق و تۆزاوی بووبوو.

(٤٤١) کە زیوسی کوڕی کرونوس بەو حاڵەوە بینینی زۆر دڵی پێ سووتان. سەری دانەواند و لە بن لێوانەوە گوتی: "بێ نەوایان، بێ بۆچی دامن بەشا بیلیوس کە بنیادەمێکی فانییە، لە کاتێکا ئێوە نەمرن و پیر نابن؟ ئایا ئەمە قەدەری خۆتان بوو کە بکەونە ناو بەشەرانی کڵۆڵ و ببن بەشەریکی خەم و پەژارەیان؟.. چونکە لەناو هەر هەموو زیندەوەرانی سەر ڕووی زەویدا، لە بەشەر کڵۆڵتر و بەدبەخت تر نییە، لەهەر گیانلەبەرێك زیاتر شایستەی بەزەییە. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمەشدا هەرگیز هیکتۆری کوڕی پریام سواری خۆتان و عەرەبانە نایابەکەتان نابێت. من ئەمەی پێ ڕەوا نابینم. ئایا ئەوەندەی بەس نییە کە چەك و ئەسلەحەکەی ئەخیلی بەدەست هێناوە وبەخۆرایی پێوەی دەفشێ و خۆی دەنوێنێ؟ جا من هێز و تین و تاو دەخەمە بەر دڵ و لاقتان، تا ئۆتومیدون بەسەلامەتی لە مەیدانی شەڕەکەوە بەرەو کەشتییەکان بەرنەوە، چونکە هێشتا بەنیازم سەرفرازی سەکەوتن بەتەروادەییەکان ببەخشم تا دەگەنە کەناری کەشتییە مکومەکان،

تا ڕۆژئاوا دەبێت و دنیا تاریک دەبێت."

(٤٥٦) هەرکە ئەوقسانەی کرد ئەسپەکان هێز و توانایەکی زۆریان وەبەرهاتەوە. یاڵوبژیان لە تەپوتۆز تەکاند، بەلەز خۆیان وەناوجەرگەی شەڕ و کوشتاری نێوان تەروادەیی و ئاخییەکاندا کرد. ئوتومیدون، کە زۆر پەرێشانی کوژرانی هاوڕێکەی بوو، وەکو داڵاشێك خۆی بەپۆلە قازێکی بێ دەسەڵاتدا بدات، بەلەز بەخۆ و گالیسکەکەیەوە خۆی بەئاپۆرەی هێزی تەروادەییەکاندا دا، بەڵام چونکە زۆر خەمین و تورە بوو، هەرچەند بەجددی دوای تەروادەییەکان کەوتبوو، نەیتوانی تاقە کەسێکیان لێ بکوژێت، هەڵبەتە ئەم کارەی بۆ نەدەکرا، چونکە بەتەنێ لە گالیسکە پیرۆزەکەدا بوو، نەیدەتوانی بە دەم هێرشبردنەوە هەم ڕمەکەی بەکاربێنێ و ڕمبازی بکات، و هەم جڵەوی ئەسپە ڕەهوانەکان بگرێت. لە ئەنجامدا هاوڕێیەکی، ئەلکیمیدونی کوڕی (لایرکیس)ی کوڕی هیمون بینی، بەغار دوای عەرەبانەکەی کەوت و پێی گوت: "ئەی ئوتومیدون، چ خواوەندێك ئەم گەوجێتییەی لەدڵ ناوێت، و هۆش و ئەقڵی لێ ئەستاندویەوە، و بەتاقی تەنیا و بەدەسێکەوە لە ڕیزی پێشەوە شەڕی تەروادەییەکان دەکەیت؟ هاوڕێکەت کوژراوە و هیکتۆر جلوبەرگە جەنگییەکەی کوڕی ئیکۆسی پۆشیوە و خۆی پێوە دەنوێنێ."

(٤٧٤) ئوتومیدونی کوڕی دیوریس وەڵامی دایەوە: "ئەلکیمیدون ئەی ئازیز، لەدوای پاتروکلۆس، لەنێو ئاخییەکاندا کێ لە تۆ باشتر دەتوانێ سەرکێشی ئەم ئەسپە خواییانە ڕام بکات؟ ئەو پاتروکلۆسەی تا لە ژیانا بوو بەئەندازەی خواوەندێك بەردەبار بوو، ئەوەتا ئێستا مەرگ و چارەنووس لەسەری نیشتوونەتەوە. کەواتە تۆ وەرە قامچیو جڵەوە ڕەخشانەکان بگرە، با من دابەزم و بەشداری شەڕ بکەم."

(٤٨١) ئەلکیمیدون بەپەلە خۆی هەڵدایە سەر گالیسکەکە، خێرا قامچی و جڵەوەکانی گرتە دەست. ئوتومیدون لە گالیسکەکە دابەزی. هیکتۆری مێرخاس بینی. یەکسەر ڕوویکردە ئیناس کە لە نزیکییەوە بوو، و گوتی: "ئەی ئینیاس، ئەی شیرەتکاری تەروادەییانی برونزپۆش، من ئەسپە ڕەهوانەکانی کوڕی ئیکوس دەبینم، بەجووتێ گالسیکەڕانی لاوازەوە بەرەو مەیدانی شەڕەکە دێن. ئومێدەوارم ئەگەر تۆ بەپەسندی بزانی و یارمەتیم بدەی، دەست بەسەر ئەو ئەسپانەدا بگرم، چونکە ئەگەر بەدوو قۆڵی هێرشیان بۆ بەرین، ئەوانە، ئەو جووتە پیاوە خۆیان لەبەرمان ناگرن، ئینیاسی کوڕی (ئەنخیسیس)ش لەسەر هەمان باوەڕ و قەناعەت بوو، بەدوو قۆڵی، ڕاستەوخۆ هێرشیان

بۆ کالیسکەکە برد، هەردوکیان سپەرەکانیان کە لە چەرمی وشکی گا دروست کرابوون و لۆیەکی برونزیان بەسەردا درابوو، لەشان کرد بوو. هەروەها کرومیوس و (ئەریتوس)ش کە لە جوانیدا دەتگوت خوایە، لەگەڵیاندا چوون، پڕ بەدڵ حەزیان دەکرد، ئەو جووتە پیاوە بکوژن و ئەسپە مل بەرزەکان بگرن. لێ خەیاڵیان خاو بوو. چونکە قەدەر وای لە چارە نەنووسی بوون کە بەسەلامەتی لای ئوتومیدون بگەڕێنەوە. ئوتومیدون کە لە سەرداری خواوەندان، لە زیوس پاڕایەوە، هێز و شەهامەتێکی بێ وێنە لە دڵ و دەروونی گەڕا، ئیدی ڕویکردە ئەلکیمیدونی هاوڕێی وەفاداری و گوتی: "ئەلکیمیدون ئەسپەکان لە من دوور مەخەوە، با بەدوامەوە بن، ئەوەندە نزیك بن هەناسەیان بەر پشتم بکەوێ. چونکە پێم وایە هیکتۆری کوڕی پریام دەستبەردار نابێ، تا ئێمە هەردوکمان نەکوژێت و جڵەوی ئەسپەکانی ئەخیل، ئەسپە یاڵوبژ جوانەکان، نەگرێتە دەست و ئارگوسییەکان نەتارێنێ یان بەخۆی لە جەرگەی شەڕدا و لە ڕیزی پێشەوەدا نەکوژرێ!"

(٥٠٧) دوای ئەو قسانە، هاواری لە هەردووك ئەجاکس و مینیلاوس کرد: "ئەی برایانی ئەجاکس، ئەی سەرانی ئارگۆسی، ئەی مینیلاوس.. ئەم جەنازەیە بەئازاترین جەنگاوەران بسپێرن، تا پاسی بکەن و هێزەکانی دژمنی لێ دوور بخەنەوە، بەخۆتان فریای ئێمە بکەون، تا ماوین، مەرگمان لێ دوور بخەنەوە. چونکە هیکتۆر و ئینیاس، کە ئازاترین جەنگاوەری تەروادەیین، قورسایی شەڕەکەیان بۆ ئێرە هێناوە و گوشارێکی زۆریان خستوینەتە سەر، هەڵبەتە سەرکەوتن بەدەستی خودایانە، جا منیش نێزەی خۆم داوێم و بەتەمای زیوس."

(٥١٤) بەدەم ئەو قسانەوە، نێزە درێژەکەی ڕێك گرت و هاویشتی، نێزەکە بەر سپەرە مکوم و هاوسەنگەکەی ئەریتوس کەوت. سپەرەکە بەرگەی نێزەکەی نەگرت، سەرە برونزییەکەی سپەرەکەی بڕی. لەخوار پشتێنەوە چوو بەورگی ئەریتوسدا. وەکو چۆن پیاوێکی گەنجی بەهێز تەورێکی تیژ و بڕندە بەدەستەوە دەگرێت و لە پشتەوە دەیکێشێت بەشاخی گاجوتێکدا و یەکسەر دەمارەکانی دەبڕێ و گایەکە بەپێشا ڕەت دەبات و دەکەوێت، بەو ئاوایە ئەریتوس ڕەتی برد و ئەوجا بە پشتا کەوت، ڕمە بڕندەکە، کە لە هەناوی چەقی بوو، هەر چوارپەلی شکاند و مرد. هیکتۆرش، نێزە ڕەخشانەکەی سرەواندە ئوتومیدون، بەڵام ئوتومیدون کە ڕمەکەی بەدی کرد خۆی لەبەری لادا، ڕمە تێپەڕی و لە عاردەکە چەقی، دەسکی ڕمەکە هەر دەلەرییەوە تا ئێریس دایمرکاندەوەو

له جووڵەی خست. خۆ ئەگەر لەو کاتەدا برایانی ئەجاکس کە بەهانای ئۆتومیدونەوە هاتبوون، و یەکپارچە ڕق وپشم وغەزەب بوون، نەگەییشتبانە جێ و لێکیان نەکردبانەوە، لەوە بوو ئەم جووتە پاڵەوانە لە شەڕێکی دەستەو یەخەدا و بەشمشێران بەربوونایەتە گیانی یەکدی. ئیدی هیکتۆر و ئینیاس و کرومیوسی نیمچە خوا پاشەکشەیان کرد و (ئەریتوس)یان بەدەم گیانەڵێوە بەجێهێشت. هەنگێ ئۆتومیدونی هاوتای ئێریسی زەرۆپ خۆی گەیاندێ و چەك و ئەسلەحەکەی لێداماڵی و بەلاف و گەزافەوە گوتی: "ئۆخەی کە بەمە کەمێك داخی مەرگی (پاترۆکلۆس)م هەڵرشت، هەرچەندە ئەوەی من کوشتوومە هاوشان و هاوتای ئەو نییە.

(٥٤٠) بەدەم ئەو قسانەوە دەسکەوتە خوێناوییەکانی خستە سەر عەرەبانەکەی، ئەوجا بەدەست و پێی خوێناوییەوە، وەکو شێرێك تۆزێك بەر لە ئێستا گایەکی کوشتبێ و خواردبێ، خۆی هەڵدایە سەر گالیسکەکە.

(٥٤٣) لەم ماوەیەدا، سەرلەنوێ شەڕێکی سامناك و خوێناوی، لە دەوری جەنازەکەی پاترۆکلۆس هەڵگیرسا، ئەتینا لە ئاسمانەوە و لەسەر داوای زیوس هاتبووە خوارێ کە ئاگری شەڕەکە خۆش بکات، چونکە زیوسی دوورئەنێش ڕای خۆی گۆڕی بوو و ئەوی نارد بوو کە داناییەکان هانبدات و بۆ شەڕیان جۆش بدات. وەکو چۆن زیوس لە قوڵایی ئاسمانەوە، پەلکەزێڕینەیەکی ئەرخەوانی دەخاتە بەرچاوی بەشەرانی فانی، تا لایان مەعلوم بێ کە یا شەڕێك دەقەومێ، یان تۆفانێکی سارد و بەتەرەف هەڵدەستێ و خەڵکی لە کار و جووتکاری دەخات و ماڵات و پەزان پەرێشان دەکات،

(٥٥٠) ئەتیناش بەو شێوەیە کە خۆی لە هەورێکی ئەرخەوانییەوە پێچا بوو، بەهەشتاو خۆی گەیاندە ناو ئاپۆڕەی هێزی ئاخییەکان و کەوتە هاندانی یەك بەیەکی جەنگاورەکان، هەوەڵجار لە مینیلاوسی مێرخاسی کوڕی ئۆتریوسەوە، کە لێوەی نزیك بوو، دەستی پێکرد، خۆی خستە پێستی (فونیکس)ەوە، بەشێوە و دەنگی ئەو ڕویکردە مینیلاوس و گوتی: "ئەی مینیلاوس، ئەگەر کسۆکان، جەنازەکەی (پاترۆکلۆس)ی یاوەری ئەمەکداری ئەخیل، بەرنە بن حەساری تەروادەییەکان و بیخۆن دەبی بەگەپجاڕی ڕۆژگار، کەواتە خۆت بنوێنە، و هەموو لەشکرەکەت بۆ شەڕ هانبدە."

(٥٦١) (مینیلاوس)ی نەعرەتەکێشی مەیدانی جەنگ، بەرسڤی دایەوە: "ئەی فونیکس، ئەی بابەکەم، ئەی پیرەمێردی ئازیز، ئەی هاوڕێی دێرینەم، خۆزیا ئەتینا پشتی دەگرتم و

له تیر و نێزان دەیپاراستم، من بەدڵ دەخوازم فریای پاتروکلۆس بکەوم و بەرگری لێبکەم، چونکە مەرگی ئەو تا ناخی سمیوم. بەڵام هیکتۆر، ئەو ئاگرەی لە ناخیا هەڵایساوە بۆ هەموو شوێنێکی دەبات و نێزە بەدەست بۆ ساتێك لە کوشتن ناپرینگێتەوە چونکە زیوس سەرکەوتن و سەرفرازی پێ بەخشیوە."

(٥٦٧) "ئەتینا"ی چاو کەژاڵ زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە بەر لە هەموو خواوندەکان هانای بۆ ئەو هێنا و لەو پاڕایەوە. بۆیە هێز و گوڕی وەبەر هەردووك شان و ئەژنۆی نا، و لاساری مێشی لە دڵ و دەرونی گێڕا، ئەو مێشەی کە هەمیشە دوور دەخرێتەوە و جارێکی دی دەگەڕێتەوە و لەسەر پێستی بەشەر دەنیشێتەوە و دەیگەزێت. چونکە خوێنی بەشەری پێ خۆشە.. ئەتینا بەو شێوەیە دڵی ڕەشی مینیلاوسی پڕ کرد لە جورئەت و بێباکی، بەدیار جەنازەکەی پاتروکلۆسەوە وەستاو ڕمە ڕەخشانەکەی هاویشت، لەنێو تەروادەییەکاندا پیاوێکی دەوڵەمەندی دلێر هەبوو بەناوی (بودیس)ی کوڕی ئیتیون، هیکتۆر لە دەڤەرەکەدا لە هەمووان پتر ڕێزی دەگرت، چونکە دۆست و هاوخوانی ئەو بوو. مینیلاوسی پۆرزەرد، لە کاتێکا کە دەیویست هەڵێ ،نیشانەی لێگرتەوە و نێزەیەکی لەناو قەدی داو دیواودەری کرد و شڵپەی لێ هەستاند و بەدەما کەوت. ئیدی (مینیلاوس)ی کوڕی ئوتریوس لاشەکەی ڕاکێشا و بۆ ناو هاوڕێکانی خۆی برد.

(٥٨٢) ئەوجا ئەپولۆ هاتە لای هیکتۆرەوە و بۆ شەڕی هاندا. ئەپولۆ خۆی خستە شێوە و سیمای فینوپسی کوڕی ئاسیوسەوە، کە خەڵکی ئەبودوس بوو، و ئازیزترین و بەڕێزترین میوانی هیکتۆر بوو. ئەپولۆی دوورئەنگێوە لە هەیئەتی ئەودا ڕوویکردە هیکتۆر و گوتی: "ئەی هیکتۆر، لە ئێستا بەدواوە دەبێ کیهان ئاخییایی لە تۆ بترسێت، کە تۆ بەمجۆرە لەبەر مینیلاوس، کە تا ئەمڕۆ جەنگاوەرێکی لاواز پتر نەبووە، هەڵێی، و بەبەرچاوی خۆتەوە و بەتەنیا جەنازەی ئەو جەنگاوەرەی کە ئێستا کوشتی، جەنازەی (پودس)ی دۆستی دلاوەری تۆ، لەنێو تەروادەییەکاندا بڕفێنێ و ببیات؟

(٥٩١) هیکتۆر کە گوێی لەو قسانە بوو، تەمێکی ڕەشی خەمینی باڵی بەسەردا کێشا، بەچەك و ئەسلەحەی تەواوەوە بەرەو ڕیزەکانی پێشەوە وەڕێکەوت. هەنگێ زیوسی کوڕی کرونوس سپەرە پرشنگدارەکەی خۆی هەڵگرت، چیای ئیدای بەهەوری تاریك داپۆشی، چەخماخە و هەورە تریشقەی سامناك دەستی پێکرد و ئاسمان خرۆشا. سپەرەکەی جوڵاند و سەرکەوتنی بەتەروادەییەکان بەخشی و ترس و لەرزی خستە ناو ئاخییەکان و تاراندنی.

(٦٢٢) (پینیلیوس)ی سەرداری بیوتی، کە تا ئەو کاتە ڕووبەڕووی دژمن بوو، بەر لە هەمووان ڕێگەی هەڵاتنی گرتەبەر. نێزەیەك سەرووی شانی گرت، بەسووکی برینداری کرد، سەری نێزەکەی پولیداماس ئێسکەکەی ڕوشاند بوو. ئەو دەمەی کە لە پولیداماس نزیك بوو بووەوە، پولیداماس لە نزیکەوە لێی دابوو. هیکتۆرش لە شەڕێکی دەستەو یەخەدا شەبەقی زامێکی کردبووە قۆڵ و مەچەکی لیتوسی جوامێری کوڕی ئەلیکترون و پەکی خستبوو و ناچاری کردبوو دەست لە شەڕ هەڵگرێت: بەنیگەرانییەوە ڕوانیە دەوروبەر. بەرەو پاش کشایەوە، ئومێدی ئەوەی لە دڵدا نەما کە جارێکی دی بتوانێ ڕم هەڵگرێ و بچێتە شەڕی تەروادەییان. لەو کاتەدا هیکتۆر پەلاماری لیتوس دەدا، ئیدومینیوس نیشانەی لە دوڕ سینگی و لە نزیکی مەمکی هیکتۆر گرتەوە و ڕمێکی کێشا بەزرێکەیدا، نووکی نێزەکە لەسەر زرێکە شکا، تەروادەییەکان دەستیان بەهاواری شادی کرد. ئەوجا هیکتۆر نیشانەی لە ئیدومینیوسی کوڕی دیوکالیون، کە بەسەر عارەبانەکەیەوە وەستا بوو، گرتەوە. نێزەکە بەبناگوێیدا ڕەت بوو و (کویرانوس)ی یاوەر و میرئاخوری میریونیسی پێکا، کە لە (لوکتوس)ەوە لەگەڵیدا هاتبوو. کاتێ کە ئیدومینیوس لەلای کەشتییەکانەوە بەپێیان هاتبوو، ئەگەر (کویرانوس) فریای نەکەوتبا و ئەسپەڕەهوانەکانی پێ نەگەیاندبوایە، بێگومان تەروادەییەکان دەیانکوشت و سەرکەوتنێکی گەورەی پێ دەبەخشین. هاتنی ئەو، بۆ ئیدومینیوس تروسکەی ڕزگاری بوو و مەرگی دڵڕەقی لێ دوور خستەوە. بەڵام کویرانوس، بەخۆی بەدەستی هیکتۆری کوشتۆخ و سامناك کوژراو، هیکتۆر نێزەیەکی لە ژێر گوێچکەیەوە بەشەویلاگەیداکێشابوو و سەری نێزەکە ددانەکانی لە بێخەوە هەڵکەند بوو و زمانی لە ناوەڕاستەوە لەت کرد بوو. لە عەرەبانەکەوە کەوتبوو و جڵەوەکانی لە دەست کەوتبووە زەوی. ئەوجا میریونیس دانەوییەوە و بەدەستی خۆی جڵەوەکانی لە عاردی هەڵگرتەوە و ڕویکردە ئیدومینیوس و گوتی: "ئەسپەکان بەر قامچی بدە و بازۆ تادەگەیە کەشتییە لەزەکان. بەخۆت دەزانی ئەمڕۆکە ڕۆژی ئاخییەکان نییە.

(٦٢٤) ئیدومینیوس ئەسپە یاڵوبژ جوانەکانی بەر قامچی دان و بەرەو کەشتییەکانی تاودان و ترس باڵی بەسەر ڕوحیا کێشابوو.

(٦٢٦) ئەجاکسی جوامێر و مینیلاوس لەوە بێ ئاگا نەبوون کە زیوس سەرکەوتن بەرتەوادەییەکان دەبەخشێ تا ڕەوتی شەڕەکە بگۆڕێ. ئیدی ئەجاکسی کوڕی تیلامون

یەکەم کەس ڕویکردە هاوڕێکانی و گوتی: "بەداخەوە، منالّیش هەست دەکات کە بابە زیوس لێبڕاوە یارمەتی تەرِوادەییەکان بدات. تیر ونێزەیان بەخەسار ناچێ، چ ترسنۆك بیان هاوێ وچ بوێر وئازا، ڕێك نیشانە دەپێکن. چونکە زیوس هەرچۆنێ بووە ئاڕاستەیان دەکات و نیشانان دەنگێون. بەڵام تیر و نێزەکانی ئێمە بێهودە دەکەونە سەر زەوی. جا وەرن با بیرێك بکەینەوە و باشترین چارە بدۆزینەوە، کە بتوانین جەنازەکەی پاترۆکلۆس ڕزگار بکەین و لە گەڕانەوەدا دڵی هاوڕێکانمان خۆش بکەین، ئەو هاوڕێیانەی کە سەیرمان بکەن، بێگومان خەم دایان دەگرێت، چونکە دڵنیا دەبن کە جۆش و خرۆشی هیکتۆری جوامێر و مێرخاس لە دامرکانەوە نایەت و هێز نییە بەری بگرێ و سنوری بۆ دابنێت و هاکا هێرشی هێناو گەییە سەر کەشتییە ڕەشباوەکانمان. خۆزگە یەکێك لە هاوڕێیانمان بەپەلە دەچوو بۆلای کوڕەکەی بیلیوس و لە حاڵ و وەزعەکەی ئاگادار دەکردەوە! پێم وانییە هێشتا لەم هەواڵە دڵتەزێنە ئاگاداربێ. هێشتا نازانێ کە هاوڕێ ئازیزەکەی کوژراوە. بەهەرحاڵ من هیچ ئاخیاییەك نابینم کە بۆ ئەم کارەی بنێرم، چونکە تەم و تاریکی باڵی بەسەر خۆیان و ئەسپەکانیاندا کێشاوە. خواوەندا، ئەی زیوسی باب، کوڕانی ئاخیایی لەم تاریکیە دەربێنە، ئاسمان ڕوناك بکەوە، کارێکی وەها بکە بتوانین بەردەمی خۆ بدینین.. ئەگەر خوازیاری فەوتانی ئێمەی، لە ڕوناکیدا بمانکوژە!"

(٦٤٨) بابە زیوس کە گوێی لە گریانی ئەجاکس بوو بەزەیی پێداهاتەوە. دەستبەجێ دڕی بەتاریکییەکەدا و هەورەکانی ڕەواندەوە، ڕۆژ بەسەر سەریانەوە هەڵهات، هەموو شەڕگە و شەڕڤانەکان بەدیار کەوتن .ئەجاکس ڕویکردە مینیلاوسی مێرخاس و گوتی: "مینیلاوس، ئەی زیوس زادە، بڕوانە بزانە کە ئاخۆ (ئەنتیلوخوس)ی کەڵەمێر و کوڕی نەستور ماوە! ئەگەر ماوە بەپەلە بەڕێی بکە تا ئەخیلی قارەمان، لە کوژرانی دۆستە هەرە ئازیزەکەی ئاگادار بکات."

(٦٥٦) دوای ئەو قسانە، مینیلاوسی دلاوەری نەعرەتەکێشی مەیدانی شەڕ، قسەکەی لە عاردی نەدا وکەوتەڕێ. وەکو چۆن شێرێك تەماح دەکاتە پەرزێك و شوانان و کسۆکەکانیان ڕێگەی نادەن مەڕێکی قەڵە و برفێنێ و بەدرێژایی شەوکێشکی ئاغەڵەکەیان دەگرن و شێرەکە لەتاو برسێتی و تامەزرۆیی بۆ گۆشت، هەر دەچێتە پێشێ، بەڵام هیچی چنگ ناکەوێ، و بەر تیران دەدرێ و مەشخەڵی هەڵایساوی تێ دەسرەوێنرێ و لە ئەنجاما ماندوو دەبێ و لەبەرە بەیاندا بەنائومێدی پایدۆسی لێدەکات.. (مینیلاوس)ش بەهەمان شێوە،

بەخەمبێنی و نیگەرانییەوە جەنازەکەی پاترۆکلۆسی بەجێهێشت. چونکە زۆر دەترسا ئاخییەکان نەترە بەر بدەن و بشکێن و جەنازەکەی پاترۆکلۆس بەجێ بێڵن و بکەوێتە دەستی دژمن! بۆیە ڕوویکردە میریونیس و برایانی ئەجاکس‌و ڕایسپاردن کە: "برایانی ئەجاکس، ئەی سەرانی ئارگوسییان، تۆش ئەی میریونیس ئاگاتان لە پاترۆکلۆس بێ، ئەوەتان لەبیر بێ کە تا لەژیاندا بوو چەند کەسێکی میهرەبان و باش بوو، هاوڕێی هەمووان بوو، بەڵام ئەمێستا مەرگ و چارەنووس لە هەمێزیان گرتووە."

(٦٧٣) مینیلاوس بەدەم ئەو قسانەوە وبەڕێوە، بەوریاییەوە نیگای بەهەموو لایەکدا هەڵدا. وەکو چۆن هەڵۆیەك کە دەڵێن لە ناو فرندەێن ژێر قووبەی ئاسماندا، لە هەمووان چاو تیژ ترە، بەو ڕادەیەی کە چەند بەبەرزییەوە بێ، هەرکە کەروێشکێك بەپەلە خۆی بەبێشەیەکدا یان دەوەنە جارێکدا بکات و خۆی وەشێرێ، لە نیگای پیرە هەڵۆ ون نابێ. لەپڕ بۆی دادەکشێت و دەیگرێت و حەیاتی لەبەردەبرێت. بەهەمان شێوە، ئەی مینیلاوسی زادەی زیوس، چاوانی پرشنگداری تۆ بەسەر ئاپۆرەی هاوڕێکانتدا گەڕان، تابزانی کە ئاخۆ لە شوێنێکدا ئەنتیلوخۆسی کوڕی نەستور بەزندوویی دەدۆزییەوە. مینیلاوس زۆر زوو لە قۆڵی چەپی شەڕگەکەدا بەدی کرد کە هاوڕێکانی بۆ شەڕی مان و نەمان لەگەڵ دژمندا هاندەدا. مینیلاوسی پۆرزەرد لە تەکیا وەستاو گوتی: "ئەنتیلوخۆس، ئەی زیوس زادە، زەحمەت بکێشە و تا ئێرە وەرە، هەواڵی ڕووداوێکی دڵتەزێن بژنەوە، کە هەرگیز نەدەبوایە ڕووبدات.. پێم وایە تۆ بەخۆت هەستدەکەیت و دەبینی کە خواوەندێك ڕۆژ ڕەشی و بەڵا بەسەر ئاخییەکاندا دەدات و سەرکەوتن بۆ تەروادەییەکانە. ئەوەتا ئازاترین جەنگاوەری ئاخاییان، پاترۆکلۆس کوژراوە. کۆستی ئاخاییان زۆر گەورە و گرانە. جا خێرا برۆ بۆلای ئەخیل و ئەم هەواڵەی پێ بگەیەنە، بەڵکو تا زووە فریا بکەوێ و جەنازەکەی، کە بەرووت و قوتی لەو گۆڕە کەوتووە، ڕزگار بکات و بۆلای کەشتییەکانی بەرێتەوە.. هیکتۆری کێورەخشان، دەستی بەسەر چەك و ئەسلەحەکەیدا گرتووە!"

(٦٩٥) ئەنتیلوخۆس کە گوێی لەم قسەیە بوو، سام گرتی، تا ماوەیەك بێدەنگ بوو، چاوانی تەژی روندك بوون، قسە لە ئەوکی گیرا. بەڵام فەرمانەکەی مینیلاوسی لە عاردی نەدا، چەك و ئەسلەحەکەی دایە یاوەرە بێ وێنەکەی، دایە لاودوکوس کە لە نزیکی ئەوەوە گالیسکەکەی دەڕانی. ئەوجا بەلەز وەڕێکەوت،

(٧٠٠) بەدەم گریانەوە، وبەڕاکردن شەڕگەکەی بەجێهێشت تا ئەم هەواڵە شومە بگەیەنێتە

نەخێن. جا تۆ ئەی مینیلاوس پێت وابوو بەمە یارمەتی هاوڕی ماندووەکانیت داوە. یارمەتی ئەو (پیلیان)انەی کە بەڕۆییشتنی ئەنتیلوخۆس زۆر پەرێشان بوون. ئەوە بوو مینیلاوس، تراسیمیدوسی مەزنی بۆلا ناردن، و بەخۆی بۆلای پاتروکلۆسی قارەمان گەڕایەوە و بەهەشتاو خۆی گەیاندە برایانی ئەجاکس و ڕووی تێکردن و گوتی: (ئەنتیلوخۆس)م نارد بۆلای کەشتییەکان، تا هەواڵەکە بەئەخیلی قۆچاغ بگەیەنێ. بەڵام باوەڕ ناکەم ئەخیل چەندیش لە هیکتۆر پڕ بێ وا زوو بەزوو بێت. چونکە ناتوانێ بەبێ چەك و ئەسلەحەکەی خۆی شەڕی تەروادەییەکان بکات. جا چارەمان هەر ئەوەیە بیر لەوە بکەینەوە چۆن جەنازەکە دەرباز بکەین، و چۆن خۆمان لە شەڕی بێ ئامانی تەروادەییەکان بدزینەوە و لە مەرگ و ئەجەل بخەلەسین."

(٧١٥) ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون بەرسڤی دایەوە: "قسەکەت بەجێیە ئەی مینیلاوسی خاوەن شکۆ، تۆ و میریونیس لاشەکە هەڵگرن و بیدەن بەسەر شانتاناو لە شەڕەکەی دوور بخەنەوە، ئێمەش لەدوای ئێوەوە شەڕی تەروادەییەکان و هیکتۆری مەزن دەکەین و پشتتان چۆڵ ناکەین، ئەوجا ئێمە هەردووکمان، کە یەك گیان و یەك ناومان هەیە، لە ئازایەتیدا چوون یەکین، بەپشتیوانی یەکدی ڕووبەڕووی هیکتۆر و هێزەکەی دەبینەوە!"

(٧٢٢) هەر کە ئەو قسانەی کرد. هەردوو جەنگاوەر لاشەکەی (پاتروکلۆس)یان لە عاردی هەڵگرت و بەڕێزەوە خستیانە سەر شانیان. کە تەروادەییەکان دیتیان ئاخیاییەکان جەنازەکەیان هەڵگرت و دووری دەخەنەوە، لە دواوە لێیان کردن بەهەڵێ و کەوتنە هێرش و پەلامار. وەکو چۆن کۆمەڵە ڕاوچییەکی گەنج، تاقمە کسۆکێك بەر دەدەنە بەرازە کێوییەکی بریندار تا بیکوژن، بەڵام هەر کە بەتوڕەیی لێیان دەگەڕێتەوە و شاڵاویان بۆ دەبات، هەموو دەترسن و هەریەکە بەلایەکدا پەڕاگەندە دەبێت، تەروادەییەکانیش بەهەمان شێوە، کە بەکۆمەڵ هێرشیان دەبرد، بەزەبری شمشێرانی گران و نێزەی دوو سەر، ئارگۆسییەکانیان تەنگەتاو دەکرد. بەڵام هەر کە جووتە ئەجاکس لێیان هەڵدەگەڕانەوە و ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، هەموو ڕەنگیان زەرد هەڵدەگەڕا و شتاقیان نەدەوێرا توخنی جەنازەکەی پاتروکلۆس بکەوێ!

(٧٣٥) بەو جۆرە جووتە جەنگاوەر، سەرختانە و دلێرانە، جەنازەکەیان لە مەیدانی شەڕەکەوە بەرەو کەشتییەکان دەبرد. لێ شەڕەکە لە دوایانەوە سات بەسات گەرمتر

دەبوو، وەکو چۆن ئاگرێکی سەرکێش، بەتوڕەیی بڵێسە دەسەنێ و تەشەنە دەکات و شارێکی ئاوا و ئاوەدان دەگرێتەوە، و باو باهۆز زیاتر دەیگەشێنێتەوە و ماڵەکان یەك یەك بەدەم گڕ و کڵپەوە هەرەس دێنێ و دەڕوخێت، بەو ئاوایە هورای نێزە گوزاران و زەڵە و ژاوەژاوی عەرەبانە و دەنگی سمی ئەسپان بەبەردەوامی بەدوای ئەو جووتە جەنگاوەرەوە بوو، کە بەپەلە بوون جەنازەکەی پاترۆکلۆس بگەیەننەوە کەشتییەکان. یان ئەو دووە وەکو ئەو هێسترانەی بەهەموو هێز و قوەتی خۆیانەوە، کۆمەڵە دارێك، یان قەدی زەلامی درەختێك کە کەشتی لێ دروست بکەن، لە ڕێگەیەکی پێچا و پێچ و سەختی سەر چیایەکی بەرزەوە رادەکێشن و هێسترەکان لەژێر باری گرانی خۆیاندا ئارەقەیەکی زۆر دەکەنەوە و هانکە هانکیان پێدەکەوێ، (مینیلاوس و میریونیس)ش بەهەمان شێوە سەرسەختانە و مکوڕ، ماندوو و ئارەقە کردو جەنازەکەی (پاترۆکلۆس)یان دەبرد و دەڕۆیشتن. هەردوو ئەجاکس لە پشتیانەوە بوون و بەهەموو هێز و توانایانەوە هێرشی تەروادەییەکانیان دەدایە دواوە. وەکو چۆن لەمپەر و بارستایی بێشەیەك لە دەشتێکی بەریندا ڕێ لە لافاوی ڕووبارێکی سەر هەڵگرتوو، کە لە بەستێنی خۆ دەربچێ، دەگرێت و لە ئەنجامدا ئاوەکە بەهەمان تین و تاو، بێ ئەوەی بتوانێ لەمپەر و بارستاییەکە ڕامالاَ، بەرەو بەستێنی خۆی دەگێڕیتەوە.

(٧٥١) جووتە (ئەجاکس)ش بەهەمان شێوە تەروادەییەکانیان دەدایە دواوە. بەلاَم ئەوان هەر ڕاویان دەنان، بەتایبەتی ئینیاسی کوڕی ئەنخیسیس و هیکتۆری ڕەخشان و مێرخاس. جا وەکو چۆن ڕەوە ڕیشۆڵە و هەوێردان واشەیەکی دژمنی باڵندانی بچووك دەبینن لە ئاسمانەوە بۆیان دادەکشێت، بەدەم هاواری نائومێدی و بێ دەسەلاَتیەوە هەڵدێن، بەهەمان شێوە لاوانی ئاخیایی بەدەم هاواری نائومێدییەوە لەبەر ئینیاس و هیکتۆر هەڵدەهاتن و باشاری بەرگریان لەدەستدا بوو. بەدەم هەلاَتنی داناییەکانەوە زۆر ئەسلەحە و چەکی نایاب لێرە و لەوێ لەدەوری خەنەکەکە لە دەستی جەنگاوەرانی دانایی کەوت.. شەڕەکەش لە کۆتایی نەدەهات و هەر بەردەوام بوو.

# سروودی هەژدەیەم

## زریێ تازەکەی ئەخیل

**حیکایەتەکە:**

**کوڕەکەی نەستور، هەواڵی کوژرانی پاتروکلۆس بۆ ئەخیل دەبات. ئەخیل زۆر پەرێشان و خەمبار دەبێت، چونکە ئازیزترین هاوڕێ و یاوەری بوو، هەڵبەتە پاشەکشەی ئاخاییەکان لە دەشتی تەروادە بەو خێرایی و پەشێویە جۆرە گومانێکی لا دروست کردبوو. ئەوەی زیاتر ئازاری دەدا و خەمباری دەکرد، ئەوە بوو گاڤێ ئەم هاوڕێیەی لەگەڵ خۆدا هێنابوو، بەڵێنی بەبابی دابوو کە بەسەلامەتی دەیگەڕێنێتەوە، چونکە ڕێی نادات لە نزیکی حەساری تەروادەدا بەشداری شەڕبکات، تا هیکتۆری مێرخاس ڕاوی نەکات. لێ پاتروکلۆس فەرمانی ئەخیلی لە عاردیدا و کوژرا. گاڤێ ئەخیل هەواڵەکە دەژنەوێ بەدەما دەکەوێتە سەر زەوی و لە خۆی دەدات و دەگری و قوڕ بەسەری خۆیدا دەکات و شوێنەواری قوڕ پێوانەکە بەجلەکانیەوە دەردەکەوێ و تەنانەت کوڕەکەی نەستور لەوە دەترسێت خۆی بکوژێت و بەسەریا دادەنەوێتەوە، ئەو کیژانەی کە لە شارانی تەروادەدا بەدیلیگرتبوونی، دەکەونە شین و ڕۆڕۆ ئەوجا تا زاری دەگرێ هاوارێکی پڕژان دەکات، تیتیسی دایکی لە بنکی دەریاوە، کە لەگەڵ بابە پیرەکەیدا لە شکەفتەکەی خۆیدا دەبێ، هاوارەکەی دەژنەوێ و دەزانێ کە بەڵایەکی بەسەرهاتووە، ئەویش فیزاحێکی کرد، پەریانی دەریایی لە دەوری خڕبوونەوە و بەدەنگی بەرز کەوتنە شیوەن، ئەوجا بەلەز خۆی گەیاندە کوڕەکەی کە بویەرەکەی بۆ گێڕایەوە و پێی ڕاگەیاند بەنیازە بۆ مەیدانی شەڕ بگەڕێتەوە و تۆڵەی هاوڕێ ئازیزەکەی بکاتەوە. لێ دایکی ئاگاداری دەکاتەوە کە ناتوانێ بچێتە شەڕەوە، چونکە زرێکەی بەهیکتۆرە و ئەو ناتوانێ بەهیچ زرێیەکی دیکەوە شەڕ بکات. ئەمە جگە لەوەی کە ئەگەر هیکتۆر بکوژێ، بەخۆیشی یەکسەر دوای ئەو (هیکتۆر) دەکوژرێ. بەمەش ئەو پشگۆییە دێتە**

دی کە ئەگەر سەربەرز بژی، کەم دەژی، ئەگەر ژینێکی ئاسایی بژی تەمەنی درێژ دەبێت. لیّ کە بینی مکورە لەسەر شەڕ، بەڵێنی دایە کە لەلای ئاسنگەری خواوەندان، لای وەستا (هیفایستوس)ی دەست ڕەنگین زرێیەکی دیکەی بۆ بەکرد بدات و سبەینێ لەگەڵ بەرەبەیاندا ئامادە دەبێ و بۆی دێنێ. هەنگێ دەڕوات بۆ ئۆڵەمپ و دەچێتە ئەو کۆشکە گەورەیەوە کە هیفایستوس بەدەستی خۆی دروستی کردووە و ئەوپەڕی هونەری تیا بەکارهێناوە. ژنەکەی پێشوازی دەکات، چونکە بەخۆی سەرقاڵی دروستکردنی مەنجەڵێکی سێ پایە بوو کە لەکاتی پێویستدا بەخۆی دەچوو بۆ نك خوداوەندان و بەخۆی دەگەڕایەوە، هەروەها هەندێ کارەکەرانی لە شێوەی بنیادەماندا دروست کردبوو کە کاری خۆیان زۆر بەوردی ئەنجام دەدا و لە هەموو کارەکانیا یارمەتیان دەدا. کە لە کارەکەی بووەوە گوێی لێگرت. وەڵامی دایەوە کە داواکەی ئاسانە و زرێیەکی بێ وێنەی بۆ چێدەکات. چونکە کاتێ کە دایکی لەبەر ناشرینی لە ئاسمانەوە فڕێی دابوو، ئەم (تیتیس) هەڵی گرتبووەوە و بەخودانی کردبوو. ماوەیەکی لە دەف ئەو بەسەر بردبوو و خۆی بەزۆر شتانەوە خەریك کردبووو پاشان بوو بەوەستا و هونەر کارێکی مەزن لەواری ئاسنگەری و هەموو هونەرەکانی دیکەدا. بەڵێنی دەداتێ کە زرێکە لەبەرە بەیاندا ئامادە دەبێت، بەهەموو کەرەستە و تفاقێکی پێویستی هەر شەرڤانێك. کە سپەرەکەش دروست دەکات بەزێڕ و زیوان دیمەنێن ئەفسوناوی لەسەر دەنەخشێنێ ،وەکو کێڵگەی گەنم، جووت و جووتکاری، ڕەز و باخ و شەڕی نێوان دوو هێزی هەڤدژ... کاتێ کە لە دروستکردنی هەموو کەرەستە جەنگییەکان بووەوە، زرێ و سپەر و کڵاوخود و سینەبەند و هەموو شتەکانی لەبەردەم تیتیسدا دانان، کە بەو هونەرە جوان و بەرزە سەرسام بووو بەپەلە بۆ کوڕەکەیی برد.

زەمەن:

کات ئێوارەی ڕۆژی بیست و نۆیەم و شەوی سییەمی گێڕانەوەکەیە.

شوێن:

بویەرەکان لە خێوەتەکەی ئەخیل و پاشان لەلای پەروەردگاری لەنگ هیفایستوس، خواوەندی سنعەت و ئاسنگەری ڕوودەدەن.

(١) وەکو چۆن ئاگر سات بەسات بڵێسە دەسەنێت، بەو جۆرە شەڕی یەکتریان دەکرد.
(ئەنتیلوخۆس)ی قۆچاغ ڕۆیی تا هەواڵەکە بگەیەنێتە ئەخیل. سەیری کرد لەلای کەشتییە درێژەکانیا وەستاوە ولە فکران ڕاچووە. کە ئەنتیلوخۆسی بینی دڵی خەبەری دا کە شتێك قەوماوە. ئەو قارەمانە هێژا و دلێرە بەدڵێکی خەمینەوە بەخۆی گوت: "هاوار بەماڵم! ئاخۆ ئاخاییانی پڕۆشۆر بۆچی بەو پەشێوییە، سەرگەردان و سەراسیمە کەوتونەتە ئەو دەشتە و بەرە وکەشتییەکان پاشەکشە دەکەن؟ ئومێدەوارم خواوەند ئەوخەمەم نەداتێ کە دایکم بۆی باسکردوم. جارێك پێی گوتم: "تا من لە ژیاندا بم، ئازاترین (مورمیدون) بەدەستی تەروادەییان دەکوژرێت و دنیای ڕوناك بەجێدێڵێ! وادیارە ئەو کوڕە جوامێرەی مینویتیوس کوژراوە. نەگبەت خۆت، خۆ من ئاگادارم کردبووەوە هەرکە ئاگری شەڕەکەی دوورخستەوە، بۆلای کەشتییەکان بگەڕێتەوە وشەڕی هیکتۆری نەکات!"
(١٥) لە کاتێکا لە مێشك و دڵی خۆیدا بەو ئاوایە بیری دەکردەوە، کوڕەکەی نەستور، بەدەم کوڵی گریان و ڕشتنی فرمێسکی گەرمەوە لێی هاتە پێشێ و هەواڵە خەمناکەکەی دایە و گوتی: "مەخابن، ئەی بیلیوس زادەی مێرخاس، هەواڵێکی دڵتەزێنم بۆ هێناویت، هەواڵی ڕوداوێك کە خۆزیام دەخواست ڕاست نەبوایە! پاتروکلۆس کوژراوە. شەڕ لەسەر جەنازە بێ چەکەکەی گەرمە، چونکە هیکتۆری کێوڕەخشان دەستی بەسەر چەك و ئەسلەحەکەیدا گرتووە."
(٢٢) تەمی خەمێکی ڕەش نیشتە سەر دڵ و دەرونی ئەخیل. چنگێ خۆڵەمێشی هەڵگرت و بەهەردووك دەست کردی بەسەری خۆیدا. سیمای جوانی خۆی لەوتاند. خۆڵەمێشەکە ڕژا بەسەر جلکە ئاسمانییەکەیدا، تیلاوتیل خۆی بەعاردیدا دا. بەهەردووك دەستان کەوتە ڕنینەوەی قژی خۆی.
(٢٨) ئەو کارەکەرانەی کە ئەخیل و پاتروکلۆس بەدیلی گرتبوویانن، بەدڵێکی پڕ خەمینەوە لە دەوری ئەخیلی مێرخاس خڕبوونەوە و کەوتنە شیوەن و سینگ کوتان و قەڵەمی دەست و پێیان شکا. ئەنتیلوخۆس بەدەم گریان و فرمێسك ڕشتنەوە دەچێت و هەڵیدەستێنێتەوە و دەستی دەگرێت نەبادا پڕ بداتە شمشێر و خۆی بکوژێت. ئەوجا ئەخیل تازاری گرتی هاواری کرد. دایکە هێژاکەی، کە لە بنکی دەریادا و لەنك بابە پیرەکەی دانیشتبوو گوێی لە هاوارەکەی بوو. ئەویش لای خۆیەوە فیزاحێکی توندی کرد، هەموو یەزدانخانمان و پەریانی دەریایی واتە کیژانی نیریوس، کە لە بنکی دەریادا

دەریان، لە دەوری خڕبوونەوە، لەوانە: گلاوکی، تالیا، کومودوکی، نیسایا، سبایو، توی، هالی چاوکەژاڵ، کوموتوی، ئەکتایا، لینوریا، میلیتی، و ئەیارا، ئەمفیتوی، ئەجافی، دوتو، بروتو، فیروسا، دونامینی، و ئەمفینومی، کالیانیرا، دوریس، بانوبی، گالاتیای بەناوبانگ، نیمیرتیس، ئەبسیودیس و کالیاناسا.. هەروەها ئەمانەش هاتن: کلومینی، ئیانیرا، ئیاناسا، مایرا، ئوریتوا، ئەماتیای کەزی شۆڕ، هەروەها زۆر پەری دەریایی دیکەش لەوێ خڕبوونەوە. شکەفتە بریقەدارەکە پڕبوو لەوان، پێکڤە کەوتنە ڕۆ ڕۆ و سینگ کوتان، تیتیس بەشیوەن و گریانەوە سەردولکەی بۆ دادەدان و دەیگوت:

(٥٢) خوشکانم، کیژانی بیریوس، گوێ بگرن، تا دوای ژنەوتنی قسەکانم بزانن کە دڵم چەند پڕ دەرد و خەمە، چەند بەژان و کول و کۆڤانە، من بەچەند بەدبەختم! من دایکی چاو بەگریانی جەنگاوەرێکی دلێرم، من کوڕێکم بوو کە مایەی سەرفرازی زاگەی خۆی بوو، گەورەترین پاڵەوان بوو. وەکو دەوەنێك چەکەرەی کرد، ئەم کوڕەم میناکی نەمامێك لە باخێکی جواندا پەروەردە کرد، دوای ئەوەی گەورە بوو و پێگەیی، بەخۆ و کەشتییەکانیەوە بۆ تەروادەم نارد تا شەڕی تەروادەییان بکات. لێ جارێکی دیکە نای بینمەوە و دەبێ بەعەزرەتی دڵم کە بۆ وڵات و بۆ ماڵی بیلیوس بگەڕێتەوە و پێشوازی بکەم. جا تا ئەو لە ژیاندا بێ و لە دنیای ڕوشندا بێ، هەر بەشی ڕەنج و خەم دەبێت و من ئەگەر بشچم بۆلای ناتوانم هیچ یارمەتییەکی بدەم. بەڵام وێڕای ئەمەش هەر دەڕۆم، تا کوڕە ئازیزەکەم بدینم و بزانم لەم ماوەیەدا کە لەشەڕ دوور بووە، چ دەرد و بەڵایەکی بەسەر هاتووە."

(٦٥) هەر کە ئەو قسانەی کرد یەکسەر لەشکەفتەکەی وەدەرکەوت. هەموو حوری و پەرییەکان بەشین و گریانەوە دووی کەوتن. شەپۆلان و دەریا ڕێیان بۆ کردەوە، گاڤێ گەییشتنە دەشتی بەپیت و بەرەکەتی تەروادە، یەك لەدوای یەك دابەزینە سەر کەنارەکە، کە کەشتی مورمیدونەکان بەڕیز و لە نزیکی ئەخیل لە وشکاییدا ڕاگیرا بوون. لە کاتێکا ئەخیل دەیناڵاند، دایکە هێژاکەی لێی نزیك بووەوەو بەدەم فیزاحەوە سەری کوڕەکەی گرت و بەدەم گریە و زاریەوە پێی گوت: "کوڕە ئازیزەکەم بۆچی بەم شێوەیە دەگریت؟ چ دەرد و خەمێك ئازاری ڕوحت دەدا؟.. ڕێك و ڕەوان پێم بێ و هیچ شتێکم لێ مەشارەوە. تۆ کە دەستەونزا ڕوو لە ئاسمان لە زیوس پاڕایتەوە، هەرچیت داوا کرد بۆی بەئەنجام گەیاندویت: تۆ داوات دەکرد هەموو کوڕانی ئاخایی ڕاوبنرێن و بەبێ تۆ دووچاری تاڵترین شکستی ڕۆژگا ببن!"

(٧٨) ئەخیلی قۆچاغ، بەدەم ئاه و ناڵەوە بەرسڤی دایەوە: "دایکە، ڕاستە کە زیوس هەموو نزاکانی گیرا کردوم، لێ فایدەی بەچی کە یاوەرە هەرە ئازیزەکەم، پاترۆکلۆس کە لە هەموو یاوەر و دۆستەکانم خۆشتر دەویست مردووە. لە دەستم چوو.. هیکتۆر کوشتویەتی و تاقم و ئەسلەحەکەی بەتالان بردووە. ئەو زرێ و ئەسلەحەیەی کە ئاوی چاوی دەبرد و بینەری دەحەپەساند، هەمان ئەو زرێ و ئەسلەحەیە کە خواوەندان، لەو ڕۆژەدا تۆیان بەبووکی خستە باخەڵی بەشەرێکی فانیەوە، وەکو دیارییەکی بەشکۆ پێشکەشی (بیلیوس)یان کردبوو. بریا هەر بەپاکیزەیی وەکو هەر پەرییەکی پاکیزەی دەریایی دەمایتەوە و بریا (بیلیوس)ش بووکێکی لەتیرەی بەشەری بۆ ماڵە خۆی دەگواستەوە. چونکە ئێستا قەدەری تۆ وایە و ناچاری خەمێکی گەورە و بێ سنور بدەی بەکۆڵتا، خەمی ئەوەی کە کوڕەکەت دەمرێت و تۆ هەرگیز جارێکی دی لە ماڵەوە پێشوازی ناکەیت، چونکە دڵم بەرەو مەرگم بانگ دەکات و لەمەودوا تێکەڵی بەشەران نابم تا هیکتۆر نەکوژم و حەیاتی لەبەر نەبڕم، مەگەر تەنیا بەمە باجی ئەو سەرکێشی و پڕکێشییەی کە پاترۆکلۆسی کوڕی (مینویتیوس)ی کوشت، بدات."

(٩٤) هەنگێ تیتیس، فرمێسك ڕێژان بەرسڤی دایەوە: "بەم پێیە ئەجەلت نزیکە کوڕی من، چونکە یەکسەر دوای مردنی هیکتۆر، سەرە دەگاتە سەر تۆش."

(٩٧) هەنگێ ئەخیلی زەرۆپ بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە گوتی: "خۆزیا هەر ئێستا دەمردم، منێ کە لە مردنا فریای دۆستەکەم نەکەوتم! لە دوورە وڵاتیدا مرد، بێ ئەوەی من فریای بکەوم و بیپارێزم، ئیدی من بۆچی بۆ وڵات بگەڕێمەوە، یان لێرە بەکەڵکی چی دێم، نەفریای پاترۆکلۆس کەوتم و نەفریای ئەو هەموو برادەرەی دی کە هیکتۆر کوشتنی، ئیدی من لێرە، لەناو کەشتییەکانم دانیشتوم و بووم بەبارێکی قورس بەسەر زەوییەوە، منێك کە سەر تۆپی جەنگاوەرانی ئاخیاییم، ئەگەرچی خەڵکانی لەمن بەئاوەزتر و بەردەبارتریان تێدایە.

(١٠٧) ئاه، کاشکێ ناکۆکی و ناتەبایی لەنێوان خواوەندان و مەردماندا نەدەما و تەواو دەبوو. بریا توڕەیی و پشم و غەزەب باری دەکرد، ئەو توڕەبوونەی کە ئاقڵترین بنیادەم تێکدەدات و وەکو دوکەڵ دەخزێتە بن پەڕەی ڕوحییەوە و تامی هەنگوینی ساغی پێدەبەخشێت.. ئەو پشم و غەزەبەی کە ئاگامەمنونی، شای جەنگاوەران تووشی کردم بەهەمان شێوە بوو. بەهەرحاڵ دەبێ چاوپۆشی لەم شتانە بکەین. چونکە ئازارەکانمان

زۆرە. دەبێ جڵەوی دڵمان بگرین.. من هەر ئێستا دەڕۆم و ڕووبەڕووی هیکتۆر دەبمەوە، ڕووبەڕووی بکوژەکەی پاتروکلۆس، ئازیزترین دۆستم، دەبمەوە. خۆ ئەگەر زیوس و خواوەندە نەمرەکانی دیکە ئیرادەیان لەسەر مردنم بێ، ئەوا بەدڵێکی ئاسودەوە قەبوڵی دەکەم. جا هەرکولی فیلەتەن لە مردن نەخەلەسی، وێڕای ئەوەی کە لەلای زیوسی کوڕی کرونوس یەجگار ئازیز و خۆشەویست بوو، کاتێ قەدەر و غەزەبی هیرا دایان بەعاردیدا، نەیتوانی لە چنگ مەرگی دەربێنێ.منیش، ئەگەر قەدەر هەمان شتی لە چارە نووسیبم، بەهەمان شێوە لە عاردی دەکەوم. لێ ئێستا وازم لێ بێنە با شۆرەت و ناوێکی گەورە پەیدا بکەم، کارێکی وەها بکەم ژمارەیەکی زۆر لە ژنانی تەروادەیی و دەردانی سینگ قوت، بەهەردووك دەستان بەدەم شیوەن و زارییەوە روندکی سەر گۆنا ناسکەکانیان بسڕن.. تاکو باش بزانن کە من ماوەیەکی زۆر خۆم لەم شەڕە نەدا. کەواتە دەست مەیەنە ڕێگەم، چونکە ، چارەنووسم هەرچیەك بێ! ناتوانی ژێوانم بکەیەوە"

(١٢٧) هەنگێ یەزدانخانمی زیوین پا، تیتیس وەڵامی دایەوە و گوتی: "هەق بەتۆیە کوڕەکەم، چوونە هیمدادی هاوڕێ ماندووەکانت، کە شەڕ و مەرگ تەنگی پێ هەڵچنیون، کارێکی هەژییە. بەڵام چەك و ئەسلەحەکەت لای تەروادەییەکانە، چەك و ئەسلەحە برونزییە ڕەخشانەکانت، هیکتۆری کێو ڕەخشان لەخۆی داوە و خۆی پێوە دەنوێنێ. بەڵام ئەم خۆنواندنەی زۆر دەوام ناکات، چونکە ئەجەلی نزیکە. بەڵام تۆ جارێ خۆت مەخە ناو گێژەنگ و ئاژاوەی شەڕەوە، چاوەڕوان بکە تا دێمەوە بۆلات، سبەینێ لەگەڵ گزنگی هەتاودا لێرە ئامادە دەبم، چەك و تفاقێکی جەنگی نایابی دەستکردی (هیفایستوس)ت بۆ دێنم."

(١٣٨) یەزدانخانم دوای ئەو قسانە کوڕە ئازاکەی بەجێهێشت، ڕویکردە خوشکەکانی، پەریانی دەریایی و گوتی: "ئێوە ئێستا خۆتان بەدەریادا بکەن و بچنە دیداری پیری دەریا و کۆشکەکەی بابم، و لە هەموو ڕووداوەکانی ئاگادار بکەنەوە. منیش دەچم بۆ ئۆڵەمپی سەربەرز، بۆ لای هیفایستوس. ئاسنگەرە بەناوبانگەکە، بەڵکو بتوانم کارێکی وەها بکەم کە زرێ و ئەسلەحەیەکی نایاب وڕەخشان بۆ کوڕەکەم دروست بکات."

(١٤٥) دوای ئەو قسانە، پەریانی دەریایی خۆیان وەبن شەپۆلانی دەریادا کرد و، یەزدانخانم، (تیتیس)ی زیوین پا، بەرەو ئۆڵەمپ ملی ڕێی گرت تا زرێ و ئەسلەحەیەکی نایاب بۆ کوڕە ئازیزەکەی بێنێ.

(١٦٤) بەڵا، لەو دەمەدا کە ئەو بەپێیان بۆ ئۆڵەمپ دەڕۆیی. ئاخیەکان، پەشێو و پەشۆکاو، بەدەم هاواری ترسەوە لەبەر هیکتۆری مێرخاس، هیکتۆری مەردم کوژا، چنگ لەسەرشان هەڵدەهاتن و تا کەشتییەکان و نزیکی هیلیسپونت نەوەستانەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئاخیانی برونزینە پۆش، نەیانتوانی لەژێر بارانی تیر و نێزەی هیکتۆر و تەروادەییاندا، جەنازەکەی پاتروکلۆسی یاوەر و میرئاخوری ئەخیل دەرباز بکەن؛ چونکە لەشکر و ئەسپان و گالیسکە و هیکتۆری کوڕی پریام، کە لە جۆش و خرۆش و ئازایەتیدا دەتگوت ئاگرن، گەیی بوونە سەری. هیکتۆر سێ جاران لەلاقی نەوی بوو و بەدەنگی بەرز هاواری لە تەروادەییەکان کردبوو کە بچنە هیمدادی و جەنازەکە بەرن.. برایانی (ئەجاکس)ش کە یەکپارچە غیرەت و بوێری بوون لە لاشەکەیان دوور خستبووەوە. بەڵام هیکتۆر، پشت بەهێز و ئازایەتی خۆی جارێ هێرشی دەکرد و جارێ دەوەستا و بەدەنگی بەرز بانگی لە تەروادەییەکان دەکرد. بەڵام بەئەندازەی سەری قامکێك پاشەکشەی نەدەکرد. وەکو چۆن شوانانێك شەوانە لە لەوەرەگاکاندا پاسەوانی دەکەن، ناتوانن شێرێکی سورخنی گیرۆدەی برسێتیەکی کوشندە لەلاشەی پەزێکی ناو مێگەلەکەیان دوور بخەنەوە، بەو ئاوایە جووتە ئەجاکسی دلێر و شەڕڤانیش نەیانتوانی هیکتۆری کوڕی پریام بترسێنن و لە جەنازەکەی پاتروکلۆسی دوور بخەنەوە.

(١٦٥) خۆ ئەگەر ئایریسی قۆچاغ فریا نەکەوتبا، لەوە بوو بتوانێ جەنازەکە برفێنێ و شانازییەکی گەورە بەدەست بێنێ. ئایریس بەپەلە لە ئولیمبوسەوە، بەبێ ئاگاداری زیوس و خواوەندەکانی دیکە پەیامێکی بۆ کوڕی بیلیوس (ئەخیل) هێنابوو کە خۆی بۆ شەڕ ساز بدات، هیرا بەدزییەوە ناردبووی، لێی نزیك بووەوە و بەڕوونی و ڕەوانی پێی گوت: "ڕابە ئەی کوڕی بیلیوس، ئەی سەرتۆپی جەنگاوەرانی بەهێز، ڕابە! فریای پاتروکلۆس بکەوە، کە لە نزیکی کەشتییەکان شەڕێکی ترسناکە لەسەر کوشتەکەی. جەنگاوەران دوای یەکدی دەبڕنەوە، داناییەکان بەرگری لە جەنازەکەی دەکەن و پاسی دەکەن، تەروادەییەکان هەوڵدەدەن جەنازەکەی بفڕێنن و بۆ تەروادەی بادرزی بەرن، بەتایبەتی هیکتۆری گەڕنۆس کە لە هەموویان پەرۆشترە جەنازەکە دوور بخاتەوە و سەری لێ بکاتەوە و بەپەرژین و سینگی حەساری تەروادەیدا هەڵواسێ. ڕابە و لەوەی پتر لێرە دامەنیشە! فریاکەوە دەنا پاتروکلۆس دەبێ بەخۆراکی کسۆکانی تەروادە. ئەگەر فریانەکەوی و لاشەکە بشێوێنن شەرمەزاری دنیا بۆ تۆ دەمێنێتەوە. هەموو خەڵکی

ناحیایی ئەو نەنگ و شەرمەزارییە دەخەنە ئەستۆی تۆ!
(١٨١) ئەخیلی گورج و گۆڵ گوتی: "ئەی یەزدانخانم، ئەی ئایریس، کام خواوەند بەتۆی فەرمووە کە ئەم فەرمانە بەمن بدەی؟
(١٨٣) ئایریسی قۆچاغ وەڵامی دایەوە: "هیرا، هیرای هاوڕێ و هاوسەری بەناز و شکۆی زیوس منی ناردووە. بەڵام نە کوڕەکەی کرونوس، خودانی عەرشی عەزیم ئاگادارە و نەهیچ یەکێك لە خواوەندە نەمرەکانی، ئاکنجی لوتکە بەبەفرەکانی ئۆلیمبوس ئاگادارن."
(١٨٧) (ئەخیل)ی زەرۆپ وەڵامی دایەوە: "ئاخر من چۆن بچمە شەڕەوە؟ دەستیان بەسەر زرێ و ئەسلەحەکەمدا گرتووە، دایکم ڕای سپاردووم کە تا ئەو نەیەتەوە نەچمە شەڕەوە، چونکە بەڵێنی داومەتێ چەك و ئەسلەحەیەکی نایابم لەلای هیفایستوسەوە بۆ بێنێ. جگە لە زرێیەکی ئاجاکسی کوڕی تیلامون هیچ زرێیەکی دیکە بەبەرم ناکات، هەڵبەتە ئەویش نهو لە ریزی پێشەوەی جەنگاوەراندایە و بەزەبری ڕمەکەی ،دژمنان دەکوژێت و جەنازەکەی (پاتروکلۆس)یان لێ پاس دەکات."
(١٩٦) ئایریسی قۆچاغ، کە لە ڕوییشتنا بای پێدا نەدەگەیی، گوتی: "ئێمەش دەزانین، دەستیان بەسەر زرێ و چەکەمەنیەکەتدا گرتووە، بەڵام ئێمە دەمانەوێ هەر بەم حاڵەوە بچی بۆ خەنەکەکە و خۆت پیشانی جەنگاوەرانی تەروادەیی بدەیت و هەر کە بت بینن ترسیان لێ بنیشێت و دەستبەرداری جەنگ ببن. هەنگێ کوڕانی شەڕڤانی ئاخایی، کە شەڕەکە ماندووی کردوون، هەناسەیەك دەدەن و ئاهێکیان وەبەر دێتەوە، چونکە پشووی شەڕ مایەوەکی زۆری ناوێ."
(٢٠٢) ئایریسی زەرۆپ دوای ئەو قسانە، ڕۆیی. ئەخیلی خۆشەویستی زیوس ڕابوو. ئەتینا سپەرە عەنتیکە و بەنەخش و نیگارەکەی خۆی کردە شانە بەهێزەکانی ئەو. ئەوسا پەڵە هەورێکی زێرینی میناکی تاجی لەسەرنا کە تیشکێکی وەهای دەدایەوە چاوانی دەخستە ڕێشکە و پێشکە. وەکو چۆن دووکەڵێك لە شارێکی دوورە دەستەوە، لە دورگەیەکەوە کە دژمن ئابڵوقەی دابێ هەڵدەستێ و دەچێت بەئاسماندا، خەڵکی ئەو شارە، بەدرێژایی ڕۆژ، لە دەرێی حەساری شاردا، خردەبنەوە، تا مل بۆ داوەری ئایریسی بەهێز و ترسناك بدەن، بەڵام تاشەو دادێ و هەتاو دەنیشێت، ئاگر، چڕ و تێك ڕژاو، هەر بڵێسە دەسەنێ و کڵپە دەکات و بڵێسەی توندی ئاشکرا دەبێ و دەگاتە بنی ئاسمان، تا دەر ودراوسێیان ببینن و هاوڵاتیان بزانن کە ئایا، سەرنشینانی کەشتیان، بەهانایانەوە دێن تا لە فەوتان ڕزگاریان بکەن یان نا. بەڵا

بەهەمان شێوە ڕوناکییەکی ڕووناك لەسەری ئەخیلەوە هەڵدەستا و دەچووبەئاسماندا. ئەخیل لە خەسارەکە ڕەت بوو و لە کەناری خەنەکەکە وەستا. بەڵام پەیوەندی بەئاخاییەکانەوە نەکرد، چونکە نەیدەویست ئامۆژگاری و فەرمانەکەی دایکی لە عاردی بدات.

(٢١٧) لەوێندەر وەستا و تا زاری گرتی هاواریکرد.. ئەتیناش هاوارەکەی گەیاندە دوور، ترسێکی سەیر لەنێو تەروادەییەکان بڵاوبووەوە. وەکو چۆن کاتێ دژمنان شارێك ئابڵوقە دەدەن و پەلاماری دەدەن و تەنیا بیر لە خوێنرێژی و وێرانی دەکەنەوە، دەنگی شوم و سامناکی شەیپوری جەنگ بەرز دەبێتەوە، دەنگی بەرزی (ئەخیل)ش بەهەمان شێوە سامناك و ترسێنەر بوو. تەروادەییەکان گاڤێ دەنگی برونزینی ئەخیلی کوڕی (ئیلیوس)یان ژنەفت، هەموو دڵیان داخورپا وترسیان لێ نیشت. ئەسپەکان بەیاڵوبژی جوانیانەوە بەعەرەبانەکانەوە بەرەو پاش دەگەڕانەوە، چونکە لە ناخی دڵەوە هەستیان بەنزیکی کارەسات و ماڵوێرانی دەکرد. میرئاخوڕ و گالیسکەڕانەکان کە دیتیان گڕێکی لە دامرکانەوە نەهاتوو، ترسناك لەسەر سەری کوڕە دلاوەرەکەی (بیلیوس)ەوە بەرز دەبێتەوە، تەواو ترسیان لێ نیشت. ئەتینای چاوگەش بوو کە ئەو ئاگرەی هەڵایساند بوو.

(٢٢٩) ئەخیلی مەزن، سێ جاران، بەدەنگی بەرز و لەسەر خەنەکەکە هاواریکرد. سێ جاران تەروادەییەکان و هاوپەیمانە بەناوبانگەکانیان هەراسان بوون.. بەجۆرێ شڵەژان کە دوازدە جەنگاوەری هەرە ئازا و بژاردەیان کەوتنە ژێر عەرەبانەکانیانەوە و هەر بەنێزە و ڕمی خۆیانەوە بوون و مردن. ئاخاییەکان زۆر کەیف خۆش بوون و (پاتروکلۆس)یان لە تیرڕەسی دژمن دوور خستەوە و خستیانە سەر دەسەبەرەیەك. یاوەرە دڵسۆزەکانی بەگریانەوە لێی خڕبوونەوە، یەکێك لەوانە ئەخیل بوو کە بەکوڵ و دڵ فرمێسکی گەرمی دەڕشت و چاوی بەرایی نەدەدا هاورێ هەرە دڵسۆزەکەی بەمردوویی بەسەر دارە مەیت و دەستەبەرەوە بدینێ. سەرە نێزان جەستەی ئەنجن ئەنجن کردبێ. ڕاستە ئەو بەعەرەبانە و ئەسپەکانیەوە بۆ شەڕی بەڕێ کردبوو، بەڵام نەیتوانی لەگەڕانەوەدا پێشوازی بکات.

(٢٣٩) ئەوجا هیرا، شابانۆی چاوکەژاڵ، هەتاوی بەرەو ئۆقیانوس نارد، هەتاو بەبێ ویستی خۆی، بەنا بەدڵی ئاوا بوو، ئاخاییانی جوامێر لەشەڕ وهەرا وهەنگامەی جەنگ وەستان.

(٢٤٣) تەروادەییەکان پاش ئەوەی لە مەیدانی شەڕ کشانەوە، بەرلەوەی بیر لە خواردنی

سیف بکەنەوە، کۆبوونەوەیەکیان کرد، بەدرێژایی کۆمبینەکە هەر بەپێوە بوون، هەموو لە دەرکەوتنی کوت و پڕی ئەخیل ترسا بوون، ئەگەرچی دەمێ بوو لە شەڕ و شەڕگە دوور بوو. (بولیداماس)ی حەکیم و بەئاوەز، کوڕی بانیوس، بەر لە هەمووان کەوتە قسان، ئەم پیاوە لە هەمووان باشتر هۆکار و ئەنجامی کارەکانی لێکدەدایەوە. هاوڕێی هیکتۆر بوو، بەیەك شەو لە دایك بوو بوون. یەکێکیان لە قسە و زمانپاراویدا لە پێش بوو و ئەویتریان لە ڕمبازیدا. بەنیازێکی پاکەوە ڕوویکردە ئاپۆرەی جەنگاوەرەکان و گوتی:

(٢٥٤) "دۆستان، باش بیربکەنەوەو هەموو شتەکان بەچاکی هەڵسەنگێنن. من بەش بەحاڵی خۆم ئامۆژگاریتان دەکەم کە هەر ئێستا بەرەو شار بگەڕێنەوە و چاوەڕوانی ئەوە مەکەن لەم دەشتە و لە نزیکی کەشتییەکان ڕۆژتان لێ هەڵبێ، چونکە ئێمە زۆر لە حەسار و بورجەکان دوورین. تا ئەو دەمەی ئەم پیاوە لە ئاگامەمنون غەنزری بوو شەڕی ئاخاییەکان ئاسان بوو. من ئەوکاتە خۆشحاڵ دەبووم کە لە نزیکی کەشتییە تیژڕۆکانیان هەڵماندا بووایە، بەئومێدی ئەوەی دەست بەسەر کەشتییەکانیانا بگرین. بەڵام ئێستا من زۆر لەکوڕی بیلیوس، دەترسم. کەرب و کینی بەرادەیەکە کە بەوەوە ناوەستێ لەم دەشتەدا، کە تەروادەییان و ئاخاییان لە گەرمەی شەڕدان، شەڕ و کوشتار بکات. ئەو شەڕ بۆ گرتنی شارەکەمان دەکات، بۆ هەڵگرتن و دیل کردنی ژنەکانمان شەڕ دەکات.

(٢٦٥) جا بەگوێی من بکەن‌و وەرن بۆ شار بگەڕێینەوە. چونکە ڕووداوەکان بەمجۆرە دەبێت، کوڕی بیلیوس بەم شەوە هیچ ناکات، بەڵام کە سبەینێ بەهەموو تەدارەکی جەنگەوە بێتە مەیدان وهەر لێرەدا پەلامارمان بدات، ئەوجا بەچاوی خۆ دەبینین کە چمان بەسەر دێت، هەنگێ بەختەوەر ئەو کەسە دەبێت کە لەبەری هەڵا و بگاتەوە تەروادە، ئەوکات ژمارەیەکی زۆر لە تەروادەییان دەبن بەخۆراکی کسۆك و داڵاشان.. خودایە نەگەم ئەو چیرۆکانە بژنەوم!.. لێ ئەگەر بەقسەی من بکەن، هەرچەند ئەو قسەیەمان لەبەر گرانە، ئەوا دەتوانین سوود لە شەوەکە بدینین و لە کۆبوونەوەیەکدا خۆمان ڕێك بخەینەوە و خۆ ساز بدەینەوە، ئەمە جگە لەوەی کە بورجە بەرزەکان ودەروازە گەورەکان، کە پشتکۆڵی مکومیان هەیە، شار دەپارێزن. سپێدەش، هەموو بەچەك و تفاقی جەنگەوە، لەسەر بورجەکانی خۆمانەوە دەردەکەوین، هەنگێ زۆر زەحمەتە ئەو پاڵەوانە هێرشمان بکاتە سەر، ڕەنگە کەرب و کین هەڵیبگرێ و لە کەشتییەکان دوور بکەوێتەوە و بیەوێ شەڕی ئێمە بکات و حەسارەکەمان و بورجەکانمان بگرێت. بەڵام دوای ئەوەی جڵە و بۆ ئەسپە

مل بەرزەکانی شل دەکات و لێرەوە بۆ ئەوێ و لەوێوە بۆ ئێرەیان تاو دەدات و بێهودە لە بناری شاردا پەلامار دەدات ئەسپەکانی ماندوو دەبن. هەنگێ زاتی ئەوە ناکات خۆی بەناو شاردا بکات و وێرانی بکات، بەرلەوەی فریای ئەمە بکەوێ کسۆکانی درِ هەڵیدەدرن."

(٢٨٤) هەنگێ هیکتۆری کێورەخشان، بەتورەیی برۆی وێك هێنانەوە و رووی تێکرد و گوتی: "ئەی بولیداماس، من ئەم قسانەی تۆم بەدڵ نین، تۆ داوا دەکەی بۆ شار بگەرێینەوە و خۆمان لەوێندەر زندانی بکەین، لە شار و ناو چواردیواری شار تێرنەبوون؟!.. خەڵکی لە کۆنی کۆنەوە هەر باسی شارەکەی (پریام)یان کردووە، و بەزێر و برونزی سەرسام بوون. بەڵام ئێستا لەوەتای زیوسی مەزن لێمان چووە بەقینا، ئەو گەنجینانە لە ماڵەکاندا نەمان، زۆربەی کەلوپەلەکانمان لە فریجیا و میونیای جواندا فرۆشران.. ئێستاش کە کوری کرونوسی بردەبار، دەرفەرتی ئەوەی داومەتێ کە لە کەناری کەشتییەکاندا سەرکەوم و سەرفرازی بەدەست بێنم و ئاخاییان بەرەو دەریا راوبنەم و پاشەکشەیان پێبکەم، ئەم گەوجە گەرجە بۆ خەڵکەکە مەکە، کەس بەگوێت ناکات و من رێگەی نادەم. ئێستا هەموو وەرن بەگوێی من بکەن: هەموو پێکەوە و لە ئۆردوگاکەدا، شیڤ بخۆن، ریزەکانی خۆتان تێکمەدەن، بەوریایی ئێشکی خۆ بگرن. جا ئەگەر هەر تەروادەییەك لە موڵك و ماڵی خۆی دەترسێت، بچێ کۆی بکاتەوە و بەسەر سوپاییەکانیا دابەش بکات، چونکە بۆ سوپاییەکانی خۆمان بێ، زۆر باشترە ئاخاییەکان دەستی بەسەرا بگرن و بیبەن. جا سپێدە زوو، هەموو رادەبین، تەدارەکی شەرِ لەخۆ دەدەین و لەلای کەشتیەکان شەرێکی گەرم هەڵدەگیرسێنین. خۆ ئەگەر ئەخیل بیەوێ لەلای کەشتییەکان رابێ، ئەوا تیا دەچێت. هەنگێ من بەلای کەمەوە لەبەری هەڵنایەم، و رووبەرووی دەبمەوە، چ ئەو سەربکەوێ و چ من. خواوەندی جەنگ بۆ هەمووان هەریەکە، هەر کەسێك بکوژرێت، مانای وایە ئەجەلی هاتووە.

(٣١٠) هیکتۆر بەو ئاوایە قسەی بۆ ئاپۆرەکە کرد، تەروادەییەکان بەدەنگی بەرز کەوتنە هوراکێشان. کە گەوج و کەودەن بوون! ئەتینا ئاوەزی شێواندبوون، هەموو قسە نابەجێیەکانی هیکتۆریان پەسند کرد. کەچی کەس ئامۆژگارییەکانی (پولیداماس)ی، کە مایەی رزگاری بوو، بەهەند وەرنەگرت. ئیدی بەتەدارەك و تفاقی جەنگەوە و هەر لە ئۆردوگاکەدا کەوتنە شیڤ خوارن.. ئاخاییەکان بەدرێژایی شەوەکە بەدیار جەنازەکەی پاتروکلۆسەوە ناڵاندیان و گریان، کورەکەی بیلیوس یەکەم کەس بوو لەناویاندا، کە

دەستە کوشتۆخەکانی نانە سەر سینگی یاوەر و هاورێکەی و بەکوڵ کەوتە گریە و زاری. وەکو چۆن شەپاڵێکی پیر، کە ڕاوچییەك لە بێشە و لێرەوارێکی چڕە دارستاندا ڕێی دەکەوێتە سەر لانەکەی و بێچوەکانی دەبات، و کاتێ پیرە شێر شەوێ دەگەڕێتەوە لانەکەی و دەبینێ بێچوەکانی نەماون، خەم دایدەگرێت، و زووبەزوو تورە دەبێت، و دۆڵا و دۆڵ دەڕوات و دەکەوێتە تاقیبی ئەو ڕاوچییە، بەهەمان شێوە (ئەخیلوس)ش بەدەم ئاە و ناڵە و فیغانەوە، ڕوو لە مەرمیدونەکان دەیگوت: "مەخابن، ئەو ڕۆژەی وەعد و بەڵێنم بەمینویتیوس دا، لەماڵەکەی خۆیدا بەڵێنم دایێ کە دوای ئەوەی تەروادەم گرت، کوڕە دلێرەکەی بۆ ئوبوس، بەدیاریی و دەسکەوتەوە، بەسەلامەتی بۆ دەبەمەوە. لێ ئەوەی لای بەندە خەیاڵە لەلای زیوس بەتاڵە، زیوس هەموو ئاواتەکانی بەشەر نایەنێتەدی، ئێمە هەردووکمان لە چارەمان نووسراوە بەخوێنی خۆمان، خاکی ئێرە، خاکی تەروادە سوور بکەین –چونکە منیش جارەکی دی ناگەڕێمەوە تا بیلیوسی شۆڕەسواری پیر لە کۆشکەکەی خۆیدا پێشوازیم بکات، هەروەها تیتیسی دایکیشم جارەکی دی نامبینێتەوە، خاکی ئێرە دەبێت بەگۆڕم. جا ئەی پاتروکلۆس، مادامێکی دوای تۆ مەنزڵم ژێر زەوییە، بەڵێن بێ تا چەك و ئەسلەحەکەی تۆ و سەری هیکتۆر، ئەو جەنگاوەرە دلاوەرەی کە تۆی کوشت، بۆ ئێرە نەهێنمەوە، بەخاکت ناسپێرم. بەڵێن بێ دوانزە کوڕی ناوداری تەروادەیی، لە بەرانبەر ئەو شەوتنگەیەی کە جەنازەکەتی لەسەر دێتە سوتاندن، سەر بڕم. چونکە مەرگی تۆ، بەڕاستی تورە و کەسەرداری کردم. تا ئەو کاتە با جەنازەکەت لە پاڵ کەشتییەکاندا بەم شێوەیە بمێنێ. شەو و ڕۆژ ئەو خانمە تەروادەیی و دەردانییە مەمك قوتانەی کە پێکەوە بەڕەنجی خۆمان و بەزەبری هێزی نێزە درێژەکانمان، کاتێ شارە ئاوەدانەکانیانمان گرت، بەدیلی هێنامانن، بەدیارتەوە دەگرین. شینت بۆ دەگێڕن. (٣٤٣) دوای ئەو قسانە ئەخیل فەرمانی بەهاورێکانی دا کە مەنجەڵێکی گەورەی سێ پایە بخەنە سەر ئاگر، ئاو گەرم بکەن، تا بەپەلە خوێنە وشکەوە بووەکەی سەر جەستەی پاتروکلۆس بشۆن. مەنجەڵەکەیان نایە سەر ئاگرێکی گڕ، پڕیان کرد لە ئاو، داری باشیان لەژێر نا، ئاگرەکە هەر چواردەوری مەنجەڵەکەی گرت، ئاوەکە هاتە کوڵ. ئەوجا جەنازەکەیان شت، بەزەیت چەوریان کرد. برینەکانیان بەهەتوانێکی نۆ ساڵە پڕ کردەوە، ئەوجا (پاتروکلۆس)یان لەسەر دارەمەیتێك ڕاکێشا، بەپارچە کەتانێکی نەرم سەراپایان داپۆشی و لەسەر ئەمەوە پارچەیەکی سپی جوانیان تێوەپێچا. بەو جۆرە مەرمیدونەکان

لە دەوری ئەخیل خڕبوونەوە و بەدیار پاترۆکلۆسەوە هەموو شەوەکەیان بەگریە و زاری گوزەراند.

(٣٥٦) ئەوجا زیوس ڕوویکردە هیرای ژن و خوشکی و گوتی: "ئاخری ئاواتەکەی خۆت هێنایەدی ئەی هیرای چاوکەژاڵ، ئەی هیرای هەژی. ئاقیبەت ئەخیلی قۆچاغت هاروژاند.. هێندە بەدڵ و گیان پشتیوانی لە ئاخاییان دەکەی لەتۆ وایە لە گۆشت و خوێنی تۆن!"

(٣٦٠) هیرای هەژی، چاوکەژاڵ، وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی کرونۆسی سامناک، ئەم قسەیە چییە! سەیرە! ئەوەندەی من بزانم تەنانەت بەشەریش، چەندی بتوانێ یارمەتی برای بەشەری خۆی دەدات، هەرچەند لە هیچ ڕوویەکەوە هاوتای ئێمەی خواوەندان نییە. جا من کە لە دوو سەرەوە مەزنترین یەزدانخانمم پێ دەگوترێ: یەکەم وەکو ڕەسەن لە هەموو یەزدانخانمەکان گەورەترم، دووەم هاوسەری تۆم، تۆی سەرداری گشت خواوەندەکان، بەڵا، من کە لە تەروادەییەکان تورەم، چۆن دەتوانم دژایەتیان نەکەم؟"

(٣٦٨) بەو شێوەیە یەکتریان دواند، بەڵام تیتیسی زیوین پا، گەییە ماڵی هیفایستوسی نەمر، ماڵەکەی کۆشکێکی ڕازاوەی ئەستێرە ئاسایی درەخشان بوو، لەنێو کۆشکی خواوەندەکانی دیکەدا دیار و بەرجەستە بوو، ئەم کۆشکە یەکپارچە لە برونز دروست کرابوو، ئەو خواوەندە لەنگە بەدەستی خۆی بۆ خۆی دروست کردبوو. تیتیس سەیری کرد، زۆر سەرقاڵە، شەکەت و ماندوو لە ئارەقەدا هەڵکشاوە، بەدەوری مۆشەدەمە وکورە و ئاگرەکەیدا دێ و دەچێت، سەرقاڵی دروستکردنی بیست دانە مەنجەڵی سێ پایەدار بوو کە بەپاڵ دیواری ساڵۆنی کۆشکەکەیدا ڕیز دەکران، لەژێر هەر یەکێکیاندا پێچکەی زێڕینی دروست کردبوو، بەجۆرێ کە بتوانن خۆبەخۆ بچنە کۆڕی خواوەندان و دووبارە بگەڕێنەوەو ببنە مایەی ستایش و ئافەرینی هەمووان. هێشتا بەتەواوەتی لە دروست کردنیان نەبووبووەوە، قوڵفەکانیان مابوو کە وەستایەتیەکی وردی دەویست. خەریکی ئامادەکردنیان بوو، و بزمارەکانی دادەکوتین. لەو دەمەدا کە ئەو بەوپەڕی وەستایەتی و لێهاتوییەوە سەرقاڵی کار بوو، تیتیسی زیوین پا گەییە نك وی. کاریسی نەشیمل، کە سەرپۆشێکی جوانی بەسەرا دابوو، هەمان ئەو کاریسەی کە خواوەندی لەنگی دەست و بازوو بەهێز خواستبووی، چووە پێشوازی تیتیس و دەستی گرت و گوتی: "ئەی یەزدانخانمی هەژی و بەڕێز، خێرە ڕووت کردۆتە ماڵی ئێمە؟ یاخوا وەخێرهاتی خێر وەپاتەوە، چونکە تۆ کەمتر سەردانمان دەکەی؟ فەرموو ژوورێ یا لە خزمەتا بم

(٣٨٨) یەزدانخانم بەدەم ئەو قسانەوە، تیتیسی پێش خۆی خست، ئەوجا لەسەر کورسییەکی زیوکفت، کورسییەکی جوان کە زۆر وەستایانە دروست کرابوو، دای نیشاند. چوار پایەیەکیش، کە پێی لەسەر دادەنرا لەبەردەم کورسییەکدا هەبوو. ئەوجا کاریس بەپەلە چوو مێردەکەی خۆی گاز بکات، گوتی: "هیفایستوس خێرا وەرە تیتیس کاری بەتۆ هەیە." خواوەندی ناوداری بەبازوو بەرسقی دایەوە: "من لە ماڵەکەی خۆمدا پێشوازی یەزدانخانمێك دەکەم کە لە هەر کەسێك پتر شایستەی پێشوازی و مایەی ڕێزی منە. ئەو یەزدانخانمە هێژایەی کە منی لە چەپۆکی ڕۆژگار خەلەساند. لەو دەمەدا کە من لێم قەوما و دایکە بێ ئینسافەکەم، دایکە بێ ویژدانەکەم بەخوایشتی خۆی منی لە لوتکەی ئۆڵەمپەوە توردا، چونکە من لەنگ بووم و لە لەنگی من شەرمەزار بوو، دەیویست من لە چاوی هەمووان وەشێرێ و پەنهام بکات .تیادەچووم ئەگەر ئورینومی کیژی ئوقیانوس، کە لە هەڵقوڵین ناکەوێ، و تیتیس نەیانگرتبامە خۆ. نۆ دانە ساڵ لەلای ئەوان مامەوە. لەشکە فتە گەورەکەی ئەواندا زۆر کاری دەستی جوانم ئەنجامدا، وەك: ئاوزونە، موچەوانەی پێچ پێچ، دوگمە و گوڵە یەخە، گەردەنبەند.. ئوقیانوسی کەف چەڕنیش بەسەر شکەفتەکەدا و بە هەر چوار دەورمدا، شەپۆلی دەدا و هارە و هاژەیەکی وای دەنایەوە لە وەسف کرن نایەت.هیچ کەسێك نە لە خواوەندان و نە لە بەشەران بەمەی نەدەزانی. تەنیا ئورینومی و تیتیس نەبێ، ئەوان ڕزگاریان کردم. جا ئەمڕۆکە کە گەورەی کردوم و تەشریفی هێناوەتە ماڵەکەم، ئەرکی منە کە چاکەی ئەو، چاکەی تیتیسی زڵف هوول بدەمەوە، چونکە ئەو منی لە مەینەتی و ئاسیوان ڕزگار کرد. جا تۆ برۆ، پێشوازی بکە و باشترین شتی بۆ دابنێ، تا من کەرەستە و تفاقەکانم کۆبکەمەوە و بێم.

(٤١٠) دوای ئەو قسانە، ئەم خواوەندە زەلامە ناشرین و دێو ئاسایە، بەهانکە هانك لەسەر سندانەکەی هەستا، لەسەر لاقە سست و لاوازەکانی وەستا، موشەدەمەکانی لە ئاگرەکە دوورخستەوە.هەموو ئەو کەرەستە و تفاقانەی کە لە کارەکەیدا بەکاری دەهێنان، لە سندوقێکی زیویندا کۆکردەوە. بەپارچە ئیسفەنجێك دەموچاو و هەردووك دەست و ملە ئەستورەکەی و سینگە توکنەکەی خاوێن کردەوە. جلێکی لەبەرکرد، داردەستێکی زەلامی بەدەستەوە گرت و بەشەلە شەل وەدەرکەوت. کۆمەڵێك کارەکەری لە زێڕ دروستکراو لەشێوەی ئافرەتی زندوودا کەوتنە دەوروخونی.. ئەم کارەکەرانە لە پاکیزانی زندوو دەچوون، هەستیان هەبوو، هێز و توانای قسەکردنیان هەبوو، زۆر کاری

دەستیان دەزانی کە خواوەندان ئەو بەهرانەیان پێ بەخشی بوون.. ئەو پاکیزانە دەوری ئاغاکەیان دابوو کە لە ڕێکردنا یارمەتی بدەن. هیفایستوس بەزەحمەت بەرەو لای تیتیس چوو، لەسەر کورسیەکی رەخشان ڕۆنیشت، ئەوجا دەستی گرت، ڕووی تێکرد و گوتی: "ئەی تیتیسی هەژی و بەڕێز، بۆچی هاتووی بۆماڵەکەی ئێمە، تانهو زۆر بۆ ئێرە نەدەهاتی؟ دڵی خۆتم بۆ بکەوە، هەرچیەکت بوێ، بەس لە توانای مندا بێ، بکرێ و مەحاڵ نەبێ، دریغیت بۆ ناکەم!"

(٤٢٨) تیتیس بەدەم فرمێسک ڕشتنەوە لە وەڵامیا گوتی: "هیفایستوس ئایا لەنێو هەموو یەزدانخانمانی ئۆلیمبوسدا کەسیان ئەو خەم و پەژارەیەیان هەیە کە زیوسی کوڕی کرونوس لەمنی بارکردووە؟هەستا لەناو هەموو خواوەندانی دەریاییدا، بەتۆبزی منی کرد بەهاوسەری بەشەرێکی فانی، بەهاوسەری بیلیوسی کوڕی ئیکوس، بەناچاری هاوسەری و هاوجێیی ئادەمیزادێکم قەبوڵ کرد کە ئێستا پیری کەلەلای کردووە و لە بنەبانی کۆشکەکەیدا ڕۆژگار بەڕێدەکات. جا بریا خەم و نیگەرانی یەکەم هەر ئەوەندە دەبوو و لێرەدا دەبڕایەوە.. کوڕێکم لێی بوو، وەرە بەدڵ و گیان بەخودان و پەروەردەی بکە، بوو بەسەرتۆپی قارەمانان، من ئەم کوڕەم وەکو نەونەمامێك لە باشترین و بەپیت ترین شوێنی کێڵگەیەکدا بنێژرێ و پەروەردە بکرێ، بەو شێوەیە پەروەردەم کرد و بەخۆ وکەشتییەکانییەوە بۆ (ئیلیون)م نارد تا شەڕی تەروادەییەکان بکات. جا من جارێکی دی بەچاوانی خۆم نایبینم کە بۆ وڵاتی خۆ و بۆ کۆشکەکەی بیلیوس بگەڕێتەوە. بەڵام کە هێشتا زندووە و تیشکی هەتاو دەبینێ، دووچاری خەم و پەژارەیەکی فرە بووەو هەرچەندە من چووم بۆلای، بەڵام بەهیچ جۆرێ ناتوانم یارمەتی بدەم. ئەو کیژەی کە ئاخاییەکان وەکو دیاریی بۆ ئەویان دانابوو، ئاگامەمنونی بەتوانا لێی زەوت کردووە، جا لەبەرئەوە یەجگار پەرێشان و خەمبارە.. بەهەرحاڵ تەروادەییەکان، ئاخاییەکانیان لە پاڵ کەشتییەکانیاندا بەگیر هێناوە و ڕێگەیان نادەن لەوێندەر دەربچن، ئیدی ردێن سپیان و پیاو ماقوڵانی ئارگۆسی تکایان لێکردووە کە فریایان بکەوێ و بەڵێنی دیاری و دەسکەوتێکی زۆریان داوەتێ. هەرچەندە ڕەفزی کردووە کە بەخۆی بچێتە شەڕەوە و لەو مەینەتیە ڕزگاریان بکات، لێ زرێ و چەك و ئەسلەحەکەی خۆی داوە بەپاترۆکلۆس و بۆ شەڕەکەی ناردووە و لەشکرێکی زۆری بەگەڵ خستووە. ئەم هێزە بەدرێژایی ڕۆژێك لە نزیکی دەروازەکاندا جەنگیون، دەشیا لەم ڕۆژەدا شار بگرن و تاڵانی بکەن، ئەگەر ئەپولۆ

دورە دڵەوەرەکەی منویتیوسی، کە پێشتریش گاڵەی بەتەروادەییەکان کردبوو، لە ڕیزی پێشەوە نەکوشتبوایە و سەرفرازی و ناڤ و دەنگی بەهیکتۆر نەدابوایە. لەبەرئەوەیە کە دەبینی ئەمرۆ هاتوومەتە دەف تۆ، تا دەستە و دامێنت بکەوم و داوات لێبکەم کە زرێ و قەڵغان و کێوخودێك و جووتێ لاقبەندی بەرەزوانەدار و سینەبەندێك)م بۆ کوڕەکەم بدەیتێ، ئەو کوڕەی زۆری لەم دنیایەدا نەماوە. چونکە چەك و ئەسلەحەکەی خۆی دابوو بەیاوەرە وەفادارەکەی، کە کوژراوە و هیکتۆر بەتاڵانی بردویەتی و کوڕەکەم ئەوەتا خۆی داوە بەعاردیدا و بەدەم داخ و کەسەرەوە دەتلێتەوە."

(٤٦٢) ئیدی، خواوەندی لەنگی ناودار لە وەڵامیا گوتی: "خەمت نەبێ، دڵ لە دڵ مەدە، ئەگەر من نەتوانم بەئاسانی تیری مەرگ لە کوڕەکەت دوور بخەمەوەو کە ئەجەل هات گەڕانەوەی نییە، ئەوا دەتوانم چەك و ئەسلەحە و زرێ و قەڵغانێکی هێندە نایابی بۆ دروست بکەم، کە هەر کەسێك بیدینی واقی وڕبمێنێ."

(٤٦٨) هیفایستوس ئەو قسانەی کرد و تیتیسی لەوێندەر بەجێهێشت، چوو بەلای کورە و موشەدەمەکانییەوە، ڕووی کردنە ئاگرەکە و ئەمری پێکردن کە کار بکەن.. ژمارەی موشە دەمەکان بیست دانە بوون، و بەگڕی جیاواز ئاگری سەر بۆتەکانیان دەگەشانەوە، مس و تەنەکە و زیوو زێڕی نایە سەر ئاگرەکە، سندانە زەلامەکەی نایە سەر پایەیەك، و بەدەستێکی چەکوشەکەی گرت و بەدەستەکەی دیکە مقاشەکانی گرت.

(٤٧٨) هیفایستوس یەکەمجار قەڵغانێکی گەورەی بتەوی دروست کرد، لە هەموو لایەکەوە ڕازاندیەوە ئەمما ڕازانەوە، چوارچێوەیەکی پرشنگداری سێ توێی لە دەوری چەسپاند، بەحەمایلی زیو پێکەوەی بەستن، قەڵغانەکەی پێنج توێ بوو، بەوپەڕی هونەرمەندی و وەستاییەوە نەخشاندی.

(٤٨٣) نەخشی زەوی، ئاسمان، دەریا، ڕۆژی پرشنگدار و مانگی چواردە و ستێرانی ئاسمانی لەسەر کێشا بوو: بلیادس و هیادیس و ئوریون و حەوتەوانە کە بەشەران دوو براشی پێ دەڵێن کە بەبەردەوامی بەدەوری یەکتردا دەسوڕێنەوە و دەڕواننە ئوریون، ئەو ئوریونەی کە تاقە ئەستێرەیەك بوو لە شەپۆلی ئوقیانوسدا نقوم نەبوو. هەر هەموو ئەمانەی لەسەر نەخشاندبوو..

(٤٩٠) هەروەها دووشاری زۆر جوانی بەشەرانی لەسەر ئەم قەڵغانە نەخشاندبوو: لە یەکێکیاندا شایی وزەماوەند وداوەت ودەعوەتان بوو، ئاهەنگ گێڕان لەبەر تیشك وڕوناکی

مەشخەڵاندا بووك و زاوايان لەماڵەوە دێنایە دەرێ و بەدەم گۆرانی و سترانەوە بەکوچە وکۆڵانانی شاریاندا دەگێڕن، ئاهەنگگێڕانی لاو لەسەر نەزمی چەنگ و زوڕنا هەڵدەپەڕن و دەرەقسن.. هەر ژن بوو لەبەر دەرگاوە بەسەرسامی دەیانڕوانییە ئەم دیمەنە.

(٤٩٧) هەر لە هەمان شاردا، لە هەمان کاتدا خەڵکێکی زۆر گردبوو بوونەوە، شەڕێك قەوما بوو دوو پیاو لەسەر خوێنی زەلامێکی کوژراو مشت و مڕیان بوو، یەکەمیان بەخەڵکەکەی ڕادەگەیاند کە خوێنی کابرای کوژراوی بەتەواوەتی داوە، بەڵام دووەمیان دەیگوت عەشتەبای وەرنەگرتووە.هەریەکەیان بەڵگە و بیانوی خۆی دێنایەوە. هەردوکیان دەیانویست داوەرێك بکەوێتە بەینەوەو کۆتایی بەکێشە و قەرقەشەکەیان بێنێ، هەر یەکێك لەو دووانە لەناو هاوشارییەکانیاندا لایەنگرانی خۆی هەبوو، ئەمانە ڕیزیان بەستبوو و هەر ڕیزە بەدەنگی بەرز و هەراو زەناوە لایەنگری خۆی بۆ یەکێك لە شەڕکەرەکان دەردەبڕی.

(٥٠٢) جارچییان حەشاماتەکەیان دەدایە دواوە، ڕدێن سپیانی شار کە بەشێوەی بازنەیی لەسەر بەردان دانیشتبوون، گۆچانی جارچییە دەنگ بەرزەکانیان بەدەستەوە گرتبوو، هەر جارەی یەکێکیان گۆچان بەدەست هەڵدەستان و ڕاوبۆچوونی خۆیان ڕادەگەیاند، بارێ زێڕیش لە ناوەڕاستیاندا لەسەر زەوی دانرا بوو، ئەو زێڕە بەکەسێك دەدرا کە باشترین داوەری دەکرد و دروست ترین ودادوەرانەترین حوکمی دەدا.

(٥٠٩) بەڵام لە شارەکەی دیدا دوو سوپا لە جەنگاوەرانی زرێپۆش و سەراپا چەکدار، کە تەدارەك و ئەسلەحەکانیان دەدرەوشایەوە، لە دەوری شار هەواریان هەڵدابوو، ئەم دوو سوپایە لەسەر ئەوە ناکۆك بوون کە ئایا شارەکە بگرن و تالانی بکەن، یان لەگەڵ خەڵکی شاردا، سەروەت و سامانی شارەکە دابەش بکەن و وازبێنن. بەڵام ئابلوقە دراوانی شار بەمە قاییل نابن و بەنهێنی بۆسەیان بۆ دەنەنەوە. لەو کاتەدا کە هاوسەرە ئازیزەکانیان و منداڵە بچوکەکانیان لەگەڵ پیرەمێر و بەساڵاچووەکاندا لەسەر بورج و قەڵاتەکان خڕبووبوونەوە و ئێشکیان دەگرت، ئەوانی دی بەهەشتاو لە شار وەدەردەکەوتن و بەرابەرایەتی ئەریس و ئەتینا هێرشیان دەبرد. ئەم دووە لە زێڕ دروستکرابوون، جلوبەرگی ڕەخشانیان لەبەربوو. جلوبەرگێك کە شایستەی خواوەندان بوو. بەجوانی و گەورەیی وسپەر وزرێکانیاندا دیاربوون. جەنگاوەرەکان بەجۆرێکی بچوکتر لە جووتە خواوەند نەخشێنرا بوون. جەنگاوەران، کاتێ گەیینە شوێنێکی لەبار بۆ بۆسەدانان لە بەستێنی

ڕووبارێکدا، کە دەراوی ئاو خواردنەوەی چارەوێ و پەزان بوو، بەجلوبەرگ و ئەسلەحەی برونزینی ڕەخشانەوە لایان دا. تۆزێ دوورتر، دوو پاسەوان خۆیان دابووە پەنایەك، تا چاودێری هاتنی پەزان و گاگەلان بکەن. مێگەلەکان بەشێنەیی و خێرا نشێو بوونەوە، دوو شوانی سەرمەستی ئاوازی نای خۆ، بەدووی مێگەلەکانەوە بوون. شوانەکان هەستیان بەم بۆسەیە نەکردبوو، کە بۆسەچییەکان ئەم دیمەنەیان بینی، یەکسەر پەلاماریان دان، کەوتنە سەربڕینی ماڵاتەکان وپەزە سپییەکان وهەردوو شوانەکەشیان کوشت. لەو دەمەدا جەنگاوەرەکانی دی کە کۆڕیان بەستبوو، گوێیان لە هەرا و هەنگامە و بۆڕەی چێێن دەبێ، بەلەز سواری ئەسپەرەهوانەکانیان دەبن و بەچوار ناڵە دەگەنە ئەوێندەر. لەوێ لە کەناری ڕووبارەکە شەڕێکی ڕێکوپێك دەست پێدەکەن، هەردوو سوپا بەنێزەی نوك برونزینەوە دەکەونە گیانی یەکدی.پەروەردگارانی دووبەرەکی و مەرگ و ئاژاوەی شوم دەکەونە نێوانیان و لەم ڕیزەوە بەرەو ئەو ڕیز بەهەڵەداوان دێن و دەچن، پەروەردگاری مەرگ، جلێکی لەبەر بوو کە خوێنی بنیادەمی لێدەچۆڕا، ئەمە سێ کەسی بەدووی خۆیدا ڕادەکێشا، یەکێکیان تازە بریندار بوو بوو و یەکێکی تریان بریندار نەبوو، و لەلاقی جەنازەیەك نەوی بوو و لە ناوجەرگەی شەڕەکەوە ڕایدەکێشا.. ئەم خواوەندانە ڕێك وەکو بەشەرانی زندوو شەڕیان دەکرد. لە هەردوو بەرەکەدا جەنازەی مردووەکانیان ڕادەکێشا و دووریان دەخستنەوە.

(٥٤١) هەروەها هیفایستوس، دیمەنی کێڵگەیەکی جوان، بەپیت، پان و بەرین، سێ گاسنەی لەسەر مەتاڵەکە نەخشاندبوو. ئەم کێڵگەیە زۆر جووتکاری لەسەر بوون کە بەدەم جوتکردنەوە گاجوتەکانیان بەملاو بەولادا دازۆت. هەر کە دەگەیشتنە سەری خەت، پیاوێکیان لێ دەچووە پێشێ و هەریەکە و پەرداخێ بادەی شیرینی چوون هەنگوینی دەدایە. ئەوجا دەهاتنەوە سەری خەت و خوا خوایان بوو جارەکی دی بگەنەوە ئەوسەر. کێڵگەکە لە دوایانەوە ڕەش دەچووەوە، هەرچەندە کێڵگەکە بەزێڕ نەخشێنرا بوو، بەڵام لەتۆ وایە بەڕاستی کێڵراوە، هیفایستوس بەڕاستی هونەرێکی زۆر بەرزی نواند بوو.

(٥٥٠) هەروەها تەبارە گەنمێکی گەورەی شاهانەی لەسەر مەتاڵەکە نەخشاندبوو، دروێنەوانان بەخۆ و داسی تیژیانەوە خەریکی دروێنە بوون. مەڵۆ بەمەڵۆ، ڕێك و ڕاست لە دوایانەوە دەکەوتە سەر زەوی. مەڵۆکێشان کۆیان دەکردەوە و بەباقەبێن دەیان بەستن. سێ مەڵۆنێر لە کێڵگەکەدا دەبینران، چەند منداڵێك لەدوای ئەوانەوە بوون و مەڵۆکانیان لە

رەوی مەڵدەگرت و بەباوەش دەیانبرد بۆ مەڵۆنێرەکان. پاشای خاوەن کێڵگە لە نێوانیاندا، گۆچان بەدەست، کپ و بێدەنگ لەناو کێڵگەکەدا وەستا بوو وزۆر دڵخۆش بوو. لەم کاتەدا دەست و پێوەند و جاڕچیان، دوور لەوانی دی، لەژێر دار بەڕوویەکدا، سەرگەرمی ئامادەکردنی نان و خوان بوون، گایەکی گەورەیان کردبووە قوربانی و ئامادەیان دەکرد.. ژنانیش بڕێ جۆی سپیان لەگۆشتەکەوە دەکرد بەڵکو تامی خۆش بێ.

(٥٦١) هەروەها ڕەزێکی جوانی لەسەر سپەرەکە نەخشاندبوو کە لەژێر باری هێشواندا داکەوتبوو.. ڕەزێکی جوانی لە زێڕ دروستکراو، هێشووە ترێی ڕەش، بەلقەکانەوە، کە لەم سەر تا ئەوسەری ڕەزەکە لەسەر قایمەمێوی زیو بەسترابوون، شۆڕ بوو بووەوە. هیفایستوس خەنەکێکی بەڕەنگی شین و پەرژینێکی برونزی لە دەوری ڕەزەکە نەخشاندبوو. تەنیا یەك ڕێگە بۆ ناو ڕەزەکە هەبوو. ئەوانەی کە دەچوونە هەنگورچنی لەو ڕێگەیەوە هاتوچۆیان دەکرد. کیژان و کوڕانی گەنج و سادە و ساکار، بەکەیف و خۆشییەوە بەرچنەیان لەبەری شیرین ،چوون هەنگوین تەژی دەکرد. کوریژگەیەکیان لەگەڵ بوو کە بەئاوازێکی خۆش و ڕەوان گیتاری بۆ لێدەدان و بەدەنگە منالانە زوڵاڵەکەی گۆرانی بۆ دەگوتن و ئەوانی دی هاوئاهەنگ هەڵدەپەڕین، شاد و بەدەماخ، گۆرانییەکەیان بۆ گیتار ژەنەکە دەسەندەوە.

(٥٧٣) هەروەها گاگەلێکی لەسەر نەخشاندبوو، کە شاخیان ڕاست و درێژ بوو. چێلەکان لە زێڕ و برونز دروست کرابوون، بەدەم بۆڕە بۆڕەوە لە ئاغەڵەکەیان وەدەر دەکەوتن، تا بچنە ئەو مێرگوزارەی کە لە کەناری ڕووبارێکی سەرکێشی بەهارە وهاژەدا بوو، قامیشەلانێك دەوری دابوو.

ئەم گاگەلە چوار گاوانی لەگەڵدا بوو، هەموویان لە زێڕ دروست کرابوون، و لەگەڵ گاگەلەکەدا دەڕۆییشتن و نۆ سەگی چاپوك و دڕیان بەدواوە بوو. دوو شێری ترسناك لە پێشی پێشی گاگەلەکەوە، جوانەگایەکی بزێو وەگیر دێنن، جوانەگا بەدەم گابۆڕەوە دەبەن و.. سەگەکان و گاوانەکان شوێنیان دەکەون تا جوانەگاکە ڕزگار بکەن، بەڵام جووتە شێری دڕندە ورگی جوانەگەکەیان هەڵدڕی بوو و دەمیان تێژەند بوو و خوێنەکەیان دەخواردەوە. گاوانەکان بێهودە دەیانویست شێرەکان بترسێنن و سەگەکانیان تێبەر بدەن، بەڵام سەگەکان لە کەڵبەی تیژی شێرەکان دەترسان، و لە حەپین و وەڕین زیاتریان لە دەست نەهات!

(٥٨٧) هەروەها خواوەندی ناودار و بەبازوو لەوەڕگەیەکی گەورەی لە دۆڵێکی جوانی چیاییدا دروست کردبوو.. لەوەڕگەیەك بۆ پەزێن سپی، لەگەڵ ئاغەڵ و کوخێن سەرگیراودا..

(٥٩٠) هەروەها دیمەنی سەرایەکی شایی و هەڵپەڕکێی لەسە سپەرەکە نەخشاندبوو. وەکو ئەوەی کە کاتی خۆی دیدالۆس، لە کنوسوس بۆ ئاریادنی جوان و نازداری دروست کردبوو.. بەوێنەی کوڕ و کچی لاو ڕازاندبوویەوە، قۆڵیان بەقۆڵی یەکتردا کردبوو و دەرەقسین. کیژەکان جلی نەرم و ناسکی کەتانیان لەبەربوو. کوڕەکان جۆرە کراسێکی دەست چنی زۆر جوان و نایاب و تۆزێ ئەستورتریان لەبەر بوو. کە تەنکە زەیتێکیان لێدابوو و بریقەی ئۆخژنی دەخستە دڵ و دەروونەوە. کیژەکان تاجی گەڵا وگوڵیان لەسەر نابوو. کوڕەکان خەنجەری زێڕیان بەقەدەوە بوو کە بەحەمایڵی زیو هەڵواسرا بوون. هەندێ جار ئەڵقاوئەڵق دەستیان دەگرت و سووك سووك و هونەرمەندانە لاقیان دەبزواند و دەرەقسین. وەکو چۆن گۆزەکەرێك بەدیار چەرخەکەیەوە دادەنیشێت و بایدەدات تا خێرایی سوڕانەوەکەی تاقی بکاتەوە،.. ئەوانیش بەو جۆرە دەسوڕانەوە.. هەندێ جاریش ڕیزیان دەبەست و لە هەنبەر یەکتر دەرەقسین و جماعەتی بینەرانیش کە دەوریان دابوون، بەسەرسامی دەیانڕوانیە ئەم شایی و هەڵپەرکێیە. شایەرێکی گەرۆکیش گۆرانی بۆ دەگوتن و گیتاری لێ دەدا، دوو لۆتیش بەدەم ئاوازی شایەرەکەوە سوڕیان دەدا.

(٦٠٧) بەدەوری هەر هەموو ئەم دیمەنانەوە ولە قەراخی سپەرە مکۆمەکەدا جەبەروتی ئۆقیانوسی نەخشاندبوو.

(٦٠٩) کاتێ لە دروستکردنی سپەرە پتەکەوەکە بووەوە، زرێیەکی بۆ دروستکرد لە بڵێسەی ئاگر پرشنگدارتر بوو. ئەوجا کێوخودێکی قورسی بۆ دروستکرد، کە بەتەواوەتی لەسەری و لاجانگەکانی دەچەسپی.. کێوخودێکی جوان بوو، کاکۆڵێکی زێڕینی خستبووە سەری. ئەوجا جووتێ لاقبەندی لە برونزی نەرم بۆ دروست کرد.

(٦١٤) ئەوسا کە شەلەی ناودار، دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، چەك و ئەسلەحەکەی دروست کرد، هەڵیگرت و هێنای لەبەر پێی دایکی ئەخیلدا داینا، هەنگێ تیتیس وەکو تەوارێك لە لوتکەی بەفرگرتووی ئولیمبۆسەوە داگەڕێ، بەو شێوەیە پڕیدایە چەك و ئەسلەحە ڕەخشانەکە و لە ماڵی هیفایستوس وەدەرکەوت.

# سروودی نۆزدەیەم

## مەسڵەت

**حیکایەتەکە:**

**تیتیسی دایکی ئەخیل بەزرێ و چەك و ئەسلەحەوە لەلای خواوەندی لەنگ هیفایستوسەوە گەڕایەوە و دانی بەکوڕەکەی. زۆر پێی خۆشحاڵ بوو، وەدەرکەوت و هاواری لە ئاخاییەکان کرد کە کۆببنەوە. خەڵکانێکی فرەی لە دەور خڕ بووەوە، لەوانە ئۆدیسیوس و کوڕی تیدیوس و ئاگامەمنون و نەستور. ئەخیل وتارێکی پڕ جۆش و خرۆشی دا ، داوای کرد یەکسەر دەست بەشەڕ بکەن. لێ ئۆدیسیوس پێی گوت ڕاستە لە هەموو ئاخاییەکان بەهێزترە، بەڵام ئەهلی ڕاوێژ و تەگبیران نییە. جا چونکە لەو بەتەمەنترە و لەویش پڕ ئەزموونترە، پێی وایە دەبێ جەنگاوەرەکان نان بخۆن، چونکە ئەگەر بەدرێژایی ڕۆژەکە برسی بن بەرگەی شەڕ ناگرن، بازوویان سست دەبێ و لاقیان دەلەرزێ، هەروەها دەبێ خەم و خەمینی وەلا بنرێ، چونکە ژمارەی کوژراوانی شەڕ ڕۆژ بەڕۆژ زیاد دەکەن. ئیدی تازیە و تازیە باری دڵی جەنگاوەر ماندوو دەکات. دەبێ جۆش و خرۆشی وەدڵ و دەرون بخەین نەك خەم و پەژارە. ناشێت سوپا بەر لە ئاشتبوونەوە و مەسڵەت بچێتە شەڕەوە، بەرلەوەی ئاگامەمنون سوێندی گەورە بخوات و خوان و نەزر و قوربانی بۆ خواوەندان ساز بکات. ئەم سرووتانە زەروریە تا جەنگاوەران سەرکەوتن وەدەست بێنن.**

**لێرەدا ئاگامەمنون لێدەبرێ قسان بکات، لێ نایەتە ناوەندی کۆبوونەوەکە، بەڵکو لە جێی خۆیەوە قسە دەکات، دەڵێت ئەو لە پریسیس بەرپرس نییە، چونکە ئەو ئیرادەو ویستی خواوەندان بوو. ئەو هێشتا لەسەر قسە و بەڵێنی خۆیەتی کە دیاریی گرانبەها لەگەڵ پریسیسدا پێشکەش بکات، فەرمان بەئۆدیسیوس دەدات کە دەست و پێوەندان لەگەڵ خۆیدا بەرێ و هەرچی ئەم گوتویەتی، بهێنێ.ئۆدیسیوس دەڕوات دیارییەکان**

بینێ. ئاگامەمنون قوربانی خۆی ئەنجام دەدات، بەرازێك سەر دەبڕێت و دەرخواردی ماسیانی دەدات. دوای نزا و نوێژ و پاڕانەوە لە زیوس، داوا لە ئەخیل دەکات بێتە سەر خوان و دەعوەتی ئاشت بوونەوە، لێ ئەخیل سوێند دەخوات کە تا کۆتایی ڕۆژەکە، تا تۆڵەی یاوەرە ئازیزەکەی، پاترۆکلۆس، نەسەنێتەوە تامی زاد ناکات. هەرچی دەکەن قەناعەتی پێناکەن. ئۆدیسیوس بەدیارییەکانەوە دەگەڕێتەوە. پریسیس لەگەڵ حەوت ژنی شارەزای هەموو هونەران، لە پێشەوە دەڕوات، گاڤێ چاوی بەپاترۆکلۆس کەوت،کەوتە گریە و زاری و ژماردنی خەسڵەتە باشەکانی و چۆن کاتێ ئەخیل مێردەکەی و برایەکانی کوشتووە، پاترۆکلۆس دڵی داوەتەوە کە کارێکی وەها دەکات ئەخیل بیخوازێ، ژنەکانیش لەگەڵیا کەوتنە شین و گرین، بەڵام لە ڕاستیدا هەریەکەیان بۆ خۆی و بۆ ئەو نەگبەتیە دەگریا کە بەسەری هاتبوو.

ئەخیل زرێ سەیر و عەنتیکەکەی لەبەرکرد. هەموو بینەران واقیان وڕما. کڵاوخودە پرشنگدارەکەی کردە سەری کە پرشنگی دەگەیە قوبەی ئاسمان. ئەوجا ڕوویکردە ئەسپەکانی، ئیکسانتوس و پالیوس، کە جووتێك ئەسپی یەزدانی بوون، لێیان پاڕایەوە کە ئەگەر سایەقەکەیان لەشەڕدا کوژرا بەجێی نەهێڵن وەکو پاترۆکلۆسیان بەجێهێشت. ئیکسانتوس کە هیرا توانای قسەکردنی پێ بەخشی بوو بەرسڤی دایەوە و گوتی: کەس بەجێ ناهێڵن ئەگەر ئەجەلی نەیەت، بەڵام کە خواوەندانی قەدەر حوکم بدەن ئەوان سەرپێچی ناکەن. ئەوان ئێستا دەستبەرداری نابن، بەڵام کە ڕۆژی تەواو بێ و ئەجەلی بێ، ناتوانن هیچ شتێك ڕەت بکەنەوە. لێرەدا یەزدانخانمانی ئیرینی هەڵدەدەنێ و بێدەنگی دەکەن. ئەوجا ئەخیل دەنگی ئەسپەکان دەدا بەرەو شەڕگە و مەیدانی شەڕ.

زەمەن:

کات بەیانی ڕۆژی سییەمی گێڕانەوەکەیە.

شوێن:

هەموو بویەرەکان لە ئۆردوگای گریکەکان، لای خێوەت و کەشتییەکانیان ڕوو دەدەن.

(١) لەو دەمەدا کە سپێدە بەجلی زەردی زافەرانیەوە، لەنێو شەپۆلەکانی ئۆقیانوسەوە هەڵدەهات ڕوناکی بۆ نەمران و بەشەران بەدیاری دێنا، تیتیس گەییە کەناری کەشتییەکان و پێشکەشی و دیارییەکانی هیفایستوسی لەگەڵ خۆدا هێنا. سەیری کرد کوڕە ئازیزەکەی پاتروکلۆسی لە ئامێز گرتووە و بەکوڵ دەگری ئەمما گریان. گەلێك لە هاوڕێکانیشی دەوریان دابوو و دەگریان. یەزدانخانم خۆی بەناویاندا کرد، دەستی ئەخیلی گرت و بەڕاشکاوی گوتی: "کوڕی من چەند خەمبارببین ئەم مردووە زندوو نابێتەوە، چونکە مردوو بەگریان ناژێتەوەو مردنی ئەمیش خواستی خواوەندانی لەسەر بووە و تەواو. ئێستا تۆ ئەم چەك و ئەسلەحە بێ وێنەیە لە خۆت بدە، چەك و ئەسلەحەیەکی زۆر جوانە، تا ئێستا هەرگیز هیچ پیاوێك چەکەمەنی وای بەخۆوە نەدیوە، ئەمە دیاریی (هیفایستوس)ە.

(١٢) تیتیس ئەو قسانەی کرد، زرێ و ئەسلەحەکانی لەبەردەم ئەخیلدا دانا، زرینگەیەکی سامناکیان لێ هەستا. مەرمیدونەکان ترسیان لێ نیشت، کەس نەیوێرا ڕاستەوخۆ لە چەکەمەنیەکان بڕوانێ، هەموو بەترسەوە کشانەوە. لێ ئەخیل کە چاوی بەچەك و ئەسلەحەکە کەوت هێندەی دی خرۆشا و جۆشی سەند، گڕێکی سامناکی ئەوتۆ لە چاوەکانی دەبووەوە، لەتۆ وایە بڵێسەی ئاگرە.کە چەکەمەنییەکانی بەدەستەوە گرت، ئەو دیاریە عەنتیکانەی خواوەندێکی وەکو هیفایستوس، لە خۆشیاندا لە پێستی خۆی نەدەهێوری، بەدیتنی زرێ و تفاقە جەنگییەکەی یەجگار خۆشحاڵ بوو. ڕویکردە دایکی و گوتی: "دایکە، ئەم چەك و ئەسلەحەیەی خواوەند پێشکەشی کردوم، بەڕاستی دەستکردێکی خودایانەیە، هەر لە نەمران دەوەشێتەوە، هیچ بەنی بەشەرێك ناتوانێ دروستی بکات. کەواتە هەر ئێستا لەبەریان دەکەم و خۆم بۆ شەڕ ساز دەکەم. بەڵام زۆر دەترسم مێش و مەگەسان لە جەستەی پاتروکلۆسی کوڕە دلێرەکەی مینویتیوس بنیشن و لە شەبەقی زامەکانیەوە، وە ژوور بکەون و بیلەوتێنن و کرم تێی بدات و لاشە بێ گیانەکەی بشێوێ و هەموو گۆشتەکەی بۆگەن بکات."

(٢٨) تیتپسی زیوین پا لە وەڵامیا گوتی: "کوڕی من، لەم بارەیەوە خاترجەم بە. من بەخۆم هەموو ئەو مێش و مەگەزە لاسارانەی لێ دوور دەخەمەوە کە لەسەر جەستەی کوژراوانی مەیدانی شەڕ دەلەوەڕن، ئەگەر یەك ساڵی تەواو بەو دەقەوە بمێنێ، لاشەکەی نەك تێکناچێ و بۆگەن ناکات، بەڵکو لە ئێستا باشتر و جوانتر دەبێت.. بۆیە بچۆ بۆ ئەنجومەنی جەنگاوەرانی ئاخایی و هیچ شتێك لە دڵی خۆتا بەرانبەر بەئاگامەمنونی سەروەری سوپا

مەمیلە، دڵت پاک بکەرەوە، بەهەموو هێز و تواناوە دلاوەری خۆت بنوێنە."

بەو قسانە، جۆش و خرۆشی شەڕی خستە دڵی ئەخیلەوە. هەنگێ عەنبەر و نۆشداروی بەجەنازەکەی پاتروکلۆسەوە کرد، تا گۆشتەکەی نەرزێ و بۆگەن نەکات.

(٤٠) ئەوجا ئەخیلی مەزن، بەپەلە لە کەناری دەریاکەدا کەوتە ڕێ، بەدەنگێکی پڕ سام بانگەوازی کرد، جەنگاوەرانی ئاخایی رابوون، هەموو کۆبوونەوە .تەنانەت دەریاوان و سەوڵ لێدەران و میرەچیانیش، کە ئەوانە بەزۆری بەدیار کەشتییەکانەوە دەمانەوە و نەدەبوو بچنە شەڕەوە، بۆ بارەگای کۆبوونەوە هاتن. چونکە ئەخیل، هەرچەند دەمێك بوو لە شەڕە کارەساتبارەکە دوور بوو، لەوێدا دەرکەوت.. دووان لە هاوەڵانی (ئایریس)ش بەشەلەشەل کەوتنەڕێ، یەکێکیان کوڕی گەڕنۆس و نەبەزەکەی تودیوس بوو، و ئەویتریان ئودیسیوسی مەزن بوو، ئەمانە خۆیان دابوو بەسەر ڕمەکانیاندا، چونکە هێشتا زامەکانیان سارێژ نەبووبوو. کە گەییشتنە بارەگای ئەنجومەن لە ڕیزی پێشەوە ڕۆنیشتن. ئاگامەمنونی سەرداری سوپا لەدوای هەمووانەوە هات، ئەویش بریندار بوو، چونکە کیونی کوڕی ئەنتینور لەشەڕدا بەڕمە نووك برونزییەکەی برینداری کردبوو.

(٥٤) وەختێ ئاخاییەکان کۆبوونەوە، ئەخیلی زەرۆپ، چووە ناوەندی حەشامەتەکە وگوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، بێگومان ئەوەی ئەمڕۆ دەیکەین، بۆ هەردووکمان هەم بۆ تۆ و هەم بۆ من باشتر و بەسوودتر دەبوو ئەگەر ئەوسا، لە جەنگەی ڕق و کینەماندا و لەسەر ژنێك شیر و تیرمان لێکدی دەسوو، بمانکردایە. بریا هەر ئەو ڕۆژەی کە شاری (لورنیسوس)م گرت و تالانم کرد و ئەو ژنەم بەدیلی هێنا، هەر ئەو ڕۆژە ئەرتیمیس تیرێکی لێدەدا و لە ناوەندی کەشتییەکانمدا دەیکوشت.. هەنگێ گەلێك لەو ئاخاییانەی تیاچوون، لە سۆنگەی پشم و غەزەبی منەوە، ناچار نەدەبوون ببنە تێشووی تیر و نێزەی دژمن و لە خاك و خوێندا بگەوزن. ئەم دووبەرەکیەی ئێمە بەقازانجی هیکتۆر و تەروادەییەکان شکایەوە. پێم وایە ئاخاییان تاماوەیەکی زۆر ئەم دووبەرەکیەی نێوان ئێمەیان لە بیر ناچێتەوە. بەهەرحاڵ با لەدووی چوان نەچین، ئەوەی ڕۆیی ڕۆیی، کینەی دڵمان لغاو بکەین و بەسەریا زاڵ بین. من ئێستا کینەی خۆمم دامرکاندوەتەوە، چونکە ناکرێ هەتا هەتایە هەر تورەبم. کەواتە لەزێکە، هەرە ئاخاییانی پۆردرێژ بۆ شەڕ هانبدە، تا من پەلاماری تەروادەییەکان بدەم و بزانم ئاخۆ هێشتا بەتەمان لای کەشتییەکانی ئێمە ڕۆژ بکەنەوە یان نا. پێم وایە هەر کەسێك بتوانێ هەڵا و لە جەزرەبەی ڕمی من بخەلەسێ بەختی هەیە و بەختەوەر دەبێت."

(٧٤) ئاخاییەکان زۆریان کەیف بەوە هات کە دەستبەرداری کەرب و کین بووە. ئاگامەمنونی سەرداری جەنگاوەران، لە دوای ئەو هەستا و هەر لە جێی خۆیەوە و بێ وەی بێتە ناوەندی حەشاماتەکە گوتی: "ئەی دۆستان، جەنگاوەرانی دانایی، هەڤالانی ئایریس: جێی خۆیەتی و هەقە گوێ لەو کەسە بگرین کە هەڵدەستێ و قسان دەکات، هەق نییە قسەی پێ ببرین، چونکە ئەمە کارێکی خراپە و چەند بەدەم و زمان بێ دەشلەژێ و مەبەستی خۆی پێ نایەتە دەربرین. چۆن لە نێو هەراو زەنای حەشاماتێکدا قسە دەبیسترێ یان دەکرێت؟ وتاربێژی دەنگ بەرزیش لەم حاڵەدا دەپەشۆکێ. جا من لێبراوم قسەی دڵی خۆم بۆ کورەکەی پیلیوس بکەم، بەڵام تکایە باش گوێم لێ بگرن!.. زۆرجار ئاخاییەکان سەرزەنشتیان کردووم و گلەییان لێکردوم و بەتاوانباریان زانیوم، و بەناشیرینی باسیان کردووم. بەڵام من هیچ خەتایەکم نەبووە، من لەم کارە بەرپرس نەبووم. بەڵکو خواوەندان بەرپرسیارن، زیوس، و مویرا (یەزدانخانمانی قەدەر و چارەنووس) و ئیرینوس (یەزدانخانمی تۆڵە) بوون کە بەشەوان لەژێر باڵی تاریکیدا سەر بەهەموو شوێنێکدا دەکەن، ئەوان بوون لەو رۆژەدا کە لێبرام، بەدەستی خۆم پاداشتەکەی (ئەخیل)م رفاند، لە جەنگەی کۆبوونەوەکەدا،ختووکەی سۆز و ئەقڵیان دام، لە خشتەیان بردم، من دەمتوانی چ بکەم؟! هەموو شتەکان بەدەستی زیوس بوو. (ئاتی) کیژە گەورەی زیوس، کە خەڵکان گومڕا دەکات و لە رێ دەردەکات. پێیەکانی زۆر نەرم و ناسکن، چونکە هەرگیز بەزەویدا ناڕوات، بەڵکو بەسەر سەری بەشەراندا دەڕوات و ئازاریان دەدات، ئەم و ئەو دەخاتە داوی خۆیەوە و گومڕایان دەکات.

(٩٥) تەنانەت جارێك (زیوس)شی لە خشتە بردووەو گومڕای کردووە، ئەو زیوسەی کە دەڵێن لە هەموو خواوەندان و بەشەران بەهێزتر و بەتواناترە.. بگرە هیراش، بەو ژنییەی خۆیەوە، بەفێڵ و نێرەنگان فریوی دا، لەو رۆژەدا فریوی دا کە ئەلکیمنی لە شاری تیبەی جواندا، هیرکولی مەزنی دەبوو. زیوس بەکەش و فشەوە رووی کردە خواوەندان و گوتی: "ئەی خواوەندان و یەزدانخانمان گوێ بگرن، گرێی دڵی خۆمتان بۆ بکەمەوە. لەم رۆژەدا یەزدانخانمی مامانی، ئیلیتیا، بنیادەمێك دێنێتە سەر دنیا، دەبێ بەگەورە و سەرداری هەموو دەوروبەری خۆی.. ئەمە نەوەی یەکێك لەو پیاوانەیە کە لە خوێنی منە." هیرای هەژی، بەوپەڕی خوایی و هەر بۆ ئەوەی دەمی ئەو تاقی بکاتەوە گوتی: "تۆ دەتەوێ پێمان ڕابوێری و ئەم قسانەی خۆت نابەیە سەر، ئەگەر بەڕاستتە، ئەی ئۆلەمپی سوێندم

بۆ بخوە سوێندێکی قورس کە ئەو پیاوەی گوایە لە خوێنی تۆیە و دەبێ ئەمڕۆ لە دایك ببێ و لە داوێنی ژنێك بەربێتەوە، حوکمڕانی هەموو دەوروبەرەکەی خۆی دەکات!"

(١١٢) ئەوقسانەی کرد. زیوس بەهیچ جۆرێ پەی بە بەدنیازیەکەی نەبرد. سوێندێکی قورسی بۆ خوارد کە پابەندی قسەکەی خۆی دەبێت. هێرا بەهەشتاو لە لوتکەی ئۆلیمبۆسەوە داگەڕا و خێرا گەییە ئارگۆسی ئاخاییان، چونکە دەیزانی ژنەکەی ستینیلوسی کوڕی پیرسیوس دووگیانە و سکی حەوت مانگانە. یەزدانخانم، کارێکی وەهای کرد ئەم مناڵە بەر لە تەواوبوونی ماوەی بارداری دایکی، بێتە دنیاوە، لەولاشەوە زاینەکەی ئەلکیمینی دواخست، و (ئیلیتا)ی پەروەردگاری زایاندنی منالی، گێڕایەوە. ئەوجا بەخۆی چوو بۆ لای زیوسی کوڕی کرونوس و هەواڵی دایەو گوتی: "بابە زیوس، ئەی خێوی بروسکە و هەورە تریشقان، هەواڵێکم پێیە، گەرەکمە پێتی ڕابگەیەنم، ئەمڕۆ مناڵێك لەدایك بوو، کە ناوی یوروستیوس کوڕی ستینیلوس)ی کوڕی پیرسیوسە، لە توخم و تۆوی تۆیە، دەبێ بەگەورە و فەرمانڕەوای ئارگۆسییەکان

(١٢٥) کە گوێی لەو قسانە بوو، ژانێکی تیژ چووە دڵیەوە، یەکسەر چنگی لە قژە ڕەخشانەکەی ئاتی نا، تورە بوو، سوێندێکی قورسی خوارد، کە ئاتی جارێکی دی بۆ ئۆلیمبوس و ئاسمانی پڕ ئەستێرە ناگەڕێتەوە، چونکە خەڵکی گومڕا و سەرگەشتە دەکات. ئەو سوێندەی خوارد و ئەوجا قژی بادا و لە ئاسمانی پڕ ئەستێرەوە توڕی دا، ئاتی لەناو کێڵگە داچێنراوەکانی بەشەرێن فانی گیرسایەوە. زیوس هەر کاتێ کە دەیبینی هیرکولی کوڕی لەژێر فەرمانی یوریستیوسی بێ ئینسافدایە و خەریکە لەژێر باری کاردا دەپسێ، زۆر بێتاقەت و بێزار دەبوو. منیش بەو ئاوایە، کە دەمبینی هیکتۆری مەزن، هیکتۆری کێوڕەخشان، لە نزیکی کەشتیەکاندا، ئارگۆسیانی دەکوشت و دەبڕی، (ئاتی)م بیردەکەوتەوە کە چۆن کوێری کردبووم و لە خشتەی بردبووم و گومڕای کردبووم. بەهەرحاڵ منی هەڵخەڵەتاو، کە زیوس هۆشی لێ سەند بوومەوە، ئێستا لێبڕاوم و ئامادەم هەڵەکانی خۆم ڕاست بکەمەوە و باجێکی زۆری بێ شومار بدەم. کەواتە ڕابە و لەشکرەکە دوای خۆت بخە و هەرە جەنگ.من لێرەم و ئامادەم هەر هەموو ئەو بەخشش و دیاریانەی کە ئۆدیسیوسی مەزن، ئەو شەوەی هاتبووە سەراپەردەکەت و بەڵێنی دابویتێ، بخەمە بەردەمت.هەرچەندە تۆ تامەزرۆی شەڕیت، بەڵام کەمێك سەبر بکە، دەست و پێوەندەکانم چوون ئەو دیاریانەت لە کەشتییەکانمەوە بۆ بێنن، تا دڵنیابیت

ئەوەندەت دیاری دەدەمێ کە پێی ڕازی بیت."

(١٤٥) هەنگێ ئەخیلی گورج و گۆڵ، گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی سەرداری جەنگاوەران، ئەی ئاگامەمنونی سەرفراز، تۆ سەرپشك بە، دەتوانی دیارییەکان پێشکەش بکەیت، یان بۆ خۆتی هەڵبگری؛ ئەمە پەیوەندی بەخۆتەوە هەیە. ئێستا گرنگ ئەوەیە خۆ بۆ شەڕ ساز بدەین،

(١٤٩) چونکە ڕەوا نییە ئێمە بەبێهودە لێرە بوەستین و کاتەکەمان بەقسەوە بەفیڕۆ بدەین. کاری زۆر گەورە و گرنگمان لە پێشە. جا وەکو چۆن هەریەك لە ئێوە ئەخیل دەبینێ و لە ڕیزی پێشەوە ڕێ دەکات تا بەنێزە تیژ و بڕندەکەی جەنگاوەرانی تەروادەیی داپاچێت، ئێوەش، هەیەکە بەهەمان تین و تاو، بەهەمان جۆش و خرۆش بیر لە داپاچینی ڕەقیبەکانتان بکەنەوە!"

(١٥٤) ئودیسیوسی هۆشمەند و زیرەك وەڵامی دایەوە: "نەخێر، ئەی ئەخیلی هاوتای خواوەندان، تۆ چەند دلێر و بێباکیش بێ، نابێ بەو پەلەپەلە کوڕانی ئاخایی بەرەو ئیلیون، بۆ شەڕی تەروادەییان بنێری. چونکە ئەم شەڕە درێژە دەکێشێت، هەر بەوە کۆتایی نایەت کە لەشکرەکان ڕووبەڕووی یەکتر ببنەوە و خواوەند دەست بەپشتی هەردوولادا بدات.. فەرمان بەئاخاییەکان بدە کە لە کەشتییەکانیاندا نان و شەرابی خۆ بخۆن و بخۆنەوە، چونکە تێری سەرچاوەی هێز و ئازایەتیە. کەس ناتوانێ لە بەیانیەوە تا خۆرنشین، بەسکی برسی شەڕی دژمن بکات، چونکە چەند ئازاو تامەزرۆی شەڕیش بێ، لەپڕ و بێ ئەوەی بەخۆ بزانێ چوارپەلی سست دەبێ، برسێتی و تینویەتی زۆری بۆ دێنێ و لە پەلوپۆی دەخات. بەڵام ئەو جەنگاوەرەی تێر و پڕی خواردبێ و خواردبێتەوە، تا ئێوارە بەرگە دەگرێت و بەدڵ و بەگیان شەڕ دەکات، و دەست هەڵگیرنابێت مەگەر هەموو هاوەڵەکانی پاشەکشە بکەن. دەیسا لەشکرەکە مەرەخەس بکە و فەرمان بەجەنگاوەرەکان بدە با خوان برازێننەوە و نانی خۆ بخۆن. سەبارەت بەدیاریەکانیش، ئاگامەمنونی سەرداری جەنگاوەران بۆ بارەگای ئەنجومەنی دێنێ تا هەموو ئاخاییان بەچاوی خۆیان ببینن و تۆش دڵت خۆش ببێ. با بەبەرچاوی خەڵکەکەوە سوێندی گەورەت بۆ بخوات کە هەرگیز لەگەڵ پریسیسدا نەخەوتووە وئیلاقەی نەکردووە، وەکو هەر پیاو و ژنێك ئەمە دەکەن. تۆش لەلای خۆتەوە کەرب و کین لەدڵی خۆت دەربکە. جا هەنگێ بۆ ئەوەی هیچ مافێکی تۆ نەخورێ، ئاگامەمنونی سەرکردەمان لە سەراپەردەکەی خۆیدا دەعوەتێکت بۆ ساز

دەکات. تۆش ئەی کوڕی ئوتریوس لەمەودوا دەبێ دادپەروەرتر بی، گەورەیی پاشایانە لەوەدایە کە کەسێکی بەناهەق زویر کرد، خێرا ئاشتی بکاتەوە."

(١٨٤) هەنگێ ئاگامەمنون، شای بەشەران، لە وەڵامیا گوتی: "ئەی کوڕی لایرتیس، بەقسەکانت شادمانم. تۆ هەموو شتێکت، بەشایستەیی ئاشکرا کرد و مەسەلەکەت گێڕایەوە. سەبارەت بەسوێندەکە، پڕ بەدڵ ئامادەم و بەشایەتی خواوەندێك سوێند دەخۆم و خۆم درۆزنی بەردەرگای خوا ناکەم. بەڵام بەر لەوە باجاری ئەخیل، هەرچەندە پەلەی شەڕێتی، لێرە بمێنێ، ئێوەش هەمووتان بمێنن، تا دەسکەوت و دیاریەکان لە سەراپەردەکەی منەوە دەهێنرێن و بەدەم قوربانیەوە سوێندەکە دەخۆم. بەڵام تکام وایە تۆ سەرپشك بەو هەندێ لە فەرماندە لاوەکانی لەشکری ئاخاییان هەڵبژێرە و هەر هەموو ئەو دەسکەوت و دیاریانەی کە پێشتر بەڵێنمان دابوو بەئەخیلی پێشکەش بکەین، لە کەشتییەکەی منەوە بهێنن، ژنەکانیش بێنن، بە (تالتوبیوس)ش بڵێن کە لە ئۆردوگای ئاخاییاندا بەرازە کێوییەك ئامادە بکات، تا بیکەینە نەزر و قوربانی زیوس و "هەتاو".

(١٩٨) ئەخیلی چاپوك، هەڵیدایە و گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی سەروەر، شای بەشەران، ئاگامەمنون، باشتر وایە ئەم کارانە بۆ کاتێکی دیکە هەڵگری. بۆ کاتێك ماوەی پشوو هەبێ و من لە ئێستا هێورتر بم. ئێستا ئەوانەی کە هیکتۆری کوڕی پریام، کاتێ کە زیوس دەستی داو سەرفرازی پێبەخشی و کوشتنی، هەموو بەشێواوی لەو دەشتە کەوتوون، کەچی ئێوە، بەهەردووکتان خوڵکی نان خواردنمان دەکەن! ئەوەی من دەمەوێ بیکەم ئەوەیە کە کوڕانی ئاخایی بەبێ خواردن و بەناشتا بۆ شەڕ ببەم، ئێوارێ، کاتێ ڕۆژئاوا بوو، تۆڵەی خۆمان لە تەروادەییەکان سەندەوە، هەنگینێ خوانێکی گەورە دەڕازێنینەوە. تا ئەو زەمانە هیچ خواردن و خواردنەوەیەك بەگەروی مندا ناڕوات.. چونکە یاوەر و هاوڕێکەم مردووە و ئازای لەشی شەبەقی برونزی تیژ و نێزەی برندەیە، لە سەراپەردەکەی مندا بەشێواوی کەوتووە و هەواڵەکانی دەوریان داوە و بەدیارییەوە دەگرین. بۆیە دڵم بەم شتانەوە نییە و هۆش و بیرم تەنیا لای کوشتار و خوێن ڕشتن و ئاه و ناڵەی سامناکی شەڕڤانانە!"

(٢١٥) ئودیسیوسی بەهۆش و ئاوەز بەرسقی دایەوە: "ئەی ئەخیلی کوڕی پیلیوس، ئەی ئازاترین شەڕڤانی ناو ئاخاییان، تۆ لە من بەهێزتری، لە ڕمبازیدا زۆر لە من باڵادەستتری، بەڵام لە ڕاوێژ و تەگبیراندا ناگەیە من. چونکە من بەتەمەن لە تۆ گەورەتر و داناترم. بۆیە

دەبێ سەبرت هەبێ و گوێم لێبگریت! شەڕ مرۆڤ زوو برسی دەکات، وەختێ زیوسی سەرپەرشتیاری جەنگان، ئەنجامی شەڕ هەڵدەسەنگێنێ و دەسکەوت لە زیان کەمتر دەردەچێت، هەنگێ جەنگاوەران زوو لە کوشتار بێ تاقەت دەبن، شەڕ وەکو خەرمانێکە دوای ڕەنجێکی زۆر دەبینی کای لە دانی زۆرترە..بۆیە باشتر وایە بەسکی تێر دەست بدرێتە کاری وا کەم بەرهەم. خۆ ناکرێ ئاخاییان هەر کەسێکیان لێ کوژرا دەم بەقوتەوە بگرن و هیچ نەخۆن و بەمە ماتەمباری خۆیان دەربڕن، شینی مردوو بەبرسی کردنی سك ناکرێ. هەر ڕۆژەی دەستەیەك جەنگاوەر دەکوژرێن، تا شەڕ هەبێ ئەمە بەردەوام دەبێ و ژمارەی کوژراوان ڕۆژ بەڕۆژ زیاد دەکات، لەم حاڵەدا چارمان چ دەبێ؟ نەخێر، چار هەر ئەوەیە هەر کەسێکمان کوژرا، بەخاکی بسپێرین، دڵ قایم بین و تەنیا یەك ڕۆژ بۆی بگرین. ئەوانەش کە لە شەڕ دەرباز دەبن دەبێ تێر بخۆن و بخۆنەوە تا بتوانین چەکداریان بکەین و بەتین و تاوەوە بەگژ دژمنا بچین. هەنگێ کەس بیانوی نابێ خۆی بدزێتەوە و وای بەحاڵی ئەوەی لای کەشتیەکان دەمێنێتەوە. هەموو پێکەوە، وەکو یەك جەنگاوەر، پەلاماری تەروادەییانی چاپك سواردەدەین و شەڕێکی توند هەڵدەگیرسێنین."

(٢٣٨) دوای ئەو قسانە، کوڕانی نەستور، میگیسی کوڕی نیلیوس، و تواس، میریونیس و لیکومیدویسی کوڕی کریونتیس و میلانیبوسی هەڵبژاردن و دوای خۆی دان و بەرەو سەراپەردەکەی ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس وەڕێکەوتن.. لەوێ هەر کە فەرمانی دا، دەستبەجێ فرمانی جێبەجێکرا. هەوت سێ کوچکە، بیست مەنجەڵی بریقەدار ،دوانزە ئەسپیان لە خێوەتەکەوە هێنا. هەروەها حەوت ژنی دەست ڕەنگینیان لە سەراپەردەکە هێنایە دەرێ، کە بە (پریسیس)ی قشپیلەوە دەیانکردە هەشت ژن.. ئودیسیوس دە تالان (تالان ،پێوانەیەکە بەرانبەر بە ٢٦ کیلۆ) زێڕی کێشا و لە پێشیانەوە کەوتەڕێ، لاوە ئاخاییەکانی دیکەش، بەخۆ و دیارییەکانی دەستیانەوە دوای کەوتن. دیارییەکانیان هێناو لە بارەگای ئەنجومەن دایان نا.

(٢٤٩) لەم کاتەدا ئاگامەمنون هەستایە سەر پێیان، (تالتوبیوس)ش کە دەنگی لە دەنگی خواوەندێك دەچوو، لەلایەوە وەستا، بەرازێکی بەدەستەوە بوو. کوڕی ئوتریوس، هەڵیکێشایە خەنجەر، هەمیشە لە تەنیشت کیفی شمشێرەکەیەوە خەنجەرێکی بەقەدەوە بوو، کەوتە بڕینی چەند موویەکی چڕ لە بەرازەکە، بەدەم ئەو کارەوە دەسە و دوعا دەستی بەرزکردەوە. هەموو ئاخاییەکانی دی کپ و بێدەنگ دانیشتن و گوێیان لە

نزا و پاڕانەوەکەی شا ئاگامەمنون دەگرت. ئاگامەمنون ڕوو لە ئاسمان کەوتە نزا و پاڕانەوە وگوتی: "ئەی زیوس، ئەی سەروەر و گەورەی هەموو خواوەندان، ئەی زەوی و هەتاو، ئەی ئێرینوسیان، ئەی ئەوانەی لەژێر زەویدان و تۆڵە لەوانە دەسەنن کە بەدرۆ سوێند دەخۆن.. ئێوە بەشایەت دەگرم کە من هەرگیز دەستم بۆ پریسیس نەبردووە، نە بەمەبەستی ئاشقێنی و هەمامێزی و نە بەهیچ مەبەستێکی دیکە، بەڵکو لە خێوەتەکانمدا، بێ ئەوەی دەستی بۆ ببرێ، ماوەتەوە. جا ئەگەر ئەم سوێندە بەدرۆ بخۆم، با خواوەندان بمگرن و هەمان ئەو بەڵا و ئازارانەم بەسەردا بێنن کە بەسەر سوێندخۆرانی بەدرۆیدا دێنن."

(٢٦٦) دوای ئەو قسانە، خەنجەرەکەی بەملی یەکانەکەدا هێنا. ئەوجا تالتیببیوس، لاکەکەی بەدەوری سەری خۆیدا باداو، توڕیدایە دەریای کەفچەڕینی مەنگ و بێ بنەوە تا ماسیان بیخۆن.

ئەوسا ئەخیل لە جێی خۆی هەستا و ڕوویکردە شەڕڤانانی ئارگۆسی و گوتی: "ئەی بابە زیوس! تۆ باش سەر لە خەڵکی دەشێوێنی، ئەگەر وا نەبوایە کوڕی ئوتریوس هەرگیز منی بەو شێوەیە نەدەڕەنجان و تورەی نەدەکردم، هەرگیز بەتۆبزی ئەو ژنەی لێ زەوت نەدەکردم. بەڵام دیارە ویستی زیوس وەها بووە کە مەرگ گیانی ژمارەیەك لە ئارگوسیان بسەنێ. فەرموو ئێستا بچن نانەکەتان بخۆن، تا بچینە مەیدانی شەڕ."

(٢٧٦) دوای ئەو قسانە، خێرا کۆتایی بەکۆبوونەوەکە هات، خەڵکەکە بێوەیان لێکرد و هەر کەسە و بۆلای کەشتی خۆ ڕۆییشتن. مورمیدونانی دلاوەریش کەوتنە سەروکاری دیارییەکان و بۆ کەشتیەکانی ئەخیلیان برد و شتەکانیان لە خورگەکەی دانا، ژنەکانیشیان دامەزراند، مەیتەر و میرئاخورانیش ئەسپەکانیان بۆ ناو گەلە ئەسپەکانی وەپێش دا.

(٢٨٢) گاڤێ پریسیس، ئەو شۆخەی لە ئەفرۆدێتی زێڕین دەچوو، چاوی بەپاتروکلۆس، کە ئازای لەشی کون کونی پەیکان بوو، کەوت. خۆی دا بەسەریا و بەدەنگی بەرز کەوتە شین و شەپۆڕێکی دڵتەزێن. بەدەست کەوتە سینگ کوتان و ڕنینەوەی گەردنی ناسك و ڕوومەتی جوانی. میناکی یەزدانخانمێك دەیلاواندەوە ودەیگوت: "ئەی پاتروکلۆس، ئەی ئازیزترین ئازیزی دڵە کڵۆڵەکەم.. وەختێ من لێرە، لەم خەرگەیە ڕۆییشتم تۆم بەزندویەتی بەجێهێشت، ئەی سەرداری لەشکرکێش، کەچی لە هاتنەوەمدا بەمردویەتی دەتبینم!.. وادیارە ئەمە بەختی ڕەشی منە کە دەبێ کارەسات بەکارەساتم بسپێرێت.

من بەچاوی خۆم مێردەکەمم، کە باب و داکی بەڕێزم بەویان بەمێرد دابووم، بینی کە لەبەردەم شارەکەماندا بەزەبری نێزە و پەیکان کوژرا، هەروەها هەر سێ براکەشم، برا ئازیزەکانم، لە هەمان ڕۆژدا کوژران.. کەچی تۆ، لەو کاتەدا کە (ئەخیل)ی گورج و گۆڵ شووەکەی کوشتم و شاری (مونیس)ی وێران و تالان کرد، لەو تەنگانەیەدا دڵخۆشیت دەدامەوەو نەتدەهێشت بگریم. دەتگوت کارێکی وەها دەکەم ئەخیل بەفەرمی بتخوازێ و لەگەڵ خۆیدا بۆ (پیتیا)ت دەبات و لەوێ لەناو مورمیدونەکاندا، ئاهەنگی زەماوەندم بۆ دەگێڕیت. لەبەر ئەوە هەقی خۆمە ئێستا لەسەر کوشتەت بکەم شین.

(٣٠١) بەدەم گریانەوە ئەو قسانەی دەکرد. ژنەکانی دیکەش بەگریان و ڕۆڕۆ لە دەوری خڕبوونەوە، لە ڕاستیا بەبیانوی پاتروکلۆسەوە، هەریەکەیان بۆ خۆی و بەدبەختی و نەگبەتی خۆی دەگریا. ردێن سپیانی ئاخایی هەموو لە دەوری ئەخیل خڕبوونەوە، لێی پاڕانەوە کە شتێك بخوات، بەڵام ئەو زاری لە خواردن نەدا و بەدەم گریانەوە دەیگوت: "تکاتان لێدەکەم، ئەگەر خاتری منتان دەوێ، کەس بۆ نان خواردن ڕووم لێ نەنێ، چونکە دەردێکی گەلەك گرانم لەدڵدایە. تاوەکو ئێواری نان ناخۆم."

(٣٠٩) دوای ئەو قسانە، فەرماندە و ردێن سپیەکانی دی هەموو ڕۆییشتن، تەنیا دوو کوڕەکەی ئوتریوس و ئودیسیوسی جوامێر، و نەستور، ئیدومینیوس، فونیکسی پیر -میرئاخوڕ و عەرەبانچی- مانەوە و کەوتنە هەوڵی ئەوەی دڵخۆشی بدەنەوە و خەمە گەورەکەی دڵی برەوێننەوە ودابمرکێننەوە. بەڵام ئەوە نەیدەویست بەرلەوەی بچێتە جەنگی خوێناویەوە دڵی داسەکنێ.

(٣١٥) بەدەم ئەو بیرانەوە ئاهێکی ساردی هەڵکێشا و گوتی: "ئەی ئازیزترین هاوڕێم، ئەی بەدبەخت، جاران تۆ، هەر جارێ ئاخاییەکان دەکەوتنە خۆ بۆ شەڕی خوێناوی تەروادەییەکان. تەروادەییانی چاپوك سوار خێرا، خۆشترین خواردنت بۆ ساز دەکردم.. کەچی ئێستا، شێواو و بێ جوڵە لەو گۆڕە کەوتووی. هێندە بۆت پەرۆشم، دڵم لە خواردن و خواردنەوە، هەرچەند لەبەردەستدان، تۆراوە. تەنیا خەم دەخۆم. باوەڕ بکە ئەگەر هەواڵی مەرگی بابمیان بۆ هێنابام ئەوەندەم خەم نەدەخوارد. ئەو بابەی پێموایە نهو لە پتیادا فرمێسکی میهر و سۆزی باوکایەتی بۆ کوڕێکی وەکو من، بۆ دووری من دەڕێژێت. منێك کە لەم غەریبایەتیە لە ڕای هیلینێکی قێزەوەردا شەڕی جەنگاوەرانی تەروادەیی دەکەم.. تەنانەت ئەگەر هەواڵی ئەوەیان دابومایە کە تاقە کوڕە ئازیزەکەم،

نیوپتولیموس، که بەقەد خوایەك جوانە، و ئێستا لە سکوروس بۆمی بەخێو و پەروەردە دەکەن، بەزندویەتی ناگەڕێتەوە، ئەوەندە خەمبار نەدەبووم. بەڕاستی من لە ناخی دڵەوە، بەهێڤی ئەوە بووم کە هەر من لە دووری ئارگۆس، مەڵبەندی ئەسپان، لێرە، لە خاکی تەروادەدا بمرم و تۆ بۆ پیتیا بگەڕێیتەوە تا کوڕەکەم بنەیتە سەرکەشتییە چاپوك و ڕەشباوەکەت و لە سکورسەوە بیهێنیەوە و هەموو شتەکانی منی پێ نیشان بدەیت: موڵك وماڵەکەم، نۆکەر ودەست و پێوەندانم، کۆشکە بەرز و باڵاکەم.. چونکە پێموایە پیلیوس، ئێستا، یا مردووە و براوەتەوە، یا ئەگەر مابێ، پیر و کەلەلا بووە و لەژێر باری قورسی درێوی پیریدا، بەدەم چاوەڕوانی هەواڵی دڵتەزێنی مەرگی منەوە دەناڵێنێ."

(٣٣٧) بەدەم گریانەوە ئەو قسانەی دەکرد، ردێن سپیەکانیش بەدەم هەناسە هەڵکێشانەوە، هەر کەسە و بیری لەو موڵك و ماڵ و کەسوکارە دەکردەوە کە لە وڵاتی خۆی بەجێی هێشتبوو. زیوسی کوڕی کرونۆس لە ئاسمانەوە تێی ڕوانین، بەزەیی پێیاندا هاتەوە. ڕویکردە ئەتینا و بەڕاشکاوی پێی گوت: "کیژم، تۆ ئەم جەنگاوەرە دلێرەت بەجاریێ فەرامۆش کردووە، چیە، ئەخیل تەواو، لە دڵت دەرچوو؟ ئەوەتا لەوێ، لە هەنبەر کەشتییەکانی بەتاقی تەنێ ڕۆنیشتووە و بۆ مەرگی هاوڕێ ئازیزەکەی دەگری، هەرچەند ئەوانی دی چوون بۆ نانخواردن، لێ ئەو وەك ئەوەی بەڕۆژوو بێ خواردن و خواردنەوەی لەخۆی حەرام کردووە."

(٣٤٩) بەو قسانە ئەتینای هاندا، ئەویش بەتاسەیەکی زۆرەوە، وەکو بازێکی تیژ باڵی، دەنگ تیژ، لە قوببەی ئاسمانەوە داکشا. لەو کاتەدا ئاخاییەکان لە سەرانسەری ئۆردوگاکەدا، خۆیان بۆ شەڕ تەیار دەکرد. ئەتینا خۆی گەیاندە ئەخیل و نۆشدارو و عەنبەری خوایی بەگەرووی ئەخیلدا کرد، تا برسێتی زەفەری پێ نەبات و لاقی لە برساندا نەلەرزێ، ئەوجا بۆ کۆشکە مکوم و بێ وێنەکەی بابە هەرە بەهێز و تواناکەی گەڕایەوە. هەنگێ ئاخاییەکان لە کەشتییە لەزگینەکانیانەوە وەدەرکەوتن. وەکو ئەو کلوە بەفرە چڕانەی کە زیوس دەیبارێنێ و بەدەم بای باکورەوە باڵ دەگرن و سارد و تەزی و سفت دادەبارن، بەڵا بەو ئاوایە، بەهەمان چڕ و پڕی کێوخودێن ڕەخشان، سپەرانی قۆقز، زرێ و سینەبەندی قوت و قایم و ڕمێن دارگەز لە کەشتییەکانەوە دەهاتنە دەرێ.. بریق و هۆڕی چەك و زرێ و ئەسلەحەیان دەگەییە تاقی ئاسمان و زەوی دەوروبەریان لە تیشکی برونزی واندا غەرق بوو بوو. ڕمبەی ڕۆییشتن و هەنگاونانیان ڕۆژە ڕێیەك

دەڕویی. ئەخیل لە ناوەڕاستیانا، چەك و تەدارەکی لە خۆ دابوو و ددانی لێکدی دەسوو، چاوەکانی میناکی ئاگر پرشنگیان دەدا، دڵی سەر ڕێژی خەم بوو. بەو جۆرە دانی لە تەروادەییەکان دەکرۆشت و دیارییە خواییەکانی، ئەوانەی کە هیفایستوسی لەنگ ڕەنجێکی زۆری بەدروستکردنیانەوە کێشا بوو، یەك یەك لەبەر دەکرد.

(٣٦٩) هەوەڵجار لاقبەندە جوانەکانی، کە بە ئاوزونەی زیو لە دیوی پاژنەیەوە قایم دەکرا، لەپێ کرد. ئەوجا زرێکەی لەبەرکرد. دوایی شمشێرە برونزییە زیوکفتەکەی لە شان کرد، دوای ئەوە قەڵغانە بتەوە نایابەکەی بەدەستەوە گرت، کە پرشنگی تا هەتەری چاو دەڕۆیی و لە تۆ وایە تریفەی مانگە. وەکو چۆن چەند دەریاوانێك، لە قوڵایی دەریادا گەرداو هەڵیان دەگرێت و بڵێسەی ئاگرێکیان لەمەزاریەکی دوورە دەستی تەریکی سەر چیایەکەوە لێ بەدیار دەکەوێ و گەرداوەکە بەتۆبزی دەیانبات و لە هاورێکانیان دوور دەخاتەوە.. بەو ئاوایە سپەرە جوان و نایابەکەی ئەخیل پرشنگی دەهاویشت و پرشنگی دەگەییە تاقی ئاسمان.ئەوجا کێوخودە قورسەکەی هەڵگرت و نایە سەرسەری، لە تۆ وایە ئەستێرەیە و دەدرەوشێتەوە و ئەو ڕیشو و کاکۆڵانەی کە هیفایستوس وەستایانە پێوەی نابوو بەهەموو لایەکدا نەرم و ناسك دەجوڵان و شەپۆلیان دەدا. ئەخیلی مێرخاس هەموو ئەو چەك و ئەسلەحانەی تاقی کردەوە، پڕ بەبەری بوون، چوارپەلی زۆر بەئاسانی تیایدا دەجوڵا و لەتۆ وایە باڵن و بۆ ئاسمانی هەڵدەگرن.

(٣٨٦) ئەوسا نێزەکەی بابی لە کێلان دەرکێشا، ئەو نێزە قورس و گرانەی کە جگە لە ئەخیل، هیچ ئاخاییەکی دیکە نەیدەتوانی بەکاری بێنێ. ئەم نێزەیە لە دارگەز دروست کرابوو، خایرون لە دارێکی سەر لوتکەی بیلیونی بڕی بووەوە و دابووی بەبابی وی تا قارەمانانی پێ بکوژێت. ئوتومیدون و ئەلکیموس خەریك بوون ئەسپەکانیان لە گالیسکەکە دەبەست، هەوساری جوانیان کردنە سەریان و لغاویان لە دەمیان کرد و جڵەوەکانیان لە عەرەبانەکە بەست.. ئوتومیدون قامچییە ڕەخشانەکەی بەدەستەوە گرت و خۆی هەڵدایە سەر عارەبانەکە و لە پشت ئەسپەکانەوە دانیشت. هەنگێ ئەخیل بەتەواوی چەك و ئەسلەحەی شەڕەوە سەرکەوت، لە چەك و ئەسلەحەدا بەجۆرێ دەدرەوشایەوە لە تۆ وایە هیپریونی خواوەندی هەتاوە. ئەوجا بەدەنگی بەرز، ئەسپەکانی بابی دەنگ دا و گوتی: "ئەی ئیکسانتوس و پالیوس، ئەی نەوە و نەتیرانی بودارجی بەناقودەنگ، چاو بکەنەوە و ئاگادار بن، هەر چۆنێ بووە سایەقەتان بەسەلامەتی بۆ ناو هێز و لەشکری

دانیان بگەڕێننەوە. بەمردوویەتی لەو دەشتەدا وەکو پاترۆکلۆس بەجێی مەهێڵن."
(٤٠٤) "ئیکسانتوس"ی ڕەهوان، ئەگەرچی لەژێر نیردا بوو، سەری دانەواندەوە و یاڵەکەی لەژێر نیرەکەوە شۆڕ بووەوە و گەییە عاردی. چونکە هیرای باسك چەرموو، توانای قسەکردنی پێ بەخشی بوو، گوتی: "بەڵا، ئەی ئەخیلی بەتوانا: ئێمە ئەمجارەش تۆ لە مەرگ دەخەلەسێنین. لێ ڕۆژی مەرگی تۆ نزیکە، ئەوەش گوناهی ئێمەی تێدا نییە، چونکە ئەوە قەرار و قەدەری ئاسمانە. جا تەروادەییەکانیش کە چەك و ئەسلەحەکەی پاترۆکلۆسیان بەتالاند بردووە، ئەمە ئەنجامی تەخسیر و درێغی ئێمە نەبووە. ئەو کەسەی کە ئەوی لەڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکاندا کوشت و سەرفرازی و سەرکەوتنی بەهیکتۆر بەخشی، خواوەندێکی فرە بەتوانا بوو، کوڕەکەی لیتوی ناسك و نازدار بوو. ئێمە هەردووکمان دکارین لە بای ڕۆژئاوا، کە بەقەولی بەشەران، لەزترین بایە، خێراتر غار بدەین و تاو بدەین، بەڵام چارەنووسی تۆ ئەوەیە کە بنیادەمێك بەپشتیوانی خواوەندێك دەتکوژێت و بەسەرتا زاڵ دەبێت."
(٤١٨) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، پەروەردگارانی تورەیی (ئیرینویس) قسەکەیان لە دەمی بڕی و بێدەنگیان کرد. ئەخیلوس، بەتورەیی وەڵامی دایەوە: "ئەی ئیکسانتوس بۆچی هەواڵی مەرگی خۆمم دەدەیە؟ پێوست بەوە ناکات، تۆ ئەو هەواڵەم بدەیتێ. من بەخۆم زۆر چاك دەزانم کە چارەنووسم ئەوەیە لێرە، دوور لە بابی ئازیز و دایکم بمرم. بەڵام وێرای ئەمەش من دەست لە کوشتار هەڵناگرم، بەر لەوەی ژەهری کوشتار ومەرگ بەتەروادەییەکان بنۆشم."
(٤٢٤) ئەوقسانەی کرد، لە نەعرەتەی داوئەسپە ڕەهوانەکانی بەناوهێزی جەنگاوەرەکانی پێشەوەدا تاودا.

# سروودی بیستەم

## بەشداری خواوەندان لە شەڕدا

**حیکایەتەکە:**

**پاش مەرگی پاتروکلۆس، هیفایستوس زرێیەکی عەنتیکەی بۆ ئەخیل دروست کرد. ئەمەش بەو مانایە بوو کە ئەخیل بڕیاری شەڕی داوەو براوەتەوە. هەڵبەتە دەبێ لە ئەنجامی ئەمەوە ڕووداوەکان بگۆڕێ، زیوس خواوەندەکانی کۆ کردەوە، پێی گوتن دوای ئەوەی پشم و غەزەبی ئەخیل دامردەوەو ئەخیل و ئاگامەمنون ئاشتبوونەوەتەوە و ئەخیلی قارەمان سەرفرازی و شکۆی خۆی بەدەستهێناوەتەوە، خواوەندان بۆیان هەیە بەشداری شەڕ بکەن، یا هەر خواوەندێك پشتیوانی لەو لایەنە بکات کە خۆی گەرەکیەتی، ئەمە بۆ زیوس فەرق ناکات، چونکە کاروبارەکان ڕەوتی خۆیان وەرگرتووە و بەندن بەقەدەری خۆیانەوە.خواوەندەکان چاوەنۆڕیی دەرفەتێکی واهی بوون، هیرا و ئەتینا و پوسیدون و هرمیس و هیفایستوس دایانە پاڵ ئاخاییەکان، ئەپولۆ و ئەفرۆدێت و ئایریس و لیتۆ و ئێکسانتوس چوونە پاڵ تەروادەییەکان.**

**شەڕ هەڵگیرسایەوە. خواوەندەکان حەزیان نەدەکرد ڕاستەوخۆ بەشداری شەڕەکە بکەن، تا شەڕەکە نەبێ بەشەڕ و ڕووبەڕووبوونەوەی ڕاستەوخۆی خواوەندەکان. بۆیە لە بازنەی پیلانگێڕی و دەسیسە و ئەو فێڵ و فەندانە دەرنەچوون کە دەیانزانی. شەڕی یەکەم لەنێوان ئەخیل و ئینیاسدا ڕوویدا، ئەپولۆ ئینیاسی قارەمانی هاندا ڕووبەڕووی ئەخیل ببێتەوە، دوای ئەوەی هەردوو قارمان تیر قسان بەیەکتر دەڵێن، شەڕێکی توند دەست پێدەکات، زۆری نامێنێ ئینیاسی تێدا بکوژرێ، ئەگەر خواوەند پوسیدون نەبوایە. پۆسیدون هەڵیگرت و گەیاندییەوە ئەوسەری بەرەی شەڕەکە. کە هەندێ دەستە و هێز خۆیان بۆ بەشداری لە شەڕەکە ئامادە دەکرد، چەکیان لەخۆ دەدا و عەرەبانە و ئەسپەکانیان لە چەك و تفاقی شەڕ بار دەکرد. هۆیەکەش ئەوە بوو کە هێشتا**

ئەخیلی نەهاتبوو، بۆیە ئەم خواوەندە، هەرچەند لایەنگری ئاخاییەکان بوو، ڕزگاری کرد.شەڕی گەورەی دووەم لەنێوان ئەخیل و هیکتۆردا ڕوودەدات. ئەپولۆ هیکتۆری ئاگادار کردبووەوە کە بەتەنێ و بەبێ هاوڕێکانی توخنی ئەخیل نەکەوێ. هیکتۆر لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەخیل دوور کەوتەوە.لێ کاتێ کە (پۆلیدرۆس)ی برای بینی کوژراوەو ورگ و ڕیخۆڵەی ڕژاوی لە باوەش گرتووە، خۆی پێنەگیرا، هێرشی بردە سەر ئەخیل وشەڕێکی توند لە نێوان هەردوو قارەماندا هەڵگیرسا. هیکتۆر ڕمێکی خێواندێ، لێ ئەتینا فویەکی کردو ڕمەکەی لە ئەخیل لادا، هەرچەند فوەکە سووك بوو. شەڕەکە تەواو گەرم بوو، ئەپۆلۆ ناچار بوو،چەند جارێك هیکتۆر ڕزگار بکات، ئەخیل هەر ئەوەندەی بۆ مایەوە بڵێ، خواوەندێك هەیە هەموو ڕۆژ نوێژی بۆ دەکەی و لەبەری دەپاڕێیەوە، ئەویش ئەپولۆیە کە ئەمڕۆ کەوتۆتە پاراستنت، لێ ئەگەر خواوەندێك پشتیوانی لەمن بکات، بێگومان دەتکوژم.شەڕەکە گەرم بوو. تەروادەییەکان پەراگەندە بوون و هەڵاتن، هەندێکیان بەرەو شار هەڵهاتن و هەندێکیان بەرەو ڕوباری ئیکسانتوس.

زەمەن:

گێڕانەوەکە هێشتا لە ڕۆژی سییەمدایە، ئەو ڕۆژەی ئەخیل خۆی بەتەواوەتی بۆ شەڕ تەیار کرد.

شوێن:

دەوروبەری ئۆردوگای ئاخاییەکانە، ئەو دەشتەی نێوان ڕەخی دەریا و شاری تەروادە.

(١) بەو جۆرە، ئەی کوڕی پیلیوس، ئەی تینووی شەڕ، ئاخاییان ئامادە و سەراپا چەکدار، خۆیان بۆ شەڕ تەیار کرد و لە دەورت خڕبوونەوە.. تەروادەییەکانیش لەلای خۆیانەوە، هەموو بەجلی جەنگەوە، هەردەکانی دەشتی تەروادەیان گرت و ئامادەی ڕووبەڕووبوونەوە بوون.

(٤) لەو کاتەدا، زیوس، فەرمانی بەتیمیس دا کە هەموو خواوەندەکان بۆ کۆبوونەوە گاز بکات، ئیدی بەلەز بەناو دۆڵە پڕ پێچ و زۆر و زەبەندەکانی ئولیمبۆس کەوت و خواوەندانی ئاگادار دەکردەوە، کە کۆبوونەوەیە و بێن بۆماڵەکەی زیوس. تەنیا ئوقیانوس نەبێ، ئیدی هەر هەموو ڕوباران و پەریانی دەریایی، ئەوانەی لە بێشەلانانی دڵگیر، سەرچاوە و ڕۆخانان و مێرگوزارانی سەرسەوزدا دەژین، هەموو هاتن بۆ کۆبوونەوەکە، وەختێ گەیشتنە کۆشکەکەی زیوس، زیوسی هەورەوان، لەو دالانە مەرمەڕیە بریقەدار و ناسکەدا، کە هیفایستوس بەوپەڕی لێهاتوییەوە بۆ بابە زیوسی دروستکردبوو، ڕۆنیشتن.

(١٣) بەو جۆرە خواوەندانی بەردەبار لە ماڵی زیوسدا خڕبوونەوە. هەروەها پۆسیدونی خودانی بوومەلەرزەش، فەرمانەکەی یەزدانخانم (تیمیس)ی بەجێهێنابوو و دەریای بەجێهێشتبوو، و هاتبوو، لەوێ لەنێو خواوەندەکاندا ڕۆنیشت و لە مەبەستی زیوسی پرسی و گوتی: "ئەی فەرمانداری هەورە تریشقەی ڕەخشان، بۆچی خواوەندانت کۆکردوەتەوە؟ ئایا لە بیری تەروادەییان و ئاخاییاندای؟.. ئایا شەڕێکی تازە لە ئارادایە ودەتەوێ خواوەندانی لێ ئاگادار بکەی؟

(١٩) زیوسی —خودانی هەوران- بەرسڤی دایەوە و گوتی: "ئەی خێوی بوومەلەرزە، ئەی هەژێنەری زەوی، تۆ نیازی دڵی من دەزانیت و لەوەش بەئاگای کە بۆ چ مەبەستێك لێرەم کۆکردونەتەوە.. من بەئێستاشەوە لە خەمی ئەوانەدام کە ڕوو لە نابووتی دەڕۆن و ملیان بەم شەڕەوە ناوە. جا من حەزم لێیە لێرە، لە لوتکەی ئۆڵەمپدا دانیشم و بەکاوەخۆ بڕوانمە ئەوێندەر و زاخاوی دڵ و دەرونم بدەم. بەڵام ئێوە، ئەی مەحشەری خواوەندان یەکسەر بچن بۆ ناو تەروادەیی و ئاخاییەکان، بەکەیفی خۆتان، لایەنگری لەهەر لایەنێکیان دەکەن، بیکەن. ئەگەر ئەخیل، بەتاقی تەنیاش پەلاماری تەروادەییەکان بدات، ناتوانن خۆیان لەبەر کوڕی پیلیوس ڕابگرن. هەر بەدیتنی قەڵەمی دەست و پێیان دەشکێت، چ جای ئێستا کە لە داخی کوژرانی هاوڕێکەی یەکپارچە بووە بەپشم و غەزەب و پشکۆی تۆڵە. من دەترسم ئەمڕۆ پێش فەرمانی چارەنوس بکەوێ و حەساری شار بڕوخێنێ و شارەکەیان بگرێت."

(٤٠) کوڕی کرونوس، بەم قسانە جەنگێکی بێ ئامانی ڕاگەیاند. خواوەندان، بەگوێرەی خواست و حەزی خۆیان بوون بەدوو دەستەوە و بەرەو شەڕگە وەڕێکەوتن. هیرا ڕووی کردە حەشاماتی لای کەشتییەکان و ئەتینا، پوسیدۆنی خێوی بوومەلەرزە، هیرمیسی چاکەکار و کوانگی زیرەکی و دانایی"شی بەگەڵ کەوتن. هەروەها (هیفایستوس)ش بەشەلەشەل، لاقە لاوازەکانی وەگەڕخست و لەگەڵیاندا چوو!. بەڵام ئەریسی کێورەخشانی بەرەو ئاپۆرەی تەروادەییەکان چوو، ئەپولۆی پۆردرێژ، ئەرتیمسی تیرەنداز، لیتو و ئیکسانتوس و ئەفرۆدێتی ئەهلی خەندە و خۆشی، بەگەڵ کەوتن.

(٤١) تا ئەو کاتەی خواوەندەکان لە شەڕگەکە دوور بوون، ئاخاییەکان زۆر بەکەیف و خۆشحاڵ بوون، چونکە ئەخیل کە ماوەیەکی زۆر دوورەپەرێز و لە مەیدانی شەڕ دوور بوو، هاتبووەوە مەیدان. تەروادەییەکان کە کوڕەکەی (پیلیوس)یان بینی، لە چەك و تفاقی جەنگدا دەبریسکایەوە و هەڤرکێ ئێریسی خواوەندی شەڕ و قرکەری بەشەرانی دەکرد، ترسێکی سەیریان لێ نیشت و قەڵەمی دەست و پێیان شکا... لێ هەر کە خواوەندان هاتنە مەیدان و بەسەر هەردوو هێزی نەیاردا دابەش بوون، خواوەندی دووبەرەکی ئاژاوە و شەڕێکی گەورەی لە بەینی هەردوو سوپادا نایەوە. ئەتینا بەدەنگی بەرز کەوتە بانگ و هاوار.. جارێ لە قەراخ خەنەکەکەی دەرێی حەسارەکە هاواری دەکرد و جارێك لەسەر کەناری بەرز و پڕ هارە و هاژەی دەریاوە پڕ بەزاری هاواری دەکرد. لەم لاشەوە ئەریس لەلای خۆیەوە، میناکی هەورە گۆڵەیەکی ڕەش و سامناك، لەسەر بەرزترین لوتکەی بورجی شارەوە هاواری دەکرد و تەروادەییەکانی بۆ شەڕ هاندەدا، هەندێ جاریش بەکەناری سیمویسدا بەپەلە دەڕۆیی و خۆی دەگەیاندە تەپەی کالیکولونی و لەوێوە هاواری لە تەروادەییەکان دەکرد.

(٥٤) بەو ئاوایە خواوەندانی پیرۆز کەوتنە دنەدانی هەردوو سوپا بۆ شەڕ. ئەوجا بەخۆیان کەوتنە شەڕی یەکدی. هەنگێ زیوسی باب وسەروەری خواوەندان وبەشەران، لە ئاسمانەوە کەوتە گرمەگرم و چەخماخە ناردن بەسەریاندا. (پوسیدون)ش کەوتە هەژاندنی قوڵایی زەوی بێ سنور و لوتکە بەرز و دیوارئاساکانی کۆساران لەژێر پێیاندا. هەر هەموو ڕەگ و ڕیشە و لوتکەکانی ئیدای پڕ فوارە و سەرچاوان کەوتە لەرزین. هەروەها شاری تەروادە و کەشتی ئاخاییەکانیش کەوتنە لەرزین. هادیسی خێوی شەبەنگان و سەروەر و خوای جیهانانی ژێرین، ڕاچڵەکی و لەسەر عەرشەکەی ڕابوو و بەدەنگی بەرز هاواری کرد. لەوە

دەترسا کە پوسیدونی خێوی بوومەلەرزە، زەوییەکەی سەر ئەو شەق بکات، قەڵەمڕەوە ترسناك و بۆگەنەکەی، کە خواوەندانیش لێی دەترسن، بۆ بەشەران و خواوەندان ئاشکرا بکات. کاتێ خواوەندەکان بەربوونە گیانی یەکدی بوو بەو ڕۆژی حەشرە. ئەپولۆ بەخۆ و تیرە باڵدارەکانیەوە بەرانبەری لە شا پوسیدون گرت.. یەزدانخانم ئەتینای چاوگەش دژی ئەریس وەستا.. ئەرتیمسی شکارچی، زێڕین تیر، و تیرەندازی خوشکی ئەپولۆی دوور ئەنگێوە بەرانبەر بەهیرا وەستا، (هێرمیس)ش ڕووبەڕووی (لیتو) بووەوە. ئەو ڕوبارە قوڵ و پڕ گێژەنگەی کە خواوەندان ئیکسانتوس، و بەشەران سکاماندری پێی دەڵێن دژی هیفایستوسە لەنگی مەزن وەستا.

(٧٥) بەو جۆرە خواوەندان بەرانبەریان لێکدی گرت. لێ ئەخیل یەجگار تاسەمەندی ڕووبەڕووبوونەوەی هیکتۆری کوڕی پریام بوو.. چونکە دڵی ئەمری پێدەکرد کە بەر لەهەر کەسێك، ئەو جەنگاوەرە سەرسەختە بکوژێت و تینوێتی ئێریسی –جەنگاوەری چەرمین سپەر، بەخوێنی ئەم قارەمانە پاراو بکات. ئەپولۆی ڕێنوێن و هاروژێنەری لەشکران، کەوتە هاندانی ئینیاس بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کوڕەکەی پیلیوس و تا توانی زاتی خستەبەری. دەنگی خۆی گۆڕی بەدەنگی لیکایونی کوڕی پریام، و چووە پێستی ئەوەوە و ڕوویکردە ئینیاس و گوتی: "ئەی ئینیاس، ئەی شیرەتکار و بەردەباری تەروادەییان، کوا ئەو قسە و ئازایەتی و هەڕو گیڤەی کە بەدەم خواردنەوەوە بۆ فەرماندەکانی تەروادەت دەکرد و خۆت پێوە بادەدا. ئەدی هەر تۆ نەبووی بەخۆت دەفشی و دەتگوت ڕووبەڕووی ئەخیل دەبمەوە؟

(٨٦) ئینیاس بەرسڤی دایەوە: "ئەی کوڕی پریام بۆچی بەو زمانە هانم دەدەی بەگژ کوڕی بەجەرگی پیلیوسدا بچم، لە کاتێکدا دەزانی کە ئەو خۆراکی من نیە؟ ئەمە یەکەمجارم نیە کە دژی ئەخیلی لەزگین دەوەستم. جارێکی دیکەش بەخۆ و بەڕمەکەیەوە منی لە ئیداوە ڕاوناوە، ئەو کاتە بوو کە گاگەلەکانی بەتاڵان بردین و لیرینسوس و (پیداسوس)ی وێران کرد. ئەگەر زیوس فریام نەکەوتبا ،ئەو غیرەتی نایە بەرم و هێز و توانای بەلاقم بەخشی، بەخۆی و ئەتینا، دەیانکوشتم. ئەتینا پێشی کەوتبوو، لە ئاسیوانی دەپاراست و دنەی دەدا بەڕمە برونزیەکەی بکەوێتە گیانی خەڵکی لیجیسی و تەروادەییان، یاخوا کەس ڕووبەڕووی ئەخیل نەبێتەوە و لەگەڵی بەشەڕ نەیەت، هەمیشە خواوەندێکی لە تەکدایە، کە لە ئاسیو و بەدبەختی دەپارێزێت. ئەمە جگە لەوەی نێزەکەی ڕاستەوخۆ

بەرەو نامانج دەکشێت و تا بەدەنی بەشەرێك نەپێکێ و نەسمێ ناوەستێتەوە.لەگەڵ ئەمەشدا، ئەگەر خواوەندێك هەبێ و ئیمکاناتی شەڕی نێوانمان یەکسان بکات، ناتوانێ بەئاسانی بۆرم پێ بدات، هەرچەند لاف و گەزافی ئەوەش لێ بدات کە قەڵای پۆڵاینی دژمنان و نەیارانی ئێمەیە.

(١٠٣) ئەپولۆ، کوڕی زیوس، لەبەرسڤیا گوتی: "نا، ئەی قارەمان، تۆش وەرە، نوێژ بۆ خواوەندان بکە، لە بەریان بپاڕێوە. تۆش، وەباڵ بەئەستۆی خەڵك، لە ئەفرۆدێتی، ئەفرۆدێت کیژی زیوسە، خۆ پایەی دایکی ئەخیل، لەنێو یەزدانخانماندا لە پایەی دایکی تۆ کەمترە. چونکە دایکی تۆ کچی زیوسە، و دایکی ئەو کیژی پیرەمێردێکی فەرمانڕەوای دەریایە. کەواتە ڕمە برونزیە مکومەکەت بێنە و پڕی دەیە، نەترە بەر مەدە و نە لە تەوس و توانج و نە لە هەڕ و گیڤی مەترسە."

(١١٠) ئەپولۆ، بەوقسانە زات‌وغیرەتی نایە بەرسەرداری سوپا، تەدارەکی جەنگی لەخۆدا، سەراپا برونزی ڕەخشان بوو، بەوشێوەیە خۆی گەیاندە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکان. هیرای بازوو چەرمگ، کە کوڕەکەی ئەنخیسیسی بینی بەپەلە بەنێو حەشاماتەکەدا دەڕۆیی تا ڕووبەڕووی کوڕی پیلیوس ببێتەوە، خواوەندەکانی لە خۆی خڕکردەوە و پێی گوتن: "ئەی پۆسیدۆن و ئەتینا، ئێوە هەردوکتان لە دڵی خۆدا بیربکەنەوە کە ئەنجامی ئەم کارانە چ دەبێ، ئەوەتا ئینیاس بەخۆ و کێو ڕەخشانەکەیەوە، بەپەلە دەڕوات تا ڕووبەڕووی کوڕەکەی پیلیوس ببێتەوە، ئەپولۆ، دەست بەپشتیا دەدا و دنەی دەدا. جا ئێمە یا دەبێ بیگێڕینەوە، یان یەکێکمان بچینە هیمدادی ئەخیل و هانی بدات و ورەی بەرز بکاتەوە. دەبێ بزانێ کە ئەو خواوەندە نەمرانەی خۆشیان دەوێ و پشتیوانی دەکەن، لە هەموو خواوەندەکانی دیکە پتر جێی باوەڕ و متمانەن، بەڵام ئەوانەی کە تا ئێستا داکۆکیان لە تەروادەییەکان کردووە، فشەن و هیچ نین. ئێمە هەموومان لە ئولیمبوسەوە هاتووین تا لەم شەڕەدا بەشداری بکەین و نەیەڵین ئەخیل ئەمڕۆکە لە ناو تەروادەییەکاندا هیچ ئاسیوێکی بگاتێ. پاشان وازی لێ دێنین ڕووبەڕووی ئەو شتە ببێتەوە کە قەدەر، لە ڕۆژی لە دایکبوونیەوە، لەو ڕۆژەوە کە دایکی ژیانی پێ بەخشیوە، لە چارەی نووسیوە. ئەگەر ئەخیل ئەمە لە زاری یەکێك لە خواوەندەکانەوە نەزانێ، کاتێ لەشەڕدا ڕووبەڕووی خواوەندێك ببێتەوە دەترسێت، چونکە خواوەندان کاتێ دەردەکەون و دێنە بەرچاو یەجگار سامناکن.

(١٤٣) ئەوجا پۆسیدۆنی زەوی لەرزێن، لە وەڵامیان گوتی: "هیرا، بەخۆڕایی خۆت توڕە مەکە، ئەمە لە تۆ ناوەشێتەوە. من لەگەڵ ئەوەدا نیم خواوەندان شەڕی یەکتر بکەین. باشتر وایە بچین لە پەنایەکەوە دابنیشین و تەمەشا بکەین و شەڕەکە بۆ بەشەران بەجێ بهێڵین، خۆ ئەگەر ئێریس یان ئەپولۆ بچنە شەڕەوە، یان رێ لە ئەخیل بگرن و نەیەڵن شەڕ بکات، هەنگێ ئێمەش هەقی خۆمانە بچینە شەڕەوە. پێموایە ئەوسا بەپەلە لە شەڕەکە دوور دەکەونەوەو دەگەڕێنەوە بۆ ئولیمبوس بۆ ناو ئاپۆڕەی خواوەندەکان، چونکە ئەوان باری ئێمە نابەن و دەرەقەتمان نایەن."

(١٤٤) خواوەندی پۆرپەش دوای ئەو قسانە، بردنی بۆ ئەو حەشارگە بەرزەی کە تەروادەییەکان لەگەڵ ئەتینادا بۆ هیروکلیسی ئاسمانی نەژادیان دروست کردبوو، تا بتوانێ پەنای بەرێتێ و خۆی لە چنگی ئەو حەزیا دەریاییە دەرباز بکات کە لە کەناری دەریاوە بەرەو دەشتەکەی راودەنا. پۆسیدون وخواوەندەکانی هاورێی لەوێندەر رۆنیشتن، ئەوجا خۆیان لەژێر پەڵە هەورێکی توندا وەشێرد. لەولاشەوە خواوەندەکانی هاوسۆز و لایەنگری بەرەی بەرانبەر، لەسەر بەرزاییەکانی کالیکولونی، لە دەوری تۆ ئەی ئەپولۆی کەوانکێش و لە دەوری ئێریسی وێرانکەری شاران، بەرانبەر بەدەستە خواوەندەکەی دی دانیشتن.

(١٥٣) بەو جۆرە، خواوەندان، کە بەدوو دەستە دانیشتبوون، تەگبیریان دەکرد، هیچ لایەکیان حەزیان نەدەکرد لە شەڕدا دەست پێشکەری بکەن، زیوس لە ئاسمانەوە، لە عەرشی بەرزی خۆیەوە چاودێری دەکردن.. نیشانەکانی شەڕ دیار بوون، دەشتەکە پڕ بوو لە جەنگاوەر و ئەسپان، سەراپای دەشتەکە لە برونزا دەدرەوشایەوە، زەوی لەژێر پێی ئاپۆڕەی جەنگاوەرانی هەردوولادا دەلەرییەوە، دوو پیاوی بەشان و باهۆی لە هەموان بەهەیبەتتر لەنێو هەردوو لەشکرەکەوە هاتنە دەرێ و لە مەیدانەکەی نێوان هەردوو سوپاکەدا بەرەو ڕووی یەکتر چوون، هەردوکیان شەڕیان لێدەباری.. ئەو دووە ئینیاسی کوڕی ئەنخیسیس، و ئەخیلی مێرخاس بوون.

(١٦) ئینیاس، لە پێشا، بەدەم هەڕ وگیڤەوە هاتبووە مەیدان، کێوخودە گرانەکەی بەسەر سەرییەوە دەلەرییەوە، سپەرە مکومەکەی بە بەر سینگیەوە گرتبوو، نێزە برونزیەکەی لە دەستیا با هەڵدەدا. لەولاشەوە کوڕەکەی پیلیوس وەکو شێرێکی دڕی دڕندە کە کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر لێی خڕببنەوەو بیانەوێ پەلاماری بدەن، سەرەتا بێتە پێشێ و هیچ حەساوێکیان بۆ نەکات، و هەر کە لاوێك خێرا ڕمێکی تێ بسرەوێنێ و شێرە

بەرۆری و دەمیان لێ داپچڕێ و کەف لە دەم و زاریەوە دەرپەڕێ و کلکی بەملاو بەولادا بابدات و گڕ لە چاوانی دەرپەڕێ، یەکسەر پەلامار بدات و هەوڵبدات یەکێکیان لێ بکوژێت، یان خۆی لەبەردەم ئاپوراکەدا بکوژرێ.. (ئەخیل)ش بەهەمان پشم و غەزەب تاوی دایە ئینیاس.

(١٧٦) کاتێ لێکدی نزیکبوونەوە، ئەخیلی جوامێر و لەزگین ڕوویکردە ئینیاس و پێی گوت: "ئەی ئینیاس بۆچی بەم جۆرە لە سوپاییانی خۆت دوورکەوتویتەوە، تا ڕووبەڕووی من ببیتەوە؟ گوایە بەخەیاڵی خۆت، شەڕی من دەکەیت بەو ئومێدەی لەنێو تەروادەییەکاندا ،لەنێو ئەو چاپك سوارانەدا هەمان شوێن و دەسەڵاتی پریام بگریتەوە و پەیدا بکەی؟.. نا، خەیاڵت خاوە، گریمان بشمکوژیت، پریام هەر مەملەکەتەکەی خۆیت ناخاتە بەردەست.چونکە کوڕی فرەن، پیاوێکی بەئاوەز و بەردەبارە.. یان تەروادەییەکان بەڵێنی ئەوەیان داویتێ کە ئەگەر من بکوژیت زەوی و زارێکی زۆر و بەپیت، سەروەت و سامان و دەوڵەت، مێرگ و مەزراوڕەزو باخان و گەنمە جاڕێکی فرەت دەدەنێ؟ بەڵام پێم وایە کوشتنی من لە کێشی تۆدا نییە.. هەر تۆ نەبووی جارێکیان بەپەلە پروزێ لە چنگم دەربازبوویت؟ بیرت چووەوە ڕۆژێ کە بەتەنێ لای گاگەلەکەت بووی، گاگەلەکەم تاڵان کردی و بەلوتکە و قەدپاڵەکانی ئیدادا چنگ لەسەر شان ڕاوم دەنایت؟.. ئەو ڕۆژە بەجۆرێ قوچانت نەتوێرا بۆ تاقە جارێکیش ئاوڕی پاشەوە بدەیتەوە.

لەوێوە بۆ لورونیسوس هەڵاتی، لێ هێرشم هێنایە سەر ئەوێندەرش، و بەکۆمەکی ئەتینا و بابە زیوس دەستم بەسەرا گرت، وێرانم کرد، ژنەکانم بەدیلی برد. بەڵام خوا بەقوربانی زیوس و هەندێ خواوەندی دیکەت بکات کە فریات کەوتن و دەربازیان کردیت. جا تۆ وادەزانی ئەمجارەش دەتپارێزن، نا، پێم وانیە ئەمجارە هەقیان بەسەرتەوە هەبێ. بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم، ئەمرت پێ دەکەم ڕێ و ڕێ بۆ ناو هاوڕێکانت بگەڕێوە، ڕووبەڕووی من مەبەوە، دەنا خراپ دەبینی و ژێوان دەبییەوە.. کەر ئەو کەسەیە پاش باران بیر لە کەپەنك بکاتەوە.

(١٩٩) ئینیاس لە وەڵامیا گوتی: "ئەی کوڕی پیلیوس، مەحاڵە بەگاڵەی دەم بمتۆقێنی، وەکو ئەوەی من منداڵ بم، منیش گەر بمەوێ دەزانم وەکو تۆ جنێوان بدەم و هەڕوگیف بکەم. هەردووکمان ڕەگ و ڕەچەڵەکی یەکتر دەناسین، ناوبانگی باب و داکی یەکترمان لە داستانانی سەرزاری بەشەرانەوە ژنەوتووە و دەیان ناسین. بەڵام نەتۆداك وبابی منت

دیبوون نه من هی تۆ..دەڵێن تۆ لە توخم و تۆوی پیلیوسی مێرخاس و جوامێری، دایکت تیتیسی کەزێ شۆڕە، یەکێکە لە پەریانی دەریایی. بەڵام من، ئەنخیسیسی مێرخاس بابمە و دایکم ئەفرۆدێتە.. ئەمرۆکە باب و داکی من یا هی تۆ، لایەکیان لەسەر کوشتەی رۆڵەکەیان دەکەن شین. جا پێم وایە قسەی بۆش و بەتاڵ تینوێتی کەسمان ناشکێنێ، رۆژ رۆژی شەڕە. بەڵام ئەگەر تۆ دەتەوێ رەگ و رەچەڵەکی من باشتر بناسیت، کە لای زۆربەی خەڵك ئاشکرایە، گوێ بگرە و بزانە

(٢١٥) یەکەمجار زیوسی خێوی هەوران، داردانۆسی لێ کەوتەوە کە شاری داردانیای دامەزراند، ئەوسا هێشتا ئیلیونی پیرۆز دانەمەزرابوو، تا ببێ بەمەفتەن و مەڵبەندی ئەو بەشەرانەی کە لە دۆڵە پڕ سەرچاوە و کانیاوەکانی ئیدادا دەژیان. ئەوجا داردانۆس کوڕێکی لێکەوتەوە، کە شا ئەریختونیوس بوو، کە بوو بەزەنگینترین بەشەر، سێ هەزار ئەسپ و ماینی هەبوو لە مێرگوزارەکانیا دەلەوەڕین و زۆری دڵ بەمنداڵە نازدارەکانی خۆش بوو. بای باکور کە ئەم ماینانە لە لەوەڕەگەدا دەبینێ حەزی دەچێتە سەریان، بۆیە دەچێتە پێستی ئەسپێکی یاڵ رەشەوە و لێیان دەپەڕێ، ماینەکان ئاوس بوون و دوانزە جوانویان هێنا. ئەم جوانوانە کاتێ بەگەنمەجارێکدا برویشتبان، بەجۆرێ بەرز دەبوونەوە دەکەوتنە سەرووی گوڵە گەنمەکانەوە و نەیاندەهێشت تاقە گوڵێك بشکێتەوە .کاتێ بەسەر دەریادا دەڕۆیین. بەسەر بەرزترین شەپۆلانی کێو ئاسای دەریادا دەپەڕینەوە ئیدی ئەریختونیوس (تروس)ی لێکەوتەوە، کە بوو بەپاشای تەروادەییەکان (تروس)ش سێ کوڕی لێکەوتەوە، کوڕ نەگاڵتە کە بریتی بوون لە: ئیلوس، ئەساراکوس، و گانیمدیس کە جوانترین پیاوی ناو بەشەران بوو، لە خواوەند دەچوو، بۆیە خواوەندان دڵبەندی بوون و هەڵیانکێشا بۆ ئاسمان تا لەوێ ببێ بەساقی و مەیگێڕی زیوس، و لەگەڵ نەمراندا بژی. ئیلیوس، لاومیدونی بێ وێنەی خستەوە، لاومیدون، تیتونوس و پریام و کلوتیوس و هیکیتایونی ئەریس زادەی بوو. بەڵام ئەسارکوس، کابیسی خستەوە و کابیس بابی ئەنخیسیس بوو، و (ئەنخیسیس)ش بابی منە و هیتکۆری مەزنیش کوڕی پریامە..

(٢٤١) ئەمە ئەو ئەسڵ و فەسڵ و رەگ و رەچەڵەکەیە کە لێوەی هاتووم. ئەو خوێنەیە کە شانازی پێوە دەکەم. سەبارەت بەئازایەتی و مێرخاسی، بەدەستی زیوسە، بەکەیفی خۆی بەسەر بەشەرانیدا دابەش دەکات. کەمی و زۆری بەدەستی خۆیەتی، چونکە ئەو سەروەر و گەورەی هەمووانە و لە هەمووان بەتواناترە. بەڵام باواز لەم قسانە بێنین،

با چیتر وەکو منداڵان لە جەرگەی مەیدانی شەڕدا قسان نەکەین. قسەی سارد و سڕ و جنێوان هێندە زۆرە، کە هەریەکێکمان دەتوانێ ئەوەندە قسەی ناشرین بەوی دی بێ کە کەشتیەکی سەد نەفەری نەیگرێ و نەتوانێ هەڵیبگرێ. زمانی بەشەر ئامانی نیە، گۆشتێکی نەرمە و بەهەموو لایەکدا دەگەڕێ، وتەی باش و وتەی بەدی لێ دەوەشێتەوە. تۆ بتوانی هەر شتێك بڵێی، هەمان شت دەبیستیەوەو هەمان شتت پێ دەگوترێتەوە. ئیدی چ پێویست دەکات بکەوینە تانە و تەشەر لێکدی، وەکو ئەو ژنانەی بەشەڕ دێن و تورەیی جڵەویان لە دەست دەسێنێ و سەری ڕێگە لێکدی دەگرن و هەزار و یەك جنێوی سەر بەکوڵکەی ڕاست و درۆ بەپێی تورەییەکەیان بەسەر یەکدیدا دەبارێنن. جا تۆش ناتوانی بەقسە و جنێوان من ببەزێنی و خولیای شەڕم لەسەر دەربێنی .بۆیە باشتر وایە بەرمان ڕووبەڕووی یەکتر ببینەوە و یەکتری تاقی بکەینەوە!"

(٢٥٩) دوای ئەو قسانە، نێزەیەکی خێواندە سپەرە عەنتیکە و سامناکەکەی ئەخیل، سپەرەکە لە ئاستی نوکی ڕمەکەدا زرنگایەوە و دەنگی دایەوە. کوڕی پیلیوس سپەرەکەی بەدەستە بەهێزەکانی خۆی لەبەردەم خۆی ڕاگرت. ئەوی ڕاستی بێ ترسا، چونکە پێی وابوو ڕمەکەی (ئینیاس)ی جوامێر بەئاسانی سپەرەکەی دەبڕێ. غافڵ بوو لەوەی کە ئەو دیارییە بەشکۆیانەی خواوەندان، بەو ئاسانییە بەبەشەرانی فانی بێنە شکان، ئەوە بوو نێزە قورسەکەی ئینیاسی جوامێر، سپەرەکەی نەبڕی، چونکە ئەو توێژە زێڕەی کە دیاریی خودابوو، و لە دروستکردنی سپەرەکەدا بەکارهاتبوو نێزەکەی گەڕاندەوە. هەرچەندە نێزەکە دوو لۆی سپەرەکەی بڕی، بەڵام سێ لۆیەکەی دی وەکو خۆیان مانەوە. چونکە خواوەندی لەنگ لە پێنج لۆ دروستی کردبوو، دووانی لە برونز، دوانی ژێرتر لە مس و لۆیەکی ناوەڕاستیان لە زێڕ بوو، جا ڕمە بناویەکە لەم لۆیەیاندا وەستایەوە.

(٢٧٣) هەنگێ ئەخیل، ڕمەکەی خۆی هاویشت. بەر سپەرەکەی ئینیاس کەوت، ڕێك بەر قەراخی دەرەوەی سپەرەکە کەوت کە برونزەکەی زۆر تەنك بوو هەروەها چەرمەکەی ژێریشی زۆر تەنك بوو ڕمەکە کە لە داربناوی چیای پیلینا دروست کرابوو، بەر قەراخی سپەرەکە کەوت، پیرە سپەر تەقەی لێ هەستاو دەنگی دایەوە. ئینیاس خەریك بوو بکەوێ. سپەرەکەی لە خۆ دوور گرت، ترسی لێنیشت ڕمەکە لە پشتیەوە تێپەڕی و لە عاردی چەقی، هەرچەند دوولۆی قەراخی سپەرەکەی شکاند بوو، بەڵام ئینیاس لە ڕمەکە خەلەسی، زۆر حەپەسا، لەجێی خۆی وەستا، کە بینی نێزەکە لە نزیکی ئەوەوە لە عاردی

جەوەی ترسێکی زۆری لێنیشت. ئەخیل شمشێرە بڕندەکەی هەڵکێشا و لە نەعرەتەی داو پەلاماریدا، ئینیاس هەڵیگرتە بەردێکی گەورەی ئەوتۆ کە بەدوو زەلامی ڕۆژگاری ئەمڕۆ هەڵنەدەگیرا، لێ ئینیاس بەتاقی تەنێ و زۆر بەئاسانی هەڵیگرت.

(٢٨٨) لەم کاتەدا ئینیاس دەیتوانی ئەو گابەردە بەکێوخود یان سپەرەکەی ئەخیلدا بکێشێت، ئەو سپەر و کێوخودەی کە لە مەرگیان دەپاراست. هەروەها (ئەخیل)ش دەیتوانی بەزەبری شمشێرەکەی ورگی ئینیاس هەڵدڕێ و ڕوحی لەبەر ببڕێ، ئەگەر پوسیدونی زەوی لەرزێنی چاوتیژ نەیدیبان. ئەوەبوو یەکسەر ڕوویکردە خواوەندەکان و گوتی: "ئەی خواوەندان، گوێ لە من بگرن... من زۆر بەخەمی ئینیاسی مێرخاس و دلێرەوەم، کە هەر ئێستا بەدەستی ئەخیل دەکوژرێت و بەتەنێ دەڕوات بۆ هادیس ،خانەی مردووان. چونکە ئەم گەوجە بەگوێی ئەپولۆی دوور ئەنگێوەی کردووە. غافڵە لەوەی کە ئەپولۆ لە مەرگی ناپارێزێ. باشە بۆ دەبێ ئەم جەنگاوەرە بێ تاوانە، بەبێ هیچ هۆیەکی ماقول باجی هەڵەی کەسێکی تر بدات؟ ئەم جەنگاوەرەی هەمیشە نەزر و قوربانی بەخواوەندانی ئاکنجی ئاسمانی بێ کۆتایی، پێشکەش کردووە .جا با ئێمە بەخۆمان فریای بکەوین و نەیەڵین ئەخیل بیکوژێت، چونکە زیوسی کوڕی کرونوس تورە دەبێت.. چارەنوسیشی وایە کە نابێ بمرێت، تاوەکو تۆ و توخمی داردانۆس نەبڕێتەوە.. ئەو داردانوسەی کە زیوس لەهەر هەموو ئەو منالانەی کە لە ژنانی بەشەری بوونی خۆشتری گەرەکە. جا کوڕی کرونوس لە نەوەی پریام بێزار بووە و لەمەودوا ئینیاسی مەزن و لەدوای خۆی نەوەکانی فەرمانڕەوایی تەروادەییەکان دەکەن."

(٣٠٩) هەنگێ هیرای هەژی، چاوکەژاڵ لە بەرسڤیا گوتی: "ئەی زەوی لەرزێن ،خێوی بوومەلەرزان! بەخۆت بیر لە مەسەلەی ئینیاس بکەوە، ئەگەر دەتەوێ ئینیاس لە فەوتان ڕزگار بکەی و نەیەڵی بەدەستی ئەخیل بکوژرێ، تۆ خۆت بەوردی بیری لێ بکەوە، چونکە ئێمە، من و ئەتینا چەندین جار لەبەردەم هەموو خواوەندە نەمرەکاندا سوێندمان خواردووە کە هەرگیز لە تەنگانەدا بەهانای تەروادەییەکانەوە نەچین.. تەنانەت ئەگەر هەر هەموو تەروادەش بەدەستی جەنگاوەرانی نەبەزی ئاخایی بێتە سوتاندن."

(٣١٨) کاتێ پۆسیدون، زەوی لەرزێن، گوێی لەو قسانەی هیرا بوو خۆی بەمەیدانی شەڕەکەدا کرد و بەناو هەراو هەنگامەی شەڕەنێزاندا خۆی گەیاندە ئەو شوێنەی کە ئینیاس و ئەخیلی لێ بوون. یەکسەر تەمومژێکی خستە سەر چاوانی ئەخیلی کوڕی

ئینیوس، و ڕمە بناوییە بەبرونز پۆشراوەکەی لە سپەرەکەی ئینیاسی گەڕنۆس و دلێر دەرکێشا و لەبەر پێی ئەخیلدا دایناۥ ئەوجا ئینیاسی هەڵگرت، لە زەوی بەرزکردەوە. ئینیاس کە دەستێکی خوایی هەڵیگرتبوو بەسەر سەری سەربازان و ئەسپ و عەرەبانانداوە فڕی تا گەییە ئەوپەڕی مەیدانی شەڕە خوێناوییەکە ،کە کوکونانەکان لەوێندەر خۆیان بۆ شەڕ ئامادە و ساز دەکرد. هەنگێ پوسیدونی زەوی لەرزێن لێی نزیك بووەوە و گوتی: "ئەی ئینیاس، ئەمە کام خودا گەوجی کردوویت تا بچی بەگژ کوڕی پیلیوسدا کە هەم لەتۆ بەهێزترە و هەم خواوەندانیش لەتۆ زیاتریان دەوێ؟ پێویستە هەر کاتی دیتت خۆتی لێ لابدەی، نەبا بەرلەوەی ئەجەلت بێ هەواڵەی هادیس (خانەی مردووان)ت بکات. هەر گاڤێ ئەخیل ئەجەلی هات و مرد دەتوانی بچیتە ڕیزی پێشەوەی شەڕ و دەعوایە، چونکە جگە لەو هیچ ئاخاییەك ناتوانێ تۆ بکوژێت!"

(٣٤٠) ئەو قسانەی کرد و پاش ئەوەی ئینیاسی لە هەموو شتێك ئاگادار کردەوە و ئامۆژگاری تەواوی کرد، لەوێ ڕۆیی. تەمومژەکەی سەر چاوی ئەخیلی ڕەواندەوە. ئەخیل چاوی کرایەوە و بەسەرسامی ڕوانیە دەوروبەری خۆی. بەدڵەی بێباك و نەترسی خۆی گوت: "ئاە، چ موجیزاتێك دەبینم! ڕمەکەم لەو گۆڕە کەوتووە، ئەو پیاوە نابینم کە بەقەستی کوشت خێواندمێ! وادیارە "ئینیاس"ش لەژێر باڵی خواوەندانە و لایان ئازیزە، هەرچەند من پێم وابوو، بەخۆرایی خۆی هەڵدەنا. بابڕوات جارێکی دیکە زاتی ئەوە ناکات ڕووبەڕووم بێتەوە. بەختی هەبوو کە ئەمجارە لە مەرگ خەلەسی. بەهەرحاڵ با بڕۆم داناییانی ئاشقە شەڕ بەگەڕ بخەم و بەپەلە بچینە شەڕی تەروادەییەکانی دی."

(٣٥٣) دوای ئەو قسانە، بەسەر جەنگاوەرەکاندا گەڕا و بەدەم هاندانیانەوە گوتی: "ئەی ئاخاییان لەمە بەدوا دەست لە تەروادەییان مەپارێزن. هێرشیان بۆ بەرن و هەریەکەتان ڕووبەڕووی یەکێکیان ببێتەوە! سەبارەت بەمن، چەند دلێر و بەهێزش بم زۆر زەحمەتە بەتەنیا ڕووبەڕووی هێز و لەشکرێکی وا گەورە ببمەوە و بەجارێ شەڕی هەر هەموویان بکەم.. بەڵکو نە ئەریس، هەرچەند خواوەندێکی نەمرە، و نە ئەتینا ناتوانن ئەم شەڕە قورسە کۆنترۆڵ بکەن ،من ئەوەندەی دەستانم، لاقانم، هێز و توانام ڕێم بدەن درێغی ناکەم، بۆ تاقە دەمێکیش کەمتەرخەمی ناکەم. سەفدر تێیان دەکەوم و پێموایە هەر تەروادەییەك بێتە هەتەری ڕمی من بێ بەڵا دەرناچێت."

(٣٦٤) هیکتۆری جوامێرش لەلای خۆیەوە هاواری لە تەروادەییەکان کرد و بەدەم

هاندانیانەوە ئاگاداری کردنەوە کە دەچێتە شەڕی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەخیل: "ئەی تەروادەییانی بەڕێز و ئازا، بەهیچ جۆرێ لە کوڕی پیلیوس مەترسن، سڵی لێ مەکەنەوە.. ئەگەر مەسەلەکە هەر بەقسەی ڕووت بوایە، من دەمتوانی نەك شەڕی ئەو، شەڕی خواوەندانی نەمرش بکەم. بەڵام شەڕە نێزە لەگەڵ ئەواندا دژوارە، چونکە ئەوان زۆر لە ئێمە بەهێزترن.. (ئەخیل)ش هەموو قسەکانی نایەنەدی، هەندێکی دێتەدی، و هەندێکی نایەتەدی. جا من دەچمە شەڕی ئەو، ڕووبەڕووی دەبمەوە. ئەگەر دەستانی ئاگرو هێز و توانای پۆلاش بێ."

(٣٧٤) بەو جۆرە هانیدان، تەروادەییان ڕمەکانیان بەرز کردەوە و بەرەو دژمن چوون. هەردوو لەشکر تێك بەربوون و هەرا و هوریای شەڕ لە هەموو لایەکەوە هەستا. لەم کاتەدا ئەپولۆ لە هیکتۆر نزیك بووەوە و گوتی: "ئەی هیکتۆر لە ئێستا بەدواوە لە ئاپۆرەی لەشکرەکە دەرمەکەوە تا ڕووبەڕووی ئەخیل ببیتەوە، بەڵکو لەناو خەڵکەکەدا چاوەڕوانی بکە، نەبادا بەر دوورە ڕمت بدات و بت ئەنگێوێ یان لە نزیکەوە بەشمشێر بریندارت بکات."

(٣٧٩) هیکتۆر کە دەنگی خواوەندی ناسییەوە، ترسا، بۆ ناو ئاپۆرەی جەنگاوەرەکانگەڕایەوە.. لێ ئەخیل کە یەکپارچە جۆش و خرۆش بوو، بەدەم نەعرەتەی سامناکەوە هێرشی بردە سەر تەروادەییەکان. هەوەڵجار ئەفیتیونی جوامێری کوڕی ئۆترونیتیوسی، کوشت. ئەفیتیون ڕابەر و سەرکردەی لەشکرێکی گەورە بوو. ئۆترونیتوسی، شاران گیر لە داوێنی چیای تومولوسی سەر بەبەفرا، لە دەڤەری بەپیت و بەرەکەتی (هیدا)دا لەگەڵ پەرییەکی دەریاییدا جووت بوو بوو و ئەفیتیونی لێ بوو بوو. ئەم جەنگاوەرە مەزنە حەماس گرتبووی و ڕاستەوخۆ هێرشی بۆ ئەخیل بردبوو. ئەخیل نێزەیەکی بەسەریا دابوو و کردبووی بەدوو لەتەوە. ئیدی ڕمبەی لێ هەستابوو و کەوتبووە سەر زەوی، و لە خاك و خوێن گەوزا بوو. ئەخیل شاد و سەرمەست دەچێتە سەری و دەڵێت: "ئەی کوڕی ئۆترونیتوس، ئەی بەسامترین پیاو، ئەمە تۆی لەم گورە کەوتوویت و لێرە دەمریت، هەرچەند تۆ لە کەناری دەریاچەی جیجە، کە قەڵەمڕەو ومەڵبەندی باوانتە، لە کەناری هیلوسی فرە ماسی، هیرموسی پڕ گێژاو وگێژەنگ لە دایك بووی!"

(٣٩٣) بەو ئاوایە کەوتە خۆ هەڵنان، تاریکی باڵی بەسەر چاوانی ئەفیتیوندا کێشا و

جەنارەکەی لەڕیزی پێشەوە و لەژێر تەگەری گالیسکەی ئاخییەکاندا پارچە پارچە بوو. ئەخیل دوای ئەو (دیمولیون)ی کوڕی ئەنتینوری کوشت. دیمولیون پشت و پەنا وقەڵای جەنگاوەران بوو. ئەخیل نێزەیەکی بەلاجانگیدا دا وڕوومەت پۆشی کێوخودە برونزیەکەی بڕی و کاسەی سەری شەق کرد ومێشکی پژا و مرد.. ئەوجا ئەخیل بەهەمان تین وتاو نێزەیەکی سرەوانده ناوقەدی هیپوداماس، لە کاتێکا هیپوداماس خۆی لە عارەبانەکەی هەڵدایە خوارێ و دەیویست لەبەر ئەخیل هەڵێ، ئەخیل نێزەیەکی لەناو قەدی دا بەدەم دواهەناسەوە بۆڕاندی، لەتۆ وایە ئەو گایەیە کە کۆمەڵێك زەلامی گەنج بەزۆر بەرەو هیلیسی دەبەن تا لە قوربانگەکەی پۆسیدوندا بیکوژنەوە وپۆسیدون ڕازی بکەن. چونکە پۆسیدون ئەو جۆرە قوربانیەی لاپەسندە.. ئەو جەنگاوەرەش بەهەمان شێوە گیانی دەرچوو. ئەوجا ئەخیل دەست بەڕم کەوتە دووی بولودوروسی کوڕی پریام، کە دەتگوت خواوەندە. بابی نەیدەهێشت بچێتە شەڕەوە چونکە لەهەر هەموو مناڵەکانی بچووکتر و ئازیزتر بوو. لە هەموویان لەزگین تر بوو. لەو کاتەدا کە دەیویست وەکو لاوێکی بێ ئەزمون، توانای خۆی لە چەلەنگی و تیژڕەویدا بجەربێنێ، لە ڕیزی پێشەوەی جەنگاوەرەکاندا دەستی بەغاردان کرد، تا گیانی شیرینی خۆی لە دەستدا .ئەخیلی مەزن نیشانەی لێگرتەوە، نێزەیەکی لە بڕبڕەی پشتی دا ڕێك لەو شوێنەی دا کە لە ئاستی کەمەربەندەکەیدا بەئاوەزوونەی زێڕ هەردوولای زرێکەی پێکەوە گرێ دەدا، سەری ڕمەکە زرێکەی بڕی و لە ئاستی ناوکیەوە هاتەدەرێ. نالاندی و بەچۆکدا هات. بەرچاوی تاریك بوو. بەدەم کەوتنەوە ورگ و ڕیخۆڵەی لە باوەش گرت.

(٤١٩) کاتێ هیکتۆر بولودوروسی برای بینی، دەستی بەورگ و ریخۆڵەیەوە گرتووە و دەکەوێتە سەرزەوی، هەستی کرد دەمرێت. ئیدی خۆی پێنەگیرا ،بەپەلە وەکو مەشخەڵی ئاگر، بەدەم نێزە بادانەوە بەرەو ڕووی ئەخیل چوو. لێ ئەخیل هەرکە بینی زۆر خۆشحاڵ بوو و گوتی: "ئۆخەی، ئەمە ئەو پیاوەیە کە لە هەموو کەسێك پتر ئازاری ڕوحی داوم و دۆستە هەرە ئازیزەکەی کوشتووم. ئیدی ئەو زەمانە بەسەرچوو بتوانین خۆ لە یەکتر بدزینەوە."

(٤٢٨) دوای ئەو قسانە برۆکانی وێك هێنانەوە و بەپشم و غەزەبەوە ڕوانیە هیکتۆر و گوتی: "وەرە، دەی وەرە پێشێ تا زووتر لەنێو بچیت." هیکتۆری کێو ڕەخشان بەکاوەخۆ و بێباك وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی پیلیوس، بەتەما مەبە، بەگاڵەی دەم

منداڵی زارۆك بمترسێنی. چونکه منیش گەر بمەوێ دەتوانم وەکو تۆ قسەی نابەجێ بکەم و بەر جنێوانت بدەم. من دەزانم تۆ کەسێکی ئازای، زۆر لەمن ئازاتری. بەڵام ئەم شتانە هەر لە عیلمی خوادایە کێ دەزانێ، لەوەیە وێڕای بێ توانایی ،بەرمێك بتکوژم. چونکە ڕمەکەم تا ئێستا سەلماندویەتی کە ئەویش تیژ و بڕندەیە."

(٤٣٨) دوای ئەو قسەیە ڕمەکەی لە دەستیا خۆش کرد و هاویشتی. لێ ئەتینا فویەکی چکۆلەی لێکرد و لە ئەخیلی ئاسمانی نەژادی دوورخستەوە. گەڕایەوە بۆلای هیکتۆری جوامێر و لەبەر پێیدا کەوتەوە. لێ ئەخیل کە گەرم بوو بوو، بەقەستی کوشت پەلاماری داو نەعرەتەیەکی سامناکی کێشا. لێ ئەپولۆ فریاکەوت و زۆر بەئاسانی هیکتۆری، خوایانە ڕفاند و لە تەمومژێکی چڕا شاردییەوە.ئەخیلی لەزگین، سێ جار بەرمی برونزییەوە پەلاماری دا، سێ جار بێهودە پەلە تەمومژەکەی بەر ڕمان دا. بەڵام گاڤێ کە چوارەمین جار پەلاماری دا تازاری گرتی هاواری کرد گوتی: "ئەی سەگی هار، ئەمجارەش لە مەرگ دەربازبوویت. هەرچەندە مەرگ بەبناگوێتا تێپەڕی، بەڵام ئەپولۆ جارێکی دیکەش ڕزگاری کردیت. بۆیە هەر کاتێ چووی بۆ شەڕ دەبێ شوکرانەبژێری ئەپۆلۆ بی. بەڵا، من لە دیدارێکی دیکەدا، گەر خودایەك دەستم بدات، فەوت و فەنات دەکەم. بەڵام ئێستا دەکەومە سەر تەروادەییەکانی دیکە. هەر کەسێك بێتەڕێم لەت و پەتی دەکەم.

(٤٥٥) دوای ئەو قسانە پەلاماری (دروپس)ی دا، ڕمێکی بەکۆتەرەی ملیا کێشا و لەبەر پێیدا کەوت، هەر لەوێ بەدەم گیانەڵێوە بەجێی هێشت. ئەوجا بەرەنگاری دیموخوس، کوڕی فیلتور بووەوە. دیموخوس پیاوێکی باڵابەرزی زۆر ئازا بوو. ڕمێکی لە هەردووك ئەژنۆیانی دا، ئەوجا بەشمشێرەکەی کوشتی .پاشان هەڵیکوتایە سەر لاوگونوس و درادانوس، کوڕانی بیاس. لە عەرەبانەکەیانەوە خستنیە خوارەوە. یەکەمیانی بەرمێك خست و دووەمیانی لەشەڕی دەستە و یەخەدا بەشیر کوشت. ئەوسا جەزرەبەیەکی گەیاندە تروسی کوڕی ئالاستور. تروس خۆی دا بەسەر پێی ئەخیلدا، بەو ئومێدەی ئەخیل کە هاوتەمەنی وی بوو، بەزەیی پێدابێتەوە و زینهاری بدات وبەدیلی بیبات و نەیکوژێت. لێ تروس خەیاڵی خاو بوو! نەیدەزانی ئەخیل مەحاڵە گوێ بەپاڕانەوەی کەس بدات، چونکە ئەخیل بەشەرێکی میهرەبان و دڵنەرم نەبوو، بەڵکو جەنگاوەرێکی زۆر دڵڕەق و بێ بەزەیی بوو. تروس دەستی لە ئەژنۆی ئەخیل هاڵاندبوو، لێی دەپاڕایەوەو داوای ئەمانی لێدەکرد. ئەخیل شمشێرێکی بە هەناویا کرد. جەرگ و دڵی هێنایە دەرێ. خوێنێکی ڕەش

لە رمەکەیەوە فوارەی کردو ڕژایە هەمێزی. لەو کاتەدا کە گیانی دەردەچوو، تاریکی باڵی بەسەر چاوەکانیا کێشا.

(٤٧٢) ئەوجا ئەخیل تاویدایە مولیوس. ڕمێکی لەم گوێی دا لەو گوێیەوە دەرچوو. ئەوجا شمشێرێکی بەسەری ئیخیلوسی کوڕی ئەجینوردا کێشا و پیرە شمشێر خڵتانی خوێن بوو. تاریکی مەرگ باڵی بەسەر چاوانیدا کێشا. ئەوجا ئەخیل نێزەیەکی خێواندە دیوکالیون و ڕێك ئانیشکی پێکا و بازووی لەکار کەوت. مەرگی بەچاوی خۆی بینی. ئەخیل هەڵیکێشایە شمشێر و لە ملی دا ،سەری بەکێوخودەکەوە پەڕان. مۆخی مۆرەغەی پشتی بەو ناوەدا پڕژا و لە عاردی تەخت بوو. ئەوسا کەوتە دووی ڕیگموسی بێ وێنە، کوڕی پیرسی مێرخاس و خانەدان، کە لە تراسیاوە هاتبوو.. ڕمێکی لەناوقەدی دا، ڕمە لە سکی چەقی، یەکسەر لە عەرەبانەکەیەوە کەوتە خوارێ، هەروەها ئەخیل ڕمێکی ئاراستەی میرئاخورەکەشی ،ئاریتوس کرد کە خەریك بوو پێچی بەئەسپەکان دەکردەوە تا هەڵا. ڕێك لەو کاتەدا ڕمێکی بەناوقەدیا دا. یەکسەر لە عەرەبانەکەی بەربووەوە و ئەسپەکان سەرگەردان و پەشێو وترساو وبێ خاوەن لینگیان وەغارێوە نا.

(٤٩٠) وەکو چۆن، بێشەیەکی چڕ لە دۆڵێکی قوڵی کێوسانێکی وشکدا، ئاگری تێبەردەبێ و بڵێسەی دەگاتە تاقی ئاسمان و باو گێژەڵوکە ئاگرەکە بەهەموو لایەکدا دەبات، بەو ئاوایە ئەخیل نێزە بەدەست هاوڕوژا بوو و وەکو خواوەندێکی تووڕە بەهەموو لایەکدا هەر هێرشی دەبرد و پەلاماری دەدا و جەنگاوەرانی ڕاودەنا و دەیکوشتن. خوێن بەو دەشتە ڕەشەدا دەڕۆیی. وەکو چۆن جووتیارێك گاجووتانی تەوێڵ پان لەژێر نیردا دادەبەستێ و گێرەی قرشەی جۆ سپیان پێدەکات و دان و کا لەژێر پێی گایەکاندا جیا دەبێتەوە.. بەو ئاوایە ئەسپەکانی ئەخیلی ئاسمانی نەژاد ،ئەسپانی سم تیژ، جەستەی مردوان و زرێ و سپەری مەیدانی شەڕەکەیان گێرە دەکرد و عەرەبانە و تەگەری عەرەبانەکەیان لە خوێنا هەڵکشاندبوو، پرژی خوێن لەژێر سمی ئەسپەکانەوە دەچوو بەئاسمانا و دادەبارییەوە و تەگەر و بۆدی عەرەبانەکەی خوێناوی دەکرد. کوڕی (پیلیوس)ش کە بەهومێدی ئەوە بوو بگاتە سەرکەوتن و سەرفرازی جاویدانی، دەستە بەهێزەکانی خڵتانی خاك و خوێن بوون.

# سروودی بیست و یەکەم

## ئەخیل و شەڕی ڕووبار

**حیکایەتەکە:**

**ئەخیل کەوتە کوشت و بڕی تەروادەییان، قارەمان نەما بەر جەزرەبەی ڕم یان شمشێری ئەو نەکەوێ، هەموو بەرەو ڕوباری ئیکسانتوس لەبەری هەڵاتن. ئەخیل تا رەخی ڕووبارەکە ڕاوی نان، هەر بەوەوە نەوەستا، ڕمەکەی وەکو دارعەسا بەدەستەوە گرت، شمشێرەکەی لەشان کرد، سپەرەکەی بەدەستەوە گرت و ملی بەڕوبارەوە ناو لە کوشت و بڕی تەروادەییان بەردەوام بوو. ئەوە بوو کۆمەڵێك لاوی لە نزیکی ڕوبارەکەدا بینی، ئەسیری کردن و بەزندویەتی بۆلای کەشتییەکانی ڕەوانەی کردن. بەڵا لەناو ڕوبارەکەدا هەر لێیان نەبووەوە، تا ئاوی ڕوبارەکە لە خوێنی کوژراواندا سوور هەڵگەرا، هەروەها لە جەنازە و لاشەی کوژراوانی تەروادەیی پڕ بوو. خواوەندی ڕووبار لەم کردەوەیە پەست بوو. ڕێگەی براو ئاوەکەی لەبەر زۆری جەنازە و کەڵەکەبوونی لاشە پەنگایەوە. زۆری لەگەڵ ئەخیلدا هەوڵدا کە لەوەی پتر بێزاری نەکات ،لێ بێهودە بوو. هیچ چاری نەما ئەوە نەبێ لەگەڵ ئەخیلدا بەشەڕبێ و کەوتە شەپۆلدان ئەمما شەپۆلدان، بۆ ئەوەی ئەخیل ناچار بێ بەبێ وچان هەر لە هەوڵ و تەقەلادا بێ.. ئەخیل لەم کارەی خواوەند ئیکسانتۆس بێتاقەت بوو، چیوای نەمابوو لە ئاوا غەرق بێ، هانای بۆ خواوەندان برد. ئەوەبوو پوسیدون وئەتینا بەهانایەوە هاتن و بەرلەوەی ئاو ڕایماڵا ڕزگاریان کرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕوبارەکە هەر لێی نەدەبووەوە. هیرا ترسا، بۆیە خۆی لە مەسەلەکە کردە ساحێب، داوای لە هیفایستوسی کوڕی، خواوەندی ئاگر و ئاسنگەری کرد، کە بچێتە هانا و هیمدادی ئەخیل. ئەوەبوو ڕووی ئاگرەکانی کردە ڕوبارەکە .لە پێشا لە کێڵگەکانی دەوروبەر و ڕەخەکانەوە دەستی پێکرد، تەڕو هیشکی پێکڤە سوتاند، هەر بەوەندەوە نەوێستا، بەڵکو گژوگیای کەنارەکەشی سوتاند. ئەوجا**

تیرا کە بەربەرەکانی خودی ڕوبارەکەش بکات، ڕووی ئاگرەکانی تێکرد تا وشکی بکات، ڕوبارەکە هاواری لێهەستا، داوای کۆمەکی کرد. ئەوەبوو هیرا داوای لە کورەکەی کرد کە دەستبەرداری شەڕی ڕوبارەکە ببێ. چونکە ناکرێ ئەم هەموو توند و تیژییە لە ڕای بەشەڕێکی فانیدا، دژی خواوەندێك بەکاربرێ. لێ شەڕو ئاژاوە تەشەنەی کرد بۆ ناوخودی خواوەندەکانیش. چونکە سەبارەت بەشەڕ و کوشتارەکە لەسەر یەك ڕاو تەگبیر نەگیرسانەوە.. دەست پێشکەرییەکە لە خواوەندی شەڕ، (ئێریس)ەوە بوو. جنێوی بەئەتینا دا چونکە هەر بەقسە خواوەندەکانی دژی ئەو هان دابوو، لێی دا. لێ ئەتینا پێی گوتبوو کە پێی نیشاندەدات کە لەو بەتواناترە و جارێکی دی دەبێ حیساب بۆ توانا و هێزی ئەو بکات. بەردێکی گەورەی لێ هەڵگرت، تێی سرەواند، بەسەر ئەرزەکەدا خل بووەوە، ئەفرۆدێت خێرا فریاکەوت و ڕزگاری کرد. زیوس هەموو ئەو دیمەنانەی دەبینی و پێدەکەنی. ئەوجا پۆسیدۆن بەرەنگاری ئەپولۆ بووەوە و گلەیی ئەوەی لێکرد کە لایەنگری تەروادەییەکان دەکات و ئەوەی بیرچووەتەوە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لەلای گەورە و سەردارەکەیان کاریان کردووە و هەقدەستەکەی نەداونەتێ. لێ ئەپولۆ دوای ئەوەی بەپۆسیدونی گوت، پێویست بەوە ناکات لەپێناوی بەشەرانی فانیدا، کە وەکو گەڵای دار دەوەرن، بەشەڕ بێن. و خۆی لە شەڕەکە دزییەوە. خوشکەکەی یەزدانخانمی گیانلەبەرانی کێوی و ڕاووشکاران گلەیی لێدەکات. هیرا پڕی دەداتێ و (خواوەندی ڕاووشکاران) هەردوو مەچەکی دەگرێ و بایدەدات، تیر و کەوانەکەی لێ دەستێنێ، تیرەکانی پەرش و بڵاودەبنەوە. بەهەشتاو دەچێ بۆ ئۆلیمبۆس و لای بابی، لای زیوس، کە خاتری دەوێ، شکاتی لێدەکات.بەڵام (لیتو)ی دایکی هیرمیس بەگلەییەوە یەخەی دەگرێت. بەڵام لیتو وەڵام ناداتەوە، تیرەکانی کیژەکەی کۆدەکاتەوە و هەڵدێ. ئیدی هەموو خواوەندەکان بۆ ئۆلیمبوس دەگەڕێنەوە تەنیا ئەپولۆ نەبێ، کە پێی وابوو ئەخیل بەر لەکاتی خۆی شارەکە دەگرێت .بۆیە بەپەلە غاریدا بۆ ئەوێندەر و لەبەردەم ئەخیلدا وەستا تا لە خشتەی بەرێت و وا بنوێنێ کە ئەو ڕەقیبەکەیەتی، و بەکاوەخۆ لەبەری هەڵا، تا تەماحی بخاتە بەر کە دەتوانێ تاوی بداتێ و بیگاتێ .ئەخیل دەکەوێتە داوەکەوە. بەو شێوەیە لە تەروادەییەکانی دوور دەخاتەوە. ئەو تەروادەییانەی شپرزە و پەرێشان لە هەموو قوڵێکەوە بەرەو شار ڕایاندەکرد، کە پریام فەرمانی بەدەرگاوانەکان دابوو، دەرگاکان بخەنە سەر گازی پشت تا هەموو

تەروادەییەکان وە ژوور دەکەون، و ئەوجا خێرا دایان بخەنەوە تا ئەخیل و ئاخاییان نەیەنە ژوورەوە. دەرگاوانەکان فرمانی پریام لە ئەرزی نادەن.

زەمەن:

هەموو بویەرەکان لە ڕۆژی سییەمی گێڕانەوەکەدا ڕوودەدەن.

شوێن:

(ئیکسانتوس)ی خواوەند، شوێنی هەرە سەرەکی ئەم سرودە پێکدێنێ، چەند دیمەنێکی دیکەی کۆبوونەوە و ناکۆکی خواوەندانیش لە دەشتی تەروادەدا بەدی دەکرێت.

(١) کاتێ که تەروادەییان گەیینە بواری ڕوباری (ئیکسانتوس)ی بەگێژوگەرداف، زادە و بەرهەمی زیوس. ئەخیل هێزەکەیانی لێکدی دابڕی و بوون بەدوو بەشەوە. بەشێکیانی بەدەشتەکەدا، بەرەو شار ڕاونا، بەهەمان ڕێگەدا ڕاوی نان که دوێنێ کاتێ هیکتۆری مێرخاس هاروژا بوو، ئاخاییەکانی پێدا ڕاودەنا.. بەڵا پەرێشان و سەرگەردان بەهەمان ڕێگەدا هەڵدەهاتن. هیرا بەو مەبەستەی کۆسپییان بخاتە ڕێ و لە هەڵاتن دوایان بخات، تەمومژێکی چڕی هەڵکرد چاو چاوی نەدەبینی. بەشەکەی دیکەی هێزەکە، بەدەم هات و هاوار و زەناوە ملیان بەڕوباری زیو ئاسای بەگێژ و گەرداڤەوە نا. تەروادەییەکان بەدەم هەرا و زەناوە خۆیان بەڕوبارەکەدا دا. ڕوباری قوڵ پڕبوو لە هەرا وهوریا ،هاوار و فریاد لە کەنارەکانەوە بەرز دەبووەوە و لەو دەوروبەرە دەنگی دەدایەوە. تەروادەییەکان یەکتریان بانگ دەکرد، لێرەو لەوێ بەنێو گەرداڤ و شەپۆلەکاندا بەمەلە دەڕۆییشتن. وەکو چۆن پۆلە کلۆیەك لەبەر شاڵاوی ئاگرێك هەڵدێ و لەتاو سوتان خۆ بەئاودا دەدەن .بەڵا بەهەمان شێوە ڕوباری بەپێچ و دەورەی (ئیکسانتوس)ش پڕ بوو لە تەروادەییان و ئەسپ و عەرەبانەکانیان، و کەس بەکەس نەبوو و کەس خۆی لەبەر ئەخیل نەدەگرت.

(١٧) ئەخیل، ڕمەکەی بە بنەگەزێکی کەنار ڕوبارەکەوە هەڵپەسارد، بەشمشێری ڕووتەوە وەکو خواوەندێك بەنیاز و مەبەستی کوشتارێکی بێ ڕوحمانە خۆی بەڕوبارەکەدا دا. شەلم کوێرم، بەدڵی پڕکینەوە ،بەشمشێر بەربووە تەروادەییەکان.. ناڵەی قوربانیانی شمشێرەکەی ئەخیل دەگەییە بنی دنیا .ئاوی ڕوبار لە خوێنا سووربوو. وەکو چۆن ماسییان لەبەر دۆلفینێکی زەلامدا هەڵدێن و لە پەنایەك دەگەڕێن، چونکە هەر شتێکی بەر چنگ بکەوێ لووشی دەکات ،بەڵا تەروادەییەکان بەهەمان شێوە بەنێو ڕوباری خوڕدا بەرەو ڕەخەکان هەڵدەهاتن. کاتێ دەستانی ئەخیل لە کوشت و کوشتار ماندوو بوون،

(٢٧) دوانزە لاوی هەڵبژارد و بەزندوویەتی لە ڕوبارەکەی دەرهێنان .دەیویست بەکوشتنی ئەوانە تۆڵەی مەرگی پاتروکلۆسی کوڕی مینویتیوس بسەنێ. ئەو لاوانەی، کە دەتگوت کارمامزی ترساون، بردنە سەر ڕەخی ڕوبار. هەر بەپشتێنەکانی خۆیان کە لەسەر جلکە ناسك و جوانەکانیان بەستبوویان، لە پشتەوە دەستی بەستن، بەهاوڕێکانی خۆی سپاردن تا بیانبەن بۆ لای کەشتییە ناو بەتاڵەکانی. ئەوجا بەخۆی جارێکی دی بەناو ڕوبارەکە کەوتەوە و لەجاران پتر تینوی خوێن بوو.

(٣٤) ئەمجارەیان تووشی لیکاونی کوڕی پڕیامی داردانیوسی بوو، کە لە ئاوەکە

وەدەرکەوت و دەیویست هەڵێ. ئەخیل، لەوەپێش لە شەبەیخونێکدا لەپڕ بەدیلی گرتبووی و بەزۆر بردبووی. لەوکاتەدا کە لە ڕەزێکی بابیدا خەریك بوو لقی دار هەنجیرێکی کێوی دەبڕییەوە، تا چەمەرەی عەرەبانەی لێ چێبکات. لێ ئەخیلی جوامێر، میناکی ئەجەلی لە نکاو گەییە سەری و لە کەشتییەکەی خۆی نا وبەرەو لیمنوس، ئەو دورگە مکومەی برد. لەوێ بەکوڕی جاسۆنی فرۆشت. بەڵام ئیتیونی ئیمبرۆسی کە دۆستێکی میوان بوو، بەپارەیەکی زۆر کرییەوە و ئازادی کرد و بۆ ئەریسبی پیرۆزی نارد. لێ لیکاون لەوێوە بەدزییەوە هەڵهات و بۆماڵی بابی گەڕایەوە، دوای ئەوەی لە لیمنوس گەڕایەوە، یازدە ڕۆژی بەبەزم و خۆشی لەگەڵ دۆستەکانیدا بەسەربرد. بەڵام تەقدیری یەکێك لە خواوەندەکان وابوو کە لە ڕۆژی دوازدەیەمدا بۆ جاری دووەم بکەوێتەوە بەردەستی ئەخیل. قەدەر وای لە چارەنووسی بوو، بێ ویستی خۆی بەدەستی ئەخیل ڕەوانەی هادیس بکرێ. ئەخیلی ئاسمانی نەژاد و لەزگین، کاتێ ئەوی گرت ،سەیری کرد چەکی پێ نییە نە کڵوخود، نە سپەر و قەڵغان نە نێزەی پێ نییە. چونکە کاتێ کە ویستویەتی لە ڕووبارەکە بپەڕێتەوە زۆر ماندوو بووە، ئارەقەی کردۆتەوە، هێزی لەبەر براوە، ئەژنۆکانی شل بوون، و ناچار بووە چەك و ئەسلەحەکەی فڕێ بدات و لە کەنار ڕووبارەکەی بەجێ بێڵێ.

(٥٤) کاتێ ئەخیل بەو شێوەیە بینی حەپەسا، لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئاه! چ پەرجوییەك دەبینم لێرە؟! مادامێکی ئەم پیاوە، پاش ئەوەی لە دورگەی لیمنوس فرۆشرا، جارێکی دیکە بەزندویەتی پەیدا بووەوە وادیارە هەر هەموو ئەو تەروادەییە ئازایانەی من کوشتمن و هەواڵەی خانەی مردووانم کردن لەوێوە دەگەڕێنەوە و زندوو دەبنەوە. تەنانەت ئاوی مەنگی دەریاش کە گەلێك لە بەشەرانی فانی لە خۆیدا غەرق کردووە، ڕێی گەڕانەوەی لەو نەگرتووە. کەواتە با ئەمجارە بیکەم بەتێشووی نێزەکەم. تا بزانم، ئاخۆ جارێکی دیکە لەژێر زەوییەوە دێتەوە یان زەوی بۆ هەتا هەتایە گلی دەداتەوە، ئەو زەویەی کە بەهێزترین جەنگاوەرانی شاردۆتەوە!".

(٦٤) بەو جۆرە بەحەپەساوی وەستا، لیکاون، کە پڕ بەدڵ حەزیدەکرد لە مردن بخەلەسێ و بژی، لێی نزیك بووەوە، دەیویست دەستە و دامێنی بکەوێ. ئەخیلی مەزن بەقەستی کوشت نێزەکەی بەرزکردەوە. لێ لیکاون خۆی دانەواندەوە، بەپەلە ڕایکرد تا بەسەر پێیدا بکەوێ، ڕمەکە کە پشتی ڕوشاندبوو هەرچەندە تینووی خوێن بوو، لە زەوی چەقی. لیکاون بەدەستێك ئەژنۆکانی ئەخیلوسی گرت، و دەستەکەی تری خستە سەر ڕمەکەی

و نوند گرتی.ئەوجا کەوتە پاڕانەوە و لالانەوە، گوتی: "ئەی ئەخیل ڕوحمم پێدابکە و مەمکوژە. ئەی نەوەی زیوس بەزەییت پێمدا بێتەوە، من هانام بۆ تۆ هێناوە. ئاخر من نان و نمەکی تۆم کردووە. ها ڕۆژەکە لە ڕەز و باخە جوانەکەی بابمدا بەدیلی گرتمیت، لە باب و کەسوکار و دۆستانت دوور خستمەوە و لە لیمنوسی پیرۆزا فرۆشتمیت، ئەوە بوو خێر و نرخی سەد سەرگات بەبۆنەی منەوە دەستکەوت، واتە خێری نرخی سەد سەرگام بۆ دایتەوە. ئێستاش ئامادەم خۆم بەسێ چەنانەی ئەوسا بکرمەوە. ئەمڕۆ دوانزەمین ڕۆژمە، دوای سەریەشەیەکی زۆر بۆ تەروادە هاتومەتەوە. ئیدی قەدەری زاڵم وا بۆ جاری دووەم خستیمەوە بەردەستی تۆ. بێگومان بابە زیوس دەمکورهێنێ وا بۆ جاری دووەم خستیمەوە بەردەستی تۆ. دیارە دایکم لاوتوی کیژی ئەلتیسی پیر بەو مەرجە منی بووە کە تەمەنم زۆر کورت بێ، هەمان ئەو ئەلتیسەی حوکمڕانی لیجیسبییە جەنگاوەرەکانی دەکرد و لە (پیداسۆس)ی ڕەخی ڕوباری ستانیوس ئاکنجی بوو. پریام کیژەکەی ئەو و زۆر کیژی دیکەی خواست. دوو کوڕی لەو بوو، وادیارە قەدەر وای لە قەڵەم داوە تۆ هەردووکیان بکوژیت. تۆ پێشتر (پولودوروس)ی هاوتای خواوەندانت لە ڕیزی هێزی پیادەی پێشەوە بەزەبری نێزە بڕندەکەت کوشت. ئەوا منیش کەوتمە بەردەستت و چاوەڕوانی مەرگی خۆمم، پێموانیە، مادامێکی خواوەندێك خستومیە بەر دەستت لە چنگت ڕزگار بم. بەڵام قسەیەکم هەیە و پێتی دەڵێم و باوەڕم پێبکە: "من لە دایکی هیکتۆر، کە یاوەرە جوامێرەکەی کوشتویت، نیم."

(٩٧) بەو جۆرە کوڕەکەی پریامی مێرخاس لە ئەخیل پاڕایەوە، بەڵام وەڵامێکی ترسناکی گوێ لێ بوو، گوتی: "زارت لێکنێ، کەودەن!... باسی سەربەها وئەو شتانە بۆ من مەکە، تا ڕۆژی کوشتنەکەی پاتروکلۆس، حەزم نەدەکرد تەروادەییەکان بکوژم، زۆرم بەدیلی لێگرتن و لە ڕێگەی دەریاوە بەزندویەتی فرۆشتنم. لێ ئێستا هیچ یەکێك لەوانەی کە خواوەند لەبەردەم شاری ئیلیوندا دەیانخاتە بەردەستم، لە چنگم دەرباز نابن..

(١٠٤) نا، نەخێر، ڕوحم بەهیچ تەروادەییەکدا ناکەم، بەتایبەتی کوڕانی پریام.. نا برادەر تۆش دەبێ بمریت!... بۆچی بەو جۆرە دەگریت؟ دنیا بۆ پاتروکلۆس نەما کە زۆر لە تۆ گرنگتر بوو. تۆ من نابینی چتۆ پیاوێکم، چەند قۆز و باڵا بەرزم؟ من کوڕی پیاوێکی خانەدان و جوامێرم، دایکم یەزدانخانمە، لەگەڵ هەموو ئەمەشدا مەرگ و قەدەری نامیهرەبان بەسەر سەرمەوەیە. جا بێگومان، بەرەبەیانێك، ئێوارەیەك، یان نیوەڕۆیەك

جەنگاوەرێکم لێ پەیدا دەبێ، لەشەڕدا بەزەبری نێزەکەی یان تیرێك بمکوژێت و ژیانم لەبەر ببڕێت!".

(١١٤) ئەو قسانەی کرد.. دڵی لیکاون کەوتە لەرزین، لاقەکانی سست بوون دەستی لەرمەکەی ئەخیل بەردا.. ئەخیل شمشێرە برندەکەی هەڵکێشا، ڕێك دای بەنێوان شان و ملی لیکاوندا، شمشێر تا دەسکەکەی لە لیکاوندا ختم بوو، تیلاوتیل کەوتە سەر زەوی، خوێن فوارەی کرد و ئەرزەکەی داپۆشی. هەنگێ ئەخیل لە هەردووك لینگی نەوی و توڕیدایە ڕووبارەکەوە کە ئاو بیبات، ئەوجا بەدەم خۆ هەڵنانەوە گوتی: "لەوێ بنوو، لەناو ماسیاندا پاڵ داوە تا بێ هیچ ترس و پەروایەك خوێنی زامەکەت بلێسنەوە .ئیدی دایکت ناتوانێ لە تابوتت بنێ و بەدیارتەوە بگری. سکاماندۆڕۆسی پڕ گێژاو و گێژەنگان، بەرەو باوەشی بەرینی دەریا ڕاتدەماڵێت. لەوێ زۆر ماسی لەنێو شەپۆلانەوە دێن تا لە گۆشتی سپی لیکاون بخۆن.. بەڵا بەو جۆرە بمرن، هەڵێن، منیش لەدواوە تاقوبڕتان دەکەم تا دەگەینە شاری تەروادەی پیرۆز. ئەو ڕووبارە مەنگ و زیوین شەپۆلە، هەرچەند پێموایە گەلێك گوێرەکە و گاجوتانتان بۆ کردە قوربانی، زۆر ئەسپی ڕەهوان و سمتیژی زندووتان تێ هاویشت، فریاتان ناکەوێ. هەمووتان دەبێ لەناو بچن، وەکو چارەنووسی شەڕ لێتان نابمەوە تا تۆڵەی مەرگی پاتروکلۆس، و هەموو ئەو ئاخاییانەی لە پاڵ کەشتییە لەزگینەکاندا لەکاتی دوورە پەرێزی من لە مەیدانی شەڕ، کوژران، لە یەکە بەیەکەتان نەکەمەوە."

(١٣٦) دوای ئەو قسانە، ڕووبارەکە لە دڵی خۆیدا زۆر تووڕە بوو، لەبەرخۆوە کەوتە بیری ئەوەی چۆن بتوانێ ئەخیلی مەزن بەربەست بکات و تەروادەییەکان لە فەوتان ڕزگار بکات. لەو کاتەدا ئەخیل نێزە بەدەست هەڵیکوتایە سەر ئەستروبایوسی کوڕی کوڕی پیلیگۆن، کە زادەی جووتبوونی ڕووباری بەرینی ئاکسیوس و پیریبویای کیژە گەورەی ئیکیسامینوس بوو، ئەخیل هەڵیکوتایە سەری تا بیکوژێ. ئەستیروبایوس لەدەرێی ڕووبارەکە، بەخۆ ودوو ڕمەوە لە هەنبەری وەستا. ئیکسانتوس هانی دەدا .چونکە زۆر لە کوشتنی ئەو دوانزە لاوە تووڕە بوو کە ئەخیل بەوپەڕی دڵڕەقی لە ئاوی ئەودا کوشتنی. کە هەردووکیان لێکدی نزیکبوونەوە، ئەخیلی مێرخاس، لەزگین، ڕوویکردە ئەستیروبایوس، و گوتی: "تۆ کێی، لە چ تیرە و تایفەیەکی، لە کوێوە هاتووی وا بەخۆتا ڕادەپەڕموی بەگژ مندا بێیتەوە؟ واوەیلا بەحاڵی داك و بابی ئەو کەسەی دژی من دەوەستێ!". کوڕی

بیبیدوی وەڵامی دایەوە: "ئەی کوڕی جوامێری پیلیوس، بۆچی لە ڕەگ و ڕەچەڵەکم دەپرسیت؟ من لە دەڤەری ئاوا وئاوەدانی (پیونا)وە هاتووم و رابەر و سەرداری پیونیانم، ئەمڕۆ یازدە ڕۆژە هاتووم بۆ ئیلیون. من لە توخم و تۆوی ئاکسیوسم کە جوانترین ڕوباری لێ دەبێتەوە و پیلیگۆنی لێ بووە کە بەڕمبازی بەناوبانگە .جا پیلیگۆن، وەباڵ بەئەستۆی خەڵك، بابی منە. لێ واز لەمە بێنە و ئەوە عەرز و ئەوە گەز باشەڕی خۆ بکەین."

(١٦١) بەو ئاوایە کەوتە مەیدانخوازی .ئەخیل ڕمەکەی کە لە دار بناو دروست کرابوو، هەڵبری هەنگێ ئەستیروپایوس بەیەکجار هەردوو ڕمەکەی تێسرەواند. یەکێك بوو لەوانەی دەتوانن هەردوو دەستیان پێکڤە بەکاربێنن. یەکێك لە ڕمەکان قەڵغانەکەی ئەخیلی پێکا، بەڵام نەیبڕی چونکە لۆیەکی زێڕ بوو، دیاری خواوەند بوو، سەری ڕمەکەی وەستاند. لێ ڕمی دووەم باسکی ڕاستی ئەخیلی پێکا. خوێنێکی ڕەش فیچقەی کرد. لێ سەری ڕمەکە چیغی کرد، هەرچەندە تامەزرۆی گۆشتی کاڵ بوو، بەلایا ڕۆیی و لە عاردەکە چەقی. ئەخیل بەقەستی کوشت ڕمە بناوییە ڕێك و ڕاستەکەی خێواندە ئەستیروپایوس، لێ پیرە ڕم بەهەتەر چوو، لە کەنارە بەرزەکەدا گیرسایەوە و تانیوەی لە ئەرزەکە ڕۆچوو. هەنگێ کوڕی پیلیوس، شمشێرە برندەکەی هەڵکێشا، و درندە ئاسا پەلاماری دا. ئەستیروپایوس بێهودە هەوڵیدا، بەدەستە بەهێزەکانی ڕمەکە بناوییەکەی ئەخیل لە کەنارەکە دەربێنێ، سێ جاران هەوڵی دا ڕمەکە لە عاردی دەربێنێ، نەیتوانی. لە جاری چوارەمدا ویستی ڕمەکە بچەمێنێتەوە و بیشکێنێ، بەڵام ئەخیل وەکو ئەجەل گەییە سەری و بەشمشێرەکەی حەیاتی لەبەر بری. شمشێرێکی بەورگیا کرد، لەلای ناوکیەوە دایدری، ورگ و ڕیخۆڵەی کەوتە ئەرزی .بەدەم گیانەلێوە تیلاوتیل بەربووەوە و تاریکی باڵی بەسەر چاوانیا کێشا. ئەخیل هەڵیکوتایە سەری. لاقی خستە سەر سینگی. چەك و ئەسلەحەکەی لێ داماڵی. بەدەم کەش و فشەوە گوتی: "لە جێی خۆت مەبزووە شوێنەکەت باشە، هەرچەندە لە توخم و تۆوی ڕوباری، بەڵام زەحمەتە لەبەر نەوەونەژادی کوڕی کرونوسی هەرە بەتوانا بوەستی!.. تۆ بەوە دەفشیت کە لەتوخم و تۆوی ڕوباری پان بەرینی، جا منیش لە توخم و تۆوی زیوسی مەزنم. من کوڕی پیلیوسی کوڕی ئیاکۆسی فەرمانڕەوای گەلی فرە ژمارەی (مورمیدون)م جا ئەو ئیاکۆسە کوڕی زیوسە .جا وەکو چۆن زیوس لەهەر ڕوبارێکی خوڕی سەرهەڵگرتوو بەرەو دەریا، بەهێزترە. نەوەکانیشی لەهەر ڕوبارێك، ئەو ڕوبارە هەرچییەك و هەرچۆنێك بێ بەهێزترن.. ئەوەتا ڕوبارێکی گەورە لەبەردەمی

نودایە، هەوڵدە و بزانە دەتوانێ یارمەتی تۆ بدات! کەس ناتوانێ شەڕی زیوسی کوڕی کرۆنۆس بکات، یا بەگژیا بچێتەوە. جا خوای دەکرد ئەو کەسە ئەخیلوس دەبوو.. نا، نەخێر تەنانەت (ئۆقیانوس)ش بەهەموو هێز و دەسەڵاتێکیەوە.. کە هەموو ڕووبارەکان ،هەموو دەریاکان، هەموو سەرچاوە و کانیاوەکان و هەموو گۆلاوە قوڵەکان لەو دەبنەوە، ئەویش لە چەخماخەی زیوسی مەزن و هەورە تریشقەی سامناکی ئەو کە لە ئاسمانێ را دەنگ دەداتەوە، دەترسێت!"

(٢٠٠) ئەو قسانەی کرد، نێزە برونزییەکەی کە لە کەناری ڕووبارەکە چەقی بوو، دەرهێنایەوە. ئەستیروپایوسی بەمردووی لەسەر لمەکە و لەدەم ڕووبارەکە بەجێهێشت، ئاوی ڕووبارەکە بەسەریا دەڕۆیی. ماسی و مارماسی دەوریان دابوو و سەریان دەژنیە جەستەی و لەلا قەبرغەوە دەیانخوارد. ئەوجا ئەخیل دوای بایونیەکان کەوت، کە بەخۆ و عەرەبانەکانیانەوە، بەرەخی ڕووبارە بەگێژەنگەکەدا شپرزە و سەرگەردان هەڵدەهاتن، کە دیتبویان ڕابەرەکەیان کە ئازاترین جەنگاوەریان بوو ،بەهێزی بازوو و زەبری شمشێری کوڕی پیلیوس کوژرا بوو، بەجارێ شپرزە بوو بوون و نەترەیان بەردابوو. ئەوجا کەوتە کوشتنی تیرسیلوخۆس، مودون، ئەستوپولوس، نیسوس، وتراسیوس، ئینیوس، و ئوفیلیستیس. دیارە ئەخیلی لەزگین دەیتوانی ژمارەیەکی زۆرتری پایونیان بکوژێت، ئەگەر ڕووبارە قوڵ و بەگێژاوەکە زۆر تورە نەبوایە و لەشێوەی پیاوێکدا و لەژێر گێژاوێکی قوڵدا لێی نەهاتبایەتە دەنگ و پێی نەگوتبا: "ئەی ئەخیل، هەرچەندە تۆ لەهەر کەسێك بەهێزتری، بەڵام زۆریش شەڕفرۆش وشەڕەنگێزی، چونکە خواوەندان دەتپارێزن.. جا ئەگەر کوڕی کرونۆس ڕێگەی داوی تەروادەییان قڕ بکەی ،بەلای کەمەوە فڕێیان مەدە ئاوەڕۆی منەوە، بڕۆ لە دەشتی تەروادەدا خۆت بنوێنە و کوشت و بڕی خۆت بکە. ئاوە جوانەکەم پڕ بووە لە جەنازەی کوژراوان، من ناتوانم بەم هەموو جەنازەیەوە بڕژێمە ناو دەریای ڕەخشانەوە. کەچی تۆ هێشتا، بەوپەڕی ڕق و دڵڕەقییەوە هەر خەریکی کوشتاری و دەستبەردار نابی.. بەسە وازبێنە ئەی سەرداری لەشکرکێش، لەوەی پتر پەستم مەکە!"

(٢٢٢) ئەخیلی لەزگین لە وەڵامیا گوتی: "تۆ ڕاست دەکەی ئەی سکاماندرۆس، ئەی توخم و تۆوی زیوس، هەرچی دەڵێی بەسەر سەر، بەڵام من دەستبەرداری کوشتاری تەروادەییانی خۆ پەسند نابم، تا نەیانکەمەوە بەشارەکەیاندا، و ڕووبەڕووی هیکتۆر

دەبمەوە، تا بزانم ئەو من دەکوژێت یا من ئەو دەکوژم."

(٢٢٧) هەر کە ئەو قسانەی کرد وەکو خواوەندێکی ترسناك هێرشی بردە سەر تەروادەییەکان. هەنگێ ڕوبارەکە، ڕوباری بەگێژاو و گێژەنگی قوڵ، ڕویکردە ئەپولۆ و گوتی: "مەخابن، ئەی خواوەندی زیوین کەوان، ئەی کوڕی زیوس.. وا دیارە تۆ فەرمانەکانی کوڕی (کرونۆس)ت فەرامۆش کردووە، کە پێی فەرمووی پشتیوانی لە تەروادەییەکان بکە و یارمەتیان بدە تا درەنگانێکی شەو، تا ئەو کاتەی ڕۆژئاوا دەبێت و تاریکی باڵ بەسەر دەشت و دەرا دەکێشێت."

(٢٣٣) دوای ئەو قسانە، ئەخیلی ناودار بەڕمبازی، ڕابوو. لە کەنارەکەوە خۆی هەڵدایە ناوەندی شەپۆلەکان. ڕوبارەکە هەستا، شەپۆل بوو بەسێیۆێکی خوڕ. هەموو ئەو جەنازانەی کە ئەخیل کوشتبوونی کەوتبوونە بنی ڕوبارەکە، هەر هەموویانی ڕامالی و پالی دانە سەر ئەرزەکە. بەدەم ئەو کارەوە وەکو گا دەیبۆڕاند.. بەلام زندووەکانی لەژێر گێژەنگە قولەکانی خۆیدا شاردەوە و پاراستنی.. شەپۆلێکی زۆر گەورە، گەلەك بەرز، دەوری ئەخیل دا، شلپ و هوڕ سەری بەقەلغانەکەیدا دەکێشا، ئەخیل نەیتوانی خۆی لەسەر پێیان ڕابگرێ.. دەستی بەداربناوێکی بەرزی پڕ لق و پۆپی جوانەوە گرت، داربناوەکە لەڕیشەوە هەلکەنرا و کەوت و کەنارە هەلدێرەکە بەجارێ هەرەسی هێنا و داڕوخا، داربناوەکە تیلاوتیل بەهەموو لق و پۆپە چڕەکەیەوە کەوتە ناو ڕوبارەکە و وەکو جۆرە بەربەستێك بەری ڕوبارەکەی گرت .(ئەخیل)ش تەواو ترسی لێ نیشت. بەپەلە خۆی لە گێژاوی سێیۆەکە دەرباز کرد و خۆی گەیاندە دەشتەکە.

(٢٤٩) لێ خواوەندی مەزن هەر بەوەندە وازی نەهێنا. بەلکو بەشەپۆلێکی لێلی بەرزەوە دوای ئەخیل کەوت تا کۆتایی بەکارەکانی ئەم جەنگاوەرە ئاسمانی نەژادە بێنێ و تەروادەییەکان لە فەوتان و نەمان ڕزگار بکات. بەلام کوڕی پیلیوس پازێکی داو بەئەندازەی ڕمهاوێژێك لە ڕوبارەکە دوورکەوتەوە. وەکو چۆن هەلۆیەکی ڕەش کە تیژ باڵترین و بەهێزترین باڵندەی ڕاوییە، پەلامار دەدا ،(ئەخیل)ش بەو ئاوایە بەرەو پێش تاوی دەدا و زرێ برونزییەکەی بەشێوەیەکی ترسناك دەزرنگایەوە.. بەلا هەلدەهات و لە ڕوبارەکە دوور دەکەوتەوە .لێ سێیۆ و شەپۆلان لێی نەدەبوونەوە و بەهەراو هەنگامەیەکی سەیرەوە دووی کەوتبوو. وەکو چۆن کابرایەك کاتێ ئاودێری دەکات و دەیەوێ باخ و بێستانەکەی ئاو بدات و لەسەرچاوەیەکی فرە ئاوەوە بەکەنالێکدا ئاوی بۆ بێنێ.

(٢٦٢) بێلێك بەدەستەوە بگرێت و کەناڵەکە جۆماڵ بکات و هەر بەربەستێکی پێش ئاوەکە لابدات، تا بەتوندی لێشاو بێنێ و هەردارو بەردێکی لەبن دابێ، رای بماڵێت، زۆر بەخوڕ بڕوات، بەهاڕەو هاژە بەرەوخوار داگەڕێ و چاوەڕێی هیچ نەکات و تەنانەت ئاودێرەکەش کە گوایە کۆنترۆڵی دەکات بەجێبێڵێ.. بەوئاوایە لافاوی ڕوبارەکە چنگ لەسەر شان دوای ئەخیلی لەزگێن کەوت بووو دەیگەیشتێ. چونکە خواوەندان زۆر لە بەشەران بەهێزترن. هەر کاتێ ئەخیلی قۆچاغ ئاوڕی پاشەوەی دەدایەوە تا لە هەنبەر ڕوبارەکەدا بوەستێ و بزانێ کە ئاخۆ هەموو خواوەندانی سەروەرانی ئاسمانی بەرین بەدوایەوەن، شەپۆلێکی گەورە دەگەییە سەری و خۆی بەشانیا دەکێشا. ئەخیل بەترسێکی زۆرەوە هێزی دەدایە خۆ و ڕوبارە خوڕەکە،خۆی بەلاق و ئەژنۆکانیدا دەکێشا و زەوییەکەی ژێر پێی رادەماڵی.

(٢٧٢) هەنگێ کوڕی پیلیوس، بەدەنگێکی خەمناك هاواریکرد و نیگای بڕییە ئاسمانی بەرین و گوتی: "ئەی بابە زیوس، ئەرێ هیچ خواوەندێك نیە دڵی بەمن بسوتێ و لە چنگی ئەم ڕوبارە و لەم مەینەتیەم ڕزگار بکات؟. دوای ئەوە هەرچیم بەسەر دێ بابێ، من ڕازیم. ئەوەندەی گلەییم لە دایکی هەژیمە، گلەییم لە هیچ خواوەندێکی دیکە نیە. چونکە ئەو بە زمانی لوس خاپاندمی. پێی ڕاگەیاندم کە لە بناری حەساری تەروادەییانی پڕ چەکدا بەتیری وێڵی ئەپولۆ دەکوژرێم ئاە. بریا بەدەستی هیکتۆر دەکوژرام، هەر نەبێ پاڵەوانترین جەنگاوەری ناو تەروادەییەکانە. ئەوسا دەگوترا قارەمانێك قارەمانێکی هاوتای خۆی کوشتووە. کەچی ئێستا چارەنووس وای خواستووە بەم کلۆلیە بمرم، گیرۆدەی چنگی ڕوبارێکی گەورە بووم، دەڵێی بەرازەوانێکی گەنجم دەیەوێ لە جەرگەی زستاندا لە چۆمێك بپەڕێتەوە و شەپۆل و سێێو بواری نادەن و ڕایدەماڵن."

(٢٨٤) هەر کە ئەو قسانەی کرد، یەکسەر پوسیدون و ئەتینا لە شێوە و هەیئەتی دوو بەشەردا خۆیان دەیاندێ. دەستیان گرت. بەڵێنیان دایە کە ڕزگاری دەکەن. هەوەڵجار پۆسیدونی زەوی لەرزێن کەوتە قسان وگوتی: "ئەی کوڕی پیلیوس، بەو ڕادەیە مەترسە. هیچ خەمت نەبێ ئێمە، من و ئەتینا بەڕەزامەندی زیوس، لە مەڵبەندی خواوەندانەوە بۆ یارمەتی تۆ هاتووین. تۆ لە چارەت نەنووسراوە لەم ڕوبارەدا تیابچی. هەر ئێستا بەچاوی خۆت دەبینی چۆن ئاوی ڕوبارەکە دەنیشێتەوە، جا ئەگەر تۆ بەگوێمان بکەی ئێمە ئامۆژگارییەکی باشت دەکەین. دەست لەشەڕی خوێناوی هەڵمەگرە تا لەشکری

تەروادەیی لە حەسارە بەناوبانگەکەی تەروادە نەکەی.ڕەنگە هەندێکیان دەربازبن. ئەوجا هێکتۆر بکوژە و بۆلای کەشتییەکان بگەڕێوە، بزانە چۆن سەرکەوتن و سەرفرازیت پێ دەبەخشین."

(٢٩٨) دوای ئەو قسانە، هەردوکیان بۆ بارەگای نەمران گەڕانەوە. ئەخیل ڕویکردە دەشتەکە، بەڵێن و ئامۆژگاری خواوەندەکان بەتەواوەتی هێنابویانە جۆش و خرۆش. دەشتەکە یەکپارچە ئاوی سێیو و لافاو بوو، زۆر چەکی جوان و لاشەی لاوانی کوژراوی مەیدانی شەڕ، کەوتبوونە سەر ئاو. ئەخیل لەهەر شوێنێکدا ڕووبەڕووی لافاوەکە دەبووەوە پاژێکی بەرزی دەدا، ڕوباری بەرین نەیتوانی بەرهەڤی بکات، چونکە ئەتینا هێزێکی گەورەی پێ بەخشی بوو. لێ (سکاماندروس)ش ڕقی دانەدەمرکایەوە، بەڵکو زیاتر لە کوڕی پیلیوس تورە بوو. شەپۆلەکانی زۆر بەرزکردنەوە، هاواری لە سیمویس کرد: "ئەی برای ئازیز، وەرە با پێکڤە دژی ئەم کابرایە بوەستین، ئەگەر خێرا کۆنترۆڵی نەکەین، زۆری پێناچێت شارەکەی شا پریامی مەزن وێران دەکات، و تەروادەییەکان بەرگەی ناگرن. دەی خێراکە یارمەتیم بدە .ئاوەڕۆکانت پڕلە ئاوبکە، هەموو شەپۆلەکانت خڕبکەوە، شەپۆلێکی گەورە هەستێنە. دار و بەردان هەڵکەنە. بیکە بەهەرا و هەنگامەیەك ئەوسەری دیار نەبێ ،تا ئەم پیاوە دڕ و دڕندە تەبیعەتە، کە جارێ سەرکەوتووە، و لافی هاوتایی دەگەڵ خواوەندانا لێدەدات، کۆنترۆڵ بکەین.. من دەزانم نە هێز و بازووی نە جوانی و جەمالی نە سپەرو زرێ وچەك وئەسلەحە جوانەکەی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان وەبن ئاو دەکەون و قوڕ وسیان دای دەپۆشن،دادی نادات.. خۆشی لە گڵ و لمدا نوقوم دەکەم، هێندەی چەو و لم بەسەردا دەکەم کە ئاخاییەکان نەزانن کوێی بۆ بگەڕێن تا ئێسك و پروسکەکەی کۆبکەنەوە. لە قوڵاییەکی ئاوهادا دەیشارمەوە، ئەوێ دەبێ بەگۆری و وەختێ ئاخاییەکان ڕێوڕەسمی پرسەی بۆ بگێڕن پێویست بەوە نەکات گۆری بۆ دروست بکەن."

(٣٢٤) ئەو قسانەی کرد. ئەوجا کەوتە شەپۆلدان. هەر شەپۆلەی بەقەد باڵا زەلامێك. یەکپارچە کەف و خوێن و لاشە بوو، زۆر بەتوندی پەلاماری ئەخیلی دا، ئاوی ڕوبار سات لەدوای سات بەرز و بەرزتردەبووەوە، چی وای نەمابوو کوڕی پیلیوس نقوم بکات و لەناوی بەرێت، هیرا کە ترسی لێ نیشت شەپۆل ولافاو ئەخیل ڕامالێت، بەدەنگی بەرز هاواری لە ئیفایستوسی کوڕی ئازیزی کرد وگوتی: "ڕابە کوڕی خۆم، ڕابە ئەی شەلە گیان! وادیارە دەبێ بێیتە شەڕی ڕوباری ئیکسانتوس. خێرا فریامان بکەوە. تۆ ئاگرە زۆر

و زەبەبەکانت هەڵایسێنە. منیش دەچم لە دەریاوە گێژەڵوکە و زریانی ڕۆژئاوا و باشور هەڵدەکەم.
(٣٣٥) تا ئەم زریانە گڕ و بڵێسەی ئاگرەکە ئاراستەی تەروادەییەکان بکات و خۆیان وکێوخود وزرێ وسپەر وچەکەمەنیەکانیان بسوتێنێ، تۆش لە کەنارەکانی ئیکسانتوسدا، هەرچی دار و درەخت هەیە بیسوتێنە. ئاگاداربە بە بەقسەی نەرم و زمانی لوس یان بەهاشوهوشە هەڵت نەخەڵەتێنێ و دەستبەرداری کارەکەت بی، تا خۆم ئاگادارت نەکەمەوە ئاگرەکەت مەتەمرینە."
(٣٤٢) دوای ئەو قسەیە، هیفایستوس، ئاگرێکی سامناکی خودایانەی هەڵایساند. ئاگرەکە هەوەڵجار دەشتەکەی گرت. هەموو ئەو مردووە زۆر و زەبەندانەی کە ئەخیل کوشتبوونی و لەو دەشتە کەوتبوون سوتاند. دەشتەکە وشك بووەوە، ئاوی بەبریق و باقی لافاوەکە وشکی کرد. وەکو چۆن بای باکور لە پایزدا بەسەر بێستانێکی لافاوگرتوودا هەڵدەکات و لەپڕ ئاوەکە دەنیشێتەوە وخاوەنەکەی دڵخۆش دەبێت، بەو ئاوایە دەشتەکە وشك دەبووەوە و جەستەی هەموو مردوەکان سوتان و لەبەین چوون. ئەوجا هیفایستوس گڕ و بڵێسەی ئاگرەکەی کردە ڕوبارەکە. هەرچی داری بەناف وچنار وبی، و گوڵ و ڕوەکی کێوی لە قەراخی ڕوبارەکە هەبوون سوتاندنی. مارماسی و ماسی ژێر گێژاو وئاوەڕۆی مەنگی ڕوبارەکە هەبوو، کەوتنە هەلەکە سەما و شپرزە و ترسا و لەبەر ئاگرە بێ ئامانەکەی هیفایستوس هەڵدەهاتن و ملیان بەملاو بەولاوە دەنا.. ئاگر گەییە خودی ڕوبارەکەش، بۆیە ڕویکردە هیفایستوس و گوتی: "ئەی هیفایستوس، هیچ خواوەندێك ناتوانێ شەڕی تۆ بکات، منیش ناتوانم بەم ئاگرە بێ ئامانەتەوە شەڕی تۆ بکەم و دژت بوەستم.. ئەم شەڕە ڕابگرە! جا با ئەخیل هەموو تەروادەییەکان شار بەدەر بکات، بەمن چی چ پێویستم بەوەیە شەڕی ئەوان بکەم یان یارمەتیان بدەم؟!"
(٣٦١) بەدەم ئەو قسانەوە، پیرە ڕوبار دەسوتاو هەموو ئاوەڕۆ و سەرچاوەکانی هاتبوونە کوڵ و جۆش. وەکو چۆن بەزو پیووچەوری بەرازێکی قەڵەوی دابەستە لەناو مەنجەڵێك دادەنرێ و لەژێرییەوە نێڵ دەدرێ و پەیتا پەیتا چیلکە وداری ژێر دەخرێ و چەوریەکە لەناو مەنجەڵەکەدا و لە شوێنی خۆیدا قوڵپ دەدات. بەوئاوایە ئاوەڕۆ زوڵاڵەکانی پیرە دەریا دەسووتا و ئاوەکەی قوڵە قوڵ دەکوڵا.. ئیدی ڕوبارەکە لە پەلوپۆ کەوت. نەیدەتوانی بستێك بچێتە پێشێ. لەجێی خۆی وەستا .چونکە شالاوی گڕەکەی هیفایستوس بڕستی لی بڕی بوو.

هەنگێ بەپەلە ڕوویکردە هیرا و کەوتە نوێژ و نزا. لێی پاڕایەوە وگوتی: "ئەی هیرا، بۆچی لەنێو هەموو خواوەندەکاندا هەرکوڕەکەی تۆ ڕووی ڕقی ئاگرەکانی خۆی کردۆتە من. منێ کە لە هەموو خواوەندەکانی دیکەی پشتیوانی تەروادەییان بێ گوناح ترم؟

(٣٧١) بەهەرحاڵ ئەگەر تۆ ئەمر بفەرمووی، من دەستبەردار دەبم. بەمەرجێ دەبێ (هیفایستوس)ش وازبێنێ و دەستبەرداربێ. جا هەنگێ من سوێندت بۆ دەخۆم کە جارێکی دی نەچمە هیمدادی تەروادەییەکان. تەنانەت ئەگەر لەلایەن جەنگاوەرانی ئاخاییەوە بێتە سوتاندیش."

(٣٧٧) گاڤێ هیرای بازوو چەرمگ گوێی لەو نزا و پاڕانەوەیە بوو، یەکسەر ڕویکردە کوڕە ئازیزەکەی، هیفایستوس، گوتی: "هیفایستوس، نهو ئاگرەکەت ڕاگرە. پێویست ناکا لە پێناوی بەشەرانی فانیدا بەو شێوەیە بچین بەگژ خواوەندێکی نەمردا."

(٣٨١) کە هیرا ئەو قسەیەی کرد، هیفایستوس دەست بەجێ گڕ و بڵێسەی ئاگرەکەی کوژاندەوە، سێی ڕووی ڕوبارەکە نیشتەوە و هێدی ئارام گەڕایەوە دۆخی جارانی.

(٣٨٣) هەڵچوون و تووڕەیی ئیکسانتوس داکوژا، ئیکسانتوس و هیفایستوس، هەردووکیان دەستیان لەشەڕ هەڵگرت. چونکە هیرا، وێڕای ئەوەی هێشتا هەر تووڕە بوو ،شەڕەکەی پێ ڕاگرتن. بەڵام شەڕ و کێشەیەکی توند لەنێوان خواوەندەکانی دیکەدا هەڵگیرسا .چونکە لە کۆبوونەوەدا نەگەیینە یەك، ئیدی دژی یەکتر وەسان و لێیان بوو بەدەنگە دەنگ و هەرایەکی گەورە. ئەرز و ئاسمانیان وەزاڵە هێنابوو.. زیوس کە لە ترۆپکی ئولیمبۆس ڕۆنیشتبوو گوێی لە هەرا و زەنایان بوو، کە دیتی خواوەندان خەریکە تێك بەردەبن، لە کەیفان پڕ بەدڵ پێکەنی.. ئیدی خواوەندەکان نەیانتوانی بەسەر خۆیاندا زاڵ بن، ئێریسی قەڵغان شکێن بەر لە هەمووان دەستی بەشەڕ کرد، نێزە ئاسنینەکەی هەڵگرت و بەرەو ئەتینا غاریدا و بەدەم جنێو و قسەی زبرەوە پێی گوت: "ئەی مێشە سەگانەی لاسار، ئەی مایە فیتنەی بێ باك، ئەی خۆپەرست بۆچی بۆ کەیفی دڵی خۆت خواوەندەکان بەشەڕ دەدەیت؟ لە بیرت چووەوە چۆن دیومیدسی کوڕی (تودیوس)ت لێ هاندام کە بریندارم بکات؟ تۆ بەخۆت، بەبەرچاوی هەمووانەوە نێزەیەکی درەخشانت هەڵگرت و ڕێك ئاراستەی منت کرد، جەستەی ناسکت بریندار کردم. پێموایە ئەمڕۆ سزا و باجی ئەو کردەوە کرێتانەی خۆت بەزیادەوە دەبێ بدەیت!"

(٤٠٠) ئەوەی گوت و یەکێکی بەسپەرە بەگێز وگوڵینگەکەی ئەتینادا کێشا.. ئەو سپەرەی

کە چەخماخەی (زیوس)ش نەیدەتوانی بیبڕێت. ئێریسی خواوەندی خوێن و مەرگ، ڕمە درێژەکەی کێشا بەو سپەرەدا، ئەتینا کشایە دواوە، بەدەستە بەهێزەکانی گا بەردێکی ڕەش، ناهەموار و زبری لە دەشتەکە هەڵگرت، کە پێشینان بۆ نیشانەکردنی ئاقاری کێڵگەیان دانابوو. کێشای بەملی ئێریسدا، لە پەلوپۆی خست. کەوتە سەر زەوی و بەدرێژایی حەوت فەرسەخان غل بووەوە قژەکەی خۆڵاوی بوو .دەنگ و دەنگدانەوەی زرێکەی بەری دنیای پڕکرد.

(٤٠٨) هەنگێ ئەتینا پڕ بەزار پێکەنی، بەکەش و فشەوە گوتی: "کەودەن، چما تا ئێستا نازانی من لە تۆ بەهێزترم، وا هێزی خۆت بەمن تاقی دەکەیەوە؟ خۆت بۆ پشم و غەزەبی دایکت ئامادە بکە، زۆرت لێ قەڵسە .چونکە تۆ پشتت کردۆتە ئاخاییان و یارمەتی تەروادەییانی خۆپەسند دەدەیت."

(٤١٥) دوای ئەو قسانە، چاوە تیژەکانی لە ئێریس گواستەوە، ئەفرۆدێتی کیژی زیوس، دەستی ئێریسی گرت کە لە پەستاو بێ پسانەوە دەینااڵند، دەیویست لەو ناوەی دووربخاتەوە، زۆر بەزەحمەت هەناسەی هاتەوە بەر. لێ هەر کە یەزدانخانم هیرا، هیرای باسک سپی بینی ڕویکردە هیرا و بەڕاشکاوی پێی گوت: "ئاە، ئەی کیژی زیوسی سپەروان، بڕوانە ئەم مێشە سەگانەیە واجارێکی دی ئێریس، ئێریسی بەڵای گیانی بەشەرانی فانی، لە مەیدانی ئەم شەڕ و قەوغایە دوور دەخاتەوە، خێرا هەرە دوای بکەوە."

(٤٢٤) هەرکە هیرا ئەو قسانەی کرد، ئەتینا بەخۆشحاڵیەوە شوێنی ئەفرۆدێت کەوت. خۆی گەیاندێ و بەدەستە بەهێزەکانی یەکێکی کێشا بەسەر سینگیدا. ئەژنۆکانی سست بوون .دڵی خاو بووەوە وهەردوکیان، ئەفرۆدێت و ئێریس کەوتنە سەر زەوی. هەنگێ ئەتینا بەکەش و فشەوە ڕووی تێکردن وگوتی: "ئەگەر هەموو ئەوانەی یارمەتی تەروادەییەکان دەدەن و دژی ئارگۆسیانی شەڕڤان دەوەستن، وەکو ئافرۆدێت بەهێز و ئازابان، وەختێ بەرانبەر بەهێزی من پڕکێشی کرد، هاتبا کۆمەکی ئێریس، دەمێ بوو ئەم شەڕەمان بڕانبووەوە و شارە قایم و ئاواو و ئاوەدانەکەی تەروادەمان گرتبوو."

(٤٣٤) هیرای باسك چەرموو، کە گوێی لەو قسانە بوو پێکەنی. لێ شا پوسیدونی زەوی لەرزێن، ڕووی کردە ئەپولۆ وگوتی: "ئەی فویبوس، تاکەی لێکدی دووربین، بۆ نەکەوینە وێزەی یەکدی؟ ئەمە کارێکی باش نیە، چونکە خواوەندەکانی دی دەستیان بەشەڕی یەکتر کردووە. ئاخر جوان نیە من و تۆ بەبێ شەڕ بگەڕێینەوە بۆ ئولیمبۆس. بۆ ماڵە

ئاسنادە برونزیەکەی زیوس ،جا مادامێکی تۆ بچووکتری، تۆ دەست پێبکە. نابێ من دەست پێبکەم. چونکە لە تۆ گەورەترم ئەزموونم زیاترە.. کەللەپوت، لەبیرت چووەوە کە لەنێو خواوەندەکاندا تەنیا من و تۆ بەئەمری زیوس چووین بۆ تەروادە و چ دەرد و مەینەتیەکمان چەشت؟ کاتێ بەفرمانی زیوس چووین بۆ ئەوێندەر، بۆ ماوەی ساڵێکی ڕەبەق لە هەنبەر هەقدەستێکی دیاریکراو خزمەتی شا (لاومیدون)مان کرد، ئەو سەرکار و فەرماندار بوو، و بەکەیفی خۆی ئەمری پێدەکردین. ئەوەبوو حەسارێکی پانی زۆر جوانم لە دەوری شارەکەیان کێشا، تا ببێ بەقەڵا و شارەکەیان بپارێزێ.. تۆش ئەی فویبوس، گاوگۆتاڵە لەڕو لاواز و پەیزەنەکانیانت لە بنار ودۆڵە بژوێن و زەمەندەکانی ئیدادا دەلەوەراند.

(٤٤٩) کە کەوتینە شێنەیی، ماوەی کارەکەمان تەواو بوو. وەختی ئەوە هات لاومیدون هەقەکەمان وێدا ،نەك هەرهیچی نەداینێ، بەڵکو هەموو هەقدەستەکەی بەبارەبار خواردین، دەریکردین و هەڕەشەی لێکردین کە دەست و پێمان دەبەستێ و لە دورگەیەکی دورە دەست دەمانفرۆشێت. سوێندی لێخواردین گوێی هەردووکمان بەشمشێرە برونزیەکەی دەبڕێت، ئەوەبوو هەردووکمان بەتوڕەیی، بێ ئەوەی هەقدەستەکەمان بداتێ گەڕاینەوە! کەچی تۆ وێڕای ئەو هەموو نەهەقی و زوڵمەی لێی کردین، ئەمڕۆکە یارمەتی قەوم و دەستە وبەستەکەی ئەو دەدەیت و یارمەتی ئێمە نادەیت کە ئەو تەروادەییە خۆپەسەندانە بەخۆ وماڵ ومنداڵ و ژنیانەوە بێنینە سەر چۆکان و لەناویان بەرین."

(٤٦٢) ئەپولۆی دوور ئەنگێوە بەرسڤی دایەوە: "ئەی خێوی بومەلەرزان، ئەگەر من لە پێناوی خێڵی بەشەرانی فانیدا شەڕی تۆ بکەم هەقی خۆتە سەرزەنیشتم بکەی و بەگەوج و بێ ئاوەزم بزانی، ئەو بەشەرانەی کە وەکو گەڵای دار ودرەختان، کاتێ چەکەرە دەکەن و دەروێن و لە شیلەی زەوی دەخۆن گەش و تەڕ و تازەن، پاشان سیس دەبن و دەژاکێن و دەوەرێن و دەمرن و دەبڕێنەوە، کەواتە تا زووە بادەستبەرداری دووبەرەکی و کێشە ببین و واز لە بەشەران بێنین شەڕی خۆیان بکەن!"

(٤٦٨) ئەو قسانەی کرد و ڕووی وەرگێڕا و ڕۆیی. پێی شەرم بوو شەڕی برایەکی بابی بکات. بەڵام ئەرتەمیسی خوشکی، شابانۆی جەنگەڵان وهۆڤی ودرندان، زۆر بەتوندی و توڕەیی کەوتە جنێودان و سەرزەنشتی وگوتی: "بەڕاستی شەمە بۆ تۆ، ئەی خواوەندی دوور ئەنگێوە! هەڵدێی. مەیدان لەبەر پوسیدون چۆڵ دەکەی. بەخوت وخۆڕایی سەرکەوتنی

بەسیپ دەکەی؟!.. هەی بێ ئاوەز! منداڵ، ئەدی بۆچی ئەوکەوانەت بەبێهودە هەڵگرتووە؟ نەخەڵەتابی، جارەکی دی لەبەرچاوی مندا، لە کۆشکەکەی بابمدا، لەناو خواوەنداندا، وەکو جاران بەخۆ بنازی و بلێی ڕووبەڕوو شەڕی (پوسیدون)ت کردووە!

(٤٧٨) ئەپولۆی دوور ئەنگێوە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە. لێ ژنە هێژاکەی زیوس زۆر تورە بوو. زۆر بەتوندی کەوتە سەرزەنشتی ئەرتەمیسی تیرئەنداز و بەدەم قسەی ساردوسرەوە گوتی: "ئەی دێڵە سەگی بێ چاو ڕوو، چۆن زات دەکەی بەم ئاوایە دژی من بوەستی؟.. من ئەو دژمنە نەرمە قوتە نیم کە بەو ئاسانییە بتوانی ڕووبەڕووی ببیتەوە. هەرچەندە کەوانداربی، هەرچەندە زیوس تۆی کردۆتە دێڵە شێر و بەریداویتە ژنان وڕێی داوی بەکەیفی خۆت کیهەیانت بوێ بیکوژیت.. جا باشتر وایە تۆ ئەم کارە لە کۆساراندا بکەی و گیانلەبەرانی درندە و هۆڤی و بزنە کێویان بەتیر و کەوانەکەت بکوژیت، نەك پەلاماری خەڵکانی لە خۆت بەتواناتر و بەهێزتر بدەی.. خۆ ئەگەر هەر سووری لەسەر شەڕ و دەتەوێ خۆت تاقی بکەیەوە، ئەوا بێگومان پەشیمان دەبیتەوە و چەند بەهێزبی من لەتۆ بەهێزترم."

(٤٨٩) هیرا دوای ئەو قسانە، بەدەستی چەپی هەردوو مەچەکی ئەرتەمیسی گرت .بەدەستی ڕاست کەوانەکەی لەشانی داگرت، بەدەم تەوس و پێکەنینەوە ،بەکەوانەکەی خۆی بەربووە سەر و گوێلاکی. ئەویش (ئەرتەمیس) خۆی لە دەستی ڕادەپسکان و خۆی لەبەر جەزرەبەکانی لادەدا، هەموو تیرەکانی ناو تیردانەکەی کەوتن و بەسەر ئەرزەکەدا پەرش و بڵاوبوونەوە. ئەرتەمیس بەدەم گریان و زاریەوە وەکو کۆتریێکی ترساو چۆن فرسەت دێنێ و لەبەر واشەیەك هەڵدێ تا خۆی بگەیەنێتە هێلانەکەی، لە کونە تاوێرێکدا، لە شکەفیتێکدا، خۆی دەرباز بکات.. (ئەرتەمیس)ش بەدەم گریانەوە تا هێزی تێدا بوو پێی وەغارێوەنا،کەوان و تیرەکانی لەوێندەر بەجێهێشت.

(٤٩٧) هەنگێ هێرمیس، بکوژی ئارگۆسیان، ڕویکردە دایکی ئەرتەمیس، واتە لیتۆ و گوتی: "لیتۆ، من شەڕی تۆ ناکەم، چونکە شەڕی هاوسەرانی زیوسی هەورەوان، کارێکی گەلەك خەتەرناکە.. ئەگەر پێت خۆشە هەرە لەنێو دەستەوبەستەی خودایاندا لاف لێ بدە کە بەسەر مندا سەرکەوتووی.

(٥٠٢) دوای ئەو قسانە، لیتۆ کەوان و تیرەکانی لەناو تەپوتۆزدا خڕکردنەوە. بەپەلە شوێن کیژەکەی کەوت. بەڵێ ئەرتەمیس خۆی گەیاندە ئولیمبۆس و چوو بۆ ماڵە برونزینەکەی زیوس، بەدەم فرمێسك ڕشتنەوە لە باوەشی بابی دانیشت.جلە عەنبەرینەکەی لەبەریا

دەلەرزی. بابی، کوڕەکەی کرونۆس، بۆلای خۆی ڕایکێشا و بەدەم بزەوەو بەمیهرەبانی لێی پرسی: "کیژی ئازیزم، کام خواوەندی ئاسمانی بەو جۆرە و بەناهەق ڕەنجاندوتی و ئازاری داوی، وەك ئەوەی تاوانێکی گەورەت بەبەرچاوی هەموو خەڵکیەوە کردبێ؟ هەنگێ، ئەرتەمیسی ڕاوچی، کە تاجێکی پرشنگداری بەسەرەوە بوو لە وەڵامیا گوتی: "بابۆ، هاوسەرەکەی تۆ.. هیرای باسك چەرموو لێیدام، هەر ئەویشە ئاژاوە و کێشە دەخاتە نێو خواوەندانەوە و دەیاندات بەگژ یەکدا."

(٥١٤) بەو جۆرە قسەیان بۆ یەکدی کرد. لەو کاتەدا ئەپولۆ خۆی بەتەروادەی پیرۆزدا کردبوو، لەوە ترسابوو کە داناییەکان پەلە بکەن و بەپێچەوانەی ئەو قەدەرەوە کە بۆ تەروادە دانرابوو، هەر ئەو ڕۆژە شورە و حەساری ئەو شارە مکومە وێران بکەن.. خواوەندەکانی دیکە چوونەوە بۆ ئۆلیمبۆس، هەندێکیان تورە و هەندێکیان شادمان لەلای بابیان، پاشا و خێوی هەوران ڕۆنیشتن.. بەڵام ئەخیل هێشتا شەلم کوێرم ،کەس نابوێرێم کەوتبووە گیان تەروادەییەکان و ئەسپەرەهوان و ڕەخشانەکانیان. وەکو چۆن شارێك ئاگری تێبەر دەبێ و دووکەڵی دەگاتە تاقی ئاسمانی بەرین و خواوەندان تورە دەبن و جڵە و بۆ ئاگرەکە شل دەکەن، و ئاگر زیاتر بڵێسە دەسەنێ و خەڵکانێکی زۆر ماڵوێران و تازیەبار دەکات.. (ئەخیل)ش بەهەمان شێوە تەروادەییەکانی ماڵوێران و ماتەمبار دەکرد!

(٥٢٦) پریامی پیر لەسەر حەسار و بورجە پیرۆزەکە وەستابوو. سەیری کرد ئەخیلی درندە هێرش دێنێ ئەمما هێرش، تەروادەییەکان شپرزە و سەرگەردان و بێ سەر و بەر، لەبەری هەڵدێن و بەجارێ نەترەیان بەرداوە. پریام بەدەم کەسەر وداخێکی فرەوە لەسەر بورجەکە هاتەخوارێ، بانگی لە پاسەوانانی ناودار ودلێری دەروازەکان، کە بەدرێژایی حەسارەکە ڕیزیان بەستبوو، کرد: "بەدەستی خۆتان دەروازەکان بخەنە سەر پشت، با هێزە شکاو وهەڵاتوەکەمان بێتە ناو شارەوە. چونکە ئەخیل زۆر لێیان نزیکە. چنگ لەسەر شان ڕاویان دەنێت و شپرزەی کردوون، هاکا بیانگاتێ و لەنێویان بەرێ، چ حەیاچوونێکە! بەڵام وەختێ هێزەکەمان گەییەوە ناو شار و ئاهێکیان وەبەرهاتەوە، هەنگێ دەروازەکان جوان دابخەنەوە، چونکە دەترسم ئەم پیاوە سەر شێت و بەڵایە خۆی بەشاردا بکات!"

(٥٣٧) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، پاسەوانەکان خێرا دەروازەکانیان خستە سەر گازی پشت. بەکردنەوەی دەروازەکان ئومێدێکیان پەیدا کرد. لەگەڵ ئەمەشدا ئەپولۆ خێرا

جووە پێشوازیان تا لە فەوتان ڕزگاریان بکات. لێ تەروادەییەکان، لە دەشتەکەوە، ئینو وتیفەڕۆ، سەروپۆڕ تەپوتۆزاوی بەهەڵەداوان، ڕاستە و ڕاست بەرەو شار و بورجە بەرزەکەی شار هەڵدەهاتن. (ئەخیل)ش نێزە بەدەست، لێوان لێو لە کەرب و کین، دوایان کەوتبوو. پشم و غەزەبێکی تۆفان ئاسا لە دڵی هەستا بوو وبەخەیاڵی سەرکەوتن و سەرفرازی و شکۆ بوو.

(٥٤٤) لەم کاتەدا کورانی ئاخایی دەیانتوانی دەست بەسەر تەروادەی دەروازە بەرزدا بگرن، ئەگەر ئەپولۆ فریا نەکەوتبا و ئەجینوری جوامێر، کوڕی ئەنتینور، ئەو جەنگاوەرە نەبەز و بێ وێنەیەی هان نەدابا کە ورەی بەرز بێ و بەرگری بکات. ئەپولۆ ورەی ئەوی بەرزکردەوە و بەخۆیشی لەلایەوە وەستا، تا لە چنگی کوشندەی مەرگی بپارێزێ. پشتی بەدار بەڕوویەکەوە دا خۆی لە پەڵە هەورێکی توندەوە پێچا. ئەجینور، وەختێ ئەخیلی وێرانکەری شارانی بینی، لەجێی خۆی وەستا، دڵەڕاوکێیەکی زۆری پێکەوت، لە دڵی خۆیدا بیری لە هەزار و یەك ئاکامی خراپ کردەوە کە چاوەڕوانی بوون. نائومێد و پەرێشانبیر، کەوتە دواندنی ڕوحی مەزن و بوێری خۆی: "واوەیلا بەحاڵم! ئەگەر منیش وەکو ئەوانی دی، لەبەر ئەخیلی جوامێر، بەترس و لەرزەوە هەڵێم، ئەوا دەمگرێت و بەزەبونی و زەلیلی و کەساسی دەمکوژێت!.چۆنە هەقم بەسەر ئەوانەوە نەبێ کە ئەخیل دوایان کەوتووە، من لە پەنا حەسارەکەوە بەرەو شوێنێکی دی هەڵێم، بەرەو دەشتی ئیلیون.

(٥٥٨) تا دەگەمە دۆڵ و زەندۆڵانی ئیداو، لەوێ خۆم بەبێشەیەکی چڕە دارستاندا دەکەم؟.. کە ئێوارە داهات خۆم لە ڕوباردا دەشۆم و ئەو تەپوتۆز و ئارەقەیە لەخۆ دەکەمەوە، ئەوجا بۆ تەروادە دەگەڕێمەوە.بەڵام بۆچی بەم شێوەیە خۆم دەدوێنم؟ لەوەیە کاتێ کە پشت لەشار ڕوودەکەمە دەشت، بمدینێ، هەنگێ دوام دەکەوێ ،دەمگرێت و لە چنگی دەرباز نابم. چونکە لە هەموو بەشەران بەهێزترە. ئەدی چۆنە لەبەردەم شاردا ڕووبەڕووی ببمەوە ؟ خۆ بەدەنی پۆڵا نیە، برونزی تیژ دەیبڕێ، ئەویش هەر یەك گیانی هەیە .بەشەرێکی فانیە و هیچی دی،با هەر زیوس، (کوڕی کرنوس)ش پشتو پشتیوانی بێ."

(٥٧١) هەر کە ئەو قسانەی کرد ،خۆی ئامادەکرد تا ڕووبەڕووی ئەخیل ببێتەوە. بەدڵ و بەگیان، بێ ترس و دوودڵی ،لەبیری ئەوەدا بوو بەگژ ئەخیلدا بچێتەوە. وەکو چۆن دێڵە پڵنگێك لە بێشە دێتە دەر، ڕووبەڕووی ڕاوچییەك دەبێتەوە، بێ ترس و بێ پەروا، لە گەفی سەگان ناپرینگێتەوە، تەنانەت ئەگەر شکارچیەکە تەردەستی بکات، بەتیر یان

بەرەو بڕینداری بکات، بەو حاڵەشەوە دەستبەردار نابێ، ناگەڕێتەوەو پەلاماری خۆی دەدات و تا نەکوژرێ وازناهێنێ.. بەو ئاوایە ئەجینوری گەڕناس، کوڕی ئەنتینور، لێبڕا کە هەڵنەیەت و ڕووبەڕووی ئەخیل ببێتەوە. سپەرەکەی لەبەردەم خۆی گرت، ڕووی نێزەکەی کردە ئەخیل و بەدەنگی بەرز تێی خوڕی: "ئەی ئەخیلی ناودار و جوامێر، بێگومان لە کانگەی دڵەوە بەتەمای ئەمڕۆکە شاری سەربەرزی تەروادەییانی جەنگاوەر وێران بکەی.. خەیاڵت خاوە، ئەمەت بەو ئاسانیە بۆ ناچێتە سەر، چونکە شار پڕە لە ئێمەمانان، لە خەڵکانی گەڕنۆس ودلێر، هەموو لەبەردەم داك و بابانی ئازیز، و ژن و منداڵەکانمان دەوەستین و بەرگری لە ئیلیون دەکەین. جا چەند جەنگاوەرێکی چەلەنگ و چالاك وبەهێز وبێباك بی، ئێرە دەکەین بەگۆڕت."

(٥٩٠) ئەو قسانەی کرد و بەدەستە بەهێزەکەی ڕمە تیژەکەی تێ سرەواند. ڕمەکە لەژێر ئەژنۆوە بەر لاقبەندەکەی ئەخیل کەوت. لێ سەرە نێزەکە نەك هەر لاقبەندە مسە تازە دروستکراوەکەی نەبڕی، بەڵکو هەڵگەڕایەوە و دەنگێکی ترسناك لە لاقبەندەکەوە هەستا. بەهەرحاڵ دیاری خواوەندەونایەتە بڕین.. ئەوجا نۆرە هاتە سەر ئەخیلی کوڕی پیلیوس و پەلاماری ئەجینوری خواوەند ئاسای دا.. بەڵام ئەپولۆ فریا کەوت، نەیهێشت ئەخیل بەئاوات بگات و ئەجینور بکوژێت.

(٥٩٦) ئەجینوری ڕفاند، لە پەڵە هەورێکی توندییەوە پێچاو. بەئارامی لە شەڕگەکەی دوورخستەوە. ئەوجا بەفێڵ و فەند کوڕەکەی پیلیوسی لە لەشکری تەروادەییەکان دوورخستەوە. خۆی خستە پێستی ئەجینورەوە، بەموو لەو جیاواز نەبوو، هەنگێ خواوەندی دوورئەنگێوە، بەو شێوەوتەرحە ڕاوەستا، ئەخیل بەهەشتاو هێرشی بۆ برد. لەکاتێکا ئەخیل بەگەنمەجاری دەشتەکەدا ڕاوی دەنا، ئەو بەرەو ڕوباری قوڵی پڕ گێژاو و گێژەنگی سکاماندروس پێچی کردەوە. ئەپولۆ پێی هەڵگرت، بەڵام پێ هەڵگرتنێکی کەم، چونکە دەیویست ئەخیل بخەڵەتێنێ و ئومێدی ئەوەی بخاتە دڵ کە ئەگەر یەك تۆزێ پێ هەڵگرێ دەیگاتێ. لەو کاتەدا تەروادەییەکان، تێکشکاو وهەڵاتوو، بەکۆمەڵ خۆیان بەناوجەرگەی شاردا دەکرد و زۆر خۆشحاڵ بوون کە توانی بوویان ڕزگار بن. شار پڕبوو لە ئاپۆرەی جەنگاوەران. کەس زاتی نەکردبوو لە دەرێی شار و حەسارەکە هەڵوەستەیەك بکات و تەمەشایەك بکات بزانێ کێ هەڵاتووە وکێ لە جەرگەی شەڕدا کوژراوە.. کوڕ ئەو کوڕە بوو خۆی بگەیەنێتەوە ناو شار.

# سروودی بیست و دووەم

## کوژرانی هیکتۆر

**حیکایەتەکە:**

**ئەخیل هەر ئەپولۆی ڕاودەنا، ئەپولۆ دەیویست ئەخیل لە دەروازەکانی شار (تەروادە) دووربخاتەوە، تا لەپڕ ئەپولۆ وەستا، خۆی ئاشکرا کرد کە خواوەندە وئەخیل نەدەتوانێ بەسەریا زاڵ بێ و نەدەتوانێ بیگاتێ. ئەخیل دوای ئەو هەموو ڕاکەراك وماندووبوونە دووچاری نائومێدی بوو. ئیدی ئەتینا بەلەز خۆی پێ دەگەیەنێ و شوێنەکەی هیکتۆری پێ دەڵێت. دنەی دەدات، ورەی بەرز دەکاتەوە، هێز وەبەر بەدەن و لاقی دەخات. لەم کاتەدا پریام لەسەر حەسارەوە دەڕوانێ، داوا لە هیکتۆر دەکات وەژوور بکەوێ و ببێ بەرابەر و پارێزەری گەلەکەی، هەم خۆی بپارێزێ وهەم گەلەکەی. هەوڵدەدا قەناعەتی پێبکات کە لەگەڵ ئاخاییاندا سەودا بکات. هیلین ونیوەی گەنج و سامانی تەروادەیان بداتێ و بەمە ئەم شەڕە شوومە دەبڕێتەوە. لێ هیکتۆر قاییل نابێ بچێتە ژوورەوە، هەستدەکات ئەگەر وەژوور بکەوێ عەیبدار دەبێ و دەبێ بەگەپجاری قارەمانان و جەنگاوەرانی تەروادە. ئەوجا مەسەلەکە لە هەموو ڕوویەکەوە هەڵدەسەنگێنێ، دەگاتە ئەو قەناعەتەی کە ئاخاییەکان بەنیوەی گەنج و سامانی تەروادە ڕازی نابن و مکوڕن لەسەر وێرانکردن و گرتن و تالانکردنی تەواوەتی شار.. تا ئەمانەی لە هزری خۆدا تاوتوێ کرد، ئەخیل گەییە نزیکی. ئەوجا پرسیاری ئەوە لە خۆ دەکات کە ڕووبەڕووی ئەخیل ببێتەوە یان لەبەری هەڵبێ؟ کە بینی ئەخیل زۆر لێوەی نزیکە، بڕیاری دا لەبەری هەڵبێ، بەدەوری حەسارەکەدا پێ وەغارێوە دەنا و ئەخیل بەدوویدا. جووتە پاڵەوان لە یەکبینە و بێ ماندووبوون سێ جاران بەدەوری حەساردا دەسوڕێنەوە، لەتۆ وایە خواوەندان هێزیان وەبەرناون.. ئەخیل خەریکەبێ لەم گەمەیە وەڕز دەبێ، لێ ئەتینا لێی دێتە پێشێ و پێی دەڵێت دەچێت بۆلای هیکتۆر، قەناعەتی پێ دەکات لەڕووی**

بوەستێ.. ئەتینا لەڕووی زیۆسی بابی دەوەستێ، کە بەزەیی بەهیکتۆردا دێتەوە و دەخوازێ ڕزگاری بکات. بەڵا لەڕووی دەوەستێ و پێی دەڵێت ڕۆژی تەواو بووە ودەبێ بەچارەنووسی خۆی بگات و ناشێت سەروەری خواوەندان دژی قەدەر بوەستێ.هەروەها (ئەپولۆ)ش دەیەوێ هیکتۆر ڕزگار بکات. بەڵام بەرلەوەی بچێتە هیمدادی، زیوس تەرازووی قەدەر بەدەستەوە دەگرێت، هیکتۆر دەخاتە تایەکیەوە و ئەخیل دەخاتە تایەکەی دیکەوە، تایەکەی هیکتۆر بەرەو هادیس، خانەی مردووان دادەکشێت، ئیدی ئەپولۆ دەستبەردار دەبێت. ئەوسا ئەتینا دەچێتە پێستی (دیفوبوس)ی برای هیکتۆرەوە و دەچێت بۆلای و بەدەنگی ئەو قسانی دەگەڵ دەکات، پێی دەڵێت کۆمەڵێك ڕمی پێیە، هەر جارێ ڕمێکی هاویشتە ئەخیل ،ئەم ڕمێکی دی دەداتێ، بەو جۆرە بۆ شەڕی هان دەدا لەجێی خۆی دەوەستێ. ئەخیل ڕمێکی تێ دەسرەوێنێ، خۆی لادەبات. ئەم ڕمێك داوێتە ئەخیل و دەیپێکێ. بەڵام کار لە سپەرە عەجیبەکەی ناکات، داوا لە دیفوبوس دەکات ڕمێکی بداتێ، بەڵام براکەی لەوێ نابینێ. ئیدی دەزانێ ئەتینا خەڵەتاندویەتی. داوا لە ئەخیل دەکات کە پابەندی داب و نەریتان بن، هەر کامیان ئەوی تری کوشت جەنازەکەی بداتەوە بەخاوەن و کەسوکاری. ئەخیل قایل نابێ، جارێکی دی داوای لێدەکات کە ئەگەر جەنازەکەی بداتەوە سەربەهایەکی گەورەی دەست دەکەوێ، لی ڕەفزی دەکات و دەڵێت جەنازەکەی بۆلای کەشتی ئاخاییەکان دەبات و دەیخاتە بەر کسۆکان.. ئیدی دوای ئەوەی دەیکوژێت، هەردوو پاژنەی کون دەکات، پەتێ تێ دەخات، لە عەرەبانەکەی دەبەستێ تا بەناو هورای ئاخاییان و ئاه و ناڵەی تەروادەییاندا بەرەو کەشتیەکانی ڕایکێشێت .داك وبابی لەسەر حەسارەوە بۆی دەگرین. لەو کاتەدا ئەندروماك کە خەریکی خەرەکەکەی دەبێ گوێی لەگریان و زاریان دەبێ، یەکسەر دڵی خەبەر دەدا کە شووەکەی مردووە. لەگەڵ دووان لە کارەکەرەکانیا وەدەردەکەوێ، کە چاوی بەدیمەنەکە دەکەوێ لەخۆی دەچێت. کاتێ وەهۆش دێتەوە بۆ بەختی ڕەشی خۆی و نادیاریی ئایندەی کوڕە بێ بابەکەی دەکەوێتە شین وشەپۆڕ وهەموو ژنانی تەروادە لەگەڵی دەگرین.

زەمەن:

هێشتا لە ڕۆژی سییەمی زەمەنی گێڕانەوە هۆمەریەکەداین.

سوبێ.

زۆربەی بویەرەکان لەبن حەسارەکانی تەروادەدا ڕوودەدەن. هۆمەر هەموو ئەو شوێنانە دەژمێرێ کە هەردووك پاڵەوان بەدەوری حەسارەکەدا پێیدا دەڕۆن. دیمەنێکیش هەیە، زیوس بەزەیی بەهیکتۆردا دێتەوە، ئەتینای کچی داوای لێدەکات یارمەتی هیکتۆر نەدات و دژایەتی قەدەر و چارەنووس نەکات.

(٦) تەروادەییەکان، وەکو کارمامزانی هەراسان وشپرزە خۆیان بەشاردا کرد، هەموو لەسەر بانێژە جوانەکانی شارەوە ئارەقەی سەر وچاو ولەشیان دەسڕی وتینویەتی خۆیان دەشکاند. ئاخاییەکانیش هەموو قەڵغان بەشان، لە حەساری شار نزیک دەبوونەوە. لێ قەدەری سەرسەخت هیکتۆری خستە داوەوە ولەشوێنی خۆی لەبەردەم ئیلیون ودەروازەکانی شاردا مایەوە. ئەپولۆ ڕوویکردە کوڕی پیلیوس وگوتی: "ئەی کوڕی پیلیوس، بۆچی دوام دەکەوی، لە کاتێکا تۆ بەشەرێکی فانیت و من خواوەندێکی نەمر؟ یانی هێشتا نازانی من خواوەندم و تۆ بەبێهودە خۆت ماندوو دەکەی؟ تا تۆ لێرە دەگەڕێیتەوە، تەروادەییانی دژمنی تۆ، بەکۆمەڵ خۆیان لەشار توند دەکەن. کەچی تۆ تا ئێستا وێڵ و سەرگەردان بەخۆرایی دوای من کەوتووی. بەهەرحاڵ تۆ ناتوانی من بکوژیت، چونکە من مردنم لەسەر نییە!"

(١٤) ئەخیلی لەزگێن زۆر تورە بوو، وەڵامی دایەوە: "بەڕاستی چاکت خەڵەتاندم ئەی خواوەندی دووربەنگێوە، ئەی دڵرەشترین خواوەندن، تۆ بۆ ئێرەت بکێش کردم تا لە حەساری تەروادەم دوور بخەیەوە، دەنا زۆر کەسی ترم، بەرلەوەی بگەنە ناو ئیلیون، لە خوێنا دەگەوزاند و جارێکی دی هەرگیز تەروادەیان بەچاو نەدەبینی.. بەم کارەت سەرفرازی و شکۆیەکی گەورەت لەدەستدام، زۆر بەئاسانی ڕزگارت کردن. چونکە لە قەرزی دوارۆژ ناترسیت و خەمی تۆڵەت نییە. ئاخ ئەگەر دەمتوانی، دەمزانی چۆن تۆڵەی خۆم لێدەکردیتەوە!"

(٢١) ئەو قسانەی کرد، بەدڵێکی پڕ لە خۆپەسندی، بەهەشتاو بەرەو شاری تەروادە وەڕێکەوت. وەکو چۆن ئەسپێکی براوە، بەخۆی و عەرەبانەکەیەوە، زۆر خێرا مەیدان دەبڕێ و پێش ئەوانی دی دەکەوێ.. (ئەخیل)ش بەهەمان چوست و چالاکی لاقەکانی خستە کار و ڕێگەی دەبڕی. پریامی پیر یەکەم کەس بوو کە لە دوورەوە بینی،

(٣٠) بەپەلە بەدەشتەکەدا دەهات و وەکو چۆن ئەستێرەی یەمانی (دوو خوشك) کە بەشەران (سەگی گەورەی پێ دەڵێن) لەناو لەشکری ستێراندا لە شەوی ئەنگوستە چاودا دەدرەوشێتەوە و لە هەموو ئەستێران بەپرشنگترە، بەڵام لەهەمان کاتدا نیشانەی شەڕ وشومییە وتاولەرزی کوشندەی بۆ بنیادەمانی کەساس پێیە، (ئەخیل)ش بەو ئاوایە لەژێر برونزاندا دەبریسکایەوە و دەهاتە پێشێ. پریام ئاهێکی قوڵی هەڵکێشا، هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردنەوە و کێشانی بەسەریا و بەدەنگی بەرز کەوتە پاڕانەوە لەکوڕە

ناریزەکەی کە بگەڕێتەوە. بەڵام هیکتۆر لەبەر دەروازەکاندا وەستا بوو و بەتاسەوە چاوەڕوانی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەخیل بوو. پیرەمێرد بەدەنگێکی خەمناك ڕوویکردە کوڕەکەی و گوتی: "هیکتۆر، ئەی کوڕی ئازیزم.. تکایە بەتەنێ، بەبێ پشتیوانی کەسانی دی ڕووبەڕووی ئەم پیاوە مەبەوە، دەنا بەدەستی کوڕی پیلیون دەکوژرێی .چونکە زۆر لەتۆ بەهێزترە، ئەمە دڕندەیە دڕندە. ئاە بریا خواوەندانیش هەر هێندەی منیان خۆش دەویست، هەنگی زووبەزوو لە گوڕە دەکەوت و دەبوو بەخۆراکی کسۆك و سەرگەڕان، دڵی پڕ خەمی منیش ئیسراحەتی دەکرد. گەلێك لە کوڕە ئازاکانی لێ ڕفاندم، هەندێکیانی کوشت. هەندێکیانی لە دوڕگە دوورە دەستەکاندا فرۆشت. ئەوەتا ئەمڕۆکەش، لەنێو ئەو تەروادەییانەدا کە بەکۆمەڵ لەناو شار خڕبوونەتەوە، دووان لە کوڕەکانم نابینم: لیکاون وپولیدوروس، کە هەردووکیان لە(لاوت)ی هاوسەرم بوون، لاوتی ڕەسەن و ئەسڵزادە، سەنگین ترین ژنی ناو ژنان. جا ئەگەر ئەم دووانەم هێشتا زندووبن و لە ئۆردوگای دژمندا بن، ئەوا زێڕ و برونزێکی زۆرمان هەیە و بەزێڕ وبرونزان ژیانیان دەکڕینەوە، چونکە (ئالتیس)ی بەناف و دەنگ، کاتی خۆی کەلاوتی کیژیم خواست، زێڕ و برونزێکی فرەی بەجیازی لەگەڵدا ناردبوو. بەڵام ئەگەر مردبن و چووبنە هادیس، خانەی مردوان، ئەوا دەبنە سوێی دڵی من و دایکیان و هەموو ئەوانەی ئێمە خستومانننەوە. بەهەرحاڵ داخ و کەسەری ئەوانی تر کەمتر دەبێ، ئەگەر تۆش بەدەستی ئەخیل نەکوژرێی و لەناو نەچیت. کەواتە وەرە ژوورەوە کوڕی خۆم، وەرە ژوورەوە تا پیاوان و ژنانی تەروادەیی ڕزگار بکەیت. تا نەبیتە مایەی سەرکەوتن و سەرفرازی کوڕی پیلیوس، و لەناوچوونی خۆت و لە دەستدانی ژیانی شیرینی خۆت.. هەروەها دەبێ بەزەییت بەمندا بێتەوە. بەمنی نەگبەت و بەدبەخت، کە هێشتا هۆش و گۆشم لای خۆمە. منی بێنەوای چارەڕەش کە (زیوس)ی کوڕی کرۆنۆس پاش ئەو هەموو داخ و کەسەرە بێ شومارە بەو زووانە، بەم ئاخری پیرییەوە، بەچارەنووسێکی خەمناکەوە لەنێوم دەبات، کە کوژران و مەرگی کوڕەکانم دەبینم، کیژەکانم بەئەسیری و کەنیزەکی دەبرێن. کۆشك و تەلارەکانم وێران دەکرێن، (٦٤) نەوەکانم لە مەیدانی شەڕدا دەگەوزێنرێن، ئاخاییانی ستەمکار، بووکەکانم بەتۆبزی دەبەن. ئەنجام نۆرە دێتە سەر من، کسۆکان لەبەر ماڵەکەی خۆمدا، دوای ئەوەی یەکێك لە دژمن بەزەبری شمشێر یان نێزە دەمکوژێت، هەڵم دەدڕن.. ئەو کسۆکانەی لەسەر خوانی خۆم خواردنم داونەتێ تا پاسەوانی دەرگاکەم بکەن. بەڵا، ئەو کسۆکانە دوای

ئەوەی بەدڵی پڕ لە کەرب و کینەوە خوێنەکەم دەمژن، دەچن لە ڕاڕەوەکانی سەراکەمدا لێی وەردەکەون.. سەبارەت بەگەنج ئەگەر لەشەڕا بکوژرێ، ئاساییە لەو گۆڕە بکەوێ، هەموو جێیەکی بەدەرەوە بێ تەنانەت لە مردنیشدا هەموو شتێکی لێ جوانە. بەڵام کە پیرێك دەکوژرێ لە دنیادا لەوە ناخۆشتر نییە کە کسۆکان دەم بژننە پۆریبۆز وردینی چەرمگیوگەڵوگون و ئەسپابە تایبەتییەکانی بکەوێتە ئەو گۆڕە، تەحا لەو حەیاچوونە!"

(٧٧) پریامی پیر بەو جۆرە قسانی کرد. بەدەست بەربووە ڕنینەوە ودەرهێنانی پۆڕەسپییەکەی، بەڵام نەیتوانی دڵی هیکتۆر نەرم بکا.. دایکیشی لەولاوە بەدەم فرمێسك ڕشتن و گریانەوە بەدەستێك لۆیەکی کراسەکەی لادا وبەدەستەکەی تری مەمکەکانی دەرخست و بەدەم لالانەوەوە گوتی: "هیکتۆر کوڕەکەم! بیکە بەخاتری ئەم سینگ و مەمکانەم، حورمەتی ئەم مەمکانەم بگرە و بەزەییت بەمندا بێتەوە. ئەوەت لەبیر بێ کە چۆن بەم مەمکانە بەخێوم کردویت و هەموو خەم و ئازارێکم ڕەواندویتەوە. کوڕی خۆم وەرە ژووری، لێرەوە، لەم دیو حەسارەکەوە ڕووبەڕووی ببەوە لە دەرەوە ڕووبەڕووی مەبەوە. کابرایەکی دڵڕەقە ئەگەر بتکوژێت ناتوانم لە جێگەدا داتبنەم و لەگەڵ ژنەکەتدا ژنە ئەسڵزادەکەتا، ئەی کوڕی شیرینم، بەدیارتەوە بگرین. بەڵکو دوور لە ئێمە، لەکەناری کەشتی ئارگۆسییەکاندا بەبێ گۆڕ، دەکرێی بەخۆراکی کسۆکان. بەو جۆرە هەردووکیان بەدەم گریانەوە، لە کوڕە ئازیزەکەیان دەپاڕانەوە. لێ نەیانتوانی دڵی نەرم بکەن. بەڵکو لەجێی خۆی چەقی بوو. چاوەڕوانی ئەخیلی دەکرد. کە بەهەڵەداوان لێی دەهاتە پێشێ. وەکو چۆن مارێکی کێوی تێر بەسکی خۆی گیای زەهراوی خواردبێ، زۆر تورە بووبێ و لەبەر کونەکەی خۆیدا پەپکەی خواردبێ و چاوەڕوانی ڕێبوارێك بێ و بەگومان وتورەیی لێی بڕوانێ.. هیکتۆری (مێرخاس)ش بەهەمان شێوە سەراپای بوو بوو بەئازایەتی و لەجێی خۆی نەدەبزووت و نەدەگەڕایەوە. سپەرە ڕەخشانەکەی لەشانی داگرت و بەدیواری بورجەکەوەی هەڵپەسارد، بێباك ونەترس لەوێ وەستا.

(٩٩) لەدڵی خۆیدا گوتی: "واوەیلا بەحاڵم، ئەگەر لەدەروازەوحەسار وەژوور کەوم، پولیداماس یەکەم کەس دەبێ لۆمەم بکات .چونکە ئەو ئامۆژگاری کردم هەر کە ئەخیل هاتە مەیدانی شەڕ لەژێر باڵی تاریکی شەودا پاشەکشە بەلەشکرەکە بکەم و بۆ بورجەکانی خۆمان بگەڕێینەوە، بەڵام بەقسەم نەکرد. بریا بەقسەم دەکرد. زۆر باشتر دەبوو. من کە

بەدەریی خۆم لەشکرەکەم پەرێشان وداغان کردووە، ڕووی ئەوەم نیە چاو لەبەر پیاوانی تەروادەیی و ژنانی تەرپۆشی شار هەڵێنم. زۆر دەترسم ڕۆژێ لە ڕۆژان کەسێکی زۆر بودەڵە بێ: "هیکتۆر، لەشکرەکەی کرد بەقوربانی لاف وگەزافی خۆی، زۆر بەتوانا و هێزی خۆی دەفشی!".. باشترین شت ئەوەیە ڕووبەڕووی ئەخیل ببمەوە یان دەیکوژم و دەگەڕێمەوە یا بەسەربەرزی لەبەردەم شاردا دەکوژرێم.. یان چۆنە سپەرە بەنەخش و نیگارەکەم و کێوخودە قورسەکەم دابنەم و رمەکەم بەدیوارەکەوە هەڵپەسێرم، بەخۆم بەبێ چەك بچمە پێشوازی ئەخیل؟ بەڵێنی بدەمێ کە هیلین و هەموو ئەو گەنج و سامانەی کە ئەلکساندەر (پاریس) لە کەشتیانی بارکرد بوو و لەگەڵ هیلیندا هێنابووی بۆ تەروادە کە هۆکاری شەڕی ئێمە و ئەو بوو، بۆ کورانی ئۆتریوس دەگێڕینەوە. هەروەها کارێکی وەها دەکەم هەرچی سەروەت وسامان وگەنجینە لە شاردا هەیە، برابەش لەگەڵ ئاخاییەکاندا بەش بکەین و بەشایەتی دەمراست و ردێن سپیانی تەروادەش بەڵێن لە تەروادەییان وەردەگرم کە هیچ شتێك نەشارنەوە، هەموو گەنجینە جوانەکانی شار بکەن بەدوو بەشەوە؟. ئەمە چۆن بیرکردنەوەیەکە من هەمە؟ ئەگەر بەو شێوەیە بەرەو پیری بچم، نەروحمم پێدەکات و نەڕێزم دەگرێت. منی بێ چەك وەکو ژنێکی بێدەسەڵات دەکوژێت. بۆیە ناکرێ وەکو چۆن کوران و کیژانی لاو لەسەر تاوێرێك یان لەبن دار بەرویەکدا دەکەونە راز و نیاز، بەو ئاوایە لەگەڵیا بکەمەوە گفتوگۆ.. بۆیە تازووتر بکەوینە شەڕی یەکتر باشترە. بابزانین خوا (زیوس) سەرکەوتن بەکێمان دەدا."

(١٣١) هیکتۆر بەدەم ئەو بیرانەوە لە جێی خۆی وەستا بوو. لێ ئەخیل کە کێوخودەکەی وەکو کێوخودەکەی ئێریسی خواوەندی جەنگ، بەسەر سەرییەوە دەلەرییەوە دەهاتە پێشێ. نێزە سامناکەکەی کە لە داربناوی دەڤەری پیلیون دروست کرابوو، لەسەرشانی راستییەوە سەرەتاتکێی دەکرد. سەپارای لە برونزدا دەدرەوشایەوە. لە تۆ وایە بڵێسەی ئاگرێکی بێ ئامانە یان گزنگی هەڵاتنی هەتاوە. هیکتۆر کە چاوی پێکەوت، ترسی لێنیشت و زاتی نەکرد لەوەی پتر لەجێی خۆی چاوەڕوانی بکات. بەترسەوە بە بەر دەروازەکاندا کەوتە غاردان .لێ ئەخیل بەپەلە دوای کەوت. وەکو چۆن واشەیەکی تیژ باڵ، لەسەر چیایەکەوە پەلاماری کۆترێکی پەشۆکاو دەدات و کۆترە لەبەری هەڵدێ بەڵام

(١٤١) واشەکە بەدەم قیژەیەکی سامناکەوە، زیاتر لێی نزیك دەبێتەوە وگوڕ دەداتە خۆ کە نێچیرەکەی بگرێ (ئەخیل)ش بەهەمان شێوە تا هێز لە لاقیا بوو بەرەو هیکتۆر چوو،

هیکتوریش بەهەموو هێزی خۆیەوە بەبن حەساری تەروادەدا کەوتە غاردان.

(١٤٥) بەو جۆرە بەدەم غاردانەوە بەدەوراندەوەری حەساری شاردا دەسوڕانەوە. لە بورجی دیدەوانییەکە ڕەت بوون. لەدار هەنجیرە کێویە تەنیاکە ،کە بەدەم باوە دەشنایەوە ڕەت بوون. بەگالیسکەڕێیەکەدا بەردەوام بوون، گەیینە ئەو جووتە کانییە جوان و ئارامەی کە سەرچاوەی ڕوباری (سکاماندروس)یان پێکدێنا، و یەکێکیان ئاوی گەرمی لێ هەڵدەقولا، هەڵمێکی لێ هەڵدەستا لە تۆ وایە دوکەڵی ئاگرە. ئەوی تریان بەهاوین، ئاوێکی تەزی لێ هەڵدەقولا، وەکو ئاوی تەرزە یا بەفر یان شەختەی سەر ئاوان. لە نزیکی ئەم جووتە کانیەدا، چەند جورنەیەك هەبوو بۆ کوڵ و شوستوشۆ، زۆر جوان بوون، لەبەرد دروست کرابوون. کە ژنان و کچانی نەشمیلی تەروادەیی لە ڕۆژانی ئاشتی و ئارامیدا، بەر لە هاتنی کوڕانی ئاخایی، جلە جوانەکانیان لەوێ دەشت.. بەخێرایی لەو جورنانەی تێپەڕین. یەکێکیان هەڵدەهات و دووەمیانی ڕاوی دەنا.. لە پێشەوە پیاوێکی دلێر و ئازا هەڵدەهات،

(١٥٨) بەڵام ئەوەی ڕاوی دەنا لەو ئازاتر بوو. ئەم جووتە غاریان دەدا ئەمما غار.. غاردانی وان لەڕای بردنەوەی حەیوانێکی قوربانی یان کەوڵی جوانەگایەك نەبوو، وەکو ئەمە لە پێشبڕکێی غارغارێندا باو بوو.. خەڵاتی ئەم غاردانە ژیانی هیکتۆر بوو. هیکتۆری چاپکسوار و ڕامکەری ئەسپان. وەکو چۆن ئەسپانی خورت و ڕەهوان، سمتیژ، بەهومێدی بردنەوەی خەڵاتێکی بەهادار –مەنجەڵی سێپا بێ یان کەنیزەك- لە ئاهەنگی یادی پاڵەوانێکی مردوودا، بەڕێگەیەکی پڕ پێچاو وپێچدا دەکەونە پێشبڕکێ.. بەو ئاوایە ئەم جووتەش بەهەموو هێز و توانای خۆیانەوە، بەدەوری شارەکەی پریامدا سوڕانەوە. هەموو خواوەندەکانیش تەمەشایان دەکردن. ئیدی سەردار وبابی هەموو بەشەران وخواوەندان بەر لە هەموویان هاتە قسان و گوتی:

(١٦٨) "مەخابن، بەچاوی خۆم پیاوێکی ئازیز دەبینم بەدەوری حەساری تەروادەدا ڕاودەنرێت. بەڕاستی بەزەییم بەهیکتۆردا دێتەوە، کە لە لوتکەکانی ئیدای پڕ گەلی‌ونوالاندا لە بورج و قەڵای ئیلیوندا زۆر گاجووتانی لە پێناوی مندا کردۆتە قوربانی و ڕانەکانی لەڕای مندا سوتاندون. ئەخیل دەبینم، ئەخیلی مەزن، چنگ لەسەرشان بەدەوری شارەکەی پریامدا ڕاوی دەنێت.. ئەی خواوەندان باش بیربکەنەوە. لە بەینی خۆتاندا تەگبیر بکەن ئایا ڕزگاری بکەین یا بەهەموو دلێری و ئازایەتییەکیەوە وازی لێ بێنین، ئەخیلی کوڕی

پیلیوس بیکوژێت؟"
(١٧٧) ئەتینای چاوگەش وەڵامی دایەوە: "بابۆ، ئەی خێوی هەورە تریشقان، ئەی هەورەوان، ئەم قسەیە چیە کە تۆ دەیکەی؟ دەتەوێ یاسای دێرینەی چارەنوس بگۆڕی؟ ئەم ئادەمیزادە لە دەستی مقەدەری مەرگ ڕزگار بکەی. تۆ بەکەیفی دڵی خۆت بکە. بەڵام دڵنیابە ئێمە ،خواوەندان شتاقامان بەشداریت ناکەین!". زیوسی هەورەوان بەرسڤی دایەوە: "کیژم، دڵ لەدڵ مەدە، خەمت نەبێ من شتەکەم بەجدی نییە، بەڵام دەمەوێ هەندێ بەروحم بم لەگەلیا. گوێ مەدەیە هەموو شتێك بەدڵی خۆت دەبێ. برۆ چیت پێ خۆشە وا بکە، بێ دڵی خۆت مەکە. لە هیچ مەپرینگێوە."
(١٨٦)ئەتینا کە بەخۆی لەسەرپێ بوو، بەو قسانە هێندەی دی خرۆشاو بە هەشتاو لە لوتکەکانی ئۆلیمبۆسەوە داگەرا
(١٨٨ ئەخیل سات بەسات پتر تەنگی بەهیکتۆر هەڵدەچنی و لێی نەدەبووەوە. وەکو چۆن تاژییەك لەنێو چیایاندا ئاسکێك لەلانەکەی هەڵدەستێنێ، بەگەلی و نواڵاندا ڕاوی دەنێ ،ئەگەر ئاسکەکە لەپڕ خۆی وەناو بێشەیەکدا بکات و بۆ ماوەیەکی کەم دەرباز ببێ، ئەوا تاژیەکە دەستبەرداری نابێ، بەبۆن دەیدۆزێتەوە و دوای دەکەوێ تا دەگیرێت. هیکتۆرش بەهەمان شێوە نەیدەتوانی لە چنگی ئەخیلی لەزگێن دەربازبێ. چەند دەیویست بگاتە دەروازەکانی دەردانیان و خۆی بداتە پەنا حەسارە مکومەکە و هاورێکانی لەسەرەوە بەهانایەوە بێن و لەسەرەوە ئەخیل بەر تیرو کەوانان بدەن، ئەخیل پێشی لێدەگرتەوە و بۆ دەشتەکەی دەگێڕایەوە و ناچار بەدەوری حەسارەکەدا دەسورایەوە. وەکو چۆن لە خەوندا یەکێك یەکێك ڕاودەنێ، نە یەکەم دەتوانێ هەڵێ و نەدووەم دەتوانێ بیگاتێ و بیگرێ.. بەو ئاوایە نەئەخیل توانی بگاتە هیکتۆر و نەهیکتۆر توانی هەڵێ!.. هیکتۆر چۆن دەیتوانی لە قەدەری مەرگ دەرباز بێ؟ ئەپولۆ لێی نزیك بووەوە تا ورەی بەرزبکاتەوە. هێز و گوڕ وەلاقانی ببەخشێت. ئەخیلی مەزن ئاماژەیەکی بۆ لەشکری ئاخاییان کرد، بەڵام بەئاماژەی سەر تێی گەیاندن کە کەس تیر ونێزە نەهاوێتە هیکتۆر. لەوە دەترسا یەکێکیان بیپێکن و سەربەرزییەکە بۆ خۆی تۆمار بکات. هەوڵ و خەبتینی ئەم بەفیڕۆ بچێ و ئەو سەنگەی نەبێ. پاش ئەوەی بۆ جاری چوارەم گەییشتنەوە لای دوو کانیەکە، بابە زیوس هەردوو لنگی تەرازووە زێرینەکەی بەرز کردەوە، دوو قەدەر و چارەنووسی خستنە ناو یەکێکیان هی ئەخیل و ئەویتریان هی هیکتۆری چابك سوار بوو. ئەوجا

تەرازووەکەی لە ناوەندەوە گرت وبەرزی کردەوە. لینگەکەی هیکتۆر بۆ هادیس، خانەی مردوان داکەوت. ئیدی ئەپولۆ وازی لێهێنا. هەنگێ ئەتینای چاوگەش چوو بۆلای کورەکەی پیلیوس، گوتی: "ئەی ئەخیلی جوامێر، ئەی خۆشەویستی زیوس، بەئومێدم ئێستا ئەو کاتە بێ، کە هەرچەند هیکتۆر هێشتا لە شەڕ و جەنگ تێر نەبووە، تۆ بتوانی بیکوژیت و مژدەی سەرکەوتنێکی گەورە بەئاخاییان بدەیت.. تازە ناتوانێ لە دەستمان دەرباز بێ. تەنانەت ئەپولۆی دوورئەنگێوەش هەرچی بکات و چەند لەبەر زیوس بپاڕێتەوە وداوای ڕزگاری هیکتۆری لێ بکات، ناتوانێ فریای بکەوێ و ڕزگاری بکات. تۆ لێرە بوەستە. نەفەسێك تازە بکەوە. تا من بەخۆم دەچم بۆلای ئەو پیاوە وقەناعەتی پێدەکەم کە چیتر هەڵنەیەت و کاتی شەڕی دەستەویەخەیە."

(٢٢٤) ئەتینا ئەو قسانەی کرد ،ئەخیل بەخۆشحاڵییەوە بگوێی کرد. خۆی دا بەسەر نێزە بناویە نووك برونزیەکەیدا و لەجێی خۆی وەستا. ئەتینا ئەوی بەجێهێشت و ڕۆیی بۆلای هیکتۆری مەزن ،بەهەیئەت و دەنگی دیفوبوس خۆی پیشانی هیکتۆردا، لێی نزیك بووەوە وگوتی: "برای ئازیز، بزانم ئەخیلی لەزگین زۆر پەریشانی کردویت و بەدەوری شارەکەی پریامدا ڕاوت دەنێ. وەرە با ڕووبەڕووی بینەوە و لەبەری هەڵنەیەین."

(٢٣٢) هیکتۆری جوامێر، کێو ڕەخشان وەڵامی دایەوە: "ئەی دیفوبوس، هەمیشە تۆم لە هەموو براکانم، لە هەموو کوڕانی هیکوبا و پریام پتر لا خۆشەویست بووی. بەڵام ئەمجارەیان لە هەموو کات پتر چوویە دڵمەوە، چونکە تۆ لەبەرخاتری من ڤیروسیات لەخۆ کردووەو لە حەسار هاتویە دەر وئەوانی دی بۆ خۆیان لە ژوورەوەن."

(٢٣٢) ئەتینای چاوگەش گوتی: "برای ئازیزم، باب و داکی هەژیمان، هەموو هاوڕێیانم، لەبەرم پاڕانەوە، زۆریان تکا لێکردم کە لە حەسار وەدەرنەکەوم. چونکە تەواو ترسیان لێ نیشتبوو. بەڵام کە تۆم بەو حاڵەوە بینی زۆر خەمبار بووم. خۆم پێنەگیرا. جا بۆیە وەرە بەدوو قۆڵی پەلاماری بدەین و لێی نەترسین ،ڕم بەدەست سڵی لێنەکەینەوە! بەهیچ جۆرێ خەمی ڕمت نەبێ، جا بابزانین ئاخۆ ئەو هەردووکمان دەکوژێ و میراتیە خوێناویەکانمان بۆلای کەشتییەکانیان دەبات یان ئەو دەبێت بەتێشووی ڕمی تۆ."

(٢٤٧) ئەتینا بەدەم ئەو قسانەوە پێشکەوت و هیکتۆری هەڵخەڵەتاند. وەختێ لێکدی نزیکبوونەوە ،هیکتۆری مەزن، هیکتۆری کێوڕەخشان ڕویکردە ئەخیل و گوتی: "ئەی کوڕی پیلیوس چیتر لەبەرت هەڵنایەم، سێ جاران دەوراندەوری حەساری شارەکەی

پریامی مەزنت پێکردم، زاتم نەکرد لێت هەڵگەڕێمەوە و شەڕی تۆ بکەم، لێ ئێستا ڕوحم فەرمانم پێدەکات ڕووبەڕووت ببمەوە. جا یا دەتکوژم یا دەمکوژیت. بەڵام با خواوەندان بەشایەد بگرین و لەبەردەمی ئەواندا بەڵێن بدەین: کە ئەگەر زیوس دەستی دام و توانیم بتکوژم بەهیچ جۆرێ جەنازەکەت ناشێوێنم و سوکایەتی پێناکەم. بەڵکو دوای ئەوەی چەك و ئەسلەحەکەم تالآن کردیت، لاشەکەت بەسەلامەتی و بەحورمەتەوە بۆ ئاخاییەکان دەگێرمەوە. تۆش سوێندم بۆ بخۆ کەواهی دەکەی!".

(٢٦٠) هەنگێ ئەخیلی لەزگین، برۆکانی وێك هێنانەوە وبەرقەوە گوتی: "ئەی هیکتۆر، ئەی کەر پیاو باسی پەیمان و بەڵێنان بۆ من مەکە، وەکو چۆن سۆز و پەیمان لە نێوان شێر و بەشەردا نییە ،ئاشتی لەنێوان گورگ و بەرخدا نییە، هەردووك ڕقیان لێکدیە، بەهەمان شێوە مەحاڵە من و تۆش پێکەوەمان بکرێ. دۆستی یەکتر بین، واتە هیچ سۆز و پەیمانێکمان لەنێواندا نابێ. دەبێ یەکێکمان بکوژرێ و بەخوێنەکەی تینویەتی ئێریس، ئەو جەنگاوەرە لەزەبرە، کە سپەرەکەی لە پێستی گا دروست کراوە بشکێنێ.. جا ئێستا بیر لە هەموو جۆرە ئازایەتیەك بکەوە. پێویستە بەکردەوە بیسەلمێنی کە ڕمباز و شەرڤانێکی مێرخاسی. هیچ دەرفەتێکی هەڵاتنت نیە، هەر ئێستا ئەتینا دەتکات بەتێشووی نێزەکەی من. دەبێ باجی ئەو هەموو دەرد و خەمە بدەی، کە بەکوشتنی هاورێکانم بەمنت نۆشت."

(٢٧٣) ئەو قسانەی کرد، نیشانەی لێگرتەوە و پیرە ڕمی هاویشتێ. هیکتۆر ڕمەکەی بینی خۆی لەبەری لادا، ڕمی برونزی بەسەر سەریا گڤەی کرد و لە عاردی چەقی.لێ ئەتینا، هەڵیگرتەوە و بەبێ ئەوەی هیکتۆر بیدینێ دایەوە بەئەخیل. هیکتۆر بەکوری پیلیوسی گوت: "نێزەکەت بەهەتەر چوو. نەت پێکام، وادیارە ئەی ئەخیل، ئەی هاوتای خواوەندان، هێشتا زیوس لە چارەنووسی منی ئاگادار نەکردویت، کەچی تۆ جەختت لەسەر ئەوە کرد کە ئاگاداری کردویت. تۆ کابرایەکی درۆزنی فیشاڵبازی ،دەتەوێ بەگاڵەی دەم بمترسێنی و زاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەدەست بدەم و لەبەرت هەڵێم.. نا ئەو زەمانە بەسەرچوو لەبەرت هەڵێم و لە پشتەوە بەر نێزەم بدەیت، نا دەبێ کاتێ کە پەلامارت دەدەم لە سینگمی بچەقێنی، ئەگەر خواوەندێك ئەم توانایەت پێ ببەخشێت.. ئێستا خۆت لەبەر نێزەی برونزینی من لادە، بەئومێدم لە جەستەتدا ختم ببێ!.. بەمردنی تۆ باری شەڕ لەسەر شانی تەروادەییان سووك دەبێت. چونکە تۆ بەڵای گیانی ئەوانی."

(١٨١) بەدەم ئەو قسانەوە نیشانەی لێگرتەوە ونێزەکەی تێسرەواند. نێزە ڕێك بەرناوەندی سپەرەکەی کوڕی پیلیوس کەوت. لێ نێزەکە هەڵگەڕایەوە و چووڵەودوورە کەوتەوە. هیکتۆر کە بینی ڕمەکەی بەبێهودە لە دەست ڕۆیی، زۆر تورە وقەڵس بوو حایر وسەرسام وەستا ،چونکە نێزەی دیکەی پێ نەبوو. هەنگێ بەدەنگی بەرز هاواری دیفوبوسی سپەرڕەخشانی کرد، داوای نێزەیەکی درێژی لێدەکرد .لێ دیفوبوس لەو ناوە نەبوو. هیکتۆر لە ناخی خۆیدا پەی بەهەموو شتێك برد. لەبەر خۆیەوە گوتی: "حەیفێ، بێگومان خواوەندان بەرەو مەرگی خۆمم بەکێش دەکەن. وامزانی دیفوبوس لە تەکمایە. لێ مەخابن لەودیو حەسارە. ئەتینا هەڵیخەڵەتاندوم .ئیدی ئەوە مەرگە و بەرەورووم دێت. ئیدی مەرگ نزیکەوهیچ مەفەرێکم نییە.پێم وایە هەر لە هەوەڵەوە زیوس وکورەکەی زیوس، ئەپولۆی دوورئەنگێوە، ئەمەیان پێ خۆش بوو. ئەوانەی کە پێشتر دڵسۆزانە بەهانامەوە دەهاتن و دەیان پاراستم. وادیارە ئێستا ڕۆژم تەواو بووە .بەڵام ناشمەوێ هەروا بێ هیچ هەوڵ و تەقەلایەك، ناوبزر بمرم، دەبێ کارێکی شایستەی وەها بکەم کە نەوەکانی ئایندە بیگێڕنەوە."

(٣٠٦) هەر کە ئەو قسەیەی کرد، شمشێرە گران وبرندەکەی کە بەقەدیەوە بوو هەڵکێشا.. خۆی ئامادەکردو وەکو چۆن هەڵۆیەکی بەرزەفڕ، لەتاقی ئاسمانەوە بەناو هەوری توند وچڕا بەرەو دەشتێك داگەڕێ تا پەلاماری بەرخە کۆرپەیەکی ناسك یان کەروێشکێکی هەڵتروشکاو بدات.. هیکتۆرش بەو شێوەیە بەشمشێری ڕووتەوە هێرشی برد.. ئەخیل بەدڵێکی پڕ کەرب و کینەوە بەرەورووی چوو. قەڵغانە جوان و بەنەخشونیگارە نایابەکەی دابووە پێش خۆی. کێوخودە درەخشان وچوار قوببەییەکەی بەسەر سەریەوە دەلەرییەوە، ئەو یاڵ و ڕیشوە زێڕ و جوانانەی کە هیفایستوس لێی نابوو بەهەموو لایەکدا شەپۆلیان دەدا وبەنەرمی دەلەرینەوە. وەکو چۆن لە تاریکە شەوێکا ،لەناوجەرگەی ئەستێرانەوە، لە قوڵایی ئاسمانەوە، ئەستێرەی شەوێ، میناکی جوانترین ئەستێرە دەدرەوشێتەوەوپرشنگ داوێ بەو ئاوایە نێزەکەی (ئەخیل)ش کە بەدەستی ڕاستی گرتبووی و مەرگی هیکتۆری لەخۆیدا هەڵگرتبوو دەدرەوشایەوەو پرشنگی دەهاویشت. چاوی بۆ شوێنێکی ڕووتی بەدەنی دەگێڕا، تا ڕمەکەی ئاراستە بکات. ئەو زرێ و چەك و ئەسلەحەیەی کە لەدوای کوشتنی پاتروکلۆسی جوامێر دەستی بەسەراگرتبوو، سەراپای داپۆشی بوو. تاقە شوێنێکی کە بەدەرەوە بوو، ئەوکی بوو، ڕێك بەینی شانی و ملی، کە گیانی بەشەڕ لەوێندەرەوە زوو دەردەچێت. ئەخیلی مەزن هێرشی بردە سەر هیکتۆر.

ڕێك نەوێندەری پێكا. گەرووی دیواودەر كون كرد، بەلاّم بۆری هەناسەی نەبڕی، چونكە هێكتۆر بەرلەوەی بكەوێ، فریاكەوت چەند قسەیەك بەئەخیل بڵێ.. ئەوجا تیلاوتیل تەختی زەوی بوو.. ئەخیل شاد و سەرمەست چووە دیاری و گوتی: "ئەی هیكتۆر! بێگومان، ئەو كاتەی چەك و ئەسلەحەكەی (پاترۆكلۆس)ت تالاّن دەكرد، لە دڵی خۆتا دەتگوت لەشەڕی من دوور دەبیت و بیری ئەوەت نەبوو كە منی دوورە جەنگ كە لەگەڵیا نەبووم، تۆڵەی دەكەمەوە. بێ ئەقڵ خۆت، غافڵ بووی لەوەی كە لەناو كەشتییەكاندا تۆڵە ئەستێنێكی زۆر بەتواناتر لە پاترۆكلۆس هەبوو. ئەو تۆڵە ئەستێنە من بووم، كە ئەوەتام لە پەلوپۆم خستیت و تۆ ئیدی دەبیت بەخۆراكی كسۆك و دالاّشان. بەلاّم پاترۆكلۆس بەڕێز وحورمەتەوە ئاخاییان پرسەی بۆ دەگێڕن و دەینێژن."

(٣٣٨) هەنگێ هیكتۆری كێوڕەخشان بەدەم دوا هەناسەی گیانەڵێوە گوتی: "دەستم دامێنت. تۆ گیانی خۆت ،ساقەسەری داك و بابت، ئەوەم لەگەڵدا مەكە كسۆكان لە كەناری كەشتی ئاخاییەكاندا بمخون. تادەتوانی زێڕ و برونزان داوا بكە، باب وداكم درێغی ناكەن، دەتدەنێ، هەر ئەوەندە جەنازەكەمیان وێدەوە، تا بیبەنەوەو لە ولاّتی خۆمدا پیاوان و ژنانی تەروادەیی ڕێوڕەسمی پرسەم بۆ ئەنجام بدەن و شەوتنگەم(محرقە) بۆ بەرپا بكەن و بمسوتێنن."

(٣٤٤) هەنگێ ئەخیلی لەزگین، برۆكانی وێكهێنایەوە ومۆرەیەكی پڕ كینەی لێكرد و گوتی: "ئەی سەگ، لێم مەپاڕێوە، بەگیانی داك و بابم سوێندم مەدە.. ئەگەر لاشەكەت پارچە پارچە بكەم و گۆشتەكەت بەكاڵی بخۆم هێشتا دڵم داناسەكنێ، دەزانی چ داخێكت نا بەجەرگی منەوە. هێز نیە لە دنیادا بتوانێ لە چنگی كسۆكانت دەربێنێ. نا نەخێر، ئەگەر دە قات و بیست قات سەربەهات بدەن و بەڵێنی زیاترش بدەن.. نا نەخێر، تەنانەت ئەگەر پریامی كوری داردانوس فەرمان بدات بەقورسایی خۆت ئاڵتونم بدەنێ، دایكە هێژاكەت بەدیار جەنازەی ئەو كەسەوە كە لە داوێنی ئەو كەوتۆتە خواریێ ناگری.. بەڵكو كسۆكان و دالاّشان دەتخۆن و حەپەلوشت دەكەن!"

(٣٥٥) هیكتۆر بەدەنگێكی لەرزۆك، بەدەم گیانەڵێوە گوتی: "بەڕاستی من وەكو پێویستە نەمناسیت، دەبوایە بمزانیبا كە دڵی تۆ نەرم ناكرێت، چونكە دڵێكی ئاسن لە سینەی تۆدایە. جا بۆ خۆت بیرێك بكەوە، ئەوەی تۆ دەیكەی ئاسمان لێت دەرەنجێ. ئەو ڕۆژەی كە پاریس و ئەپولۆ وێرای هەموو ئازایەتیەكت لەبەر دەروازەكانی شاردا

دەیخوون، دێتەوە ڕێت."

(٣٦١) بەدەم ئەو قسانەوە تاریکی مەرگ باڵی بەسەرا کێشا، گیانی لەهەر چوار پەلیەوە دەرچوو. بەرەو هادیس، خانەی مردووان چوو. گلەیی لە بەختی خۆی دەکرد کە تێری لە قارەمانێتی و لاوی خۆی نەخوارد. لێ ئەخیل ڕوویکردە جەنازە بێ گیانەکە و گوتی: "پاڵکەوە بۆ خۆت ،من بەهەر قەدەرێکی زیوس و خواوەندەکانی دی قاییلم."

(٣٦٧) بەدەم ئەو قسانەوە نێزە برونزیەکەی لە جەنازەکە دەرێنا. لەلایەکەوەی دانا. ئەوجا کەوتە داماڵینی زرێ و چەکەمەنیە خوێناوییەکانی دی لە مردووەکە. ئەوسا کوڕانی ئاخاییایی دی لە دەوری کۆبوونەوە. دەیانڕوانیە باڵا وجوانی لە ڕادەبەدەری هیکتۆر. هەر کەسێك دەهاتە دیاری ڕمێکی لێدەدا وزامێکی تری دەخستە جەستەی.. هەر کەسەو بەوەی تەنیشت خۆی دەگوت: "تۆ بڕوانە ئەم هیکتۆرە لە کوێ و ئەوەی بوو بوو بەپارچەیەك ئاگری ڕق و کەشتییەکانی دەسوتانین لە کوێ."

(٣٧٦) کاتێ ئەخیل، لە تاڵانکردنی چەکەمەنییەکانی هیکتۆر بووەوە ،لەنێو ئاخاییەکاندا وەستاو بەزمانێکی ڕەوان پێی گوتن: "دۆستان، ئەی ڕابەران و شێرەتکارانی ئارگۆسی، خواوەندان دەستیان داین ئەم پیاوە بکوژین، کە بەتاقی تەنیا لەهەر هەموو ئەوانی دی پتر دەردی داینێ. باهەوڵ بدەین دەست بەچەك دەوری شار بگرین.

(٣٨١) تا بزانین تەروادەییان بەنیازی چین: ئاخۆ لە دوای کوشتنی ئەم پیاوە ،شارە بەرزەکەیان بەجێدێڵن، یان بەبێ هیکتۆرش، سەرسەختانە بەرگری دەکەن. بەڵام ئەوە چیە، بۆچی دڵ بەو جۆرەم دەدوێنێ؟.. جەنازەکەی پاترۆکلۆس، بێ ئەوەی کەسێك بۆی بگری، هێشتا نەنێژاوە و لەلای کەشتییەکان کەوتووە. جەنازەی ئەو پاترۆکلۆسەی کە تا لە ژیاندا بمێنم و هێز لە لاقمدا هەبێ هەرگیز لەبیرم ناچێت. ئەگەرچی خەڵکی ،مردوان کە دەگەنە هادیس لە بیر دەکەن. لێ من تەنانەت لەوێش ئەو دۆستە ئازیزەم لەبیر ناکەم.. دەی سا کوڕانی ئاخایی، با بەدەم سروودی سەرکەوتنەوە بەرەو کەشتییەکانمان بڕۆین و ئەو جەنازەیەش دەگەڵ خۆدا بەرین. ئێمە بەکوشتنی هیکتۆری مێرخاس، کە تەروادەییەکان وەکو خوایەك ڕێزیان دەگرت و هانایان بۆ دەبرد، سەرفرازی و سەرکەوتنێکی بەشکۆمان بۆ خۆ وەدەست هێنا."

(٣٩٥) ئیدی کەوتە بیری سوکایەتی کردن بەجەنازەکەی هیکتۆری جوامێر. هەردووك پاژنەی پێی لە پشتەوە تا قولە پێی کون کرد، دوو سیرمەی چەرمی گای لە کونەکان

هەڵکێشا. بەعەرەبانەکەیەوە بەستن. سەری هیکتۆر بەعاردیدا دەخشا. ئەوجا سەرکەوتە سەر عەرەبانەکە. ئەسپابی جەنگەکەی دانا. ئەسپەکانی بەر قامچی دا، ئەسپ وەکو تێسکەی تفەنگ بۆی دەرچوون. لە هیچ نەدەگەڕانەوە. تەپوتۆزێکی زۆر سەری جەنازەکەی هیکتۆری گرت، کە بەدووی عەرەبانەکەوە وبەعاردیدا ڕادەکێشرا. قژە ڕەشەکەی بەهەموو لایەکدا پەخش و پەریشان دەبوو. سەرە جوانەکەی یەکپارچە گڵ و خۆڵ بوو. زیوس دابویە دەستی دژمنەکانی تا لە ژێگە ولەسەر خاکی وڵاتی خۆیدا سوکایەتی پێبکەن."

(٤٠٥) بەو ئاوایە سەری هیکتۆر لە گڵ و خۆڵدا غەرق، بێ ڕێزییەکی زۆری پێکرا. دایکی کەوتە ڕنینەوەی قژی خۆی. سەرپۆشە ناسك و جوانەکەی توڕدا ،کە کوڕەکەی بەو شێوەیە بینی لەزێر ژنی گریانی دا. بابی لەهۆڕ ژنی گریانێکی بەکوڵ و خەمناکی دا. ئیدی شار یەکپارچە بوو بەگریان و شین و ڕۆڕۆ، لەتۆ وایە سەرانسەری تەروادە لە ئاگردایە و نێڵە نێڵ دەسوتێ. پریامی پیر، شێت ئاسا بەرەو دەروازەکانی شار ملی دەناو دەیویست لە شار وەدەرکەوێ. خەڵکەکە زۆر بەزەحمەت پێشیان بۆ دەگیرا. خۆی لە گڵ و خۆڵ وەردەدا وبەناو لەیەك بەیەکیان دەپارایەوە،

(٤١٦) دەیگوت: "ئەی دۆستانی من ڕێم بەردەن، با بەتەنێ لەشار وەدەربکەوم. با بەتەنێ خۆم بگەیەنمە کەشتی ئاخاییەکان. دەمەوێ دەستەو دامێنی ئەو پیاوە دڵڕەقە ببم. ئێ بەڵکو لەبەردەم هاوڕێکانیا شەرم بیگرێ و بەزەیی بەپیرییەکەمدا بێتەوە .بەخۆیشی بابێکی وەکو منی هەیە ،پیلیوس کە خستیەوە و پەروەردەی کرد تا ببێ بەبەڵای گیانی تەروادەییەکان.. زیاد لە هەمووان ببێ بەبەڵای گیانی من، کە ژمارەیەکی زۆری کوڕەکانی لە هەرەتی لاویدا کوشتم. بۆ کەسیان هێندەی ئەمیان، هیکتۆر، سووم نەخواردووە ونەگریاوم و دڵنیام بەسووی ئەمەوە دەمرم و دەچمە هادیس. بریا لەبەر دەستی خۆماندا دەمرد، هەر نەبوایە من و دایکە کۆست کەوتەکەی تێر بەدڵی خۆ بۆی دەگریاین."

(٤٢٩) بەو جۆرە و بەدەم گریانەوە قسەی دەکرد. تەروادەییەکانی دیکەش گوێ بەگوێی ئەو کەوتنە گریە و زاری .ئەوجا هیکوبا لەنێو ژنانی تەروادەییدا شین و شەپۆڕێکی نایەوە ئەوسەری دیارنەبێ. بەدەم گریانەوە هاواری دەکرد: "ئەی کوڕەکەم، هاوار لە من،ماڵوێران خۆم، چۆن لەدوای تۆ هەڵدەکەم ،چۆن بەم هەموو خەم و ئازارەوە دەژیم، نەمایێ، نەمایێ لە خۆم نەمینم؟ ئەی ئەو کەسەی شەو وڕۆژ لە شارا پێوەت دەنازیم، ئەی قەڵا و پشت و پەنای پیاوان و ژنانی تەروادە، ئەو تەروادەییانەی بەئەندازەی

خوابەت ڕێزیان دەگرتی، لە ژیانا مایەی شانازیان بووی، بەڵام ئێستا لەدوای مەرگی تۆ!.
(٤٣٧) بەدەم ئەو قسانەوە دەگریا، ژنەکەی هیکتۆر هێشتا لە مەرگی مێردەکەی خەبەردار نەبوو بوو ·چونکە هیچ پەیکێکی ڕاستگۆ نەچوو بوو پێی بێ کە مێردەکەی لە دەرێی حەسارە. بۆیە چوو بووە کونی ژوورەوە، پارچەیەکی دووبەری ئەرخەوانی لەسەر خەرەکەکەی بوو، بەگوڵی هەمەرەنگ دەینەخشاند. لە هەمان کاتدا کارەکەرەکانی ڕاسپاردبوو کە مەنجەڵێکی گەورەی ئاو بخەنە سەر ئاگر تا هیکتۆر کە لەشەڕ گەڕایەوە خۆی بەئاوی گەرم بشوات. هەر بەبیریشیدا نەدەهات هیکتۆر بەفیتی ئەتینا ،بەدەستی ئەخیل کوژرابێ! گوێی لە دەنگی شیوەن و گریان بوو کە لە حەسارەکەوە دەهات ،دڵی داخورپا و چوارپەلی کەوتنە لەرزین. خەرەکەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە. ئاوڕێکی دایەوە و ڕویکردە کارەکەرەکانی و گوتی: "دوانتان لەگەڵمدا وەرن بابچم بزانم چ باسە. گوێم لە هاواری خەسووە هێژاکەم بوو.
(٤٥١) خەریکە دڵم بەردەبێتەوە. هێز لە ئەژنۆمدا نەما، لەوە دەچێت بەڵایەکی گەورە بەسەر کورانی پریامدا هاتبێ. خۆزیا خەبەری ناخۆشم نەدەژنەوت! زۆر دەترسم ئەخیلی جوامێر، مێردە ئازاکەی لە لەشکر دابڕیبم، وڕێی گەڕانەوە بۆ شاری لێ بڕیبێ‌و لە دەشتەکەدا دوای کەوتبێ وکوشتبێتی. چونکە ئەو هەمیشە لە پێشی پێشەوە دەجەنگی و مەودای کەسی نەدەدا پێشی بکەوێ!"
(٤٦٠) هەر کە ئەو قسانەی کرد، شێت ئاسا بەدڵە کوتەوە لەماڵ وەدەرکەوت و کارەکەرەکانی دووی کەوتن. کاتێ گەیینە سەر حەسار و نێو حەشاماتە زۆرەکە وەستاو. لە بورجەکەوە ڕوانی، هیکتۆری بینی کە خراوەتە دووی عەرەبانە ولەبەردەم شارا، بەعاردیدا ڕایدەکێشن. ئەسپەڕەهوانەکان بەشێوەیەکی ناشایستە ڕایاندەکێشا وبەرەو کەشتی ئاخاییەکانیان دەبرد بەرچاوی تاریك بوو بەپشتا کەوت و بورایەوە. خشڵە بەنرخەکانی سەری، قردێلەکانی، ئەو تەوقانەی بەزوڵفییەوە بوون، تاجەکەی سەری، ئاشقبەندەکەی هەر هەموو لەو گۆڕە کەوتن. سەرپۆشە ناسك و گرانبەهاکەی چوو بەئاسماندا، ئەو سەرپۆشەی کە لە ئەفرۆدێتی وەرگرتبوو. ئەو ڕۆژە وەریگرتبوو، کە هیکتۆری دلاوەر لە کۆشکەکەی ئیتونەوە، پاش دانی مارەیی و شیربابییەکی زۆر بۆ کۆشکەکەی خۆی گواستبووەوە. دشەکانی وهێوەرژنەکانی خێرا گەیینە سەری و هەڵیانگرتەوە. بەستەزمانە لە سوێیاندا گەیی بووە حاڵی مەرگ. لێ کە ئافاقەی بۆ هات،

وەهوش هاتەوە و ڕوحی هاتەوەبەر، لە ناخی ناخەوە ئاهێکی پڕ سوێی هەڵکێشا و بەدەنگی بەرز کەوتە شین و شەپۆڕ ولەناو ژنانی تەروادەییەوە هاواری دەکرد: "ئەی هیکتۆر، لە خۆم ماڵوێرانێ، لە خۆم نەگبەت و بەدبەختێ! وادیارە ئێمە هەر لە ڕۆژی لە دایکبوونمانەوە یەك چارەنووسمان هەبووە. تۆ لە تەروادەو لە کۆشکەکەی پریامدا لە دایکبووی و من لە تیبە لە بناری چیای پلاکۆسی بەلێرو بێشان، لە کۆشکەکەی ئیتون، کە منی بەساوایی پەروەردە و بەخودان کرد. بابێکی نەگبەت و مناڵێکی نەگبەت تر! بریا سەد بریا منی هەر نەدەبوو! ئەوا تۆ دەڕۆی بۆ هادیس ،بۆ خانەی مردوان، منی بێوەژن لە ماڵەکەتدا بۆ خەم و کەسەران بەجێدێڵی، هێشتا کوڕەکەم ساوایە، کوڕی دایك و بابێکی کڵۆڵ، کوڕی من و تۆی نەگبەت.. ئەوا تۆ ڕۆیشتی هیکتۆر، تازە تۆ ناتوانی هیچی بۆ بکەی، تازە نەتۆ بۆ ئەو دەبی و نە ئەو بۆ تۆ.

(٤٨٦) ئەگەر لە شەڕی پڕ ژان و سوێی ئاخاییانیش دەرباز بێ، ئەوا بەشی هەر کڵۆڵی و نەگبەتی و خەم و کەسەران دەبێت. چونکە بێگانان و دەستداران دەست بەسەر موڵك و ماڵ و وڵاتەکەیدا دەگرن. ئەو ڕۆژەی منداڵ سێوی دەبێت ،بابی لە دەست دەدات، ئیدی هەموو هاوساڵ و هاوتەمەن و برادەرەکانی فەرامۆشی دەکەن.خەڵکی هەتیو هەمیشە سەر نەوی و چاو بەگریانە. هەتیو لە بێنەوایی و بێکەسی خۆیدا ،پەنا بۆ کۆنە دۆستانی بابی دەبات، پاڵتۆی ئەم ڕادەکێشێت و چمکی عەبای ئەویان دەگرێت، خۆ ئەگەر یەکێکیان ڕوحمی بجوڵا و بۆ ماوەیەکی کەم جامێکی بەدیاری بداتێ ئەوا هەر بایی دەم تەڕ کردنێك دەبێ، ناگاتە گەروی و تینویەتی ناشکێنێ. مناڵی بەداك و باب، دەکێشن بەدەستیا و لەسەر نان وخوانی وەدەردەنەن، سەرزەنشتی دەکەن و پێی دەڵێن: "هەرە هەتیو، بابی تۆ هاوخوان و هاوبەزم و مەجلیسی ئێمە نیە!" هەنگێ منداڵەکە چاو بەگریان و فرمێسکان بۆلای دایکە بێوەژنە بێنەواکەی دەگەڕێتەوە. ئەم منداڵە (ئاستیناکس)ی منە. کە بەر لە ئێستا لە باوەشی بابیا، جگە لە مۆخ و گۆشتی ناسکی بەرخ هیچی دی نەدەخوارد! پاشان کە خەو دەیبردەوەو لە قسەی مناڵانە ماندوو دەبوو، لە باوەشی دایەنەکەیدا تێر و پڕ لە خواردنی بەلەزەت ،لەسەر جێگەیەکی نەرم دەنووست. بەڵام ئێستا ئەم (ئاستیناکس)ە بێ بابە، دەبێ چاوەڕوانی هەموو دەرد و مەینەتیەك بێ! تەروادەییەکانیش ئاستیناکس (واتە پاسەوان)یان پێدەگوت، چونکە ئەی هیکتۆر هەر تۆ بوویت کە دەروازە و بورجەکانیانت پاس دەکرد ودەپاراست. کەچی ئێستا لە دووری باب

و دایخەن لای کەشتی ئاخاییەکان کەوتوویت و کرم لە جەستەت دەدات و دوای ئەوەی سەگان تێرت لێ دەخۆن، سەر دەژننە لەشی ڕووت و قووتت.. لە کاتێکا جلوربەرگی زۆر جوانی دەستچن و دەستکردی خانمانت بۆ لە ماڵەوە ئامادەکراوە.. بەڵام هەر ئێستا دەچم، هەموو ئەم جلە جوانانە دەخەمە ئاگرەوە، دەیان سوتێنم چونکە تۆ جارێکی دی لەبەریان ناکەیت.. دەبێ بەیادی سەرفرازی تۆوە لەبەرچاوی پیاوان و ژنانی تەروادەدا بسوتێنرێن.

بەو ئاوایە هیکتۆری دەلاواندەوە و ژنانی تەروادە لەگەڵیا کەوتنە شین و شەپۆڕ.

# سروودی بیست و سێیەم

## پرسە و ڕێورەسمی ناشتنی پاترۆکلۆس

**حیکایەتەکە:**

**دوای ئەوەی ئەخیل جەنازەکەی هیکتۆری بۆلای کەشتییەکان برد، بەرق و کینە و سوکایەتیەوە توڕیدایە ئەو گۆڕە. لێ ئەفرۆدێت بەزەیتی عەنبەر چەوری کرد و لە بۆگەنیی پاراست. داوایان لە ئەخیل کرد کە خوێن و خوڕە مەییوەکەی سەر لەشی بشوات، قایل نەبوو بەر لە جێبەجێکردنی ڕسوماتی ناشتنی هاوڕێ ئازیزەکەی دڵۆپە ئاوێکی بەگیان بکەوێ. داوایان لێکرد کە ڕێورەسمی جەنازە ئەنجام بدرێ، قایل نەبوو تا خوانی ڕەحمەت چێنەکرێت. ئیدی مەڕ و مالاتێکی زۆر سەربڕدرا. خوانێکی گەورە سازکرا. زۆریان لێکرد نان بخوات، نەیخوارد .ئەوجا کەمێکی خوارد. چونکە شەکەت بوو، خەو دایگرت، نووست. تارمایی هاوڕێکەی هاتە خەونی. لێی هاتە پێشێ و گلەیی لێکرد کە وێڕای ئەوەی خۆشی گەرەکە جەنازەکەی بەخۆڕایی ماتەڵ کردووە و نەی ناشتووە. ئاخر ئەمە لەو دنیا دەبێتە مایەی عەزاب بۆی .چونکە تا ڕێورەسمی ناشتنی بۆ نەکرێت، ناتوانێت بچێتە هادیس و هەر وێڵ و سەرگەردان، دەبێ لەبەر دەروازەکانی هادیسدا چاوەنۆڕ بکات تا ڕێورەسمی تەواوی بۆ ئەنجام دەدرێت. تکای لێکرد بەزوترین کات ڕێورەسمی ناشتنی بۆ بکات. ئەخیل بەڵێنیدایە کە بەتەواوەتی ڕێورەسمەکانی جەنازەی بۆ ئەنجام دەدات تا لە خانەی مردواندا، لە هادیسدا ئاسودەبێت. دەستی درێژکرد تا لە ئامێزی بگرێت، چونکە زۆر بەتاسەیەوە بوو، لێ لە هەوا پتری نەهات بەدەستەوە. کە لە خەویش ڕابوو هەروا بوو. بەیانی دەستی بەئەنجامدانی ڕێورەسمەکان کرد. ئاخاییەکان چوون بۆ ئیدا و دار و چل و چێویان هێنا، کەڵەکەیان کرد، (پارتوکلۆس)یان خستە سەر لێژنە دارەکە. ئەخیل قژی خۆی بڕی تا لەگەڵ پاترۆکلۆسدا بیخاتە ئاگرەکەوە و بسوتێ. هەروەها دوانزە لاوی تەروادەییشی سەربڕی تا جەنازەکانیان لەگەڵ هاوڕێکەی خۆیدا بسووتێنێ. ئەمە**

حەکە لە کۆمەڵە ئەسپێکی زۆر.. ئەوجا ئاگریان بە لێژنە دارەکەوە نا . لێ ئاگرەکە پێ نەبوو .ئەخیل لەبەر خواوەندانی با پاڕایەوە کە هەڵکاتە با بەسەر شەوتنگەکەدا (محرقە). لێ خواوەندانی با لە ئاهەنگ بوون. ئیدی ئیریس بەهەشتاو چوو بۆلایان و ئاگاداری کردن. ئەوە بوو با هەڵیکرد و لاشەکەی پاترۆکلۆس سووتێنرا .خۆڵەمێش وئێسك و پروسکەکەی لە ئینجانەیەکی دوو چین خرا، تاوەکو ئەگەر ئەخیل کوژرا و ڕێورەسمی جەنازەی بۆ ئەنجام درا، خۆڵەمێش و ئێسك و پروسکەکەی لەگەڵ هاوڕێکەیدا لەهەمان ئینجانە بکرێ. ڕۆژی دوایی نۆرە هاتە سەر پێشبرکێ و گەمە وەزشیەکان. ئەخیل بەخۆی خەلاتی بەسەر براوەکان و دۆڕاوەکانیشدا دابەش کرد. بەلام هەر کەسە و بەپێی ڕیزی خۆی لە سەرکەوتن و دۆڕاندا . پێشبرکێییەکانی زۆر گەمەی وەکو کێبەرکێی گالیسکە و فایتۆن، بۆکسبازی، زۆرەبانی، قورس هەڵدان، و تیرەندازی...و هتد.تیا بوو.

زەمەن:

ڕۆژی سێیەمی گێرانەوەکە ئێوارێ تەواو دەبێ. لە شەوی سی و یەکەمدا تاپۆ و تارمایی پاترۆکلۆس دێتە خەونی ئەخیل. لە ڕۆژی سی و یەکەمدا دار و چڵ و چێو لە ئیدا دێنن، لە ڕۆژی سی و دووەمدا جەنازەکە دەسوتێنن، لە ڕۆژی سی و سێیەمدا دەست بەگەمە و پێشبرکێ وەرزشیە جۆراوجۆرەکان دەکەن.

شوێن:

گشت بویەرەکان لە ئۆردوگای گریکەکاندا، لە کەناری دەریا ڕوودەدەن.

(١) بەو جۆرە تەرادەییەکان لە سەرانسەری شاردا، خەریکی گریە و زاری بوون. بەڵام ئاخاییەکان کاتێ گەیینەوە هیلسیپونت، لای کەشتییەکان ،بێوەیان لێکرد و هەر کەسە و چوو بۆ کەشتییەکەی خۆی. بەڵام ئەخیل نەیهێشت مورمیدونەکان بێوەی لێبکەن و بڕۆن. ڕویکردە هاورێ گەڕناسەکانی خۆی و گوتی: "ئەی مورمیدونانی سوارچاك، ئەی هاوڕێیانی دڵسۆزم، ئەسپەکان بەرمەدەن، با بە ئەسپ و فایتۆنەکانەوە بچینە دیار پاتروکلۆس و بۆی بگرین. ئەمە هەقی مردووانە. کە لە گریان بووینەوە، هەنگێ نیرەکان لە ئەسپەکان دەکەینەوە و پێکەوە شیڤ دەخۆین."

(١٢) هەر کە ئەو قسەیەی کرد هەموو دەنگی شین و ڕۆڕۆیان لێ بەرزکردەوە. ئەخیل لە پێش هەموویانەوە بوو. سێ کەڕەت بەئەسپە یاڵوبژ جوانەکانیانەوە، بەدەم گریانەوە بەدەوری جەنازەکەی پاتروکلۆسدا سوڕانەوە. تیتیس هێندەی دی کوڵی گریانی هێنانە جۆش. لمی کەنارەکە و چەك و ئەسلەحەی جەنگاوەرەکان لە فرمێسکدا تەڕبوون، بۆ پیاوێکی فرە مەزن و ڕەشید دەگریان. ئەخیل لە بەراییانەوە بوو. لە هەموویان بەکوڵتر دەگریا. هەردوو دەستە خوێناویەکەی نانە سەر سینگی هاورێکەی و گوتی: "بەدوعا پاتروکلۆس، هەرچەند چوویە هادیس بەڵام بێ خەم بە، هەر وادە و بەڵێنێکم پێدابووی، هێناومنە دی: هیکتۆر تا ئێرە بەراکێشان هێنراوە و دەخرێتە بەر کسۆکان تا پارچە پارچەی بکەن و گۆشەتەکەی بەکاڵی بخۆن. لە تۆڵەی کوشتنی تۆدا ،سەری دوانزە لاوی تەرادەیی دەبڕم و دەیانخەمە ئەو شەوتنگەیەوە کە بۆ سوتاندنی لاشەکەی تۆ ئامادەمان کردووە."

(٢٤) بەدەم ئەو قسانەوە دزێوترین ڕەفتاری دەگەڵ هیکتۆری پاکزادا کرد. تیلاوتیل لەسەر ئەرزەکە و لەبەردەم نەعشەکەی پاتروکلۆسدا فرێی دا. ئەوسا هەر کەسە و چەك و ئەسلەحەکەی لەخۆ داماڵی، ئەسپەکانیان لە عەرەبانان کردەوە. بەکۆمەڵ لە نزیکی کەشتییەکەی ئەخیلی لەزگین ڕۆنیشتن،

(٢٩) ئەخیل، خوانی ڕەحمەت و پرسەی بۆ هاورێکەی ساز کرد. خوان بوو نەگاڵتە. چەندین گا چەندین مەڕ و بزن، چەندین بەرازی قەڵە و چەور سەر بڕدرابوون و خرابوونە سەر ئاگری گەشی هیفایستوس ودەبرژان. لە هەموو لایەکەوە خوێن بەچواردەوری جەنازەکەدا دەڕۆیی.

(٣٥) هەنگێ فەرماندە ئاخاییەکان دوای هەوڵ و ڕجا وتکایەکی زۆر. کوڕە لەزگینەکەی

(پیلیوس)یان بۆلای ئاگامەمنونی مەزن برد، یەجگار خەمباری هاوڕێکەی بوو. کە گەیینە لای سەراپەردەکەی، ئاگامەمنون ئەمری کرد، جارچیانی دەنگ بەرز داوایان کرد، کە مەنجەڵێکی گەورەی ئاو بخەنە سەر ئاگر ،بەڵکو بتوانن قەناعەت بەئەخیل بکەن کە خوێنە وشکەوەبووەکەی سەر لەشی بشوات.لێ ئەخیل قسەکەی لە زەویدان، بەدەم سوێند خواردنەوە گوتی: "نا، بەهەقی زیوس، سەروەر و گەورەی هەموو خواوەندان ئاو بێ و بەلەشی من ناکەوێ، تا جەنازەکەی نەخەمە سەر ئاگر و گۆڕێکی بۆ هەڵنەبەستم و قژی خۆمی بۆ نەبڕم –چونکە لە هەمو ژیانما جارێکی دی تووشی خەمی وا نابمەوە. با ئێستا هەرچەندە دڵم پڕ خەمە، لەسەر ئەم خوانی پرسەیە دانیشین. بەڵام تۆش ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی شای جەنگاوەران، فەرمان بدە کە سپێدە زوو لە جەنگەڵەوە دار بێنن، ئاگر بکەنەوە، هەر شتێك بۆ بەڕێکردنی مردوو بۆ هادیس پێویست بێ ئامادە بکرێ، بخرێتە سەر شەوتنگەکە تا ئاگرەکە زووتر پاتروکلۆس و کەلوپەلەکەی بسووتێنێ، لەبەرچاومانی ون بکات و خەڵکەکە بچنەوە سەر کاری خۆیان."

(٥٤) دوای ئەو قسانە، هەموو بەدڵ بەگوێیان کرد. خوان ڕاخرا، شێویان خوارد. خوانەکە بۆ هەموو کەس چوون یەك بوو. هەر کەسەو بەشی خۆی خوارد. ئەوجا هەر کەسەو چوو بۆ خێوەتی خۆی تا ئیسراحەت بکات. کوڕی پیلیوس لە کەناری دەریای بەگێژاو وگێژەنگ، لەسەر لمەکە بەداخ و کەسەرێکی زۆرەوە، لە ناوەندی مورمیدونەکاندا، لە شوێنێکی دیار، کە شەپۆلان سەریان بەکەناری دەریاکەدا دەدا، لێی پاڵکەوت .خەو فریای کەوت و باری خەم و پەژارەی لە کۆڵ کردەوە. چونکە ماوەیەکی زۆر بەدەوری تەروادەی باگردا هیکتۆری ڕاونابوو. لاقەکانی ماندوو بوون. هەنگێ ڕوحی خەمینی پاتروکلۆس هاتە دیاری ،لە ژیانیا چۆن بوو بەهەمان شێوە، بەهەمان بەژن و باڵا و چاوانی جوان و دەنگەوە هاتە خەونی، هەمان جلوبەرگەکەی جارانی لەبەربوو. ڕوحەکە بەدیار ئەخیلەوە وەستا، گوتی:

(٦٩) "ئەی ئەخیل! تۆ بۆ خۆت خەوتوویت و منت لە بیر کردووە.. تا زندوو بووم بەهیچ جۆرێ دەست بەردارم نەدەبووی. بەڵام ئێستا کە مردووم لەبیرت کردووم و هیچ خەمی منت نییە! خێراکە، تازووە ڕێوڕەسمی مەرگم بۆ بەرپا بکە تا لە دەروازەکانی هادیس (خانەی مردووان) دەرباز ببم و ئاودیوبم. ڕۆحەکان کە سایە و سێبەری ئەوانەن کە مردوون و دەرد و ڕەنجیان لەم دنیایە تەواو بووە، لە خۆیانم دوور دەخەنەوە و ڕێگەم

نادەن کە لە ڕوبارەکە بپەڕمەوە و تێکەڵاوی ئەوان ببم. ئەوەتا وێڵ و سەرگەردان، لەبەر دەروازە گەورەکانی هادیسدا بێهودە دەسوڕێمەوە. تکات لێدەکەم فریام کەوە، دەستی یارمەتیم بۆ درێژ بکە، ڕێوڕەسمی شەوتنگەم بۆ ئەنجام بدە تا ئاسودە ببم. چونکە من جارێکی دی لە هادیس نایەمەدەرێ.. لە ئێستا بەدواوە جارێکی دی بەدوو قۆڵی دوور لە هاوڕێ ئازیزەکانمان دانانیشین کە پێکەوە تەگبیر و ڕایان بکەین.. قەدەری زاڵم، ئەو قەدەرەی لە ڕۆژی لە دایکبوونمەوە لە چارەم نووسرا بوو، بۆ خۆی بردمەوە. جا تۆش ئەی ئەخیل ئەی شێوە خوا ،لە چارەت نووسراوە لە بن حەساری تەروادەییانی دەوڵەمەند و نەجیبدا بمریت.

(۸۲) جا داوایەکی دیکەشم لێت هەیە ،ئەگەر لێمی قەبوڵ بکەی. تکایە ئێسک و پروسکەکەم لە ئێسك و پروسکی خۆت دوور مەخەوە و بەجیا دایمەنێ، با لە یەك شوێندا بن. وەکو چۆن پێکەوە لە ماڵی ئێوەدا گەورە بووین، کاتێ کە مینویتیوس لە (ئوبوس)ەوە بۆ وڵاتی ئێوەی هێنام، هەنگێ من منداڵ بووم. بۆیە هێنامی چونکە من منداڵ بووم و بە نەزانستە، بەهۆی هەڵچوونێکی منداڵانەوە لەسەر گەمەی نەدرێن، کوڕەکەی (ئەمفیداماس)م کوشتبوو. پیلیوسی سوارچاك لە ماڵەکەی خۆیدا گلی دامەوە، بەخێوی کردم، کردمی بەئاجودان ومیرئاخوری تۆ.. بۆیە با ئێسك و پروسکی هەردووکمان لەیەك کۆپەڵەدا بێ. لەو کوپەڵە زێڕینە دوو قوڵفەیەدا بێ کە دایکی هەژیت بەدیاریی دایتێ."

(۹۳) ئەخیل بەرسڤی دایەوە: "ئەی ئازیزەکەی دڵم، بۆچی هاتووی بۆ ئێرە و ئەم ڕاسپاردانەم پی دەڵێی؟ من بەخۆم بێ چەند و چوون هەر هەموو ئەو شتانە ئەنجام دەدەم، بەدڵی تۆ دەکەم فەرمانت لە زەوی نادەم. بەڵام تکایە وەرە نزیکترەوە، با بۆ دەمێك یەکتر لە ئامێز بگرین، دەردی هاوبەشی دڵمان بەگریە و ناڵین سووك بکەین."

(۹۹) بەدەم ئەو قسانەوە باوەشی گرتەوە، بەڵام هیچ کەسێك نەهاتە باوەشیەوە. ڕوحەکە وەکو هەڵم ڕەوییەوە و بەناڵە ناڵ خۆی بەژێر زەمیندا کرد. ئەخیل، حەپەسا و سەرگەشتە وبەواقی وڕەوە لە خەو ڕابوو: "سەیرە، کەواتە ڕوح و تاپۆی پیاو لە (هادیس)شدا هەر دەمێنێ، سێبەر و تاپۆکەی دەمێنێ، با ژیانیشی لەبەر نەمێنێ.

(۱۰۵) سەرانسەری ئەم شەوە، ڕوحی پاتروکلۆسی نەگبەت، بەدەم گریە و ناڵینەوە بەدەوری مندا سوڕاوەتەوە، پێی گوتوم کە چی و چی لە پێناودا بکەم، وەکو خۆی بوو، بەموو نەگۆڕ بوو!."

(١٢٨) ئەخیل بەو جۆرە قسەی کرد. ئارەزووی گریانی لای هەمووان بزواند. لەو کاتەدا کە ئەوان سەرگەرمی گریان بوون، سپێدەی بەیان بەقامکانی چوون گوڵیەوە دەرکەوت. شا ئاگامەمنون ئەمری کرد زەلام بەوڵاخەوە لە ئۆردوگاوە دەرکەون، بچن داربێنن، میریونیسی دلاوەری خزمەتکاری ئیدومینیوسی دڵرەحم سەپەرشتی دەکردن. خێرا تەور و کندریان گرتە دەست و بەرەو دارکردن وەرێکەوتن.. هێسترانیان وەپێش دا، هەوراز و نشێو، کوێرە ڕێگا و ڕاستە ڕێگا، گەڵی و نوڵانیان بری. کاتێ گەییبنە گەلی و نواڵە پڕ کانیاو وسەرچاوەکانی ئیدا بەپەلە بە بیور و تەورێن تیژی برونزین کەوتنە برینەوەی داربەڕووانی بەرز و زەلام و چڕە لق و پۆپان، هەر دار بوو بەرمب و هۆڕ دەکەوتە سەر زەوی. ئەوجا ئاخاییەکان لق و پۆپی درەختەکانیان بڕی و داریان دوو لەت کرد و لە دوو هێسترانیان بەست. هێستران بەنێو بێشە و جەنگەڵاندا بەرەو دەشتەکە نشێو بوونەوە. ئیدی دارکەران بەگوێرەی فەرمانی میریونیسی خزمەتکاری ئیدومینیوسی دڵرەحم، یەك یەك بارەکانیان لە کەناری دەریادا، لەو شوێنەدا کە ئەخیل دەست نیشانی کردبوو، داگرت. ئەخیل دەیویست لەو شوێنە گۆڕێك بۆ پاتروکلۆس و خۆی دروست بکات.

(١٢٧) کە بارە دارەکانیان خست، لە جێی خۆی بەجێیان هێشت. لەوێ دانیشتن و چاوەنۆڕ بوون. ئەوجا ئەخیل ئەمری بەمۆرمیدونەکان کرد ،کە هەموو چەك تفاق لەخۆ بدەن و ئەسپان لە فایتۆنان ببەستن. هەموو هەستان و چەك و تفاقی جەنگیان بەست. جەنگاوەران و میرئاخوڕان سواری عەرەبانەکان بوون. لەپێشدا عەرەبانە سواران پێشکەوتن، ئەوجا هێزی پیادە بە هەزاران وەکو هەور دوایان کەوتن.هاورێیانی پاتروکلۆس، لە ناوەڕاستەوە جەنازەکەی پاتروکلۆسیان خستبووە سەرشان، لاشەکەی بەقژی بڕاوی ئەوان داپۆشرا بوو. هەمو لە خەما قژی خۆیان بڕی بوو و دابوویان بەسەر لاشەکەی پاتروکلۆسدا. ئەوجا ئەخیلی مەزن پەیدا بوو، بەهەردوو دەستان سەری دۆستەکەی گرتبوو، بەدڵێکی پڕ خەم و کەسەرەوە، ئەم دۆست و یاوەرە ئازیزەی بۆ گۆڕ، بۆ هادیس، بۆ خانەی مردووان بەڕێ دەکرد.

(١٣٨) کاتێ گەییبنە ئەو شوێنەی کە ئەخیل پێشتر بۆی دیاریکردبوون، جەنازەکەیان داگرت. بەپەلە دارێکی زۆریان کەڵەکە کرد. شەوتنگەکەیان ئامادەکرد. هەنگێ ئەخیلی لەزگین ڕای خۆی گۆڕی. کەمێك لە شەوتنگەکە دوور کەوتەوە. چەپکێك لە قژ زێڕینەکەی، ئازیزترین چەپکە قژی سەری، کە داینا بوو بیکات بەنەزری ڕوباری سبیرخیوس، بڕی.

بەوپەڕی خەمبارییەوە ڕوانیە دەریا تاریکەکە وگوتی: "سیبرخیوس، بابم بەخۆڕایی بەڵێنی بەتۆ دابوو کاتێ من بەسەلامەتی بۆ ماڵی خۆم ،بۆ وڵاتی ئازیزی خۆم گەڕامەوە، قژم لە پێناوی تۆدا ببڕم. بیکەم بەنەزری تۆ، سەد سەر گات بۆ بکەمە قوربانیەکی پیرۆز.. لەوێ لەلای سەرچاوەکانت کە پەرستگە و قوربانگەیەکی بۆنداری تۆی لێیە، پەنجا سەر بەرانت بۆ سەر ببڕم و بیکەمە قوربانی. ئەو پیرە مێرە لە نوێژ و نزاکەیدا ئەو بەڵێنەی دابوو. بەڵام تۆ ئارەزووەکەیت نەهێنایەدی. جا مادامێکی من جارێکی دی هەرگیز ماڵی خۆم نابینمەوە، دەمەوێ ئەم قژەم بەپاتروکلۆسی قارەمان ببەخشم تا لەگەڵ خۆیدا بیبات!".

(١٥٢) دوای ئەو قسانە، چەپکە قژەکەی خستە ناو دەستی هاوڕێ ئازیزەکەیەوە. هەموو ئەوانەی لە نزیکی بوون دەستیان بەگریان کرد. خۆر لە ئاوادابووندا بوو. ئەوان هەر دەگریان ئەخیل چووە لای ئاگامەمنونەوە و گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، لەبەرئەوەی هێزی ئاخاییان زیاتر گوێڕایەڵی تۆن، لە هەموو کەس زیاتر بەقسەی تۆ دەکەن.. زۆریش گریان. ئێستا لە شەوتنگەکە دووریان بخەوە، ئەمریان پێ بکە با ئەوان خەریکی نان خواردن بن. ئێمە، ئەوانەی زیاتر لە پاتروکلۆسەوە نزیکین خەمی ناشتنەکەی دەخۆین. ئەم کارە زیاتر لە ئەستۆی ئێمەدایە باتەنیا فەرماندەکان بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە لەگەڵمان بمێننەوە!".

(١٦١) وەختێ ئاگامەمنونی شای جەنگاوەران گوێی لەو قسانە بوو، بێوەی بەجەنگاوەرەکان کرد و ناردنی بۆلای کەشتییەکان. نزیکانی مردووەکە لەوێ مانەوە. دارەکانیان کەڵەکەی سەریەك کرد. لێژنەدارێکیان بەپانتایی سەد پێ دروست کرد. ئەوجا بەدڵێکی پڕ لە خەم و خەفەت جەنازەکەیان لەسەر ترۆپکی لێژنەدارەکە دانا. ژمارەیەکی زۆر بەران، گای قەڵەوی شاخ پێچاوپێچیان لەبەردەم شەوتنگەکە سەربڕی، کەوڵ و ئامادەیان کرد. ئەخیلی مێرخاس چەوریەکەی لێگرتن. سەراپای جەنازەکەی لە بنی پێیەوە تا تەوقی سەری پێ چەور کرد. ئەوجا حەیوانە سەر بڕاوەکانی لە دەوری (پاتروکلۆس) نایە سەر یەك، ئەوجا دوو گۆزەی جووت قوڵفەی تەژی هەنگوین و زەیتی لەسەر نەعشەکە دانا، بەپەلە چوار ئەسپی ڕەسەنی هەڵدایە سەر شەوتنگەکە و لەناخی ناخەوە ئاهێکی پڕ کەسەری هەڵکێشا. (پاتروکلۆس)ی قارەمان نۆ دانە سەگی هەبوو کە بەرماوەی نان وخوانی ئەویان دەخوارد. ئەخیل دوانیانی سەربڕی و هەڵیدانە سەر

شەوتنگەکە. هەروەها دوانزە لاوی ئەسڵزادەی تەروادەیی دلێری سەربڕی و ئەوانەشی هەڵیدایە سەر لێژنەدارەکە، ڕقێکی وەهای لە دڵدا بوو بەهیچ شتێك دانەدەکوژاوە.

(١٧٧) ئەوجا ئاگری بەلێژنەدارەکەوە نا. ئاگر بڵێسەی سەند و هەرچییەکی دەهاتە بەردەم دەیسوتاند. ئەوجا بەدەم هۆرژنی گریانەوە، بەدەنگی بەرز گازی هاوڕێکەی کرد: "بەدوعا ئەی پاترۆکلۆس، لەودنیا لە مەڵبەند وخانەی مردووواندا ئاسودە وشادبە، من وەعد و بەڵێنەکانی خۆم جێبەجێ کردووە. ئەوە دوانزە لاوی ئەسڵزادەی تەروادەییانی مەزن، هاوکات لەگەڵ لاشەکەی تۆدا دەبن بەخۆراکی ئاگر. بەڵام هیکتۆر! من ئەم کوڕەی پریام ناخەمە ئاگرەوە تا بسووتێ بەڵکو دەیخەمە بەر کسۆکان تا پارچە پارچەی بکەن."

(١٨٤) بەو کەش و فشەوە قسەی دەکرد. لێ کسۆکان نەیانتوانی بوو بچنە سەر لاشەکەی هیکتۆر. چونکە ئەفرۆدێتی کیژی زیوس بەدرێژایی شەو و ڕۆژ پاسی کردبوو. لاشەکەی هیکتۆری بەگوڵاوی خوایی، بەزەیتی عەنبەرین گوڵاوپرژێن کردبوو، تا ئەخیل نەتوانێ بەراکێشان جەستەکەی عەیبدار و بریندار بکات .(ئەپولۆ)ش هەورێکی توندی تاریکی لە ئاسمانەوە ناردبوو بۆ سەر زەوی و سێبەری خستبووە سەر ئەو شوێنەی کە هیکتۆری لێ فرێدرابوو، تا تیشکی هەتاوەکە جەستەی وشك نەکاتەوە.

(١٩٣) بەڵام شەوتنگەکەی پاترۆکلۆس گڕێ نەگرت. ئەخیلی لەزگین بیری لە شتێکی دیکە کردەوە. لە دووری شەوتنگەکە وەستا. کەوتە نوێژ بۆ هەردووك خواوەندی با: بوریاس و زیفیر (بای باکور و بای ڕۆژاوا) زۆریان لەبەر پاڕایەوە، بەڵێنی قوربانی گەورەو بەنرخی پێدان. ئەوجا جامێکی زێرینی بەدەستەوە گرت و وەکو ڕێزلێنان لە هەردوو خواوەندی ناوبراو کەوتە بادە پرژاندن بەسەر عاریدا. لێیان پاڕایەوە کە بەپەلە هەڵکەن تا زووتر مردووەکان لە ئاگرەکەدا بسوتێن و شەوتنگەکە بەلەزگر بگرێ و بڵێسە بسەنێ. ئایریسی گورج و گۆڵ گوێی لە نزا و نوێژ و پاڕانەوەکانی بوو. بەپەلە کەوتەڕێ تا پەیامەکە بۆ بایەکان ببات. بایەکان لەو کاتەدا لەلای (زفیر) سامناك میوان بوون و ئاهەنگی خۆیان هەبوو.ئایریسی تیژڕۆ لەبەر ئاستانە مەڕمەڕیەکەیان وەستا. بایەکان کە ئەویان بینی بەرزە پێ لەبەری هەستان‌وخوڵکیان کرد وە ژوور بکەوێ. لێ دانەنیشت و لە وەڵامیاندا گوتی: "ناتوانم دانیشم چونکە دەبێ بڕۆم بۆ دەڤەری حەبەشیان، بۆ کەناری ئۆقیانوس و دەریا، کە لەوێ قوربانیەکی گەورە، سەد سەر گا بۆ خواوەندانی نەمر دەکرێ، بەشی منیشی تێدایە و دەبێ بەشداری بکەم. بەڵام ئەخیل لە بوریاس و زفیری فەرتەنە ساز

دەیارییەوە، کە دەنگی بژنەون و بەهانایەوە بچن: بەڵێنی قوربانی گەروەیان دەداتێ، ئەگەر کارێکی وەها بکەن ئەو کۆمەدارەی پاتروکلۆسی لەسەر پاڵخراوە، کە هەموو ئاخاییەکان بەدیارییەوە شین و شەپۆڕیانە گڕ بگرێ و بڵێسە بسەنێ."

(٢١٢) هەر کە ئەو قسانەی کرد، لێیداو ڕۆیی. جووتە با بەگڤ و هوڕ هەستان، هەورانیان وە پێش دا. خێرا گەیینە دەریا و بەسەر دەریادا هەڵیانکرد. شەپۆلان لەبەردەمیاندا هاروژان گەیینە مەزرا وکێڵگە ئاواو ئاوەدانەکانی تەروادە. پریاندایە شەوتنگەکە، ئاگر بەقرچە قرچ بڵێسەی سەند و چوو بەئاسماندا. بەدرێژایی شەوەکە لە پەستاو بێ پسانەوە فوویان بەلێژنە دارەکەدا کرد. ئەخیلی لەزگێن بەدرێژایی شەوەکە جامێکی زێرینی جووت قوڵفەی بەدەستەوە بوو، بادەی لە گۆزەیەکی جووت قوڵفەی زێڕین دەردێناو زەویەکەی پێ بادە پرژێن دەکرد و ڕوحی پاتروکلۆسی نەگبەتی گاز دەکردو دەست هەڵگیر نەبوو تا ئەرزەکەی تەواو پاراوکرد. وەکو چۆن کاتێ باوکێك جەستە کوڕە تازە زاواکەی کە بەمەرگی خۆی دایك و بابە نەگبەتەکەی جەرگ سوتاو کردبێ، بەدەم گریانەوە دەسوتێنێ.. (ئەخیل)ش بەهەمان شێوە بەدەم سوتاندنی جەستەی دۆستەکەیەوە دەگریا و بەخەم و پەژاریەکی قوڵەوە بەدەوری نەعشەکەیدا دەخولایەوە.

(٢٢٦) کاتێ ئەستێرەی بەیانی هەڵهات تا هەواڵی هەڵهاتنی ڕۆژ ڕابگەیەنێ، ئەوجا سپێدە بەسەرپۆشە زەعفەرانیەکەیەوە هەڵات و بەپرتەوی خۆی ڕووی دەریای زێرین کرد، ئاگرەکە بەرەبەرە کز بوو تا بەتەواوی دامرکایەوە. ئەوجا جووتە با بەسەر دەریای تراکیەدا، تراکیەی پڕ شەپۆل و بەهارە و هاژەدا، بۆ شوێنی خۆ گەڕانەوە. ئەوسا کوڕەکەی پیلیوس لە شەوتنگەکە دوورکەوتەوە. هیلاك و شەکەت پاڵکەوت، خەوێکی خۆش بردیەوە. بەڵام ئەوانەی لەگەڵ کوڕەکەی ئوتریوسدا بوون، هەموو لە دەوری خڕبوونەوە. هەرا وهەنگامەی وان ئەخیلی بێدار کردەوە. لەخەو ڕاپەڕی و دانیشت، ڕوی تێکردن و گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی سەرانی سوپای ئەخیا، هەوەڵجار لە هەموو لایەکەوە بادە بەشەوتنگەکەدا بکەن تا ئاگرەکە بەتەواوی دەکوژێننەوە .ئەوجا با ئێسك و پروسکەکەی پاتروکلۆسی کوڕی مینویتیوس، بەوردی لە ئێسك و پروسکی ئەوانی دی جیا بکەینەوە و لە شوێنێکی تایبەتدا کۆی بکەینەوە و دای بنەین. ناسینەوە و جیاکردنەوەی ئاسانە ،چونکە لاشەکەی ئەو لە ناوەندی ئاگرەکەدا دانراوە. لاشەی ئەوانی دی، زەلامەکان و ئەسپەکان ،لە قەراخی ئاگرەکەوە و بەبێ تەرتیب لەسەر

یەکدی کەڵەکەکراون. ئێسك و پروسکەکەی لە کوپەڵەیەکی زێڕیندا، لەنێوان دوو چینە چەوریدا هەڵیدەگرین. چینێکیان بۆ من تا ئەو ڕۆژە دێ منیش بەرەو هادیس کۆچ دەکەم. بەهەرحاڵ سەبارەت بەقسنەکەش ،داواتان لێدەکەم خۆتان زۆر ئەزیەت مەدەن و قسنێکی زۆر بەرز دروست مەکەن ،هەر قسنێك بێ هەندێ شایستە بێ و بەس، لەوەودوا ئێوە ئەی ئاخاییان دەتوانن بەرزتر و گەورەتری بکەن، ئێوەی کە دوای من دەمێنن."

(٢٤٩) کوڕی پیلیوس بەو جۆرە قسەی کرد. هەر هەموو بەگوێیان کرد. بادەی سوور و ئالیان بەسەر شەوتنگەکەدا ڕشت. ئاگرەکەیان دامراندەوە .بەدەم گریانەوە خۆڵەمێشەکەیان کەڵەکە کرد و بەرزیان کردەوە. ئێسکە سپیەکانی هاوڕێکەیان لە کوپەڵەیەکی زێڕدا خڕکردەوە ،لە توێی دوو چینە چەوریان نا. ئەوجا کوپەڵەکەیان برد بۆ خێوەتەکەی ئەخیل و بەپارچە کەتانێك داپانپۆشی. ئەوسا دەوری خۆڵەمێشەکەیان نیشانەکرد و لەهەرچوارلاوە هەڵیانکەند، گڵەکەیان بەرزکردەوە. دوای ئەوەی قسنەکەیان تەواو بەرزکردەوە ڕۆییشتن. لێ ئەخیل لە شوێنی خۆیان هێشتنیەوە، بەکۆمەڵ دانیان، ئەوجا ناردی خەڵات و پاداشتەکانیان لە کەشتییەکانەوە هێنا: بریتی بوو لە مەنجەڵ و سێپا و ئەسپ و هێستر و نێر و گاجووتانی ڕەسەن، کەنیزەکانی ناوقەد باریك و ئاسنی خۆڵەمێشی.

(٢٦٢) هەوەڵجار لە عارەبانچییەکانەوە دەستی پێکرد و خەڵاتەکانی دانا. خەڵاتی یەکەم بریتی بوو لە کەنیزەکێکی دەست ڕەنگین و هونەرمەند لەکاری دەستیدا، لەگەڵ مەنجەڵێکی قوڵفداردا کە بیست و دوو پەیمانە بگرێت. خەڵاتی دووەم بریتی بوو لە ماینێکی شەش ساڵەی ئاوس بەجوانوویەك. خەڵاتی سێیەم بریتی بوو لە مەنجەڵێکی سپی جوان کە نۆ پەیمانە بگرێت و هێشتا ئاگری نەبینێ بێ. خەڵاتی چوارەم بریتی بوو لە دوو بار زێڕ، خەڵاتی پێنجەم بریتی بوو لە کوپەڵەیەکی جوانی دوو قوڵفە کە هێشتا ئاگری نەبینی بێ. ئەوجا هەستاو ڕویکردە ئارگۆسییەکان و گوتی:

(٢٧٢) "ئەی کوڕی ئوتریوس، شێرە کوڕانی ئاخاییی.. ئەم خەڵاتانە بۆ پێشبڕکێی گالیسکەکان دانراون. ئەگەر بهاتبایە و ئەم پێشبڕکێیە بۆ ڕێزلێنانی کەسێکی دیکە ساز بدرایا، بێگومان من براوەی یەکەم دەبووم و خەڵاتەکەم بۆ سەراپەردەکەی خۆم دەبردەوە، چونکە بەخۆتان دەزانن ئەسپەکانی من چەند بەهێز و خۆشبەز و ڕەهوانن، چونکە ئەسپانی نەمر و خوایین، پوسیدون دابوونی بەپیلیوسی بابم. ئەویش دانیە من.

بەڵام من و ئەسپەکانم بەشداری ناکەین، چونکە میرئاخوڕ و سایەقێکی یەجگار دلێر و دلڕەحمیان لە دەست داوە، کە زۆرجار پاش ئەوەی بەئاوی زوڵاڵ و ساف دەیشتن، یاڵەکانی زەیت دەکردن تا نەرم و خاو بێ. بڕوانن چۆن وەستاون و لەوێدا دەگرین، یاڵەکانیان شۆڕ بووەتەوە و لە عاردی دەخشێ و خەم خوێناوی جگەریان دەخواتەوە. بەڵام ئێوە ئەی کوڕانی ئاخایی، کێ لەخۆی و لە ئەسپەکانی و لە مکومی گالیسکەکەی رادەبینێ با خۆی ئامادە بکات و بەشداری پێشبڕکێیەکە ببێ.

(٢٨٧) کوڕی پیلیوس بەو ئاوایە قسەی کرد. عارەبانچییەکان هەموو خۆیان ئامادەکرد. یەکەم کەس کە هەستا یومیلوس، رابەری جەنگاوەران و کوڕی ئادەمیتوسی سوارچاك بوو. دوای ئەو (دیومیدس)ی دلێری کوڕی تیودیوس هەستا، ئەسپە ترۆسیەکانی خستنە ژێر نیر، ئەو ئەسپانەی کە رۆژێ لە رۆژان لە ئینیاسی گرتبوون ،ئەو رۆژەی کە ئەپولۆ ئینیاسی لە مەرگ رزگار کردبوو. دوای ئەو کوڕی ئوتریوس، مینیلاوسی قژ زەرد، زادەی زیوس، هەستا دوو بەرزەی خۆشبەزی خستە ژێر نیر، ئیستی، ماینەکەی ئاگامەمنون و (بوداگروس) ئەسپەکەی خۆی. ئەم ماینە (ئافیبولوس)ی کوڕی ئەنخیسیس بەدیاری دابووی بەئاگامەمنون تا چاوپۆشی لێبکات و لەگەڵ خۆیدا بۆ شەڕی ئیلیون (تەروادە)ی نەبات .بەڵکو لە وڵاتی خۆیدا وەمێنێ و بەدیار ئەو هەموو سەروەت و سامانەوە بژی کە زیوس پێی بەخشیبوو. ئەم پیاوە لە (سیکون)ی پان و بەریندا دەژیا.. مینیلاوس، ئەم جووتە بەرزەیەی، کە زۆر تامەزرۆی پێشبڕکێ بوون خستە ژێر نیر.

(٣٠١) ئەنتیلوخۆس، چوارەمین کەس بوو کە هەستاو ئەسپە یاڵوبژ شۆڕ و جوانەکانی لە گالیسکە بەست. ئەنتیلوخۆس کوڕی بێ وێنەی نەستوری بەردەباری کوڕی نیلیوس بوو. ئەسپەکان پەروەردەی ناوچەی پولوس بوون. بابی هەستا ،هەرچەند ئەنتیلوخۆس گەنجێکی زیرەك و بەئاوەز بوو، چەند ئامۆژگارییەکی بەسوودی کرد و گوتی: "ئەی ئەنتیلوخۆس تۆ لە رۆژگاری لاویتدا لەلای زیوس و پوسیدون خۆشەویست بووی. هەموو جۆرە هونەرێکی سوارچاکی و گالیسکە رانیان فێرکردویت. لەم بارەیەوە پێویستییەکی ئەوتۆت بەئامۆژگاری نییە ،چونکە بەخۆت دەزانی چۆن عەرەبانە وئەسپان هەڵدەسوڕێنی و نایەڵی لە خەت دەربچن. بەڵام ئەسپەکانت زۆر خاون، هی جریدبازی نین! بۆیە دەترسم رەنج بەخەسار دەرچیت و هیچ بەهیچ نەکەیت. ئەسپی ئەوانی دی لە هینەکانی تۆ خێراترن. بەڵام بەخۆیان لە تۆ سوارچاك تر نین .جا کوڕی ئازیزم، باش بیربکەوە، ئەگەر

هەموو هۆش و زەبەردەستی خۆت نەخەیە گەڕ، بەتەمای بردنەوەو خەڵات مەبە. هونەر و لێزانی بۆ دارشکێنان پێویست ترە تا لە هێزی بازوو. بەزەبری لێهاتوی و شارەزاییە کە دەریاوان، کەشتییە چاپوکەکەی بەنێو گەرداو و گێژەنگانی دەریادا، دەریای مەنگ و بەسام و تاریکدا داژوێ و ڕێنوێنی و ڕابەرتی دەکات و دەرباز دەبێت.. هەروەها گالیسکەڕانیش، بەلێزانی و شارەزایی دەیسەلمێنێ کە گالیسکەڕانی چاکە و لە خەڵکی تر باشترە.. باشترە لەو کەسەی کە پشت بەئەسپەکانی و عەرەبانەکەی دەبەستێ، بێ هیچ حسابێك بەملاو و بەولادا دەڕوات، ئەسپەکانی لە ڕێگە لادەدەن و ناتوانێ کۆنترۆڵیان بکات و بەرەو ئامانج ئاڕاستەیان بکات..

(٣٢٤) بەڵام گالیسکەڕانی لێزان و شارەزا چەند ئەسپەکانیشی خاو و خراپ بن، هەمیشە چاو دەبڕێتە ئامانجی پێشبرکێیەکە، لە خەت دەرناچێت ،بەنزیکی ئامانجدا دەسوڕێتەوە، هەرگیز ئەوە فەرامۆش ناکات کە ئەرکی گەروەی ئەوەیە بەزەبری جڵەوی چەرمەگایان. ئەسپەکانی کۆنترۆڵ بکات و هەمیشە ئەو جڵەوەی لە دەستدا بێت و چاوی لەو پیاوەبێ کە لە پێشبرکێیەکەدا کەوتووەتە پێشیەوە.. جا گوێ بگرە با نهێنییەکت پێ بڵێم و لە بیرت نەچێت: قەدی دارێکی وشکەوە بوو یا دار بەڕووە یان کاژە کە بەئەندازەی باڵا زەلامێك دەبێت لە مەیدانی پێشبرکێیەکەدایە، هێشتا باران نەیرزاندووە، دوو کێلە بەردی سپی لەمبەر و لەوبەریا، بەرانبەر بەیەکدی لە عاردەکە لە فولکەی سوڕانەوەی عەرەبانەکاندا چەقێنراون. مەیدانەکەی دەوریان ئەرزێکی تەخت و ڕاستانیە جا ئەمە یان گۆڕی کەسێکە کە لە زەمانی کۆندا مردووە یان مەیدان و تەوەری پێشبرکێی گەلانی کۆن و دێرین بووە و ئەخیلی مەزن هاتووە کردویەتی بەتەوەر و فولکەی ئەم پێشبرکێیە و کردویەتی بەو نیشانەیەی کە دەبێ عەرەبانەکان بەدەوریا بسوڕێنەوە. عەرەبانە و ئەسپەکانت بەنزیکیا لێ بخوڕە. لەسەر عەرەبانە مکومەکەتەوە، خۆت کەمێك بەلای چەپی ئەسپەکاندا دابنەوێنە، ئەسپی دەستەڕاست بەرقامچی بدە، دەنگی بدە و جڵەوەکەی بۆ شل بکە. بەڵام ئەسپی دەستە چەپ با ئەوەندە لە نزیکییەوە (کێڵە بەردەکان) بڕوات پێت وابێ، تەگەرە مکومەکەی لێی دەخشێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا ئاگات لێ بێ لە کێلە بەردەکە نەدەی نەبا ئەسپەکانت زامدار بن و گالیسکەکەت تێکبشکێ! جا کوری خۆم، بەو جۆرە بیربکەوە و ئاگاداربە، چونکە ئەگەر بەباشی بەدەوری بەردەکەدا پێچت کردەوە ،هیچ کەسێك ئیدی ناتوانێ پێت بگات. یان لێت تێپەڕێ، تەنانەت ئەگەر ئەوەی دواتەوە

گەردوونی ئاسمانی نەژادی لەژێردابێ، ئەو ئەسپە ڕەهوانە خوشبەزە ئاسمانی نەژادەی کە بە (ئەدراستورس) بوو. یان ئەسپەکانی لاومیدون کە باشترین ئەسپێن دەڤەرەکەن لە دواتەوە بێن."

(٣٤٩) کاتێ نەستوری کوڕی نیلیوس قسەکانی تەواو کرد، گەڕایەوە و لە شوێنی خۆی دانیشتەوە .پێنجەمین کەس کە هەستا میریونیس بوو. ئەسپە یاڵوبژ جوانەکانی لە گالیسکەکەی بەست. ئەوجا پێشبڕکێچییەکان هەموو سواری عەرەبانەکانیان بوون. پشکیان خستە کێوخودێکەوە. ئەخیل کێوخودی بادا. قورعە کێشرا. یەکەم ناو ئەنتیلوخۆسی کوڕی نەستور دەرچوو. دوای ئەو شایومیلوس ،ئەوجا مینیلاوسی کوڕی ئوتریوس کە بەڕمبازی بەناوبانگ بوو، ئەوسا میریونیس. دواناو ناوی دیومیدیوسی کوڕی تیدیوس بوو، کە لە هەموویان شایستەتر بوو. ئەوسا هەموو بەگوێرەی قورعەکێشییەکە بەعەرەبانەکانیانەوە لەسەر هێڵەکە ڕیز بوون. ئەخیل ئەو فولکەیەی نیشاندان کە دەبووا بەدەرویا بسوڕێنەوە. شوێنێکی دوور بوو. کەوتبووە قوڵایی دەشتەکەوە. ئەوسا فینکوسی هاواتای خوداوەندان، کە خزمەتکاری بابی بوو دانا .تا وەکو داوەر سەرپەرشتی پێشبڕکێیەکە بکات و بەڕاستی و دادپەروەرانە گەواهی بدات کە کێ براوە و سەرکەوتووە.

(٣٦١) ئەوجا هەموان لەیەك کاتدا ئەسپەکانیان بەر قامچی دا. جڵەوەکانیان گرتە دەست و بەدەنگی بەرز دەنگیان دان. ئەسپەکان بەهەشتاو بەدەشتەکەدا دەرپەڕین و لە کەشتییەکان دوورکەوتنەوە. گەرد و تۆزێکی وەها لەژێر پێیانەوە هەڵدەستا، لەتۆ وایە هەورە یان گێژەڵوکەیە. یاڵەکانیان بەدەم باوە سەمای دەکرد.عەرەبانەکان جاری وابوو بەزەویدا دەڕۆیشتن و جاری وابوو بەرز دەبوونەوە و لەتۆ وایە دەفڕن. هەر سوارەش بەسەر عەرەبانەی خۆیەوە دڵی لەسەر سەد لێی دەدا و تاسەمەندی بردنەوە بوو. هەر کەسە و دەنگی ئەسپی خۆی دەدا و ئەسپەکان وەکو تەیر بەو دەشتەدا دەڕۆییشتن و گەردەلولی تەپوتۆزیان لەدووی خۆ هەڵدەستان.

(٣٧٣)لەوکاتەداکە ئەسپە خۆشبەزەکان لەڕێگای گەڕانەوەدادواقۆناغی پێشبڕکێیەکەیان، بەرەو دەریای زیوین دەبڕی، هەر سوارچاك بوو بەسیمای پڕ هەڵچوونەوە، ئەسپەکانی ناچار دەکرد بەوپەڕی تواناوە تاو بدەن. یەکسەر ئەسپە ڕەهوانەکانی کوڕی فیریس لەچوار ناڵەیان داو کەوتنە پێشی پێشەوە، لەدوای ئەوانەوە بە مەودایەکی زۆر کەم

ئەسپەکانی دیومیدس کە لە ڕەچەڵی تروس بوون، دەهاتن. لەتۆ وایە ئەم جووتە ئەسپە ئێستا نا تۆزێکی دی خۆ هەڵدەدەنە سەر گالیسکەکەی یومیلوس. هەناسەیان دەیدا لە پشت و هەردوو شانە پانەکەی ئەو و هێندەی دی گەرمیان دادەهێنا. ئەم ئەسپانە سەریان نابوو بەعەرەبانەکەی ئەوەوە و ڕێگاکە خۆی لەبەریان نەدەگرت. کوڕی تودیوس خەریك بوو پێشی دەکەوت یان دەگەییە شان بەشانی و ئاکامی پێشبڕکێیەکە بەمۆلەقی وەمێنێ، ئەگەر ئەپولۆ لێی نەغەزریبا و قامچییەکەی لەدەستی بەرنەداباوە.. کوڕی تودیوس لە داخا گریا. کە دەبینێ ئەسپەکانی لە جاران پتر و خێراتر تاو دەدەن و دەڕۆن و ئەسپەکانی ئەو بەسستی و خاویو بێ قامچی ڕێدەکەن. بەڵام ئەتینا کە ئەم فێڵەی ئەپولۆی بینی دەرهەق بەکوڕی تیودیوس، خێرا دوای ڕابەری سوپا کەوت و جارەکی دی قامچیەکەی دایەوە دەستی و هێز و گوڕی وەبەر ئەسپەکانی خست. ئەوجا بەتوڕەیی دوای کوڕەکەی ئەدمیتوس کەوت و نیری ئەسپەکانی شکاند. هەردوو ئەسپەکەی لە خەت دەرچوون و هەریەکەیان لەلایەکدا دەڕۆیی. مژانی عەرەبانەکە کەوتە عاردی. یومیلوس خۆی لە عەرەبانەکە هەڵدایە خوارێ. هەردوو ئانیشك ودەم و لوتی ڕوشان، نێوچەوانی لەسەرو برۆیەوە شکا. هەردوك چاوی تەژی ڕوندك بوون و دەنگی نوسا. ئیدی کوڕەکەی تیودیوس ئەسپە سم تیژەکانی زیاتر تاودا، پێشی هەموو ئەسپەکانی دی دایەوە. چونکە ئەتینا گوڕ و تینی دابووە ئەسپەکانی و سەرکەوتنی بەو بەخشی.

(٤٠١) مینیلاوسی قژ زێڕین، کوڕی ئوتریوس لەدوای ئەوەوە دەهات. لێ ئەنتیلوخۆس ئەسپەکانی بابی دەنگ دەدا و دەیگوت: "دەی، خێراکەن، توندتر بڕۆن. من داواتان لێناکەم ئەسپەکانی کوڕی تیودیوس بۆڕ بدەن، چونکە ئەتینا گوڕێکی تازەی پێ بەخشیون و سەرکەوتنی بەڕابەرەکەیان داوە. بەڵام خێرا بگەنە ئەسپەکانی کوڕی ئوترویوس .ئەوان بۆڕ بدەن دوایان مەکەون، ڕەتیان بدەن ،دەنا ئیتی کە ماینێکە بەو ماینایەتیەی خۆیەوە گاڵتەتان پێدەکات. حەیاتان دەچێت، شەرمەزار دەبن. دەیسا ئەی ئەسپە ئازاکانی من بۆچی دوا دەکەون؟ با ئەوەتان پێ بڵێم، دڵنیابن ئەگەر دوابکەون ،نەستوری ڕابەری جەنگاوەران لێتان دەرەنجێ، چیتر ڕاتان ناگرێ، تیمارتان ناکات. دەتانکات بەتێشووی شمشێر ،ئەگەر تەمەڵی بکەن و یەکێك لە خەڵاتەکان با کەم بایەخیش بێ نەبەینەوە. کەواتە هێز بدەنە خۆ، تا دەتوانن غاردەن، خێراکەن من بەڵێنتان دەدەمێ ئەگەر ئێوە بەگوێم بکەن، هەر کە گەیینە ڕێگا تەنگەکە خۆ بەبەینی هەردوکیاندا دەکەین و پێشیان

دەدەینەوە و ئەم دەرفەتە لە دەست خۆ نادەین.

(٤١٧) دوای ئەو قسانە، ئەسپەکان لە سەرزەنشتەکانی خاوەنەکەیان ترسان. بۆماوەیەکی کورت گوڕیان بەستەوە ،لە جاران خێراتر رایان دەکرد. ئەنتیلوخۆسی قارەمان خێرا شوێنێکی تەنگی لەسەر ڕێگا چۆڵەکە بەدی کرد. ئەرزەکە دادڕا بوو. ئاوی باران بەشێکی ڕێگاکەی دڕی بوو. ڕێگە کە بوو بوو بەکەندرێکی ترسناك. مینیلاوس بەو ئومێدەی هیچ کەسێکی دی لە بەشدارانی پێشبڕکێیەکە نەیگەنێ و خۆ لە عەرەبانەکەی نەخشێنن و یەکەم بێ ئەو ڕێگە خراپەی گرتەبەر. بەڵام ئەنتیلوخۆس ئەسپە سم تیژەکانی لە ڕێگەکە لادا ،بۆ ماوەیەکی کەم کەوتە شان بەشانی. کوڕی ئوتریوس ترسا وهاواریکرد: "ئەنتیلوخۆس، شێتانە ئەسپەکانت داژۆی. جڵەویان بگرە.. ڕێگەکە لێرەدا تەنگە، کەمێك سەبر بکە تا ڕێگەکە پان دەبێ، ئەوجا بۆت هەیە لە من ڕەت بی. بەڵام لێرەدا ناتوانی لەمن ڕەت بی، دەترسم خۆت بەعارەبانەکەی مندا بدەیت و هەردوکمان تیابچین."

(٤٢٩) لێ ئەنتیلوخۆس وەکو ئەوەی گوێی لە قسەکانی ئەو نەبووبێ قامچی لە ئەسپەکانی خستە کار و زیاتری تاودان، بەئەندازەی قورس هاوێژێك کە گەنجێکی بار بۆ تاقیکردنەوەی هێزی خۆی هەڵیدەدا، شان بەشانی یەك ڕۆییشتن. ئەوسا ئەسپەکانی کوڕی ئوتریوس کەوتنە دوا، مینیلاوس بەئانقەست ئەسپەکانی خاو کردەوە. لەوە دەترسا نەبا ئەسپە سم تیژەکان لە ڕێگە بەیەکدا بدەن و عەرەبانە مکومەکان وەرگەڕێن و هەردوو سوارەکەش ببنە قوربانی هەڵپەی شێتانەی سەرکەوتن. هەنگێ مینیلاوسی قژزەرد کەوتە جنێودان و گوتی: "ئەنتیلوخۆس هیچ بەشەرێك بەقەد تۆ گێو و خاپینۆك نییە، برۆ خێر نەیەتە ڕێت ،ئێمە ،ئاخاییان بەخۆڕایی تۆمان بەئاقڵمەند و دانا دەزانی، برۆ بەم هەموو فرو فێڵەشەوە ناتوانی خەڵاتەکە بەدەست بێنی، مەگەر سوێند و بەڵێنەکەی خۆت پێشێل بکەی!

(٤٤٢) دوای ئەو قسانە ئەسپەکانی دەنگ داو گوتی: "من ئەمرتان پێ دەکەم کە سارد مەبنەوە، خەمتان نەبێ، دڵ لە دڵ مەدەن. لاقی ئەو ئەسپانە بەر لە ئێوە ماندوو دەبن. چونکە ئەو گوروتینی لاوییەی ئێوەیان نییە."

(٤٤٦) جووتە ئەسپ لە ترسی سەرزەنشتی خاوەنەکەیان گوڕیان بەستەوە و زۆر زوو گەیینە نزیکی هەڤرکەکانیان.

(٤٤٨) ئارگۆسییەکان لە شوێنی خۆیان دانیشتبوون و دەیانڕوانیە ئەو ئەسپانەی کە وەکو باڵدار بەناو تەپوتۆزی ژێر پێی خۆیاندا دەشتەکەیان دەبڕی. ئیدومینیوس، سەرکردەی

کریتییەکان یەکەم کەس بوو کە ئەسپەکانی بینی، چونکە ئەو لە دەرێی مەیدانەکە، لە شوێنێکی بەرزدا دانیشتبوو. لەو بەرزیەوە مەیدانی غارغارێنەکەی بەباشی دەبینی. هەرچەندە دیومیدوس زۆر لێوەی دوور بوو، گوێی لە دەنگی بوو کە ئەسپەکانی دەنگ دەدا، ناسییەوە. هەروەها ئەو ئەسپەشی ناسییەوە کە لە پێشی پێشەوە تاوی دەدا ،سەراپای خەنەیی بوو، خاڵێکی سپی بازنەیی چوون مانگ بەتەوێڵیەوە بوو. لەجێی خۆی هەستا، رویکردە ئاخاییەکان و گوتی: "برادەران، رابەران و دەمراستانی ئارگۆسیان! ئایا هەر من ئەسپەکان دەبینم یان ئیوەش دەیان بینن؟ وام دێتە بەرچاو ئەو ئەسپانەی کە لە پێشەوە تاو دەدەن، ئەو جووتە ئەسپە نین کە پێشتر لە پێشەوە بوون.. هەروەها گالیسکەرانەکەش ئەوەی یەکەمجار نیە. بێگومان جووتە ئەسپەکەی پێشوو لە رێگە دەرچوون. دەبێ شتێکیان بەسەر هاتبێ. تا لە فولکەکەش سورانەوە هەردەم بینین، کەچی ئێستا لە هیچ شوێنێکەوە دیارنین. هەرچەندە هەموو شوێنەکانمان لێوە دیارە، سەرانسەری دەشتی تەروادە دەبینم. تۆ بڵێی جڵەوەکە لە دەستی گالیسکەرانەکە بەربوو بێ و نەیتوانی بێ لەکاتی سورانەوە بەدەوری فولکەکەدا ئەسپەکان کۆنترۆڵ بکات و لەو سورانەوەیەدا بەختی یار نەبووبێ؟ پێموایە دەبێ لە گالیسکەکەوە کەوتبێ، گالیسکەکە شکابێ و ئەسپەکان لە ترسا رەوی بووبنەوە و لە رێگە لایاندابێ .بەهەرحاڵ وەرن بەخۆتان سەیر بکەن وادیارە من بەتەواوەتی بۆم جیاناکرێتەوە. بەڵام پێموایە ئەو کابرایە ئیتولییە، یەکێکە لە فەرماندە ئارگوسییەکان ،دیومیدوسی دلێر و چابك سوار، کوری تیدیوسە."

(٤٧٣) ئەجاکسی چاپوك ،کوری ئولیوس، بەروویا هەڵشاخی و گوتی: "ئیدومینیوس، ئەم چەنە چەنە چییە؟ ماینەکان هێشتا دوورن و بەراکردن دەشتەکە دەبرن. خۆ تۆ گەنج نیت و چاوت لە چاوی خەڵکانی دی تیژتر نین. کەچی تۆ بەردەوام دەبزرکێنی.. و چاوت ئەو حوکمەی نیە.

(٤٧٨) تۆ هەقی ئەم وراوە گۆییەت نیە .چونکە خەڵکی دی لێرەن و چاویان لەتۆ تیژترە. ئەو ئەسپانەی لە پێشەوەن هەر هەمان ئەوانەی پێشترن.. ئەسپەکانی (یومیلوس)ن بەخۆیشی لەسەر عەرەبانەکە ،جڵەو بەدەست دانیشتووە و وادێ."

(٤٨٢) سەرداری کریتییەکان زۆر لە قەڵس بوو هەڵیدایە و گوتی: "ئەی ئەجاکس، ئەی جنێو فرۆشی کینە لە دڵ. تۆ هەرگیز رایەکی پەسەند و بەجێت نەبووە.. لەبەر کەللە

ڕەفی و سەرسەختی خۆت لە هەموو شوێنێکدا قرەی ئارگۆسییەکان بوویت. ئەگەر ڕاست دەکەیت وەرە من ئامادەم گرەوت لەگەڵدا بکەم، لەسەر سێپایەك یان مەنجەڵێك، بەمەرجێ هەردووکمان ئاگامەمنونی کوڕی ئوتریوس بکەین بەداوەر و ئەو بڕیار و بدات کە کام ئەسپانە لە پێشەوەن هەنگێ دەزانی چۆن دۆڕانێك دەدۆڕێی!"

(٤٨٨) هەرکە ئەو قسانەی کرد، ئەجاکسی چابوك، کوڕی ئەلیوس، بەپشم و غەزەبەوە ڕابوو تا بەقسەی سارد و سوك دەمکوتی بکات .خۆ ئەگەر ئەخیل لێیان هەڵنەستابا و ئەم قسانەی پێ نەگوتبان، بێگومان کێشەکەیان تەشەنەی دەکرد و درێژەی دەکێشا: "وازلە هەرا و ئاژاوە بێنن ئەی ئەجاکس و ئیدومینیوس ،ئەمە کارێکی جوان نیە ،ئەگەر خەڵکی تر ئەم قسانەی کردبا ئێوە بەخۆتان لۆمەتان دەکرد: لە شوێنی خۆتان دانیشن و تەمەشا بکەن ،ئەسپەکان کە لەڕای سەرکەوتندا ململانێ دەکەن، بەو زووانە دەگەنە ئێرە. هەنگێ هەردووکتان دەزانن کە لە نێو ئەسپانی ئەرگۆسیدا کامەیان زووگەییوەتە جێ و کامیان درەنگ.."

(٥٠٠) هێشتا لەو قسانەدا بوو کە کوڕەکەی تیودیوس نزیکبووەوە، بەقامچی بەر بوو بووە شانی ئەسپەکانی، بۆی دەرچوون و وەکو باڵدار ڕێگاکەیان دەبڕی. هەر گەرد و تۆز بوو و دەنیشتە سەر شان و ملی سایەقەکە و گالیسکە قورسەکەیان –بەزێڕ و برونز- بەخێرایی بەدووی خۆدا ڕادەکێشا. هێندە خێرا بوو، جێ تەگەرەکانی بەئاستەم لەسەر گڵە نەرمەکە دەردەکەوت .ئەسپەکان چی وایان نەمابوو باڵ بگرن. دیومیدیس لە گالیسکە ڕەخشانەکەیەوە لە ناوجەرگەی حەشامەتەکەدا خۆی هەڵدایە سەر زەوی. قامچییەکەی کرد بەنێری ئەسپەکاندا، ئارەقە لە مل و بەرۆکی هەردوو ئەسپەکەوە زەنگۆڵ زەنگۆڵدەچۆڕایە سەر ئەرزەکە .ستینیلوسی کارامە و دلێر بەهیچ جۆرێ ماتەڵ نەبوو. بەڵکو یەکسەر خەڵاتەکەی وەرگرت و یاوەرە ئازاکانی ڕاسپارد کە کەنیزەکەکە و مەنجەڵە قوڵفدارەکە ببەن، ئەوجا بەخۆی نیرەکەی لە ئەسپەکان کردەوە و لە عەرەبانەکەی بەردان!

(٥١٤) لەدوای ئەو، ئەنتیلوخۆس، زادەی ئیلیوس بەخۆ و جووتە ئەسپەکەیەوە دەهات. هەڵبەتە بەفێڵ وزیرەکی کەوتبووە پێش مینیلاوس نەك لە سۆنگەی چابوکی ئەسپەکانیەوە. بەهەرحاڵ مینیلاوس ڕێك ڕاستەوخۆ لەدوای هەڤرکەکەی خۆیەوە بوو. ڕێك بەو ئەندازەیە کە کاتێ ئەسپ بەهەشتاو غار دەدا و خاوەنەکەی بەسەر عەرەبانەکەوەیە و بەدەشتدا ڕایدەکێشێت، لە تەگەری عەرەبانەکەوە دوورە، سەری کلکی لە عەرەبانەکە دەخشێ

(میریونس)ش هەر ئەوەندە لە ئەنتیلوخۆسی جوامێرەوە دوور بوو. مینیلاوس هەوەڵجار بەئەندازەی قورس هاوێژێك لە دواوە بوو. بەڵام ئەنتیلوخۆس زۆر زوو پیاگەیشتەوە، چونکە ماینە یاڵوبڕ جوانەکەی ئاگامەمنون، ئیتی، سات بەسات پتر تاوی دەدا و ڕێگە خۆی لەبەر نەدەگرت. خۆ ئەگەر ڕێگاکە یەك تۆزی دی درێژبوایە ئەوا پێشی دەکەوتەوە و مینیلاوس بێ چەند و چون براوە دەبوو. بەڵام میریونیس، خزمەتکارە ئازاکەی ئیدومینیوس هەر ڕمهاوژێك لەدوای (مینیلاوس)ەوە بوو. ئەسپە یاڵوبڕ جوانەکانی لە هەموو ئەسپەکانی دی خاوتر بوون و بەخۆیشی لە هەموو گالیسکەڕانەکانی دی نەشارەزاتر بوو. کوڕەکەی ئەدمیتوس لەدوای هەمووانەوە بەلەقەلەقی ئەسپان و بەتەقەتەقی عارەبانە دەهات. کە ئەخیلی لەزگین بەو حاڵەوە بینی، بەزەیی پێدا هاتەوە. هەستاو لەنێو ئارگۆسیەکانەوە ڕووی تێکرد وگوتی: "باشترین سوارچاك کەوتووەتە دوای هەمووانەوە. بەڵام باخەڵاتێکی شایستەی بدەینێ، خەڵاتی دووەم.. با خەڵاتی یەکەمیش بۆ کوڕی تیودیوس بێ!"
(٥٣٩) هەموو ئاخاییەکان بەپێشنیاز و داوەرییەکەی قایل بوون و ستایشیان کرد. (ئەخیل)ش بەستایشەکەی ئەوان پشت گەرمتر بوو. دەیویست ماینەکە بەم سەرکردەیە ببەخشێت. لێ ئەنتیلوخۆسی مێرخاسی کوڕی نەستور، بەرپەرچی ئەخیلی دایەوەوداوای هەقی خۆی دەکرد: "ئەی ئەخیل، ئەگەر ئەو قسەیە جێبەجێ بکەی زۆر تورە دەبم .چونکە ئەمە لەسەر حسابی منە، دەتەوێ خەڵاتەکەی من نەدەی، چونکە پێت وایە عەرەبانە و ئەسپەکانی یومیلوس وێڕای تەردەستی لەکاردا تووشی ڕووداوێکی خراپ بوون. بەڵام ئەو دەبووایە لە خواوەندان بپاڕێتەوە کە نەبێ بەدوا کەسی پێشبڕکێچییەکان .بەهەرحاڵ ئەگەر تۆ دڵت پێی دەسوتێت و خۆشت گەرەکە خێوەتەکانی تۆ ئەگەر بڕوخێن بەسەر زێڕ و برونز و پەز و کەنیزەکان و هەسپێن چاکدا دەڕوخێن، جا ئەگەر تۆ بەتەمای ئاخاییان ئافەرین و ستایشت بکەن، بڕۆ بەکەیفی دڵی خۆت لەو هەموو سەروەت و سامانەی بدەیە، یان خەڵاتێکی زۆر لەوەی من باشتری بدەیە. بەڵام من دەستبەرداری ماینەکە نابم و ڕازی نیم بەکەسێکی دیکە بدرێ. هەر کەسێك بیەوێ ئەو ماینەم لە دەست دەربێنێ ئامادەم خۆمی لەتەکدا بگۆڕمەوەو بابێتە مەیدان."
(٥٥٥) ئەخیلی مەزن بزەیەکی بۆ کرد .قسەکەی ئەنتیلوخۆسی لەبەرگران نەبوو .چونکە هاوڕێی نزیك و دڵسۆزی بوو، بۆیە ڕووی تێکرد و بەڕاشکاوی گوتی:
(٥٥٨) "ئەی ئەنتیلوخۆس! مادامێکی تۆ داوا دەکەی کە لە سەروەت و سامانی خۆم

خەڵاتێکی دی هەڵبژێرم و بەیومیلوسی بدەم، من قسەت لە عەردی نادەم .ئەو زرێیەی کە لە (ئەستیروبایوس)م گرت، کە لە برونزی خالیسەیە و بەقوڕقوشمی بریقەدارنەخشێنراوە، ئەوەی دەدەمێ کە دیارییەکی شایستە و گران بەهایە و هەر قابیلی ئەوە."

(٥٦٣) هەر کە لە قسەکەی بووەوە، ئەمری بە ئەوتومیدونی هاوڕێی دڵسۆزی کرد، بچێ لە خێوەتەکەی بیهێنێ. خێرا چوو و هێنای. دای بەیومیلوس. ئەمیش بەخۆشحاڵیەوە وەریگرت.

(٥٦٦) ئەوسا مینیلاوس لەجێی خۆی هەستا. یەجگار قەڵس و نارەحەت بوو. لە ئەنتیلوخۆس قەڵس بوو. یەکێك لە خزمەتکارەکانی گۆچانی فەرمانڕەواییەکەی دایە دەستی و ئارگۆسییەکانی بێدەنگ کرد. ئەوجا مینیلاوس خواوەند ئاسا هەڵیدایە و گوتی: "ئەنتیلوخۆس خۆ تۆ جاران پیاوێکی بەئاوەز بووی، ئەم قۆڕیاتە چیە دەستت داوەتێ؟ تۆ سوکایەتیت بەمن کرد، تۆ بەفێڵ پێش ئەسپەکانی منت دایەوە. چونکە ئەسپەکانی تۆ لەگەڵ ئەسپی مندا دەرنابەن .جا سەران و حەکیمانی ئارگۆسی وەرن ئێوە دادپەروەرانە داوەریمان بکەن. پشتیوانی لە کەسمان مەکەن. تادوایی یەکێك لە جەنگاوەرانی ئاخایی قوت نەبێتەوە و نەڵێت: "مینیلاوس بەفێڵ و دەهۆیان، بەسەر ئەنتیلوخۆسدا سەرکەوت، بەنەهەق ماینەکەی بردەوە. ئەسپەکانی ئەو لە هینەکانی ئەنتیلوخۆس لە پاشتر بوون، بۆیە خەڵاتەکەیان دایە چونکە لەناو ئاخیاندا پلە و پایەی زیاترە" نەخێر من خۆم حەقیقەتەکە ئاشکرا دەکەم و حوکم دەدەم حوکمێکی دادوەرانەی وەها دەدەم کە هیچ داناییەك لۆمەم نەکات.بەهەرحاڵ ئەنتیلوخۆس، زادەی زیوس، هەستە وەرە ئێرە بەگوێرەی ڕێوڕەسم و عادەتی باو لەبەردەم عەرەبانە و ئەسپەکانت بوەستە، ئەو قامچییە باریك و نەرمەی کە ئەسپەکانت پێ داژۆت بەدەستەوە بگرە، سوێند بەپۆسیدونی خێوی زەوی و بومەلەرزە بخۆ کە تۆ بەئانقەست و بەفێڵ و دەهۆ ڕێگەت لە من نەبەستەوەو پێشت نەدامەوە."

(٥٨٦) ئەنتیلوخۆسی دورئەنێش لە وەڵامیدا گوتی: "بمبەخشە ئەی مینیلاوس پاشا، من چ بەساڵ و چ بەپایە و ئازایەتی زۆر لەتۆ بچووکترم. تۆ بەخۆت دەزانی خەڵکانی گەنج کەم ئەزموون و سەرکێشن. تۆ دڵت گەورە بێ ،سینگت فراوان بێت، ئەو ماینەی کە بردومەتەوە بەخوایشتی خۆم دەتدەمێ. خۆ ئەگەر لەوەش زیاترت دەوێ لە ماڵ و سامانی خۆم چیت بوێ من لە خزمەتت دام. بەدەستی خۆم پێشکەشتی دەکەم. ئەمەم باشترە لەوەی

لەبەرچاوی تۆ بکەوم، لە حوزوری خواوەندان درۆزن و تاوانبار دەرچم."
(٥٩٦) کورە ئازاکەی نەستور بەو شێوەیە قسانی کرد. ئەوجا ماینەکەی برد و پێشکەشی مینیلاوسی کرد. وەکو چۆن ئاونگ بەسەر تەبارە گەنمدا دەبارێ و گوڵەکانی پارا و دەکات و دەیخەملێنێ ،بەو ئاوایە دڵی مینیلاوس فێنك بووەوە.. ئاوری لە ئەنتیلوخۆس دایەوە و بەراشکاوی پێی گوت: "ئەی ئەنتیلوخۆس، هەرچەندە زۆرت لی پەست بووم، بەڵام ئەمرۆکە لێت دەبورم. چونکە تۆ پێشتر نەپیاوێکی بێ ئەقڵ بووی و نەکەسێکی بێ پەرواو کەللە شەق. هەرچییەك بووە لاوی پێ کردویت! جارەکی دی فێڵ لە کەسانی لە خۆت باشتر مەکە. چاك بزانە هیچ کەسێکی دی نەیدەتوانی بەو ئاسانیە هێورم بکاتەوە. بەڵام تۆ وەکو بابە مەزنەکەت و میناکی براکەت لەشەردا بەخەمی منەوە بوون. یارمەتیدەرم بوون. لەوە زیاتر رەنجتان داوە کە من نەتوانم چاوپۆشی لە غەنزرینی خۆم بکەم .بۆیە من ماینەکەت، هەرچەندە هەقی من بوو، وێدەدەم. با خەڵکەکە بزانن کە من نەپیاوێکی کینە لە دڵم و نە بوغزن و کەللە رەق."
(٦١٢) دوای ئەو قسانە، ماینەکەی دایە دەستی (نویمون)ی میرئاخوری ئەنتیلوخۆس تا بیبات. مەنجەڵە بریقەدارەکەی بۆ خۆی هەڵگرت. میریونس کە چوارەمی پێشبرکێیەکە بوو دوو تالان زێری وەرگرت. خەڵاتی پێنجەم مابوو، کە ئینجانە یا کوپەڵەیەکی دوو قوڵفی بوو، بەر کەس نەکەوت. ئەخیل بەخۆی هەڵیگرت و بەناو ئاپۆرەی ئاخاییاندا رۆیی و لەلای نەستورەوە وێستا و گوتی: "ئەی پیرەمێرد بائەمەش بەم بۆنەیەوە، بۆنەی ناشتنی پاتروکلۆسەوە بۆ تۆ بێ. ئەو پاتروکلۆسەی جارێکی دی لەناو ئارگۆسییەکاندا نای بینیتەوە! من ئەم خەڵاتەت دەدەمێ بێ ئەوەی بەشداری پێشبرکێیەکەت کردبێت. چونکە تۆ ناتوانی لە زۆرەبانی، بۆکسبازی، رم ئەندازی و غارداندا بەشداری بکەیت. پیری دوابراو باری قورسی خۆی بەکۆڵدا داویت!"
(٦٢٤) دوای ئەو قسانە، ئینجانەکەی دایە دەستی نەستور. ئەویش بەخۆشحاڵییەوە لێی وەرگرت ووەڵامی دایەوە: "راستە کوری خۆم. ئەوەی تۆ گوتت هەمووی راست و دروستە! هەر چوار پەلم، تەنانەت پێیەکانیشم سست بوون. ئەو تین و تاوەی جارانیان نیە. قۆڵ و باسکم وەکو جاران چوست و چالاك ناجولێن. بریا رۆژگاری لاوی دەگەرایەوە و وەکو ئەو رۆژەم لێدەهاتەوە کە (ئیبیون)ەکان لە بوپراسیوندا (ئامارنیکیوس)ی پاشای خۆیان دەناشت. کورەکانی بەو بۆنەیەوە و وەکو رێز بۆ بابیان خەڵاتی تایبەتیان تەرخان کرد. لەو رۆژەدا بەسەر هەمواندا سەرکەوتم. نە لە ناو ئیبیونان و نە لەناو بیلانیان و

له نێو ئێتولیاندا کەس نەبوو لەگەڵما دەربەرێ، هەڤرکیم بکات. لە بۆکسازیدا بەسەر کلیتۆمیدیسی کوڕی ئینویسدا زاڵ بووم لە زۆرەبانیدا (ئەنکایوس)م کە لە (بلیورون)ەوە هاتبوو بەعاردیدا دا، لە غارغارێندا (ئەفیکوس) هەرچەندە ڕاکەرێکی باش بوو،
(٦٣٦) ئەویشم بۆردا. لەرم ئەندازیشدا (فیلیوس و بولودوروس)م بردەوە. تەنیا لە گەرمەی گالیسکەڕانیدا نەبێ، جووتە کوڕەکەی ئاکتور پێشیان دامەوە. چونکە ئەوان دوان بوون، بەتەماحی بردنەوە پێش من کەوتن. چونکە هێشتا خەڵاتی گەورە مابوون دەبوایە، بۆ بردنەوەی ئەو خەلاتانە خۆماندوو بکەین. ئەوان لفانە بوون. یەکێکیان جڵەوی ئەسپەکانی گرتبوو و ئەویتریان قامچی دەوەشاند و ئەسپەکانی تاو دەدا .ئەوسا من ئەو کوڕە بووم، بەڵام ئێستا دەبێ ئەم کارانە بۆ لاوەکان بەجێبێڵم و مل بۆ باری دوابڕاوی پیری بدەم. من ئەوسا سەرتۆپی قارەمانان بووم. ئێستا بڕۆ، تۆ بڕۆ باقی پێشبڕکێ و گەمەکان بەبۆنەی ناشتنی هاوڕێکەتەوە ئەنجام بدە: من ئەم ئینجانەیە بەشانازی و خۆشحاڵیەوە قبوڵ دەکەم، بەدڵ شادمانم ئەی هاوڕێم هەمیشە منت لە بیرە. ئەو ڕێز و حورمەتەی کە لە ئاخییەکانم داواو چاوەڕوانە پێ ڕەوا دەبینی. لە خواوەندان دەپاڕێمەوە بەدڵی خۆت لەگەڵدا بکەن. ڕاوەستاو و بەرخوردارت بکەن. خێر و بەرەکەت بێتە ڕێت."
(٦٥١) کوڕی پیلیوس دوای ئەوەی گوێی لە سوپاسگوزاری و ستایشەکانی نەستور بوو، بەنێو ئاپۆرەی ئاخاییەکاندا گەڕایەوە. ئەوجا خەڵاتی پێشبڕکێی بۆکسبازی، کە گەمەیەکی زۆر زبر و دژوار بوو، دیاری کرد. هێسترێکی بەقوەتی هێنا و لە مەیدانەکەی بەستەوە. هێسترێکی شەش ساڵەی تۆسن و چەموش کە ڕامکردنی ئاسان نەبوو، ئەمە بۆ براوە بوو.. جامێکیشی، جامێکی دوو قوڵفەی بۆ دۆڕاو دانا. ئەوسا هەستا، ڕوویکردە ئارگۆسییەکان و گوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئەی ئاخاییانی جەنگاوەر، دوو کەسمان لە باشترین جەنگاوەرانی ئێرە دەوێ کە لە پێناوی ئەم خەڵاتانەدا هەڤرکی یەکدی بکەن. هەر کێ ئەپولۆ توانای پایەداری دایە و بەبەرچاوی هەموو ئاخاییەکانەوە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، ئەم هێسترە ڕەشە بۆ خۆی بەرێتەوە بۆ خێوەتەکەی خۆی. هەرکەسێکیش دۆڕا ئەم جامە جووت قوڵفەیەی دەردێتێ."
(٦٦٤) هەر کە لە قسەکانی بووەوە، یەکسەر پیاوێکی کەڵەگەتی زەلام، بۆکسبازێکی لێهاتوو، بەتوانا کە ئیبیوسی کوڕی بانوبیوس بوو، هاتە پێشێ. دەستی خستە سەر هێسترەکە و گوتی: "ئەوەی گەرەکیە جامە دوو قوڵفیەکە بەرێتەوە بابێتە مەیدان. بەڵام

سەبارەت بەهێسترەکە، بەئاشکرا دەیڵێم هیچ ئاخاییەك جگە لە من ناتوانێ بەهێزی دەست و بازووی خۆی بیباتەوە. چونکە من حاڵی حازر باشترین بوکسبازی ئێرەم. کەس لەگەڵما دەرنابات. ڕاستە من لەشەڕدا ئەوە نیم، بەڵام لە بۆکسبازیدا پاڵەوانم پاڵەوان.. کەس نیە لە هەموو بوارەکاندا هەر لێهاتوو کارامە بێ.. من ئەم قسانە دەکەم دەشی هێنمە.. دی هەر کەسێك بێتە مەیدانم مارئەنجنی دەکەم، ئێسك و پروسکی دەشکێنم. جا با هاورێ و کەسوکاری لێرە چاوەنۆڕ بکەن، تا کە کوشتم جەنازەکەی بەرنەوە."

(٦٧٦) ئەو قسانەی کرد. هەموو مات و بێدەنگ بوون. یورواڵوس، خواوەند ئاسا، کوڕی شا میکستیوسی کوڕی تالاوس تاقە کەس بوو هەستا کە بەرەنگاری بێتەوە. ئەو میکیسیتوسەی کە کاتی خۆی جارێك بۆ تیبوس (تیبە) بۆ بەشداری لە پرسە و ڕێورەسم و پێشبرکێیەکانی ئودیپ چوو بوو. لەوێ لە پێشبرکێیەکاندا بۆڕی بەهەموو کوڕانی کادمۆس دابوو. کوڕی تیودیوس کە بەڕمبازی بەنێوبانگ بوو، کەوتە هاندانی یورالوسی پسمامی و پڕ بەدڵ ئاواتی سەرکەوتنی بۆ دەخواست. هەوەڵجار کەمەربەندێکی لە پشتی بەست، ئەوجا جووتێ دەستکێشی بۆکسبازانی، کە زۆر وەستایانە لە چەرمی گا دروستکرابوون، دایە. دوای ئەوەی هەردووك هەڤرك کەمەربەندیان لە پشت بەست، هاتنە مەیدانگەکەوە. ڕووبەڕووی یەك وەستان. هەردووکیان لەیەك کاتدا دەستیان کردەوە و بەبۆکسی قورسەوە بەربوونە یەکدی. جیرەجیری ددانیان سەعاتە ڕێیەك دەڕۆیی. ئارەقە لە سەراپایان دەچۆڕا.ئیپیوس کە لە هەلێك دەگەڕا، هاتە پێشێ و بۆکسێکی خێواندە چەناگەی یورواڵوس. لاقەکانی سست بوون و چەمینەوە، وەکو چۆن ماسییەك بەدەم بای بوریاسەوە هەڵدەبەزێتەوە و دەکەوێتە سەر کەنار و ئەوجا شەپۆلێکی تاریك دایدەپۆشێت.. (یورواڵوس)ش بەهەمان شێوە لەگەڵ یەکەم جەزرەبەدا هەڵبەزییەوە و کەوتە سەر ئەرزەکە. بەڵام ئیپوسی جوامێر باوەشی پێداکرد و هەڵیساندەوە. هاورێ دڵسۆزەکانی لێی گردبوونەوە و لە مەیدانگەکەیان بردە دەرێ. بەتۆبزی خۆی بکێش دەکرد. خوێن لە زاری دەڕۆیی و ملی بەلادا خوار بووبووەوە، بردیانە لایەکەوە، لە بەینی خۆیاندا دایاننا. ئیدی لەوێ بورایەوە، ئەوسا چوون جامەکەیان بۆ وەرگرت.

(٧٠٠) ئەوجا کوڕی پیلیوس، خەڵاتەکانی سێیەم پێشبرکێی هێناو پیشانی ئارگوسییەکانی دا. ئەم خەڵاتانە تایبەت بوون بەگەمەی زبری زۆرەبانی. خەڵاتی یەکەم بریتی بوو لە مەنجەڵێکی زۆر مکوم، هەر ئەوەندەی کەم بوو بخرێتە سەر ئاگر،

(۷۰۱) ئاخاییەکان، نرخی ئەم مەنجەڵەیان بەبەهای دوانزە گا دەقەبڕاند. بۆ دۆڕاوش کەنیزەکێکی دەست ڕەنگینی دانا، کە ئاخاییەکان لەنێو خۆیاندا بەبایی چوار گاجووتیان دەقرساند. ئەخیل هەستاو ڕویکردە ئارگۆسییەکان وگوتی: "کێ دەیەوێ لەم پێشبڕکێیەدا بەشداری بکات باهەستێتە سەرپێ!"

(۷۰۸) هەر کە ئەو قسانەی کرد، یەکسەر ئەجاکسی کوڕی تیلامون و ئۆدیسیوسی زرینگ و زەبەردەستی مەیدانی ئەو وەرزشە ڕابوون. هەردوو هەڤرک کەمەربەندیان بەست و هاتنە مەیدانگەکە. بەدەستانی بەهێز بازوانی یەکتریان گرت. وەکو چۆن وەستایەکی شارەزا سەری دوو کاریتەی گەورە لە میچی ماڵێکی بەرزدا لێکدەدا و دەگەیەنێتە یەکدی تا بەرگەی تەوژمی با بگرێ، لە نزیکەوە ناوچەوانی خۆیان بەیەکەوە نابوو. کە یەکیان رادەکێشا و دێنا و دەبرد خرمە خرم لە بڕبڕەی پشتیانەوە دەهات. ئازای ئەندامیان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو. هەموو شان و مل و پەراسو و قەبرغەیان زامدار بوو بوو. بەدەم ئارەقەوە خوێنیان لێ دەچۆڕا. بەڵام بەو حاڵەشەوە هەردووکیان لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە یەکتر ببەزێنن و مەنجەڵە مکومەکە ببنەوە. نە ئۆدیسیوس دەیتوانی پشتی ئەجاکس لە عاردی بدات و نەئەجاکس دەیتوانی ئۆدیسیوسی پایەدار بدات بەعاردیدا و کۆتایی بەگەمەکە بێنێ. لە ئەنجامدا ئاخاییانی چەکدار خەریك بوو لە تەماشاکردن بێزار دەبوون. هەنگێ ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون، بەئۆدیسیوسی گوت: "ئەی زادەی زیوس، ئۆدیسوسی کوڕی ئیتریسی خانەدان، یا لە عاردیم بەرزبکەوە یان ڕێمبدە من تۆ لە عاردی بەرز بکەمەوە و ئاکامی کاریش دەدەینە دەستی زیوس."

(۷۲۵) بەدەم ئەو قسانەوە بەرزی کردەوە. بەڵام ئۆدیسیوس دەستبەرداری فێڵ و نیرەنگی خۆی نەبوو. لە پشتەوە تاهێزی تێدا بوو ئەژنۆیەکی بەڕەفیسکی ئەجاکسدا کێشا، لاقی سست بوون، پاشە و پاش کشایەوە و پانەوپان کەوتە سەر زەوی، ئۆدیسیوس کەوتە سەر سینگی ئەجاکس. کە حەشاماتەکە ئەم دیمەنەیان بینی زۆریان پێ سەیر بوو. ئەوسا ئۆدیسیوسی بەسەبر و حەوسەڵە، هەوڵیدا بەرزی بکاتەوە، تۆزێکی لە عاردی جوڵاند، بەڵام نەیتوانی بەرزی بکاتەوە. ئەژنۆی خستە بەینی ئەژنۆکانی (ئەجاکس) هەردووکیان بەپاڵ یەکەوە کەوتنە سەر ئەرزەکە و لە تەپوتۆزا گەوزان. خەریك بوو بۆ گێمی سێیەم هەڵدەستانەوە، کە ئەخیل بەخۆی هەستا و ڕایگرتن گوتی: "بەسە، لەوەی پتر خۆتان ئەزیەت مەدەن. هەردووکتان سەرکەوتوون. هەردووکتان دوو خەڵاتی چوونیەك

وەردەدرن و لاکەون، تا ئاخاییەکان لەسەر پێشبڕکێیەکانی دی بەردەوام بن!"

(٧٣٨) دوای ئەو قسانە هەردووکیان بەگوێیان کرد. دوای ئەوەی تەپوتۆزەکەیان لە خۆیان تەکاند، جلەکانیان لەبەرکردەوە.

(٧٣٩) ئەوجا کوڕی پیلیوس یەکسەر خەڵاتی دی بۆ پێشبڕکێی غارغارێن دانا: بریتی بوو لە تاسێکی زیوین کە زۆر وەستایانە و هونەرمەندانە دروست کرابوو. ئەم تاسە شەش پەیمانەی دەگرت و لە جوانیدا بێ وێنە بوو. تاس نەبوو لەم سەر زەمینەدا بیگاتێ. سنعەتکارانی سەیدایی کە لە کاری دەستیدا زۆر مەعلانن، دروستیان کردبوو. فینیقیەکان لە ڕێگەی دەریای بەتەمتومانەوە لەگەڵ خۆدا هێنابوویان و چەند بەندەرێکیان پێکردبوو و ئەوجا وەکو دیاری پێشکەش بە (تواس)یان کردبوو و ئەوسا یونیوسی کوڕی جاسون، لەبری سەربەهای لیکاونی کوڕی پریام، دابووی بەپاتروکلۆسی قارەمان. جا ئەخیل ئەم تاسەی وەکو خەڵات لە بۆنەی ناشتنی هاوڕێ دڵسۆزەکەیدا بۆ براوەی یەکەمی پێشبڕکێی غارغارێن دانا. بۆ دووەم گایەکی زەلامی قەڵەوی یەکپارچە چەوری دانا. بۆ سێیەمیش نیوتالان زێڕی دانا. ئەوسا هەستا و ڕویکردە ئارگۆسییەکان و گوتی: "کێ بەشداری دەکات بابێتە مەیدان!"

(٧٥٤) دوای ئەو قسانە ،یەکسەر ئەجاکسی لەزگین، کوڕی ئویلیوس هاتە بەرەوە، ئودیسیوسی زیرەك و هۆشمەند لەدوای ئەو هەستا. ئەوسا ئەنتیلوخۆسی کوڕی نەستور هاتە پێشەوە کە لە نێو لاوانی هاوتەمەن و هاوسونحی خۆیدا کەس نەبوو لە ڕاکردندا بیگاتێ. شانبەشانی یەك، لەسەر یەك هێڵ وەستان. ئەخیل مەرزی بۆ دەست نیشان کردن، کە نیشانەی سوڕانەوە دیاریکرا، غارغارێن دەستی پێکرد. ئەجاکس لە پێشەوە بوو، ئودیسیوسی مەزن بەماوەیەکی زۆر کەم لە دوایەوە بوو. وەکو چۆن ژنێکی قەد باریك مەکۆکەی خۆی بەدەستانی لەزو وەستایانە هەڵدەسوڕێنێ و داوی پۆیەکە لە نێو کێفەوە دەردەکێشێت، لە سینگی خۆی نزیکی دەخاتەوە، (ئودیسیوس)ش بەهەمان ئەندازە لە نزیکی ئەجاکسەوە غاری دەدا.پێش ئەوەی بیێ تۆز لە جێ پێی هەڤرکەکەی هەستێ پێی لەجێ پێی ئەو دادەنا. هەناسەی گەرمی ئودیسیوسی مەزن، بەدەم غاردانەوە لە پشتی سەری ئەجاکسی دەدا. هەموو ئاخاییەکان هورایان بۆ دەکێشا و هانیان دەدا و داوایان لێدەکرد خێراتر غاربدا. کاتێ لەدوا قۆناغی غارغارینەکە نزیکبوونەوە، ئودیسیوس لە دڵی خۆیدا لە ئەتینای چاوگەش پاڕایەوە، گوتی: "خواوەندا، فریام کەوە ،هێزی لاقم

بدە. بەو ئاوایە کەوتە نوێژ و نزا، ئەتیناش نزاکەی قەبوڵ کرد. دەست و لاقانی سووك کرد. کاتێ کە هەڤرکەکان خەریك بوو دەگەیینە سەر شار.. و خەڵاتەکە ببەنەوە، ئەتینا کارێکی وەهای کرد ئەجاکس لە گەرمەی راکردنا خزی. ئەرزەکە یەکپارچە شیاکە و خوێن و سەخوراوی ئەو گایانە بوو کە ئەخیلی لەزگێن بۆ پاتروکلۆسی کوشتبوونەوەو کردبوونیە قوربانی. دەم و لوتی ئەجاکس پڕبوون لە شیاکە.

(٧٧٨) بەو جۆرە ئۆدیسیوسی مەزن، بەسەبر و حەوسەڵە، کە لە پێشدا گەییەوە سەر شار، تاسەکەی هەڵگرت. ئەجاکسی جوامێر گایەکەی بردەوە. دەستی خستە سەر قۆچێکی و بەدەم تفانەوەی شیاکەوە روویکردە ئەرگۆسییەکان وگوتی:"مەخابن، ئەوەی منی خزاند یەزدانخانمێکە کە هەمیشە لە پشتی ئۆدیسیوسە و یارمەتی دەدات، دەڵێی دایکیەتی!" ئاخاییەکان هەموو شاد و دڵخۆش بەقسە قوتەکەی پێکەنین.

(٧٨٥) دوا خەڵات بەر ئەنتیلوخۆس کەوت. بەر لە هەمووان بەناکامی خۆی پێکەنی و رویکردە تەماشاڤانەکان وگوتی: "دۆستان ئێوە بەشایەد بن کە خواوەندان تەنانەت لێرەشدا، پشتیوانی لە پیرەکان دەکەن و رێزیان دەگرن. ئەجاکس، ئەوی راستی بێ کەمێك لەمن گەورەترە. بەڵام ئۆدیسیوس زۆر کۆنە، لە خانەی پیرەکانە. بەڵام وەك دەڵێن پیرێکی تەرو برو بەگورە، لەناو ئاخاییەکاندا مەگەر ئەخیل، دەنا کەس لە راکردندا لەگەڵیا دەرنابات!"

(٧٩٣) ئۆدیسیوس بەو ئاوایە ستایشی کورە لەزگینەکەی پیلیوسی کرد. ئەخیل بەرسڤی دایەوەو گوتی: "ئەنتیلوخۆس، نایەڵم ئەو ستایشەت بەبێهودە بروات. بۆیە نیو تالان زێری دیکە دەخەمە سەر خەڵاتەکەت." هەر کە لە قسەکەی بۆیەوە، زێرەکەی دایە و ئەنتیلوخۆس بەخۆشحاڵییەوە لێی وەرگرت.

(٧٩٨) ئەوسا کوڕی پیلیوس، رمێکی درێژ، سپەرێك و کێوخودێك و زرێیەکی هێنا و لە مەیدانگەکەی دانا. ئەمانە چەك و ئەسلەحە میراتیەکەی سارپیدون بوون کە پاتروکلۆس لێی داماڵی بوون. ئەوسا هەستا، رویکردە ئارگوسیەکان و گوتی: "داوا دەکەین دوو کەس لە ئازاترین شەرڤانانی ئێرە، بۆ بردنەوەی خەڵات بێنە مەیدان. بازرێ لەبەرکەن، تەدارەکی جەنگ لەخۆ بدەن. رمی برونزینی تیژ بگرنە دەست. بەبەرچاوی ئەم حەشاماتەوە بەگژ یەکدا بچن. کێ هەوەڵجار هەڤرکەکەی زامدار بکات، زرێکەی کون بکات، خوێنی لەبەر بروات ،من ئەو شمشێرە زیونیشانەی دەدەمێ. شمشێرە نەك گاڵتە. دەستکردی

براندبویە، کاتی خۆی کە (ئەستیروپایوس)م کوشت لەوی دامالّی. بەڵام چەکەکانی دی بەیەکسانی بەسەر هەردووك هەڤرکدا دابەش دەکرێن. دەعوەت و بەزمێکی گەورەشیان لە خێوەتەکەی خۆمدا بۆ ساز دەکەم."

(٨١١) دوای ئەو قسانە ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون هاتە پێشێ. دیومیدۆسی دلاوەریش، کوڕی تیودیوس دوابەدوای ئەو هەستا. دوای ئەوەی زرێیان پۆشی، لە حەشاماتەکە دوورکەوتنەوە. هاتنە ناوەندی مەیدانگەکە. هەردوو بەدەم چاوەڕوانی دەستپێکی شەڕکەوە بەغەزەبەوە دەیانڕوانیە یەکدی. ئاخاییەکان کە بەو حاڵەوە دیتیانن ترسیان لێنیشت. لێکدی نزیك بوونەوە.. سێ جار پەلاماری یەکتریان دا، سێ جار بەیەکتردا هەڵشاخان.

(٨١٨) ئەجاکس ڕمەکەی خێواندە سپەرە مکومە بازنەییەکەی دیومیدوس. لێ ڕمەکە نەگەییە گۆشت. زرێکەی ژێرەوە پاراستی. بریندار نەبوو. کوڕی تیودیوس هەر لە هەوڵی ئەوەدا بوو لەسەروی سپەرەکەوە نووکی ڕمە ڕەخشانەکەی بگەیەنێتە ملی ئەجاکس. ئیدی ئاخاییەکان هەموو ترسیان لێنیشت. خەمی ئەوەیان بوو ئەجاکس بکوژرێ. بۆیە داوایان کرد کۆتایی بەشەڕەکە بهێنرێت و خەڵاتەکان بەیەکسانی بەسەر هەردووکیاندا دابەش بکرێ. شەڕەکە ڕاگیرا. ئەخیلی قارەمان شمشێرە گەورەکەی بەکێلان و حەمایلە جوانەکەیەوە دا بەکوڕەکەی تیودیوس.

(٨٢٦) ئەوجا کوڕەکەی پیلیوس، تۆپەڵە ئاسنێکی خاوی هێنا، کە ئیتون جاران وەك وەرزش بەهەموو هێز و قوەتی خۆیەوە هەڵیدەدا. لێ ئیتون، بەدەستی ئەخیلی لەزگین کوژرا بوو. ئەخیل ئەو تۆپەڵە ئاسنە و کەلوپەل و داراییەکانی دیکەی تالآن کردبوو و لە کەشتییەکەی خۆی بارکرد بوو. هەستا ڕویکردە ئارگۆسییەکان و گوتی: "کێ گەرەکیە بەشداری ئەم پێشبرکێیە بکات بابێتە بەرەوە. هەر کەسێك گرێوەکە بباتەوە، ئەم تۆپەڵە ئاسنەی دەدرێتێ کە تێری پێنج ساڵی دەکات. پێویستی بەهیچ ئاسنێکی دی نابێت. خۆ ئەگەر کێڵگەی بەپیت و بەرەکەتی دووره شاریشی هەبێ، شوانەکەی یا وەرزێرەکەی ناچار نابن ڕێگەی دوور و درێژی شار ببڕن و ئاسن بکڕن، چونکە ئاسنێکی فرەی لەبەردەستدا دەبێت."

(٨٣٦) دوای قسەکانی ئەخیل، بولوپویتیسی مێرخاس، لیونتیوسی خواوەند ئاسا، ئەجاکسی کوڕی تیلامون و ئیبیوسی مەزن هەستان و بەڕیز شان بەشانی یەکتر وەستان.

بیبیوس، تۆپەڵە ئاسنەکەی هەڵگرت و بەهەموو هێزی خۆیەوە هەڵیدا. هەموو ئاخاییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا ٠دوای ئەو لیونیتوسی زادەی ئەریس هەڵیدا. ئەوجا نۆرە هاتە سەر ئەجاکسی مەزن، کوڕی تیلامون و تۆپە ئاسنەکەی هەڵدا. لە دوانەکەی پێش خۆی پتر ڕۆیی و نیشانەکانی بەزاند. بەڵام کە نۆرە هاتە سەر بولیبوتیسی دلاوەر، هەر گرتی بەتۆپە ئاسنەکەدا و وەکو چۆن گاوانێك دار گارانەکەی هەڵدەدا و بەسەر گاگەلەکەیدا گڤە دەکات و دەڕوات. بەو ئاوایە تۆپە ئاسنەکەی هەڵدا و هەموو نیشانەکانی پێش خۆی بەزاند. هەر هەمووان کەوتنە هوراکێشان و ئافەرینی. ئەوسا دۆستانی بولوبویتیس هەستان، خەڵاتەکەی سەردارەکەی خۆیان هەڵگرت و بردیان بۆ ناو کەشتیەکەی.

(٨٥٠) ئەوجا ئەخیل، خەڵاتی پێشبڕکێی تیرەندازی دانا. بریتی بوو لە دە تەوریزینی دوو دەم و دە تەورزینی یەك دەم. ئەوجا ئەمری کرد کە بورجی یەکێك لە کەشتیەکان، لە دوور، لەناو لمدا بچەقێنن. لاقی کۆترێکی ترساوی بەداوێکی باریك بەست بەبورجەکەوە و فرمانیدا کە کۆترەکە بکەنە نیشانە،

(٨٥٥) گوتی: "هەر کەسێك کۆترەکە بانگێوێ هەموو تەورزینە دوو دەمەکان دەبات بۆ خۆی. ئەوەی تەنیا داوەکە بپێکێ، ئەگەر لە کۆترەکەش نەدات، ئەوا خەڵاتی دۆڕاوی بەردەکەوێ، کە بریتییە لە گشت تەورزینە یەك دەمەکان".

(٨٥٩) دوای ئەو قسانە، شا تیوسیری بەهێز و توانا هەستاو هاتە پێشێ. ئەوجا میریونیسی خزمەتکاری بەجەرگی ئیدومینیوس هاتە پێشێ. قورعەیان خستە ناو کۆوخودێکەوە، کۆوخودیان بادا، یەکەم ناو تیوسیر دەرچوو. یەکسەر و بێ ئەوەی قەولی ئەوە بەئەپولۆ بدات کە سەد سەر بەرخە کۆرپەی بۆ بکات بەقوربانی، تیری خۆی هاویشت. نەیتوانی کۆترەکە بانگێوێ. چونکە ئەپولۆ نەیهێشت ئەم سەرکەوتنەی پێ ببڕێت. بەڵام تیرەکە بەر ئەو داوە باریکە کەوت کە کۆترەکەی پێ بەبورجەکەوە بەسترا بوو. لە نزیکی پێی کۆترەکەوە بەریکەوت و پچراندی. کۆترەکە فڕی و چوو بەئاسماندا، داوەکە کەوتە خوارەوە. ئاخاییەکان کردیان بەهەرا ودەست خۆشیان لێکرد. بەڵام میریونیس بەپەلە ڕۆیی و کەوانەکەی لە دەستی تیوسیر دەرهێنا، چونکە دەمێ بوو تیرێکی بەدەستەوە گرتبوو و ئامادەی هاویشتنی بوو. یەکسەر وەعدی بەئەپولۆی دوورئەنگێوە دا کە سەد بەرخە کۆرپەی بۆ بکات بەنەزر و قوربانی. ئەوسا کۆترەکەی بەبەرزییەوە، لەژێر هەورانەوە بەدی کرد. نیشانەی لە ناوەندی باڵەکانی گرتەوە. تیرەکە ڕێك و ڕاست بەدەنی

دوورەکەی دیواو دەرکرد. ئەوجا هاتەوە خوارێ ولەبەر پێی میریونیسدا لە عاردی چەقی. کۆترەکەش بەملا کەوتە سەر بورجەکە، پەڕوپۆی هەڵوەری.. هەر زوو گیانی دەرچوو و لەسەر بورجەکەوە تەپ کەوتە خوارێ. جەنگاوەرەکان بەسەرسامی و ستایشەوە دەیانڕوانییە میریونیس. ئیدی میریونیس هەموو تەورزینە دوو دەمەکانی برد. (تیوسیر)ش تەورزینە یەك دەمەکانی بۆ ناو کەشتییەکانی برد.

(٨٨٤) ئەوجا نۆرە هاتە سەر ڕمبازی. کوڕی پیلیوس، ڕمێکی درێژ و مەنجەڵێکی تازەی هێنا کە هێشتا نەخرابووە سەر ئاگر. یەکپارچە بەگوڵ نەقاشی کرابوو. هاونرخی گایەك بوو. هێنانی و لە مەیدانەکەی دانان. ڕمهاوێژان هاتنە مەیدان. یەك لەوانە ئاگامەمنونی بەدەسەڵات، کوڕی ئوتریوس بوو. دووەمیان میریونیسی دلێر، میرئاخوڕ و خزمەتکاری ئیدومینیوس بوو. ئەخیل هەستا ،ڕووی تێکردن وگوتی: "ئەی کوڕی ئوتریوس، ئێمە زۆر چاك دەزانین کەس لەگەڵ تۆدا دەرنابات. لە هێزداری و ڕمبازیدا کەس هاوتات ناکاتەوە. مەنجەڵەکە هەڵگرە وبچۆ بۆ ناو کەشتییەکانت .ئەگەر تۆ ڕازی بی با ڕمەکە بدەینە میریونیسی قارەمان، من حەزەکەم!".

(٨٩٥) ئەخیل ئەو قسانەی کرد. پاشای جەنگاوەران ،ئاگامەمنون، قسەکەی لە عاردی نەدا. ئیدی ئەخیل نێزەکەی بەمیریونیس پێشکەش کرد. ئاگامەمنونیش خەڵاتی دووەمی، کە خەڵاتێکی گەورە بوو، دایە تالتیبیوسی میرئاخوڕ و خزمەتکاری خۆی کە بۆلای کەشتییەکانی بەرێتەوە.

# سروودی بیست و چوارەم

## پریام و ئەخیل

**حیکایەتەکە:**

**دوای تەواوبوونی کۆڕ و کۆبوونەوەکە و ڕۆیشتنی خەڵکەکە تا بنوون، ئەخیل لە داخ و سوێی پاتروکلۆس خەوی لێنەکەوت. بەیانی هەستا. جەنازەکەی هیکتۆری خستە دووی گالسیسکەکەی. ئەپولۆ خێرا فریاکەوت و جەنازەکەی هەر ئاسیوێك پاراست. ئەخیل سێ جاری بەدەوری قسنی هاوڕێکەیدا گێڕا تا تینویەتی دڵی بشکێنێ.لێ خواوەندان بەم کارەی قایل نەبوون ولەنێو خۆیاندا کەوتنە تەگبیر و ڕاوێژ. هیرا و ئەتینا لەگەڵ ئەم کارەی ئەخیلدا بوون. لێ زیوس بەم ڕەفتارە قایل نەبوو. هیرا ئیعتراز دەگرێت کە نابێ بەشەرزادەیەك (هیکتۆر) و خواوەند زادەیەك (ئەخیل) بەیەك چاو تەماشا بکرێن. لێ زیوس پێی وادەبێ کارەکەی (ئەخیل)ش ڕەوا نیە ئاخر مرۆڤ چۆن تۆڵە لە قورێکی مردوو دەستێنێ؟ خواوەندان ئەمر دەکەن جەنازەکە بپارێزرێ، خاوێن بکرێتەوەو بەزەیت چەور بکرێ، ڕێزگرتنی مردوو یاسایەکی خواییە. زیوس ناردی بەدووی تیتیسدا و قەناعەتی پێکرد کە ئەخیل دەبێ جەنازەکەی هیکتۆر بداتەوە بەخاوەنی. ئەوجا نیشانەیەکی پیشانی پریامدا کە بڕوات جەنازەکە وەربگرێتەوە. هیکوبای ژنی هەوڵدەدا ڕێگەی نەدا بچێ، گوایە دەیگرن و داوای سەربەها دەکەن. بەڵام پاش نیشانە خوایی و ئاسمانیەکە گوێی بەژنەکەی نەدا. لەگەڵ هیرمیسی خواوەندا. بەسەربەهاو دەست و دیارییەکی فرەوە چوو بۆ سەراپەردەکەی ئەخیل. ئەخیل دەبینێ، سەربەهاکەی لێ وەردەگرێت و جەنازەکەی وێدەداتەوە. حورمەتی خۆی و خزمەتکارەکەی دەگرێت .دوو جێگەی بۆ ڕادەخات شەوێ هیرمیس دەیخاتە دڵیەوە کە ڕابێ و جەنازەکە بەرێتەوە تا ئاگامەمنون نەیبینیوە و داوای سەربەهایەك گەورەتری لە کوڕە زندوەکانی نەکردووە. پریام هەڵدەستێت جەنازەکە دەباتەوە،**

کاساندروس یەکەم کەس دەبێ کە ئەسپ و هێستر و جەنازەکەی هیکتۆر دەبینێ، بەشاردا دەگەڕێ و جاڕی ئەم هەواڵە شومە دەدات. خەڵکەکە ڕادەبن و لە ماڵ دێنە دەرێ و شار غەرقی خەم وپەژارە دەبێت .پریام ئەمر بەسازبازان دەکات بچنە چیا و داربێنن بۆ سازدانی شەوتنگە. ئەندروماکی ژنی هیکتۆر و هیکوبای دایکی و هیلینی براژنی، ژنی پاریس بەدیار جەنازەکەوە دەکەونە گریە و زاری. شایەران ریز دەبەستن، تا سەردولکەی جەنازەکە ڕێکبخەن. هەر هەمووان بەدیار هیکتۆرەوە دەگرین. شەوتنگەکە ساز دەکرێت. ڕێوڕەسمەکە تەواو دەبێت. مەرقەدێك بۆ هیکتۆری شۆڕەسوار دروست دەکرێت.

زەمەن:

گێرانەوەکە بیست و سێ رۆژ دەخایەنێ کە بریتییە لە: دوانزە ڕۆژ ،کە جەنازەکەی هیکتۆر لە نزیکی خێوەتەکەی ئەخیل دەمێنێتەوە. یانزە ڕۆژ کە ڕێوڕەسمی جەنازە و ناشتن و پرسەی تیادا ئەنجامدرا.

شوێن:

ئۆلەمپە کە خواوەندان سەبارەت بەچۆنیەتی مامەڵەکردن دەگەڵ جەنازەکەی هیکتۆردا ڕاوێژ دەکەن. خێوەتەکەی ئەخیل کە پریام بۆ ئەوێ چوو و جەنازەکەی هێنایەوە. ئەجا تەروادە، کە ڕێوڕەسمی ناشتن و پرسە بەڕێوە چوو.

(١) جوڕەکە تەواو بوو. جەنگاوەرەکان بێوەیان لێکرد، هەر کەسە بەرەو کەشتی خۆی ڕۆیی. شیویان ئامادە کرد، نانیان خوارد و لێی خەوتن. بەڵام ئەخیل هاوڕێ دڵسۆزەکەی بیرکەوتەوە و لەسەلاَی گریانی دا. خەو کە هەموو گیانلەبەران دەباتەوە، توخنی ئەو نەکەوت و نەکەوت. لەجێی خۆی گینگڵی دەدا، هەر ئەم دیو و ئەودیوی دەکرد. خەفەتی بۆ پیاوەتی و جوامێری و زات و شەهامەتی پاترۆکلۆس دەخوارد. بیری لە هەموو ئەو زەحمەتانە دەکردەوە کە پاترۆکلۆس لەشەڕی جەنگاوەرانی دلێر و سەفەری پڕخەتەری ناو شەپۆلانی یاخیدا لەتەك ئەودا کێشابووی.. تا زیاتر بیری لەمانە دەکردەوە، زیاتر گریانی هەڵدەستا و فرمێسك لە دیدەی سەری دەکرد. دەکەوتە گینگڵدان، جارێ دەکەوتە سەر تەنیشت، جارێ دەکەوتە سەر پشت و جارێك بەدەما دەکەوت. زۆرجاریش هەڵدەستایە سەر پێیان، وێڵ و سەرگەردان ،پەرێشانبیر بەسەر لمەلانی کەناری دەریاکەدا دەکەوتە پیاسە. بەڵام هەرگیز سپێدە، کاتێ لە دەریای دەدا، لە نیگا و ئەندێشەی ئەو دوور نەدەکەوتەوە. هەمیشە هەڵاتنی سپێدەی لە بەرچاو و لە خەیاڵ بوو. لەم کاتەدا ئەسپە ڕەهوانەکانی دەخستنە ژێرنیر و لە عەرەبانەکەی دەبەستن، جەنازەکەی بەپاشی عەرەبانەکەوە دەبەست تا بەدووی خۆیدا ڕایکێشێت. ئەوجا سێ جار جەنازەکەی هیکتۆری بەدەوری قەبرەکەی پاترۆکلۆس، کوڕی منویتیوسدا ڕادەکێشا. ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ خێوەتەکەی خۆی. لاشەکەی هیکتۆری بەدەما لەو گۆڕە بەجێدەهێشت. بەڵام ئەپولۆ، بەمردویەتیش دڵی بەم قارەمانە دەسوتا. لاشەکەی لەهەر ئاسیو و بۆگەن بوون و ڕزینێك دەپاراست. سەراپای بە قەڵغانە زێڕینەکەی خۆی داپۆشی، تا ئەخیل بەدەم ڕاکێشانیەوە نەتوانێ جەنازەکەی عەیبدار بکات و بیشێوێنێ.

(٢٢) بەو جۆرە ئەخیل پشم و غەزەبی خۆی بەسەر هیکتۆری مەزندا دەڕشت و سوکایەتی بەجەنازەکەی دەکرد. بەڵام خواوەندانی موبارەك کە بەو حاڵەوە بینیان بەزەییان پێداهاتەوە. ئیدی داوایان لە هیرمیسی چاو تیژی چاوگەش کرد کە جەنازەکە بدزێت. هەمووان ئەم تەگبیر و ڕاوێژەیان بەدڵ بوو، تەنیا هیرا ،پوسیدون و ئەتینای چاوکەژاڵ نەبێ،.

(٢٦) کە لە کانگای دڵەوە ئیلیون و پریام و گەلەکەیان دەبوغزاند. چونکە ئەو غەڵەتەیان لە دڵ دەرنەدەچوو کە ئەلکساندەر (پاریس) لە ڕووی نەزانیەوە دەرهەق بەوان کردبووی ، کاتێ لە کوخەکەی خۆی چووبوونە لای بۆ داوەری، ئەوانی فەرامۆش کردبوو و بەلای

ئەفرودیتی خواوەندی ڤیان و جوانیدا دایشکاند بوو،، چونکە بەڵێنی دابوویە ئارەزووە کوشندەکانی بێنێتەدی.

(٣١) لە ڕۆژی دوازدەیەمدا ئەپولۆ خۆی بەئەنجومەنی خواوەندانداندا کردو گوتی: "ئەی خواوەندانی ئولیمبوس ئەم دڵڕەقیەتان لەچیە؟ شەرم لە خۆتان بکەن، هیکتۆر کەمی ڕانە گا و بزنی ناسکی بۆ کردنە قوربانی؟ کەچی غیرەتی ئەوەتان نیە تەنانەت جەنازەکەی بەمردویەتی، ڕزگار بکەن، بیدەنەوە بەخاوەنی تا ژنەکەی، دایکی، کورەکەی، و پریامی بابی و گەلەکەی بیدینن و شەوتنگەی بۆ ساز بکەن و بیسوتێنن و ڕێورەسمی جەنازە و پرسەی بۆ ئەنجامبدەن. یان ئێوەش ئەی خواوەندان لەگەڵ ئەخیلی سەرشێتان.. کە نە ئەقڵی هەیە نە دەزانێ ئینساف چیە و نە تۆزقاڵێك میهر و سۆزی لە دڵدایە. شێرێکی دڕندەیە لەو گۆرە .وەکو چۆن شێرێکی دڕندە پشت بەهێزی دڕندانەی خۆی، بەدوور لەهەر سۆز و بەزەییەك پەلاماری مێگەلانی بەشەر دەدات هەر بۆ ئەوەی سکی تێر بکات.. (ئەخیل)ش بەو جۆرە هیچ ڕوحم و بەزەییەکی لەدڵدا نەماوە. بەتەواوەتی شولی لێ هەڵکێشاوە و شەرمی لەبەر هەڵگیراوە. بەڕاستی شەرم بۆ بەشەر شتێکی باشە، قازانجی زیاترە تا زیان.بەڕاستی بێ شەرمیە بەشەر خەڵکی لە پێناوی قازانجی خۆیدا ئازار بدات. زۆر کەس، ئازیزێکی ئازیزتر لە هاوڕێکەی ئەخیل لە دەست دەدات. لەوەیە کوڕێکی یان برایەکی دایك و باوکی لە دەست بدات. بەڵام ماوەیەك بۆی دەگری و دەینێژێ و دەبڕێتەوەو هێور دەبێتەوە. چونکە خەمی گەورە ئینسان دەکوژێت. خواوەندان سەبر و حەوسەلەیان بەبەشەر بەخشیوە. کەچی ئەم پیاوە، ئەخیل لەو ڕۆژەوە کە هیکتۆری مەزن و جوامێری کوشتووە، کردویەتی بەعادەت دەیخاتە دووی عەرەبانەکەی و بەدەوری گۆڕی هاوڕێ ئازیزەکەیدا، پاتروکلۆس ڕایدەکێشێت و دەیگێڕێت. بەڕاستی ئەم کارە کارێکی کرێتە و هیچ قازانجێکی ئەوی تێدانیە. چەند پیاوێکی ئازا و دلێرش بێ، بۆی نیە پشم و غەزەبی چەپەڵی بەسەر تۆپەڵە قوڕێکی بێ هەست و خوست ومردوودا بڕێژێ. با ئاگای لەخۆ بێ کە لێی نەچین بەقینا!"

(٥٥) هیرای بازوو چەرمەڵە، زۆر تورە بوو، ڕوی تێکرد وگوتی: "ئەی خودان کەوانی زیوین، ئەم قسانە چیە کە تۆ دەیکەی، دەتەوێ خواوەندان هان بدەی کە بەیەك چاو بڕواننە هیکتۆر و ئەخیل! هیکتۆر بەشەرێکی فانییە و مەمکی ژنێکی لەزار نراوە، بەڵام ئەخیل کوڕی یەزدانخانمە یەزدانخانمێك کە بەخۆم بەخودان و پەروەردەم کردووە. بەشووم

دواوە. دوومە بەجەنگاوەری ناودار پیلیوس، کە هەموو خواوەندان زۆریان خۆشدەوێ. هەر هەمووتان بەشداری ئاهەنگی زەماوەندەکەیانتان کرد. تۆش ئەی بەد نمەك، ئەی سپڵە و پێنەزان، ئەی یار و یاوەری بەدکاران، بەخۆ و گیتارەکەتەوە هاتییە ئەوێندەر و لەگەڵ ئێمەدا کەوتیە بەزم و شایی گێران.

(٦٤) ئەوجا زیوس، خێوی هەوران وەڵامیدایەوە وگوتی: "ئەی هیرا بەخواوەندەکاندا هەڵمەشاخێ، کەس بەیەك چاو ناروانێتە ئەو دووانە .چونکە بەڕاستی یەکسان و بەرانبەر نین. هیکتۆرش لەنێو خەڵکانی تەروادەدا لە هەمووان پتر خۆشەویستی خواوەندان بوو. یا بەلای کەمەوە لە دڵی مندا ئازیز بوو. بەهیچ جۆرێ لە پێشکەشکردنی نەزر و دیاری و قوربانیانی پەسەند و بەجێ قسوری نەدەکرد و هەرگیز میحراب و قوربانگەکەی من لە خۆراك و قوربانی کە بۆ هەمووان چون یەك بوو، لە بادە پرژێنی، لە دوکەڵ و دوو، و برژانی گۆشتی قوربانی و عیبادەتکاری، کە مافێکی ڕەوای ئێمەی خواوەندانە چۆڵ نەبووە. بەڵام دزینەوەی جەنازەکەی هیکتۆری مەزن، زەحمەتە بەبێ ئاگاداری ئەخیل ئەنجامبدرێ ،چونکە دایکی شەو و ڕۆژ ها بەلایەوەو یارمەتی دەدا. جا با یەکێك لە خواوەندەکان بڕوات و (تیتیس)م بۆ بانگ بکات، بەڵکو ئامۆژگاری دەکەم و داوای لێدەکەم کە قەناعەت بەئەخیل بێنێ سەربەها و دیارییەکانی پریام قبوڵ بکات و جەنازەکەی هیکتۆری پێ بداتەوە."

(٧٧) هەر کە قسەکەی لە زار دەرچوو، ئایریس وەکو با بۆی دەرچوو. پەیامەکەی برد و ڕۆیی. لە بەینی (ساموس و ئیمبروس)ی بەردەڵانەوە خۆی بەقوڵایی دەریای تاریك و نوتەکەدا کرد، ئاو بەشڵپ و هوڕ چواردەوری گرت. زۆر بەخێرایی بەرەو قوڵایی داکشا. لە تۆ وایە داوی قوڵابێکە، بەکەڵەشاخێکی پڕ لە قورقوشمەوە بەستراوە و بەرەو قوڵایی ڕادەکشێت و مەرگ بۆ ماسیانی گۆشت خۆر دەبات. بەو ئاوایە بەرەو قوڵایی داکشا، سەیری کرد تیتیس لە ئەشکەوتێکی گەورەدا دانیشتووە. پەریانی دەریایی دەوریانداوە.. تیتیس لە ناوەڕاستیاندا دانیتشووە و بۆ چارەنووسی ئەخیل، کوڕە بێ هاوتاکەی دەگری، کە لە غەریبیدا، لە دوورە وڵاتیدا، لە دەشتی بەبڕشتی تەروادەدا دەمرێت. چووە لایەوە وگوتی: "ئەی تیتیس ڕابە زیوسی زانا، دوورئەنێش، ئەمری بەوەیە کە خێرا بچی بۆلای."

(تیتیس)ی لاق چەرمەڵە گوتی: "خواوەندی مەزن منی بۆچیە، بۆ دەخوازێ بمدینێ؟ حەز

ناخەم تێکەڵ بەخواوەندان ببم. خەمێکی یەجگار زۆرم لە دڵدایە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر دەچم، فەرمانی زیوس هەرچییەك بێ، لە ئەرز نادرێ.

(٩٣) یەزدانخانمی دەریا، سەرپۆشێکی ڕەش ڕەشی پۆشی. ملی ڕێگەی گرت. ئایریس کە لە ڕێکردنا بای نەدەگەیشتێ ،لە پێش ئەوەوە دەرۆیی و ڕێنوێنی دەکرد. شەپۆلی دەریا لەبەردەمیاندا شەق دەبوون و ڕێیان بۆ دەکردنەوە. تا گەیینە کەناری دەریا. لەوێوە بەهەشتاو بەرەو ئاسمان هەڵکشان، گەیینە مەنزڵ .سەیریان کرد کوری کرونۆس، دوربین، دانیشتووە و هەموو خواوەندە موبارەکەکان بەدەوریەوەن. ئەتینا شوێنەکەی خۆی بۆ چۆڵ کرد، لەلای زیوسەوە دانیشت. هیراش جامێکی زێرینی زۆر جوانی دایە دەست، کەوتە دڵدانەوەی. تیتیس شەربەتەکەی خواردەوە و جامەکەی دایەوە. ئەوجا سەروەری خواوەندان و بەشەران کەوتە قسان و گوتی:

(١٠٤) "ئەی یەزدانخانم تیتیس.. تۆ بەو هەموو خەمباریەوە بۆ ئولیمبوس هاتوویت، تۆ دڵت پڕ لە خەمێکی گەورە، من بەمە دەزانم. بەڵام ئێستا پێت دەڵێم بۆ چیم بەشوێنتا ناردووە. ئەوە نۆ ڕۆژە خواوەندەکان لەسەر جەنازەکەی هیکتۆر و ڕەفتاری ئەخیل، تالانکەر و وێرانکەری شاران، کێشەیانە. خواوەندان دەیانەوێ هیرمیسی بکوژی ئارگوس راسپێرن کە جەنازەکەی هیکتۆر بدزێ. بەڵام من ڕاموایە کە تۆ، هەڵبەتە ڕاگرتنی دڵی تۆ و ڕێز و حورمەتی خۆت و کورەکەتم بەلاوە مەبەستە، بەپەلە بچی بۆ ناو سوپاکەیان و فەرمانی من بەکورەکەت بگەیەنی. پێی بێ هەموو خواوەندان لێی تورەن و من لە هەموویان زیاتر لێی قەڵسم. چونکە چووە بەقینا و جەنازەکەی هیکتۆری لای کەشتییەکان هێشتووەتەوە و نایداتەوە بەخاوەنی. برۆ و پێی بێ بەڵکو لێم بترسێت و بێتە ڕەدا و جەنازەکەی هیکتۆر بداتەوە. منیش لای خۆمەوە ئایریس دەنێرم بۆلای پیریامی جوامێر و دڵ گەورە، تا فەرمانی منی پێگەیەنێ کە بچێ بۆلای کەشتی ئاخاییان و کورەکەی بکرێتەوە، ئەوەندە دیاری و سەوقاتی دەگەڵ خۆدا بۆ ئەخیل ببات کە بتوانێ دڵی نەرم بکات!"

(١٢٠) زیوس ئەو قسانەی کرد. تیتیسی پێ زیوین، فەرمانی ئەوی لە ئەرزی نەدا. لە لوتکەکانی ئولیمبوسەوە داگەڕا. گەییە سەراپەردەی کورەکەی، سەیری کرد بەردەوام دەگری و دەناڵێنێ، هاورێ دڵسۆزەکانی بەدەوریا دێن و دەچن. سەرگەرمی ڕازانەوەی خوانی بەیانین. بەرانێکی گەورەی تیسکنیان کوشتبووەوە. دایکە هەژیەکەی لە تەنیشتیا

دانیشت. دەستی خستە سەر شانی گوتی: "کوڕی خۆم تۆ بەتەمای تاکەی بەخەم و گریان دلی خۆت ئازار بدەی، بێ ئەوەی بیر لە خواردن و دەست لەملانی ژنان بکەیەوە ؟!وا باشە خوو بدەیە دڵداری و ڕابواردن. چونکە من دەزانم و پێت دەڵێم، زۆرت لە ژیاندا نەماوە، مەرگ و چارەنووس زۆر لێتەوە نزیکن و بەدیار سەرتەوە وەستاون.. جا گوێم لێبگرە، من نوێنەری زیوسم، لای ئەوەوە هاتووم. پەیامی ئەوم پێیە کە دەڵێت خواوەندان زۆر لێت پەستن، ئەو لە هەموویان زیاتر لێت قەڵسە، چونکە تۆ چووی بەقیناو بەتەمای جەنازەکەی هیکتۆر لێرە، لەلای ئەم کەشتیانە گل بدەیەوە ونەیدەتیەوە بەخاوەنی. جا خێراکە تەسلیمی خاوەنی بکەوەو سەربەهایەکی مۆڵی لەبری وەربگرە."

(١٣٨) ئەخیل وەڵامی دایەوە: "باوابێ، مادامێکی ئەمری زیوس وایە. هەرکێ سەربەهاکەی دێنێ، بابیهێنێ و جەنازەکە بەرێتەوە!"

(١٤١) بەو جۆرە دایك و کوڕ لەنێو ئاپۆرەی کەشتییەکاندا زۆر بەڕوونی و ڕەوانی قسانیان کرد. لە هەمان کاتدا کوڕی کورنوس، ئایریسی بۆ تەروادەی پیرۆز نارد، پێی گوت: "ئەی ئایریسی لەزگین! هەرە بکەوەرێ، ئولیمبوس بەجێبێڵە و بەهەشتاو بچۆ بۆ تەرداوە، بۆلای پریامی ڕەشید و جوامێر، خەبەری بدەیە کە بچێ بۆ لای کەشتی ئاخاییەکان و سەربەها بدات و جەنازەی کوڕەکەی بکڕێتەوە. بەدەست و دیاری و سەربەهایەکی ئەوتۆوە بڕوات کە دڵی ئەخیل خۆش و نەرم بکات. بێ هەر خۆی بەتەنێ بچێت. هیچ جەنگاوەرێکی تەروادەیی لەگەڵ خۆیدا نەبات.دەتوانێ پیرە پیاوێك لەگەڵ خۆیدا بەرێ ،عەرەبانە و ئەسپەکانی بۆ لێخوڕێ و جەنازەکەی هیکتۆر کە بەدەستی ئەخیل کوژراوە بێنێتەوە بۆ شار. بێ بەهیچ جۆرێ لەدڵی خۆیدا نیگەرانی مەرگ نەبێ و لە هیچ شتێك نەترسێت. چونکە ئێمە هێرمیسی بکوژی ئارگۆسی لەگەڵدا دەنێرین تا دەیگەیەنەنێتە نزیکی خێوەتەکەی ئەخیل. هەر کە وەژوور کەوت ئیدی نەئەخیل دەیکوژێت و نەرێ بەکەس دی دەدات بیکوژێت. چونکە ئەخیل ئەوەندەش بێ هەست و بێ باوەڕ نیە کە فەرمانی خواوەندان لە ئەرز بدات. حیساب بۆ هەموو ڕەفتارێکی خۆی دەکات هیچ غەڵەتێك ناکات و زۆر بەڕێز و حورمەتەوە ڕێزی پاشایەك دەگرێت کە هانای بۆ بردووە."

(١٥٩) ئایریس، پەیامەکەی وەرگرت. لەجێی خۆی هەستا، وەکو با بۆی دەرچوو. ئایریس گەییە ماڵی پریام. ماڵی چی ،سەراپا شیوەن و گریان بوو. کوڕەکانی لەناو هۆڵی کۆشکەکەدا بەدەوری باپیانەوە ڕۆنیشتبوون و هەموو جلەکانیان لە فرمێسکدا تەڕ بوو

بوو. پیرە باب خۆی لە عەبایەکەیەوە پێچابوو، سەر و ملی یەکپارچە قوڕ و سیان بوو کە بۆ مەرگی کوڕەکەی لەسەری نابوو. کیژ و بووکەکانی لە سەرانسەری کۆشکەکەدا بۆ ئەو هەموو جەنگاوەرە ئازایانەی کە لە دەشتی تەروادەدا بەدەستی ئارگۆسییەکان کوژرابوون، دەگریان. نوێنەری زیوس خۆی گەیاندە نزیکی پریام، بەدەنگێکی نزم و هێدی دواندی. دڵی پریام داخورپا.. ئایریس گوتی: "ئەی پریام ئەی زادەی داردانوس ،دڵت هیچ نەکا، لە هیچ مەترسە. هیچ هەواڵێکی خراپ و ناخۆشم بۆ نەهێناوی. من لەلایەن زیوسەوە نێردراوم بۆلای تۆ. زیوس ئەگەرچی لەتۆوە دوورە، بەڵام تۆی لە بیرە و بەزەیی پێتدا دێتەوە. سەرداری ئۆلیمبوس ئەمرت پێدەکات کە هیکتۆری جوامێر بکڕییەوە، سەربەهایەکی مۆڵ لەبری جەنازەکەی هیکتۆر بدە. ئەوەندە دیاری و سەوقاتی بۆ ئەخیل بەرە کە خۆشحاڵ ببێ و دڵی نەرم ببێ..

(١٧٦) بەتەنێ خۆت بچۆ. هیچ جەنگاوەرێکی تەروادەیی دەگەڵ خۆ مەبە. دەتوانی پیرە میرئاخوڕ و خزمەتکارێك لەگەڵ خۆدا بەری کە عەرەبانە و ئەسپەکانت بۆ بازۆێ، ئەوجا ئەو جەنازەیەی کە بەدەستی ئەخیل کوژراوە بۆ شار بەرێتەوە. نە بیر لە مردن بکەوە و نە لە هیچ شتێك بترسە. چونکە زیوس هیرمیسی بکوژی (ئارگوس)ت لەگەڵدا دەنێرێ تا دەتگەیەنێتە نزیکی ئەخیل. هەر کە گەیشتیە ناو خێوەتەکەی، نە ئەخیل دەتکوژێت و نە ڕێ بەکەسی دی دەدات بتکوژێ. چونکە حیساب بۆ هەموو ڕەفتارێکی خۆی دەکات، نە ئەوەندە بێ ئەقڵە و نەئەوەندە کوڕت بینە و نەئەوەندە شەڕانییە کەسێك نەپارێزێ کە پەنای بۆ بردووە!"

(١٨٨) ئایریسی لەزگین هەر کە قسەکەی تەواو کرد، ڕێ و ڕێ گەڕایەوە. شاپریام ئەمری بەمناڵەکانی کرد کە عەرەبانە و هێستری بەقوەت و خۆشبەزی بۆ ئامادە بکەن و تابوتێکی سورەچنار بخەنە سەر عەرەبانەکە. ئەوجا بۆ خۆی چوو بۆ گەنجینەکەی، ژوورێکی بەرزی بۆن خۆش بوو. دەروازەکەی لەداری کونار دروستکرابوو. هێندەی شتی دەگمەن و توحفە تێدا بوو لە حەساو نەدەهات. هیکۆبای خێزانی بانگکرد وگوتی: "خانم، زیوس پەیامنێرێکی ناردوە فەرمانی وایە کە بچم بۆلای کەشتی ئاخاییەکان و جەنازەی کوڕە ئازیزەکەم بکڕمەوە. ئەوەندە دیاری و سەوقاتی لەگەڵ خۆدا بەرم کە ئەخیل پێی خۆشحاڵ ببێ و دڵی نەرم بێ. نازانم تۆ چ دەڵێی؟ پڕ بەدڵ تاسەمەندم کە بچم بۆ ئەوێندەر، بۆلای کەشتییەکان، بۆ ئۆردوگای پان و بەرینی ئاخاییەکان."

(۲۱۶) ئەو قسانەی کرد. هاوارێکی کرد، گوتی: "ئەیەرۆ!.. واوەیلا بەحاڵم! خۆ تۆ لە دێرزەمانەوە، لەنێو ئاشناو بێگانەدا بە بەردەبار و داناو دووربین ناسراوی، ئەقڵت کێوە چووە؟ چۆن دەتەوێ بەتەنێ بچی بۆ ئۆردوگای ئاخاییان و ڕووبەڕوو ئەو کابرایە بدینی کە ژمارەیەکی زۆری لە کوڕە قارەمانەکانت کوشتوە؟ بەڕاستی دڵت لە پۆڵایە ،چونکە ئەگەر ڕێت بکەوێتە ئاقاری ئەو، بەچاوانی خۆی بتبینێ، نەڕوحمت پێدەکات و نە ڕێز و حورمەتت دەگرێ. جا وەرە بائێستا لێرە، لە کۆشکەکەی خۆماندا، دوور لە هیکتۆر، بەکوڵ وبەدڵ بۆی بگرین. هەر لەو ڕۆژەوە کە لە دایك بوو ،لە داوێنی من کەوتە خوارەوە، چارەنووس تەقدیری وابوو کە لە غەریبیدا، دوور لە داك و بابی، لە ماڵی ئەو کابرا ستەمکارەدا ببێ بەخۆراکی کسۆکان. ئەو کابرا سامناکەی کە تەمەنا دەکەم دەستم بیگاتێ، جەرگ و هەناوی دەربێنم و بیخۆم، مەگەر تەنیا بەمە تۆڵەی ئەو غەدرە بکەمەوە کە لە کوڕەکەم کراوە.. کوڕەکەم بە ترسنۆکی نەمرد. بەڵکو مەرد و مەردانە بەرانبەری لێگرت. بەرگری لە پیاوان و ژنانی سینگ و بەرۆك پانی تەروادە کرد. بێ ئەوەی بیر لە خۆ شاردنەوە یا هەڵاتن بکاتەوە."

(۲۱۷) پریامی پیر کە لە خواوەند دەچوو لە وەڵامیدا گوتی: "ژێوانم مەکەوە. دڵم پێم دەڵا کە بڕۆم .لێم مەبە بەتەیری شومی ماڵەکەم، دەست مەیەنە ڕێم، هەر دەچم. ئەگەر بەشەرێك بەشەرێکی فانی یان کاهین و تەرکە دنیایەك لە پێناوی نەزر و قوربانیەکدا ئەم پێشنیازەیان بۆ بکردمایە هەقی خۆمان بوو بەداو و درۆی بزانین و بەهەندی نەگرین. بەڵام من بەگوێی خۆم گوێم لە یەزدانخانم بوو. بەچاوی خۆم ڕووبەڕوو بینیم.. هەر ئێستا دەکەومە ڕێ. هیچ ناچار نیە درۆم لەگەڵدا بکات. خۆ ئەگەر چارەنووس وای لە قەڵەمدابێ لەلای کەشتی ئاخاییەکان، ئاخاییانی جەنگاوەر بمرم، دەبا بمرم، بائەخیل بێ منەت بێ و بمکوژێت، بەمەرجێ بەر لە مردن کوڕەکەم لە هەمێز بگرم و بەکامی دڵ بەسەریا بگریم."

(۲۲۸) دوای ئەو قسانە سەری سەندوقە گەورەکانی هەڵدایەوە. دوانزە جبەی زۆر جوان، دوانزە باڵاپۆشی یەك بەرۆك، ڕایەخێکی زۆر، دوانزە سەرجێ و لێفە ،دەرزەنێك جبەی سپی، دەرزەنێك کراس، پاڵتۆ ،هەموو ئەمانەی لە سەندوقەکان دەرهێنا. ئەوجا دە تالان (تالان، پێوانەیەکی باوبووە لە یۆنانی کۆندا، بەرانبەر بەنزیکەی شازدە کیلۆگرامە) زێڕی کێشا، دوو سێپای درەخشان، چوار مەنجەڵ و جامێکی یەجگار جوان، کاتی خۆی کە

بەوەفد چوو بوو بۆ تراکیە، پیاوانی تراکیایی پێشکەشیان کردبوو، بەڕاستی توحفەیەکی یەجگار بەنرخ بوو. لەگەڵ ئەوەشدا پیرەمێرد نەیویست لە کۆشکەکەیدا بیهێڵێتەوە و نەیبات، چونکە یەجگار پەرۆشی کڕینەوەی کوڕە ئازیزەکەی بوو. پریام هەموو ئەمانەی ئامادەکرد، ئەوجا هەموو تەروادەییەکانی لە دالانەکە وەدەرنا و زۆر بەتوڕەیی سەرکۆنەی کردن گوتی: "نازانم ئێوەی شملی شەڕ چ دەکەن لێرە، بەڕاستی مایەی سەرشۆڕی و شەرمەزارین. ئێوە لە کاولی خۆتان هیچ خەمێکتان نیە، وا هاتوونە ئێرە و من پەست دەکەن؟. ئەوە بەس نیە کە کوڕی کورنوس ئەم کۆستەگرانەی داوە بەسەرما و ئازیزترین کوڕم ،مەردی مەردانەکەمی لێ ئەستاندمەوە؟ دەبینن کە مردنی ئەو چۆن کار لە ئێوەش دەکات. ئیدی ئاخاییەکان دەتوانن زۆر بەئاسانی پەلامارتان بدەن و بتانکوژن. بەڵام سەبارەت بەمن، من پڕ بەدڵ حەز دەکەم بەرلەوەی بەچاوی خۆم شارەکەم بەتاڵانکراوی و وێرانی بدینم، بمرم و بچمە هادیس!"

(٢٤٧) دوای ئەو قسانە بەگۆچانی فەرمانڕەواییەکەی، بەسەوڵەجانەکەی هەموو پیاوەکانی وەدەرنا، بەپەلە ڕۆیشتن. ئەوجا کەوتە گازکردنی کوڕەکانی: هیلینوس، پاریس، ئاگاتونی جوامێر، پامون، ئەنتیفونوس، پولیتیسی نەعرەتەکێشی مەیدانی شەڕ، دایفوپوس، هیپوتوس، و دیوسی شکۆدار.. بەدەنگی بەرز ئەو نۆ کوڕەی گاز کرد و ئەمری پێکردن کە: "وەرن ئەی کوڕانی زەبون و خوێڕیلەم.. وەرن ئەی مایەی شەرمەزاری..

(٢٥٤) سەد بریا هەر هەمووتان لەلای کەشتی ئاخاییەکان لە جیاتی هیکتۆر دەکوژران! چ پیاوێکی نەگبەتم من. لەم تەروادە پان و بەرینەدا ئازاترین کوڕم خستەوە و پەروەردە کرد. لێ بەداخەوە دوایان بڕایەوە و هیچیانم بۆ نەمایەوە!.. نەمیستوری خواوەندئاسا، نەترویلوسی جەنگاوەری گالیسکەڕان و نەهیکتۆر کە لە نێو بەشەراندا بەخواوەندیان دەژمارد، لەوە نەدەچوو کوڕی بەشەرێکی فانی بێ، پێدەچوو زادەی خواوەندێك بێ. هەموو ئەوانە ئێریس کوشتنی و لەنێوی بردن. ئەم گەجەر و گوجارانەی بۆ هێشتوومەتەوە کە مایەی شەرمەزارین و هەموو خوێڕێتییەکیان لێدەوەشێتەوە. ئەی دز و درۆزنان، قارەمانانی بەزم و سوڕ و چەقەنە. دزانی بەرخۆلە و کارژۆلانی هاوشارییانی خۆ، بۆ ناجولێن. خێرا ئەو عەرەبانە و هێسترانەم بۆ ئامادە بکەن. هەموو ئەو شتانەی لێ بار بکەن تا لەگەڵ خۆمدا بیبەم و بڕۆم!"

(٢٦٥) کوڕەکان کە گوێیان لە بۆڵە بۆڵی بابیان بوو ترسان. خێرا عەرەبانەی هێسترانیان

هێنایەدەر. عەرەبانەیەکی جوان و تازە و نفت و نوێ بوو. تابوتەکەیان لێ قایم کرد. نیرەی هێسترەکانیان کە بەسنگێکەوە هەڵواسرا بوو داگرت. ئەم نیرە لە دار شمشاد دروستکرابوو. چەمەرە و ئەڵقەی تایبەتی پێوە بوو بۆ ئاراستە کردن و هاژوتنی هێسترەکان. ئەوجا مژانەکەیان، کە نۆ گەز درێژ بوو، لە نیرەکە قایمکرد. بەهەرحاڵ جوان و پوختە عەرەبانە و هێستریان بەست و تەواویان کرد. ئەوجا چوونە ژوورەوە، دیاری و سەربەها مۆڵەکانیان هێناو لەناو عەرەبانەکەیان دانا. هێسترەکان هێستری باری بوون، کاتی خۆی میسیانیەکان وەکو دیاریەکی گەورە بەپریامیان پێشکەش کردبوو. ئەوجا ئەسپە تایبەتییەکانی پریامیان، کە پریام لە تەویلەکەی خۆیدا بەتایبەتی بۆ خۆی بەخودانی کردبوون، هێنا و لە گالیسکە تایبەتیەکەیان بەست.

(٢٨١) بەو جۆرە هەردوکیان، پریام و میرئاخورەکەی لەناو کۆشکە بڵندەکەدا، عەرەبانەکانیان ئامادە دەکرد، هەردوکیان لە بیر و ئەندێشەدا بوون.. لەوکاتەدا هیکوبا بەدڵی پڕ لە خەم و کەسەرەوە ،بەرەولای ئەوان هات. جامێکی زێرینی پڕ لە بادەی بەدەستی ڕاست هەڵگرتبوو، هیکوبا دەیویست بەرلەوەی بکەونە ڕێ بەناوی نەزر و قوربانیەوە ئەرزەکە بادەپڕژێن بکەن. لەبەردەم ئەسپەکاندا وەستاو ڕویکردە پریام و گوتی: "پریام، هانێ ئەم جامە بگرە، بەناوی باوکە زیوسەوە بەسەر ئەرزەکەیدا بیرژێنە، لێی بپاڕێوە کە بەسەلامەتی لای دژمنەکانتەوە بۆ ماڵ بگەڕێیەوە، مادامێکی سوری لەسەر ئەوەی کە بڕۆیت. هەرچەندە من لەگەڵ ئەم سەفەرەتدا نیم. ئەوجا لە کوڕی کرونوس ،خودانی هەوران کە لەو سەرەوە، لە لوتکەی ئیدای مەڵبەندی خۆیەوە سەرانسەری خاکی تەروادە لەژێر پێی خۆیدا دەبینێ،

(٢٩٢) بپاڕێوە ،داوای لێ بکە، پەیاماوەرێکی تیژ باڵ بەلای ڕاستتا بنێرێ، تەیری بەشارەتت بۆ بنێرێ کە لەلای ئەو ئازیزترین تەیرە و تەیرێکە کە بە بەهێزترین باڵندە دەژمێردرێ، تا تۆ بتوانی بەدیتنی ئەم تەیرە و ناسینەوەی، دڵنیابیت لەژیانی خۆت و بەئاسودەیی بەرەو لەنگەرگەی کەشتی داناییان، داناییانی خودان ئەسپێن ڕەهوان و خۆشبەز بڕۆی. بەڵام ئەگەر زیوس، کە چاوی هەمووان دەبینێ، تەیری بەشارەتی بەنوێنەرایەتی خۆی نەنارد، چەندیش دڵت بەو چوونەوە بێ، من هەرگیز هانت نادەم کە بچی بۆ ئەوێندەر."

(٢٩٩) پریام، ئەو خواوەند ئاسایە وەڵامیدایەوە و گوتی: "ژنەکە من ئەم تەگبیرەی تۆم

پێی باسە، بەگوێت دەکەم. جێی خۆیەتی دەستە و دوعا لە زیوس بپاڕێینەوە، چونکە نوێژ و نزا دڵی نەرم دەکات، میهر و بەزەیی دەخاتە دڵ." پیرەمێرد دوای ئەو قسانە داوای لە کارەکەرەکەی ماڵەوە کرد کە ئاوی پاك بێنێ و بیکا بەدەستیا. کارەکەرەکە، خێرا دەس شۆرێك و مەسینەیەك ئاوی هێنا. پریام دەستەکانی شت. جامە بادەکەی لە دەستی ژنەکەی وەرگرت. لە هۆڵەکەدا بەپێوە وەستا، بەدەم نوێژ و نزا و پارانەوەوە نواڕیە ئاسمان و بادەکەی بەسەر عاردیدا پرژاند. بەدەنگی بەرز گوتی: "ئەی بابە زیوس، ئەی ئەوکەسەی لە ترۆپکی ئیداوە ئاگاداریمان دەکەی، ئەی مەزنی مەزنان، ئەی خاوەن دەسەڵات و توانا، کارێکی وەها بکە لەسایەی ڕەحمەتی تۆدا بەسەلامەتی بگەمە خێوەتەکەی ئەخیل و ڕێز و حورمەتم بگرێ. خوادایە تەیری بەشارەت بنێرە، با لای ڕاستمەوە دەربکەوێ، ئەو تەیرەی کە لای تۆ بەهێزترین و ئازیزترین تەیرە. بینێرە با لەلای ڕاستمەوە دەربکەوێ، تا بەچاوانی خۆم بیبینم و باوەڕ بێنم کە بەسەلامەتی دەگەمە لای کەشتی دانایانی خودان ئەسپێن ڕەهوان و خۆشبەز."

(٣١٤) بەو جۆرە پاڕایەوە، زیوسی بردەبار ودانا گوێی لێ بوو ،دوعاکەی گیراکرد. دەستبەجێ هەڵۆیەکی نارد کە تیژباڵ ترین باڵندەی ڕاوچیە. بەشەران هەڵۆی ڕەشی پێدەڵێن، هەردوو باڵی کردنەوە، لەتۆ وایە دەروازەیەی کراوەی کۆشکێکی بەرزە، کۆشکی پیاوێکی دەوڵەمەند.. پانی باڵەکانی پیرە هەڵۆ بەئەندازەی ئەو دەروازەیە دەبوو. هەڵۆ لەلای ڕاستی شارەوە بەحەواوەوە دەرکەوت، باڵەکانی بەملاو بەولادا کردبووەوە. وەختێ بینیان دڵیان پڕبوو لە خۆشی و ئاسودەیی. پریامی پیر بەپەلە سواری عەرەبانەکەی بوو تا لە دالان و ڕاڕەوە پڕ دەنگەدەنگەکەی بەڕێتە دەرێ و بکەوێتە ڕێ و بڕوات. ئەو گالیسکە چوار تەگەرییەی کە جووتێ هێستری خرابووە ژێر و ئیدایوسی زانا لێی دەخوڕی لەپێش ئەوەوە دەرچوو. لەدوای ئەوەوە ئەسپەکانی پریام دەهاتن، کە پیرەمێر بەخۆ و قامچیەوە بەپەلە بەنێو شارا تاوی دەدان.

(٣٢٧) هەموو دەستە وبەستە وکەسوکارەکەی بەگریانەوە دوای کەوتبوون. دەتگوت بۆ کەسێك دەگرین کە بەرەو مەرگ دەچێ. کاتێ پریام و خزمەتکارەکەی لە شاروەدەرکەوتن و گەیینە دەشتەکە، کوڕ و زاواکانی پریام کە بەڕێیان کردبوو، بۆ تەروادە گەڕانەوە.

(٢٣١) بەڵام پریام و میرئاخورەکەی، ئیدایوس وەختێ گەیینە دەشتی تەروادە، زیوسی دووربین و ئاگادار لە هەموو شتان بینینی، بەزەیی بەپریامی پیردا هاتەوە، ڕویکردە

کوڕە خۆشەویستەکەی، هێرمیس و گوتی: "ئەی هێرمیس، چونکە تۆ لە هەمووان زیاتر ڕێنوێنی و هاوڕێیەتی بەشەرانت پێ خۆشە، گوێ لە داواکانیان دەگریت، هەرە پریام بەرە بۆلای کەشتی ئاخاییەکان، مەیەڵە هیچ داناییەك بیدینێ یان هەستی پێبکات، تا دەگاتە لای کوڕەکەی پیلیوس!"

(٣٣٩) زیوس، ئەو قسانەی کرد، هێرمیسی ڕابەر و پەیاماوەر، ڕوح سوك، فەرمانی وی لە ئەرزنەدا. دەستبەجێ سەندەڵە جوانەکانی، سەندەڵە زێرینە خواییەکانی لەپێ کرد، کە دەیتوانی بەهۆیانەوە بەسەر دەشت و دەر، ڕوبار و دەریایاندا وەکو با بفڕێ و بڕوات. گۆچانە ئەفسوناویەکەی هەڵگرت، کە دەیتوانی بەهۆیەوە هەر کەسێکی بوێ بیخەوێنێ، یان لە خەوی هەستێنێ، ئیدی بەگوێرەی پێویستی و ویستی خۆی.

بەو جۆرە هێرمیسی گۆچان بەدەست، وەکو با بۆی دەرچوو و لە چاو تروکانێکا گەییە تەرواده و هیلیسبونت. دیمەنی لە میرزادەیەکی زۆر گەنج و جوان دەچوو کە تازە خەتی دابێ.

(٣٤٩) کاتێ پریام و میرئاخورەکەی لە قسنەکەی ئیلیوسی مەزن ڕەت بوون، هێستر و ئەسپەکانیان ڕاگرت تا لە ڕوبارەکە ئاویان بدەن. تاریکی شەو باڵی بەسەر دەشت و دەردا دەکێشا. ئیدایوسی میرئاخوڕ چاوێکی بەچواردەورا گێڕا، هەستی بەهێرمیس کرد کە زۆر لێیانەوە نزیك بوو. بەپریامی گوت: "ئەی کوڕی داردانوس وریابە، ئەمە ئەو ساتەیە کە پێویستی بەبیری وردە. پیاوێك دەبینم بەرەو ئێرە دێت. پێموایە هاکا بمانگاتێ و پارچە پارچەمان بکات. جا وەرە یا بەعەرەبانەکانمانەوە هەڵێین، یا بەسەر دەست و پێیدا بکەوین و لێی بپاڕێینەوە کە ڕوحممان پێدا بکات!"

(٣٥٧) وەختێ پیرەمێرد گوێی لەو قسانە بوو دڵی داخورپا. هزر و بیری ئاڵۆزکا. ترسێکی گەورەی لێنیشت. لە شوێنی خۆی مات و حەیران ما، مووی لێ نەدەبزووت. بەڵام ئەو فریارەسە لەخۆیەوە هاتە بەرەوە، دەستی پیرەمێری گرت و لێی پرسی: "بابۆ، بەم شەوە تاریك و نوتەکە لە کاتێکا خەڵکی لە غوڕابی خەودان، تۆ بەم هێستر و ئەسپانەوە کێوە دەچێت؟"

(٣٦٤) ئایا لە ئاخاییانی شەڕڤانانی سەرسەخت و خوێن ڕێژ و ئاشقە شەڕ ناترسیت، ئەو دژمنانەی کە بەخوێنی تۆ تینون و لەم دەوروبەرەوە نزیکن؟ ئەگەر یەکێکیان بەم هەموو گەنجینە پڕ بەهایەوە لەم تاریکە شەوەدا بتبینێ چیت لێدەکات، حاڵت چ دەبێ؟

بەتایبەتی تۆ گەنجێك نیت، هاورێکەشت پیرە و ناتونێ بەرگریت لێ بکات و لە چەپاڵەی دژمنت بپارێزێ. بەڵام تۆ دڵ مەدە، من نەك هەر ئازارت نادەم، بەڵکو دەبمە رێنوێنت و لەهەر دژمنێکت دەپارێزم. چونکە تۆ لە بابم دەچیت."

(٣٧٢) هەنگێ پریامی پیر، ئەو خواوەند ئاسایە وەڵامی دایەوە و گوتی: "قسەی تۆیە ئەی کوری ئازیزم. ئەوەی تۆ دەیڵێی وایە. وادیارە خواوەندێك لە خەمی مندایە کە رێنوێنێکی وەکو تۆی ناردوە تا هاورێیەتیم بکەی. رێنوێنێکی جوان خاس، دەم و لەبز شیرین.. روح سووك و ئەقڵ پڕ و میهرەبان دڵ، کە دەبێ لە داك و بابێکی نەجیب و رەسەن بیت."

(٣٧٨) ئەوجا هیرمیس، رابەر و پەیاماوەر، وەڵامی دایەوە وگوتی: "ئەزبەنی تۆ راست دەکەی، هەرچیەکت گوت دروستە .بەڵام تۆ راست و رەوان پێم بێ ئایا تۆ ئەم هەموو گەنجینە جوان و پڕ بەهایانە دەبەی بۆ خەڵکانێکی بێگانە تا بۆتی هەڵگرن و بپارێزن. یان بەناچاری و لە ترسا تەروادەی موبارەك بەجێدێڵی، دوای ئەوەی قارەمانی هەرە گەورە و جوامێر، سەرتۆپی هەمووان، کورەکەت کوژرا، کە رۆژێ لە رۆژان دەستبەرداری شەری ئاخاییان نەبوو و سەری لەبەر دانەنواندن؟"

(٣٨٦) ئەوسا پریامی پیر، خواوەند ئاسا وەڵامی دایەوە وگوتی: "ئەی جوامێر تۆ کێی، داك و بابت کێن، کە بەو دڵسۆزی و سەنگینییە باسی چارەنووسی کورەکەی من دەکەی؟

(٣٨٩) هەنگێ هیرمیس، رابەر و پاسەوان، وەڵامی دایەوە: "ئەزبەنی وادیارە دەتەوێ پرسیاری هیکتۆری مەزن لە من بکەی و تاقیم بکەیەوە. زۆرجار بەچاوانی خۆم لەشەری ئاخاییاندا دیتومە کە چۆن بەرەو کەشتییەکانیان راوی ناون و بەرم و شیران تێیان کەوتووە. ئێمە بەسەرسامی لەوێندەر دەوەستاین و سەیرمان لە ئەخیل دەما کە چۆن فەرمانی شەرمان ناداتێ، لە کوری ئوتریوس غەزری بوو. رێگەی نەدەداین بچینە شەرەوە. من هاورێ و خزمەتکاری ئەوم هەردووکمان بەیەك کەشتی بۆ ئێرە هاتووین. من بابایەکی (مورمیدونی)م کوری (بولوکتور)م پیاوێکی زەنگینە، پیرە پیاوێکە لە تەمەنی تۆدا. شەش کوری هەیە. من حەوتەمیانم، کە قورعەمان کێشا بۆ ئێرە بێین، بەر من کەوت. ئەوە بوو بەگەڵ ئەخیل کەوتم .جا من ئێستا لەلای کەشتییەکانەوە هاتووم بۆ ئەم دەشتە، چونکە ئاخاییەکان لێبروان لەگەڵ بەرەبەیاندا لە دەوروبەری شاردا شەر

هەڵگیرسێنن. لە دانیشتن بێتاقەت بوون. سەریان لە شەڕ دەخورێ. سەرانی ئاخیایی ناتوانن ڕێگەی شەڕیان لێبگرن!"

(٤٠٥) پریامی پیری خواوەند ئاسا، هەڵیدایێ وگوتی: "ئەگەر بەراستی هاوڕێ و خزمەتکاری ئەخیلی، ڕاستیم پێ بێ کە ئاخۆ کوڕەکەم هێشتا لەلای کەشتییەکانە یان ئەخیل پارچە پارچەی کردووەو فڕێی داوەتە بەر کسۆکان؟"

(٤١٠) هیرمیس، ڕابەر و پەیاماوەری درەخشان وەڵامی دایەوە: "نەخێر، هێشتا، نە کسۆکان و نە سیسارکە کەچەڵان نەیانخواردوە، هێشتا لەوێندەر لەنێوان کەشتیەکاندایە، بەدەقی خۆیەوە ماوە. ئەمڕۆ دوانزە ڕۆژە لەوێیە، کەچی جەنازەکەی نە تێکچووە، نە بۆگەنی کردووە و نە کرم تێیداوە کەچی کرم داویەتە جەنازەی جەنگاوەرەکانی دی. ڕاستە ئەخیل هەموو ڕۆژێ بەدەوری گۆڕی هاوڕێکەیدا ڕایدەکشێت و دەیگێڕێت. بەڵام وێڕای ئەوەش بەدەنی نەشێواوە. کاتێ دێی و بەچاوی خۆت دەیبینی، سەرت سوڕدەمێنێ کە چۆن بەو تەڕی و تازەییە ماوە. پەڵە خوێنێکی پێوەنیە، پاك و خاوێن، هەموو زامەکانی سارێژ بووەتەوە، ئەگەرچی بەنوکی ڕمان کون کون کرابوو. دیارە خواوەندانی موبارەك و پیرۆز کوڕە دلاوەرەکەی تۆ ،هەرچەند جەنازەیەکی مردووە، تیمار دەکەن و دەیپارێزن. چونکە بەهەموو حاڵ و حیسابێك لە دڵیاندا ئازیز بوو!"

(٤٢٤) پیرە پریام کە بەمەیزانی دڵی خۆش بوو، گوتی: "کوڕی خۆم پێشکەشکردنی نەزر و قوربانیانی پێویست بەخواوەندان کارێکی جوان و چاکە. کوڕەکەی من لە ماڵی خۆماندا بەدرێژایی تەمەنی خۆی، هەرگیز خواوەندانی نیشتەجێی ئۆلیمبوسی لەیاد نەدەکرد. هەر بۆیە تەنانەت لە مردنەکەشیدا کە قەدەر لە چارەی نوسیوە، پاداشتی دەدەنەوە و دەیپارێزن! کەواتە پیاوی چابە ئەم جامە جوانەم بەدیاریی لێ وەرگرە، بەپشت و پەنای خواوەندان بم پارێزە و ڕێنوێنیم بکە تا دەگەمە خێوەتەکەی کوڕی پیلیوس."

(٤٣٢) هیرمیس وەڵامی دایەوە: "قوربان، تۆی پیری دنیادیدە دەزانی من هێشتا منداڵم، بۆیە دەتەوێ تاقیم بکەیەوە، کە دەتەوێ بەبێ ئاگاداری ئەخیل بەرتیل و دیاری لەتۆ وەربگرم. ئەمە مەحاڵە، ناتوانی ئەم کارەم پێ بکەی! چونکە من هەم دەترسم و هەم شەرم دەکەم ناپاکی و فێڵی لێبکەم، و بەکاری وا بێ ئەدەبانە خۆم عەیبدار بکەم .بەڵام تاوەکو (ئارگوس)ش لەگەڵتا دێم. لە ڕوبار و دەریایان دابێ، یان لە دەشت و دەران، دڵسۆزانە لە خزمەتتدا دەبم و تا منت لەگەڵدا بم، کەس حەدی نیە پەلامارت بدات."

(٤٤٠) هێرمیسی فریارەس، دوای ئەو قسانە خۆی هەڵدایە سەر گالیسکەکە و لە پشت ئەسپەکانەوە دانیشت، قامچی و جڵەوەکانی گرتە دەست، گوڕ و تاوێکی تازەی وەبەر ئەسپەکان خست. کاتێ گەیینە خەنەك و دیواری بەردەم کەشتییەکانن پاسەوانەکان مژوڵی ئامادەکردنی شیوبوون. هێرمیس خێرا خەوی لە هەموویان خست. ئەوجا دەروازەکانی کردەوە. پشتکۆڵی دەروازەکەی نایەلاوە، پریام و گەنج و دیارییەکانی کە بەسەر گالیسکەیەکی چوار تەگەرییەوە بوو، وەژوور خست. بەو جۆرە گەیینە بارەگای کوڕی پیلیوس. بارەگایەکی بەرز بوو کە (مورمیدون)ەکان لە قەد و لق و پۆی دارکاژ بۆ خودان و سەروەری خۆیان، ئەخیل دروستیان کردبوو، هەژگ و بژاڵ و چرپی و چاڵیان لە دەشت و مێرگان دوری بووەوە و هێنابوویان سەرەکەیان پێگرتبوو. بەچواردەوری بارەگاکەدا حەوشێکی گەورەیان دروست کردبوو. کۆڵەکەی گەورە گەورەیان لە نزیکی یەکترەوە لە عاردی چەقاندبوو. تەیمانێکیان دروست کردبوو، زۆر مکوم و قایم. دەرگایەکی هەبوو بەپشتکۆڵێکی زۆر قەبەی دارکاژ قایم دەکرا. دەرگاکە سێ زەلامی ئاخایی دەویست تا بیکەنەوە. سیانیشی دەویست کە پیشتکۆڵەکەی ڕاکێشن. بەڵام ئەخیل بەتاقی تەنێ دایدەخست و دەیکردەوە.. (هێرمیس)ی فریارەس دەرگاکەی بۆ پیرەپریام کردەوە، دەست و دیاری و گەنجەکانیشی لەگەڵدا وەژوور خست، ئەوجا خۆی هەڵدایە سەر عاردی وگوتی: "ئەزبەنی من خواوەندم.. من (هێرمیس)م، بابم ناردمی تا لە ڕێگە ڕێنوێنت بم. بەڵام ئێستا من دەگەڕێمەوە، تا ئەخیل نەمبینێ، چونکە نابێ خواوەندێکی نەمر، بەو ئاشکراییە دۆستایەتی بەشەرانی فانی بکات. بەڵام تۆ وەژوورکەوە، خۆت بخە سەر دەست و پێی ئەخیل، بەناوی دایك و بابیەوە، بەناوی دایکە جوانەکەیەوە، بەناوی کوڕەکەیەوە لێی بپاڕێوە تا سۆزی بجوڵێ و دڵی نەرم ببێ."

(٤٦٨) هێرمیس، دوای ئەو قسانە بەرەو ئولیمبوسی سەربەرز وەڕێکەوت. پریام لە عەرەبانەکەی خۆی هەڵدایە خوارێ. ئیدایوسی لەلای ئەسپ و هێسترەکان بەجێهێشت. ڕێك بەرەو ئەو ژوورە چوو کە نیشتمانی ئەخیلی حەبیبی خواوەندان بوو. ئەخیلی لە ژوورەکەی خۆیدا بینی کە پیاوەکانی دوورا و دوور بەدەوریا دانیشتبوون، تەنیا دووانیان نەبێ، ئوتومیدونی قارەمان و ئەلکیموسی زادەی ئاریس کە لە نزیکەوە سەرگەرمی خزمەتکردنی بوون. تازە لەنان خواردن بوو بووەوە و لەسەر سفرە وخوان هەستا بوو.

(٤٧٥) خوانەکە هێشتا کۆنە کرابووەوە. پریام بێ ئەوەی کەس بیبینێ وەژوور کەوت.

هەرکە لە ئەخیل نزیکبووەوە، باوەشی بەهەردوو ئەژنۆیدا کرد، دەستە دزێوەکانی، دەستەخوێن ڕێژ و کوشتۆخەکانی کە ژمارەیەك لە کوڕەکانی ئەوی پێ کوشتبوون ماچ کرد.

(٤٨٠) وەکو چۆن پیاوێك زاڵمانە و بەنەهەق لە وڵاتی خۆیدا کەسێك دەکوژێت، ئەوجا هەڵدێ بۆ وڵاتێکی بێگانە و پەنا وەبەر کەسێکی دەوڵەمەند دەبات و ئەوانەی دەیبینن واقیان وڕدەمێنێ و دەحەپەسێن، (ئەخیل)ش بەهەمان شێوە کە چاوی بە پیرە پریامی خواوەند ئاسا کەوت، بەجارێ ئەبڵەق بوو. دەستەو بەستەکەشی دووچاری سەرسامی بوون و بەواقی وڕەوە دەیانڕوانیە یەکتر. ئەوسا پیرە پریام بەدەم گریانەوە کەوتە تکا و ڕجا لە ئەخیل و گوتی: "ئەخیل، ئەی ئەو کەسەی لە خواوەندان دەچیت، بابی خۆت وەبیربێنەوە، بیکە بەخاتری بابت، ئەو بابەی کە لە تەمەنی مندایە و پیری بەر دەرکەی پێگرتووە، ڕەنگە دەوروبەرەکەی خراپەی دەگەڵ بکەن و کەس نەبێ لەسەری بکاتەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبیستێ تۆ هێشتا لە ژیاندای، بەو ئومێدە دەژی و دەژێتەوە کە کوڕە ئازیزەکەی لە تەڕوادەوە بۆ ماڵ دەگەڕێتەوەو دەیبینێ. هەر نەبێ ئەو بەو هیوایە دەژی. بەڵام من، منی نەحس ،منی نامووبارەك، ئازاترین کوڕانی خاکی تەڕوادەم، تەڕوادەی بەبرشت و پان و بەرین خستەوە، بەڵام شتاقیانم بۆ نەمایەوە. کاتێ ئاخاییەکان بۆ ئێرە هاتن پەنجا دانە کوڕم هەبوون. نۆزدەیان هی یەك دایك بوون. ئەوانی دی لە کارەکەر و قەرەواشەکانی ناو کۆشك و ماڵەکەم بوون. ئەریسی دڵڕەق لاقی زۆربەیانی کێشایەوە، جگە لە هیکتۆر کە تەنیا باڵ هەر بەخۆی پاسداری شار و پارێزگاری خەڵکەکەی دەکرد، کەسم بۆ نەمایەوە. ئەویش لە گەرمەی بەرگریدا، بەرگری لە وڵاتەکەی، تۆ کوشتت. جا ئێستا لە پێناوی ئەودا هاتووم بۆ ئێرە. هاتووم جەنازەکەیت لێ بکڕمەوە، سەربەها و دیارییەکی زۆرم لەگەڵ خۆدا بۆ هێناوی. جا ئەخیل، سەرێ هەڵبڕە و خواوەندان بەهەق بناسە، بیر لە بابی خۆت بکەوە، بەزەییت بەمندا بێتەوە ،ئەوەی بەسەر من هاتووە، بەسەر هیچ کەسێکی ئەم سەرزەمینەدا نەهاتووە. من توانیمە کارێ بکەم کە هێشتا هیچ بنیادەمێك نەیکردووە. من دەستی بکوژی کوڕەکەم ماچ دەکەم!

(٥٠٧) پیرە پریام بەو جۆرە پاڕایەوە، ئەخیل بابی بیرکەوتەوە و دڵی پڕبوو لە گریان. دەستی پیرە پریامی گرت و زۆر بەنەرمی و ئارامی لە خۆی دوورخستەوە. ئەوجا هەردووکیان لە کانگای دڵەوە بەکوڵ گریان. پریام کە بەسەر دەست و پێی ئەخیلدا

کەوتبوو ،بۆ هیکتۆری جوامێر و شەڕڤان دەگریا ،(ئەخیل)ش جاریٚ بۆ بابی و جاریٚ بۆ پاترۆکلۆسی هاوڕێی دەگریا ئەمما گریان. هۆڕژنی گریانیان سەرانسەری بارەگا و سەراکەی پڕکرد. دوای ئەوەی ئەخیل تێرگریا، کوڵی دڵی دامرکایەوە و هێز وەبەر چوارپەلی هاتەوە، لە جێگەکەی خۆی هەستا

(٥١٣) دەستی کابرای پیرەمێری گرت. زۆری بەزەیی بەپۆر وردێنیٚ چەرموویدا هاتەوە. ئەوجا سەری قسەی دامەزراند و گوتی: "ئاە! ئەی داماوی کلۆڵ، بەڕاستی دەرد و ئازارێکی زۆرت بەسەر هاتووە .باشە چۆنت وێراوە بەتاقی تەنیٚ بۆلای کەشتی ئاخاییەکان بێی و خۆت پیشانی من، بکوژی کوڕەکانت بدەی؟ بەڕاستی تۆ دڵت لە ئاسنە! فەرموو لەم جێگەیەی من ڕۆنیشە، ئەگەرچی دەردی دڵمان گرانە، بەڵام دەبیٚ لەناخی خۆدا بینێژین، گریان هیچی لیٚ شین نابیٚ. ئیدی ئەمە چارەنووسێکە و خواوەندان بۆ بەشەرانی فانیان تەنیوە، چار نیە دەبیٚ بەدەرد و ئازارەوە بژین، کەچی بەخۆیان (خواوەندان) دوورن لەهەر خەم و نیگەرانیەك!.. بێفایدەیە.. لە بارەگا و سەرای زیوسدا دوو گۆزەی پڕ هەن، یەکێکیان پڕە لە خەم و پەژارە و ئەویتریان پڕە لە شادی و کامەرانی، زیوس ئەم گۆزانە دابەش دەکات، جا بەشی هەر کەسێك ئەگەر تێکەڵەیەك بیٚ لە ناواخنی هەردووك گۆزەکە، جاریٚ تووشی خەم و پەژارە دەبێت، جاریٚ تووشی شادی و کامەرانی.بەڵام ئەو کەسەی کە زیوس تەنیا ڕەنج و پەژارەی دەداتیٚ، ئەوا لەلایەن تیرەی بەشەرەوە دەبێزریٚ، ئیدی عەزرەتی نانێکی ئیسراحەت دەبیٚ. بێتاقەت و سەرگەردان و ئاوارە وەکو سەگی پیٚ سوتاو بەم دنیایەدا دەسوڕێتەوە، نەخواوەندان ڕێزی دەگرن و نەبەشەران قەدری دەزانن! ئیدی ئینسان هەرچیەك بیٚ ئیسراحەتی نیە، بۆ نمونە خواوەندان هەمیشە و لە ڕۆژی لە دایکبوونەوە (پیلیوس)یان بەسەر کردۆتەوە، موڵك وماڵێکی فرەیان داوەتیٚ، لە هەموو کەسێك دەوڵەمەندتر و دەستڕۆترە، پاشای مورمیدونەکان بوو، هەرچەند بەشەر بوو، خواوەندان یەزدانخانمێکیان کرد بەهاوسەری.. کەچی بەو حاڵەشەوە خواوەندان بەدبەختی و نەگبەتیان بەسەر ئەویشدا داوە. هەرگیز لە کۆشك و سەراکەی خۆیدا کوڕێکی نەبینی کە جێی ئەو بگرێتەوە و لەدوای ئەو مەملەکەتەکەی بەڕێوەببات.تاقە کوڕێکی بوو کە تەمەنی زۆر کورت دەبێت.. ئەو کە ئێستا بەساڵاچووە و توانای نەماوە، من ناتوانم یارمەتی بدەم .چونکە دوورم لە وڵاتی خۆم. لە تەروادەدا گیرم خواردووە تا ببمە بەڵای گیانی تۆ و کوڕەکانت. ئەدی تۆ ئەی پیرەمێر، ئێمە

وامانزانیوه کە تۆش پیاوێکی زۆر بەختەوەر و کامەران بووی. دەیانگوت تۆ بەحوکمی ڕەنگینی و زۆری کوڕەکانت گەورە و فەرمانڕەوای سەرزەمینێ بوویت کە سەرانسەری لسبوس، مەملەکەتی ماکار و فروجیا و (هیلیسبونت)ی لەخۆ گرتووە. کەچی خواوەندان ئەم بەڵایەیان بۆ ناردیت، شەڕ و خوێن ڕشتن و بەشەرکوژی دەوری شارەکەی داویت و بەردەرکەی پێگرتوویت و لێت نابێتەوە.

(٥٤٩) کەواتە مەگری ئەزبەنی مەناڵە. خەفت خواردن بۆ کوڕە دلێرەکەت دادات نادا، بەگریان ناژێتەوە، دوورنیە تووشی بەڵایەکی دیکە ببی!"

(٥٥٢) پیرە پریامی خواوەند ئاسا بەرسڤی دایەوە و گوتی: "ئەی زیوس زادە، مادامێکی هیکتۆر لەنێو خێوەتەکاندا بەبێ ناز لەو گۆڕە کەوتووە، داوای دانیشتن لە من مەکە. نا نەخێر ئەو داوایەم لێ مەکە، لە جیاتی ئەوە خێراکە ئەم دیاری و (سەربەها) مۆڵەم لێوەربگرە و جەنازەکەم وێدەوە تا بەچاوی خۆم بیدینم. هیوادارم سوود لەم سەربەها و دیاریانە ببینی و بەسەلامەتی بۆ وڵاتی خۆت بگەڕێیەوە، چونکە تۆ منت نەکوشت و هێشتت جارێکی دی تیشکی هەتاو بدینم!"

(٥٥٩) ئەخیل، بڕۆی وێك هێنانەوە، تووڕەبوو وگوتی: "لەوەی پتر سەرمەکە سەرم ئەی پیرەمێرد. من بەخۆم لە بیری ئەوەدام کە هیکتۆرت بدەمەوە. چونکە دایکم کە من لە خوێنی ئەوم، کیژی (پیر)ی دەریا، بەنوێنەرایەتی زیوس بۆ ئەو مەبەستە هاتبوو و فەرمانی زیوسی پێڕاگەیاندم. هەر وەها سەبارەت بەتۆش ئەی پریام، هەڵبەتە یەکێك لە خواوەندەکان تۆی گەیاندووەتە لای کەشتی ئاخاییەکان، من هەست بەمە دەکەم و تۆ ناتوانی لێمی بشاریتەوە. چونکە هیچ بەنی بەشەرێك، تەنانەت ئەگەر لە تافی لاوی و بەهێزیشدا بێت، ناتوانێ زاتی ئەوە بکات و بگاتە ئۆردوگای ئێمە و نەیەڵا پاسەوانەکان پێی بزانن. ناتوانێ بەو ئاسانیە پشتکۆڵی دەروازەکانی ئێمە بکاتەوە و وەژوور بکەوێ.. جا لەبەرئەوە لەوەی پتر ئازاری ڕوحم مەدە، نەبادا هەرچەندە بەتکاکاری هاتووی بۆلام، لەنێو خێوەتەکانمدا تۆش بکوژم و فەرمانی زیوس لە زەوی بدەم."

(٥٧١) پیرە پریام کە گوێی لەو قسانە بوو ترسا و بێدەنگ بوو. ئەوسا کوڕی پیلیوس وەکو شێرێك ڕاپەڕی و لەژوور وەدەرکەوت. هەر بەتەنێ نەبوو بەڵکو دووان لە خزمەتکار و میرئاخورەکانی لەگەڵیا چوون. ئەوانیش جەنگاوەران ئوتومیدون و ئەلکیموس بوون، کە ئەخیل لە پاش مەرگی پاتروکلۆس لە هەموو کەس پتری خۆشدەویستن و ڕێزی دەگرتن.

ئەوانە ئەسپ و هێسترەکانیان لەژێر نیر هێنایە دەرێ. خزمەتکار و میرئاخورەکەی (پیرە پریام)یان هێنایە ژوورێ. لە شوێنێکی باشدا دایاننا. دیاریی و سەربەهاکانی هیکتۆر یان لە گالیسکە چوار تەگەرییەکە داگرت. دوو عەبا و کراسێکی جوانیان لەناو عەرەبانەکەدا هێشتەوە، تا ئەخیل لە جەنازەکەی هیکتۆریانەوە وەپێچی و تەسلیمی بابی بکاتەوە، تا بۆ وڵاتی خۆی بەرێتەوە. ئەخیل کارەکەرەکانی گاز کرد، ئەمری پێکردن کە لاشەکەی هیکتۆر پاك بشۆن، سەراپای بەزەیت چەور بکەن. هەڵبەتە پێشوەختە تەگبیری ئەوەشی کردبوو کە لاشەکە ببەنە پەنایەکەوە، تا پریام نەبینێ. چونکە ئەخیل لەوە دەترسا کە پیرەمێردی خەمبار بەدیتنی جەنازەی کوڕەکەی، نەتوانێ تورەیی خۆی جڵەو بکات و ئەخیل کەللەیی ببێ و فەرمانی زیوس لە ئەرز بدات و بیکوژێت. پاش ئەوەی کارەکەرەکان لەشتن و چەورکردنی جەنازەکە بوونەوە، جلێکی جوانیان لەبەرکرد. ئەخیل بەخۆی هەڵیگرت و خستیە سەر دارە مەیتەکە. ئەوجا هاورێکانی دەستباریان داو خستیانە سەر عەرەبانە مکوم و نایابەکە. ئەوجا ئەخیل بەدەنگی بەرز ئاهێکی ساردی هەڵکێشا و بەناو ناوی هاورێکەی هێناو گوتی: "ئەی پاتروکلۆس! هەرچەندە تۆ لە هادیس دای، ئەگەر بیستتەوە من هیکتۆری موبارەکم داوەتەوە بەبابی، لێم زویر مەبە، چونکە سەربەهایەکی یەجگار مۆڵی داومەتێ. هەر شتێکی شایستەی تۆ بێ، بۆ تۆی دادەنێم!"

(٥٩٦) ئەخیلی موبارەك دوای ئەو قسانە بۆ خەرگەکەی خۆی گەڕایەوە. لەسەر کورسییە نەرم و نایابەکەی خۆی کە لە سوچی ڕاستی دیوارەکە و بەرانبەر بەکورسیەکەی پریام بوو دانیشت. ڕووی کردە پریام و گوتی: "ئەی پیرەمێر، ئەوا وەکو چۆن خۆت دەتویست بەو ئاوایە کوڕەکەم دایتەوە. لەسەر دارە مەیتە وسبەینێ لەگەڵ سپێدەدا دەیبینی و لێرەی دەبەی. بەڵام ئێستا کاتی شیوە. دنیا لەدوای کەس تەرك ناکرێ. تەنانەت نیوبی نازدار، کە دوانزە منداڵی لە ماڵەکەی خۆیدا مرد، نان و خوانی پێ تەرك نەکرا: شەش کیژ و شەش کوڕ لە هەرەت و تافی لاویدا، ئەپولۆ کە لە نیوبی چوو بوو بەقینا، بەتیری کەوانە زیوینەکەی کوشتنی. کیژەکانیش ئەرتەمیسی کەواندار کوشتنی. چونکە نیوبی فەخری بەسەر لیتودا کردبوو کە لیتو تەنیا دوو منداڵی بووە. هەر ئەپولۆ و ئەرتەمیسی بووە. کەچی ئەم دایکێکی پڕ سك و زایە و منداڵی زۆری خستوەتەوە.. بەو جۆرە جووتە خواوەند هەموو منداڵەکانی (نیوبی)یان کشوت. نۆ دانە ڕۆژی ڕەبەق لە خاك و خوێنا مانەوەو کەس نەبوو بیان نێژێ و پرسەیان بۆ دابنێ. چونکە کوڕی کورونۆس دڵی

خەڵکەکەی کردبوو بەبەرد. ئەوە بوو ڕۆژی دەیەم کوڕانی ئاسمان، خواوەندان، بەخۆیان ناشتیانن. نیوبی کە لە گریان و فرمێسك ڕشتن ماندو بوو بوو، بیری لە خواردن کردەوە. هەرچەندە باری هەندە گران بوو کە لە کێوی ڕووتەنی (سیبولوس)دا بوو بەتاشە بەردێك، کە پڕە لە دەخمەی پەریانی دەریایی. ئەوانەی بەدەوری ڕوباری ئاخیلوسدا، دەرەقسن. ئێستاش، هەرچەندە بووە بەبەرد کە بەدبەختی و نەگبەتیەکانی خۆی بیردەکەوێتەوە بەکوڵ و بەدڵ دەگری. کەواتە پیرەمێر با بەسەر دەردی خۆماندا زاڵ بین و دەست بەنان خواردن بکەین.. پاشان کە کوڕە ئازیزەکەت بۆ تەرواده بردەوە تا دەتوانی بۆی بگری."

(٦٢١) ئەخیلی لەزگین هەر کە ئەو قسەیەی کرد هەستا. بەرخێکی سپی سەربڕی. خزمەتکارەکانی کەوڵیان کرد و جوان چاکیان کرد. وەستایانە جنیان، لە شیشیان دا، بەجوانی برژاندیان. ئەوجا هەموویان لە شیشەکان داماڵی، ئەوجا ئوتومیدون نانی هێنا زۆر بەجوانی لەسەر خوانەکە سەفتەی کردن. ئەخیل بەخۆی گۆشتەکەی لەسەر خوانەکە دانا. ئەوجا دەستیان بەنان خواردن کرد. دوای ئەوەی تێر و پڕیان خوارد و خواردەوە، پریامی کوڕی داردانوس زۆر دڵبەندی ئەخیل بوو. چەند جوان بوو. چەند بەسام بوو. لەتۆ وایە خواوەندە. (ئەخیل)ش لەلای خۆیەوە دڵبەندی پیرە پریام بوو. بەدەم گوێگرتنەوە چ سام و هەیبەتێکی هەبوو. پاش ئەوەی تێر تەماشای یەکتریان کرد، پیرە پریامی خواوەند ئاسا هەڵیدایێ و گوتی: "ئەی زیوس زادە خێرا نوێنەکەم پێ نیشان بدە بەڵکو تا خەوم نەزڕاوە تاوێ دەخەوم. باوەڕ دەکەی لەو ڕۆژەوە کە تۆ کوڕەکەت کوشتوم خەو نەچووەتە چاوانم. هەمیشە هەر خەریکی گریان بووم، بەدەم خەم و داخەوە لە تەویلەکەی خۆمدا تلم داوە. لەوساوە تا ئێستا هەر بەناشتا بووم، ئەمە یەکەمجارە تامی خواردن و خواردنەوەبکەم."

(٦٤٢) ئەخیل فەرمانی بەخزمەتکار و کارەکەرەکانی دا کە لە تارمەکەدا جێگە بۆ میوانەکان چاك بکەن و بەجوانترین سەرجێ دایبپۆشن وجلی خوری ئەستور بۆ پریام و ئیدایوس دابنەن تا لەکاتی نوستندا لەبەری بکەن. یەکسەر کارەکەرەکان مەشخەڵ وەدەست لە هۆڵەکە وەدەر کەوتن، زۆر بەپەلە دوو نوێنیان ڕاخست. هەنگێ ئەخیلی لەزگین بەسوعبەتەوە بەپریامی گوت: "ئەزبەنی، هەر لە دەرەوە بنووە نەبا یەکێك لە ئاخاییەکان، لەو دەمڕاست و ڕاوێژکارانەی کە هەمیشە دێنەلام بۆ ڕاوتەگبیران، ئێستا

پەیدا ببێ و لەم تاریکە شەوەدا بتبینێ و بچێ ئاگامەمنونی سەرداری لەشکر ئاگادار بکاتەوە و مەسەلەی دانەوەی جەنازەکە دوابکەوێ. جا با واز لەمە بێنین، ڕێك و ڕەوان پێم بێ چەند ڕۆژت بەسە بۆ ڕێوڕەسمی پرسە و ناشتنی هیکتۆری مەزن تا لەو ڕۆژانەدا شەڕ ڕابگرم و نەیەڵم لەشکر هێرش بکات؟

(٦٥٩) پیریامی پیر ،خواوەند ئاسا وەڵامی دایەوە: "ئەگەر تۆ بەڕاستی پێت خۆش بێ من ڕێوڕەسمی پرسە و مەرگ بۆ هیکتۆری جوامێر ئەنجام بدەم، ئەی ئەخیل بەم کارەت منەتبارم دەکەیت. بێگومان بەخۆت دەزانی ئێمە لە چ تەنگانەیەکداین و شارەکەمان چۆن گەمارۆدراوە،

(٦٦٢) و زۆر دوورین لەو چیایەوە کە دار و چڵ و چێوی لێ دەبڕین و دێنین. تەروادەییەکان زۆر دەترسن. ئێمە دەتوانین نۆ ڕۆژ لە ماڵەوە بەدیارییەوە بگرین. ڕۆژی دەیەم دەینێژین و نان و خوانی تازیە بۆ خەڵکەکە ساز دەکەین. لە ڕۆژی یازدەیەمدا گۆڕێك لەسەر خۆڵەمێشەکەی هەڵدەبەستین. لە ڕۆژی دوازدەیەمدا ئەگەر پێویست بکات دەستی بەشەڕ دەکەینەوە." ئەخیلی مەزن بەرسڤی دایەوە، گوتی: "ئەی پریامی بەڕێز، تۆ هەرچییەك دەڵێی ئەمرەو، جێبەجێکردنی لەسەر منە. من شەڕ تا ئەو ڕۆژەی تۆ گەرەکتە ڕادەگرم!"

(٦٧١) بەدەم ئەو قسانەوە دەستی خستە سەر مەچەکی ڕاستی پیرەمێر، تا دڵنیای بکات کە هیچ خەم و ترسێکی نەبێ. ئەوجا پریام و میرئاخوڕ و خزمەتکارەکەی لەبەر دالانی سەراکەی ئەخیلدا بەڕوحی پڕ لە نیگەرانیەوە لێی ڕاکشان. بەڵام ئەخیل لە ژووری سەرا مکوم و قایمەکەیدا، لەگەڵ پریسیسی نازدار و خشکۆکدا نووست.

(٦٧٧) هەموو خواوەندان و بەشەران بەدرێژایی شەو بۆ خۆ لێی خەوتن، تەنیا هێرمیسی فریاڕەس نەبێت خەو نەچووە چاوانی. بیری لەوە دەکردەوە چۆن شا پریام بگەڕێنێتەوە و لەکەشتی ئاخاییەکان دووری بخاتەوە بێ ئەوەی پاسەوانە بەهێزەکانی دەروازەکان بیاندینن. بەدیار سەریەوە وەستاو گوتی: "پیرەمێر، تۆ لەم دەمەدا، بیر لە هیچ مەترسیەك ناکەیەوە، چونکە ئەخیل نەیکوشتویت، بێ خەم و ترس لەنێو دژمنەکانتدا خەوتووی.. ڕاستە تۆ کوڕەکەت بە سەربەهایەکی مۆڵ کڕیوەتەوە، بەڵام ئەگەر ئاگامەمنون، کوڕی ئوتریوس و ئاخاییەکانی دی بتناسنەوە و بزانن لێرەی ،کوڕەکانی دیکەت دەبێ لە پێناوی پاراستنی ژیانی تۆدا سەربەهایەکی سێ چەنانە بدەن."

(٦٨١) پیرە پریام کە گوێی لەو قسانە بوو زۆر ترسا و ڕابوو،خزمەتکارەکەی لەخەو هەستاند. هیرمیس هێستر و ئەسپەکانی لەژێر عەرەبانەکانیاندا بۆ دابەستن. بەخۆی زۆر بەلەزبەنێو ئۆردوگاکەدا، بێ ئەوەی بێێ کەس پێیان بحەسێ ئاژوتنی. تا گەییشتنە بواری ڕووباری ئیکسانتۆسی موبارەك، زادەی زیوسی نەمر ،ساف و زولاڵ و بەخوڕ، هیرمیس بۆ ئۆلیمبۆسی سەربەرز گەڕایەوە. ئیدی سپێدە بەیانی دا و هەموو گۆی زەوی ڕوناك کردەوە. هەنگێ پریام و میرئاخوڕەکەی بەدەم گریە و زارییەوە عەرەبانەکانیان بەرەو شار ئاژۆت. جەنازەکەی هیکتۆر بەسەر عەرەبانەی هێسترەکانەوە بوو. هیچ کەسێك لە پیاوان و ژنانی قەد باریك پێیان نەحەسی.

(٦٩٩) تەنیا کاساندرا نەبێ کە دەتگوت ئەفرۆدێتی زێڕینە. کاساندرا لەسەر بورجی پرگامۆس وەستابوو. بابە ئازیزەکەی بینی لەنێو عەرەبانەکەیدا وەستاوە. هەروەها میرئاخوڕ و جارچییەکەی شاریشی (ئیدایوس) بینی. ئەوجا هیکتۆری بەسەر دارمەیتێکەوە لەسەر عەرەبانەی دوای هێسترەکان بینی. ئیدی بەسەرانسەری شاردا کەوتە هاوار و شیوەن: "ئەی پیاوان و ژنانی تەروادەیی، وەرنە پێشوازی هیکتۆر، ئەو هیکتۆرەی کە حەزتان دەکرد کاتێ بەزندویەتی لەشەڕ دەگەڕێتەوە بیدینن. جا ئێستا وەرن تەمەشای بکەن. تەماشای ئەو کەسە بکەن کە مایەی سەربەرزی و شادی شارەکە و خەڵکی شارەکەمان بوو."

(٧٠٧) دوای ئەو قسانە تاقە کەسێك نە پیاو نە ژن لە شاردا نەمایەوە. خەم و پەژارەیەکی بێ ئامان باڵی بەسەر هەمووآندا کێشا. هەموو بەرەو دەروازەکان، بەرەو پیری پریام کە جەنازەکەی بۆ وڵات هێنابووەوە، هێرۆژمیان برد. بەر لە هەمووان ژنە ئازیزەکەی هیکتۆر و دایکە هەژیەکەی گەییشتنە سەری ،خۆیان دا بەسەر عەرەبانەکەدا، هەردووکیان لەیەك کاتدا باوەشیان بەسەریاکرد و کەوتنە شیوەن و قژ ڕنینەوە. حەشامەتەکە بەگریانەوە دەوریان دابوون. ئەگەر پریامی پیر لەسەر عەرەبانەکەوە هاواری لێ نەکردبان، تاکو ڕۆژئاوا لەوێ بەدیار جەنازەکەوە دەگریان و شیوەنیان دەگێڕا. بەڵام پیرە پریام لەسەر عەرەبانەکەیەوە هاواری لێکردن، گوتی: "ڕێگە بەردەن باهێسترەکان ڕەت بن، دوای ئەوەی جەنازەکەم گەیاندە ماڵەوە تا حەز دەکەن هەر بگرین."

(٧١٨) دوای ئەو قسانە تەروادەییەکان لاکەوتن و ڕێگەیان بۆ گالیسکەکە کردەوە. دوای ئەوەی پریام و دەستە وبەستەکەی لاشەکەی هیکتۆریان گەیاندە ماڵەوە، لەسەر

تەختێکی بەشکۆ ڕایان کشاند کۆمەڵێك سەردولکە بێژیان بەدیاریەوە دانا. ئەوان سەردولکەیان دادەدا و کۆڕی ژنانی دەوروبەر، بەڕۆڕۆ بۆیان دەسەندنەوە. ئەندروماکی باسك سپی لە ناوەندیاندا سەری هیکتۆری جوامێر و مێرخاسی لە باوەش گرتبوو. وەکو رابەری شین و شەپۆڕی ژنان دەستی بەڕۆڕۆ و سەردولکە دادان کرد: "ئەی مێردە ئازیزەکەم، سەد حەیف و مەخابن بەگەنجی سەرت نایەوە. منت بێوەژن کرد، بێ کەس و تەنها لەماڵەکەتدا جێتهێشتم. کورەکەت هێشتا زۆر منداڵە!.. ئەو منداڵەی من و تۆی نەگبەت و بێ یەغباڵ خستمانەوە. زۆر دەترسم، باوەڕ ناکەم بگاتە تەمەنی لاوی، پێش ئەوەی ئەو پێبگات ئەم شارە وێران و ژێر و ژوور دەکرێت.. چونکە تۆ ڕۆیشتی، تۆ ئەی ئەو کەسەی ئەم شارە و ژنانی وەفادار و منالآنی ئەم شارەت دەپاراست، تۆ ڕۆیشتی. پێموایە ئەو ژن و منالآنە بەمنیشەوە بەو زوانە بەدیلی دەبرێین و لە کەشتیانی تیژڕۆ بار دەکرێین.. تۆش ئەی کورە بێنازەکەم، یا دوای من دەکەوی و دەبرێی بۆ شوێنێك و لە سایەی ڕەحمەتی سەروەرێکی دڵڕەق و ستەمکاری بێگانەدا دەخرێیتە ژێر باری کاری قورس و ناشایستەوە، یان

(٧٣٦) پیاوێکی ئاخایی داخ لە دڵ، کە ڕەنگە هیکتۆر برایەکی یان باوکی یان کوڕێکی کوشتبێ، پیلت دەگرێ و لەسەر بورجەکەوە هەڵت دەداتە خوارێ تا بەمەرگێکی خەمناك لەم دنیایە بڕۆیت. چونکە گەلێك لە ئاخاییەکان کۆست کەوتوی دەستی هیکتۆرن، چونکە بابت بەڕاستی لەشەڕدا ،شەڕی چەپەڵدا یەجگار دڵڕەق بوو.. هەر بۆیە خەڵکی لە سەرانسەری شاردا بۆی بەداخن و بەو جۆرە بۆی دەگرین!.. ئەی هیکتۆر داخ و کەسەرێکی وات خستە دڵی داك و بابتەوە هەرگیز خۆش نابێتەوە. بەلآم داخی من لەهی هەمووان گرانترە. چونکە تۆ لە کاتی مردنتا بەدەم گیانەڵێوە دەستانت لە ملی من وەرنەینا و قسە و پەندێکی وەهات بەگوێدا نەدام کە هەتاهەتایە، شەو و ڕۆژ بەدەم گریانەوە یادی بکەمەوە!"

(٧٤٦) ئەو بەدەم ئەو سەردولکانەوە بەکوڵ دەگریا و کۆڕی ژنان بۆیان دەسەندەوە. ئەوجا (هیکوبا)ش هەستا و بەسۆز و شیوەن و گریانەوە کەوتە سەردولکە دادان: "ئەی هیکتۆر، ئەی ئازیزترین فەرزەندم، تۆ لە ژیانتا میهر پەروەردەی خواوەندان بووی. ئێستا لەمردنەکەشتا، ئەو مەرگەی قەدەر لە چارەی نووسیویت هەر دەستبەردارت نین، تۆیان هەر لە بیرە. چونکە ئەخیلی لەزگین هەر کوڕێکی دیکەمی بەردەست کەوتبێ، لەودیوی

دەریا لە کەنارەکانی ساموس و ئەمبروس و لیمنوس)ی دووره دەستدا، کە کەشتی نایانگاتێ فرۆشتونی! بەڵام سەبارەت بەتۆ کاتێ کە بەزەبری ڕمان کۆشتتی، بەدەوری گۆڕی پاترۆکلۆسی هاوڕێیدا کە تۆ کوشتبووت، ڕایکێشایت ·بەڵام پاترۆکلۆس بەمکارەی ئەو زندوو نەبووەوە· ئێستاش ئەوەتا لە ماڵەکەمدا ڕاکشاوی، جەنازەکەت نەرم و ناسك، تەڕ و تازە دەڵێی تازە کوژراوی·· لە کەسێك دەچیت کە ئەپولۆی زیوین کەوان، بەبێ ئازارترین تیری خۆی تازە کوشتبێتی!"··

(٧٦٠) بەو ئاوایە بەدەم گریانی بەکوڵەوە سەردولکەی دادەداو کۆڕی شین و شەپۆڕی ژنان جۆشی دەسەند· ئەوجا سێیەمین ژن کە هیلین بوو، هاتە بەرەوە و سەرەداوی گریان و زارییەکەی گرتە دەست و بەم شێوەیە دەستی پێکرد: "ئەی هیکتۆر، ئەی ئەو کەسەی لە هەموو شوبراکانم ئازیزتربووی لە دڵمدا! لەوساوە کە ئەلکساندەر (پاریس)ی جوانی خواوەند ئاسا منی بۆ تەروادە هێناوە، بریا دەمردم و ڕۆژم بەم ڕۆژە دەگەیی! ئەمە بیستەمین ساڵە من لەوێندەرەوە هاتووم و وڵاتی خۆم بەجێهێشتووە· هەرگیز قسەیەکی سارد و زبرم لە تۆ نەژنەوتووە· خۆ ئەگەر کەسێکی دیکەش لە کۆشك و سەراکەدا، یەکێك لە شوبراکانم یان دشەکانم یان خەسووم، لە داخی دڵی خۆی منی سەرزەنشت بکردایە —پریام نا، چونکە هەمیشە میهرەبانترین باوك بوو بۆ من- تۆ بەزیرەکی و زمانە شیرین و ناسکەکەت بەرپەرچت دەدایەوە و ژێوانت دەکردەوە· بۆیە هەم بۆ تۆ دەگریم و هەم بۆ خۆمی کڵۆڵ· چونکە لە ئێستا بەدواوە کەس نابێ لە تەروادەی پان و بەریندا لەگەڵما میهرەبان و نەرم و نیان بێ، هەموو دەم بوغزێنن و ڕووم لێ وەردەگێڕن!"··

(٧٧٦) بەدەم ئەو قسانەوە بەگریە و زاری هەمووانی خستە گریان ئەمما گریان· ئەوجا پیرە پریام ڕابوو، ڕوویکردە خەڵکەکە و گوتی: "ئەی تەروادەییان ئێستا بچنە دار، بەهیچ جۆرێ ترسی کەمین و بۆسەی ئارگۆسیەکانتان نەبێ· چونکە کاتێ ئەخیل بەڕێی کردمەوە بەڵێنی دامێ کە تا سپێدەی ڕۆژی دوازدەیەم هیچ دژمنایەتیەکمان ناکات!"

(٧٨٢) هەر کە ئەو قسانەی کرد خێرا گاجوت و هێسترانیان لە گالیسکان بەست، بەپەلە لەبەردەم شاردا خڕبوونەوە· ئیدی بەدرێژایی نۆ ڕۆژ هەر داریان کێشایەوە و لەسەر یەك کەڵەکەیان کرد· کە ڕۆژی دەیەم بەیانی داو ڕوناکی خۆی بەسەر دنیا و بەشەراندا پەخش کرد، بەدەم گریان و بارانی ڕوندکەوە جەنازەکەی هیکتۆری موبارەك، ئازا و دلێریان هەڵگرت، نایانە سەر خەرمانە دارەکە و نێڵیان دا! ئەوجا کە ڕۆژی یازدەیەم کیژۆڵەی

بەیان بەقامکە گوڵرەنگەکانیەوە دەرکەوت ،خەڵکەکە لە دەوری شەوتنگەکەی (محرقة) هیکتۆری سەربەرز خڕبوونەوە. ئاگرەکەیان کە هێشتا هەر نێڵە نێڵ دەسوتا بە بادە دەکوژانەوە. ئەوجا برا و دۆستەکانی بەدەم گریانەوە کەوتنە کۆکردنەوەی ئێسک و پروسکە سپییەکانی، لە کۆپەڵەیەکی زێڕینیان ناو بەپارچەیەکی ئەرخەوانی ناسکیانەوە پێچاو. ئەوجا لە دەخمەیەکی قوڵیان ناو، سەرەکەیان بەتاوێرانی گەورە گەورە نایەوە. قسنێکیان بۆ دروست کرد و لە هەموو لایەکەوە پاسەوانیان بۆ دانا. لە ترسی ئەوەی نەبادا ئاخاییەکان بەر لە تەواوبوونی وەعدەکە پەلاماریان بدەن. کە لە کاری گۆڕەکە بوونەوە بۆ شار گەڕانەوە. ئیدی خەڵکەکە هەمووان لە کۆشکەکەی پریام پاشای زادەی زیوس خڕبوونەوە. ئەویش بەیادی هیکتۆر نان و خوانێکی شاهانەی بۆ سازکردن.

(٨٠٤) بەو جۆرە سرووتی جەنازە و پرسەیان بۆ هیکتۆری سوارچاك و ڕامکەری ئەسپان ئەنجام دا.

# تێبینی:



لە ڕۆژی (٢٠٠٨/٩/١٧) لە شاری سلێمانی لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە بوومەوە. کە لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرمگێڕاوە. هەموو ئەم سەرچاوانەم پەرەگراف بەپەرەگراف لەبەریەك گرتووە، لەهەر شوێنێکدا کامیان لەگەڵ ڕەوتی گشتی دەقەکەدا گونجاوتر هاتبێتە بەر مەزەندە و تێگەییشتنی بەندە، ئەوەیانم کردووە بەبناخە. بەهەرحاڵ کارەکەی من کارێکی بەراوردکارانەیە. بۆیە پەرەگرافی وام هەیە هەر دەستەواژە و ڕستەیەکی لە یەکێك لەو سەرچاوانەوە وەرگێڕدراوە.. هەڵبەتە ئەو سەرچاوانە ئەگەر لە هێڵە گشتییەکاندا تێکبکەنەوە، ئەوا لە وردەکاری و پاژاندا جیاوازی زۆریان هەیە. کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی زمانی ئەو سەرچاوانەی کارەکەیان لێوە وەرگێردراوە لەلایەك و بۆ جیاوازی شێواز و دارشتن و دەوڵەمەندی و هەژاری فەرهەنگی زمانەوانی هەر یەکێك لە وەرگێڕە بەڕێزەکان. بەهەرحاڵ من مەبەستم نەبووە خوێنەر فێری عەرەبی یا فارسی بکەم، بۆیە خۆم لە وەرگێڕانی وشە بەوشە دوور گرتووە و ئەم کارەم بەو ئاوایە کردووە، زۆر بەدرەنگەوە وەڵامی ئەم پرسیارەم داوەتەوە: بۆچی تائێستا شاکارێکی وەکو ئیلیادە نەکراوە بەکوردی؟

بەئومێدم لەڕیزی وەرگێڕانەکانی دیکەدا جێی بێتەوە ،دەنا ماڵی قەڵب سەری ساحێبی.. چونکە هەر کەسێکی ئەهلی قەڵەم بەتەمای ستایش و ئافەرین و دەستخۆشی بێ، بەتایبەتی لە کۆمەڵگا پاشکەوتووەکاندا کە مەخابن کوردستانی ئێمە لەوەشدا هەر قڕەیە، ئەوا وەرگێڕ نابێ چاوەنواری ئەمە بێ، و ئەگەر سەرزەنشت نەکرێ و بەر تانە و تەشەران نەدرێ دەبێ مەمنونی بەختی خۆی بێ.. بەهەرحاڵ ئەمە سەرچاوەکانی لەمەڕ وەرگێڕانە بەراوردکارییەکەی بەندەیە:


١-الألياذة: هوميروس، ترجمها عن الأصل اليونانی المقارن، امين سلامه.

٢-ايلياد: هومر، ترجمة مير جلال الدين كزازی، نشر مركز، چاپ پنجم، ١٣٨٥.

٣-الالياذة، هوميروس، ترجمة: حنا عبود، دار الحقائق، ط١ ٢٠٠٧ سوريه، حمص.

٤-ايلياد، هومر، مترجم: سعيد نفسی، تصحيح: دكتر ميترا مهرآبادی، چاپ سوم: ١٣٨٥.

# پێرست